كتێبی دووەم

# کاك ئەحمەدی موفتی زادە

هەوڵێک بۆ ناساندنی بەشێک لە بۆچوونە
(پەروەردەیی، فیکری، فەلسەفی) یەکانی



سەروەت عەبدوڵا

# کاک ئەحمەدی موفتی زادە

هەوڵێک بۆ ناساندنی بەشێک لە بۆچوونە
( پەروەردەیی، فیکری، فەلسەفی ) یەکانی



# کاك ئەحمەدی موفتی زادە

## هەوڵێك بۆ ناساندنی بەشێك لە بۆچوونە
## ( پەروەردەیی، فیکری، فەلسەفی ) یەکانی

نووسین و ئامادەکردنی
سەروەت عەبدوڵا





# ناسنامە

ناوی کتێب: کاك ئەحمەدی موفتی زادە،

هەوڵێك بۆ ناساندنی بەشێك لە بۆچوونە پەروەردەیی، فیکری، فەلسەفییەکانی

بابەت: پەروەردەیی، فیکری سیاسی

نووسین و ئامادەکردنی: سەروەت عەبدوڵا.

پیتچن: ئیمان وشیار.

هەڵەچنی: ئارام عەزیز.

دیزاینی بەرگ: سەروەت گوڵئەسەر.

ساڵ و نۆرەی چاپ: (٢٠١١).

چاپخانە: سیما

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

نرخ: (     ) دینار.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی(١٦٥٥)ی ساڵی (٢٠١١) پێ دراوە.



*****





**كاك ئەحمەدی موفتی زادە:**

**فەیلەسوف و سیاسی و پەروەرشیارێكی كۆمەڵناس**

# پێشکەشە بە:

* رۆحی باوکم، دڵی دایکم، چاوی هەموویان.
* هاورێ و هاوسەفەر و هاوسەرم ﴿بەهرە گوڵئەسەر﴾.
*ڕۆحی هەمیشە زیندووی﴿مامۆستا سەعید نوورسی و کاك ئەحمەدی موفتی زادەو مامۆستا ناصری سوبحانی﴾.
* هەموو خەمخۆرانی ڕێگەی حەقیقەت.

# پێشەكی

لە هەر سەردەم و كۆمەڵگەیەكدا واقیع داوای شتێكی كردوە و مرۆڤەكانی ئەو كۆمەڵگەیە وەڵامی پێویستیان بۆ ئەو واقیعە پێنەبووە، ئەگەر نەیانتوانی بە دروستی بەدەم واقیعەوە بچن لەوكاتەدا دەبێت مرۆڤەكان لەكەمترین كاردانەوەیاندا چاوەڕێی ئەوە بكەن كۆمەڵگەكەیان ڕووبەڕووی تێكچون و بارگرژی و جۆرەها نەخۆشی دەبنەوە، ئەمەش ئەو حەقیقەتەیە كە لە هەمو سەردەمە جیاوازەكاندا بۆتە هۆكاری ئەوەی (خودا) پێغەمبەر و مورشیدەكانی خۆی بۆ مرۆڤەكان رەوانە بكات و كۆمەڵگەكان لەو نەهامەتیانە ئاگاربكاتەوە كە یەخەی گرتون بەهۆی بێباكی خۆیانەوە!

ئەگەر كەمێك لە دۆخی ئێستای كۆمەڵگەی خۆمان ڕابمێنین زۆر بە سانایی دەتوانین هەست بەوەبكەین كە كۆمەڵگەكەمان واقیعێك بە سەریدا سەپاوە و نەخۆشیگەلێكی تێدا دەركەوتوە پێویستی ئەوە دەردەخەن كە دەبێت لەبەرامبەریدا بوەستینەوە و وەڵامی یەك بەیەكی داواكاریەكانی بدەینەوە! جا ئەو دەردانە لە سەرەكی تریانەوە دەستپێدەكات، كە تاك و بنەمای خانەوادە و كۆمەڵگەی هەڵتەكاندوە تا دەگاتە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكان و لە سنوری جوگرافیای كوردستان دەچێتە دەرەوە!

لەگەڵئەوەی هەمیشە لە كۆمەڵگەدا كەسانێك هەبوون بە بەردەوامی هاواریانكردووە و خەڵكیان ئاگادار و هۆشیاركردۆتەوە، بەڵام لەبەرامبەردا توانای بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەكان زۆر زیاترە! بەجۆرێك پزیشكەكانیش




ئاسان توانایی بەرپێگرتنیان نەبووە. لە ڕاستیدا بەشێك لەم نەتوانییە دەگەڕێتەوە بۆ هێرش و سەرچاوەی بەهێزی ڤایرۆسەكان، بەلاّم بەشی زۆری دەكەوێتە ئەستۆی پزیشكەكان و لێهاتوویان، چونكە لەلایەكەوە لە دیاریكردنی دەرد و دەرماندا شارەزانەبوون! لەلایەكی دیكەوە ڕێگەكانی پێدانی دەرمانیان نا زانستی، دووبارە، یان هەڵەبووە!! نەشارەزاییان لەوێدایە تاكەكانی كۆمەڵگە عەقیدە و جیهانبینیان دوچاری دەردبووە، بەلاّم ئەوان هاتوون دەرمانی شەڕی سیاسی و ئابوریانكردووە. دووبارەی دەرمانەكانیان لەوێدابووە هەمیشە ناوەڕۆكی پەیامەكانیان شێوەیەك لە چەقبەستووی و كۆنی پێوەدیاربووە، كە گوێی لێدەگریت و دەیانخوێنیتەوە هەست بە بەسەرچوونیان دەكەیت! ئەوان هەمیشە هەوڵیانداوە لەڕێگەی وتار و وانەی ئیمانیاتەوە چارەی دەردەكان بكەن، بەلاّم لەبەرئەوەی (نەخۆش) ئازار و كێشە لە فكریدا بووە، بابەتە فكری و فەلسەفییەكان كێشەیان بۆ دروستكردووە بۆیە دەبینیت چارەسەر نەكراوە، چونكە ئێمە دەزانین كاتێك بابەتە فكری و فەلسەفییەكان سەریانهەڵدا ئیتر ئەوە بابەتە ئیمانییەكان نین وەلاّمی پرسیارەكان دەداتەوە! بەڵكو تۆش دەبێت ئەسپی خۆت لە مەیدانی فكردا تاوبدەیت و لەوێ وەلاّمی پرسیار و گومانەكان بدەیتەوە..

ئەم كتێبەی ئێستا لەبەردەستدایە هەوڵێكە بۆ دەرمانكردنی ئەو دەردانە، دەرمانێكە بۆ گەڕاندنەوەی كۆمەڵگە بۆ دۆخە تەندروستەكەی جاران! ئەو دۆخەی هەمیشە بۆمان دەگێڕنەوە، كە تاكەكانی بەوپەڕی بەرپرسیارێتییەوە مامەڵەیانكردووە، بە هەموو توانایانەوە هاوكاری یەكتر و پشت و پەنای یەكتربوون!

سوپاس بۆ خوا لەساڵی پاردا لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی (کتێبی یەکەم)ەوە توانیمان تارادەیەك نوسەر و بیریار و سیاسەتوانێکی کەنارخراو بگەڕێنینەوە مەیدانی قسە لەسەرکردن، نەوەیەك لە بێسەروشوێنکردنی شۆڕشگێڕێك ئاگاداربکەینەوە! لەم کتێبەشدا کە بەڵێنماندا بوو بڵاویبکەینەوە بە هامان شێوە هەوڵەکانمان خستۆتەگەڕ، بۆئەوەی جارێکی تر فەلسەفە و سیاسەت و توانا کۆمەڵناسییەکەی (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) لە ڕێگەی باسگەلێکی خۆیەوە بەم نەوەیە ئاشنابکەین. دەمانەوێت هیچ نەبێت بە تاکی خوێنەواری کورد بڵێین"جێگەی دڵخۆشییە کە خاوەنی ئاوا پیاوێکی بیرمەند و فەلسەفی و سیاسین!". ئەو بابەتانەی لەم کتێبەدان بەم نەفەسە نووسراو و ئامادەکراون، ڕاستییەك هەیە پێش ئەوەی بڕۆمە سەرباسی ناوەڕۆکی کتێبەکە پێویستە تۆی خوێنەر لێی بە ئاگابیت: یەکەم، شێوازی کاری ئێمە لەگەڵ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) و بەرهەمەکانی بەهەمان ئەو شێوەیە کە لە ژیانی خوێندنەوە و نووسینماندا لەگەڵ بەرهەم و نووسینی بیریارێکی عەرەب، فارس، ئینگلیزی و ئەڵمانی یان فەڕەنسی و ئەمەریکیدا دەیکەین، ئەگەر ڕونتر بڵێم ئەم مامەڵەیە مامەڵەیەکی ئیحساسی و نازانستی نییە، لێرەدا لەبەرئەوە نییە کوردە بۆیە خوێندنەوەی بۆدەکەین، بەڵکو مامەڵەیەکی وردە و ئەگەر هەر نەتەوەیەکی تربووایە ئێمە لە بوارە فیکرییەکەوە هەروا کارمان لەسەر دەرکرد(لەڕاستیدا ئەگەر ئەم بیریارە خاوەن کتێبی فەلسەفی و سیاسی بووایە ئەوە ئێمە لە ئێستادا لەبری ئەوەی لەم خاڵەوە ئەو بناسێنم و خوێندنەوەی بۆ بکەم دەهاتم توێژینەوەی بەراوردکاریم ئەنجام دەدا لەسەر بەرهەمەکانی!)، جا ئەمەش لەبەرئەوە دەڵێم زۆرکەس بەتایبەت ئەوانەی




مامەڵەی شاگرد و وەستا دەكەن لەگەڵ ئەم بڕیارە زۆر قورسە لەلایان كەسێك بێت و بەبێ‌پرسی ئەوان كار لەسەر بەرهەمەكانی ئەو بكات، بۆیە ئێمە ویستومانە ئەم ڕێچكەیە بشكێنین، هەروەك چۆن لەگەڵ بابەتێكی (عەبدولكەریم سروش، یان نیچە)مامەڵە دەكەین و بۆ هیچ شتێك ناگەڕێینەوە بۆ شاگردەكانی و ئیجازەیان لێوەرناگرین لێرەشدا هەروادەكەین. ئەمەش بە قازانجی فكرەكەیە، هەروەها ئێمە (موفتی زادە) بە خاوەنی قوتابخانەیەكی فكری دەزانین و لەوە گومانمان نییە خاوەنی سیاسەت و پەیرەوپرۆگرامی خۆیەتی، بۆیە مامەڵەی فكریش لەگەڵ بەرهەمەكانیدا دەكەین و ڕەخنەش لە بەرهەمەكان دەگرین و لێكۆڵینەوەی زانستیشی لەبارەوە ئەنجام دەدەین. دووەم ڕاستی ئەوەیە هەروەك وتمان ئەم كارەی ئێمە سەرەتا و دەروازەیەكە بۆ خۆمان و هەموو ئەو كەسانەی دەیانەوێت لەم بوارەدا دەست بەلێكۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی بكەن، چونكە بەپێی میتۆدی لێكۆڵینەوە سەرچاوەیەك كتێب و نووسراو بێت و ژمارەی سپاردن و ساڵ و شوێنی چاپی لەسەربێت مامەڵەكردن لەگەڵیدا ئاسانترە وەك لەوەی دەنگی بێت، ئەمەش لەبەرئەوەی گەڕانەوەی خوێنەر بۆ سەرچاوەی نووسراو ئاسانترە، جگەلەوەی پاراستن و ئەرشیفكردنی كتێب لە ڕووی (زیاتر مانەوەی لە بارودۆخی جیاوازدا) لەبارترە وەك لەوەی دەنگ بێت. كاتێك ئێمە ئەم بەرهەمەمان ئامادەكردووە ویستوومانە كارئاسانی بۆ خۆمان و توێژەران بكەین و بنكەی كارەكانمان لەسەر ئەم بڕیارە فراوانتر بكەین.

ئێستا دەمانەوێت زۆر بەكورتی ئاماژەیەك بە ناوەڕۆكی كتێبەكە بكەم، ئەوانەی كتێبی یەكەمیان خوێندبێتەوە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەروازەیەك






بۆ خەباتێکی نەناسێنرو١) ئەوە دەزانن کە لەوێ قسە لەسەر ژیان و کەسایەتی و کەمێك لە خەباتە سیاسییەکەیەتی و هەوڵدراوە زۆر بەکورتی ئەم زانایە بناسێنرێت، لەگەڵئەوەی هەوڵماندا لە (کتێبی دووەم)-مەبەست ئەم کتێبەی بەردەستتە- ئەگەر بە باسێکیش بووە درێژە بە باسەکانی (کتێبی یەکەم) بدەین، لەبارەی کەسایەتی و مێژووی خەباتییەوە، بەڵام لەبەرئەوەی سەرچاوەی زانیارییەکان ئاسان دەستنەدەکەوتن و تەلاشی زۆر درا کەسە دیار و نزیکەکانی ئەو بیریارە ببینرێت، (چونکە لە ئێستادا گرنگترین سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوە لە -موفتی زادە- بریتییە لە گێڕانەوە) جگەلەوەش نووسەر بەهۆی ئەو چەندین ئەرکەی لەسەرشانییەتی ئاسان نەبوو بۆی لەیەك کاتدا حەقی هەموو کارەکانی بدات، بۆیە لە کتێبی دووەمدا کارمان لەسەر ئەوەکردووە جیهانبینی و بەشێك لە هەوڵ و کارەکانی (کاك ئەحمەد) و قوتابخانەکەی لە ڕێگەی چەند باسێکەوە کە خۆ لە کاتەکانی ئینقلاب و پێش ئینقلاب و پاش ئینقلابدا کردونی بیکەینە نووسین.

لەم کتێبەدا هەوڵمانداوە بەلایەنی کەمەوە ئەوەندەی پێ‌ڕاگەیشتووین و بەگرنگمان زانیوە ئەو باسانەی زیاتر دەکرێت فکر و بیری (موفتی زادە)ی لێوە بناسرێت و لەم کات و سەردەمەی ئێمەدا واقیعییەتی کۆمەڵگەکەمان پێویستی پێیەتی کاری لەسەر بکەین. لێرەدا ئێمە توانیومانە چەند باسێکی (موفتی زادە) کە لە چەند دانیشتنێکی جیاوازدا دەربارەتی تەوەرەی تایبەت پێشکەشی کردون ڕێکیان بخەین و لە ژێر ناونیشانی تایبەتدا بە شێوەیەکی زانستی بینووسینەوە، ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە بەشی یەکەمدا دەردەکەوێت، کە تێیدا قسەکردنە دەربارەی(بونیاد نانی خێزانێکی ئیسلامی)، ئەوەش بڵێم

ئێمە لەم کتێبەدا نەهاتووین هەمان ئەو ناونیشانە بەکاربهێنینەوە کە لەکاتی خۆیدا بۆ وتار و باسەکان دانراون، بەڵکو ویستومانە لە رێگەی گۆڕینی ناونیشانەکانەوە بەرگێکی زانستی و فەلسەفی و سیاسی بکەین بەبەری باسەکاندا و سرنجی خوێنەر ڕاکێشین بۆ قوڵایی ناوەڕۆکی بابەتەکان!

بەگشتی کتێبی دووەم لە چوار بەشی سەرەکی پێکدێت، کە هەر بەشێك لە چەند باسێکی سەربەخۆ پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا ویستومانە لە ژێر ناویشانی (بونیادانی خێزانێکی ئیسلامی)دا دیدی (کاك ئەحمەد) بۆ تاك و خانەوادە و بەرپرسیارێتی ئەو دووانە بەرامبەر بە کۆمەڵگە ڕونبکەینەوە، لە کۆتایشدا پەردە لەسەر ئەو میتۆدەلابەرین، کە (قوتابخانەکەی کاك ئەحمەد) کاری پێدەکات و هەوڵی بلاوکردنەوەی داوە. لە بەشی دووەمدا قسە دەربارەی پەروەردەو فێرکردن و گرنگی ئەم دوو چەمکەیە لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا دەکەین، لێرەدا (موفتی زادە) لە هۆکارەکانی (ئیزدواجییەتی شەخصییەت) دەکۆڵێتەوە و چەند بنەمایەکی گرنگ بۆ پەروەردە و فێرکردن تەرح دەکات کە زیاتر وەك زانایەکی دەروونناس دەردەکەوێت. بەشی سێیەمیش تایبەتە بە باسی کۆمەڵگە و بابەتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، کە دەیەوێت ئەوە ڕابگەیەنێت کۆمەڵگە و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی هەمیشە درێژکراوەی ئەو جوڵانەوە و بزاوتنەن کە لە کۆمەڵگەدا هەیە، بۆیە دەبینین لێرەدا وەك فەیلەسوفێکی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت و چەندین دەردی (کۆمەڵگەکوژ) تاوتوێدەکات. هەرچی بەشی چوارەمە تایبەتە بە فکر و فەلسەفە و چەمکە سیاسییەکانەوە لێرەدا ئیتر(موفتی زادە) دەبێتە فەیلەسوفێك و دەنگی شەپوری فەلسەفەی دونیای فیزیك و میتافیزیك دەگرێتەوە و بە زمانە فەلسەفییەکەی

دەكەوێتە شەن و كەونكردنی دونیای (مادە) و (رۆح) و حەقیقەتگەلێك دەخاتە ڕوو ئاستی تێگەیشتن و مەعریفە لەڕەگەوە دەگۆڕێت! لە باسی كۆتایدا(موفتی زادە) بە دیدێكی سیاسی فەلسەفییەوە دەربارەی حوكم و دەسەلاتی ئێران قسە دەكات، و ئەو هۆكارانە ڕوندەكاتەوە كە بۆچی قوتابخانەكەی لەگەڵ ئەو حیزب و گروپانەدا نییە كە لەوكاتەدا حوكمی ئێرانیان نكردووە. لەوێدا چەمكی لیبرالیزم، وەك خاوەن قوتابخانەیەك دەخاتە ژێر پرسیار و ڕەخنەوە، لە پاشاندا حیزبە دەستەلاتدارەكانی وەك (جمهوری و تودە و چریكەی فیدای و موجاهدینی خەلق و بەنی صەد...) باسدەكات و ئومێدی خۆی و قوتابخانەكەی بەو حوكمەتە ئاشكرا دەكات، هەر لەم باسەدایە خوێنەر دەتوانێت بە لوتكەی جیهانبینی و ئاماجی كار و چالاكییەكانی (موفتی زادە) و قوتابخانەكەی بگات.

لە كۆتایدا تەنها دەمەوێت ئەوە بڵێم: ئەم بەرهەمە بریتییە لە دەست بردن بۆ بابەتگەلێك كە ئەگەر لەبەر هەست كردن بە بەرپرسیارێتی نەبووایە هەر لە هەنگاوە ئەوەڵییەكانەوە پاشەكشەم دەكرد، ئەویش لەبەرئەوەی بیریارێكی ورد و قوڵ، هەرلەبەر ئەمەش پڕبەدڵ داوای لێخۆشبوون لە خواد دەكەم، ئەگەر لە بەرامبەر ئەم بەرپرسیارێتییەدا كورتم هێنابێت و بوبێتمە مایەی تێكدانی وشە و مەبەستێكی ئەو كەڵە پیاوە. لەكۆتایدە پڕ بەدڵ سوپاسی (خاتو ئیمان وشیار)دەكەم، لەگەڵ سەرقاڵی زۆری خۆی بە خوێندنەوە، بەڵام ماندو نەناسانە لە پیتچنی ئەم بەرهەمەدا كەمتەرخەمی نەكرد.

سەروەت عەبدوڵا

٢٠١١/٥/١٧

زالكۆی سلێمانی

# ناوەڕۆك

# باسی یەكەم:
# بونیادنانی خێزانێكی ئیسلامی

## سەرەتایەك لە بارەی (كۆمەڵگە، خانەوادە، تاك{پەروەردە})

یەكێك لەبابەتە زۆر گرنگ و ئەساسییەكانی كۆمەڵگە، بابەتی(خانەوادە) یە. خانەوادە بنەڕەتی كۆمەڵگەیە، كۆمەڵگە ئەوەی وتراوە (شار، دێ، ناوچەیەك) بەهەمور ئەمانە دەوترێت كۆمەڵگە، ئەوەی كە ژمارەیەك لە ئینسانگەل زیندەگی تێدا دەكەن پێی ئێژن (كۆمەڵگە). خانەوادە، واتە ماڵێك كەپێكهاتووە لە ژن و شوویەك و دوو، سێ، یان چەند منداڵێك، بەمەش ئێژن(خانەوادە).

كۆمەڵگە لەچییەوە دروست دەبێت؟ شارێك، سەد هەزار، سەد و پەنجا هەزار، یان پێنج ملیۆن دانیشتوی هەیە، لەچی پێكدێت؟ دیارە بەگشتی لە خانەوادەگەل پێكدێت. ئەوە خانەوادەكانن یەك دەگرن و شارێكی گەورە یان بچوك، دێیەكی گەورە یان بچوك دروست دەكەن. هەر شتێكی گەورە كەدروست بووە لەسەرەتادا چەند شتێكی بچوك بووە. شتە گەورەكە كاتێك محكەم و دروست دەبێت، كە شتە بچوكەكان محكەم و دروست بن، بۆ نمونە (ماڵێك) دروست دەبێت لەچەندانە بلۆك و خشت و ئاجۆڕ و دار... ئەم جۆرە وەسائیلانە، كاتێك ماڵەكە فرە قایم و محكەم دەبێت، كەئەو شتگەلە




وا کەوتونەتە یەك و ماڵەکەیان دروست کردووە، قایم و محکەم و دروست بن، ئەگەر ئاجۆڕەکان، یان خشتەکان، یان ئەو دارگەلە وا بەکار دەهێنرێت زۆر سست و شل بێت لە کۆتایدا ماڵەکەش وا دەبێت!

کۆمەڵگە وەك ماڵێك وایە، ئەو شتە بچوکگەلە وا کۆمەڵگە دروست دەکات، وەك دانە دانەی خشتگەل و ئاجۆڕگەل و دارەکان وایە، کاتێك کۆمەڵگە قایم و محکەم و دروست و سالم دەبێت، کەئەو جوزئە بچوکگەلە وادەکەوێتە یەك و کۆمەڵگەی پێ دروست دەبێت ئەوانە سالم و دروست بن، ئەگەر ئەوانە ناسالم و نادروست بن لە کۆتایدا کۆمەڵگەش نادروست و ناسالم دەبێت.

جا کاك ئەحمەد، وەك کاری هەمیشەی بۆئەوەی زۆرتر بەرامبەری تێبگەیەنێت و ڕونکردنەوەیان بۆبدات دێت یەکدانە لەو نمونە زۆرانەی لە بەردەستیدایە دەیکاتە دەرگایەك و لە ڕێگەیەوە دەچێتە ناو بابەتەکانەوە، ئەو لێرەدا بۆئەوەی بیسەلمێنێت خانەوادە، کە بنەمای دروستکردنی کۆمەڵگەیە چەنێك کاریگەری دەبێت لەسەر دروستی و سالمی کۆمەڵگەیەك دێت نمونەیەکی شاری (سنە) دەکاتە دەستکەلای خۆیی و لەوێوە لەیەککاتدا دەروازە بۆ دچەندباسێکی گرنگ دەکاتەوە، ئەوانیش باسی گۆمەڵگە کە بنەماکەی خێزانە، باسی خێزان کە بنەماکەی تاکەکانییەتی، باسی تاك کە بنەمی ڕەفتاری پەروەردەکردنە، ئەو بەم جۆرە دەستدەکات بە ڕونکردنەوە، "ڕوداوگەلێك لەڕابردووی شاری سنە (ڕویاندا)، چونکە ناسالم بوو نەتیجەیەکی ترسناکی دروست کرد، گشتمان لەم یەك دووساڵەدا بینیمان کە چۆن کۆمەڵگەی ناسالم کرد.





زۆر بینیمان منداڵگەل چۆن لەناو شاردا ئازاری(توتكەسەگیان) دەكرد، ئەزییەتی بەچكە (پشیلە)و ئەم ولاَخگەلەیان دەكرد، كە كەسە بێئینسافەكان ماوەیەك باریان پێدەبەن و لەوەودوا لەوەرزی پاییزدا بەرەڵایان دەكەن! منداڵگەل دەهاتن ئازاری ئەمانەیاندەدا. لەزۆر شوێندا بینیومە هەر لە خوار ئەو محەلەی خۆمانەوە كۆلاَنێك لە شەقامی(شوهەدا) ـ فەرەح ـ لەبەرامبەر كۆلاَنی(حەمام ئادەورش)ەوە دەچێتە خوارەوە كەلاوە و شتی تێدا بوو، چەندین جار لەوێوە تێپەڕیووم بینیومە (توتكە سەگ و پشیلەیان) هێناوە، تەنافیان خستۆتە ملیان و بەستونیانەتەوە بە دارەوە و داویاننەتە سەر دارقەلاَ! ئەنواع بێڕەحمی لەمنداڵگەلی مەعسومەوە، منداڵ كەمەزهەری صەفا و صەداقەت و صەمیمەتە... شتی ئاوامانە پێیانەوە دیوە. جائەمە باسێكە لە وەزیفەی (ئەركی) خانەوادە بانترە، وەزیفەی گشت كۆمەڵگەیە، لەسەرەتادا ئەمە باسدەكەم، لەوەودوا دەچمە سەر باسی خانەوادە، ئەگەر موسوڵمانگەل وەزیفەی خۆیان بزانییایە! دەیانبینی ئەم منداڵگەلە مەعسومە نازانن و دەركی ئەمە ناكەن، ئەم گیاندارە هەروەك ئێمە هەست بە ئێش و ئازار دەكاتو بە ئازاردا ناڕەحەت دەبێت. منداڵگەلیان حاڵی بكردایە، منداڵگەلمان ئاوا بێڕەحمو دڵ سەخت بار نەدەهاتن! جارها بینیومە كەمنداڵ خەریكی ئازاردانی منداڵی تر، یان بەچكە پشیلە بوون، پیاوگەل و ژنگەل هاتوون تێپەڕیون و ئەصڵەن دانەچڵەكیونو لایەكیان نەكردووەتەوە، وەك ئەمە هیچ شتێك ڕووی نەدا بێت!

هەندێكجار،كەڕوداوی بەم شێوەم دیوە دەستم كردووە بە قسەكردن لەگەڵیاندا، سەیرمكردووە ئەمانە بەچكەی بنیادەمن و فەهمیان هەیە و حاڵی




دەبن و عاتیفەیان هەیە،گەورە"ئاوێكی چڵكن دەڕژێت و ئەمانە بە شوێندا دەچن" لەسەرەتاوە بێڕەحم و دڵسەختێك كارێكی لەو جۆرە دەكات لەوەودوا ئەم مندالگەلە حاڵی نابن‌و نازانن ئەمە تاوانەو دوورە لە ئینسانییەت دێن بەبێ‌ئەوەی دەرك بكەن ئەمە كارێكی خراپە ئەنجامی دەدەنەوە، ئەركی گەورەكانە و دەبوایە حاڵییان بكردنایە، بەلاّم حاڵییان نەدەكردن. زۆرجار ڕویداوە شتێك بەو جۆرەم كردووە و كەوتوم بەسەریدا، دەستمكردووەتە قسەكردن، قسەكردن بۆ منداڵەكان و حاڵییانم كردوە، ڕوغكردووەتەوە بۆیان ئائەو (توتكە سەگە)لەژێر دەستی تۆدا بێتوانایە، وەك ئەوە وایە تۆ لەژێردەستی ئینسانگەلی گەورەدا بێتوانا بیت. پێمدەوتن"ئێستا پێتان خۆشە من بێم بەو جۆرە ئازاری ئێوە بدەم؟"

سەیرم كردوە هەندێك جار حاڵی نابن، بە موحیبەتێكەوە تەنها بۆ حاڵی بوون چوم(گوێچكەیانم گرتووە و پرواندومە(بامداوە)، توند سەریانم ناوەتە نێوان هەردوو دەستم و پرواندومە و زۆرم بۆ هێناون) بەموحیبەتێكەوە، زانیویانە مەبەستم ئازاردانیان نییە و بەڵكو مەبەستمە حاڵییان بكەم وتومە"ئەمە خۆشە؟" تەماشام دەكرد تێدەگەن و دەیان ووت"نەوەلاّ خۆش نییە". ووتومە دەی ڕۆڵەكان، ئەو بەچكە پشیلە زمانی نییە قسە بكات، ئەویش بەو جۆرە ئازار دەچێژێت بەدەست ئێوەوە. ئێستا ئەگەر من بەو جۆرە ئازاری ئێوە بدەم كارێكی خراپ دەكەم، ئێوەش بەو جۆرە ئازاری ئەو دەدەن كارێكی خراپ دەكەن، حاڵی بوون و گۆڕاون و تەواو پێچەوانەی ئەوە كاریان كردووە! دەی ئەگەر گەورەكان لەناو كۆمەڵگەدا، هەر كەسێك بێت چی منداڵی خۆی بێت، یان هی خۆیان نەبوو بێت وەزیفەی خۆیان بزانییایە و نەصیحەتی




منداڵگەلیان بکردایە. منداڵگەلی ئێمە بەو شێوە دروست نەدەبوون،کەوا دەیبینیت بەچاوی خۆت، نەتیجەکەشی بوو بەوەی لەم(یەك، دوو) ساڵەدا دەرکەوت بەحەقیقەت ئینسان مات دەبێت، کە خوایا چۆن دەبێت بەچکەی بەنی ئادەم بێت و ئائەوەندە دڵڕەق و بێڕەحم و بێشەفەقەت بێت نیسبەت بە خودی بەنی ئادەم؟!!

بینیمان و ئاگادارین، لەناو ئەم گروهگەلەدا بوون{مەبەست حیزبە چەپەکانی سەردەمی ئینقلابە}، کە چییان دەکردا چ جۆرە موسوڵمانگەلیان (ئەشکەنجە کوشت) دەکردا نەك ئەوەی کوشتنی ئاسایی! ئەوە بەهەرحاڵ شتێکەو ئاساییە رقی بێت لە کابرا و گوللەیەکی لێ بدات و بیکوژێت! موسوڵمانگەلێکیان دەگرت،کە نمونەی صەداقەت و پاکیی بوون، لەبەرئەمە خیانەتیان نەدەکرد، لەبەرئەمە نەدەکەوتنە شوێن درۆ، نەدەکەوتنە شوێن تەڵەکەبازی، ئا بەو جۆرە ئەشکەنجە کوژیان دەکردن کەبینیمان! بەحەقیقەت، وازهێنان لە باشیو خراپی و لایەنی سیاسی و لایەنی عەقیدە، کەبڵێیت، ئەم عەقیدەیەکی بووە و ئەو عەقیدەیەکی بوو، سەرفی نەزەر (واز هێنان) لەهەرچی شتە، تەنها باری ئینسانییەت لەبەرچاو بگریت. ئینسان مات دەبێت! کە خوایە خۆ دڕندەترین دڕندە، ئەوەندە بێڕەحم و دڵڕەق نییە! هیچ دڕندەیەك نابینین، بەوشێوەیە لەزەت بیات لەئازاردانی هاوجۆری خۆی! جا هاوجۆری خۆی، چونکە جیاوازی هەیە،دڕندە پێی دەڵێن "دڕندە" نەفرینی دەکەین، لەوانەیە ئاژەڵێکی تر جیاواز لە هاوجۆری خۆی بخوات، ئەویش نەك ئەشکەنجە کوژی بکات! نا...ئەشکەنجە کوژی ناکات، پێویستی پێیەتی دەیکوژێت و دەیخوات، بەڵام ئەوە عەجایب ترە، کەئەشکەنجەی بدات و لەزەت بیات لەئازاردانی، لەو

ڕووەدا كەهاوجۆری خۆیشی بێت لەناو ئاژەڵەكاندا نابینم، هیچ ئاژەڵێك ئەوەندە پەست و هیچ بێت، ئەوەندە كەسیف و زەرەرمەند بێت كەلەزەت ببات لەئازاردانی ئاژەڵێكی تر لەجۆرێكی تر چجای لە جۆری خۆی!!

دەی خوایە! چۆن دەبێت بەچكەی بەنی ئادەم بێت، ئینسان بێت، كەدەبێت هەرچی خەصڵەتگەلی باشییە لەئینساندا جێگەی ببێتەوە و جێگە بگرێت، تاوەكو جیا ببێتەوە لەتەواوی ئاژەڵگەل؟! چۆن دەبێت بەچكەی ئینسان بێت و لەناو خانەوادەی ئینساندا پەروەردە بوو بێت، ئەوەندە دڵڕەق بێت كەبێت هاو جۆرەكەی خۆی بەبێ هیچ جۆرە تاوانێك، هەر لەبەرئەوەی كە خراپ نییە، هەرلەبەرئەوەی ناكەوێتە شوێن ڕێگەی ئەوانە. فەرز بكەین ڕێگەی ئەوانیش ڕاست بێت، لەبەرئەوەی ناكەوێتە شوێن ڕێگەی ڕاست و خاسی ئەوان، بێت لەزەت ببات لەوەی ئەشكەنجە كوژی بكات، بە عەزییەت و ئازارەوە بیكوژێت! لەبیرتانە، نەفرینی(ساواك)مان دەكرد، نەفرینی (موساد)ی دەزگای ئەشكەنجەی جاسوسی(ئیسرائیل)، نەفرینی(CIA)ی ئەمەریكی و (KVG)ی ڕووسی، كەئەمانە بێڕەحمن و ئازار و عەزییەتی خەڵكی دەدەن. دەی ئەوە ئەولادەكەی خۆمان بوو ئاوایان دەكرد! خۆ كارگەلێكیان دەكرد شایەت دەزگاگەلی جاسوسی (ئێران و ئیسرائیل و ئەمەریكا و ڕووس)یش نەیانكرد، شایەت واقیعەن ئەوانیش نەگەشتبنە ئەو ئاستە لە تاوان و بێڕەحمی! ئەوە بۆچی ئەولادەكانی ئێمە وایان لێ هات؟ چۆن بەچكەی بەنی ئادەم، توانی لەهەرچی حەیواناتە خراپتر بێت، لەهەرچی حەیوانە زەرەرمەندتر و پەستتر و دڕندەتر بێت؟!

ئەوە ئالەوێوە سەرچاوەی گرت، ئەو تەربییەت(پەروەرد)ە بوو وایڵکردن، لەو کاتەدا دەچوون ئائەو بەچکە بێدەسەڵاتە کەکەمترین زەرەرو ئازاریان بۆ هیچ مەوجودێك نییە، دەیانگرتن و بەوشێوەیە ئەشکەنجە کوژیان دەکردن، ئازاریان دەدان و گەورەکانیش دەنگیان نەدەکرد! ئاگاداریيان پێ نەدەدان، ئەمەش دەبوویە (عادەت) بۆیان، دەی کاتێك ئابەو جۆرە عادەتی گرت لەکۆتایشەوە دەتوانێت پلەیەك ئەولاتر، ئازار و ئەشکەنجەی ئینسان بکات و دڵی دانەچڵەکێت! تازە ئیتر دڵێك بەمەعنایی صەحیحی ئەم کەلیمە نەماوە بۆ ئەوان، واتە عاتیفە و ڕەحیمییەت، واتە شەفەقەت، ئەمانە نەماوە بۆیان هەرلە منداڵییەوە فێری بێڕەحمی و بێشەفەقەتی بوون! لە گەورەیدا ئیتر بێ شەفەقەتی و بێ ڕەحمی ئاسانە بۆیان.

ئەو گشتە تاوانەی دیمان لەم ئینسانگەلەوە، عیللەتی ئائەوە بوو لە کاتی خۆیدا فێری بێڕەحمی و تاوانکردن بوون، کە گەورەکان گشتمان خەتاکارین، چ نیسبەت بە منداڵی خۆمان، چ نیسبەت بە منداڵی باقی موسوڵمانگەل، لێرەد ئیتر باس باسی خانەوادە نییە باسی کۆمەڵگەیە. هەر منداڵێك دەبینرێت لەناو کۆمەڵگەیەکدا، کەکارێکی ناڕەوا دەکات، هەر موسوڵمانێك بەرپرسە، چ باوكو دایکی، چ باقی موسوڵمانگەل، کەئاگاداری بکانەوە، هەر کەس دەیبینێت و هەر کەس خەبەر پەیدا بکات نەمان کرد. ئەنجامەکەی ئاوا بوو کەبینیمان. کەواتە ئەگەر خانەوادە خاس بێت، کۆمەڵگەش خاس دەبێت، ئەگەر خانەوادەگەل بیانزانیایە خۆیان ئیسلامی پەروەردەبکردایە، بەچکەی ئینسانیان پەروەردە بکردایە، مەوجوداتێکیان پەروەردە بکردایە کەمەعنای ئینسانەتییان بزانیایە، شەفەقەیان ببوایە،

عاتیفەیان ببوایە، لەكۆتایدا و لەسەر ئاستی كۆمەڵگەش وایان لێ نەدەهات بچن بەچكە پشیلە و توتكەسەگ، یان ئەو ئاژەڵگەلەی وا بەرەڵادەكران ئازار بدەن! لە كۆتایشدا وایان لێ نەدەهات ببنە ئەو تاوانكارانە"...

# پرۆسەی هاوسەرگیری

## تەمەنی صەحیح بۆ زەواج

وەك دیارە سەرەتای دروست بوونی هەر خانەوادیەك لەو كاتەوە دەست پێدەكات، كە كوڕێك بڕیاردەدات كچێك بە ناونیشانی هاوسەری ئایندەی دیاری بكات و لە بەرامبەریشدا كچێك بڕیاردەدات ئەو كوڕەی هاتۆتە داوای وەك هاوسەری ژیانی قبوڵی بكات، لە دواتردا كەسە نزیكەكانی هەر دووكیان دەستدەكەن بە ئەنجامدانی ئەو ڕێو شوێنانەی بۆئەو مەبەستە پێویستە كە بەپێی دابوو نەریتی كۆمەڵگەكان دەگۆڕێت، بەڵام لای (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) لەبەرئەوەی باسی دروستكردنی خانەوادە زۆر لەوە گرنگترو قوڵترە كە بەداخەوە لە ئێستادا بیری لێدەكرێتەوە دێت پێش هەموو شتێك قسە لەسەر ئەو تەمەنە دەكات كە كوڕو كچ بڕیاری هاوسەرگیریان تێداداوە، دەڵێت"لەئیسلامدا ئەرك ئەوەیە، ئەگەر كۆمەڵگە كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی بێت لەگەڵ كوڕ و كچ گەیشتنە(بلوغ) بەشەرائیتی موناسیبەوە هاوسەرگیری ئەنجام بدەن. (جامەبەستم(بلوغی جنسییە) نەك(بلوغی فكری)، چونكە دوو بابەتی جیاوازن لەیەك) ئەمە بەرنامەی ئیسلامە. بەڵام ئەمە

كاتێك مومكینە كە كۆمەڵگەكە ئیسلامی بێت، چونكە لەكۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئەگەر كوڕ و كچێك لەسەرەتای رشد(گەشەكردن)ەوە زەواج بكەن ئەو كێشانەی بۆیان دروست دەبێت تەنها كێشەی خۆیان نییە و لەهەموو ڕویەكەوە ناخرێتە سەرشانی خۆیان، هەرچی موسوڵمانە گشتی براو خوشكەو بەیەكەوەن كێشەیەك بۆ هەر خێزانێك دروست ببێت وەك ئەوە وایە كێشەی هەموویان بێت، گشتیان دەستیان بەدەستییەوەیەتی بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی.

بەڵام ئەگەر دیقەت بكەن و سەیرێكی كۆمەڵگەی خۆمان بكەین بەو جۆرە نییە! واتە وانییە كەئەگەر كێشەیەك بۆ خانەوادەیەك دروست ببێت موسوڵمانگەل گشتی دەست بدەنە دەستی بۆ كۆمەك كردنی، ئەصڵەن لەوانەیە هەتا هەندێك هەن زیاتر سەختیو كێشەیان بۆ دروست بكەن! كاتێك كۆمەڵگە ئیسلامی بووایە ئەمە زۆر زۆر كارێكی باش و بەجێگە بوو، كاتێكیش كۆمەڵگە غەیری ئیسلامی بێت،كە كوڕ و كچێك هێشتا تەجروبەی زیندەگییان نییە و تاڵی و سوێرییەكیان نەچەشتووە، كێشەیەك فێرنەبوون و لەناو كۆمەڵگەشدا تەعاون و موحیبەت بەو جۆرەی قورئان دەفەرمێت﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾* وجودی نییە! دیارە زەواج كردن لەسەرەتایی تەمەنی (گەشەكردن)ەوە كارێكی خراپە، چونكە كێشەی زۆر دێت بەسەریاندا لەجیاتی ئەوەی زەواج ئەو سەمەر و بەرهەمەی هەبێت كە

*) ا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحِلُّواْ شَعَآئِرَ اللّهِ وَلاَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلاَ الْهَدْيَ وَلاَ الْقَلآئِدَ وَلا آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَاناً وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ }المائدة٢

ڕشد(گەشەی) كچ و كوڕ زیاد دەكات بەپێچەوانەوە لـە ڕشدیان(گەشەیان) دەخات! دڵیان دەشكێنێت‌و ناتوانایان دەكات و نەشاطیان لێدەسەنێتەوە! چونكە ئەگەر كۆمەڵگە كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی بێت خودی زەواج ڕێگەیەكە بۆ زیادكردنی ڕشدی(گەشەی) كوڕ و كچ، لـەكاتێكدا لـە كۆمەڵگەی غەیر ئیسلامیدا، چونكە تەعاون(كۆمەكی) نییە و كێشە زۆرە بەپێچەوانەوە لـەرشد(گەشەكردن) دەكەون و هەرچی زیاتر بەرەو پێشەوە بچن و لـەژیاندا سەكەوتوو بن بێ‌تەوفیق دەبن! بۆیە ئەمە واقیعیەتێكە كە فەسادی كۆمەڵگە بۆتە هۆكاری دروست بوونی،كە دەبینین لـەناو گەنجاندا بەداخەوە زەواج تەقریبەن فەرامۆش بووە، كوڕێك ناكەوێتەوە بیری زەواجەوە، تاوەكو تەواوی ماڵ و زیندەگی‌و ئیمكانیاتی دانەمەزرا بێت، لـەدوای ئەوەی بەتەواوەتی دامەزرا هیچ كەموكورتییەكیان نەبوو تەنانەت زۆرینە وادەكەن زیادەشیان هەبێت! ئەو كاتە دەكەونە بیری زەواجەوە! ئەمەش مانای شارەزاییانە لـەباروذۆخی كۆمەڵگە. دەزانن ئەم كۆمەڵگە وا پێویست دەكات كەتەقریبەن ناحەقیشیان نییە، بەلاَم ئەگەر بەدوای بەرژەوەندیدا بگەڕێین، ئەمە بەرژەوەندی نییە، ئەمە لـەبەر فەسادی كۆمەڵگەیە خەڵكی ناچارن بەو جۆرە بكەن، ئەگەر كۆمەڵگە فەساد نەبێت بەرژەوەندی ئەوەیە چ كاتێك مەسەلـەی(غەریزەی جنسی) شكۆفە دەكات لـەوجودی ئینساندا هەر ئەو كاتە ئیزدواج بكرێت، چونكە ئەو شكۆفە بوونی غەریزەیە، واتە كاتی ئیزدواجە، هەروەها لـەوكاتەشدا چ كوڕ، چ كچ ڕۆحییەتی تێگەیشتن و شۆخی و تەفریح و لـەگەڵ منداڵدا یاری كردن و شتێك كە منداڵ پێویستیەتی، ئەم جۆرە بابەتانە بۆ زیندەگی پێویستی زۆرتریان

هەیە، تاوەكو ئەو كاتەی تەمەنیان گەورتر دەبێت، تەمەن گەورە بوو ئیتر ئەم ڕۆحییەت و نەشاتە نامێنێت، نێوانێكی زۆر دەكەوێتە نێوان(باوك و دایك) و منداڵەوە، نزیكییان نییە بەیەكەوە و سەرنجی یەكتری ڕاناكێشن. ناتوانن بەیەكەوە لەزەت لەژیان بەرن، بۆیە ئەگەر ئیمكانات هەبێت و بارودۆخ سازگار بێت و پەیوەندی ئیسلامی لەناو خانەوادەدا هەبێت، یان كوڕ و كچانێك هەبن پەیوەندی ئیسلامییان لەگەڵ برا و خوشكانێكی موسوڵماندا هەبێت،كە ئیحساسی تەنیای نەكەن و بزانن كە برا و خوشكانێك موسوڵمان هەن لەناو شار و دێ و كۆمەڵگەكەیاندا و بەدەمیانەوەن و تەنیایان ناخەن و هەرچی زوتر زەواج بكەن باشترە.

بەڵام ئەگەر بزانن ئەو خەصڵەتە جاهیلییەی لەكۆمەڵگەكەماندا ڕەواجی بووەو ئێستاش هەر هەیەو كەس بەكەسەوە نییەو هیچ كەسێك بەدەم كەسەوە نییە دیارە! واباشە كەبەناچاری لەزەواج كردندا خۆیان دوا بخەن تاوەكو كەمێك لە ئموری زیندەگیدا شارەزا دەبن، تاوەكو وایان لێدێت هەر كاتێك كێشەیان بۆ دروست دەبێت پەكیان نەكەوێت ئەمە بەناونیشانی پێویستییەكە كەئەم درەنگ زەواج كردنە دەبێتە كارێكی (موباح)، ئەگەرنا كارێكی ناپەسەندە!

# پێوەرەکانی هەڵبژاردن

بابەتی هەڵبژاردن لە دونیای مرۆڤەکاندا، لەلای هەندێك لە بیریاران بە خاڵی جیاکەرەی نێوان مرۆڤ و مەخلوقەکانی دیکە دەژمێررێت، چونکە ئێمە دەزانین یەکێك لەو نیعمەتە گەورانەی کە پەروەردگار بە مرۆڤەکانی بەخشیوە بریتییە لە بوونی (ئیرادە)، ئیرادەش، واتە من وەك مرۆڤ دەتوانم لە نێوان بکەو مەکەیەکدا یەکیان هەڵبژێرم! کەواتە ئیرادە بەدیوەکەی تریدا دەکاتە توانای مرۆڤەکان لە هەڵبژاردندا، هەر بەتێگەیشتن لەمەش مەسەلەی ئازادی مرۆڤ دێتەگۆڕێ و لەکۆتایدا قسە دەگاتە ئەوەی مرۆڤەکان ئازادن، چونکە ئیرادەیان هەیە، واتە دەتوانن خۆیان کارەکان هەڵبژێرن و ئەنجامی بدەن!

ئەم پێشەکییە کورتە یارمەتی دەردەبێت بۆ هەموو ئەو کەسە تەمەڵانەی تەنانەت ناتوانن بیریش بکەنەوە! وادەزانن مرۆڤ بریتییە لە (ڕۆبۆت)ێك و لە ئاسمانەوە کۆنترۆلکراوەو هیچی لەدەست نایە، لەباسی بابەتی پرۆسەی هاوسەرگیریدا یەکێك لە باتە زۆر گرنگ و بەرچاوەکان بریتییە لە هەڵبژاردن و دیاریکردنی (کچ) لە لایەن (کوڕ)ەوە، هەروەك لەم باسەدا کاك ئەحمەد) ڕونی دەکاتەوە هۆکاری گرنگییەکەی لەبەرئەوەیە پەیوەندی استەخۆی هەیە بە ئایندەی ئەو دوو کەسەوە، لە هەمانکاتدا بنەماشە بۆ روستکردنی شیرازەی خانەوادەیەك، هەرلەبەر ئەمەیە دێت لەمەسەلەی وەری (کوڕ و کچ) بۆ دەسنیشانکردنی یەکتری تەبەقە بەندییەکی گرنگ ،کات، کە دواجار گەورەترین ڕۆڵ دەبینێت لەوەدا کە کوڕان یان کچان انن ئایا ئەو بڕیارەی داویان دروست بووە یان نا. جا (موفتی زادە) وەك




پیشەی هەمیشەی لە سەرەتای ئەم باسەدا دێت بە دەروازەیەك دەستپێدەكات، كە دەكرێت ببێتە پێشەكی بۆ هەموو باسەكانی دوای خۆی، ئەو بۆئەوەی بەرچاو ڕوونی بداتە خوێنەرو فێریان بكات كاتێك بڕیاردەدەن لەسەر بنەمای ئیسلامی زەواج بكەن پێویستە چی بكەن و چی نەكەن، چۆن تەماشایی ئیسلام بكەن، سەرەتایی باسەكە بەم جۆرە دەستپێدەكات:

ئیسلام بەمانای یاسا و سیستەمێكە، كەلە شاراوەترین كاردانەوەی دەروونی ئینسانەوە تا دەگاتە دیارترین كردار و بەرنامە و پەیوەندی ڕێكدەخات، لەناو ئێمەدا شتێكی نەماوە! لەكاتێكدا واقیعیەتی ئیسلام ئەمەیە بەرنامەیەكە بۆ ئینسانییەت كە هیچ بابەتێك لە بابەتی ئینسانی ناهێڵێتەوە كە سیستەمی بۆ دانەنێت و ڕێكینەخات، هیچ بابەتێك ناهێڵێتەوە كەهەروا ئینسان بەرەڵاّ و هەركەسێك بەزەوق و ئارەزووی خۆی چۆنی پێخۆشە بەرەوڕووی بڕوات و ئەنجامی بدات كە ناهەماهەنگیگەل بەرخوردگەل هەر لەبەرەوە و وردە وردە بۆ كۆمەڵگە دروست ببێت. مەوازین و میقیاسی كوللی داناوە بۆ تەواوی بابەتی ئینسان هەر بەو جۆرەی كەوتم لەشاراوەترین كاردانەوەی دەروونی و ویژدانی ئینسان، تاوەكو دیارترین و ئاشكراترین كردار بۆ گشتی یاسا و پێوەری داناوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم یاسا و پێوەرانە گشتی(كوللی)ین، نەزەر و دەركی ئینسان پێویستە كەلەم(یاسا و پێوەرە) كوللییانە موتەناسیب لەگەڵ هەر شەرائیت و بارودۆخ و جەرەیانێك یاسای تایبەتی خۆی لێهەڵجێنێت، ئیجتهاد واتە ئەوە.

ئیجتهاد و تەقلید دوو بابەتن كەهیچ ئینسانێك لەم دووانە بێنیاز نییە، هەر ئینسانێك میقدارێك(تەقلید) حاكمە بەسەر بیركردنەوە و كردار و ڕەفتاریدا،

میقدارێکیشی بە ئیجتهاد کار ئەنجام دەدات. جیاوازی لەسنوری توانایی و دەرك و زانیاری ئینسانگەلدا هەیە ئەوەی وا توانایی و دەرك و زانیاری زۆرتر بێت لەبابەتەكاندا ئیجتهادی زۆرترە و تەقلیدی كەمترە، هەرچییەك دەرك و زانیاری كەم دەكات بەو نیسبەتە بە حوكمی گرنگی ئیجتهاد كەم دەبێتەوە و تەقلید زۆرتر دەبێت. بەهەرحاڵ ئەم پێوەرە ئیسلام وای دانەناوە كە فكری ئینسان قورس بكات و چوارچێوەیەك بۆ تەواوی جوزئییات لەبەرخورد لەگەڵ بێ ژمارە لەبابەتێك كە هەمیشە ڕوودەدەن، چونكە بابەتی ئینسانی لەژمارە نەهاتووە، هەر ڕۆژە و ئینسان چەندین بابەتی بۆ دێتەپێشەوە بۆ دانە دانەی ئەمانە بەرنامەی بۆ دابنێت كەئیتر جێگەی بیركردنەوە نەمێنێت! نا...بۆ تەواوی بابەتی ئینسانی دەستەبەندی دەكات بەشێوەیەكی كوللی پێوەر و یاسای بۆ دادەنێت، جا فلانە ڕوداو كە ئەمڕۆ ڕوودەدات ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ ڕوداوێكی تردا، (من یان تۆ) ئەركمانە كە تەتبیقی بكەین لەگەڵ ئەو پێوەرەدا والە ئیختیارماندایە تابزانین حوكمی بەرخوردمان لەبەرامبەر ئەم ڕوداوەوە، مەوزوعگیریمان لەبەرامبەر ئەم لایەنەوە چۆنەو دەبێت چی بكەین. جائەم ڕوونكردنەوەیەم بۆئەوەدا كەوا تەصەور نەكرێت مەیدانێك بۆ زیهنی ئینسان نەماوەتەوە و هەرچی وشك و قایم دراوەتە دەستی ئینسان.

یەكەم: (ئەگەر بیرێكی وا بكرێتەوە)ئەوە زوڵمە لە ئینسان دەكرێت، خوای گەورە ئینسانی بە زیهن و تواناوە دروست كردووە چۆن بۆ زیندەگی مادی خۆی دەخاتە كارو بەهرەی لێدەبات بۆ زیندەگی مەعنەویش هەربەو جۆرەیە.

دووەم: ئەگەر قەرار بێت بۆ یەكە یەكەی بابەتەكان یاسا و قاڵب دیاری بكرێت دەبێت پڕ هەزار (زوور)كتێب لەئیختیاری بەشەردا قەرار بدرێت كە




هێشتا كافی نابێت! چونكە بابەتەكان سنوردار نین، هەریەكێك لە ئێمە ڕۆژانە (دە تا سەد) بابەتمان بۆ پێش دێت، ئەگەر قەرار بێت بۆ یەكە یەكەی بابەتەكان شت بنوسرێت ئەصڵەن كاغەزیش بەش ناكات! پێوەر و یاساكە بۆ بابەتی ئینسانی بەدەستە بەندییەك كوللی دانراوە لەسەر خۆمانە كە زیهنی خۆمان بخەینە كار لەڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ یەكەیەكەی بابەتەكاندا چۆن ڕەفتار بكەین كە موتەبیق بێت لەگەڵ پێوەرە(عام و كولل)ەكەدا.

جا بەوجودی ئەوەی ئیسلام بەوجۆرە بۆ تەواوی بابەتەكانی(مەسائیلی) ئینسان پێوەر و ئصوڵی داناوە بەو كەیفییەتەوە وتم بەداخەوە! لەكاتێكەوە كە بەڕێوەبردنی ئیسلامی لە كۆمەڵگەدا شێوا وردە وردە هەر لەبەرەوە موسوڵمانگەل لە ئیسلام بێگانەبوون كەلەئێستادا حەقیقەتەن كردار و ڕەفتاری فەردی و گروپی موسوڵمانگەل، ئەخلاقی كۆمەڵایەتی و سیاسییان ئەگەر حساب بكەیت لەوانەیە بێژی(١٪)ی خۆیان بەوە نازانن كە دیقەت بكەنو بزانن ئیسلام چی وتووە بەوشێوەیە ڕەفتاربكەن! بۆ نمونە بابەتی(شایی و شیوەن) كەسێك كە زەماوەند دەكات (چ كوڕ، چ كچ)هەرچەند هەردووكیان موسوڵمانن ئەمە لەزیهنیاندا ئامادەیی نییە كە بیربكەنەوە و بزانن ئیسلام لەوبوارەدا چی وتووە، چ دەستور و بەرنامەیەكی هەیە تاوەكو تبقی ئەوە ڕەفتاربكەن!

شیوەنێك ڕوودەدات و خانەوادەیەك عەزیزێكیان لەدەست دەدەن بیرناكەنەوە بزانن یاسا و بەرنامەی ئیسلام بۆ بەرخورد لەگەڵ ڕووداوێكی بەوجۆرەدا چۆنە و دەبێت چی بكەن. یەك نەفەر لە پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیەكیدا بیر لەوەناكاتەوە كە قییەم و ئصوڵ و پێوەر بۆئەم پەیوەنییە چییە و مەكتەبەكەی

چی وتووە و دەبێت چۆن ڕەفتار بكات! هەروا بابەتە سیاسیەكانیش كەسێك كەچالاكی سیاسی هەیە یان گروپێك كەچالاكی سیاسییان هەیە هەرچەند موسوڵمانیش بێت لەچالاكییە سیاسییەكەی خۆیدا بیر لەوەناكاتەوە بزانێت ئیسلام لەم بوارەدا چ ڕێنماییەكی پێداوە لەكاتی ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ كەس و گروپێكی تردا چ موسوڵمان، چ غەیر موسوڵمان، چی یاسا و بەرنامەیەكی داناوە كە تبقی ئەو یاسا و بەرنامەیە ڕەفتاربكات. تەقریبەن ئەمانە لەناو خەڵكیدا مەترەح نییە! ئەو كەسە یان ئەو گروپە سیاسییە لەئەزموونی سیاسی خۆی سود وەردەگرێت لەبارەی سیاسەتەوە چی فێربووە لەوە بەهرە وەردەگرێت بۆ مەوزوعگیری لەبەرامبەر فلأنە جەرەیان، یان فلأنە كەس و گروپەوە جائێمەش ئەزموونی سیاسییمان لەچییەوە بەدەستهێناوە ئەگەر واز لەپێوەری ئیسلامی بهێنین؟ دیارە لەسیاسەتگەلی حاكم بەسەر دونیای ئەم ڕۆژەدا كە گشتی یان دژی ئیسلامییە، یان ئەگەر دژی ئیسلامی نەبێت بەلایەنی كەمەوە غەیری ئیسلامییە! واتە ئەگەر دژی ئیسلام دروست مەوزرعگیری نەكات ئەوەندە هەیە كەموافیقی ئیسلامیش كارناكات، جا ئەمە بەلایەنی كەمەوە! سیاسەتی حاكم لەدونیای ئەمڕۆدا سیاسەتگەلێكە بەلایەنی كەمەوە غەیرە ئیسلامین كەسێكی موسوڵمان یان گروپێكی ئیسلامی لەو ئەزمونە سیاسیگەلەی وابەدەستی هێناوە لەم سیاسەتگەلە غەیرە ئیسلامییە سودوەردەگرێت كە چ جۆرە ڕەفتارێكی هەبێت لەبەرامبەر فلأنە ڕوداو و جەرەیانەوە، فلأنە كەس و گروپەوە. تەواوی بابەتەكانمان ئابەم شێوەیە ازهنی خۆمان دەخەینە كارو بەو ئەزمونانەی واهەمانە سودوەربگرین و یاسا و بەرنامە بۆ خۆمان دیاری بكەین بۆئەم كارە وا ئەنجامی دەدەین یان بۆ

مەوزوعگیریمان لەبەرامبەر فلانە بابەتەوە وەك ئەوەی لە زهنماندا شتێك بەو جۆرە نەبێت کەوامان لێبکات بیربکەینەوە و بزانین خۆمان دەدەینە پاڵ مەکتەبێك، ئێژین تابیعی مەکتەبی غەیر ئیسلامین، بیربکەینەوە و بزانین ئەم مەکتەبەی ئێمە بۆ ئەم بابەتە شتێکی هەیە؟ هیچ ڕێنماییەکی پێداوین؟ بەرنامەیەکی بۆ داناوین؟ بزانین ئەو بەرنامەیە چییە وەك ئەوە ڕەفتار بکەین. ئەصڵەن بەجۆرێك ڕەفتار بکەین هەروەك ئەوەی پرسیارگەلێکی بەوجۆرە نەیەت بە زیهنماندا. لە هیچ کام لەبابەتەکانماندا واناکەین جا مەسەلەی (شایی و شیوەن) دوو بابەتی گەورەن لەم بابەتانە. بەڕاستی( لەوانەیە! بەبێ موبالەغە ئەگەر لەساڵێکدا سەد جار زەماوەند لە دێیەکدا،لەشارێکدا هەبێت ورد لێبکۆڵیتەوەو بەدواداچوونی بۆ بکەیتو بزانیت لەم (سەدجار)ەدا (یەکجار) بووە کەبیربکاتەوە یاسای ئیسلام لەبارەی زەماوەندەوە چۆنە و تبقی ئەوە ڕەفتار بکات، لەکۆتایدا وەلأمێکی نێگەتیڤت دەستبکەوێت!). تەنها (یەك)جاریش شتی واڕووی نەدابێت کەبڕۆن یاسا و پێوەری ئیسلام بدۆزنەوە و تبقی ئەوە ڕەفتاربکەن، دەی چەنێك مایەی داخ و حەسرەتە، کەئینسانێك خۆی بەمەکتەبێك حساب بکات یان بەلایەنی کەمەوە ئەمەی لادروست نەبێت بزانێت مەکتەبەکەی ئالەم بوارەدا شتێکی وتووە یان نەیوتووە، ئەگەر نەیوتووە باشە بکەوێتە شوێن بیرکردنەوەی خۆی یان بکەوێتە شوێن(عورفی کۆمەڵگە)، بەلأم ئەگەر وتویەتی و تۆش خۆت بەکەسێکی سەربەو مەکتەبە حساب دەکەیت ئەرکت ئەوەیە شوێنی بکەویت.

چەنێك عەیبە، چەنێك دورە لە لۆژیکی سالمی ئینسانی کەکەسێك خۆی بەئەندامی مەکتەبێك حساب بکات، بەلأم گەرەکی نەبێت کردار و ڕەفتاری

خۆی تبقی پێوەر و بەرنامەی ئەو مەكتەبەی خۆی ئەنجام بدات؟ چ خۆدانەپاڵێكی درۆ و ناڕەوایە؟! لەولاشەوە چەنێك خۆشترە كە ئینسانێك كاتێك موقەیەدی پێوەری مەكتەبێك نییە خۆی نەداتە پاڵ ئەو مەكتەبە. یەكێك لەگرفتارییەكانی عەوامیلی ئینحراف بۆ گەنجەكانی كۆمەڵگەی ئێمە ئەمەیە كە ئێمە ئێژین موسوڵمانین، ئێژین كردار و ڕەفتارمان ئیسلامییە، فلاْنە(گەنج) كە زهنی ئەشكۆفێتەوە، بیری دەكرێتەوە، كردار و ڕەفتاری ئێمە دەبینێت، چونكە ئێمە ئێژین موسوڵمانین ئیتر وادەرك دەكات كەئیسلام ئەمەی وتووە وائێمە خەریكین ئەنجامی دەدەین ئیسلام لەپای قسە و ڕەفتارەكەی ئێمەدا دەناسێت! چونكە ئەصڵ ئەوەیە كەكاتێك ئێمە ئێژین موسوڵمانین، واتە ئەوەی وائەنجامی دەدەین لەئیسلامەوە فێربووین، دەستور و بەرنامەكانمان لەئیسلامەوە وەرگرتووە و ئەنجامی دەدەین، بۆیە فلاْنە گەنج حەقییەتی بەتەناسوبی ئیدیعایەك كە دەیكەین لەبارەی ئیسلامەوە بەكردار و ڕەفتاری ئێمە قەزاوەت بكات. دەی جا ئیسلام ئائەمە بێت وائێمە ئێژینی و ڕەفتاری پێدەكەین حەقییەتی لەئیسلام موتەنەفیر ببێت، چونكە بەڕاستی ئەوە لەناوماندا بلاْوە و ئێژینی و ئەنجامی دەدەین نابار و ناپەسەندە و لۆژیكی سالمی ئەو گەنجە كەهێشتا ئالودە نەبووە موتەوەجیە دەبێت كە خراپە و زەرەری هەیە و نادروستە، دەی لەولاشەوە ئێمە كاتێك خۆمان بە موسوڵمان دادەنێین ئاسایە واتێدەگات كەئەمانە وائێمە ئەنجامی دەدەین لەئیسلامەوەیە خۆ لەئیسلامیش شارەزا نییە و نازانێ ئیسلام شتێكە و ئەوانەی وائێمە ئەنجامی دەدەین شتێكی ترە و موخالیفە لەگەڵ ئیسلامدا. تا لەبەرئەوە موتەوەفیر دەبێت لەئیسلام، ئەگەر وابێت ئەوە ئێمە خۆمانین بەكردار و ڕەفتارمان



گەنجەكان لەئیسلام دور دەخەینەوە! چونكە كارگەل و شتگەلێك دەكەین كەبەناوی ئیسلامەوەیە(چونكە خۆمان ناو دەنێین موسوڵمان)، بەڵام حەقیقەتەن خوێن تاڵ و نادروستە و كەسیفە و مایەی تەئەسورە كە ئینسان دووچاری دژایەتییەك بەو جۆرە ببێت یان مەوجودێك بێت پڕ ئیدعای بێ تەعەهود. دژایەتییەكە ئەمە خۆی بە موسوڵمان بناسێنێت كەچی ڕووبەڕووبونەوە و كردار و ئاداب و ڕەوشتی موخالیف(پێچەوانە)ی ئیسلام بێت. ئەمە دژایەتییەكە زۆر ئاشكرا و ڕۆشن، هەروەها لایەنی تری خراپی ئەم دژایەتی و ئیزدواجی شەخصییەتە زۆر زۆرە كەئیتر پێویست ناكات گشتی باس بكەین. خۆزگە، خەڵكی ئەوەندە شەهامەتیان هەبوایە، ئەوەندە سەریح بونایە، نەیان وتایە ئێمە موسوڵمانین! ڕایانبگەیاندایە موسوڵمان نین یان كاتێك ئێژن موسوڵمانین بەقسەكەی خۆیان ڕازی بن، هەروا سەرسەریو بێمەعنا نەبێت، مەفهومی (محتەوا)پەیدابكات، قسەیەكی سەنگین بكات، كاتێك ئێژێ موسوڵمانم بزانێ مەكتەبەكەی كە ئیسلامە لەبواری هەر بابەتێكدا هەرچییەكی وتوە تبقی ئەوە ڕەفتار بكات. جا ئێستا باسەیری ئەم بابەتی (زەماوەندە) بكەین، بزانین حەقیقەتەن تبقی ئیسلامە یان نەخێر؟ بابەتی زۆر زۆر مەترەحە لەم بوارەدا كەلەوانەیە ئەوەشی وادێت بەزهنماندا نەكرێت لە دانیشتنێكدا باسی بكەم، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوانەی وا گرنگە دەیانڵێم. یەكەمین بابەت لە بابەتی(زەماوەند) لە ئیسلامدا لەبابەتی(تەناسوب لەنێوان كوڕ و كچ)دا، نوكتەیەكی زۆر زۆر ورد و گەورە هەیە لەم بوارەدا(تەناسوب)،یان لەبواری (كەفائەت)دا، كە وشەی(كەفائەت) لە زمانی فارسی و كوردیدا زۆر بەكاوناهێنرێت، بەڵكو تەناسوب زۆرتر بەكاردەهێنرێت، كە عەجیب بابەتێكی ورد و دەقیقە!

ئینسان دوو لایەنی تێدایە، لایەنێكی(جسمی) و لایەنێكی(ڕۆحی)، یان لایەنی(مادی و مەعنەوی). ڕێنمای ئیسلام لەم دوو لایەنەدا دروست موخالیفی یەكترن، زۆر بەسادەیی ئێژمی. لەڕووی(جسمیی)ەوە دەستوری ئەمەیە تاوەكو دەكرێت لەڕووی نزیكایەتییەوە دورتر بن لەیەك، بۆ نمونە(برا و خوشك)حەرامە، هەتا دەكرێت خزمی نزیكیش كەمتر زەواج بكەن بەیەكەوە، تا دورتر بن باشترە. مەسەلەن لە دوو نەژاد لە دوو تائیفە كە لەلایەنی تایبەتمەندییەكەوە كە تەركیبی جسمانی ئەمانە دروست دەكات تا دورتر بن بۆ یەكتری باشترە، لە ئێستاشدا هەندێك لە لێكۆڵینەوەی زانستییەوە ئەمە ڕوون بوەوە كە چ حیكمەتێكی گەورەی تێدایە!{واتە، لە ڕووی زانستییەوە ئەوە دەركەوتووە ئەو كوڕ و كچانەی خزمی یەكن و پێكەوە زەواج دەكەن دواتر كە منداڵیان دەبێت دەبینیت منداڵەكەیان لە ڕووی جەستەییەوە ناتەواو!}.

بەڵام لەڕووی (مەعنەوییەوە) لەڕووی ڕۆحی و دەرونییەوە كە حەقیقەتی ئەرزشی ئینسانی ئالەم بەشەدایە، تاوەكو نزیكتربن لەیەكەوە فەوقەلعادە عەجیبە! لەڕووی مادییەوە تاوەكو دورتربن باشترە، لە ڕووی مەعنەویشەوە تاوەكو نزیكتر بن باشترە. جائەمەی لەڕووی مەعنەوییەوە تا نزیكتر بن باشترە مەیدانێكی زۆر فراوان و گەورەی هەیە، سەدەها بابەت بۆ ئینسان مەترەحە، لە عەقیدەی، لە فكری، لە تایبەتمەندی ئەخلاقی، لە كردار و ئارەزووگەلی، لەزەوق و سەلیقەی لەم بوارەدا بەبێ ژمارە بابەت مەترەحە. لێرەدا ئێمە مەسەلەن گریمانەی ئەوە دادەنێین كە مەسائیلی (مەعنەوی) ئینسان دەكەینە (سەد) بەشەوە، هەتا بكرێت لەم(سەد) فەقەرەدا (ژن و شو) زیاتر لەیەك

بچن و تەناسوبیان زیاتر بێت، جائەم ڕوونكردنەوەیەش بدەم، (مەسەلەن گریمانەی ئەوە دادەنێین كە(سەد) مەسەلە هەیە لە مەسائیلی مەعنەوی لە پەیوەندی دوو ئینساندا، ئەمانە گشتی هاو ئەرزش نین، هەمانە یەك مەسەلە ئەرزشی مەسەلەن دەیەها مەسەلە لەمەسائیلی تری هەیە، بۆیە ئەمە مەسائیلانە ڕیزبەندی دەكرێن هەندێكیان گاریگەری دیاریكراوترە لەهەندێكی تری، هەندێكی ئەوەندە گرنگە كە زۆرێك لە ئەوانی تر لەژێرەوەی ئەمەوەیە. بۆ نمونە مەسائیلی پەیوەست بە (سەلیقەوە) مەسائیلی پەیوەست بە(زەوق) ئەمانە كەلە بابەتانێكن كە پەیوەستن بەحاڵەتی دەرونی ئینسانەوە، لایەنی(مەعنەوییەوە) ئەمە بەدەر لەوەی كە دەكرێت ئەنجامەكەی لەدەرەوە حاڵەتێكی مادی پەیدابكات بە ئیعتباری تەعەلوقی بە ویژدانی ئینسانەوە خەصڵەتێكە (مەعنەوی). ئەمە جۆرێك لەو مەسەلانە، بەشێكی تر لەو سەد مەسەلە بریتییە لە(عەقیدە)، واتە (جیهانبینی)(شناختی نیسبەت بە هەستی) هەستی چۆن دەناسێت؟ ئەم مەسەلەی جیهانبینییە، لەناو سەد بەش لە مەسائیلەكاندا لەڕووی گرنگییەوە لە بانزینیانە، گرنگترین مەسەلەیەكە كەلە( نێوان كوڕ و كچ)دا دەبێت تێگەیشتنی كەفائەت لەسەری حاصڵ ببێت، بەڵام ئەو مەسائیلەی لە پێشەوە باسمكرد(لە زەوق و سەلیقە) ئەم حەز لەڕەنگێك دەكات، ئەو حەز لە ڕەنگێكی تر، ئەم حەز لە جلێك دەكات، ئەو حەز لە جلێكی تر، (كوڕ)حەز لەجۆرێك ماڵ دەكات، (كچ)حەز لەجۆرێك ماڵ دەكات، یان نەخێر مەسائیلی (سەلیقە) ئەم حەز دەكات بەرنامە بەو جۆرە ئیجرا بكات، ئەو حەز دەكات بەجۆرێكی تر، ئەمانە گشتی لەو سەد مەسەلانە گرنگن، بەڵام دەیەها مەسەلە لە مەسائیلی(زەوق و

سەلیقە) ئیختلافی تێدا بێت وەك ئەوە نییە لەمەسائیلی جیهانبینیدا ئیختلاف هەبێت.

مەسائیلی جیهانبینی لەئیسلامدا تەبەقەبەندی کراوە ئەوەی وا کوللی تر و ئەساسی ترە ئەوە ناوی نراوە(ئصول). (ئصوڵی عەقائید):واتە پایەکانی تەرزی تەفەکوری عالی ئینسان، جیهانبینی فراوان و گەورەی ئینسان، وەکو ئەوەی ئایا هەستی بەم نەزم و بەرنامەوە کەهەیەتی کەکەمترین لایەنی هەڕەمەکی و بێنەزمی تێدانییە، هیچ شتێکی بێ قاعیدە نییە و هەرچی شتی هەیە خاوەنی ئصوڵ و پێوەری سابت و موسەلەمە کە دەکرێت ئینسان پەی پێببات و بەشێوەی ئصوڵی سابتی عیلمی قبوڵی بکات هەروا لەخۆیەوە و بەبێ ئیرادە و شعور و ئاگاهییەك حاکم دروست بووە و تەسەسولی پەیوەندی(عیللەت و مەعلولییەت) گەشتۆتە ئەمە واهەیە؟ یان نەخێر ئیرادەیەك حاکمە بەسەر ئەم هەستییەدا. ئەمە مەسەلەن دوو جۆر جیهانبینی ئصوڵی و بنیادییە ئەگەر ئالەم دووانەدا جیاوازییان هەبێت لەدەیەها مەسئەلە لەمەسائیلی تردا تەوافوقیان هەبێت هێشتا بەیەك گەیشتنی ئەم (کوڕ و کچ)ە موەفەق نابێت! بەڵام ئەگەر ئالەم مەسەلەدا(جیهانبینی) تەوافوقیان هەبێت لەدەیەها مەسەلە لەمەسائیلی پەیوەست بەزەوق و سەلیقە ئیختلاف(جیاوازییان) هەبێت مومکینە کاریگەری زۆری نەبێت ئەمە لەبەرچاو بگرن هەتا وەکو بکرێت لە(سەد) مەسەلەکەدا تەوافوقیان هەبێت.

جازۆر کەم هەڵدەکەوێت لەتەواوی ئەم سەد بەشەی دیاریمان کرد لەمەسائیلی مەعنەوی ئینسان لەنێوان کوڕ و کچێکدا تەوافوق هەبێت. جاکاتێك دەزانین ئەمە ناکرێت لەهەموویاندا تەوافوقیان هەبێت ئەو کاتە

تەبەقە بەندی دەکەین کامیان لەهەموویان گرنگترە کە تەوافوقی تێدابێت، کامیان کەمتر گرنگترە. مەسائیلێکی بەم جۆرە، وەك ناسینی هەستی، وەك جیهانبینی ئەساسی و گرنگ(واتە مەسائیلی ئەساسی و گرنگ لەجیهانبینیدا) ئەمانە لەزیندەگیدا نەقشیان زۆرترە، کاریگەری زۆرتریان هەیە لەتێگەیشتن یان تێنەگەیشتنی بابەتێکدا، کەئەگەر جیهانبینییەکەیان وەك یەکتر بوو کاریگەری دەکاتە سەر تێگەشتنەکەیان، ئەگەر وەك یەکیش نەبوو دەبێتە هۆکاری لەیەکتری تێنەگەشتنیان، ئەمە لەکاتێکدا مەسائیلەکانی تریش کاریگەریان هەیە، بەڵام ئەو کاریگەرییە لەچاو کاریگەری جیهانبینییەکەدا کەمترە. تەرزی تەفەکور دەربارەی مەسائیلی فەرعی کۆمەڵگە ئەگەر جیاوازی تێدابوو هەر کاریگەری دەبێت و دەبێتە هۆکاری لەیەك نەگەیشتن، بەڵام نەك بەئەندازەی جیاوازی لە(هەدەف)دا، ئەگەر ئەم دوو ئینسانە(هەدەف)یان لەزیندەگیدا فەرقی هەبوو ئەمە زۆرتر دەبێتە هۆکاری لەیەك نەگەیشتن، تاوەکو ئەوەی ئەگەر لەمەسائیلی فەرعیدا جیاوازبن، مومکینە لە سەد مەسەلەدا تەرزی تەفەکوریان جیاوازی هەبێت، بەڵام نەقشی نەبێت لە شێواندنی پەیوەندی ئەم دووانەدا بەمەرجێك کە هەدەفیان وەك یەك بێت. جا هەموو بابەتەکان هەر بەم شێوەن، بۆیە بەسادەی ئێژم لەسەرەتای(زەواج)ەوە بیربکەنەوە، ئایا هیچ گرنگی دەدرێت بەئەم دوو لایەنە(مادی و مەعنەوی)یە. (جگە لەهەندێك نمونە مەحرەمگەلی موسەڵەم بەیەکەوە زەواج ناکەن، ئەوەندەیان دەرك کردووە ئەم کارە ناکەن)، بۆیە لەباقی لایەنەکانی ترەوە گرنگی بەمە نادرێت هەتا زاناکانیشمان کاتێك زەواج دەکەن بیردەکەنەوە تابزانن ئەم مەکتەبەکە ئێمە خۆمان بەیەکێك




لەپەیڕەوانی دەزانین چی ڕێنماییەكی داوە بەئێمە؟ بەداخەوە لەسەرەتاوە كەدەست پێدەكەن بەبێ ئەوەی واهەست بكەن پەیوەندییەكیان هەیە لەگەڵ مەكتەبێكدا دەست بەكار دەكەن وەك عورفی كۆمەڵگە.

## ڕێوڕەسمی داواكردن و مارەیی

لێرەدا (موفتی زادە) دێت قسە لەسەر مەسەلەی داواكردنی كچان دەكات، لە پاشانیشدا دەربارەی ناشیرینترین دیاردە قسە دەكات كە تا ئێستاش لە هەندێك ناوچەدا كاری پێدەكەن و بەداخەوە زۆرێك لە ئەنجامی ناحاڵیان لە دین بە دەستكەوتێكی دینی دەزانن، ئەویش بابەتی (شیربایی)ە، لە دواتردا پەیوەندی (مارەی و درۆ) دەبەستێت بەیەكەوەو بە خاڵی لاوازكردنی و سەرەتایەكی ترسناكی خانەوادەی وەصفدەكات، ئەو دێت بەو دیدە قوڵە ئیسلامییەوە دەست بەباسدەكات، كە هەرتاكێك لەبەرامبەر دروستكردنی كۆمەڵگەو خانەوادەیەكی تازە دروستبووەوە بە بەرپرس دەزانێت، موفتی زادە بەو بیرە فراوانە باس لە دیندەكات كە ڕۆڵی هیچ تاكێكی ناو كۆمەڵگە پەراوێز ناخات و هەمووی وا فێردەكات كەبەرامبەر بەوانی دیكەو خۆبەختكردنیان بەرپرسن، بۆیە دێت ئەو باسە دەوروژێنێتەوە كە لە ئێستادا بە گوێچكە و زهینی زۆربەی زۆری موسوڵمانا غەریبە! ئەویش داواكردنی كوڕ بۆ كچ، كە ئەمیش بەیەك قاعیدەوە دەبەستێتەوە كە بریتییە لە (جیاوازی مەكە لە نێوان كوڕ و كچەكەتدا)، بۆیە دەڵێت"ئایا (دایكان و باوكان)بیردەكەنەوە بزانن ئەم داواكارییە چۆن دەست پێبكەن؟ چۆن باسی لەبارەوە بكەن؟ ئەصڵەن بیر





لەشتی واناکەنەوە! لەکاتێکدا ئیسلام لەم مەجالەدا ڕێنمایی هەیە و بەرنامە پیشان دەدات کە(خێڵی زاوا)چی بکەن.

یەکەمین ڕێنمایی و بەرنامەی ئەوەیە کەجیاوازی مەکە لەنێوان(کوڕ و کچ)دا! ئەگەر کوڕێکی باش شك دەبەیت کەتبقی ئەو پێوەرانەی وا مەکتەبەکەت وتویەتی و تەناسوبی هەیە بۆ کچەکەت تۆ بچۆرە(داواکاری).

ئایا تاوەکو ئێستا کۆمەڵگەی ئێمە لەبەر عورفێکی تەبەقاتی کەهەیەتی ئەمەی دەرك کردووە کە مومکینە (کچ) بچێتە داوای(کوڕ) کە دەکرێت(باوکی کچ) بچێتە(داوای زاوا)؟

وەڵامەکەی دیارە کە نەخێر! دەی لەکاتێکدا لەئیسلامدا بەرنامەی عەمەلیمان بۆ دانراوە کارێکی ئاوابکەین، کەئەگەر کوڕێك خاسییەت و تەناسوبی هەیە لەگەڵ کچەکەتدا و زەواجی ئەمانە بەیەکەوە دەبێتە مایەی سەعادەت بۆ یەك، مومکینە خێڵی کوڕەکە زهنیان پێی نەشکێت و موتەوەجیه نەبن، تۆ(باوکی کچ) دەستپێشخەری بکە، چونکەئەمە خێرە، ئەمە سەعادەتە خانەوادەیەکی موەفەق دروست دەبێت، هەرکەسێك دەستپێشخەرییەك بکات کە نییەتێکی خێری هەبێت عیبادەتێکی کردووە، ئەگەر ئەوان ئاگایان لەمە نییە تۆ ئاگادارییان بکەرەوە و پێیان بێژە، لەپاشانیشدا کاتێك داواکاری دەست پێدەکات چی دەوترێت؟ میقدارێك تەشریفات و میقدارێك ڕەد و بەدلکردنی ئەلفازی بێ محتەوا! تەعاروفاتی هیچ و پوچ، وەك ئەوەی دووکەس بەیەك دەگەن دەست دەکەن بەقسەی بێ مانا"قوربانت بم، نۆکەرتم، شاگردتم" ئالەم کەلیماتە درۆ و بێ ئەساس و پوچانە، کەهیچ نابەخشێتە ئینسانو هیچ ئەساسێکی لە ویژدانی ئینساندا نییە جگە لەکارێکی هیچ و پوچ نەبێت!

(داواکاری)دەست پێدەکات بەهەندێك لەم کارە پوچانەوە، لەپاشاندا سەیردەکەیت یەك بابەتی تەواو نەنگین‌و ڕسواکەر دێتە پێشەوە، ئەویش (شیروای)، یان(شیربای)، یان بەفارسییەکەی(شیر بە ئاب)! واتە (نرخی شیر)! ئەمە مانای چییە؟! مانای ئەوەیە بە سەلامەتی(دایك و باوك)ئێژن، چونکە ئێمە زەحمەتمان کێشاوە و کچمان پەروەردە کردووە لەبەرامبەر ئەمەوە دەبێت نرخی ئەو زەحمەتە وا کێشاومانە بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکەمان لەتۆی (زاوا)ی بستێنین! دەی دوو مەوجود تەرزی تەفەکوریان ئاوا بێت کەی لایەقی ئەوەن بەخۆیان بێژن دایك و باوك؟! ئایا حەیوانات،کە باوك و دایکن منداڵ پەروەردە دەکەن ئەوەندە پەستن لەبەرامبەر ئەمەوە منداڵیان پەروەردە کردووە کاتێك منداڵیان دەڕوات و خانەوادە بونیاد دەنێت، بێژن حەقی زەحمەتی ئەو ماوەمان دەوێتەوە؟ بۆ نمونە(کۆتر) زیندەگی زۆر ڕۆشنە بۆ هەمووومان، کاتێك دایك و باوکێك جوجەڵـ ـیـ ـن پەرەوازەدەکەن(دەفڕێت) و دەڕوات زەواج دەکات لەگەڵ کۆترێکی نێردا، ئەم دایك و باوکە (کۆترە) داوای ئەوە دەکەن لەو کۆترە نێرە تازە کەزەواج دەکات لەگەڵ کچەکەیاندا، ئێمە زەحمەتمان کێشا، چووین بە(دەنوك) دانە دانە (دان)مان هێنا و کردمان بە قورگی ئەم کچەدا تاگەورە بوو، بۆیە بێنە حەقی زەحمەتەکەمان؟ هیچ حەیوانێك پەستی واناکات. دەی تۆخوا عەیب نییە ئینسان ئەوەندە پەست بێت منداڵی خۆی پەروەردە بکات لەبەرامبەرەوە لەسەنگەردا دابنیشێت، بەڵکو گەنجێکی کلۆڵی لێ قەوماو بێتە داوای کچەکەی و یەکسەر بێژێ ئادەی فرسەتە حەقی خۆمی لێ وەربگرمەوە جلم بۆ کردووە و نانم داوەتێ! هەی بەزیاد نەبێت(نان و جلێك)بەو جۆرە و لەلایەن دایك و




باوكێكەوە بەئاوا بیركردنەوەیەكەوە دراوە بە كچ! بەزیاد نەبێت كە پەیوەندی دایك و باوكێك لەگەڵ كچەكەیاندا بەو جۆرە بێت!

داخەكەم! ئەوەندە دورین لە موسوڵمانی، كە مەفهومی دایك و باوكی ئەوەندە پەست بووە لەناوماندا، ئەوەندە هاتۆتە خوارەوە لە مەفهومی باوك و دایكی حەیوانات فرە فرە پەستر و هیچتر بووە!! یەكەمین بابەتێكە كەمەترەح دەبێت لەدوای(داواكاری) بابەتی(شیربای)یە! ئەمە دووبابەت كەدژی ئیسلامە. لەپاشانیشدا واوەیلا! بابەت و مەسەلەی (مارەی) دێتە پێشەوە لەم بارەیەوە شتی زۆرم بیستووە. كەلەباسی (مارەییدا) چییان كردووە و چیان وتووە! هەتا ئەوانەی كە دەبێت ڕێنمایكەری خەڵكی بن ئاگادارم چی دەڵێن لەم بارەیەوە و چەنێك هەڵەو ناشارەزایانە قسەدەكەن! چەنێك بێ بەرپرسیارانە شوێن زەوق و دەرك و سەلیقەی خەڵكی كەوتن و قسەدەكەن! هەتا ئەوانەی كەئەركیانە پێوەرەكانی دین بەیان بكەن بۆ خەڵكی و بەناوی زانای دینی دەناسرێن ئەوانیش هەروەك خەڵكەكە حەقیقەتەن هەوڵنادەن بزانن دین چی وتووە، بەڵكو دەكەونە شوێنی ئەوەی بزانن(عورف)چی وتووە! داوای(مارەیگەلێك) كەهیچ كات جێگەی قبوڵ نییە بۆئەو دووانەی وا داواكاری دەكات نیوەی ئەو مارەییە، سێیەك و چواریەك هەتا پێنج یەكی ئەو مارەییە ئەگەر تەواوی كەلوپەلی زیندەگی خۆی بخاتە سەریەك و بیفرۆشێت ناتوانێت دابینی بكات! فلانە گەنج كە بۆ نمونە كاسبكارێكە سەرمایەكەی گریمان(٤٠-٥٠هەزار تمەنە) یان كارمەندێكە یان كاربەرێكە كە موچەكەی(٢٠هەزار تمەنە)دەڕواتە داوای كچێك داوای مارەیی (١٠٠-١٥٠هەزار تمەن)دەكەن بەداخەوە! بێئەوەی ئیحساسی مەسئولییەت

بكرێت كەسانێك دەفتەری (زەواج و تەلاقیان) هەیە و بەناوی زانای دینی تەعین دەكرێن بێئەوەی ورد ببنەوە دێن(عەقدی زەواجی)نێوان ئەم كوڕ و كچە لەسەر مارەییەك بەوجۆرە دەبەستن! دەی جا ئا ئەمە دروستە؟!

زۆرتان شتێكی سادە دەربارەی مارەی ئاگادارن دەوترێت"هەر كاتێك ئەم كچە داوای ئەم مارەییە بكات ئەم كوڕە حازرە فەورەن و نەقدەن بەبێ هیچ بەهانە و تەعەلوقێك تەقدیمی بكات"، ئەمەش شەرتی مارەییە، مارەی یان دەبێت نەقد بێت و بدرێت یان ئەگەر نەقد نادرێت دەبێت حەقیقەتەن هەر ئەو كاتەش دوای ئەوەی عەقدەكە بەسترا، كچەكە بێژێ مارەییەكەم، كوڕەكە بێژێ هانێ. دەبێ ئاوابێت جالەم مارەییەدا كە ئێستا لەولاتی خۆماندا باوە لەسەد بەشدا بەشێكی واهەیە، كەهەر كاتێك كچەكە داوای بكات كوڕەكە سەهل و ئاسان بتوانێ فەورەن تەقدیمی بكات؟! باوەڕ بكەن لە سەد دانەدا دانەیەكی نییە بەو جۆرەی كەمن خەبەرم هەیە، دەی جا دیقەت بدەن بنەڕەتی خانەوادە لەسەر(درۆ)دادەنرێت! درۆكەش ئەمەیە كەئەم كوڕە ئێژێ"تەعەهود دەكەم هەر كاتێك تۆ داوای مارەیت كرد بێ بڕوبیانوو و ماتڵ بوون فەورەن تەقدیمی بكەم". دەی هەرلەو كاتەشدا خۆیشی دەزانێت(درۆ) دەكات و ناتوانێت، خانەوادەی خزمانیش دەزانن درۆ دەكات، هەموو لایەك لەوكاتەدا دڵخۆشن بە(درۆ)، لەهەمان كاتدا بینای زیندەگی یەك خانەوادەی تازە لەسەر(درۆ)دادەمەزرێنن! ئائەمە عەجیبە(مارەیی)یان هەرشتێك لە(كوڕ) دەسەنرێت یەكسەر بۆ كچ حەلاڵە، خانەوادەی (كچ)ئەگەر گەرەكیان بێت(قەرانێك)سود لەزاوا بكەن فەوقەلعادە كارێكی پەست و ئەنانییە، كەلەباسی( شیربای) دا وتمان! حەقی زەحمەت و ئەركێك كەباوك و دایك

توشیان بووە بەهۆی پەروەردە كردنی منداڵەكانیانەوە كە حەیوانات بەبێ منەت ئەنجامی دەدەن ئەمان دەیانەوێت لێی بسێنن، زۆر دەنائەتە! لەپاشانیشدا مەسەلەی مارەی كەئەوان وەریناگرن و بەكچ پەیوەستە، ئصوڵەن پەیوەندی بەئەوانەوە نییە و لەئیختیاری خودی كچدایە، كچێك كە رشد(گەشە) و فەهمی هەبێت، ئەوە هیچ كەئەركی باوكە یان ئەركی محكەمەیە كە تبقی مصڵەحەتی كچەكە ڕەفتار بكەن، بەڵام نەك هەر بنەڕەت لەسەر درۆ و دەلەسە دانان، ئەوەنا!

جائەمە چەنێك كلۆڵییە بۆ كۆمەڵگەی ئێمە كە بنەڕەتی خانەوادەیەك دادەنرێت زاهیرەن تبقی بەرنامەی ئیسلامی، چونكە دێن وەك ئەوەی سیغەی عەقدی ئیسلامی ئەنجام بدەن،{وافەرز دەكەین لەكاتێكدا سیغەی عەقدی ئیسلامی ئەوە نییە بەخەیاڵی خۆیان سیغەی عەقدی ئیسلامی ئەنجام دەدەن}، واتە تبقی پێوەر و یاسای ئیسلام ئەم(كوڕ و كچ)ە خانەوادە دروست دەكەن و دەبنە(ژن و شو)، بەڵام كەچی جوزئییاتی مەسئەلەیەك كەمەترەحە لەنێوان ئەم دووانەدا بەڕەسی بكە (لێی بكۆڵەوە) بزانە كامیان تبقی ئیسلامە؟ ئەوە شیربابییەكە كەباسمان كرد، لەپاشانیشدا ئەمە مەسەلەی( مارەی)یەكە. چەنێك زەنەندەیە بەناوی ئیسلامەوە كوڕ و كچێك بكەونە یەكو زیندەگییەك هاوبەش دەست پێبكەن، بەڵام لێكۆڵینەوە نەكرێت بزانرێت كەئیسلام لەئاوا بابەتێكدا چی ڕێنمایی و بەرنامەیەكی هەیە، نەك تەنها لێكۆڵینەوە ناكرێت، بەڵكو ڕۆشن ڕۆشن و ئاشكرا ئاشكرا دەزانن بەرنامەی ئیسلام لەبابەتی مارەیدا چییە، (چونكە بۆ هەندێك خانەوادە ڕوون كراوەتەوە، كەمارەی یان پێشەكییەكە نەختی یان تەعەهودێكە لەهەر ساتێكدا داوابكرێت بەخاترەوە

هەتا بەبێ ناوچاوتاڵ کردن، بەبێ ئەوەی پێی ناخۆش بێت بەتەواوی خاترەوە بتوانێت ئامادە بکرێت و بدرێتە ئەم کچە)ئەمەیان ڕوون کراوەتەوە، دروست خیلافی ئەم پێوەرە ڕەفتار دەکەن و خۆشیان ناو دەنێن موسوڵمان...

## عەقدی زەواج

ڕەخنەکانی کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە (سیغەی عەقد) بە جۆرێکە مرۆڤ کاتێك هەڵوێستەیان لەبارەوە دەکات ئەو کاتە تێدەگات بە ڕاستی مەسەلەی خوێندن و مەراسیمی ئامادەکردنی مامۆستایەکی ئاینی هەروا بابەتێکی سادە و ئاسان نییە، بەڵکو یەکدانە لە فکرەو فەلسەفەی گەورەی لە پشتەوەیە! بەڵام لەبەرئەوەی وەك موفتی زادە دەڵێت" هەرچی شتمانە بێگانە بوونە لە ئیسلام"، ئەم بێگانەییە بە جۆرێکە بۆتە مایەیی بێ‌ماناکردنی زۆرێك لە مەراسیمەکانی ئیسلامیش! چونکە وەك لە پێشترەوە ئاماژەی بۆکرا، ئێمە ئەوەندە بە غیرەت نین بڵێین کەسێکی موسوڵمان نین و کار بە ڕێنماییەکانی ناکە، بەڵکو خۆمان بە دیندار دەزانین، بەڵام دیندارێك کە خۆمان مەبەستمانە و بڕوامان پێیەتی نەك ئەو (دین) و موسوڵمانییەتییەی بۆمان هاتووەو لێمان داواکراوە، بۆیە لە کۆتایدا ئەوە دروست دەبێت ناومان موسوڵمان بێت، بەڵام ڕەفتارمان بێگانەبێت بەدین! جا هەر لەبەرئەمە (کاك ئەحمەد) لەبارەی عەقدی زەواجەوە دەڵێت"ئێستا بابێینە سەر خودی (عەقد)ەکە، ئەصڵەن هەرچی شتمانە بێگانە بوونە لە ئیسلام! ئیسلام بۆ بەشەرە، بۆ مەوجودێکە عاقڵ و بەشعور، دێن (سیغەی عەقد دەخوێنن) چی ئێژن؟ کەلیماتێك ئێژن ئەوە هیچ مەعناکەی نازانن، هەتا ناتوانن تەلەفوز بکەن بەکەلیماتەکانەوە!

(.....)یەك هەراوبەزم و جەنجاڵی دەنێنەوە، خودی ئەمە بەسە بۆ ئەمە كەئینسانگەڵ فێری پوچی بكات، فێری ئەوەی بكات لەگەڵ ڕواڵەتدا جەرەیان پەیدابكەن (گرنگی بەڕواڵەتی شتەكان بدەن) و كارێكیان بە محتەواوە نەبێت!! ئەم(عەقدە)هەر دوو كەلیمەو سەرزارەكی هەروەك ئەو (تەڵقین)ەی لەسەر قەبران بەزمانی عەرەبی دەیدەن، لەكاتێكدا (تەلقین) فەوقەلعادە مەتڵەبێكی گرنگ و گەورەیە كە ناكرێت لێرەدا باسی بكەم. ئەمانە گشتی مەسائیلێكن بۆ خەڵكی بۆ مەوجودێك بەشعور، كە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمێت ﴿عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾الرحمن٤. زمان و بەیانی پیشانداوە، تاوەكو لەڕێگەی زمان و بەیانەوە شت فێرببێت و لایەنگیری بكات و حەرەكەتی ببێتە حەرەكەتێك خاوەن محتەوا و مەفهوم، كاتێك ئەم جۆرە شتگەلە لەناو كۆمەڵگەدا دەبینین بۆ(عەقدی) كوڕ و كچ میقدارێك كەلیمات هەڵدەڕێژن بەسەریەكدا كە هیچ مەعنای نازانن و ناتوانن تەلەفوزی بكەن. (تەلقین) دەخوێنرێت لەكاتێكدا كە زەمینە سازگارە بۆ حاڵی بوونی ئینسانگەل بەزمانێك كە ئینسانەكان حاڵی نەبن، وتار دەخوێنرێت بە زمانێك كە ئینسانەكان حاڵی نەبن، دەبێت چ چاوەڕێیەكمان هەبێت لەئەم جۆرە ئینسانگەلە؟!

دەی زۆر ئاساییە دەبێت مەوجوداتێك سەتحی(ڕووخساری) و دوور لەدەرك و بێگانە لە(مەفهوم و محتەوا)دروست ببێت دیارە پەیوەندی و بەرنامەیەك بەوجۆرە باسمكرد ئینسانێكی ئاوا دروست دەبن. ئەمە لەكاتێكدایە دەبێت لەكاتی(عەقد)دا دەرك و بینشێك ئەوەندە بدرێتە ئەم ئینسانگەلە ئەگەر(دەرك و بینشیان)هەیە بۆیان دووبارە بكرێتەوە، ئەگەر نیانە و باش حاڵی نەبوون تاوەكو باش حاڵی بن و بزانن لەسەرەتادا(عالەمی هەستی چییە؟) لەپاشاندا

ئینسان لەم هەستییەدا چ پێگەیەكی هەیە و چ كارەیە؟ ئایا مەوجودێك بەرپرسیارە یان نا؟ ئەگەر هەستی هیچ و پوچ و بێ خاوەنە و ئیرادەیەك حاكم نییە بەسەریەوە و ئینسانیش بەبێ حوكمەتی ئیرادەیەك هاتۆتە ناو ئەم هەستییەوە ئەو كاتە بەرپرسیارییەتی مانایەكی لۆژیكی و دروست پەیداناكات لای ئینسان! دەبێت ئینسان پێگەی خۆی بزانێت لەم هەستییەدا، ئایندەی خۆی بناسێت و بزانێت مەسیری چییە و بەرەو كوێ دەچێت، ئەم مەوجودە عەجیب و غەریبە ناتوانێت بەتەنها غەریزەوە وەك باقی حەیوانات رەفتار بكات، ئەوە نمونەی ئینسانگەلێك دەیان بینین كەلە ئیستعدادەكانی خۆیان چ سودێكی خراپ وەردەگرن و چۆن دەبنە ژەهر و ئافات بۆ بەشەرییەت! كەواتە ئەم ئینسانە بەرنامەی گەرەكە و بەبەرنامە دەبێتە ئینسان، ئەگەر بەرنامەی نەبێت ئەم ئیستعدادە زۆرەی كەهەیەتی دەبێتە مایەی بەدبەختی، شتێك كە ئیستعدادی زۆری تێدا نەبێت ئەگەر خراپیش بێت سودی لێوەبگیرێت زەرەری زۆری نییە، بەلاَم(یۆرانیۆم) كە ئیستعدادی زۆری هەیە، فلاَنە مادەی(كیمیاوی) مەوادی موخەدەر...ئەم جۆرە مادانە كە ئیستعداد و توانایی زۆریان هەیە یەك ماتۆرِی ئەلكترۆنی كە توانایی زۆرە، ئەگەر دروست سودی لێوەربگیرێت شتێكی زۆر زۆر گرنگە ئەگەر خراپ سودی لێوەربگریت یەكجار ترسناكە! ئیستعدادگەلی ئینسان بێ پایانە ئەگەر مەوجودێكی بێ ئیستعداد بوایە وەك حەیوان خراپیش بوایە هیچ نەبوو، بەلاَم ئەم ئینسانە بەم مەجموعە ئیستعدادەوە ئەگەر بەرنامە و رِێوشوێنی نەبوو دەبێتە ئەم ئافاتگەلە وادەیبینین! بەشەرگەلی دانشمەندی خاوەن ئیستعداد، چونكە بەرنامە و رِێگەیەكی دروستیان نییە ئەم عیلم و ئیستعدادەیان دەبێتە هۆكاری

حوكم كردنی قودرەتگەلی ئیمپریالیستی لەدونیادا، دەبێتە هۆكاری هەرچی زیاتر كاركردنی كارخانەكانی ئیتسعمارگەل دەبێتە هۆكاری سەرهەڵدانی دەزگاگەلی جاسوسی بۆ زەجر و ئەشكەنجە و ئازاری ئینسانگەلی مەزڵووم! لەم مەوجودە مەوجودێك نییە بەبێ بوونی بەرنامە بەڕێوە ببرێت، ئەی كێ بەرنامەی پێ دەدات؟ بەشەر خۆی بەرنامە بۆ خۆی دابنێ؟! خۆ ئەگەر بەكاربهاتایە و بیتوانیایە بەرنامە بداتە خۆی ئەم مەوجوداتەی لێ دروست نەدەبوو! كاتێك لەهەرچی لایەنەوە دەزانین كەئەم هەستییە دروستكەری هەیە ئەم ئینسانە بە موقتەزای ئەوەی لەلایەن دروستكەرێكەوە ئیستعدادی پێدراوە و هاتۆتە ناوئەم هەستییە و مەسئولییەتی بۆ دیاری دەكرێت ئەو كاتە دەزانین تەنها ئەو دروستكەرە صەلاحییەتی هەیە كە بەرنامە بۆ ئەم مەوجودە دیاری بكات، جگە لەخۆی هەرچییەك هەیە لەخۆی خوارترە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیشی توانایی نییە بەرنامە بۆ خۆی دابنێت! ئەمەش ئاسان دەیبینین، چونكە بەرنامە دانان پەیوەندی بە(ناسین)ەوە هەیە دەی مەگەر ئینسان(خۆی دەناسێت) تا بتوانێت بەرنامە بۆ خۆی دابنێت؟ ئایا هیچ كات بووە كەسێك شارەزای نەبێت لە(ماتۆڕێك) هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی لێدەكەین بەرنامەیەكی بەسود دابنێت بۆ سودوەرگرتن لەو(ماتۆڕە)؟ ئایا ئەگەر كەسێك شارەزا نەبێت لەكاركردنی ماتۆڕێك و گەرەكی بێت بەرنامە بۆ ئێمە دابنێت كەچۆن سودوەربگرین لەو ماتۆڕە ئەو نەفەر بەیەك نەفەری (خۆپەرستی ئەحمەق) نازانین؟! ئاخر تۆ لەچ ڕوویەكەوە خەریكی بەرنامەی كاركردن بەم ماتۆڕە دادەنێیت كە ماتۆڕەكە ناناسیت؟ دەی بەشەرێك لەماتۆڕێك زۆر گرنگترە، ئینسانگەلێك كەبەرنامە دادەنێن بۆ بەشەر هەروەك ئەو كابراوان، كەوا

شارەزایی و شناسایی كاملی نییە لەماتۆڕ و خەریكە بەرنامەی بۆ دادەنێت. تۆیەك كە شناسایت نییە نیسبەت بە ئینسان مەحاڵە و لەڕووی لۆژیكی دروستەوە دەزانین ئیمكانی نییە بەشێوەیەكی كۆتایی ئینسان بناسرێت، دەی چۆن ئەوەندە مەغروریت خەریكی بەرنامە دادەنێیت؟ ئەوا بەبێ ناسینیش بەرنامەت دانا بۆ (ماتۆڕێك) گەورەترین زەرەر ئەوەیە ئەو ماتۆڕە خراپ دەبێت، بەلاّم تۆ بەرنامە بۆ ئینسان دادەنێیت ئەو كاتە ئینسان خراپ دەبێت و ئەمەی لێدەردەچێت وا ئێستا دەیبینیت! ئەمە بەرهەمی ئەوەیە كە ئینسان بەرنامە بۆ ئینسانگەل دادەنێت، ئەم گشتە بەدبەختی قوربەسەرییە وابەسەری دێت. ئینسان صەلاحیەتی نییە بەرنامە بۆ ئینسان دابنێت، چونكە بەرنامە دانان مەسەلەی ناسینە، دەی ناسینی نییە و ناشتوانێت بیبێت، كەواتە ئەوە دروستكەری ئینسانە كەئەم مەوجودە عەجیبەی دروست كردووە، ئەم دەزگا گەورەی خەلق كردووە دەتوانێت بەرنامە دابنێت بۆ ئینسان.

لەكاتی (عەقدی زەواج)دا دەبێت ئائەمە حاڵی بكریەت بە(كوڕ و كچ)، كەلەسەرەتای دانانی بنەڕەتی زیندەگیدان، چونكە كاتێك ئەمەیان زانی ئیتر تبقی ئەو بەرنامەیە بەرپرسیار دەبن كاتێك دەزانن هەستی چییە و لەناویدا چ پێگەیەكیان هەیە و چ بەرنامەیەك دیاری كراوە بۆیان، بەرپرسیارێتییان تبقی ئەو بەرنامەیە دیاری دەكرێت جا ئیتر دوای ئەوە بەرپرس دەبن، ئەگەر لەمەو پێش بەرپرسیارێتیان فەردی بووە لەمەولا بەرپرسیارێتییان دەبێتە بەرپرسیارێتییەكی موشتەرەك، لەپاشاندا ئیزافە بەم بەرپرسیارێتیگەلە (منداڵ)دەكەوێتە نێوانیانەوە، باسی ئەوە سەرهەڵدەدات لەگەڵ یەكتردا چۆن بن؟ لەگەڵ منداڵدا چۆن بن؟ دەبێت لەكاتی(عەقد)دا ئەمانە بە كوڕ و كچ بوترێت، دەی هەرگیز شتی وادەوترێت؟! نەخێر بەموتڵەقی، بەڵكو هەندێ كەلیمەی عەرەبی تكراری(مەیمون و تولی) دروست دەكەن و ئینسان دروست ناكەن..

# زەماوەند

ئەوانەی لە بارەی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە)وە خوێندنەوەیان هەیەو دوورو نزیك ئاگاداری بەرهەم و كارەكانین ئەوەیان لەلا ڕۆشنە كە ئەم زانایە چەنێك كرنگی بە هەژانداوە، جا (موفتی زادە) ئەگەر ئەنجامگیرییەك لەسەر تەواوی باسەكانی وەربگریت لە كۆتایدا بەوە دەگەیت، كە هۆكاری ئەو هەموو دەردی سەری و موصیبەتەی بەسەر بەشەرییەتدا دێت لەئەنجامی نەمانی ئەو هاوسەنگییە كە دەبێتە هۆی ڕاگرتنی كۆمەڵگەی بەشەرییەت. بەبۆچوونی موفتی زادە ئەوە (ئیسراف و تەبزیرە) بۆتە مۆتەكەو فایرۆس و كۆمەڵگەی تەنییوە! بۆیە دەبینیت لە زۆربەی باسەكانیدا بنەمای فەلسەفەی خۆی لەسەر ئەم ڕوكنانە دادەڕێژێت و بەو قوڵییەی خۆیەوە هۆكار و دەرئەنجامەكان دەبەستێت بەیەكەوە و مەسەلەی زەماوەند و تەكلیف خستنە سەرشانی ئەو خانەوادە خنجیلەیە دەكاتە دەستكەلا بۆ ڕەخنەگرتنی وردو مەنتقی لەو شتانەی بەناوی ئیسلامەوە ئەنجام دەدرێت. هەر لەم باسەدایە دێت لەبارەی شایەتیدان و گرنگی شایەتی داو پەیوەندی ئەم شایەتی دانە بە گۆمەڵگە و بەرپرسیارێتییەوە دەبەستێتەوە. ئەو دەڵێت"ئەو خەرجی و دەردی سەرەی وا دەخرێتە سەرشانی ئەم خانەوادە بێچارەیە كەوا تازە خەریكن بنەڕەتی زیندەگی دادەنێن بۆ خۆیان ئەوەی تائێستا چی زیادەكارییەكیان پێ‌كراوە و چەنێك قەرزار كراون بەجێی خۆی، بەڵام زەماوەندەكەیان كلۆڵی لەبان كلۆڵی!! ئەوە هیچ كە جگە لەزەماوەند زۆربەی ئەو كۆبونەوانەی كەڕێكی

دەخەین و دروستیان دەكەین لەچەندین لایەنەوە نا مەشروعە كە دوو باری زۆر زۆر ڕۆشن و ئاشكرایە، ئەوانیش(ئیسراف و تەبزیر).

**ئیسراف:** واتە خەرجكردنی زیاتر لە زەرفییەت و توانای حەدی وەصەتی كۆمەڵگە، ئەگەر ئینسانین دەبێت لەزیندەگیماندا خۆمان بەشەریكی ئینسانگەلی تر بزانین، دەبێت بپرسین ئایا ئینسانگەلی تری كۆمەڵگەی ئێمە دەتوانن بەو شێوەیەی ئێمە زیندەگی بكەن؟ ئەگەر(نەخێر) بوو ئەوە ئیسرافە.

**تەبزیر:** واتە حەرام گەڕاندنی نیعمەت، كەئەمە ئیتر مونتەهای پەستییە بۆ ئینسان؟ ئیسرف بەهەرحاڵ زیاد لەتوانای وەصەتی كۆمەڵگەیە، كە ئارەزوو دەكات و دەخوات و خەرج دەكات لەڕووی فەرش و ژوور و كارەبا و سفرە و خواردنی لەهەموو ئەمانەدا زیاد لەتوانای وەصەتی كۆمەڵگە خەرج دەكات. بەڵام (تەبزیر)ەكە ئیتر غەیری دڕندە خۆری و فەساد هیچی تر نییە!! تادەتوانیت مەسرەف بكە و بخۆ، بەڵام لەوەودوا بۆچی لەكیسی بەشەری دەدەیت و دەیڕژێنیتو خراپی دەكەیت؟! (تەبزیر): واتە(نیعمەت لەكیسدان) تۆ بۆچی لەناو قاپەكەتدا میقدارێك خۆراك دەهێڵیتەوە تاوەكو دواتر بیڕژێنن؟ دەتەوێت هونەر بنوێنیت؟ تۆ دەركی ناكەیت ئەگینا ئائەو میقدارە خۆراكە لەدەمی منداڵێكت سەندۆتەوە! ئەگەر پەیوەندییە لەدورەوەیە و دەركی ناكەیت، كەمێك نزیكی بكەرەوە، منداڵی برسی زۆر هەیە كە ئائەو چكە خۆراكەی لەناو قاپەكەتدایە بیدەیتێ، وەكو گەورەترین غەنیمەیە بۆی! پەیوەندییەكە نزیك بكەرەوەو بیهێنە بەرچاوی خۆت كەئائەو (دەورییە) خۆراكە لەبەردەمی منداڵێكی برسیدا دەیەوێت بیخوات و تۆ خەریكی دەیبەیت دەیڕێژیت! ئەم هەموو زەرەر و فەسادییە بۆ؟ كەمترین لایەنی فەسادی





زەماوەندەكانمان‌و باقی كۆبونەوەكانمان ئەم دوو دانە حەرامەیە (ئیسراف‌و تەبزیر).
لەپاشانیشدا شتی تری لەژمارە نەهاتوو كەلەباری زەماوەندەوە ئەمە زۆر گرنگە، ئائەو سفرەی وا لەیەك رۆژدا لە ژەمێك یان دوو ژەمدا دادەخرێت و دەخرێتە سەرشانی ئەم خانەوادە فەقیرە، كەوا دەبێت سبەی بنەڕەتی زیندەگی دابنێن، چەنێك دەمانخاتە دواوە؟ ئەمەش بۆچی؟ لەبەرئەوەی كۆمەڵێك كەس دێن و دادەنیشن و ژەمێك دەخۆن! جا سود و كاریگەری بۆ ئەم خانەوادە چی بوو؟ ئەگەر بێتوو ئەم مەسروفەیان پێنەكرێت دەبێتە هۆی ئەوەی لەدواتردا بەڕەفاه و ئاسایش و بەئاسودەییەوە زیندەگی دەست پێبكەن. ئەم خەرجییە دەخرێتە سەرشانیان وەك ئەوە وایە لەجەستەیان كرابێتەوە! هەر ئەو كاتەی ئەو زیادە خەرجییەیان پێدەكرێت ڕووبەڕووی سەد كێشە دەبنەوە، لەگەڵ قەرزاریدا، بەكابرای زاوا(ئاڵتون و جلی زیادەی پێ دەكرن، جۆرەها خەرجی پێدەكەن) دەی گشتی وردە وردە قورساییە و دەكەوێتە سەرشانی! كاتێك ئینسان قەرزارە و باری قورس خراوەتە سەرشانی دیارەكە خاتری نارەحەتە! بەنارەحەتی و پەرێشانی و خەستەگییەوە بنەڕەتی خانەوادە دادەنرێت، بەئیزافەی ئەو(درۆ)یەی لەباسی مارەییەكەدا وتم، جائەمە خانەوادە دامەزراندنە؟ ئەمە شایی و زەماوەندە؟ ئەمە بەزۆر پێی ئێژن شایی‌و زەماوەند! ئەمە موسیبەت‌و گرفتاری و بەدبەختییە. شایی و زەماوەندی چی! هەمووی كەڵەك و درۆ و فریودانە، ئەزییەت و ئازار و دەردی سەری دروست كردنە، گرفتار كردن و بەدبەخت كردنی دوو گەنجە! جائەمانە لەنمونەگەلی فەوقەلعادە زەنەندەو نازەریفی عورفی‌و فەرهەنگی ئێمەدایە لەبارەی زەماوەندەوە، كە شتگەلی تری زۆر هەیە، بەڵام ئەمە بابەتە گرنگەكانن.

## شایەتیدان:

ئیسلام ئینسان بەناوی مەوجودێك كۆمەڵایەتی دەناسێت، یان بەتەعبیری كۆن بەناوی مەوجودێك شارستانی دەیناسێت، كە بەشێوەی گروپی بەیەكەوە زیندەگی دەكەن، بەرنامەگەلێك كەڕێكدەخرێت بۆ ئینسان(بەگشتی) و بۆ تاكیش هاوڕێكە لەگەڵ ئەم خەصڵەتە زاتییەدا، و بەحسابكردن بۆ ئەم خەصڵەتە{واتە بە كۆمەڵ ژیانی} ئەو بەرنامەیە دادەنرێت. كاتێك كە قەرارە كوڕ و كچێك بەیەكەوە زیندەگی تازە دەست پێبكەن بەم دیدگایەوە كە ئیسلام هەیەتی، كەئەم كوڕو كچە دوو تاكن لەكۆمەڵێك وابەرنامە دادەنێت كە كۆمەڵگە ئاگادار بێت لەم پەیوەندییە تازەیە لەم بناغە تازەیەی زیندەگی كەدادەنرێت، ئەم خێزانە تازەیە لەلایەن كۆمەڵگەوە بەڕەسمی بناسرێت و جیاواز بێت لەگەڵ ئەوەدا كەلەڕووی هەوا و هەوەسەوە دوو ئینسان گەرەكیان بێت چەند لەحزەیەك بەیەكەوە بگوزەرێنن، كە تەنهای بێ بەندوباری دروست دەكات و مافی ئینساگەل بەفیڕۆ دەچێت بەتایبەت مافی(ژن)! هەروەها باقی بابەتەكانی تریش كەلە كۆمەڵگەدا هەن ئیسلام هەر لەسەر ئەم ئەساسە بەرنامەی بۆ داناون كە هەر بابەتێك بۆ تاكێك یان لەنێوان چەند تاكێكدا مەترەح دەبێت پێویستە كۆمەڵگە پێی بزانێت. مەسەلەی(شەهادەت) و ئامادەبوونی شایەت لە زۆرێك لە(عەقد و ئیقاعات)دا لەبەرئەوەیە كەئەم بابەتە لەگەڵ ئەوەی بابەتی دوو تاكە بەیەكەوە، بەڵام دەبێت كۆمەڵگە لەبارەیەوە زانیاری هەبێت، ئەو (شاهیدگەلە) كەلەكاتی عەقدێكدا ئامادە دەبن جێنشینی كۆمەڵگەن،




لەبەرئائەمە لەبیروبۆچونی ئیسلامدا واجبە بەلایەنی كەمەوە دوو نەفەر(ئیعتبار پێكراو و قبوڵكراو)، واتە ئینسانی سەرسەری نەبن، بەڵكو مەرجەكانی شەهادەیان تێدابێت، ئینسانگەلێك بن كاتێك شایەتی دەدەن لەسەر مەتڵەبێك كۆمەڵگە دواتر باوەڕیان پێ بكات، بەدەستەواژەی شەرعی(عادل)بن، ئەهلی درۆ و دەلەسە نەبن، ئەمە حەدی ئەقەلیەتی لەكاتی بابەتێك كە پێویستی بەشایەت هەبێت ئامادەبن. جابۆ كارێكی وەك(زەماوەند) كەكارێكی ئەرزشدار و گرنگە موستەحەبە زیاتر لەدوو نەفەر شایەتیش لەهەر حەدێكدا كە موتەعارفە و نەبێتە مایەی ئەرك و دەردی سەری خەڵك بزانێت و بەشداری بكەن لەئەم شاییەدا، لەئەم (ئیفاتی) زیندەگییە تازەدا كە دادەنرێت، ئائەمەیە پێی ئێژن زەماوەند، مەفهومی دروستی زەماوەند ئەوەیە بەمەرجێك ئەو(ئیسراف و تەبزیرە)ڕوونەدات و خەرجی قورس نەخرێتە سەرشانی خانەوادەی (ژن یان شو) لە سنورێكدا كەبەشێوەیەكی ئاسایی لەتوانایاندا هەیە كۆمەڵێك دۆست و هاوڕێ كە هاو فەهمن و لەواقیعدا شەریكی خۆشی یەكترن، ئەمانە كۆبنەوە و بەشداری بكەن لەمەراسیمی زەماوەنددا، بەڵام لەمەسائیلی زەماوەنددا چەنێكی شەرعییە و پەسەندە كەخەڵكی بتوانن بەشداری تێدابكەن، چەنێكی ناشەرعییە؟ لەبیروبۆچوونی دیندا ئەوەی كە پەیوەندی بەكۆمەڵگەوە هەیە و تاكەكانی كۆمەڵگە بەشداری تێدا دەكەن تەنها(مارەبڕینە) و زەماوەندە، واتە هەر ئەوەندە لەوەدا(مارەبڕین) خەڵكی پێویستە ئاگاداربن و بەشدارییان هەبێت لەخۆشی ئەم خانەوادە تازەیەدا كە دروست دەبن و هاوبەش بن. لە(مارەبڕین)بەولاوە **ئیتر هیچ شتێكی تر مانای نامێنێت!** دوای ئەوەی كوڕ و كچێك مارەبڕان لەیەك ئیتر موتڵەقەن

نە كۆمەڵگە و هەتا (نە خانەوادەی كوڕ و نە خانەوادەی كچ) نە هیچ كەسێك حەقی دەخالەت كردنی نامێنێت، لەوەودوا ئیختیار بەخودی كوڕ و كچە. لەو ساتەوە كە (عەقد) ئەنجام درا و (سیغەی عەقد) خوێنرایەوە (تبقی ئەو زەوابتەی كە وتم، نەك ئەم سیغە نامەفهومانەی ئێستا) لەو ساتەوە ئەم كوڕ و كچە ئیتر ئیختیار بەخۆیانە بەبێ هیچ جۆرە تەكلیفاتێك، بێ هیچ جۆرە ئاگادارکردنەوەیەكی كۆمەڵگە، بێ هیچ جۆرە دەخالەتكردنێكی كۆمەڵگە زیندەگی هاوبەشیان پێكەوە دەست پێدەكات. هەر ساتێك بیانەوێت جادوای عەقدەكە بەبێ دواكەوتن دەست بكەن بەزیندەگی هاوبەشیان، یان ڕۆژێك دواتر یان مانگێك یان ساڵێك، هەر كاتێك كە بەرژەوەندی خۆیان پێویست دەكات بەئارەزووی خۆیانە و هیچ كەسێك مافی دەخالەت كردنی نییە، هەروەك ئەوەی دوای(گواستنەوە)هیچ كەسێك مافی دەخالەت كردنی نییە لەپەیوەندی نێوان(ژن و شو)دا لەوكاتەشدا كە عەقد دەكرییەت حەقیقەتەن ئیتر ئەم دووانە حەلاڵن بۆ یەكتری{واتە سەردەمی دەستگیرانداریيان}. پەیوەندی ئەم دوو نەفەرە بەیەكەوە ڕەسمییەتی پەیداكردووە، بۆیە ئەوەی كە زەماوەند دەخرێتە جەلسەیەكی جیاواز لەعەقد ئەمە نامەشروعە و زەماوەندێكی شەرعی نییە، زەماوەندی شەرعی هەرئەو جەرەیانی(عەقدە) و بەشداری كردنی خەڵكییە لەو مەراسیمەدایە، لەوە زیاتر ئیتر هیچ نییە.

جالەمە خراپتر و زەنەندەتر و ناپەسەندتر بریتییە لە مەسەلەی(پێخەسوو)! جارێ خودی گواستنەوەكە نامەشروعە كەكۆمەڵێك لەخەڵكی دێن بەشداری دەكەن لەگواستنەوەی ئەم كچەدا بۆ ماڵی شو، ئەوەی واپەیوەندی بەخەڵكییەوە هەیە هەروەك وتم ئەوەیە كەبزانن ئەم دووانە قەرار و عەقد لەنێوانیاندا بەستراوە،

دوای تەواوبوونی مەراسیمی عەقد ئیتر هیچ شتێك پەیوەندی بەخەڵكەوە نییەو دەخالەتیان نامێنێت، بۆیە گواستنەوە بەم شێوەیەی لەناو كودەواریدا بوونی هەیە شتێكی نامەشروعە! جاوەك وتم لەمە نامەشروعتر مەسەلەی پێخەسووە، حەقیقەتەن ئەمە كارێكی نەنگینە و خلافی شەخصییەت و ناموسی ئیسلامییە، لەو شەخصییەت و ناموسەی كەئیسلام دەیەوێت بیداتە ئینسان كارەكە ئەوەندە زەنەندەیە زۆر باسلێكردنی زەنەندەیە! واقیعەن ئەوەندە نەنگینە وەك كارگەلێك زۆر نامەشروع و ناپەسەندە باسلێكردنیشی ناخۆشە، ئەگەرنا دەبێت زۆر باس بكرێت و ڕوون بكرێتەوە و بخرێتە دەرەوە كە چ دەخالەتێكی ناڕەوایە لەمەسائیلی جنسیدا! بەڕاستی قیزی دەوێت ئینسان باس لەمەسائیلێكی ئاوا ناپەسەند و پیس بكات، هەر ئەوەندەی ئیشارەتم پێكرد لەیاسای دیندا لەدوای مارەبڕین ئیتر پەیوەندی و دەخالەتی خەڵكی تەواو دەبێت ئیتر ئەوەندە بەسە، ئومێدەوارم ئەو وشانەی لەبارەی(پێخەسوو)ەوە وتم بەس بێت بۆئەوەی ئینسانگەلێك ئاگایی و دەركێكی دروستیان هەیە بزانن كە چ نەنگی و حەقارەتێكە كەخەڵكی لەڕەوابتی جنسییاندا بەوجۆرە دەخالەت دەكەن هەر ئائەم وشانە كافییە بۆ داچڵەكاندنی ویژدان و دەرونی ئاگاهی ئینسان كە قیزیان بێتەوە لەكارێكی بەو جۆرە چ(ژن و شو)،واتە ئەو دوو كەسەی كە سیغەی عەقد لەنێوانیاندا خوێنراوە، چ خەڵكی و دۆست و ئاشنا و خانەوادەیان ئیتر دەست هەڵگرن لەم بەرنامە نەنگینە، بەتایبەت موسوڵمانگەل براگەلێك خەریكن ڕێگەی ئیسلام بدۆزنەوە و ڕێگەی ئیسلام حاڵی بكەن بەباقی خەڵك و خەریكن لەمەدرەسەگەلی قورئاندا ڕێگەیەك كە قورئان نیشانی داوە ڕۆشنی بكەنەوە ئێوە ئەركتانە زیاتر لەخەڵكی بنە پێشەنگ.

## دەربارەی هەڵپەرکێ:

ئەوە بڵێم، زاتی خۆشی کردن لەموناسەباتی خۆشیدا ناپەسەند نییە و مەشروعە و قبوڵە، بەلاّم گرنگ ئەوەیە پێوەر و قیاسگەلێك کە لەئیسلامدا بۆ خۆشی هەیە(نەبەزێنرێت) و تبقی ئەو پێوەر و میقیاسە خۆشیی مەشروعە و خلافی ئەوە بوو نامەشروعە! زاتی (هەڵپەرکێ)موباحە*، زاتی(گۆرانی وتن)موباحە، زاتی(مۆسیقا)موباحە، بەلاّم پێوەر و میقیاسگەلێکی هەیە کەئەم موباحە نەبێتە

---

*)بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام:

بڕیارەکانی خوای گەورە – کە شەریعەتی ئیسلام باسیان دەکات– حەوت دانەن:

١. (واجب)=(فرض)=(لازم)، واتە: پێویست، بریتییە لە کارێك بە کردنی لەلای خوای گەورە پاداشت وەربگرێت و بە نەکردنی سزا بدرێت لەلای خوای گەورە. ئەمیش دوو جۆرە: (فرض العین) و (فرض الکفایة).

٢. (سنة)=(مندوب)=(مستحب)، واتە خێر: بریتیەلەوەی بە کردنی لە لای خوای گەروە پاداشت بدرێت و بە نەکردنی سزا نەدرێت.

٣. (حرا)=(محظور)، قەدەغە: بریتیەلەوەی بە تاوانکردنی لەلایەن خوای گەورەوە سزا بدرێت و بە نەکردنی پاداشت وەربگرێت

٤. (مکروە)، ناپەسەند = نارێك: بریتییەلەوەی لەسەر کردنی سزا نەدرێت، بەڵکو گلەی لێبکرێت، ئەگەر بۆ گوێڕایەڵی شەریعەت وازی لێهێنا پاداشت بدرێتێ لە لەی خوای گەورە.

٥. (حلال)=(جائز)=(مباح)، دروست = ڕێگە پێدراو، بریتیەلەوەی کردن و نەکردنی یەکسانە، واتە نە پاداشتی پێدەدرێت نە سزای دەدرێت، بەلاّم ئەگەر بەنیازی خوا پەرستی کردی خێرە دەگاتێ.

٦. (صحیح)=(مجزیء)=(منعقد)، واتە: دروست = دامەزراو: بریتییە لەوەی بە گوێرەی داواکاری شەری خوای گەورە ئەنجام بدرێت، بەتەواوەی بکرێن و مەرجەکانیشی بێنە دی، وەکو نوێژ کردن بە دەست نوێژەوە.

٧. (باطل)=(فاسد)=(غیر منعقد)، واتە ناتەواوی = نا دروست: بریتییە لەوەی ناتەواوی لە بەش(رکن) هەبێت و، (فاسد)نادروست، ئەوەیە کە ناتەوای لە (شرط)مەرجەکانیدا هەبێت.

بروانە:عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی: ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین) للام النوري، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٤، ل٨٧-٩.

نامەشروع، بۆ نمونە ئەگەر(هەڵپەڕکێ) ببێتە (ڕەشبەڵەك) ئەوە نامەشروعە، چونکە حەقیقەتەن سستکردنی بنەڕەتی محکەمی خانەوادەیە، بەبۆنەی ڕەشبەڵەکەوە وەك زۆرێك لەو پەیوەندییانەی لەنێوان ژن و پیاودا دروست دەبێت پەیوەندی ژن و شویەك بەیەکەوە ئیحتیمالەن بەرەو ساردی بچێت، لەکاتێکدا خانەوادە کاتێك دەبێتە خانەوادە کە ژن و شو بەتەواوی وجود بۆ یەکبن و بۆ غەیر نەبن و گۆشەیەك لەزهنیان بەلای کەسێکی ترەوە نەبێت! ئەو کاتە واقیعەن(ژن و شون)تبقی پێوەری ئیسلامین.

ڕەشبەڵەك، یان هەر جۆرە تێکەڵیەکی تر لەنێوان(ژن و پیاو)دا خۆشەویستی نێوان(ژن و شو)بەزۆری کەم دەکاتەوە و دەیهێنێتە خوارەوە. ڕەشبەڵەکیش، واتە کوڕ و کچ، یان ژن و پیاو بەیەکەوە دەست دەگرن و هەڵدەپەڕن، یان مەسەلەن ژنگەل خۆیان بڕازێننەوە و بە بەرچاوی پیاوگەلەوە هەڵپەرکێ بکەن، وەك وتم: زاتی هەڵپەرکێ موباحە، بەلام کارێك نەکرێت کەبیکاتە نامەشروع، مەسەلەن لەشوێنێکدا ژن کەبەتەنها خۆیان هەڵپەڕن، یان پیاو کەتەنها خۆیان هەڵپەڕن هیچ ئیشکالێکی نییە. یان گۆرانی، سرودێك هەیە کە موباحییەتی گۆرانی نەفەوتێت و هەر لەوحاڵەتی مەباحییەی خۆیدا بمێنێتەوە کە ئەلفاز و کەلیماتێکی تێدانەبێت، جانبگەلی مەنفی لەئینساندا دروست بکات، تێکەڵ نەبێت لەگەڵ موناسەباتێکدا لەدەرەوەی گۆرانییەکەوە ببێتە هۆکاری مونحەریف کردنی زهنی ئینسان، ئەگەر گۆرانی ئابەم کەیفییەتە بێت و دەنگی گۆرانی بێژ خۆشبێت، (چونکە واقیعەن دەنگی خۆشی گەرەکە) هەندێك هەن ئینسان حەزدەکات فێرار بکات و ڕابکات، بەلام دەنگیان نەبیستێ ئەوەندە ناخۆشە. دەنگی خۆشبێت و وشەکانی زەریف و پەسەند دیدەبێت. ئەمە هیچ کێشەیەکی

نییە هەتا ئەگەر ژنیش بەم مەرجانەوە بیڵێتیو پیاو گوێی لێبێت، یان پیاو بیڵێتیو ژن گوێی لێبێت هیچ کێشەیەکی نییە و لەسوننەتدا بوومانە، ژنگەل سرودیان وتووە هەتا بەوەسائیلی مۆسیقای ئەو زەمانەوە کەهەبووە، بۆ نمونە لە پێشوازی کردن لە حەزرەتی ڕەسولدا(ﷺ) کاتێك چووە ناو (مەدینەوە) کچگەلی (مەدینە) هاتنە پێشوازی ئەو سرودە مێژووییە کۆنەیان دەوت (طلاع بدرو علینا...)، یان لە غەزووەگەلێك کە فەتحیان کردووە و دواتر لەشکری ئیسلام گەڕاوەتەوە ژنگەل بەسرودگەل و گۆرانیگەلەوە هاتوون و پێشوازییان لەجەنگاوەرانی ئیسلام کردووە، ئەگەر گۆرانییەکان هەیە جانبگەلی نامەکروهـ ئیجادە نەکەن هیچ کێشەیەکی نییە.

لەڕووی مۆسیقاوە کەواقیعەن مەسەلەی مۆسیقی شتێکی زۆر گرنگە هەندێك(فوقەها)پێوانە و میقیاسگەلێکیان داناوە کەکەمترین مەبنای دینی نییە و ئەصڵەن لەگەڵ دەرك و فەهمی ئیسلامدا ناخوێنێت! باسەکە پەیوەندی بەئەم دەزگا و وەسیلەی مۆسیقی و ئەویترەوە نییە، ئەم بابەتە پەیوەندی هەیە بەحاڵەتگەل و خەصڵەتگەلەوە بۆ تاك و کۆمەڵگە، بۆ نمونە هیچ جیاوازی نییە دەف و تەپڵ بێت یان دەهۆڵ بێت(لەوڕووەوە کە لێی دەدرێت و دەنگی دێت)، هیچ جیاوازی نییە(شمشاڵێك) یان(زوڕنایەك) بێت (لەوڕووەوە کە فوی پێدا دەکرێت و ئاوازێکی لێدەردەچێت و حاڵات دەگۆڕێت)، کەواتە هیچ جیاوازییەکی نییە، ئەو جیاوازییەی واباسکراوە لەهەندێك کتێبگەلدا ئیجتهاداتێکن زەعیف و مەبنا و پایەی دروستیان نییە، بەڵام لەلایەکی ترەوە فەرق دەکات ئەویش ئەوەیە ئەگەر لەناو شار و ئاوەدانیدا، لەناو ماڵێکدا(تەپڵ یان دەف)لێبدرێت لەوانەیە دەرو دراوسێ زۆر ناڕەحەت نەکات، بەڵام

ئەگەر(دەهۆڵ) لێبدرێت بەو دەنگە زلەوە بێگومان ئەگەر هاوسێكان بیانەوێت پشویەك بدەن یان دانیشن قسەیەك بكەن، یاخود نەخۆشێكیان هەبێت بەم كارە نارەحەت دەبن. ڕاستیان وتووە(دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە)، ئەگەر دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە بێت و تۆش لەپێچێكدایت یان لەخانەباخێكدا بیت، ئەگەر دوودانە دەهۆڵیش بكووتن. كەلەوانەیە كیلۆمەترێك دوور بێت لەماڵی خەڵكییەوە كەلەدوورەوە دەبیستن واقیعەن خۆشە و هیچ كێشەیەكی نییە، بەڵام لەناو ئاوەدانیدا ئەویش لەژیانی ئەمڕۆژەدا كەبەهۆی ئەو بێ ئینصافییەی كراوە و بۆتە هۆكاری ئەوەی بەوجۆرە ژیان گران بووە و خەڵكی بەنارەحەت دەتوانن برۆن لە شوێنێك (پەنجا، سەد)مەترێك زەوی پەیدا بكەن و ماڵێكی تێدابكەنەوە و گشتی وەك (قوتو) لەلای یەكتردا دانراوە و (تێكەڵی یەكتری بوون ئەوەندە نزیكن لەیەكەوە) لەناو حەوشەیەكی بەوجۆرە بچوكەدا دەستبكەیت بەدەهۆڵ و زورنا لێدان، بیربكەرەوە چەنێك دەبێتە هۆكاری نارەحەت كردنی هاوسێكان، ئەگەر(پانزە، بیست)ماڵیش زیاتر دوور بن لێتەوە؟ ئەم كارەت چەنێك ئاسایشیان لێ تێكدەدات؟ ئا ئەمە نامەشروعە نەك خودی دەهۆڵ و زورناكە، ئەو نارەحەتییە نامەشروعە كەدروستی دەكات بۆ خەڵكی، جالەڕووی هونەری مۆسیقی دەزگاگەلی مۆسیقییەوە مەسەلەن(مۆسیقی جاز) مۆسیقی كەیفی خۆیەتی موباحە، وەسائیلێك كە سودی لێوەدەگیرێت گشتی موباحە، بەڵام ئەگەر بێن و دەزگایەك بەوجۆرەی كە ئەمڕۆ پێی دەڵێن (جاز) و بتەوێت لەو دەزگا سودوەربگریت و دەنگی لێ خاریج بكەیت بەو تەجروبەیەی كەكراوە ئەوەی وا ئینسان (زەوقی حسی)دەكات سابت كراوە زەرەری هەیە. هەیەجانێك مەنفی ئیجاد دەكات كاریگەرییەكانی ئینسان ناسالم دەكات، هەر بەوجۆرە هەندێك لە




مۆسیقیگەل بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەمەیە، چۆن ئەوەی پێشوو هەیەجانگەل و تەكانگەلێك عەصەبی دروست دەكات و ئاساری سەلامەتی ئینسان لەناو دەبات، مۆسیقیگەلێك هەیە تەواو بەو دیوەكەیدا، خەفەتبار و ئەسەفاوی، پیشاندەری بەدبەختی و مەحرومییەتەكان كەلە فەرهەنگی میللەتگەلی مەحرومدا هەیە وابزانم(ئیقبالٌ لاهوری)ـ دەرەجەی عالی بێت ـ لەیەكێك لە بەرهەمەكانیدا بەناوی(بەندەگی نامە)وا دێتە بیرم باسێك دەكات دەربارەی (مۆسیقا) كەچۆن حاڵەتگەلی زیللەت و كۆیلایەتی لە مۆسیقیگەلی هونەریدا هەیە، لەئێستادا باش لەبیرم نییە مەتڵەبەكە مەتڵەبێكی زەریفە، حاڵەتی مۆسیقی گرنگە ئەو حاڵەتەی كە مۆسیقا هەیەتی چ كاریگەرییەكی دەبێت لەسەر ڕەفتار و دەرونی ئینسان، ئەگەر كاریگەرییەكی نامەتلوبی نەبێ لەهیچ لایەنێكەوە مەزاج و ویژدان و سەلامەتی دەرون نەشێوێنێت و نەیفەوتێنێت هیچ ئیشكالێكی نییە. هەروەك ئەوەی كەوتم زاتەن موباحە.

# باسی دووەم:

# خێزان و بەرپرسیارێتی

## ژن و پیاو بەرپرسیارێتیان

كاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە بابەتێكیدا كە تایبەت بۆ (كاك حمە ژیان و دادە گوڵاڵە)ی باسكردووە، دێت چەند باسێكی گرنگی بەرپرسیارێتی خانەوادەو پەروەردەكردنی خانەوادەی ئیسلامی دەوروژێنێت و هەوڵدەدات بە شێوەیەكی چڕوپڕ و كورت ئامۆژگارییان بكات و لەبارەی ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتییەی دەكەوێتە سەرشانیان ئاگاداریان بكاتەوە، جا بەڵگەش بۆئەوەی كە ئەم بابەتەی زۆر چڕكردۆتەوە ئەوەیە كەلەسەرەتایی باسەكەدا ئاماژە بۆئەوە دەكات كەبگەڕێنەوە بۆ چەند مەرجەعێكی گرنگ و پێیان دەڵێت"ڕۆڵەكانم! مەتاڵێبێك كە پێویستە پێتان بڵێم بۆ زیندەگیتان لەڕووی فەردی و لەڕووی پەیوەندیتان لەگەڵ یەكتردا، لەڕووی پەیوەندیتان لەگەڵ خەڵكیدا، لەڕووی ئەركتانەوە لەماڵداری، لەڕووی منداڵی ئایندەوە كە جیاوازی هەیە لەئەركدا لەبەرامبەر منداڵێكەوە لەگەڵ ژمارەیەك منداڵدا، هەروەها لایەنی جیاوازی ئەخلاقی كۆمەلاّتییانەوە، بۆتان ڕوون بكەمەوە كە ببێتە مایەی زیندەگییەكی موثبت(پۆزەتیڤ) بۆ دونیا و ئاخیرەتتان و پەسەندی لای خوا بێت. (جا ئەگەر ئەوە هەمووی باس بكەم) یەكجار درێژە دەكێشێت لەبەرئەوە بیرم كردەوە كە كورتەیەك لە وانە زۆر زۆر گرنگ و ئەصڵن بۆتانی بێژم، ئەوەی كە دەمێنێتەوە حەواڵە بكەم بۆ سێ جێگە:




یەکەم/کتێبێك کە (خالید محمد خالید)نوسەری ئەصڵییەتی دەتوانن (حەمەژیان) بیخوێنێتەوە و بۆتی تەفسیر بکات.

دووەم/ بگەڕێنەوە بۆ ئەو نامەگەلەی لەم کۆتاییانەدا نوسیوومە و خطابە بەگشت لایەکتان، هەروەها ژمارەیەك لەو باسانەی کەکراوە.

سێیەم/ ئەو زانیارییانەی کە خۆت هەتە{مەبەست کاك حەمە ژیانە} لەبارەی موسوڵمانی و ئەرکی فەردی.

ئەم ڕونکردنەوە کەمەی کەئێستا دەیڵێم و ئەو (سێ مەرجەعە) بەیەکەوە بەئومێدی خوای گەورە بێ نیازتان دەکات....جگە لەمانەش مەرجەعی ئەصڵی (قورئان) لە ئیختیارتاندایە، کە ئیتر ئەمەیان توانایی زۆری دەوێت! بۆ نمونە قورئان لەشوێنێکدا دەفەرمێت ﴿إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا...﴾* ، ئەمە ئەگەر کەسێك عەرەبی فەصیح بزانێت یەك مەتڵەبی دەزانێت، کە (ژن و شویەك) جیاوازی کەوتبێتە نێوانیانەوە کاتێك بەخۆیان چارەنەبێت و لەپاشاندا ڕیش سپییانی حاکم شەرعیش نەتوانن حەلی بکەن دوو نەفەر خێرخواز لەخانەوادەی هەردووکیان بانگ دەکەن و ئێژن بەشداری بکەن لەکاریاندا بە نەزارەتی یەك حاکم شەرعی(کەسێك شارەزا لەئموری دیندا ئەوەی وا لەڕووی شەرعییەوە دەتوانێت حاکم شەرعی بێت، نەك بەناونیشانی ئەرکێك پێی سپێردرا بێت) ئەمە ڕێنمایان دەکات. کەسێك لەمەتنە سادەکەی هەر لەئەوەندەی حاڵی دەبێت، کە ئەگەر ئەم دوو کەسە لەخانەوادەی(ژنو پیاو)مەبەستیان بێت بەڕاستی ئیصلاح بخەنە نێوان ئەو ژنو

*) {وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً }النساء٣٥




پیاوەوە كەجیاوازییان لەنێواندا هەیە خوا ئەم مەبەستە دەكاتە خێر و نوور و دەیانگەیەنێتە یەك، ئەو كەسە هەرئەوەندە حاڵی دەبێت، بەلاّم خۆ مەتڵەب هەر ئەوەندە نییە! سەد دانە مەتڵەب لەمەسائیلی گەورەی خانەوادەی كۆمەلاّیەتی لێ فەهم دەكرێت. بەشێوەیەكی گشتی (پرس و ڕاوێژ) چەنێك سەرچاوەی نوور و خێر و بەرەكەتە، جا ئەمە ئیشارەتێك بوو وتم. ئەگەر نا گەرەكم بێت تەنها ئەو ئایەتانەتان بۆ تەفسیر بكەم كەچی دەگەیەنێت و چ ڕازگەلێكی تێدایە زۆر درێژە دەكێشێت!!

جا قورئان لەئیختیارتان دایە لەپاشانیشدا(حدیث)یش لەئیختیارتان دایە، ئەگەر كێشەیەكتان بۆ دروست ببێت بەكەسێك چار نەبێت بە بیركردنەوەیەكی فراوانەوە، بە توانایەكی زۆرەوە. (هەم كوڕەكە و هەم كچەكە)هەوڵ و كۆششی لەپاڵدا بێت بە ئومێدی خوا، چونكە نییەتەكە خاڵصە دەتوانن بەرەكەتی زۆر دەستبخەن لە(كتاب و سوننەت). بەگشتی پرسیارەكانیان بێ وەلاّم نامێنێت"...

ئەوەندەی بەندە مامەڵەی لەگەڵ كەسایەتییە زانا و گەورەكانی وەك(مامۆستا ناصری سوبحانی و كاك ئەحمەدی موفتی زادە)دا كردبێت ئەوە تێگەیشتووم كە ئەو باسانەی ئەوان دەیكەن و دەیوروژێنن لەگەڵئەوەی لە ڕوخساردا بۆ كەسێك یان گروپێكی تایبەتی دەكەن، بەلاّم لە كاتی قسە كردنیاندا پەیامەكانیان گشتییەو بۆ هەموو خەڵكییە، بۆ نمونە زانایەكی وەك (مامۆستا ناصری سوبحانی) لەو باسەیدا كە (١١) كاسێتە و بە ناوی (موناضرە) بلاّوبۆتەوە، هەرچەندە قسە و باسەكان لە نێوان ئەو و (مەلا ئەحمەد)دایە بە ئامادەبوونی چەند كەسێكی دیكە،كەچی كاتێك(سوبحانی)وەلاّمی پرسیارەكان




دەداتەوە بەجۆرێك قسە دەكات وەك ئەوەوایە هەموو بەشەریەت بە گشتیو ئومەیی ئیسلامی بەتایبەتی لەبەرامبەرییەوە وەستابن و گوێ بۆ قسەكانی ڕادێرن!! دیارە ئەمەش لە ئەنجامی ئەو هەستی بەرپرسیارێتییە قوڵەوە سەرچاوەی گرتووە كە هەموو وجودی (سوبحانی) داگیر كردبوو، هەروەها ئەو زیرەكی و بلیمەتییەی پێناسێرنراوە! جا (كاك ئەحمەد)یش بە هەمان شێوەیە، كاتێك دێت دەربارەی بونیادنانی خێزانێكی ئیسلامی پەروەردە كراو قسە دەكات، لەگەڵئەوەی چەند كەسێكی تایبەت و كەم لەگەڵێدان، بەڵام قسە و فەرمایشتەكانی ئەوەندە وردو قوڵ و دورمەودان گوێگر دەخاتە حاڵەتێكەوە وەك ئەوەوایە بەتایبەت بۆ ئەو قسە بكات!!! لەڕاستیدا جگەلەوەی میتۆدی ئەوزانانە لەگەڵ باسەكاندا بەوشێوەیە بووە، خودی ئیسلامیش ئەو تایبەتمەندییەی تێدایە، كە ئەگەر ویستت پەیامێك ئاڕاستەی كەسێكی تایبەت بكەیت هەر ئەو پەیامە بەدیوەكەی تردا بۆ هەموو كەسێك دەشێت ئەمەش لەبەرئەوەی ئیسلام دینێكی (حەقە)! حەقیش بە پێناسەی خودی (كاك ئەحمەد) واتە: سازگاربوونی هەرشتێك لەگەڵ ئەصڵی ئینساندا! ڕونتر بڵێم هەرشتێك لەگەڵ ئینساندا سازگاربوو لەگەڵ مادە و مەعنەوییەتی ئەودا دژنەهاتەوە ئەوە ئەو شتە حەقە. جا ئەم باسەش كەلێرەدا نقڵ كراوە هەرچەند بەتایبەت بۆ دوو ئەزیزی خۆی وتوویەتی، بەڵام ناوەڕۆكێكی گشتی هەیە.

یەكێك لە سیفاتە كەم وێنە و میتۆدەكانی (كاك ئەحمەد) لە كاتی قسە كردن لەسەر بابەتێك، یان وەڵامدانەوەی پرسیارێك ئەوەیە بە جۆرێك دەست بە قسە كردن دەكات، هەروەك ئەوە وایە پێش ئەوەی ئەو پرسیارەی ئاڕاستە بكرێت صەدان و هەزاران لاپەڕەی لەبارەوە خوێندبێتەوە و دوای خۆ




ئامادەکردێکی زۆر و پۆلبەدنییەکی زیرەکانە دەست بە شروع کردنی باسەکانی بکات، لێرەشدا هەمان میتۆدی بەکارهێناوە لەگەڵئەوەی باسەکە لەبارەی خانەوادە و پەروەردە کردنەوەیە، بەڵام بەم شێوەیە دەستپێدەکات "زاناگەلی ئیسلامی بەرپرسیارێتی ئینسان دەکەن بە چەند دەستەیەکەوە:

**یەکەم:** بەرپرسیارێتی نیسبەت بە(خۆی) چەند ئەرکێکی نیسبەت بە خۆی هەیە.

**دووەم:** بەرپرسیارێتی نیسبەت بە (خوا).

**سێیەم:** بەرپرسیارێتی نیسبەت بە خەڵك.

بەرپرسیارێتی نیسبەت بەخەڵکێك دابەش دەکرێت:

١) ژن نیسبەت بە پیاو.

٢) پیاو نیسبەت بەژن.

٣) نیسبەت بە منداڵ.

٤) دایك نیسبەت بە منداڵ.

٥) هاوسێ نیسبەت بە هاوسێ.

٦) منداڵ نیسبەت بە دایك و باوك.

٧) قەومدار نیسبەت بە قەومەکەی.

**چوارەم:** بەرپرسیارێتی نیسبەت بەعالەمی وجود، بەم جۆرە بەرپرسیارێتییەکە درێژ دەبێتەوە و زۆرتر دەبێت.

ئینسان بەرامبەر بەهەموو ئەمانە بەرپرسیارە، بەڵام حەقیقەتەن دەتوانرێت تەواوی ئەم بەرپرسیارێتیگەلە لەیەکێك لەم دووانەدا کورت بکرێتەوە، بێژین بەرپرسیارێتی ئینسان لەبەرامبەر (خۆیەوە). هەر ئەمە، جا بەرپرسیارێتی ئینسان لەبەرامبەر خۆیەوەیەتی کە لق و پەلی جیاواز پەیدا دەکات.

حەقیقەن بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر (خوا)وە هەر بەرپرسیارێتییە لەبەرامبەر خۆتەوە! كاتێك ئەركەكانت لەبەرامبەر (خوا)وە بەباشی ئەنجام دەدەیت خەریكیت خۆت ئیصلاّح دەكەیت، ئەركت لەبەرامبەر(ئەگەر ژنیت) پیاوەكەوە، یان بەپێچەوانەوە، لەپاشاندا لەبەرامبەر تەواوی مەخلوقاتیش هەروایە هەرچی ئەركەكانت باشتر ئەنجام دەدەیت حەقیقەتەن بەرپرسیارێتی پێش لەهەموو شتێك نیسبەت بەخۆت ئەدا دەكەیت، بۆیە دەكرێت گشتی لەبەرپرسیارێتی نیسبەت بە(خۆت)دا كورت بكەینەوە، یان لە(بەرپرسیارێتی نیسبەت بە خوا)وە حەقیقەت ئەوەیە. ئەگەر من صەمیمانە گەرەكم بێت بەندەی خوا بم و بەگوێی بكەم تەواوی ئەوەی واخێرە بۆ خۆم و نیسبەت بەغەیری خۆم هەرچی بێژم گشتی خوا پیشانی داوم و حەقیقەتیش ئەوەیە لەبەرامبەر ئەوەوە بەرپرسم و ئەوە پیشانی داوم نیسبەت بە(ژن و منداڵ و خزم و هاوسێ)چی بكەم.

دەلیلێكی سادە بۆئەوەی كە حەقیقەت ئەوەیە كە بەرپرسیارێتییە لەبەرامبەر خواوە، ئەمەیە(خۆ دەكرێت خەڵكی فریو بدەیت. ژمارەیەكی زۆر خەڵكی هەیە كە خیانەت دەكەن بەخەڵكی بەتەزاهو و ڕیا.. كە وا پیشان بدەن لەبەرزترین پلەدا بەرپرسیارێتییان نیسبەت بەخەڵكی ئەدا دەكەن، بەلاّم لەڕووی لۆجیكی و ئینسانییەوە ئایا ئەوانە ئەدای بەرپرسیارێتی دەكەن؟

نەخێر! چونكە خوا ئاگای لێیەتی كەئەوە ئەدای بەرپرسیارێتییان نییە نیسبەت بە خەڵك، خواش نیسبەت بەوەی نییەتی هەیە جەزای دەداتەوە، بۆیە دەكرێت گشتی كورت بكەینەوە(بەرپرسیارێتی نیسبەت بە خود).

﴿فَلَمَّا أَنجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنفُسِكُم مَّتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَينَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ يونس٢٣.
چەندین جار وتومە زۆر ئارەزوومە بتوانم بۆ جارێك تەفسیرێكی كامڵی ئەم ئایەتە قورئانییەتان بۆ بێژم یان (بێژین بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خواوە)بەڕاستی دەكرێت زوڵم لەخۆم بكەم و حەقیقەتیش ئەوەیە كە قصورم كردووە لە ئیجرای دەستورگەلی خوادا نەتیجە زەرەرەكەی خوا دەیداتەوە بەسەر خۆمدا! زوڵم لەخەڵكی بكەم دیارەكە نەتیجەكەی خوا دەیداتەوە بەسەر خۆمدا بۆیە دەكرێت لەیەكێك لەم دوو وشەیەدا كورتی بكەینەوە.
جا ڕۆڵەكانم! من لەناو ئەو ناونیشانگەلەدا ئێستا لەسەرەتادا تەنها و تەنها بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خواوە كەمێك بۆتان باس دەكەم، تاوەكو دەرك و فكرتان باشتر بكرێتەوە.
لێرەدا ئەوەی دەكرێت بێژمی و ڕونی بكەمەوە مەفهومی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ە، ئا ئەم بەرپرسیارێتییەتان لەبەرمبەر خواوە لەم ئایەتەدا باش بناسن.
ڕۆڵەكانم!
ئەگەر ئینسانێك گەیشتە ئەوەی كە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ی بەڕاستی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾بوو، ئیتر ئەو كاتە بەڕاستی ئینسانە! ڕاستی ئیمكانی نییە لە هیچ شتێكیدا لە كرداری(باطن و ضاهیری)دا شتێك هەبێت كەزەرەر بەخۆی و، ژن و منداڵ و هاوسێ و بەكوللی بەشەر بگەیەنێت! ئیمكانی نییە شتی وا ڕووبدات.ئەوەی وامن ئارەزووی دەكەم ئەمەیە لەسەرەتادا﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾تان باش دامەزرێت ﴿كە خوایە بەندەی تۆم﴾، بەندەی تۆم، واتە لەدڵیشەوە لەدەروون و لەدەرەوەشدا لە(دڵ و كردار)یشدا ئەو جۆرەی وا تۆ پێت

خۆش بێت منیش پێم خۆشە وابكەم و واش دەكەم. (تەعەهود) دەكەم جا دوای ئەوە سەرەی ئەوەیە ئەمجارە بزانیت كەكێشەی زۆرە ئەگەر گەرەكت بێت بەندەیەكی ئازادی خوا بیت! گەرەكت بێت بەڕاستی بەندەی خوا بیت ئیتر ئەو كاتە نەبەندەی نەفس دەبیت نەبەندەی هیچ زۆردار و زووڵم و قەید و قیود و ئاداب و رسوم و عورف دەبیت، هیچ جۆرە زنجیری بەندەگییەك مل و دڵ و ئیرادە و فەهم و شعورتان نامێنێت. ئەگەر واقیعەن بەندەی خوابیت ئەو كاتە بە بەندەگی خوا گەشتیتە ئەو ئازادییە ئەمجارە ئیتر ئیجازەت هەیە و لۆجیكی و عاقلانەیە (خۆ هەمیشە ئیجازەت هەیە و ئینسانگەلێكی هیچ و پووچیش هەیە دەڵێن﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾بەلاَم ئەوە هیچ نییە) كاتێك ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُي﴾، واتە (لەتۆ داوای كۆمەك بكەم).

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾،واتە خوایە بەندەی تۆم بەحسابی و تەنها بەندەگی بۆ تۆ دەكەم و ئیتر بەندەی هیچی تر نیم گوێڕایەڵی هیچی تر ناكەم و دڵم لەهیچ شتێكی تر نالەرزێت.

﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُي﴾یش، واتە(كە ئینسانێك بەفەهمەوە وتی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، واتە بەرهەڵستی و هەرچی نارەوایە دەوێستم ئیتر گوێڕایەڵی لەهیچ نارەوایەك ناكەم جا ئیتر كەسوكارمە دەستوری نارەوام پێدەدەن، زۆردار و حاكمگەلن، باوكمە، عورفی كۆمەڵگەیە، دایكمە، برامە، ژنمە، پیاومە، منداڵمە، هەركامیان چاوەڕێم لێدەكەن و داوای شتی نارەوام لێدەكەن هەرچییەك نارەوا بوو بەزۆر یان بەنەرمی بەهەر رێگەیەك لەمن داوا بكرێت ئیتر من گوێڕایەڵی لەهیچ كامیان ناكەم، واتە ئەوجی ئازادەگی!




دەی ئەمە کارێکی ئاسان نییە! ئەمە دەردی سەری ئێجگار گەورە بۆ ئینسان دروست دەکات! کاتێك بەدڵ ئەوەی وت و تێگەیشت چی دەڵێت کە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، چ ڕستەیەکی گەورەیە جائەو کاتە پێی دەکەوێت بیڕێت﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (جا لەتۆش داوای کۆمەك دەکەین).

جا دیارە ئەمە هەر بەتەنها بۆ خۆی ناڵێت ئەمەش باسێکی سەربەخۆیە، بەڵام ئێستا قسە لەسەر شخصێك(فەردێك)دەکەین، فەردێك ئائەوەی نیسبەت بەخۆی بە(دڵ) وت و باشیش بە(عەقڵ) تێگەیشت کەواتای چییە، جا چونکە مەبەست نییە ئینسانی موسوڵمان هیچ کات خۆی تەنها بێت بۆیەبە(جمع) دەیلێت ئەگەرنا کەسێك بلێت(اعبد) بەتاك دەیوت لەبەرئەمەیە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، واتە هەموومان تەنها بەندەگی بۆ تۆ دەکەین. جا ئەو کاتە دەزانێت کێشەی هەیە تەصمیم دەگرێت کەئیتر نەترسێت لەکێشەکان و تەسلیم نەبێت پێی جوانە و حسابی پێی دەکەوێت بیڕێت﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (داوای کۆمەك لەتۆ دەکەین)، واقیعەن دوای ئەوە کاتییەتی داوای کۆمەك بکات، ئەی کێ هەیە فریادڕەسێك کەبتوانێت سادەترین مەتڵەبێك و بەدەر لە هەموو عەوامیلێکی خارجی هەر لە وجودی خۆمدا ترسم لەناو بەرێت؟ بۆئەوانەی وا لەسەر حەق دەڕۆن یەکێك لە(سەربازەکانی ئیلاهی) ئەوەی کەدەڵێت﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾* ئەوەی لەسورەتی(فتح)دا هەیە، یەکێك لە لەشکرگەلی خوا ئەوەیە کە ئازایەتی و بینش و تەصمیمگیری عاقڵانە و حەزەرکردن و ئا ئەو شتانەی مایەی خێرن بۆ ئینسان ئا ئەوانە

---

*) هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَاناً مَّعَ إِيمَانِهِمْ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً{ ٤ } الفتح.

دەنێرێت(دڵەوە)، ئا ئەوانە لەشكری خوان بۆ ئەوانەش وا ئەهلی باطلن جۆرێكی تر لەلەشكرگەلی ئەوەیە(ترس، وەسوەسە، حساباتی باتڵ...) جۆرەها لەو شتانەی وا دەكەن لە ئینسان بكەوێتە سەر باری مەنفی(نێگەتیڤ) دەخاتە دڵیانەوە! (سەرفی نەزەر لەهەرچی عەوامیلی خارجی هەیە، لەگەڵ ئەوەی دیارە كەئەم عەوامیلە دەرونییە لەكشتی گرنگترە).

ڕۆڵەكانم! ئەگەر ئینسانێك لەدەرەوە بەهێزبێت، وەك حەزرەتی حوسێن(سەلامی خوای لێبێت) دەبینێت ئەوە عەزیزانی، ئەوە ژن و منداڵ و ئەوە ئەو هەموو خۆشەویستانەی خانەدانی پێغەمبەر(ﷺ)لەبەرامبەر مەرگ و ئەسارەت و زیلەت و حەقارەتەوە قەراریان گرتووە كەچی تەسلیم نابێت (بەڵێ)یەك بۆ(ناحەق)بكات. دەی ئەگەر ئەو شجاعەتە نەبێت لەدڵیدا ئەوە وا قوەتی بەشەرییە هەمووی لەدەوری كۆبێتەوە ئەو جۆرە ئیرادەی بۆ دروست دەبێت، ئەگەر منداڵێكی كوژرا لەشكری دوژمن ئەوەندە زۆر بوون منداڵێكیان كوشت، هاوڕێیەكیان كوشت، یەك یەك هەموویان بكوژن و تاك و تەنها ماوەتەوە، هێشتای هەر بەمحكەمی بڵێت (نا)؟ گەورەترین لەشكرێك كە خوای گەورە بینێرێت بۆ ئینسان ئەو لەشكرە ناوەكییەیە(باطنی) كە دەبێـە هۆكاری ئەوەی لەسەر(حەق)محكەم بێت. ئەوە گەورەترین لەشكرە لە لەشكر و عامیلگەلی خارجی هیچ كامیان وەك ئەو نییە وەك لەجەرەیانی(بەدر)دا لەشكری ئاشكرای لە(مەلائیكە) (سەلامی خوایان لەسەربێت) ناردووە و لەپاشالیشدا (باران و با) لەڕووداوەكانی تردا... خۆیشی ئەفەرمێت"خۆ ئەمانە نین عاملی قودرەتی ئێوە، عاملی قودرەتی ئێوە خوایە و لەشكری خوایش فراوانە، كە گرنگترینی ئەوەیە دەینێرێت بۆ

(قلوبی ئینسانی موئمین)، بەڵام ئەمە بۆ ئەوەیە ئێوەی بەشەر بەشێوەیە ئاسایی حساب بۆ كۆمەكی خارجی وجودی خۆتان دەكەن بۆئەوەی دڵتان تەخت بكات، چونكە بەشێوەیەكی ئاسایی ئامادە بوونی عاملی خارجی قودرەتو دڵخۆشی دەداتە ئینسان. لەبەرئەو حاڵەتدیە لەجەنگی(خەندەق)دا لەشكری(با) دەنێرێت كەبەو جۆرە سەر دەشێوێنێ لێیان، كەئەگەر ملیۆنێك چەكدار بڕژایە بەسەریاندا بەو جۆرەی ئەو(با)یە پەرتەوازەی كردن پەرتەوازە نەدەبوون! جائەمانە شتگەلێكن (ضاهیرین)، ئەگەر نا هیچ كام لەم(سەربازە ئیلاهییان)ە بەقەدەر ئەو سەربازەی وا دەینێریت بۆ (باطن)ی خودی ئینسان سودی نییە! كاتێك تۆ بەدڵ وتت﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، و پاشان بە عەقڵ تێگەیشتی كەچی ئێژی چەند كێشە دێتە سەر ڕێگەت. جائیتر واقیعەن بەجێیە بڵێین﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، كۆمەكیش هەر لەتۆ داوا دەكەم.

جاكاتێك من بڕیارم بەو شێوەیە(بە وجودمەوە)بەندەی تۆبم ئیتر هیچ بەجێ نییە بۆم و شایستە نییە چاوەڕوانی كۆمەك لەغەیری تۆ بین، لەبەرئەوە كۆمەكیش هەر لەتۆ داوادەكەم ئەو كۆمەكە گەورە گەورە گرنگانە! كەئەگەر كۆمەكێكیش لەلایەن خەڵكەوە هات، چ برا، خزم، بێگانە، هاتن و یارمەتییان دام لەسەر باری (حەق)ئەوەش هەر كۆمەكی خوایە، بەڵام ئەگەر برای باوك و دایكم لەسەر خیلافی ڕێگەی حەق قسەی لەگەڵ كردم ئەوە دەرەوەی كۆمەكییەو كارم پێیەوە نییە.

﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ لەدوای﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، لایەقی ئینسانی موسوڵمانە.جاڕۆڵەكانم! لەبەرپرسیاریتاندا لەبەرامبەر خواوە هەر ئەوەندە دیقەت بكەن و ورد بنەوە و باش باش حاڵی بن كە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، واتای چییە، هەروەها خاسیش حاڵی بن

چ عیزەت و ئازادییەك دەداتە ئینسان بۆ دنیا و بۆ ئاخیرەتی، ئەو كاتە ئینشائەلاَّ بەدڵیش بگەنە ئەوەی بڵێن﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، كەداوای كۆمەك دەكەین. ئەمە زۆر بەكورتی. جائیتر بەرپرسیارێتییان نیسبەت بەخۆتان و گشت شتێك دەتوانیت لەبەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خواوە كورتی بكەیتەوە، چونكە ئەگەر تۆ واقیعەن﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، بزانیت ئەوكاتە دەزانیت بۆ خۆیشت چی بكەیت، دەزانیت بۆ ژن و منداڵ چی بكەیت خاسیش ئەنجامی بدەیت، هەروا كەوتم، ئەگەر ئینسان تەنها بەپرسیارێتی لەبەرامبەر خۆیەوە بزانێت كافییە بۆئەوەی بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خوایش و خەڵكیشەوە بزانێت، هەروەك ئەوەی ئەگەر بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خوای خۆیەوە بفەهمێت گشت شتێكی تر دەگرێتەوە. ئەمە لەناو مەجموعی ئەو بەرپرسیارێتییەی ئینسان هەیەتی ئەم دووانە ئێژم بەم دوو ڕوكنەوە:-

**یەكەم:** بكۆشن بە ئومێدی خوای گەورە لەسەرەتادا بەندەی (دەرون و هەوا و هەوەس)ی خۆتان نەبن، جا لەپاشانیشدا بەندەی عەواملی خارجیش نەبن، تەنها و تەنها بەعەقڵ و عیشق و دڵیش تەنها بەندەی خوابن و بزانن تەنها و تەنها تام و مەزە لەوەدا هەیە، كە تۆ گوێڕایەڵی خوابیت و هیچ شتێكی تر تام و مەزەی نییە، هەروەها هیچ شتێكی تریش عاقلاَّنە نییە. جا با نمونەیەكی بچوك بهێنمەوە كە بزانن تا هەر دووكیان بكەونەیەك، خودا سەعادەت مەندتان بكات (كوڕ دەبێتە باوك و كچ دەبێتە دایك) ئەو مەسائیلەی كە ئێستا ئێژمی لۆجیكی و فەهمی حاڵی دەبن. بەلاَّم هەموو لایەنێكی بەتایبەت(قەلبی)باش حاڵی نابن لەپاشاندا وردە وردە كاتێك بوونە باوك و دایك بیری لێدەكەنەوە و باش حاڵی دەبن هەندێك نمونەی جۆر جۆر دەڵێم

بۆئەوەی تەنها لەڕووی عەقڵەوە بێت و لەڕووی عیشقەوە نەبێت. بۆ نمونە، (كچ)ە كەسێكی زۆر خۆشناوێت، بەڵام بە بۆنەیەكەوە دەبێتە میوان یان بەهەر جۆرێك بووە پێویستییەكی پێتە و دەچێتە كۆمەكێكەوە و كاری بۆئەنجام داویت حسابی ئەوە دەكات ئەمە ئەركێكە و دەڵێت"بابچم ئەنجامی بدەم"ئەوەی خەڵك پێی ئێژن ئەنجامی وەزیفی، ئەمەی دەیكات كارێكی عەقڵییە و دڵ نییە هانی بدات، ئەمە جۆرێك! جۆرێكی تر. دایكێكی ناشارەزا لەبابەتی پەروەردەو بێئەوەی دیاری بكات چی باشەو چی خراپە منداڵەكەی پەڵپی شتێك دەگرێت نازانێ دروست ئاڕاستەی بكات و حاڵی بكات، كە خێر لەچیدایە بەقسەی منداڵەكەی دەكات. لەكاتێكدا بەمە زەرەری گەیاندۆتە منداڵەكەی لێرەدا بەقسەی(عەقڵ)ی نەكردووە بەقسەی دڵی كردووە، بە دڵ منداڵەكەی خۆش گەرەكە بەدڵ تەحەمولی ئەوە ناكات منداڵەكەی تاوێك بگرییەت، بەدڵ خەمبار دەبێت بەوەی تاوێك منداڵەكەی پەرێشان بێت لەبەرئەوەی ناتوانێت گریان و پەرێشانی منداڵەكەی تەحەمول بكات. لەولاشەوە دەركیشی نییە چی خێرە بۆ پەروەردەی منداڵ بەقسەی منداڵەكەی دەكاتو داواكارییەكەی ئەنجام دەدات، ئەمە تەنها بەگوێی دڵی كرد! ئەم دووانە هیچ كامیان ئەرزشێكی حسابییان نییە{واتە ئەگەر كارێك بكەیت تەنها (ئەقڵ) بڕیاری لەسەر بدات و (دڵ) غیاب بێت، یان كارێك بكەیت تەنها (دڵ) بڕیاری لەسەر بدات و (عەقڵ) غایب بێت ئەم دووكارە هیچیان باش نین}! كاتێك كارێك بەڕاستی ئەرزشدارە و دەگاتە ئەو ئاستەی ناوی بنێت كارێكی واقیعەن ئینسانی و بەرز، هەم بە(عەقڵ)بێت، هەم(بەدڵ). وەك ئەو دایكە یان باوكە بەڕاستی منداڵی خۆشدەوێت و بەباشی تەبشیر دەدات





چی خێر هەیە و چی خێری نییە. ﴿وەك ئەو دایكەی كە منداڵەكەی داوای شتێكی لێدەكات بە عەقڵ و دڵ بیری لێدەكاتەوە و لەدوایدا دەگات بەوە) كە هەم دڵی پێی دەڵێت ئەو كارە ئەنجام بدات بۆ منداڵەكەی، هەم عەقڵیشی پێی دەڵێت ئەوە ئەركتە و خێرە بۆ منداڵەكەت ئەنجامی بدە. كاری جوان و ئەرزشداری ئینسانانە ئاوایە.

جارۆڵە گیان! ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾یش وایە، كاتێك بەڕاستی ئیتاعەت و بەندەگی لەبەرامبەر خواوە لایەقی ئەوەی هەیە پێی بڵێت ئیتاعەت و بەندەگی، هەم بەعەقڵ دیاری بكەم خوا چی لەمن دەوێت، هەم بەدڵ ئاواتی ئەوەم هەبێت ئیتاعەتی خوا بكەم! بزانم ئەمە ئەصڵەن وا جوانە و لایەقی ئینسانیێتی منە موتیع و بەندەی خوابم، غەیری ئەو هیچ شتێكی تر جوان و ئەرزشدار نییە. هیچی تر محبوب نییە قابیلی ئەوە نییە من عەلاقەی پێوەپەیدا بكەم، نە ماڵی دونیا، نە ژن، نە پیاو، نە منداڵ هەر شتێك ئەگەر لای دابوو لەڕێگەی خودا قابیلی ئەوەی نییە عیشق و محبەتی پێ پەیدا بكەم، تەنها هەموو موحیبەتێكم بەشەرتێك موتابیق بێت لەگەڵ ڕێگەی خوا بەگوێی دەكەم، بۆ نمونە ئەگەر (پیاو)ی ژنێك، پیاوێك بێت ئەهلی دزی، فەساد، غەیبەتی خەڵكی، حەسودی بەرامبەر بە خەڵك، مەشروب خواردنەوە. تۆئەگەر ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، دروست بێت لەمەوردی ئەمانەدا موتیعی (پیاو)ی خۆتنیت و لایەنگری ناكەیت و ڕووی خۆشیشی پیشان نادەیت، تاوەكو بەهەمیشە موتەوەجیە ببێت بەرامبەر بەو كارانەی ناڕازییە ئەگەر(پیاو) زەڕەیەك(ئینحراف)ی هەبوو لەڕێگەی خوا هێشتا(ژن)حاڵەتی هیچ فەرقی نەكات، چونكە هەندێ كات هەیە كەبەرژەوەندی ئینسان وایە كە نەیخاتە ڕواڵەت، ئەوە ناڵێم، ئەوە دەڵێم

(ژن)ئەصڵەن موقەیدی خوا نەبێت، ئا لەبەرئەوە ئەهمییەتی نەبێت بۆی و (پیاوەکەی) گرنگتر بێت بۆی ئا ئەو(پیاو)ە تاعون و بتە بۆی و لە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، لایداوە. منداڵیش، ئەگەر لایەنی خەتا و ئینحرافی گرت و هەر بەردەوامی موحیبەتی لەگەڵ بکات هەروەك چۆن بۆ کاری چاك دەچێت ئەوە لەو کاتەشدا ئەو ژنە لایداوە لە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، جا ئیتر باوك و برا و کەسوکاریش هەمووی ...ئەمانە بەناونیشانی نمونەیەك دەیانڵێم، تاوەکو (ژن) باش تێبگات (باوك و دایك و براو خوشك و مام و خاڵ و پوور و کەسوکار و منداڵ) هەمووی کاتێك لەئینسانی موسوڵمان جوانە و ئەرزشی هەیە موتابیق بێت لەگەڵ محبەتی خوا، لەگەڵ مەفهومی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، ئەگەر زەڕەیەك موخالەفەتی لەگەڵ ئەو بوو ئیتر بۆ ئینسانی موسوڵمان نالەبارە، هەم بۆ خۆی شەڕە و هەم بۆ لایەنەکەی تریش شەڕە! ئەویش بەڕواڵەت سازگاری دەکات نازانێت و خیانەت بەویش دەکات، ئەمە بۆئەوەی باش حاڵی بین محبەتی هەر شتێکی تریش هەتا محبەتی ماڵی دنیاش ڕاستە، شتێکی پەسەندە و هیچ کێشەیەکی نییە و ماڵەکەی خۆت خۆش بوێت و خۆت خۆش بوێت و حەز نەکەیت لافاو بیبات، بێ گوێ پێدان و حسابی بۆ ناکەیت جا دیوارێکیش بڕوخێت، هەر کاتێك لایەکی خراپ دەبێت گرنگە خزمەتی بکەیت... جلوبەرگ و شتەکانت دەبێت باش ئاگاداریان بکەیت... محبەتی ماڵی دونیاش هەر وەك محبەتی خزم و کەس و کار و عەزیزانت ئەرزشدارە، بەڵام هەمووی دەبێت بەشێوەی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، هەڵسەنگێنیت، ئەگەر لەگەڵ ئەوەداپێچەوانە بوو ئەوە ئافاتە! بۆنمونە ژنێك ماڵێکی هەیە، گریمان لە باشترین ماڵەوە بیگرە تا ماڵێکی زۆر سادە. زۆر باشە (ژن

وپیاو)خۆشیان بوێت و نەهێڵن وێرانببێت، بەڵام ئەگەر سبەی وایلێهات كابرایەكی خاوەن هێز بێژێ "فڵانە ناحەقیم بۆ ئیمزابكەیت، یان ماڵەكەت لێدەستێنم". ئەگەر ماڵكەت ئەوەندەخۆشویست وتت "قەیناكە باماڵكەم نەڕوات ئیمزایەك دەكەم" ئەوە ئیتر ئەو ماڵەی بۆتە(بت) و لایدا لەڕێگەی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، كاتێك ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بێژیت، باشترە ماڵەكەم بڕوا، ئیمزایەكی ناحەقی ناكەم، كە خوا پێی ناخۆش بێت و لەڕێگەی بەندەگی خودا لام بدات و ببمەئەسیری موحیبەتی ماڵەكەم. ئەوەش ئەسارەتە! ئەسارەت و بەندەگی خەڵكی دژایەتی هەیە لەگەڵ بەندەگی بۆ (خوا) ئازادیەو هیچ شتێك ناتوانیت ئەمری بەسەردا بكات.

دووەم: لەناو ئەو بەرپرسیاریەتانەدا،كەوتم ، بریتیە لە باسی (شوار) و (تەشاور):

ڕۆڵەكانم! بەرامبەر بەتەواوی مەسائیلتان، هەتا نیسبەت بەمەسائیلی شخصی خۆتان، ئەو شتانەی وا بەدیهی نییە و ڕۆشن نییە، و موباحە. ئەوەی وا بەدیهییەوە یا واجبە یا موستەحەبە و ئینسان دەزانێت، بەرامبەرەكەشی دەزانێت كە(حەرامە)، بەلاّم شتی وا هەیە (موباحە) و لەموباحادا ئینسان دەتوانێت هەزار جۆر ڕەفتار بكات، لە تەواوی موباحادا گرنگە( ژن و پیاو)بۆ تەواوی بابەتە شەخصیو فەردیەكانیشیان عادەت بكەن بەوەكە (تەشاورتان هەبێت، تاوەكو دەكاتە مەسەلەی ماڵیان بە تەشاور و ئاڵوگۆڕی بیروڕا تەصمیم بگرن. مەبەستم لەماڵ لە تەواوی ئەوەی پێویستییان پێیەتی لە بچوكەوە تا گەورە، تەصمیمی درێژ بگرن مەسەلەن بۆ ساڵێك وەك خواردنی سالأنە، وەك فەرش و نوێن و ئەو شتانە، خانوو، وەك باقی ئەوانەی وا بۆ خانەوادەیەك مەترەحە جۆری زیندەگی كردنمان دەرەجەبەندی

زیندەگیمان، هەرچەند دەرەجەبەندی زیندەگیمان لەئەرکەکانی شەخصی پیاوە، بە بەڕێوەبردنی داخلی ماڵ ئەرکی ژنە.

ڕۆڵەکانم! لەفەردیترین مەسائیلی شەخصیتانەوە، تاوەکو دەگاتە ئەوەی ئەرکتانە بەرامبەر خانەوادەتان هیچ کات بەبێ (تشاور) کارمەکەن، بەڵکو بەتشاور و ئاڵوگۆڕی بیروڕاوە کاربکەن تادەگاتە ئەوەی چۆن پێشوازی لەمیوان بکە. هاتوچۆ لەگەڵ خزم و کەسوکاردا چۆن بێت لەگەڵ خزم و کەسوکاری(پیاو)دا، لەگەڵ خزم و کەسوکاری( ژن)دا. کەدەبێت خزم و کەسوکاری یەکتری وەکو یەك سەیربکەن، ئەو ئەرکەی کەبەرامبەر(ڕەحم) لەنێوانیاندا ئیتر هەردووکی تێکەڵ دەبێتەوە. (پیاو)کەجاران بەرپرس بووە لەبەرامبەری ئەرکی (ڕەحمییەتی) خۆی تبقی ئەوەی وا ماڵی بووە، ئەوەی وەزیفە دەکات بەرامبەر خزم و کەسوکاری (ژن) و هەردووکیان وەك یەك سەیردەکات، (ژن)یش جاران لەبەرامبەر(برا، خوشك، دایك، تاوەکو دورترینی) یەکێك هەیبووە ئێستا ئەوەی دەبێت بەئیزافەی خزم و کەسوکاری پیاو. واتە لێرە بەدواوە ئەو بەرپرسیارێتییەی کەبەفەرز بۆ خزم و کەسوکار هەیانبووە هەردووکیان بەرامبەر بەکەسوکاری هەردووکیان دەیانبێت. بۆیە دەبێت دابنیشن و بەئاڵوگۆڕی بیروڕا و تەصمیم و بەرنامە دابنێن کە چۆن بن باشە، لەسەرەتاوە ئەوەی واحاڵیان هەیە لەبارەی پێوەرەکانی دینەوە، کە واجب دەزانن و موستەحەب دەزانن و ڕوونی بکەنەوە، (جائەمە باسێکی ورد)، بەڵام ئەصڵ ئەوەیە کەلە مەوردی ئەم ئەرکەدا لەبەرامبەر خزم و کەسوکارەوە، یاخود(هاوسێ) و (دۆست)کە ژن و پیاو بەرپرسیارێتییان هاوبەشە لەبەرامبەر گشتییەوە دەبێت دابنیشن و لەم بارەیەوە ئاڵوگۆڕی

بیرورِا بکەن، هەر بەو شێوەیە تادەگاتە باقی مەسائیلێك کە ئیحتمالی هەیە بۆتان بێتە پێشەو، ئەویش دونیایەکی فراوانترە کاتێك کە مندالێکتان دەبێت، کەمندالی یەکەم هەندێك مەسائیلی هەیە و مندالی دووەم هەروا و مندالی سێیەم و چوارەم بەو جۆرە.... جا هەرکاتێك ئەندامێك زیاد دەکات بۆ خانەوادە بەرپرسیارێتی زیاد دەکات، جا سادەترین مەتلەبێك کەلەبەرامبەر مندالەوە بێت بێژمی لەپێش هەموو شتێك ئەوەیە کەئەم(ژن و پیاوە) خۆیان دروست بەکەن! لەپاشانیشدا ئەرکەکانیان لەبەرامبەر یەکەوە دروست بکەن...

# پەیوەندی ئابووری نێوان ژن* و پیاو

لەم باسەدا دەمانەوێت ئەگەر زۆر بە کورتیش بووە دەربارەی بابەتێکی زۆرگرنگ قسە بکەین، ئەویش بابەتی (ئابووری)ە لە ژیانی ڕۆژانەی (کوڕ و کچ)ێکدا. چونکە ئەم باسە یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ڕاگیرکردنی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ژن و پیاودا دروست دەبێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە ڕاستەوخۆ بەشداریدەکات لە بەڕێوەبردنی کارو چالاکی ڕۆژانەدا و ڕۆڵیشی دەبێت لە بەرنامە داڕشتندا بۆ ئایندەیەکی دوور. لەم باسەدا (کاك ئەحمەد) هەوڵدەدات بەکورتی خانەوادە و کۆمەڵگە هۆشیاربکاتەوە لەو پەیوەندییە ئابوورییەی لە نێوان ژن و پیاودا هەیە و لەم ڕێگەیەشەوە ئەو زوڵم و ناڕەواییەی بەرامبەر بە ژنا دەکرێت دەربارەی خەرجی کێشانیان چارەسەری بکات و ژنان ئاگاداربکاتەوە، کە لە ئیسلامدا خاوەنی ئابووری سەربەخۆی خۆیانن و توانای کارکردنیان هەیە، ئەمە لەکاتێکیشدا ئەگەر دەست بۆ یەك کار نەبەن و تەنها لەماڵەوە دابنیشن لەسەر پیاوان واجبە ئابووریان بۆ دابین بکات... هەر لەم باسەدایە (موفتی زادە) بابەتێکی گرنگ دەرەوژێنێت دەربارەی جۆرایەتی ئەو ئیش و کارەی کە پێویستە ژنان ئەنجامیان بدات، ئەمە جگە لەوەی ئەو بنەمایە هەڵدەوەشێنێتەوە کە ئاماژە بەوە دەکات بۆ ژنان نییە ئیش و کاربکەن و ببنە خاوەنی ئابووری خۆیان، بۆیە دەڵێت" ئەوە

---

*) لەبارەی ژن(ئافرەت)ەوە لە پاشکۆدا باسێکی سەربەخۆ بلاوکراوەتەوە، کە تێیدا (کاك ئەحمەد) هەوڵدەدات دەربارەی ئاسنامە و ئەصڵی ئافرەتەوە هەندێك ڕونکردنەوە بدات، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومان و پرسیارانەی دەربارەی ئەصڵ و پێکهاتەی ئافرەتان بلاَون....





بزانن شتێكی بەو جۆرە نییە بڵێت (لەئیسلامدا ژن مافی نییە(حقوق) وەربگرێت، بەڵكو(ئابوری ژن) لەئیسلامدا تەواو موستەقیل(سەربەخۆ)كامڵ كامڵە، ئەوەندە هەیە لە ئیسلامدا هەندێك لە تەكلیفات لەسەر ژن نییە، مەگەر لەكاتی پێویستدا وەك تەكلیفاتی(جەنگ). جەنگی ڕووبەڕوو جەستەی ئەویش كاتێك ژمارە كەم بێت و پێویست بكات ئەگەر نا تەكلیف ناكرێت و ژن مەجبورر ناكرێت بڕوات بۆ جەنگ، مەگەر ئەوەی خۆی داوابكات و مەیلی هەبێت، بەڵام لەكاتی جەنگدا پیاوگەل هەر كەسێكیان توانایی هەبێت و ساغ بێت مەجبوورە بەئەندازەی نیاز دەبێت بڕوات، بەڵام ئەم تەكلیفە لەژن ناكرێت...ئەگەرنا لەیاسای ئیسلامدا هیچ ڕێگرییەك نییە بۆ ئەمە كەژن كار بكات و حقوق بسێنێت، هەتا ئیسلام هەندێك لە كارگەل كەدیقەت و عاتفەی پێویستە تایبەتی دەكات بە ژنەوە و مەگەر كاتێك ژن نەبێت پیاو بێت بیكات، وەك (جەنگ)كەمەگەر پیاو نەبێت ژن بیكات، مەگەر كاتێك ژن نەبێت پیاو موتەعەهیدی بێت، وەك(مامۆستایی)بەتایبەت (مامۆستایی منداڵ)كە دیقەت و زەوقێكی زۆری دەوێت، وەك پزیشكی و ئموری پزیشكی و وەزیفەگەلی جیاوازی پزیشكی، بەشێوەیەكی ئاسایی ئەمانە لەوەزائیفی ژنە...(بەهۆی ئەمانەشەوە ژن دەتوانێت حقوق وەربگرێت و ببێتە خاوەنی ئابوری سەربەخۆی خۆی..."، هەروەها (موفتی زادە) دەربارەی ئەو (پەیوەندییە ئابوورییەی لە نێوان ژن و پیاو) هەیە و پێویستی بەوە هەیە ورد و شارەزایانە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، بۆئەوەی نارەوای ڕوونەدات، بەم شێوەیە دەستپێدەكات "یەكێك لەبابەتە زۆر گرنگەكان لەئیسلامدا بەداخەوە سەرنجی نەدراوە و لەبیرچۆتەوە بریتییە لە(پەیوەندی ئابووری) نێوان (ژنو




پیاو)! کاتێك ژنێك لەگەڵ پیاوێکدا دەبێتە شەریکی زیندەگی و بەرنامەی زیندەگی هاوبەش پێکەوە دادەنێن پەیوەندی ئابوری ئەم دووانە، واتە لەڕووی ماڵ و سەروەتەوە چی بابەتێك دەکەوێتە نێوانیانەوە؟

زۆر سادە بێژم، ژنێك لەگەڵ پیاوێکدا بڕیاری هاوبەشی ژیانیدا هەرئەوەندە ئەو ژنە لەو ماڵەدا زەحمەتێك بکێشێت دەبێتە هاوبەشی زیندەگی لەو ماڵەدا، وەك مەسەلەن دووکەس بەیەکەوە دوکانێکیان هەبێت یان چەند نەفەر بەیەکەوە سەروەتێکیان هەبێت کارگە و چالاکییان هەبێت، ژن وەك ئەوە دەبێتە شەریکی پیاو لەڕووی شەرعییەوە ژن موکەلەف نییە لەماڵی پیاودا موفتە و بەبێ هیچ جۆرە عەوەزێك هیچ کارێك بکات لەکاتێکدا خەرجی لەسنوری وەصەتدا بەو ئەندازەی کەپیاو توانایی هەیە دەکەوێتە سەرشانی پیاو، واتە هەر پیاوێك ژنێکی خواست تەعەهودی شەرافەتمەندانە و مەردانەی هەیە بەنیسبەتی توانایی خۆی و ژنەکەی بژێنێت، چ ئەم ژنە دەست لە(ڕەش و سپی) بدات یان نەیدات.کاتێك ژن لەماڵی پیاوەکەیدا کاری کرد و زەحمەتی کێشا بەنیسبەتی کار و زەحمەت هاوبەشە، جائەم ماڵ و سەروەتە لەوەودوا لەنێوان ئەم ژن و پیاوەدا دەبێت بەنیسبەتی ئەمەوە کەکامیان زیاتر مەنشەئی خزمەت بووەو زیاتر دەرامەتو بەرهەمی هەبووە تەعەلوق پەیدادەکات بەژنو شووەوە، بۆ نمونە پیاو ماڵ و توانایەکی هەیە کاتێك زیندەگی هاوبەش لەگەڵ ژندا دادەمەزرێنێت، لەپاشاندا ژنەکە چالاکی کەمی هەیە لەماڵی ئەم پیاوەدا، بەڵام چالاکی پیاوەکە زۆرترە دیارە لەماڵێکدا زیاد دەکات یان بەردەوامی دەبێت کەبووە پیاو بەشی زۆرترە تاوەکو ژن ئەگەر بەم شێوەیە بێت.کاتی واهەیە ئەرزیابی کاریان بکرییەت ئەرزشی مادی




كاریان دەبێتە یەك بەئەندازەی یەك كاریان هەیە و زەحمەت دەكێشن كاتێك ئابەم جۆرەیە هەرچییەك لەوكاتە كە زیندەگی هاوبەش دەستی پێكردووە دەرامەتیان دەست دەكەوێت، هەرچەند خەرجیش بكرییەت ئەوە هاوبەش دەبێت لەنێوان ژن و پیاودا.

ژن هەیە چالاكی لەپیاو زیاترە، هەموو دیومانە هەندێك پیاو هەیە نەخۆشن و ناتوانن‌و ڕێگەی كارو كاسپییان نییە، بەلاّم ژنگەلێك هەن(تەونەگەری) دەكەن، زەحمەتگەلی جۆراو جۆر دەكێشن، ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەڕۆن كار دەكەن بەشێوەی جۆرجۆر، یان هەر بەئیدارەی صەحیح ماڵ ئەم ژنگەلە لەماڵدا بەشیان زیاترە لەشوو(پیاو). جائیتر ئەندازەكەی بەووردی نازانرێت، چونكە لەنێوان هەر ژن و پیاوێكدا پەیوەندی ئابوری بەجۆرێكە و میقداری زەحمەت و چالاكی پیاو یان ژن جۆرێكە، وانییە كەبێژی هەر ئەم (سێ)دەستە بێت كەباسمكرد و هەر دەستەیەك بەمیقدارێكی دیاریكراو، وانییە كەبێژین هەندێك خانەوادە پیاو لەسەدا ئەوەندە حەقی زیاتری هەیە لەماڵدا ببات، ژن لەسەدا ئەوەندە حەقی زیاتری هەیە، یان هەردوكیان یەكسانن، نـا بەم جۆرە نییە كەتەنها ئەو سێ دەستە دیاریكراوە بن، ئەوانەیان لە(چالاكی و زەحمەتدا)یەكسانن ئەوە ئاسانە، بەلاّم ئەوەی كەئێژین ئەگەر پیاو زیاتری هەیە لەژن هەزاران شێوەی هەیە، یان ئەوەی كە ئێژین ژن زیاتری هەیە لە پیاو ئەویش هەر بەوجۆرە شێوەیەكی دیاریكراوی نییە. لەپاشاندا دەبێت لەڕێگەی باس وصولّحەوە دەربكەوێت، سادەترین شێوەی كۆمەكی ژن لەماڵی پیاودا ئەگەر هیچ جۆرە دەرامەتێكی نەبێت و كارێكی بەرهەم هێنەری نەبێت، ئەمەیە مەسەلەن ماڵەكە بەڕێوە دەبات، پاك وخاوێنی ماڵەكە تەئمین دەكات،

چێشت و خۆراك دروست دەكات، ئەم جۆرە خزمەتگەلەی وا ژنگەل هەیانە لەماڵی پیاودا، چونكە شەرعەن موكەلەف نین ئەم كارگەلە بكەن، ئەم كارگەلە بەناونیشانی هاوبەشی زیندەگی پیاو دەیكەن، بەنیسبەت ئەوەوە ئەگەر ژن ئەو كارگەلە لەجێگەیەكی تردا بیكەن نرخی وەصەتی ڕۆژ چەنێكە بەو نیسبەتە دەبنە شەریك لەماڵی پیاودا! واتە ئەگەر ژن ئەم كارانە لەماڵی خەڵكی تردا بیكات، گریمان ڕۆژی(پەنجا)تمەنی دەدەنێ...ئەم ژنە بەو نیسبەتە شەریكە لەماڵی ئەو پیاوەدا! چونكە ئەو كارەی كەدەیكات تەكلیف نییە بەسەرییەوە كەبێت ماڵ بەڕێوەبەرێت و گسك بدات لەماڵ و چێشت دروست بكات و هەتا منداڵ بەڕێوەببات، ئەم تەكلیفانەی لەسەر نییە مەگەر بەناوی شەریك، ئەوە بەناوی شەریكی پیاوەوە ئەم زەحمەتگەلە دەكێشێت لەسەریەتی خزمەتی ماڵ و منداڵ بكات، خزمەتی میوان و پیاو بكات جۆرەها كار كەلەماڵدا دەیكات، واتە ئموری ناوماڵ بگرێتە ئەستۆ و بەڕێوەی بەرێت. وو كەس شەریكن پیاوەكە هەندێكی دەگرێتە ئەستۆ و ژنەكەش هەندێكی تری،. دووبارە ڕوونی دەكەمەوە براگەلی موسوڵمان گشتی ئەمە بزانن ئەگەر ژنێك دەست بە(ڕەش و سپییەوە) نەدات و هیچ كارێك نەكات، هێشتا پیاو موكەلەفە و دەبێت بەپێی توانایی خۆی خەرجی ئەو ژنە بكێشێت، خەرجی(مەسكەنی، خۆراكی، جل و بەرگی)، هۆشتان بێت پیاوان وا بیرنەكەنەوە و بێژن ئێمە نان و جل و بەرگ وخەرجی و مەسكەنی لەبەرامبەر ئەوەوە دەدەین مەسەلەن(چامان بۆ لێبنێت)، چێشت دروست بكات و منداڵەكان بەڕێوەبەرێت، پاك و خاوێنی ماڵەكە بدات بەڕێوە، نا...هەر لەبەرامبەر ئەوەوە كە وتویەتی (بەڵێ من حازرم ژنی تۆبم) دەبێت تەواوی ئەم




خەرجییانەی بکێشێت ئەگەر هیچ کارێکیش نەکات. ئاگات لەوە بێت. ئەوەی کەکار دەکات لەماڵی پیاودا دەیکاتە شەریکی پیاو لەو ماڵەدا مەگەر خۆی گەردنی ئازادبکات و بێژێتە پیاوەکەی"قەیدی نییە کۆمەکێکە بێ عەوەز دەیکەم، کارێکە دەیکەم وچاوەڕێی هیچ قەرانێك ناکەم"، ئەگەر خۆی گەردنی ئازاد نەکات شەریکە.

جا بیری لێبکەنەوە، مانگێك، دوو مانگ، ساڵێك، دە ساڵ...پەنجا ساڵ ئەم ژنە ئەگەر لەشوێنێکی تردا بووایە لەغەیری ماڵی ئەم پیاوەدا و بەپارە ئیشی بکردایە چەنێك دەرامەتی دەبوو؟ هەر چییەك لەماڵی ئەو پیاوەدا گوزەراندویەتی و کاری کردووە بەو نیسبەتە دەرامەتی دەکەوێت ساڵێك لەلای پیاوەکەیەتی و لەوەودوا گەرەکیانە جیابنەوە وا حساب بکەن ئەم ژنە ئەم یەك ساڵە لەشوێنێکی تردا کاری بکردایە دەرامەتی چەنێك دەبوو؟ ئێستا شەریکایەتییەکەیان جیادەکەنەوە گەرەکیانە لەنێوان خۆیاندا ماڵ بەش بکەن ئەو ژنە حەقی ئەو یەك ساڵەی دەکەوێت هەڵبەتە بەڕێگەی صولح، چونکە ئەو شتانە بەوردی دیاری ناکرێت ئەساسیش لەئیسلامدا ئەوەیە هەر جۆرە جیاوازییەکی مەعنەوی یان مادی لەنێوان دوو ئینساندا هەبێت بەڕێگەی صولح و حەل و فەصڵ ببێت ئەمەش لەبەرئەوەیە کاتی وا هەیە ئەگەر بڕیار بێت کابرا بەش جیابکاتەوە لە گەڵ ژندا حساب بکەیت(وەك وتم هەندێك جار ژنەکە زۆر زۆرتر دەرامەتی هەیە و بەرهەمی هەیە تاوەکو پیاوەکە، چونکە هەم کاری ماڵەوە دەکات و لەماڵەوە کارگەلی بەرهەمداری دەکات وەك( تەونەگەری و گۆڕاو و جاجم..ئەم جۆرە کارگەلە..) ژنگەلی واهەیە دەڕوات لەدەرەوە کار دەکات،ئەگەر بڕیار بێت بەشی ئەمانە بدرێت





سەیردەكەیت كابرا هیچ نییەو قەرزاریش دەبێت بۆیە دەبێت ئەمانە لەڕێگەی صوڵحەوە حەل بكرێن و لەنێوانیاندا نەمێنێت، بەڵام مەبەست ئەوەیە ژنێك چەندساڵ زەحمەتی كێشاوە گریمانەی ئەوە بكەین ژنی پیاوێك نەبوو. ئایا ئەم چەند ساڵە كاری كردووە هەرگیز لەكۆتایدا دەستی خاڵی دەبوو؟! لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە بێ ئینصافگەل كاتێك ژن و شوو جیادەبنەوە لەیەك ژن بەدەستی خاڵی دەردەكەن(بڕۆ خواحافیزت بێت)!! ئەگەر ئەو ژنە ئەو چەند ساڵەی لەماڵی ئەو پیاوەدا زەحمەتی كێشاوە و ڕەنجی تەحەموول كردووە و ئازار و فشاری خستۆتە سەرخۆی، ئەگەر بڕۆشتایە لەشوێنێكی تردا كاری بكردایە نیوەی دەرامەتیشی وەربگرتایە، نیوەی موچەشی وەربگرتایە، چەنێك زیندەگی خۆشتر دەبوو؟! لەكاتێكدا لەماڵی پیاودا بەهەر حاڵ خەرجی لەسنوری وەصەتدا لەسەرشانی پیاوە و دەبێت خەرجی موفتە تەئمین بكات، جا لەوەودوا هەرچی كار دەكات هینی خۆیەتی، حسابی ئەوە بكەن كەئەگەر ژنێك خەرجییەكەی دەبێت بكێشرێت، لەپاشاندا دەرامەتیشی هەیە لەبەرامبەری ئەو خزمەتانەی ڕۆژانە دەیكات ئایا چەنێك وەزعی باش دەبێت؟ جا بیری لێبكەنەوە یاسای ئیسلام بەم جۆرەیە. چەنێك نامەردییە بۆ پیاوێك كەبێژێتە ژنەكەی"بڕۆ تەڵاقت كەوتوو بڕایەوە". جا زۆرینەش ئەو جۆرە لەتەڵاق دێت بەزمانیاندا كەلە ئیسلامدا ئەرزشی نییە و قسەكە موزەخرەف و پوچە! لەپاشاندا فتوا دەدرێت كەبەڵێ تەواو بوو بڕیاوە، تەڵاق كەوتوو ئیتر ئەم ژن و شووە لەیەكتری حەرام بوون، ژن سەرگەردان دەبێت، سی، چل ساڵ تەمەنی سەرف كردووە و ڕەنج و هەوڵیداوە كەچی لەكۆتایدا بەدەستی خاڵی دەریدەكەن و پاشان پیاویش دەڕوات لەسەر ئەو هەموو زەحمەتەی ژن

دادەنیشێت!! دەی توخوا ئەمە مەردانەگییە؟ ئەمە دروستە بۆ پیاو كە ژنێك چەند ساڵ زەحمەت بكێشێت كەئەگەر لەهەر جێگەیەكی تردا بوایە زیندەگییەكی زۆر ڕەحەت و خۆشی بەخۆی تەئمین دەكرد ئێستا بێت بڕواتە دەرەوە و لە(سی، چل)ساڵ زەحمەتی مەحروم بێت بەدەستی خاڵی؟! لەپاشاندا پیاو بەرهەمی ئەو زەحمەتە بخوات كەئەو كێشاویەتی. لەئیسلامدا شتی وا نییە یاسای ئیسلام ئەوەیە ژن و پیاو شەریكی زیندەگی یەكترن هەركاتێك ژن مەیلی هەبێت دەتوانێت بێژێ "ئەوەی تائێستا زەحمەتم كێشاوە جیای دەكەمەوە". هەتا ئەو كاتەی لەگەڵ پیاوەكەیشیدا زیندەگی دەكات دەتوانێت ئەوە بڵێت (هەڵبەتە خوانەكات لەنێوان ژن و پیاودا نەگونجانی بەوجۆرە ڕووبدات، بەڵام ئەگەر مەیلی هەبێت دەتوانێت). لەپاشانیشدا دەتوانێت بێژێ"ئەصڵەن من هیچ كار ناكەم". پیاو موكەلەفە نەفەقەی بدات، نەفەقە لەسنوری توانایی خۆیدا بۆیە وەلامی پرسیارەكە ئەوەیە، كەئەگەر پیاوێك لەسنوری توانایی دەسەلاتی خۆیدا نەفەقەی ژن نەكێشێت ژن لەڕێگەی ئاساییەوە لەسەرەتادا دەستدەكات بەوەی كە پیاوەكەی قەناعەت پێ بهێنێت و وایلێ بكات تەسلیم ببێت و ئەركی دینی خۆی ئەنجام بدات، چونكە ئەمە زوڵمە لەئەم ژنەی دەكات چ كار بكات، چ نەیكات ئەو دەبێت خەرجی بەئەندازەی تواناییەك كەهەیەتی نەفەقەی بدات، ئەگەر دەوڵەمەندە زۆر، فەقیرە كەم. ئەگەر هەر نەیكرد حەقی ئەم ژنەی بەسەرەوەیە بەهەرجۆرێك كەژنەكە حسابی بكات دەرامەتو خەرجی ئەم پیاوە ئیقتزا دەكات دەتوانێت لەماڵی ئەو پیاوە كەم بكات بۆ خۆی، حەڵاڵە و پاك وتەمیزە و هیچ كێشەیەكی نییە ئەوە لەلایەكەوە، لەلایەكی تریشەوە ئاخر خۆیشی شەریكە

بۆچی ئەمەیان لەژنگەل شاردۆتەوە؟! خۆی شەریكی ماڵەكەیە و بەشی هەیە بۆ هەر خەرجییەك مەیلی هەیە، حساب بكات چەنێك بەشی هەیە خەرج بكات لەو ماڵە هەڵبەتە ئەصڵ ئەوەیە بە گونجاندن و موحیبەتەوە بێت، بۆئەوەی شك و دوودڵی دروست نەبێت لەنێوانیاندا گومان دروست نەبێت لەنێوان ژن و پیاودا حەقی ئەوەیە ژن و پیاو هیچ لەیەك نەشارنەوە و قسەیەكی نهێنییان لەیەك نەبێت ئەمەش كەژنگەل بەو جۆرە بەشیان خوراو پیاوگەل بەو جۆرە زوڵم دەكەن لەژنگەل، خۆ خەتای پیاوی فەقیریش نییە، بەڵكو خراپ حاڵی كراون و حەقیقەت بەپیاو نەوتراوە كەئەم ژنگەلە لەبەرامبەر كارێكەوەی كە دەیكەن شەریكن لەم ماڵەی ئێوەدا، چونكە نەوتراوە ئەمە بڵاوبۆتەوە كە پیاوگەل وادەزانن ژن بەبێ ئیجازەی ئەوان حەقی نییە(قەرانێك) لەو ماڵەدا خەرج بكات! ئەمە خەتای پیاو نییە و نابێت ژنگەل ئەمە بەخەتای پیاوگەل بزانن، دەبوایە ئەم حەقائیقە بوترایە و حاڵی بكرانایە چ ژنگەل، چ پیاوگەل، دەی نەوتراوە و هیچ لایەكیان نایزانن. بەڵام خوشكانی موسوڵمان ئەمە بزانن!

یەكەم: هەر پیاوێك لەئەندازەی توانایی خۆیدا دەبێت خەرجی ژنی خۆی بكێشێت.

دووەم: هەرچی ژن كار دەكات بەنیسبەتی كاری شەریكە لەماڵی پیاودا، بەڵام بۆئەوەی سودوەربگرێت لەو بەشە كەهەیەتی تادەكرێت جۆرێك بێت بە تێگەیشتنەوە بێت بە ئیختلاف نەبێت وانە بێت بەبێ ئاگاداری پیاوەكەی (هەرچەند ئەگەر پیاو رێك نەكەوت حەڵاڵە بەبێ ئاگادای پیاوەكە پارە لەو ماڵە خەرج بكات)،بەڵام بەم جۆرە نەبێت باشترە بەتێگەیشتنەوە كاربكرێت باشترە، ئەگەر هەر نەكرا جائەو كاتە ژن حەڵاڵییەتی لەبەرامبەر




نەفەقەکەیەوە کەبەسەر پیاوەکەیەوە هەیەتی لەسنوری توانایی پیاوەکەیدا خەرج بکات، لەبەرامبەر بەشێکەوە کەلەومالەدا هەیەتی بەهەر ئەندازەیەك مەیلی هەبێت بەهرە بیات، بەڵام کە بەهرە دەبات ئیتر بەو ئەندازەیەی (دەیبات)بەشی لەشەریکایەتییەکە کەم دەبێتەوە.

لێرەدا دووبارە تەئکید بکەمەوە لەبارەی ئەم شەریکایەتییەوە کە ژن و پیاو هەیانە بەیەکەوە، کە تەصەوری ئەوە نەکرێت کەئەمە خەتایی پیاوگەلە، بەڵکو ئەم حەقیقەتە نەوتراوە نە ژن نە پیاو ئەصڵەن تەواوی موسوڵمانگەل حاڵی نەکراون لەوەی کەژن تەکلیفی هیچ کار و زەحمەتێکی لەسەر شان نییە لەماڵی پیاوەکەیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ ئەوەی کەمترین کار بکات دەبێت نەفەقەی بدرێت. بینا لەسەر ئەمە کەس لەمەدا موقەصیر نییە و شتێکە موسوڵمانان ئاگایان لێی نییە ئەمە یەك. دووەم: ئەوەی ڕونکردەوە نابێت مەسائیلی ماڵی ئەوەندە گرنگ بێت ئەرکی ئەخلاقی ژێرپێ بخرێت و فیدابکرێت، ژنگەل موتەوەجیە بن کەئەخلاقی ئیسلامی وا پێویست دەکات بەنی ئادەم، ئەگەر ملیۆنەها تمەنیشی لەناوبچێت لەبەرخاتری جێبەجێ کردنی ئەرکێکی ئەخلاقی بەلایەوە گرنگ نەبێت. بینا لەسەر ئەمە "نەڵێین ئەمە چونکە حەقمانە ئیتر(سینەدڕێ) بکەین لەسەر حەقی خۆمان و هەرچی موحیبەت و پەیوەندی صەمیمانەیە گشتی لەناوبەرین"(ولا تنسوا فضل بینکم) پەیوەندی دەبێت گوزەشت و میهرەبانی و موحیبەتەوە بێت لەگەڵ یەکتریدا، بۆیە بەو جۆەری وتم: ئەگەر پیاوێك هەر ئەرکی خۆی نەزانی و زۆر ڕەفتاری ناپەسەند بوو لەگەڵ ژنەکەیدا، لەبەر نا شارەزایی و نا ئەخلاقی ئیسلامی ژن هەتا دەتوانێت هەوڵ بدات بەشکوم پیاوەکە حاڵی بکرێت و بۆی ڕۆشن





بێتەوە كە چ جۆرە پەیوەندییەك لەڕووی ماڵییەوە لە نێوانی ئەو و ژنەكەیدا هەیە، ئەگەر بەهیچ جۆرێك نەكرا، ئەو كاتە ئیتر ژن دەتوانێت حەقی خۆی بەرێگەیەكی دروست بەدەست بهێنێت، ئەمەش وەك ئەوە وایە مەسەلەن (نمونەیەك بهێنینەوە كە خەتاكە ڕۆشن بێت، چونكە لێرەدا خەتاكە لەلایەن پیاوەوە ڕۆشن نییە، لەبەرئەوەی زۆربەی پیاو نازانن خەتا دەكەن وا مامەڵە دەكەن) وەك ئەوەی كەسێكی زۆردار ماڵی كەسێكی دزیوە، یان بردویەتی و تالآنی كردووە ئەم كەسە بەزۆر حەقی براوە و تالآن كراوە هەرچی هەوڵ دەدات لەرێگەیەكی مەنتیقییەوە حەقی خۆی بسەنێتەوە ناتوانێت بە ناعیلاجی دەتوانێت بۆئەوەی حەقەكەی خۆی بسەنێتەوە لەرێگەگەلێكەوە بەدەر لەو رێگاگەلەی سودی نەبووە دەست پێبكات و ئەم بەشەی بەسەر ئەم كابراوە هەیەتی لێیبسەنێتەوە، هەتا ئەگەر بەدزیش بێت، بەڵام خۆ یەكسەر دروست نییە ئەم كارە بكات، ئەگەر كەسێك ماڵی كەسێكی دزی، یان بەتالآن بردی ئەم یەكسەر ئیجازەی نییە بێژێت"با بڕۆم بەدزییەوە ماڵەكەی خۆم بهێنمەوە"، فەرشە، پارەیە، هەرچییەكە كەسێكی تر دزیویەتی نابێت یەكسەر بیر لەدزی و ئەم جۆرە شتانە بكاتەوە كاتێك دوای ئەوەی هەرچی رێگە دەگرێتە بەر و هیچ سودی نییە و بێ نەتیجەیە، دوای ئەوە ئیتر ئازاد دەبێت لەرێگەیەكی ترەوە حەقی خۆی بسەنێتەوە.





## دایك و باوك و پەروەردەكردنی منداڵ:

مەسەلەی پەروەردەكردن و دروستكردنی كەسایەتی منداڵ لای (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) یەكێكە لە باسە هەرە دیار و گرنگەكان، كە گومانم لەوەدا نییە ئەگەر بمانەوێت حەقی خۆی پێبدایەن هەرگیز ناتواین لە دوتوێی كتێبێكیشدا ئەو كارەبكەین، ئەمەش لەبەرئەوەی وەك لە چەند شوێنێكیشدا دووبارەمانكردۆتەوە بابەتی پەروەردەركردن بەگشتی و پەروەردەكردنی منداڵ بە تایبەتی لە دونیایی فكری و عەمەلی (كاك ئەحمەد)دا پانتاییەكی فراوانی داگیركردووە، بەجۆرێك پەروەردەكردن و پێگەیاندنی تاك لە ژیانی بزاوتیدا دەبێتە ئەصڵی مەتڵەب و هەموو كار و چالاكییەكانی دیكە لە چوارچێوەی ئەمەدا دەسورێتەوە، چونكە فەلسەفەی كاری (كاك ئەحمەد) ئەوەندەی توانیبێتمان كەشفی بكەین بریتییە لە {پەروەردە كردنی تاك، پاشان پەروەردە كردنی خێزان، لە كۆتایدا كۆمەڵگەیەكی پەروەردەكرا و تەندروست دروست دەبێت}، خۆی لەیەكێك لەباسەكانیدا بە ناونیشانی (ئەركی مرۆڤ نیسبەت بە كۆمەڵگە و خانەوادە) دەڵێت "دروست بوونی گۆڕانكاری لە كۆمەڵگەدا فەرعییە و تابعی گۆڕانكارییە لە تاكدا، دەبێت لەسەرەتادا تاك بگۆڕێت، جا بابەتی گۆڕینی تاكیش پلە بەندی دەكرێت، بۆنمونە یەكێك لەو گۆڕانكاریانەی لە تاكدا دروست دەكرێت بریتییە لە مەسەلەی گۆڕانی فەرهەنگی، ئەمیش لەو پلەبەندییەدا لە پلەی چوارەمدایە، چونكە یەك حەرەكەتی ئینقلابی ئیسلامی بەم چوار قۆناغەدا تێدەپەڕێت:

قۆناغی یەکەم: ژێر بینا (ئـصولی عەقائیـد)، ئـەمیش دەبێتـە سـێ بەشـی سەرەکییەوە:

أ‌- تەوحید

ب‌- نبووەت

ت‌- میعاد

قۆناغی دووەم: بەشەکانی دیکەی عەقیدە و تەرزی تەفەکوری ئینسان.

قۆناغی سێیەم: تایبەتمەندییە ویژدانی و ناوەکییەکان (ئەخلاقیاتی ئینسان)

قۆنـاغی چـوارەم: کـردەوە (ئـەعمال)، کـە فەرهـەنگ و گۆڕانکـاری دروستکردن لـە فەرهەنگاد سەربەم بەشە و دەبێت سـێ قۆناغەکـەی پێـشوتر ببڕییەت ئەوجا دەکرێت تاکێك بگۆڕرییەت.

جا ئەوەش بڵێین لـە بونیادنا و گۆڕانی کۆمەڵگـەدا بـە لایـەنی کەمـەوە دوو بیروبۆچـوون هەیـە، کـە یـەکیان پێیوایـە گـۆڕانی سـەرکردە و بەرپرسـانی دەوڵەت دەبێتە هۆی ئیسلاح بوونی کۆمەڵگە، ئەوی تریان پێیوایە کەنـەخێر پەروەردەکردن و پێگەیاندنی تاك دەبێتە هۆکاری دروست بـوونی دەسـتەڵات و کۆمەڵگەیەکی تەندروست، دیارە لـە ئێـستادا لایـەنگری بۆچـوونی دووەم زۆرتـرە لـە ڕاسـتیدا ئەمـە باسـێکی فـراوان و سـەربەخۆیە و دەکرێـت بـۆ شارەزابوونی زیاتر لەم بارەیـەوە بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو کتێبـە کۆمەڵناسـیانەی دەربارەی گۆمەڵگە و دروست بوونی کۆمەڵگە نووسراون، یاخود سـەردانی ئەو بیریارانە بکرێت کەلـەم بوارەدا قـسەو بۆچـوونی تایبـەتیان هەیـە. کـاك ئەحمەدیش بڕوای بە هەمان میتۆد هەیە بۆ ئیـصلاح کردنـی کۆمەڵگـە، واتـە بڕوای بە پەروەردەکر و پێگەیاندنی تاك هەیـە، بۆیـە دەبینیـت لـەم بـوارەدا





ئامۆژگاری زۆر وورد دەداتە خانەوادەكان، تەنانەت تا ئاستێك دەڕوات دەڵێت " ڕۆڵەكانم! سرنج بدەن، ئەگەر(بەئیزنی خوا)تەصمیم دەگرن بەڕاستی دایك و باوكی موسوڵمان بن، خوا سەعادەت مەندتان بكات و منداڵداربن، بەلاَم ئەگەر وا دەزانن ناتوانن بەوشێوەیەبن باشترە منداڵدار نەبن، با شەرمەزاری ئەوەنەبن خوانەكات منداڵی خراپ دروست بكەن! جا یا خراپی جسمی، یا ڕۆحی، یا لەڕووی تەكلیف و ئەركی دینییەوە(پەروەردە)." تەماشادەكەیت داوادەكات مەهێڵن منداڵتان ببێت، ئەگەر لەوە دڵنیا نین دەتوانن بە باشی پەروەردەی بكەن! دیارە ئەم داواكارییە قورسە لەو بیركردنەوە قوڵەوە سەرچەشمەی گرتووە كە بۆ پەروەردەكردنی تاك هەیەتی.

بۆیە لەم باسەدا هەوڵمانداوە هەندێك لە بیروبۆچوون و ئامۆژگارییەكانی (موفتی زادە) دەربارەی پەروەردەكردنی منداڵ بخەینە بەرباس و شرۆڤەكردن، ئەو لەیەكێك لە دانیشتەكانیدا دەربارەی پەروەردەكردنی منداڵ و ئەركی دایك و باوك لەو بوارەدا دێت سێ هۆكاری باسدەكات، كە بەبۆچوونی ئەو كاریگەورەیان دەبێت لە نەخشەدا بە شەخصییەتی مرۆڤ بە گشتی و منداڵ بەتایبەتی، دەڵێت "ڕۆڵەكانم! هەرچی عاملە بۆ منداڵ ئەوەیە(باوك و دایك) واقیعەن صالّح و پاك بن، ئەگەر دایك و باوك هیچ نەڵێن و باسی هیچیش نەكەن بۆ منداڵ تەنها خودی ئەمەی باوك ڕەفتار و حەرەكات و سەكەناتی و قسەگەلی، و دایك ڕەفتار و حەرەكات و قسەگەلی گشتی دروست و پاك و موبارەكبێت، خودی ئائەمە نوورە و دەڕێژێت بەسەر مبداڵدا و جیهەت دەداتە منداڵ بۆیە لەپێش هەموو شتێكەوە ئەوە گرنگە كەخۆیان واقیعەن

صالح بن، بۆیە بۆ ئاینده كەمنداڵەكەیان دەبێت، یەكەمجار هەردووكیان باش موسوڵمان بن و بزانن چۆن ڕەفتاردەكەن لەگەڵ منداڵدا، لەپاشانیشدا لیسبەت بەیەكتر باش بن، چەنێك ئافاتە بۆ منداڵ جارێك باوك بەناحەق توڕە ببێت لەدایك، هەتا توڕە بێت ئەگەر بەحەقیش بێت... نابێت منداڵ مەنزەرەی دڵ ئێشانی دایك و باوك ببینێت. ئەگەر خوا نەكردە شتێك ڕوویدات و دایكی هەڵەیەك بكات و لایەقی ئەوە بێت كەباوك كەمێك شەفەقەتی كەم بكاتەوە بێژێ "ئەمە لەبەر خاتری ئەوە" نابێت منداڵ موتەوەجیهی ئەم باس و خواسە بێت.

## منداڵ و عامیلەكانی پێدانی شەخصییەت پێی:

سێ عامل لە پێدانی شەخصییەت بە منداڵ و بە هەرچی ئینسانە كاریگەرە:-

**یەكەم: ویراسە(بۆماوەیی):**

بەخوا نەك باوك و دایك، ئاباد و ئەژدادیش بەڕەفتاریان، كرداریان، خواردنیان، كاریگەریان هەیە لەسەر نەسڵ. بۆ نمونە دەفەرموێت، ئاباد و ئەژداد ئەگەر مەشروب و شتی حەرام بخۆن مومكینە لەنەسڵەكەیدا زەرەری هەبێت، ئەگەر بەد خۆری و ڕەفتاری خراپ بكات مومكینە لەنەسڵیدا كاریگەری هەبێت. ئەوە پێی ئێژن(ویراسە). واتە ئەوەی نەسڵ بە نەسڵ دێت. ئێستا كەپێی ئێژن(ژینەتێك) لەبەرئەوەی زۆربەی بۆ(عیلم) و زۆر تحقیق دەكرێت لەسەر (جین) كە بە هەندێك تایبەتمەندی جسمانی و هەندێك تایبەتمەندی دەرونی لەنەسڵەوە وەردەگرێت، بۆ نمونە شێوەی (دەم و چاو)





سەیردەكەیت (باوا)یەك دوای چەند نەوە چۆن بووە ئێستا لەناو ئەولادەكانیدا میقدارێك لەو دەچێت. خانەوادەیەك سەیردەكەیت بەگشتی شێوەیان كەمێك لەیەك دەچێت زۆرێك لەمانە هەستی پێ دەكرێت و زۆرێكیشی هەستی پێ ناكرێت، لەوانەش كەهەستی پێ ناكرێت هەندێك خەصڵەتگەلی ڕەوانی، لەبەرئەوە (دین) ئیعتبار دەكات بەوەوە كەئینسانگەل هەمیشە خاس بێت، لەبەر نەسڵگەلی ئایندەشیان نەك تەنها لەبەر منداڵەكانی خۆیان. مولتەزیمی دین بن و حەرام نەخۆن و حەرام نەڵێن، حەرام ڕەفتار نەكەن، تاوەكو لەنەسڵیاندا كاریگەرییە نێگەتیڤییەكەی دەرنەكەوێت، چونكە خوا ئەم جیهانەی بەصاحێب و نیزام داناوە. عەمەلی خاس یان خراپی ئینسان بێ ئەسەر نییە. یان بۆ خۆی یان بۆ نەسڵی، یاخود بۆ ئەوانی تركاریگەری دەبێت.

ئەمە خەیرە بۆ بەشەرە، كە ئەگەر من ڕەفتارێكی خراپ دەكەم، زەرەری بۆخۆم یان بۆ كوڕ و كچ، یان بۆ چەندین نەصڵ لەوەوەدواش هەر زاهیربێت، ئا ئەمە خەیرە، بەڵام بۆ ئەو كەسەی وا زاهیر دەبینێت، منداڵێك لە دایك دەبێت دووچاری عەوارزێكە، ئەم منداڵە بۆچی وا لەدایك بوو، چونكە بۆنمونە باوەگەورەی، نەنەگەورەی حەرامی خواردووە هۆكارەكەی ئەوەیەو ئەویش دەركی ناكات و تەنها دژایەتییەكە دەبینێت و نارەحەتە! ئەمانە حەقیقەتەن خەیرەو دەبێت بەوشێوەیەبێت، بۆیە دەبێت كچ و كوڕ هۆشیان هەبێت كە(چۆنن؟) ئەم چۆنیانە كاریگەری دەبێت لەسەر منداڵەكانیان لە نەسڵی یەكەم و دووەم و سێیەمدا...




## دووەم:پەروەردەكردن:

ئەمە عامڵی دووەمە، ئەوەی وا ئێستا وتم بۆ دایك و باوكەكەیە كەخۆیان ئاگاداربن لەبابەتەكە، لەپاش ئەركیان لەبەرامبەریەكەوە باش تێبگەن و ئەنجامی بدەن و وا نەزانن منداڵ تەنها لە كاتێكدا زاهیرەن ڕشدی كامڵكراوەتەوە و بۆتە (سێ - چوار)ساڵە ڕەفتار وقسەتان تەنها لەوكاتەوە كاریگەری دەبێت، ناوانییە! بەڵكو لەوكاتەشدا وا هێشتا نەیتوانیوە بەگوێچكە تەركیزلە دەنگێك بدات، یان بەچاو تەركیزبكاتە سەر فلآنە دیدەنی لەوكاتەشدا هێشتا مەنزەرە و دەنگەكانی كاریگەرییان دەبێت، هەر لەساتی لەدایك بوونەوە ئیتر قۆناغەكانی پەرورردە دەستپێدەكات، هەرچەندە خەڵكی وا تەصەور دەكەن كەنازانێت، بەلآم ئەمە بە تێگەیشتنەوە نییە بەشێوەیەكی خودكاری ئەم بابەتانە لەدەرونیدا تۆماردەبێت لەو بەشەیدا وا ئێمە پێی ئێژین (قلب)، (ئەمە تەوزیح نادەم، چونكە درێژە دەكێشێت).

مەبەست ئەوەیە بارودۆخی پەروەردەی لەرۆژی یەكەمی لەدایك بوونەوە دەستپێدەكات، (ویراسەت)ماوەكەی تاوەكو پێش لەدایك بوونە، هەڵبەتە لەدەورانی(ڕەحم)دا بارودۆخی پەروەردەی دیكەی هەیە، بەلآم ئەوەش لە مەفهومە گشتییەكەی (ویراسەت)دا جیادەكەینەوە، ئەگەرنا حەقیقەتەن هەتا لەكاتێكەوە (نوتفە) نقلْ دەبێتە(ڕەحمی دایكەوە) تالەو كاتەوە بارودۆخی (پەروەردەی) هەر مەترەحە، كەئیسلام لەبارەیەوە دەستوری فەرمووە كە(ژن و پیاو) لەكاتی پەیوەندییان لەگەڵ یەكدا سالم و ساڵح بن و دڵ و دەرونیان باش بێت خەفەتیان نەبێت، تورەی نەبێت لەنێوانیاندا، چونكە ئەم حاڵەتانە حاڵەتی پەروەردەییە و كاریگەری دەبێت لەسەر نەصڵیان! دەی لەپاشانیشدا





كەلە ڕەحمدایە هەر كاریگەری دەبێت، بەلاّم من جارێك باسی ئەوانەم نەهێنایە ناو بابەتی پەروەردەی كە انشاالله ئەم ئیشارەتەی كردم لەبارەیەوە بەس بێت. بەلاّم ئێستا كەباس لەبابەتی پەروەردەی دەكەم لەو كاتەوەیە كە لەدایك دەبێت.

ڕۆڵەكانم! ئا ئەم دەورانە ڕاستە هەندێك شتی تر پێش دێت وەك ئەوەی(كوڕی نوح) ببێتە ئینسانێكی پەستی خائینی دژی دین و هاودەست لەگەڵ فاسدگەل و خوێن ڕێژگەلدا بێت، ئا ئەوە باسێكی ترە و ئێمە حساب لەسەر ئەوە ناكەین، ئێمە حساب لەسەر ئەوە دەكەین وا پەیوەندی بەخۆمانەوە هەیە هاوڕێكە لەگەڵ نەزمێكدا كەوا خوا لەم عالەمەدا دایمەزراندووە و لێی حاڵین و بەرپرسیارێتیمان هەیە. ئەوە وا عاملێكە یەك جار یەك جار كاریگەر لەسەر سەردەمی پەروەردەیی ئەوەیە لەقۆناغی یەكەمدا هەركام لە(كوڕ و كچ) واقیعەن (صالح)، لەپاشانیشدا لەبەرامبەری یەكەوە واقیعەن ژن و پیاوێكی موسوڵمان بن كەیەك كەلیمەی ناجوان و ناشرین لەزمانتان نەیەتە دەرەوە و هیچ كات و پێش ئەوەی منداڵیشتان هەبێت زمانتان فێرنەبێت بەحاڵەتی ئیهانەوە بێژێ (قسەیەكی ناحەقت كرد)، زۆر وریا بن و حەزەر بكەن لەقسەی بەو شێوەیە.

شەرعی و حەلاڵ نییە بۆ ژن یان پیاو بێژێت(درۆت كرد ئەم قسەیەت كرد) حورمەتی ئینسانییەت زۆر لەسەرەوەی ئەمانەوەیە بۆیە هیچ كات نابێت یەك كەلیمە بەیەك بێژن كەحاڵەتێكی تەحقیری تێدا بێت، هەتا ئەگەر جارێكیش واقیعەن یەكێكیان خەتا دەكەن، بەلاّم پیاوەكە كاتێك خەتا لەژنەكەدا دەبینێت تەسەوری ئەوە بكات مومكینە خۆیشی خەتا بكات، ئایا بۆ خۆی

ڕەوا دەبینێت كاتێك خەتای كرد ئاوا تەحقیری خۆی بكات هەر بەو شێوەی ژنەكەی تەحقیر دەكات؟ هێشتا بۆ خۆی ڕەوا دەبینێت شتێكی باشترە نەك بۆ بەرامبەر، چونكە بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خۆتەوە لەپێشترە تاوەكو نیسبەت بە ژنەكەت، هەروەها ژنیش خەتا دەكات بۆیە ئەگەر خەتای بینی لەپیاوەكەیەوە نەیكاتە هۆكاری ئەوەی كە خوانەكردە یەك كەلیمەی ئیهانەتاوی و سەیركردنی ئیهانەتاوی بكەوێتە نێوانیانەوە! هۆشیان هەبێت و لەسەرەتاوە حەزەر بكەن هیچ قسە و سەیركردنێك دروست نەبێت، بەتەوهین و تەحقیرەوە تەماشایی یەكتربكەن و قسەبكەن لەگەڵ یەكتردا. ئا ئەمە لەعەوامیلێكی ئێجگار گرنگە بۆ پەروەردەكردنی منداڵ لەپاشانیشدا هەندێك شت دێتە پێشەوە بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ منداڵ و حاڵی كردنی.

ڕۆڵەكانم! لەئیسلامدا حەدی وەصەت لەگشت شتێكدا داواكراوە، ئامان! هیچ كات ئەوەندە موصیبەت نیسبەت بەمنداڵ مەنوێنن، كە بێ شەخصییەت و بێ ئیعتماد بەنەفس دروست ببێت، زەعیف و خوێڕی دروست ببێت، كەئەگەر باوك و دایكی لێبڕا ببێە شتێكی بێ پایە و هیچ و پوچ و موتەزەلیل، ئامان! وا بێموصیبەتی مەنوێنن لەگەڵ منداڵدا، كەخوا نەكردە تام و مەزەی موصیبەت نەزانێت سبەی كەی موصیبەت پەیدا نەكات لەگەڵ بەندەكانی خوای گەورەدا، بەڵكو لەسنوری وەصەتدا بن. هیچ كات فێری مەكەن بیكەنە باوەش و هەمیشە كەسێك بەلایەوە بێت، ئەم كارالە لەدەرەوەی وەصەتە. هیچ كاتێكیش وانەبێت، ئەگەر حەقیقەتەن پێویستییەكی هەبوو لای نەبن، (بەڵێ، جارجاری منداڵ پێویستی بەوە هەی ساتێكیش

بگری، پێویستە موشكیلاتیشی ببێت، بەڵام وانـەبێت بگاتـە ئاسـتی وەصـەت تێپەڕاندن ئەوە عاتفەی بریندار دەكات).

هەروەها لـە تەئمین كردنی پێداویستییەكاندا، ئەگەر كاتێك گەورە دەبێت بەو شێوەیە نەبێت ئارەزووی هەرچی كـرد و پـەڵپی هەرچـی گـرت بـۆی دابـین بكەن. ئەركی(كوڕ و كچ) ئەوەیە كەمنداڵ زووتر لـەوەی كـاتی داواكردنـی مەسائیلی بۆ پێش دێت وردە وردە تێگەیشتنی باش بكەن و لـەحەقائیق حـاڵی بكەن، پێویستە پێش ئەوەی بگاتە حاڵەتی بیانوو گرتن بۆ شتێك كە موناسیب نەبێت و (دایك و باوك) بەگوێی بكەن، دوو مەتڵەبی پێ حاڵی بكرێت:

یەكەم/ بزانێـت و دەرك بكـات ئـەوەی وائەسـباب بازییـە(شـتومەكی یـاری كردن)ە، یان جلوبەرگی جوانە، یان كەوشە، هەرچییەك بـۆ منـداڵ دروسـت دەكرێت و دڵی لێـی دەچـێت، بزانێـت خۆئـەوە گـشتی بـۆ ئـەو دروسـت نەكراوە، بەڵكو ئەوە بۆ تەواوی منداڵگەل دروست كراوە.

دووەم/ لـە یەكەم گرنگتر و عالی تر و ئەساسی تر و تەنها و تـەنها لـۆجیكی، بەڵام ئەم مەتڵەبی دووەمە لۆجیكی عاتفییەكـەی ئێجگـار كاریگـەری باشـتر دەكاتە سەر ئینـسان. ئـەویش ئەوەیەكـە، ئامـان! پەیوەسـت نـەبێت بـەوەوە كەشتێكی وای هـەبێت ببێتـە هۆكـاری داخ و حەسـرەت بـۆ منـداڵانی تـرا موتـەوەجیهی ئـەوە ببێـت كـەزۆر منـداڵ هـەن هـەژاران، زۆر منـداڵ هـەن موحتاجن و هەروەكو ئەویش دڵیان بـچوكە و ئـاوات و ئارەزوویـان هەیـە، بەڵكو هەر لـەو منداڵییەوە بتوانێت بگاتە ئـەو تێگەیـشتن و عەتیفـە كـەدڵی ڕازی نەبێت بەوەی شتێكی هەبێت، حاڵەتێكی هـەبێت، ڕەفتـارێكی هـەبێت، شتێك بخوات خەفـەت دروسـت بكـات بۆتاقـە منـداڵێك، چ جـای ئـەوەی

کەزەرق و بەرقی زۆری هەبێت دەبێتە حەسرەت بۆهەژاران منداڵی فەقیر، کەلە شار و دێهات و هەموو جێگەیەکدا هەیە!

رۆڵەکانم! ناڵێم بەرۆژێك و یان بە مانگ و دوو مانگ هەروەك ئەو بابەتە بەرزە ئەخلاقیانە تەتبیق بکەن لەجل و بەرگ و هەموو ئەو شتانەی کەپێویستی ژیانن. بەڵکو حاڵی بن و بۆ خۆتان بە ئومێدی خوای گەورە لەوەودوا صەلاحییەت پەیدابکەن بە منداڵیشتان حاڵی بکەن. وردە وردە کارێکی بەو شێوە بکەن نەبنە(داهۆڵ) بۆ ترساندنی دڵێ هەژاران! ئەوە بزانن هەر جیلوەیەکی دەوڵەمەندی وەك داهۆڵێکە بۆ داچڵەکاندن و ترساندنی دڵی هەژار و فەقیرانە!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمایشێکی هەیە دورو درێژ ئا ئەم جوملەیەی بڵێم"ئەگەر ئەوانە وابێ بەشن و فەقیرن و بەشیان خوراوە لەکۆمەڵگەدا جۆرەها دەرد و گرفتاری و کێشەیان هەبێت، هیچ کامیان بە ئەندازەی ڕەفتاری دەوڵەمەندان ئازاریان نادات، ئەوەی وا دەبینین لە ڕەفتار و ماڵ و زەرق و بەرق و جل و بەرگ و سەیارە و جۆرەها جیلوەی دەوڵەمەند بوون، ئا ئەوە لە هەموو جۆرە دەردێك کەهەیان بێت زیاتر ئازاریان دەدات! هەتا لەوانەیە هەموو دەرد و ئافات و ناڕەحەتییەکی خۆیانیان لەبیربچێتەوە تەنها ئەوە ئازاریان بدات".

با نمونەیەکی سادەتان بۆ بهێنمەوە، جۆرەها کێشەمان هەبێت، (برسی بین) لەلای ماڵێکەوە تێپەڕین بۆنی خۆراکێکی خۆش بێت ئەگەر بەڕاستی برسی بین بەتایبەت، ئەگەر سەردەمی ئیحتیاجیمان بینی بێت، ( حاڵی بن، کەبەڕاستی برسی بن و خواردنیشتان نەبێت شتێك کەپێتان خۆشە دروستی بکەن نەتان بێت لەوانەیە جارجار شتی واتان بۆ دروست بووبێت، ئەمە بۆیە





دەڵێم تاوەكو نەبێتە شتێكی زهنی مەحس، بەڵكو ببێتە ئیحساسی و عاتفی و باش باش لێی حاڵی بن، كاتێك بەلای ماڵێكدا بڕۆن و بۆنی خۆراكێكی خۆش بێت هەزار جۆرە گرفتاریتان هەبێت یەكسەر هەمووتان لەبیردەچێتەوە و ئارەزووی ئەو خۆراكە دەبێتە ئەصڵ بۆتان. شتی ئاوا بۆخۆم دروست بووە خۆ ئینسانێكی نەوسنیش نیم، بەڵام ئەمە حەقیقەتێكە و خوای گەورە بەشەری بەوشێوەیە دروست كردووە، شتی خۆشی پێ خۆشە، لەكاتێكدا مەحرومە لەشتی خۆش، ئەگەر ڕەنگ یان بۆن و تامی ئەو شتە خۆشەی پێ گەیشت دەبێتە ئەصڵ بۆی. خوا بەشەری بەوشێوەیە دروست كردووە ئەگەر نەوسنیش نەبێت!

دەی لێی وردبەرەوە ئەوانەی وا مەحرومن وەك ئەو ساتەی وا من برسیمە بۆنێكی ئاوا دێت و دەبێتە هۆكاری ئەوەی هەموو شتێكم لەبیربچێتەوە، ئەو هەمیشە بە بینین و بۆن بەتەواوی عەواتیفی مەحرومییەت دەكێشێت لەتەواوی ئەو شتانەی وا دەیبینێت و دەیبیستێت! ئالێرەدا باش حاڵی دەبین لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەر(ﷺ)، خوا حاڵی وادروستكردن بۆئەوەی بەشكوم داچڵەكێن و توغیان بكەن دژی زاڵمان و دەوڵەمەندانێك كەبەشیان دەخۆن، لە مەزڵومییەت بێنە دەرەوە و ڕازی نەبن بە بەشخوراوی. خوا وای دروستكردوون هەزار دەرد و موصیبەت و كێشەیان هەبێت بەئەندازەی ڕەفتاری دەوڵەمەندان و چێشتی باش دروست كردن، یان ماڵی باش ڕازاندنەوە...بەو ئەندازەیە نایكاتە مایەی ئازار بۆیان.

دەی ڕۆڵەكانم! ئومێد دەكەم بەو شێوەیە مامەڵە بكەن هەگیز هیچ شتێكتان نە بێتە هۆكاری زەجر و ئازار بۆ دڵی هەژار و فەقیر، جادوای ئەوە (دایك

وباوك) دەتوانن منداڵیشیان حاڵی بكەن،كە وانەبێت ببێتە مایەی حەسرەت بۆ منداڵی هەژار و فەقیر.

جائەوەش بڵێم، (دایك و باوك) وا نەزانن ئەگەر خواردنی قەوی بخەنە ناو كیفەی جانتای منداڵەكەیانەوە كاتێك دەچێت بۆ قوتابخانە بۆئەوەی كەبرسی بوو بیخوات، شتێكی بەسوود دەكەن. نا...ئەمە هەڵەیە، چونكە ئەو شتە خەیری نییە كەحەرام بێت و منداڵی تر چاوی لێیەوە بێت! یان هەر هیچ نەخوات وەك لەباسەكانی (پەروەردە و فێركردن)دا ووتم، یان ئەگەر قەرار بێت شتێك بخوات تەحقیق بكەن سادەترین شتێك كەلە قوتابخانەدا دەخورێت ئەویش ئەگەر كەسانێك بن كەنەیان بێت لەگەڵ ئەوان بیخوات، هەروەها لەزەمانێكەوە كەمنداڵتان فێری ئەوە دەبێت بێتە ناو ماڵی تر (موتڵەقەن) ئاگاردار بن منداڵتان شتەكانی پیشانی منداڵی تر نە دات، تاوەكو ببێتە داخ بۆی، بۆ نمونە هیچ كات منداڵتان ساردەمەنییەك، خواردەمەنی و میوەیەك شتێكی بەدەستەوە نەبێت و بێتە بەردەرگا، یان بچێتە حەوشەیەكەوە منداڵی تری لێبێت و ئەوانەی پێ نەبێت و بێتە داخ لەدڵیدا، ڕاستە منداڵەكەتان تەكلیفی لەسەر نییە و حەرام نییە بۆی، بەڵام چونكە دایك و باوك پێچەوانەی تەكلیفی ڕەفتاریان كردووە دەبێتە شتێك كەشەڕ و ئافەتێكی ببێت بەلایەنی كەمەوە، ئەگەر بۆ منداڵەكە نەبێت بۆ دایك و باوكەكە دەبێت، ئامان! منداڵتان هەر لەمنداڵییەوە فێری ئەوە بكەن بەڕەحم بێت، دڵی ڕازی نەبێت بەوەی یەك لەحزە دڵی منداڵێك بئێشێنێت.

بەهیچ شێوەیەك ئیجازە مەدەن بەخۆتان لەمنداڵ توڕە ببن، بەڵكو بەحاڵی كردنی قسەی لەگەڵ بكەن. منداڵتان وابێت ئەصڵەن پێی خۆش نەبێت تیكە




نانێكیشی بەدەستەوە بێت و بڕوات لەبەزدەگا بیخوات، چونكە بەردەرگا وەك ماڵی هاوسێ یان ماڵی هاوڕێیەكت نییە دەزانیت ئەوان چییان هەیە و چییان نییە، ئەگەر نانێك بەدەستییەوە بێت قەیناكات، بەڵام بۆ بەردەرگا هەتا تیكە نانێكیش جائز نییە، ئەوە بۆ گەورە هیچ نابێت هەرگیز كاری وا بكات! بۆ منداڵیش هەروا.

دایك و باوك موتەوەجیهی ئەوە بن عەواتیف و ڕەحم وایان لێنەكات خوانەكات بەپێچەوانەی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ كەلە پێشەوە باسم كرد ڕەفتار بكەن لەگەڵ منداڵێك كاتێك منداڵتان خۆشبەخت و سەعادەتمەند دەبێت(بە ئیزنی خوای گەورە) كە تبقی مەفهومی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بێت ئەمەش لەبارەی منداڵەوە ئیتر دوای ئەمە منداڵی تر لەدایك دەبێت و ژمارەیان زیاد دەكات تەكلیفی دیكە سەرهەڵدەدات، كە جیاوازی نەكەن ئاگاداری ئەوە بن كە منداڵێكتان چاودێری زیاتری دەوێت و زەرفییەتیان جیاوازە، یەكسانی سەتحی و ڕوخساری ناكرێت لەنێوان منداڵێكی گەورە و بچوكدا، بەڵام دەبێت(عەدل و قسط) لەنێوانیاندا ریعایەت بكەن.

ئامان! هیچ كات جیاوازی نەخەنە نێوان منداڵتانەوە، ئەگەر (دە) منداڵیشتان هەبێت ماندو دەبن بەدەستیانەوە و حەوصەڵەتان نامێنێت ئاگاداری ئەوە بن منداڵی(دەیەمتان) هەروەك یەكەم منداڵ لەگەڵی ڕەفتار بكەن، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو جیاوازییەش كە گریمان بۆتە گەنجێكی تەمەن(٢٠)ساڵ دیارە لەگەڵ ئەودا ڕەفتار و ئیحترامی قسە كردن هەیە، بەڵام لەمەفهومی(قسط)دا نەك لە (یەكسانی)دا! ئەوەی وا گرنگە و مەبنای (قسط)ە و بۆ (قسط) ڕەفتار بكەن، چونكە لە(عەدل)یش زەریفترە و لەگەڵ

یەکسانیشدا جیاوازی زۆرە، لەبەرئەوەی (قسط) مەفهومی عەدلیشی تێدایە، بەڵام لەگەڵ زەرافەتی عاتفیدا، واتە ئەوەی وای لۆجیکییە و تەکلیفی کۆمەڵایەتییە دروست ئەنجام دەردێت لەگەڵ صەفا و صەمیمییەت و پەیوەندی زەریفیدا لەبەرئەوەی وشەی (قسط) زۆر گرنگترە، یەکسانی ئەصڵەن لەهەندێك کاتدا دروست نییە و نارەسایە، عەدلیش زەرافەت(زەریفییەت)ەکەی تێدانییە، لەکاتێکدا وشەی(قسط) ئەوەی وا لە عەدلدا هەیە تێیدایە و ئەو مەفهومە عەواتیفییە زەریفەشی هەیە. لەنێوان منداڵیشتاندا هیچ جیاوازی نەکەن و بە(قسط)ێك کامڵ لەنێوانیاندا ڕەفتار بکەن، بەئومێدی خوای گەورە مەرجی ئەوەی کەمنداڵتان باش و سەعادەتمەند بێت فەراهەمە.

سێیەم: ئیرادە:

ئەم ڕوکنەش شتێکە کەخوای گەورە لە وجودی هەر تاکێکدا دروستی کردووە، ئیرادەکە شتێکە عەجیب و غەریب و ئیستثنائی، باشترین پەروەردە هەبێت! عەوامیلی (ویراث) هەمووی موسبەت بێت، عەوامیلی (پەروەردە)ش هەمووی موسبەت بێت، یەك شت مومکینە ببێتە هۆکاری ئەوەی ئیرادەی ئینسان بەباری مەنفیدا بخات و ببیات بەرەو خراپە. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر عەوامیلی(ئیرپی ـ ژێنەتیك)هەمووی مەنفی بێت، عەوامیلی (پەروەردەی) هەمووی مەنفی بێت، یەك شت مومکینە ئیرادەی فەردێك بخاتە کار و بیخاتە سەر باری خێر! واتە هەم عەوامیلی عەجیبی (ویراث)ە کەچەنێك گرنگە لە بونیادی نوتفەدا کار دەکات بەتاڵ بکات و هەم عەوامیلی (پەروەردەی) بەتاڵ بکاتەوە و بێ کاریگەری بکات! ئەم (ئیرادە) خوا بە ئینسانی داوە شتێکی

عەجیب و غەریبە، بەچیش دەست دەکات بـە جوولـّـە؟ جۆرەهـا عـەوامیلی هەیە کەناتوانیت بیانژمێریت، چـەنێك عامیـل هەیـە بـۆ جوولـّـە پێـدانی ئـەم ئیرادەیە، ئەو کاتەی هێزی ئیرادە دەکەوێتە کار ئیتر مێژوو دروسـت دەبێـت، موحیط جیهەتی پێدەدرێت چ بەباری خێردا، چ بەباری شەڕدا، جـا وەك وتم: ئەو شتانەی دەبنە هۆکـاری جولاّنـدنی ئـەو هێـزی ئیرادەیـە ئەوەنـدە زۆرن ناتوانین بیانژمێرین، هەندێك جار عەوامیلی دەرونی خۆیەتی و مەحسوس نییـە وەك(حافـضی شـیرازی، رابیعـەی عـەدەوی..)هەنـدێك جـاریش مـادی و مەحسوسییە وەك ئەو ڕوداوەی بەسەر (مەلا عەبدولاّی دشەی)بـاپیرەی منـدا هاتووە، کاتێك (چاوئێشە)ی زۆر قورس و خەتەرناك دەگرێت و دەبێتە ڕێگـر لـەئەنجامدانی کارەکانیدا ئابەم وەزعەوە ڕۆژێك پارچە کاغەزێك لـەسەر زەوی کەوتووە ئەم نازانێت پێی پێـدا دەنێـت، کاتێـك هەڵیـدەگرێت سـەیردەکات (بسم اللّه الـرحمن الـرحیم)ی لـەسـەر نوسـراوە، ئـیتر بـە دڵ پێـی نـاخۆش دەبێـتو هەسـت بەشـەرمەزاری دەکـاتو هەیـەجانی عـەواتیفی ڕووی تێدەکاتو لـەپڕدا کاغەزەکە دەبات بۆلای دەمووچـاوی و ماچـی دەکـات و (تۆز و خاکی سەر کاغەزەکە دەچێتە چاوییەوە)، دوای ئەوە دێتـە ماڵـەوە و دەڕواتە مزگەوت نوێژ دەکات و ناڕەحەت دەبێـت و ناتوانێـت نـان بخـوات کەمێك پاڵ دەکەوێت و خـەوی لێدەکـەوێت کاتێـك هەڵدەسـێتەوە چـاوی خۆش و سالم بۆتـەوە، ئائەمـە شـتێکی مادییـە، ئـەو عاتیفـە زەریفـە ئیمانییـە کەبوویە هۆکاری ئەوەی ئەو(بسم اللّه الرحیم الرحیم) ماچ بکاتەوە و ئـەو خۆڵـە خوا بیکاتە شفای، خۆڵی پیسی ناو کۆلاّن! هەندێك جاریش دەرونییەو ئیحساسی مادی نییە.

ئـەو عنـصورە لـە صـەفا و پـاكی كەلـە وجـودی خۆیـدا هەیـە لەپڕدا(گوڵ)دەكات، جائەم عەوامیلانە قابیلی ژماردن نین كەچی شتگەلێك مومكینە ببێتە هۆكاری ئەوەی ئەم (ئیرادە) بكەوێتە كار، بەڵام ئەصلێك كە ئیلاهییە و ئەصڵی ڕیسالەت و هیدایەتە بۆ ئەمەیە، بۆئەوەیە ئیرادە بكەوێتە كار و مەرجەكانی (ویراث و پەروەرش) بەتاڵ بكاتەوە ئەساسەن فەلسەفەی هیدایەت و ئیرسال و ڕەسوڵ(ﷺ)ئەمەیە، لەپاش ڕەسولیش ئەوانەی دێن ئەو ڕیسالەتە صادقانە و بە فەهمەوە بەیانی بكەنەوە بۆ خەڵكی موتەناسیب لەگەڵ هەر زەمان و دەرك و فەهمی هەر كەسێكدا، ئا ئەمە عامیلێكە لە عامیلەكانی ئیلاهییە و بۆئەوەیە ئەو ئیرادە بخاتە كار، ئەمە عامیلێكی عومدە و گەورەیە. بەگشتی ئەم (سێ عامیلە) شەخصییەت سازی ئینسانە (ویراث، پەروەردە، ئیرادە)

## بەرپرسیارێتی و ڕەفتار و هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ منداڵدا:

كەمێك وردتر سەیری ژیانی ئینسان، یان غەیری ئینسان بكەین، بەچكەی هەر حەیوانێك كە لە دایك دەبێت (ئەوانەی كە ئێمە زیاتر دەیانناسین)لە سەرەتاوە زەعیفەو ناقصە، وردە وردە كامڵ دەبێت، جا زەعیفی و ناقصی جۆراو جۆرە، بۆ هەر حەیوانێك لە حەدێكدا كامڵ بوونی هەیە، كە ئەڵبەتە هینی حەیوانات لایەنی جسمانی (جەستەی)هەیەو لەولایەنەوە قەوی دەبێت، لە لایەنەكانی دیكەی زۆر باس ناكرێت، بەڵام بۆ مرۆڤ هەم لایەنی جەستەیی هەیە، هەم لایەنی دەرونی، بەهەر حاڵ ئەوە كە ڕۆشنەو دەبینین ئەمەیە كە لە سەرەتاوە بەچكەی هەموو گیانداران ناقصە و وردە وردە كامڵ دەبێت،





خـوا كـە مـەخلوقاتی جـۆر جـۆری دروسـت كـردووە كـە بـەعزێك لـەم مەخلوقاتە (گیانداران)، ئیلهامی كردووە، چـی خاسـە بـۆی چـی و خراپـە بۆی، مەسەلەن گیاندارێك فلأنە شت دەخوات، گیاندارێكی تر شتێكی دیكە دەخوات. ئەمانە خـۆ نایانبـەن لـە زانكـۆ دەرسیان پـێ بلـێن و وابكـەن و وامەكەن، ئەمە ئیلهامی ئیلاهییە* ! باقی جیاوازییەكانی دیكـە كـە لـە نێـوان گیانداراندا هەیە گشتی هەر ئەوەیە، واتە ئیلهامی ئیلاهییە.

لـە ڕووی گەشەكردنو(ڕوشـد پەیـداكردن)و كامـڵ بوونیـشانەوە، ئـەوە وا لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا وەكو یەك هەیـە بریتییەلـە كامـڵ بـوونی جەسـتەیی. كۆمەڵێك شت پێویـستە خـوای گـەورە ئیلـهامی كـردووە، بەچـكەی هـەر گیاندارێك، چی بەچكەی مرۆڤ، چـی بەچـكەی بـاقی حـەیوانات، تەماشـای ئاژەڵی ماڵیو نا ماڵی (كێوی) بكە، بزانـە بەچـكە بەچـی جۆرێـك هەمیـشە خەریكی جوڵـە جوڵە! ئەمانە هەر لـەگەڵ تێریان خواردو تێرخـەو بـوون ئـیتر بەبێ وچان خەریكی جموجوڵ و كایە كردنن، هەموو ئاژەڵێكیش وایە و بـەپێی پێویستی خۆی كە چەنێك پێویستی بە جوڵـە جـوڵ هەیـە، ئـەم خەصـڵەتەی تێدایە، كە لـە بچكۆلـەیدا جوڵـە جوڵ زۆرەو لـە گەورەیدا كەم دەبێتەوە.

گەورەی باش، ئیتر دایك بێت، باوك، خاڵۆ، مامۆ، پور بێت، برا بێ، خوشـك بێت، هەر كەسێك بێت، ئەوەیە كە بەچاوی گەورەی خـۆی سـەیری منـداڵ نەكات، خۆی چی پێ خۆشەو چی پێ ناخۆشە، چی شـتێك بۆخـۆی لازمـەو چی لازم نییە، ئاواش لـەبارەی منداڵـەكەوە بڕیار نەدات. گەورەی باش ئەوەیە

*) {وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ }النحل٦٨

کە لەگەڵ هەر منداڵێکدا ڕەفتار دەکات کاتی منداڵی خۆی لە بیر بێت، گەورەی باش ئەوەیە بیر بکاتەوە، کاتێك (٤-٥) ساڵ بوو چی ئارەزوویەکی بوو، چی جموجوڵ و کایەو ڕەفتارێکی بوو، منداڵەکەی ئەگەر لەو تەمەنەدایە ئەوانە بهێنێتەوە یادی خۆی و بزانێت ئێستاشە بۆ ئەو -منداڵەکە- زەمان ئاوایە نەك ئێستە خۆی چۆنە بیەوێت منداڵەکەشی ئاوا بێت، بەم ڕوون کردنەوە کەمە، گەورەیەك بە دەرك بێت دەزانێت منداڵ جموجوڵی هەیەو نابێت وەك گەورە ڕەفتار بکات، ئەگەر وەك گەورە ڕەفتاری کرد ئەوە ناساغە، دەبێت یاری بکات و هەڵسان و دانیشتنی بێت و جموجوڵی ببێت، ئەمەش ئیلهامێکی خواییە، دەی فەرموو ئێوەی گەورە ئازان ئاوا بکەن! ناتوانی، چونکە خوا پێویستیەکی وای ئیلهام نەکردووە بۆت، بەلاَم ئەو چونکە پێویستی پێیەتی و بەو جموجوڵە ڕوشت پەیدا دەکات و گەورە دەبێت، خوا پێی ئیلهام کردووە جموجوڵ بکات و چالاکی بنوێنێت.

لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی گشتی ئاوا سەیری منداڵ بکەن، ئەمە تەعلیمێکە خوایی، خوا فێری کردوون لەبەر بەرژەوەندی خۆیان ئەوەندە کایە بکەن و بجوڵێن، لە پێشدا ئەم ئەصلە کوللییە قبوڵ بکەن، بزانن کە بەرژەوەندی منداڵ لەوێدایە، تبقی ئەو قانونە وا خوا دایناوە بۆیان جموجوڵ بکەن، دوای ئەوە لە سەرەتاوە قبوڵتان کردو بە توڕەی و ناوچاو تاڵییەوە نەتانڕوانی بۆ منداڵ کە ئەگەر مەسەلە (٢-٣) منداڵتان لەمالآبن و بنیشنە ملی یەك و بیکەنە هەراو بەزم، بەڵکو بە خۆشەویستی و (قەدر شوناسی)یەوە سەیر بکەن، کە شوکر بۆ خوا منداڵەکانمان ساڵمن و ئەو ئیلهامە کە خوا پێی داون دەتوانن ئەنجامی بدەن، بەڕووی خۆش و بە زەردەخەنەوە بڕوانن بۆ

منداڵەكان، كاتێك دەنیشنە ملی یەك و دەیكەنە هەراو هوریا، لەبەرا ئاوا ڕوانینێكی ئیسلامی پەیدا بكەن، ئەخلاقی ئاوا پەیدا بكەن، جا لەوەو دوا دەمێنیتەوە شتێكی تر، دەمێنێتەوە سەر ئەوەی كە یاری كردن هەندێكی باشەو هەندێكی خراپە، جا ئەم خراپییە یان بۆ خۆیەتی یان بۆ خێزانی، یان بۆ دەرو دراوسێ و كۆڵانەكەیان، جا ئێستە ئەگەر خراوبێت لەوانەیە لەسەری بچێت، گەورە بوو خراپ دەرچێت.

بەمەرجێك لەسەرەتاوە ئەو ڕوانینە ئیسلامییە پەیدا بكەین، لە ئەصلی یاریكردن و جوڵە جوڵی منداڵ تووڕە نەویت، بزانیت ئەو ئەصلییە خێرەو كارێكە خوایی، جا دوای ئەوە صەلاحییەتی ئەمە پەیدا دەكەیت، كە ئەگەر لە جموجوڵ و ڕەفتارەكانیاندا شتێك بێت كە خراپبێت، پێیان بڵێییت و حاڵییان بكەیت كەوا نەكەن، ئەگەر لەسەرەتاوە ئاوا نەبێت دەركت ئاوا دروست نەبێت، ئیسلامی نەوێت هەر جموجوڵ و هەراو بەزمێك‌و هاوارو داوێك بكەن تۆ تورەبیت و پێت ناخۆش بێت، ئەصڵەن بەكاری ئەوە ناخۆیت منداڵ پەروەردە بكەیت، بەكاری ئەوە ناخۆیت باشەو خراپەیان بۆ دیاری بكەیت، چونكە تۆ لەباشەكانیشیان تورەیت، ئیتر چۆن دەڵێیت ئەمە باشەو ئەوە خراپە؟! لەسەرەتادا ئەم ڕۆحییەتە پەیدابكە، ئەگەر ئەم ڕۆحییەتەت پەیدا كرد، كە یاری كردن و جموجوڵ و هەراو بەزم بۆ منداڵ باشەو خێرەو نیعمەت و ڕەحمەتی ئیلاهییە، جا لەوەو دوا دەبیتە باوكێك بە صەلاحییەت كە هەرچی لە كایەو جموجوڵەكانی منداڵەكەت خراپ بوو، نادروست بوو ئاگاداری بكەیت، "نا... ڕۆڵە ئەمە وانابێت، بەو جۆرە دەبێت، ئەم جۆرە یارییە مەكە، ئەو جۆرە بكە". ئەوكاتە قسەكەت

كاریگەری دروست دەكات، ئەگەر بەوجۆرە هەڵسوكەوت بكەیت لەگەڵ منداڵەكەتدا جیا لەوانە كە تۆ پەرستش (عیبادەت)كردووە، ئەركی ئیسلامی خۆتت ئەنجام داوا، زیادلەوە كە قەدری ئەو نیعمەتە، ڕەحمەتە ئیلاهییەت زانیوە، كە منداڵ جموجوڵی هەیەو منداڵی سالم فەعالییەت دەكات، دوای ئەمانەش قسەكانت منداڵەكە قبوڵی دەكات، واتە ئامۆژگارییەكانت وەردەگرێت، چونكە لەكاتێكی تردا پێی ناڵێیت مەیكە، تورە ناویت، هەتا جار جاریش خۆت تێكەڵ دەبیت لەگەڵیان و دەیكەیتە هەرا و هوریاو بەزم لەگەڵیاندا، دەیكەنە كایەو دەنیشنە سەرمل و شانی خۆشت و شتێك خۆشت عەزیەت دەكەن و پێتخۆشەو پێ دەكەنی لەڕوویاندا كاتێك ئابەو جۆرە بوو، لەگەڵ هەڵەیەكیان كرد، كارێكی خراویان كرد ئیتر دڵیان ئامادەی قبوڵ كردنی ئامۆژگارییەكانتە، چونكە زووتر تێگەیشتون، تۆ لەبەر ئیسراحەتی خۆت نییە كە ڕێگریان دەكەیت لە یاری كردنت، تۆ وشك و بێ مەنتق ڕێگرییان لێ ناكەیت، لەكاتێكدا یاری دەكەیت هانیان دەدەیت و یارمەتییان دەدەیت، بەڵام ئێستاكە پییان دەڵێیت ئەمە مەكەن خراپە، حەتمەن باش حاڵیت بووە، دەزانیت خراوە ئەوانیش لێت قبوڵ دەكەن و بەگوێت دەكەن، ئەڵبەتە غەیری ئەمەشە دەبێت بەشێوەیەكی گشتی ڕەفتارت وابێت منداڵ بزانێت تۆ لەبەر ئەوتەو خێرخوازی و بزانێت كە دەزانی و لە ڕێگەی خەیرخوازی و زانینەوە پێیان دەڵێیت، وا بكەن و وامەكەن، جا با نمونەی یەكێك لە گەورەترین پیاوانی مێژوو، بەعەزەمەت ترین و بە قودرەت ترین مرۆڤی مێژوو لە ڕووی زاهیرییەوە بگێڕمەوە:

حەزرەتی (عمری کوڕی ختاب)(رضي الله عنه)، ئەگەر لە ڕوی زاهیری و مەعنەویەوە دەیڵێیت، یەکێکە لە پیاوە گەورەکان، ئەمما لە ڕوی قودرەتی زاهیریەوە دەیڵێیت بەبێ ئیستسنا ئیتر گەورەترین پیاوە، بەدرێژایی مێژوو هیچ پیاوێك نەبووە ئابەو جۆرە حاکم بێت لە سەر زەویدا، هیچ مرۆڤێك نەبووە ئابەو جۆرە ڕێکوپێك و ئارام، کە دەڵێم کورەی زەوی، واتە زەویی شارستانییەت ئەو وەختە کە پەیوەندیان هەبووە بە یەکەوە کە دوو دوژمنی زاڵمی گەورەی (ئێران و ڕۆم) بوون و ناوچە لە ژێر دەستیاندا بوو، ئەوە گرنگە لە دونیای ئەو وەختەدا حاکم بێت بەسەر ئەم گشتەدا، ئیتر تەقریبەن دەکاتە تەواو کورەی زەوی، حوکومەتێك نەبووە ئەوەندە گەورە، ئەوەندە بە قودرەت، ئەمەش لە عەجایەبی حوکومەتی (عومەر) تەماشاکەن مەملەکەتێك ئاوا بەو گەورەییە، هەڵبەتە ئەمە (عومەر) نییە، ئەمە ئیسلامە، زۆر کات - لەو حوکومەتە گەورەیەدا - ئەوەندە بێ کارە دەڕوات دەست دەکاتە کارکردن لەناو باخەکانی (بیت المال)دا، دەڕوات دەسدەکاتە دەرمان کردن ئاژەڵەکانی(بیت المال)، چونکە بەتاڵە کاتەکەی داناوە بۆ خزمەت بە ئیسلام و بە موسوڵمانان، هیچ کارێکی نییە چی دەکات؟

دەڕوات ئەو باخانەی هینی (بیت المال)ە ئاوداری دەکات، کاری تێدا دەکات، ئەمەش لەبەرئەوەیە، ئیسلام لەسەرەتادا بەشەری ڕێك و پێك کردبوو، ئیسلام بەشەری وا ڕێك و پێکی کردبوو هەرچەند زۆر بێت ئاسان بەڕێوەدەبرێت. بەڵام کاتێك ئیسلام نەبێت لە بەیندا بەڕێوبردنی (چوار) نەفەریش کێشەیە، جا گیانەکەم ئەگەر ئیسلامی ڕەفتار بکەن باش دەڕۆن

**بەرێوە ئەگەر ئیسلامی رەفتار نەكەن هەر دەیكەنە هەراو بەزم و باش بەیەكەوە ئیدارە ناكەن.**

**جا با رووداوەكانی حەزرەتی (عومەر)(ﷺ) باس بكەم:**

**ئەم پیاوە لەرووی قودرەتەوە گەورەترین پیاوی مێژوو بووە، جارێكیان حوكومی (والییەكی)یەكێك لەو ویلایەتەكانی نووسی بۆ یەكێك لە موسوڵمانان، كە لەلایەنی كارو توانای بەرێوەبردنەوە دەیناسی، ولایەتی ئەوكاتەش وابوو، هەر ویلایەتێك مەملەكەتێك بووە، ویلایەتەكان ئەوەندە گەورە بوون، ویلایەتی وا هەبووە لە ئێستادا چواردانە مەملەكەتی لێ دروست بووە.**

**حوكومی دەركردووە كە یەكێك لەو موسوڵمانانە بڕوات ببێتە والی یەكێك لەو ویلایەتانە. لەوەو دوا كابرا پێش ئەوەی بڕوات بۆ ئەو ویلایەتەی كە بۆی دیاری كراوە، شەوەكەی دەڵێت، با سەرێك بدەم لە خەلیفە (عومەر) بزانم كارێك دەستورێك شتێكی هەس، هاتەماڵەوە سەیری كرد لەو ژوورەی وا (عومەری)تێدایە هەرایە، ماڵ شپرزەو پرش و بڵاو، چەند نەفەر منداڵ عومەریان كردۆتە ژێرو سواری دەست و ملی بوون و ئازاری دەدەن.**

**كابرا كە دەركەوت بوو، (حەزرەتی عومەر) زانی بووی، فەرموو بووی بە منداڵەكان: رۆڵەكان ئیتر ئێوە تەواو بوون، بەرنامەتان تەواو نۆرەتان تەواو برۆن بۆلای كاری خۆتان، مناڵەكانیش هەر كە بەرنامەكەیان تەواو بوو هەستان و چوون بەلای كاری خۆیانەوە.**

**كابرا بەسەر سورمانەوە وەستا بووا كەوتبویە دونیایەكی تر، ئەم كابرا بەقووەتە یانی چی منداڵ ئاوا سواری ملی دەبن؟! ئەو دەرواتە سەر ملی و**

ئەو ئەنیشێتە بان سنگی و بەو جۆرە داویانەتە (بەر مشت) و عەزییەتی دەكەن؟! یانی چی؟

ئەم پیاوە ئەوەندە گەورە(حەزرەتی عومەر)، چۆن وا زەعیف؟ ئەوەندە بێ دەسەلاّت ئابەو جۆرە كەوتووە لەبەردەم منداڵەكانیدا؟! سەری سوڕماو هەروا لەناو فكرا بوو دوای ئەوە كە حەزرەتی (عومەر) دانیشت و دەستی كرد بە قسەكردن لەگەڵیدا.

ووتی: ئەرێ (عومەر) من سەرم سوڕ دەمێنێ لە ژیانی تۆ!

عومەر ووتی: بۆ؟

ووتی: چۆن ئەوە تەحەمول دەكەیت لەو منداڵانەت؟ ئەوە چی كایەیەكە ئەو منداڵانە لەگەڵ تۆدا دەیكەن؟

كەی منداڵ وادەكات لەگەڵ باوكیدا؟!

ئەوان بەڕاستی عەقڵییان كرا بوویەوە(هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) (ژیر بوون) بەتایبەتی (حەزرەتی عومەر)، حاڵییان بوو بوو، كە عەقڵی بەشەری كار ناكات و بەكار نایەت، ڕێگەی ئەوەیە خوا پیشانی بدات، دروست ئەوەیە وا خوا پیشانی بدات.

لەبەرئەوە حەزرەتی (عومەر) پرسی لەكابرا:

ووتی: شتێكی ناپەسەندو ناشەرعیت بینی لەم كردارو ڕەفتارەماندا؟

چونكە ئەوە حسابە، ئەگەر لای خوا ناپەسند بوو دیارە كە خراپە، ئەگەر لای خوا پەسەند بوو با بەشەر هەر بڵێ ناپەسەندە، بەڕاستی (حەزرەتی عومەر) باش حاڵی بوو بوولەوە.

كابرا ووتی: نەوەڵا! مون ... ناپەسەندێكم نەدی، شتێكیشم نەبیستووە لە قورئان و لەحەدیس كە كاری كردن لەگەڵ منداڵ شتێكی ئاوا خراپ بێت.

ووتی: دەی بۆچی ئیراد(رەخنە)م لێدەگریت؟

ووتی: ئاخر تاقەت و تەحەمولی دەوێت، چۆن دەبێت مرۆڤ بەو جۆرە ئەوەندە تاقەتدار بێت منداڵ بەو جۆرە سواری ملی بێت؟!

حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی تۆ لەماڵدا چۆنیت، لەگەڵ منداڵەكانتدا؟

ووتی: وەڵا، لەگەڵ دەرۆمەوە ماڵەوە منداڵەكان هەر یەكێكیان دەڕۆنە سوچێكەوە و موچ دەكەن و كش و مات، نەزمێكی ڕێك و پێك لەماڵما هەیە و ئەدەبێكی حسابی.

حەزرەتی عومەر فەرموی: جا كاكە گیان ئەو حوكمەی وا نووسیومە بیهێنە با ببینم، حوكمی دایە دەستی، جا (حەزرەتی عومەر) دڵی زۆر گەورە بووە، بەڵام لە هەندێ كاتدا مەسەلەكە زۆر گەورە دەبوو لە چاویدا دەردەكەوت.

فەرمووی: هەرگ وەبان سەر عومەر، كاتێك كەسێك نەتوانێ لەگەڵ منداڵی خۆیا بە موحیبەت بێت چۆن ئوممەتی محمد(ﷺ) دەداتە دەستی؟!

من چۆن ئەم ئوممەتە بسپێرمە دەستی تۆ، كە نەتوانی بەموحیببەتەوە لەگەڵ منداڵەكانی خۆتدا ڕەفتار بكەیت؟ نە براكەم ئەمە بەكاری تۆ ناخوات .

جا لێرا ئەمە خودی (عومەر) نەبوو، ئوستازەكەی ئوستازێك گەورە بوو (صلاوات و سەلامی لەسەر بێت)، بە ڕەفتارو كرداری خۆی پیشانیانی دابوو كە دەبێت ڕەفتار لەگەڵ منداڵدا چۆن بێت. لەگەڵ هەرچی منداڵدا نەك هەر تەنها منداڵی خۆی، منداڵی بێگانەش.





ڕووداوێك هەیە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، دەربارەی ڕەفتاری پێغەمبەر لەگەڵ منداڵی هەژارو نەداردا، کە باشترین سەرمەشقە بۆ گشت لایەکمان کەبزانین لەگەڵ منداڵماندا چۆن بین.

تازە موسوڵمانان لە (مەدینەی مونەوەرا) کۆ بووبوونەوە کۆمەڵگەیەك دروست بوو بوو، بەڵام پڕ دونیایەك موسیبەت و دەردی سەر لەبان سەریان بوو، لە لایەکەوە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان کۆچکەرانن وماڵیان نییە، لەولاوە کێشەی خودی موسوڵمانانی (مەدینە) کە هۆزگەلێك بوون هەمیشە شەڕ لە نێوانیاندا بووە، لەلایەکی ترەوە فرۆفێڵکی چواردەورو سەرانی ئەم هۆزانە، کە لەسەرەتاوە هێشتا وایاندەزانی دەتوانن بەناموسوڵمانی بمێننەوەو جاهو جەلالی خۆیان بسەپێنن، بەڵام لەوەو دوا سەیریان کرد ناکرێت هاتن موسوڵمان بوون و لە ئاخرۆ کێشەیان بۆ دروست بوو، جاه و جەلالیان لە دەست دابوو، بەرنامەکەیان شێوا بوو، لەو لاشەوە دەردی سەری قورەیش و هاوپەیمانەکانی قورەیش، ئەمانە گشتی دەبارێتە سەر ئەم کۆمەڵگە بچکۆلانە! بەڕاستی ئیتر زۆر لەوە زیاتر کە تەحەمول بکرێت ئەوەندە ناڕەحەت بوون .

دوای ئەوەی نوێژە فەرزەکان دانران و خەڵکی لە مزگەوتدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نوێژ کۆدەبونەوە، هەندێك بەرنامەی دانابوو دوای نوێژی جەماعەت بۆ قسەکردن لەسەر کێشەکانی خەڵکی، ئاخر ئەو مامۆستاو ڕەهبەرە گەورە بەو گشتە کێشەوە بنەمای کۆمەڵگەی دامەزراندن دوایی (عومەر)ئەو دونیا گەورە بەڕێوەدەبات و بەتاڵ بەتاڵ دەڕوات بۆ ئاودانی باخ، چونکە بنەڕەتەکەی مامۆستایەکی گەورە دایناوە، بەڵام ئەو مامۆستا لە عەزابا بوو تا ئەو جامعە جاهیلییە ئالوودەو کەسیفە لەناو ئەو گشت خراپییەدا

بكاتە ئەو كۆمەڵگە خوێن شیرینە پاك و بێ كێشەیە، كە لەوەودوا حەزرەتی (عومەر)ئاوا ئاسان بتوانێت بەڕێوەی بەرێت.

فرە كێشەو دەردی سەری هەبوو، یەكێك لە بەرنامەكانی ئەمە بوو، كە دوای (عەسر) تەشریفی دەهێناو لەمزگەوتدا دادەنیشت و دەستیان دەكردە باسی خۆیان، جارێكیان كات درەنگ بوو تەشریفی نەهێناو موسوڵمانان چاوەڕێی بوون، نەیاندەزانی چییە، یەك نەفەر لە (صەحابەكان) دەستوری پێ درا كە بچێتە شوێن پێغەمبەر (ﷺ)، بزانێت بۆچی تەشریفی نەهێنا؟

كاتێك چوو سەیری كرد لە یەكێك لە كۆڵانە فەقیرانەكان خۆڵاوی و پیس، پێغەمبەر (ﷺ) منداڵێك چڵكن و جل دڕاو هاوردوویەتیو منداڵەكەی ناوەتە قەلە دۆشكان (سەر ملی) خۆی و منداڵێكی (٢ – ٣ ) ساڵان خەریكە لەناو كۆڵانەكەدا ڕادەكات، بەو جۆرە كە دەبێت(حوشتر)غار بكات، صەحابییەكە عەرزی كرد كە موسوڵمانان زۆر چاوەڕێت دەكەن لە مزگەوتدا، كات درەنگە چۆن بوو تەشریفت نەهێنا؟

منداڵەكە وا لە قەلادۆشكانیدا بوو تێگەیشت هاتووە پێغەمبەر (ﷺ)بات، ئیعتزازی گرت(ناڕەزای كرد)و ووتی "ئەمە حوشتری خۆمەو نایدەم بە ئێوە"، بەعەینی دەربڕین وشتری خۆمە، دەنگ لێرەدا بەرز بوویەوە، چەند منداڵی تر لەولاوە وەستاون، ئەوانیش دەنگیان لێ بەرز بویەوە، " ئای من حوشتر سواریم نەكردووە، ئەو ووتی من حوشتر سواریم نەكردووە، ئەویان ووتی نۆرەی منە ..".

بەو جۆرە منداڵەكان وتیان "ئەمە حوشتری خۆمانەو نایدەینە كەس"، گشتی منداڵی بچكۆلە، بچكۆلە نازانن نێوان حوشترو ئینسان چییەو دەركی ناكات.

ڕووداوی ئەو منداڵانە ئەوە بوو كە موسابەقەی سواری (پێشبڕكێی سواری) یەكێك لە هونەرە گرنگەكان بوو لەو زەمانەدا لەناو عەرەبدا زۆر ئەرزش دار بوو، دەوروبەر وشتریان بوو كە لە ڕاكردندا سورعەتن، ئەسپیان بوو .... هەمیشە خەریكی پێشبڕكێ بوون، وەك موسابەقەی فوتباڵی ئێستا، ئەم پێش بڕكێیە هەبوو، منالأنیش شەوقیان بوو بڕۆن فێربن، چونكە موسابەقەی سوار كاری فرە گرنگ بوو لە ناویاندا، بە ئاشكرا منداڵان هەمیشە حەز دەكەن فێری بن.

ئەوانەش وا وشتری تایبەتی پێش بڕكێیان نەبوو، وشتری عادییان بوو، منالّەكان دەهاتن سودیان لەو وشترە عادییانە وەردەگرت بۆ پێش بڕكێ .

ئەی منالّی هەژار چی؟ منالّی هەژار و فەقیر وشتریان نییە خۆ وشتر دارەكان وشتریان نەئەدا بە منالّە هەژارو فەقیرەكە سواری بىن، هەروەك ئێستای خۆمان دەوڵەمەندەكان سەیارەیان هەیە، منداڵانیش داخی دڵیان دەردەچێت و جار جار دەچن لە پشتی سوكانەوە دادەنیشن و دەستێك دەدەن لە سوچەكەو ئارەزویان دادەمركێت .

ئەو منداڵە هەژارو فەقیرانە چی ؟! نییانە.

خۆ دەوڵەمەنەكانیش دڵیان ناسوتێ بۆ منالّی فەقیرو بلّێن، ئەم منداڵە هەژارە خەفەت دەخوات بۆئەوە جارێك سورای سەیارە ببێت، با بێت و سواری بكەین، دڵیان ناسوتێت بۆیان! هەر داخ و حەسرەتە لە دڵی منالّەكاندا. لەوكاتەدا هەروابووە منداڵی فەقیر خەوی دەدی بەوەوە سواری (حوشتر) ببێت، هەمیشە ئەوە ئارەزوو ئاواتی بووە لە دڵیدا، ئەو مرۆڤە عەزیمە كە خوای گەورە لەجێگەی خۆیدا دەفەرموێت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾الَنبیاو١٠٧ .بەڕاستی ﴿رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ بوو، بەڕاستی نمونەی

شەفەقەت و ڕەحمەتی خوا بوو بۆ تەواو عالەم، لەگەڵ تەواوی گیاندارگەل و مرۆڤدا.

ئەو مرۆڤە گەورە لە ناو كۆڵانەكەدا تێپەڕی سەیری كرد چەند دانە منداڵی مەعصومو بەصەفا پڕ لە پاكێتی شیرینی، بەڵام چڵكنو چەپەڵ دانیشتون و باسی وشتر سواری دەكەن، ئەگەر وشترم بێت وا دەكەم و ئەگەر وشترم بێت وا دەكەم، یەكیان وشترێكی دروست كردووەو دەڵێت "ئەمە وشترەكەی منە"، ناویەتییە ژێر خۆی و ڕادەكات ئابەو جۆرە نوقمن لەناو ئارەزو ئاواتا، كە جارێك سورای (حوشتر) بن، خۆیشی(ﷺ) وشتری نییە، چونكە ڕەهبەری عەزیم بوو، ئابەو جۆرە ئەو كۆمەڵگایەی دروست كرد زۆربەی كات خۆی دەڕۆی كرێكاری دەكرد بۆ ئەمە ژیانی خۆی تەئمین بكات. وشتری نەبوو ئارەزوی ئەو منالآنە دابین بكات .

بەڕاستی﴿رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ ڕەحمەتی خوای گەورەیە هاتووە بۆ بەشەرییەت، دەی توخوا ئینسانیێ دڵی بۆ ئەو منداڵە مەعصومە پاكە بە صەفایە، مرۆڤێك حەز نەكات ئاواتی ئەوانە بەجێ بێنێت، چی خێرێكی هەیە بۆ بەشەرییەت؟!بەكاری چی یەت؟!

**پاكترین حاڵەتی مرۆڤایەتی حاڵەتی ئەو منداڵانەیە، پاك ترین مرۆڤ ئەو منداڵانەن، موستەحەق ترین مرۆڤ كە خزمەتیان بكرێت... ئەو منداڵانەن ،ئیتر خزمەتی چی دەكەن بە بەشەر موسوڵمان بەكاری چی یەت ؟!**

ئەو مرۆڤە گەورەیە وەختێك تێ دەپەڕێت و ئاوات و ئارەزوی ئەم منداڵە مەعصومانە دەبینێت، كە خەریكن لە بارەی ئەسپ سواری قسەدەكەن و خۆیان سەرگەرم دەكەن بە وەسائیلی جۆر جۆرەوە دەكەوێتە دڵیەوە و




دەفەرموێت(ﷺ)"وشتر سواری دەكەن؟" شەفەقەی ئاوایان نەدیوە، لە خۆشیا نازانن چی بكەن، ئیتر لەنەزەرەی ئەو مندالّە مەعصومانا ئەم وشترە، چیبكەین؟ بازنەیەكیان كێشاو لەناو ئەو خاك و خۆلاّ بەنۆرە منالّەكان وشتر سواری بكەن، خوایا من چیبكەم ئێستا من چۆن ئارەزوی ئەم مندالاّنە بەدی بێنم، ڕوو دەكاتە مندالّەكان و دەلّێت من (وشتر تانم )!!

قبولّتانە من ببمە وشتر بۆتان و وشتر سواریتان پیّ بەم؟ ئەلّبەت، بۆ ئەوەی ئیختیلاف و ڕوو بەڕوو بونەوە نەبێت لە نێوانیاندا، تا ئەو حالّەتە پاكە ئەوەتا لە دەرونیاندا لەبەین نەچێت.

فەرموی جا بە نۆرە، نۆرە سوارتان دەكەم، دەورێك بۆ ئەم سەرو دەورێك بۆ ئەو سەر، تا نۆرەی گشتان تەواو دەبێت.

دەیكردن بە (قەلا دۆشكان)ەوە بە هەنگاوی (وشتر) بەو جۆرە كە ئیتر دلّنیا بن لە ئارەزوو خەیالّی خۆیانا وابزانن سورای وشتر بوون، ئا بەوجۆرە غاری دەكرد لەناو ئەو كۆلاّناو ئەو مندالاّنەی دەگەڕاند ،{لێرەدە (كاك ئەحمەد) لەتاو ئەو حالّەت و هەلّسوكەوتەی پێغەمبەر دەست دەكاتە گریان و بەدەم گریانەوە درێژە بە قسەكانی دەدات...}

سەیربكەن چی ئینسانێك!! كە دونیا دەگۆڕێت بۆتە وشتر بۆ مندالاّن!! بەڕاستی بەشەرییەت فیدای ئەو بەحسەگەلەس، ئەم بەرنامەیەی دانا بوو كە نۆرەیان بۆ بكات، دەیشی زانی كە گرفتاری ئینسانییەتە چەنیّ گەورەیە، مەسەلە چەنێك گەورەیەو موسولّمانیش لەولاوە چەنێك پێویستیانە، بەلاّم شیرین ترین نمونەی ئەو مژدەی خوایە كە ئەمە ﴿رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ە، نمونەی لەمە شیرین تر نییە، بەلاّم لەولاوە ببینە، سەرانی شیرك و كوفرو نیفاق

لەسەر پەنجەرەوە سەیرەکەنو دەڵێن: (تەماشـاکە چـەنێك بـێ شەخـصییەتە، خەریکە (وشڕ لۆق) دەکات لەناو کۆڵاندا) تانە و تەشەری لێدەدەن، بـەڵام خـۆ ئـەو بـۆ پیاهەڵـدان لەلایـەن ئەشـراف یـان مـەردم زینـدەگی ناکـات، مەئمورییەتێکی(لێپرسراوێتییەکی) هەیە بۆ ئەو مەئمورییەتەی خـۆی زینـدەگی دەکات .

کەیفی خۆیەتی خەڵکی تانەو تەشەری لـێ دەدات و دەڵـێن بـێ شەخـصییەت، لاتە، شێتە، هەرچی دەڵێن بیڵێن، ئەو مانای ژیان حاڵی بووەو بەرنامـەی خـۆی خەریکە دروست و صەحیح بڵاودەکات، قەزاوەتی خەڵکی هەرچییە بوو، بوو؟

ئالەوکاتەدا خەریکە یەکێك لە منداڵەکان دەگیرێت، ئەو صەحابیە هـات و بەرنامەکەی پێ ووت، بەو جۆرە ئیعتیرازی منداڵ بەرز بوویەوە .

هەرچەند دەزانێت گرفتاری ئەولا زۆر زۆرە ئەو هەر ڕەحمەتەو ڕزگار کردنـی بەشەرییەتە دەبێت کاری بۆ بکات، بەڵام ئەملای لەبەر چاو گرنگترە، ئـەولا دڵ و دەرون هەس قبوڵی زەجرو مەشەقەت هەس، شـەهادەت هـەس، بـەڵام ئەملا دڵ و دەرون نییە، پاکی و مەعصومی منداڵانـەس ناتوانێـت ئـەملا وێـڵ بکات بۆ ئەولا.

شتێك تازە هاتبویە بازاڕەوە زۆر نەبووە وەك (گـوێز)، کـە زاهـیرەن وا دیـار بووە کە (گوێز) بووە، لـە دەرەوە هێنراوە، ئەمـە شـتێکی بـە بایەخـە لـەلای منداڵ منداڵە هەژارو فـەقیر شـتی وایـان نـەدیوە، ئەگـەر (گـوێز) بێتـە نـاو مەدینـەوە وەك ئـەوە وایـە (مـۆز) بێتـە نـاو (ئێـران)و بێتـە (کرماشـان)، ئەگەر(مۆز)بێت منداڵی هەژار مەگەر هەر لـە دوورەوە تەماشـای ڕەنگەکـەی بکات! چەنێك لـە نەزەری منداڵـدا گرنگـە (مـۆزی) بـۆ بکرێـت، پێغەمبـەر

(ﷺ)فەرمووی بەو صەحابییە ....برۆ میقدارێك (گوێز) بكڕەو وەرە مامەڵە بكە لە نێوانیاندا، بزانە ڕازی دەبن بە مامەڵە كردن .

ڕۆشت هەندێ گوێزی كڕی و بە منداڵەكانی ووت، ئەویش عەین كەلیمەی منداڵەكان.

ووتی: ڕۆڵەكان حازر دەبن (وشترەكەتان) بفرۆشن بە منو یەكی چەند دانە گوێزتان پێ بدەم؟

ئەوانیش ووتیان :بەڵێ .

مامەڵەكریاو وشتر فرۆشیاو (گوێز) درایە منداڵەكان، جا براكانم بە ئێوەو بە باقی موسوڵمانان، بە باوكان و بە دایكان، خاڵ و براو خوشكان، با چاو لەو گەورە بڕوانین، با ئاوا ڕەفتار بكەین لەگەڵ منداڵدا، ئەگەر ئاوا ڕەفتارمان كرد منداڵیشمان باش حاڵی دەبێت و سالم دەبێت و هەرچی ئامۆژگاری بكەیت بەبێ گومان لێمان وەریدەگرێت".

ئەوەی تا ئێرە خوێندتەوە باسێكی تایبەتی (كاك ئەحمەد) لە بارەی هەڵسوكەوتی باوك و دایك لەگەڵ جگەر گۆشەكدیدا، ئەگەر كەمێك وردبینەوە لە باسەكە ئاسان دەتوانین ئەوە دەرك بكەین، كە (كاك ئەحمەد) بۆ زیاتر ڕونكردنەوەی باسەكە و گەورەی منداڵ لە دونیایی ئیسلامدا دوو نمونەی گرنگی گێڕایەوە، كە بەڕاستی ئیتر ئەوەی خاوەن دڵ بێت و لە ئیسلام شارەزا بێت دەزانێت چۆن گرنگی بە منداڵەكانی بدات. ئەوەی جێگەی گرنگی پێدانەو تا ئەو ئەندازەیەی بەندە مامەڵەی لەگەڵ (موفتی زادە)دا كردبێت یەكێك لە زیرەكییەكانی ئەم زانایە ئەوەیە، كە توانیویەتی باسەكانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و مێژووی ئیسلام و خەلیفەكان بهێنێت و




جارێكی دیكە مامەڵەیان پێبكات و بەزمان و ئاوازێكی دیكە بیانگێڕێتەوە، گرنگی نوكتەكە لێرەدایە كە نەهاتووە كۆمەڵگەی ئێستای كوردی بەرێت بۆ مەدینەو بڵێت" ئادەی بەو تایبەتمەدییەی خۆتان هەتانە تێكەڵ بە تایبەتمەندی مەدینە بن و سود لە ڕوداوەكان وەربگرن"، بەڵكو هاتووە مێژووی بۆئێستا گواستۆتەوە و مامەڵەیەكی ئێستانەی لەگەڵ ڕوداو باسەكاندا كردووە، كە وەك دەردەكەوێت یەكێك لە خاڵە لاوازەكانی گوتاری خاوەن پەیامان لە ئێستادا ئەوەیە كە بەداخەوە ناتوانن بەو جۆرەی (موفتی زادە) مامەڵە لەگەڵ باسەكاندا بكەن.

كاك ئەحمەد، لە باسێكی دیكەیدا، كە بەهەمان شێوە لە بارەی بەخێوكردن و پەروەردە كردنی منداڵەوە قسە دەكات، بۆئەوەی ڕونی بكاتەوە، بە نەرم و نیان و ئەخلاقی مامەڵە كردن لەگەڵ منداڵدا چەنێك گرنگە، چەنێك بێمانا و ناجۆرو ناشایستەیە لە منداڵ بدرێت و لێی توڕەببیت! دێت بە هەمان شێوە نمونەیەكی سەردەمی سەرداره مرۆڤایەتی (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت" ئەگەر واقیعەن (دایك و باوك)صاڵح بوون و حەرەكات و سەكەنات و ڕوانینیان بۆ منداڵ و قسەیان لەگەڵ منداڵ و، گرتنە باوەشی و لاواندنەوەیەكی، كەهەتا ئەگەر جارێكیش توڕە بن لێی كە(ئومێدەوارم) هیچ كاتێكی وا پێش نەیەت كە توڕە بن لەمنداڵ چونكە شتێكی گاڵتە نییە، و لەدیندا و شتێكی ئازاد نییە لەمنداڵ توڕە بیت، چ جای ئەوەی كەدەدەن لەمنداڵا سەیری سونەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بكەن منداڵ تا ئەو سنورە بەهانە دەگرێت كە كچەزاكانی وەك حەزرەتی(حوسەین و ئومامە) بچكۆلە ئەویان كوڕ و ئەویان كچ (ئومامە) كەكچەزایەتی و (سێ چوار)ساڵە و دێت بۆ (مسجد النبی)

ئەوەتا بە قەلادۆشكانییەوە بیانوی لێدەگرێت ئێژێ (نایەمە خوارەوە) دڵی ناشكێنێت و دێت لەئا ئەو (مسجد)دا كەوا مێژووی بەشەرییەت شتێكی وا موبارەكی نەدیوەو گەورە و پێشەوای محمدە(ﷺ) جەماعەتەكەی (ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان و عەلی) و نمونەهای ئەو پیاوە گەورانە (موهاجرین و ئەنصار) كورەی زەوی لەتەمەنیدا كۆمەڵی ئاوا موبارەكی بەخۆیەوە نەدیووە! بۆ ناو ئەم كۆمەڵە موبارەكە، ئەگەر بۆ نمونە(حوسەین) بێژێ كە كورێكی بچكۆلەیە، (ئومامە) كەكچێكی بچكۆلەیە لە قەلادۆشكانی دایانێت و بێژێ من دەچم ئیماماتێك بەو جۆرە كە گەورەترین حەرەكەت و چالاكی بەشەرییە بەدرێژای مێژووی ژیانی سەر زەمیندا دایانێت و هەر بەقەلادۆشكانییەوەیە و دەیهێنێتە ناو مزگەوت و قامەت دەخوێنێت، ئیمامەت دەكات كاتێك دەچێتە سوجدەوە، بۆئەوەی ئەم منداڵە صەدمەیەكی لێنەكەوێت منداڵ دەخاتە ئەولاوە تاوەكو سوجدەكانی تەواو دەبێت كاتێك دادانیشێت بۆ(تحیات) یان هەڵدەسێتەوە دەنەوێت لە(ئومامە)و دەیخاتەوە سەر شانی.

جابا بەدرێژی باسی نەكەم، خۆتان قیاسی بكەن لەگەڵ ڕەفتار و حەرەكاتی گەورە لەگەڵ منداڵدا دەكرێت، بۆ نمونە ئەو منداڵانەی دەچنە مزگەوت بزانە موسوڵمانان چەند (تەحقیرانە) لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبن، خۆ بێگومان ئەو منداڵانە نە یانزانیووە ڕیعایەتی نوێژكردن بكەن، بەلاّم خۆ دەزانن نوێژ هەندێ كات كەواجبە كردنی(حەرام)دەبێت لەسەر مەصڵەحەتی دڵی بەندەی خوایەك، ڕۆژوی واجب حەرام دەبێت، چ جای(موستەحەبە) وەزائیفی ئەخلاقی ئەوەندە گرنگە، چونكە دەرەجەی ئەخلاقی بەرزترە لە

ئەعمال(كردەوە)، عەقیدە بەرزترین پلەیە لەدوای ئەوە ئەخلاقە لەدوای ئەوەش ئەعمالە، بەم شێوەیە:

١. عەقیدە.

٢. ئەخلاق

٣. كردار(ئەعمال)

بۆیە بۆ هەر عەمەلێك بۆ هەر تكلیفێكی ئەخلاقی پلەبەندی بكرێت. بەگشتی (ئەخلاق) لەسەرەوەیە تاوەكو (ئەعمال). {واتە لەبەرئەوەی لەپلەبەندیدا پلەی ئەخلاق لەسەروی پلەی ئەعمالەوەیە هەركاتێك ئەعمالێك ببێتە هۆی زەرەر گەیاندن بە(ئەخلاق) ئەو كاتە ئەنجام دانی ئەو ئەعمالە دەبێتە حەرام لێرەوە دەردەكەوێت(نوێژ)كە ئەعمالە ئەگەر ببێتە هۆكاری زەرەر گەیاندن بە(ئەخلاق) ئەوكاتە نابێت ئەو نوێژە بكرێت، وەك ئەوەی لەنێوان مندالأنی مزگەوت و ئەهلی مزگەوتدا ڕوودەدات!}.

دەی جا بڵێم چی؟! چ ئیمامێك ئەوەندە مەعقول و گەورەیە؟ چ ئیمامەتێك ئەوەندە بەعەزەمەتە؟ لەگەڵ ئەوەی دڵی منداڵێكی بۆ ناشكێت منداڵێك مەبەست(ئومامەیە) كە مەعمولەن دیارە نازانێت نوێژ ریعایەت بكات، دەیخاتە سەر قەلادۆشكانی دەڕوات. ئەو (ئیمامەتە عەزیمە تەئریخییە) دەكات بۆ ئەو گەورەترین بەشەرانە كەلایەقی ئەوەبوون، مەلائیكە سوجدەببات بۆ بەشەر لەبەرخاتری وجودی ئەفرادی وا لەنەسڵی(ئادەمدا)، هەم خودی حەزرەتی(ئادەم)، هەم نەسڵی بەوجۆرە كەهەیەتی، بۆ كۆمەڵێكی بەوجۆرە دڵی ئەم منداڵە ناشكێنێتەوە، دەی ئەمە بەسە بۆئەوەی دەرس وەرگرین و حاڵیمان ببێت.




ڕۆڵەكانم! ئاوابن خوا ئیجازە نادات لە منداڵ توڕەبن، ئێستا چ جای ئائەم كردەوانەی وادەبینین. مەگەر یەكجار كەم!! تەماشای رابەر و پێشەوا﴿رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ بزانن رەحم یانی چی؟ شەفەقەت یانی چی؟ موحیبەت یانی چی؟ پەروەردەی منداڵ چۆن دەبێت؟ نەك ئەوەی ئەگەر زەرِەیەك زەحمەتی بۆ دروست كردن و لەگەڵ كارەكەی خۆم رِێكنەكەوت دەست بكەم بەجنێودان و تورِەبوون و نەفرین كردن؟"...

لە دوابەدوای ئەم باسانە ئێستا كاتی ئەوەیە، برِۆینە سەر ئەو باسانەی كە (كاك ئەحمەد) تەواو پێدادەگرێت و دایك و باوك ئاگادار وهۆشیار دەكاتەوە كە ئاگاداری رِەفتاریان بن لەگەڵ منداڵەكانیان و جۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ نەكەن لە قاڵبی دایك و باوكی ئینسانی بچنە دەرەوە" ئەركی باوك و دایك بەشێوەیەكی زۆر سادە، ئەمەیە كە منداڵ لەلایەنی(رِۆحی و جسمی)ەوە ساڵم پەروەردە بكات، بەدەربرِینێكی زۆر سادە و كورت. منداڵەكەی، هەم جسمی ساغ و سەلیم بێت، هەم رِۆح و فكر و ئەخلاق و دەرك و شعور و زەوق و سەلیقەی هەموو ئەمانە پێی ئێژن(رِۆح و دەرون) ئەمانەی ساڵم بار بێت. ئەمەیش ئەركێك دروست دەكات چۆن دەكریەت جسم و دەرونی ساڵم بێت؟ چی كارگەلێك پێویستە ئەنجام بدرێت، تاوەكو جسم و رِۆحی ساڵم و دروست بار بێت(دروست بێت).

ئەركی زۆری هەیە، هەتا دەبێت كارێك بكات جێگەیان پاك و تەمیز بێت، دەبێت هەر لەمنداڵییەوە لەوكاتەوەی كەخۆیان هیچ دەسەلاَتێكیان نییە تا كاتێك گەورە دەبن ئصوڵی پاك وخاوێنی ئیسلامییان پیٚ حاڵی بكات. لە رِووی ئصوڵەوە خواردنیان پیٚ بدرێت، وا نەبێت برسییەتی فرە بكێشن، واش

نەبێت بەکوردی خۆمان"فرە بخۆن خەمەرە بکەن(ئینتەلا)" چونکە فرە خواردن بۆ (گەدە) زەرەری لە کەم خواردن فرەترە، ئینسان بەتایبەتی لەمنداڵیدا ئەگەر خۆراك زۆر کەم بخوات، با لێرەوە پەراوێزێك بێژم"جیاوازی هەیە لەبەرنامەی منداڵ و گەورەدا، منداڵ تا کاتێك لەسەر خەتی گەورە بوون و گەشەکردنە، شەرعەن تێر بخوات خاسە و بە برسییەتی دەست نەگرێتەوە باشە، فەقەد تێر بخوات نەك زیادەخۆری بکات، جیاوازی هەیە لەنێوان تێرخۆری و زیادەخۆری کردندا. زیادەخۆری کردن، ئەوەیە کە دوای ئەوەی تێری خواردووە لەبەر نەوسنی و چەپەڵی چەند پارویەکی تر دەخوات. ئەوە خۆمان پێی ئێژین (سك دڕاو)زۆر ڕاستە، واتە هەر تێیکات(کێشی)یەت، گەورە دەبێت و ناسالم دەبێت، تا سنورێك تێرخواردنی ئاساییە بۆ منداڵ ئازادە، بەڵام بۆ گەورە ئازاد نییە و نامەشروعە، واتە کاتێك ئینسان لە گەشەکردن(رشد) کەوت ئیتر نابێت تێر بخوات، دەبێت هەمیشە پێش لەتێر خواردن دەست بگرێتەوە! جائەگەر باسی ئەم جیاوازییە بکەم درێژە دەکێشێت... زۆر بەسادەیی منداڵ چونکە وردەوردە گەورە دەبێت بەو ئەندازەیە وا زەرفییەتی هەیە هەرچییەك بخوات جەزبی بەدەنی دەبێت، خوای گەورە وای دروست کردووە، بەڵام گەورە کە ئیتر لە گەشەکردن دەکەوێت هەرچییەك بخوات گشتی جەزب نابێت، دەبێت هەمیشە گۆشەیەك لە(گەدە)ی خاڵی بێت و ئیسراحەت بکات، ئەمە یەکێك لەجیاوازییەکانی منداڵ لەگەڵ گەورەدا.

باوك و دایك بتوانن کارێك بکەن منداڵیان فێربێت زیادەخۆری نەکات، ئاگاداربن نەبرسی بێت و نەزیادەخۆری بکات، چونکە کاتێك زیادەخۆری

زیانی لەكەم خواردنەكە فرەترە، ئەگەر برسی بێت جسمی پێویستی بەخۆراك هەیە بۆئەوەی زیاد بكات، وەك گەورە نییە جسمی پێویستی بەخواردن هەیە بۆئەوەی كامڵ بێت، برسی بوو جسمی كامڵ نابێت، گەشەی كامڵ نابێت، زیادەخۆریش بكات هەربەوجۆرە، فشار دەخاتە سەر (گەدە)ی و ئەویش كەخراپ بوو كاریگەری دەبێت لەتەواوی بەشەكانی تری جسم، هەتا دەروون و ڕۆحییەتیشی خەستە و ناتوانایی دەكات و ئامادەگی دەكوژێت و زهنی كوول دەكات.

باوك و دایك تەكلیفیانە كارێك بكەن منداڵیان تاوەكو لەسەر خەتی گەشەكردنە تێربێت، هەروەها ئاگاداریشی بكەن نەك بەزۆر و بەدەستەمۆكردن، چونكە ئەوە زیاتر بەرچاو برسی دەكات و خراپە، بەحاڵی كردن هانی بدەن كەئەندازەی تێر خواردن زیاتر نەخوات. لەوەودواش خۆراكەكەی (پاك) بێت، خۆراكی سالم بێت، كەداخەكەم ئەمەش بەمەردم حاڵی نەكراوە، خۆراكی پاك و سالم چییە؟ نەزافەت چۆنە؟

بەخوا قەسەم! لەماڵگەلێكدا، كەعالمی دینی و دەبێت پاك و خاوێنی بەمەردم حاڵی بكەن، بینیومە كاسەیان داناوە و پیاڵە و ژێرپیاڵەیان هێناوە و لەناو كاسەدا شۆردویانە، خوا دەزانێت ئەمەم بەچاوی خۆم بینیوە!

دەی ئاخر بیربكەرەوە، بۆچی ئەم (كاسە) ڕوبارە و پیس نابێت؟! ئەگەر ژێر ئەم (ژێرپیاڵە) پیسییەكی پێوە بێت، تۆ دەیخەیتە ناو ئەم كاسە(قاپ) تەواوی ژێرپیاڵە و قاپ و دەست و سەماوەر و هەرچی دەستی پێوە بدەیت پیس دەبێت! ئەگەر حەوزێكی گەورە بێت بەهەرحاڵ لەوانەیە پاك بێتەوە، بەڵام لەناو ئەو ئاوەدا پاك نابێتەوە! بەداخەوە مانای پاك و خاوێنیش حاڵی نەكراوە

بەخەڵك، یەكێك لەئەركەكانیان ئەوەیە، كەكارێك بكەن خۆراكەكەی پاك و خاوێن بێت، یاخود لەلایەنی ڤیتامینات و سودەوە زۆرینەی خەڵك دەبینیت دێن خۆراك سوردەكەنەوە، كەئەمەش زەرەری هەیە...(سوركردنەوە) تایبەتمەندییەكانی خۆراك لەناو دەبات، ڕاستە تام و مەزەی پێدەدات، بەڵام خراپە....

پاك و خاوێنییەكەی ئیسلامی بێت، نەك ئەوەی (ئەشرافی)بێت، ئەشرافییە و ئیسراف ئەمانە حەرامە و خیانەتە بەمنداڵ ئەگەر بەئەشرافییەت پەروەردەی بكات، ئاسایی و موتەوەصت، بەڵام پاك و خاوێن و ساڵم، لەوەودوا لەوەرزش و تەندروستیدا چاودێری بكات، كەتائەو ئەندازەیەی پێویستە خۆرەتاو و هەوای پاك و جوجوڵ دەستەبەر بكات بۆ منداڵی.

وەرزش زۆرزۆر پێویستە بۆ منداڵ لەناو وەرزشگەلدا (سێ)دانە هەیەكە پێغەمبەر(ﷺ) پێداگری لەسەركردوون و فەرمویەتی، ئەركی باوكانە كەدەبێت ئەمە فەراهەم بكەن بۆ منداڵەكانیان، (مەلەكردن، منداڵیان فێری مەلەكردن بكەن ـ تیرئەندازی ـ ئەسپ سواری).

جاپرسیار بكەن لەو مامۆستایانەی شارەزان لەهونەرەكانی وەرزشدا، دەزانن كەئەم (سێ) جۆرە چەنێك بۆ سەلامەتی ئینسان، بەتایبەتە لەمنداڵیدا كاریگەری هەیە و سودی هەیە، كە بۆچی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لەناو تەواوی وەرزشەكاندا پێداگری لەسەر ئەمانە كردووە؟

دەست ڕاستی و تیرئەندازی تەنها لایەنی وەرزش نییە، زۆر گرنگە، ئا ئەمانە بەرنامەگەلێكی گرنگە كەبۆ سەلامەتی جسمی منداڵ پێویستە، كاممان ئەمانەمان زانیوە نیسبەت بەمنداڵەكانمان ڕیعایەتمان كردووە؟ دەی ئەگەر ڕاستە و ئێمە شوێنكەوتەی ئەو مامۆستا و ڕەسولەی خۆماین، ئەو محمد(ﷺ)

وای فەرمووە. ئەصڵەن نەمانزانیووە ئەم ئوستازە چی فەرمووە، تاوەکو بەگوێی بکەین! هێشتا حاڵیمان نەبووە و پێمان نەوتراوە!

لەوەودوا، لەمانەش گرنگتر، لایەنی سەلامەتی دەرونییە. چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ منداڵیاندا؟ محەبەتیان محەبەتێك بەرێزوە، چۆن بێت، کەئەم منداڵە گرێی دەرونی بۆ دروست نەبێت؟ دڵی پڕ نەبێت لەداخ و حەسرەت، منداڵێکی سالم و بەشەفەقەت بێت، لەسەرحاڵ و کەیف خۆش و بەعاتفە بێت...لەم لایەنە زۆر زۆر تەکلیف دێتە ئاراوە کەناکرێت ئالێرەدا من هەمووی بێژم.

بەکورتی ئەوەندە بێژم، باوك و دایك دەبێت هەمیشە سەرچاوەی شەفەقەت و خۆشەویستی بن بۆ منداڵ. منداڵ هەست بکات و بزانێت ئەم دایك و باوکە خۆشیان دەوێت، لە کاتێکدا هەڵەیەك دەکات بەخۆشەویستی و موحیبەتەوە حاڵی بکەن ئەوە خراپە. نەك بەتوڕەیی و ناوچاوتاڵی، ئەویش لەکاتی خۆیدا ئامۆژگاری کردن کاتی خۆی هەیە، خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ادْعُ إِلى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾*، ئەگەر قسە لەکاتی خۆیدا بکرێت، کاتێك ڕۆحییەتی لایەنی بەرامبەر ئامادەگی هەیە، جێگەی خۆی دەگرێت، لەکاتی خۆیشیدا نەبێت جێگە ناگرێت، وەك ئەوە وایە لە(بەرد) بدات، ئەوەی کە دەڵێت "تەقەی سەری دێت"، واتە قسەکە بکێشێت بەبەردێکدا، چۆن بکێشیت بەبەردێکدا تەقەی دێت، بەوجۆرە تەقەی دێت و هیچ جێگە ناگرێت...مەسەلەن

*) ادْعُ إِلى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ }النحل١٢٥

منداڵەكەت دەڕواتە دەرەوە(٥تمەن)ی بردووە و شتێكی كڕیووە و هێناویەتیەوە و دڵی زۆر پێخۆشە، لەوكاتەدا توڕەبیت و بێژی(هەتیو! ئەمە بۆچی واتكردووە؟) وەك ئەوە وایە هیچت نەكردووە و لەجیاتی ئەوەی خزمەتت كردبێت، خیانەتت كردووە و زیانت پێ گەیاندووە! چونكە لەو كاتەدا تەواوی دڵی بەلای ئەوەوەیە كڕیویەتی، ئێمە خۆمان گەورەین، كاتێك تەواو دڵمان بەلای كارێكەوە بێت لەوكاتەدا پێمان بێژن مەیكەن، قسەكە خوێن تاڵ دەبێت لەلامان. منداڵیش بەو جۆرەیە! زۆر لەوە زیاتریش لەوكاتەدا نابێت پێی بڵێیت، هەروا زەردەخەنەیەكی بۆدەكەیت و وازی لێدەهێنیت، تاوەكو كاتێك ڕۆحییەتێكی ئاسایی هەیە، لەوكاتەدا دایدەنیشێنیت و وردەوردە قسەی بۆ دەكەیت و مانای ژیان و پێداویستی و پارە و سەرفكردنی بۆ باسدەكەیت، (كەناكرێت ئەمەش باسی بكەم، چونكە فرە تول دەكێشێت!) لەكاتێكدا پێی ئێژیت كە قسەكە كاریگەری بەجێ بهێڵێت. بەشێوەیەكی گشتی دەبێت بزانێت تۆ دڵسۆزی دەكەیت و ئەمە لەبەر پارەكەی خۆت نییە، بەڵكو لەبەر ئەوە ئەوت خۆشدەوێت نەك پارەكە، پارەكە دەكەیتە قوربانی ئەو، با ئەمە بزانێت، تۆ كاسبی بۆ ئەو دەكەیت و زەحمەت بۆ ئەو دەكێشیت و پارە بۆ ئەو پەیدا دەكەیت، كەئەو خۆشی بێت و باش پەروەردەی بكەیت، بەڵام ئەگەر ئەو بچێت و بەو شێوەیە خەرجی بكات، ئەوە زەرەری هەیە و خراپە، هەم بۆ كڕینی شتی باش و جوان پارە نامێنێت بۆی بكڕیت و هەمیش خۆی پەروەردەی خراپ دەبێت، بۆیە دەبێت لەكاتێكی باش و موناسیبدا پێی بڵێیت كەلێت تێبگات، ئەمە ئەركی دایك و باوكە هەمیشە بەمورحیبەتەوە بێت، هەتا كاتێ كارێكی خراپ دەكات

لەڕووی موحیبەتەوە حاڵی بكەیت كە نەیكات، هەتا ئەگەر گەشتە جێگەیەك كەچەندجار ئامۆژگاری كردن و ئاگادار كردنەوە سودی نەبوو، پێویستی كرد زللەیەكی لێبدەیت، یان تولێكی لێبدەیت، بزانێت ئەمە لەڕووی خۆشەویستییەوەیە و خۆشت دەوێت، وەك ئەو منداڵەی كە نەخۆشە و دەرزییەكی لێدەدەیت بزانێت كەئەم(دەرزییە) لەڕووی خۆشەویستییەوە لێی دەدرێت، نەك بەوجۆرەی هەندێك دایك و باوكی نەزان، منداڵ كاتێك بێ تەربێتییەك دەكات، دەیترسێنن "بێژم دكتۆرەكە بێت بۆت؟" ئا ئەوە خیانەتە بەرامبەر منداڵ دەكرێت بۆچی (دكتۆر و دەوا و دەرمان) لەبەرچاوی ناشرین دەكەیت؟ ئەگەر بەیانی بكەوێ و پێویست بێت ببەیتە لای دكتۆر و نەیەت و ڕقی لێی بێت! پێویست بێت دەرزییەكی لێبدەن بترسێت و بگرییەت. دەبێت فێر بێت كەدەرزی لێدان خێرە،{هەروەها (كاك ئەحمەد) لە یەكێك لەباسەكانی دیكەیدا (دەربارەی پەروەردەكردنی منداڵ){بۆ خوێندنەوی زیاتر دەربارەی ئەم بابەت و چەند نموونەیەكی دیكە لەم بوارەدا لە بەشی دووەمدا باسێك ئامادەكراوە لەژێر ناونیشانی (ئیزدواجی شەخییەت لە ئینساندا)} و شێوازی و هەڵسوكەوتی دایك و باوك لەگەڵ منداڵ و كاریگەری ئەو هەڵسوكەوتە لەسەر لایەنی دەروونی منداڵ دەڵێت، هۆكاری ئەوەی كە زۆرێك لە منداڵەكان خۆشیان نایەت لەوەی برۆنە (حەمام) و دایكیان بیانشوات پەیوەندی بە هەڵسوكەوتی نادروستی دایكەوە هەیە لەكاتی شۆردنی منداڵەكەیدا، ئەویش بەوەی كاتێك دایك منداڵەكەی دەبات بۆ حەمام بیشوات نایەت سەرەتا مامەڵەیكی دروست لەگەڵ ئەم منداڵەدا بكات، بەڵكو یەكسەر دەیباتە حەمامەكە و بە پەلە دەستدەكات بەشۆردنی و

ئاوی پێدادەکات و کەف دەچێتە چاوییەوە و ئیتر ئەو منداڵە ترسێکی دەربارەی حەمام بۆ دروست دەبێت هەرکاتێك باس حەمامی لەلابکەن ئەم دەست دەکات بەگریان ناڕەزای دەربڕین، چونکە یەکەمجار دایکەکە زۆر زەحمەتی داوە ئەو وا فێربووە کە خۆشۆردن ئاوا نارەحەتی دەکات، بەڵام ئەو دەڵێت، ئەگەر سەرەتا ئەو دایکە بێت بە شێوەیەکی ئاسایی و بەبێ پەلەکرد منداڵەکە بەرێت و دەست بکات بە قسەی خۆشکردن بۆی و پێش ئەوەی ئاوەکە بکات بەسەریدا لەناو تەشتی ئاوەکەدا کەمێك دەستبخاتە ناوئاوەکەوە و یاری بۆ منداڵەکەی بکات و تێیبگەیەنێت کە ئاوەکە خۆشەو ئازاری نادات، ئیتر ئیمکانی نییە ئەو منداڵە لە خۆشۆردن و حەمام بترسێت!}....

دەبێت ئەو منداڵەت بزانێت ئامۆژگاریکردنەکەی تۆش خێرە، بە شێوەیەکی سادە ئەمە ئەرکی دایك و باوکە نیسبەت بە منداڵ خۆ ئەگەر ئەمانە شی بکەمەوە، هەزار لق و پۆپی لێدەبێتەوە و گشتی لازمە!.... هەر دەربارەی موحیبەت و شەفەقەت و بەرپرسیارێتی دایك و باوك بەرامبەر بەمنداڵەکانیان و ئەو ئەرکە گرانەی لەم سەردەمەدا کەوتۆتە ئەستۆی دایك و باوك و پێویستە ئاگاری بن، ئەرکانێك کە دەبێت هەوڵێکی زۆر بدەن تاوەکو لە نێوان پەروەردەکردنی منداڵ و پەیدا کردنی قوتێك بۆیان هەوسەنگییەکی وا دروست بکەن هیچ کامیان زیان نەگەیەنێت بەوی دیکەیان، واتە کاتێك سەرقاڵن بە پەروەردەکردنی منداڵەکانیانەوە ئەویان لەیاد نەچێت کە دەبێت خواردنیش پەیدا بکەن، بە پێچەوانەشەوە کاتێك مەشغوڵی کاردەبن بزانن منداڵیان هەیەو پێویستە بەرامبەریان کۆمەڵێك ئەرك ڕاپەڕێن، کە کاك ئەحمەد لەسەر ئەم بەشەی دووەمی دەوەستێت و بەتایبەت لەبارەیەوە قسەدەکات و

دایك و باوك لە هەڵەگەلێك ئاگادار دەکاتەوە کە بەڕاستی غافڵبوون لێیان سەرئەنجامێکی ترسناکی دەبێت، ئەو دەڵێت" دایکان! ئەم گشتە وەختەی تۆ سەرفت کردوە دەی برۆ بخوێنەرەوە و موتاڵەعە بکە، شت فێرببە. فێر بوون بۆ تۆ گرنگ ترە تا خواردن، خواردنیش لازمە، بەلاّم بەو ئەندازەیەی پێداویستی لاشە پەیدا دەکات، نەك شتی ڕەنگاو ڕەنگ و پڕ زەرق و برق دانان لەسەر سفرە.

مناڵەکەی تۆ سالم بێت، مناڵەکەی تۆ یاری بکات لەگەڵتدا، مناڵەکەی تۆ خۆشەویستیت لەگەلاّ پەیدا بکات گرنگ ترە، ئەمە ئێژم تەنها بۆ دایکان نییە، بۆ باوکانیشە. هاوار لەم کۆمەڵگەیەی ئێمە کە باوکی بێ چارە دەڕواتە دەرەوە لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ خۆی ئەکوتێ، کاتێك دێتەوە ماڵەوە پەرێشان، خەستەو مردوو منداڵ سەلامی دەکات توانای نییە وەلاّمی سەلامی منداڵەکەی بداتەوە، دوای نیوەڕۆ یەلاّ بە جەستەی شەکەتەوە دەڕواتە دەروە شەو دەگەڕێتە ماڵەوە، منداڵ دێت بەرەوڕووی مەسەلەن دەیەوێ مەحەبەتێك (خۆشەویستی) ببینێت لە باوکییەوە، چی باوکی بێچارە تاقەت و توانای مەحەبەتی نییە باوکی چی، ئەوە کەی باوکە؟! خۆ من نایەژم خەتای شەخصی ئەو باوکەیە، بەڵکو پەیوەنییە خراپەکە وای کردووە دەبێت ئەو بەیانی تا ئێوارە زەحمەت بکێشێت بۆئەوەی ماڵەکەی شتێکی کەم نەوێ لەماڵی فلاّنە دراوسێ، فەرشەکەی کەم نەوێت پێداویستیەکانی چێشتخانەی کەم نەوێت کاسەو کەوچکی کەم نەبێت موبیلاتی کەم نەبێت.... مەجبورە بێچارە وا دەکات، ئەگەر ئەو پیاوە فەقیرە وا بەیانی تا ئێوارە دەچێت خۆی دەکوژێت و خۆی ماندوو دەکات ئەمە بۆچی؟ لەبەرئەوەی دیکۆری ماڵەکەی بگۆڕێت و

نەخش و نیگاری زۆر تر بێت، لە جیاتی ئەوەی بێت دانیشێت دوو قسەی خۆش بكات لەگەڵ ژنەكەیدا، دوو ڕووداى ژیانی دەرەوەی خۆی باس بكات و بیگێڕێتەوە بۆ ژنەكەی، گوێ بگرێت بۆ ژنەكەی دوو كێشە لە كێشەكانی خێزان باس بكات بۆی، دوو بابەت لە بابەتەكانی پەروەردە كردنی مناڵەكانی باس بكات بۆی، ئەو وەختە باوكە... ئەوكاتە تەنها بۆ منداڵ بوون نابێت بە باوك، هەرچی حەیوانە باوكە ئەگەر باوك وابێت، مەقامی باوكی (پلەی باوكایەتی) یان پلەی دایكی زۆر گەورەیە، دایك و باوك لە مەنتقی ئینسانیدا واتە مەسئولییەت لە بەرامبەر منداڵەوە، واتە ئەوە كەدایك بتوانێ مەزهەری عاتیفە (سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستی) بێت بۆ باش كردنی دەروەی، سالم كردنی دەروونی منالّ واتە ئەوە كە باوك بتوانێت مەزهەری فێركردن و لێپرساوێتی بێت بۆ پەروەردە كردنی دروستی منداڵ بۆ ئاگادار بوونی زیاتری، ئەگەر باوك و دایك كاریان هەر ئەوە بێت، ئەو بڕواتە دەرەوە جا هەر كامیان بێت فەرقی نییە، هەر هەوڵ بدەن و پارە پەیدا بكەن، با سەیارەكە وابێت، با فەرشەكە وابێت، با بیناكەمان وابێت، منداڵی بێچارە چی منەتێ بكات باوك و دایكی هەیە؟! نان و ئاو هونەرێكی نییە، جل و بەرگ هونەرێكی نییە، باوك و دایكی ڕاستەقینە ئەوەسە كە صەفا و موحیبەت و گەرمی دەدەنە منداڵ ئەوەیە كە نەشاتی ڕۆحی دەدەنە منداڵ نەك تەنها نان و ئاو پێدان، دراوسێیەكیش دەتوانێت نان و ئاو بدات بە منداڵەكەی.

من پیاوانێك دەناسم لە شەو و ڕۆژێكدا جارێك چاویان ناكەوێت بە منداڵەكانیان لەبەر چی؟ نە لەبەر جیهاد، نەلەبەر لێپرسراوێتی گەورەی كۆمەڵایەتی، نەوەڵا لەبەر مادیەت، لەبەر پارە پەیدا كردن. من دەزانم

دایکانێك هەن کە حەوسەڵە (تاقەیان) نییە یەك کەلیمە خۆشەویستی پیشانی منداڵەکانیان بدەن، گشتی تەنها لەبەر ئەشرافییەت، لەبەر ژیانی ئەشرافی. بەڕاستی ئەو دایکە وا لەجیاتی هەمیشە بەدیاری خواردن دروستکردنەوە بێت، وا هەمیشە بڕوات لە فەرمانگەکاندا بە نارەحەت پارە بێنێتە ماڵەوەو لە ماڵا خەریك بێت چێشت دروست بکات کارگەلێك زیادە ئەنجام بدات، ئەگەر ئا بەوجۆرە میقدارێك خەریك بێت ژیانی خۆی بچوك بکاتەوەو ئەشرافییەت و زەرق و بەرق لاببات، لە جیاتی ئەوە کایە(یاری) و شۆخی بکات لەگەڵ منداڵەکانیدا، سەیر دەکات ماڵی دەبێتە ماڵ. هەروەها پیاوانیش ئەگەر بێن لە جیاتی ئەوە موحیبەت لەگەڵ ژنەکانیاندا بکەن، گوێکە شلکەن بۆ دەردە دڵی ژن، گوێچکە شل کەن بۆ کێشەیەك کە هەیەتی لەبەرامبەر منداڵەوە، لەبەرامبەر خەڵکی گەڕەکەوە، لەبەرامبەر دراوسێکانیەوە، لە کاتی کاری فەرمانگەکەیدا، لە کاتی کاری ماڵیدا بزانن ئەم ژنە چی دەردە دڵێکی هەس؟ با کەم ببێتەگرێ لە دڵی خۆی و منداڵید لە دڵی خودی پیاویشدا، خۆشی دانیشێت دەردە دڵی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ژنەکەی، ئەو کاتە تەماشا دەکەیت پەیوەندی ئەوەندە گەرمە کە ئەشێت پێی بڵێین یەك خێزانی ئیسلامی، بەڵام ئا ئێستا داخەکەم یەکجار کەم هەمانە خێزانێکی ئیسلامی، کە بەڕاستی پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوان تاکەکانی خێزانەکە گەرم بێت...". بەدەر لەمانەش دەردێکی تر کە بەداخەوە کەسی گوێی پێنادات و تائێستاش نەتوانراوە قسەی لەسەر بکرێت، بریتییەلە لەو فاصیلە فیکرییەی لە نێوان ژن و پیاودا دروست دەبێت، کە ئەمەش دواجار جێگەوتەیەکی نیگەتیڤ بەجێدەهێڵێت لەسەر ژیانی خێزان بەگشتی و

پەروەردەکرن و ڕاپەڕانـدنی بەرپرسـیارێتییەکان بەرامبـەر بـە منـداڵ. (کـاك لەحمەد) دەربارەی هۆکار و کاریگەری دروست بوونی ئەم ماصـیلە فیکرییـە دەڵێ"بۆچی ناهێڵن ژن بێتە مزگەوت؟ خۆ ئیـسلام ئێـژێ دەبێـت ژن و پیـاو وەکو یەك لـە پەروەردە و بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەدا حاڵی بن! ئاخر خۆشەویستەکانم! بیری ئەوە ناکەنەوە ئێستا کاتێك یەکێك لە ئێـوە لـە مزگەوت دانیشتووە، لێرە بابەتێکی گوێ لێدەبێت ئائەوە گاریگەری لەسـەر ڕۆحییەتی دروست دەکات، کە دەچێتەوە بـۆ ماڵـەوە ژنەکـەی لەوبارەیـەوە هـیچ نازانێـت، ئـەم فاصـیلەی فکرییـە کـە ئـەو شـتێکی دەرك کـردووە و کاریگـەری ڕۆحییـەی تێـدا دروسـت کـردووەو ، بـەڵام ژنەکـەی دەرکـی نەکردووە دەبێتە هۆی دروست بوونی (عەدەمی تەفاوت)، بۆیە دەبێت توێـژە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەگـشتی و دوو توێـژی ژن و پیـاو (دایـك و بـاوك) بەتایبەتی گـشتیان لــە لایـەنی عمومیـاتی کۆمەڵگـەوە هاوجیهـەت بـن، لــە مەسائیلی عمومیدا هاودەرك و هاوفەهم بـن. بۆچـی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) یاسای جاهیلییـەتی شـکان کـە ژن تـەحقیر دەکـرا و ئیجـازەی نـەبوو بێتـە ناودانیشتنی پیاوانەوە و کچیان زیندەبەچاڵ دەکرد؟ ئەو دەستوریدا لـەهەرچی دانیشتنی گەورەی سیاسی و فەلسەفی و دینی و ئیسلامیدا هەیە لە ناویشیاندا مزگەوت، (کە سەنتەری گشتی بوو، هەرچی کاروباری کۆمەڵایەتیبوو لەوێ چارەدەکرا) دەستوریدا دەبێت ژن و پیاو هەردووکی بەیەکەوە بن! ئەی ئێمـە بۆچـی تـەرکمانکرد؟ چـونکە پیاوەکـان بەدەسـتەڵاتربوون و ژنـەکان بێدەستەڵات. پیاوان دەیانووت وێڵیان بکەن! با لە ماڵەوە خەریکی ماڵداری بن، با چێشتەکە دروست بکەن، و گسکەکە بدەن، با پێشوازی لە میوانەکان

بكەن! ئەمەش یەك تەبەقە بەندی دروستكردا" لە ڕاستیدا ئەگەر كەمێك ڕابمێنین لەم وتەیەی (موفتی زادە) وا دەزام بە چەند نوكتەیەكی گرنگ دەگەین، یەكیان ئەوەیە كە بوونی فاصیلە و نێوانی مەعریفی و فیكری لە نێوان ژن و پیاودا دەبێتە هۆكاری ئەوەی كە جیاوازی تێگەیشتن دروست ببێت و لێرەشەوە سەربكێش بۆ دروست بوونی بیروڕا لەسەر ئاستی عەقیدەی، كە بەدوای ئەمە ئەنجام نەدانی بەرپرسیارییەتی و گوێنەدان بە پەروەردەكردنی منداڵ سەرهەڵدەدات، بۆیە دەبینین كاك ئەحمەد لە زۆر شوێندا پێی لەسەر ئەوە داگرتووە كە با ژنگەل وا بیرنەكەنەوە پێویستیان بە خوێندن و زانین نییە، بەڵكو زۆر زۆر پێویستیان پێیەتی و دەبێت هەندێك بابەت و كاروباری خێزانداری هەیە وازی لێبهێنن و لەجیاتی ئەوەی خۆیان سەرقاڵبكەن بەو شتە بێسودانەوە خەریكی خوێندنەوە و زانیاری وەرگرتن و دەرس خوێندنبن، بۆئەوەی بتوانن هەم لەسەر ئاستی فیكری و هەم لەسەر ئاستی كۆمەڵایەتی و ئەنجامدانی بەرپرسیارێتییەكانیان شانبەشانی پیاوان ڕێگە بكەن و بەردەوام بن. یەكێكی تریش لە نوكتە دیارەكانی (موفتی زادە) ئەوەیە، كە پێی وایە هۆكارێكی دیكەی دروست بوونی چینایەتی و بان و خوار لە خێزاندا كە دواتر درێژدەبێتەوە بۆ چینایەتی (تەبەقات)ی كۆمەڵگە بریتییە لە دروست بوونی ئەو فاصیلە مەعریفییەی لە نێوان ژن و پیاودا! چونكە ئەو پێیوایە كاتێك ژنان نەخوێندەوارن و دەربارەی بابەت و بارودۆخەكانی كۆمەڵگە شارەواییان نییە و لەولاشەوە پیاوان خاوەن هێزن و بەردەوام لەبوارەكاندا لەبەر شارەزاییان قسە دەكەن ئەمە دەبێت هۆی دروست بوونی چینایەتی و لەكۆتایدا ئەوەسەرهەڵدەدات كە جارێكی دیكە

ژنان بچەوسێننەوە و ئـەو شۆڕشـە گەورەیـەیی پێغەمبـەر(ﷺ) لـەو بـوارەدا هەڵبگیرسان و بەلتکەی گەیاند جارێکی تر بیکوژێننەوە.

هەروەها موفتی زادە، لە باسێکی تریدا هەر دەربارەی چۆنییەتی مامەڵە کردنە لەگەڵمنداڵدا، دەربارەی ئەم بابەتـە نمونەیـەك دەهێنێتـەوە، کـە باسـی ئـەوە دەکات، ئەگەر منداڵەکەت هەر لاساری کـرد و تـۆش پێویـست بـوو لێـی بدەیت لەوکاتەدا جۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت، ئـەو نمونەیـەکی واقیعـی خـۆی دەگێڕێتـەوە کـە بـەوجۆرە لەگـەڵ (حمـە ژیـان)ی کوڕیـدا مامەڵـەی کردووە، لێرەدا ئەوەش بڵـێم یـەکێك لـە هـەرە خاڵـە گرنگـەکانی ژیـانی کرداری (کاك ئەحمەد) لە کاتی بزوتنەوەی بانگەوازییەکەیدا کە بۆتـە هـۆی ئەوەی بتوانێت لەو ماوە کەمەی بەردەسـتیدا ئـەو کاریگەرییـە قـوڵ و زۆرە لەسەر خەڵکی و ڕەتەکان بـەجێبهێڵێت، بریتییـە لـە (هاوسـەنگی لـە نێـوان گوفتار و کرداردا)! زۆرێك لە خەڵکی لە هـەموو هەئاسـتەکاندا لـە ڕووی مەعریفییەوە هەمیشە ئەم پرسیارانە دووبارە دەکەنەوە، کە بۆچی ئێمە ناتوانین وەك ئەو ئـەو پیاوانـە کاریگـەربین؟ بـۆ چـی وتـاری مـەلاکان وەك قـسە و باسەکانی (کاك ئەحمەد و مامۆسـتا ناصـر و مامۆسـتا سـەعید و...) بـەجۆش نابن، لە کاتێکدا هەمان قسەیە و لەهەمان سەرچاوەوە وەرگیراوە (قورئـان و سوننەت)؟ یان بۆچی لەم سەردەمەدا موفتی زادەیەکی تر دروسـت نابێتـەوە؟ جا بەشێك لەوەڵامی ئەم پرسیارانە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەوە (هاوسەنگی لـە نێوان گوفتار و کردار)ەدا هەیە! ئاخر قـسەی مەلایـەك دەربـارەی کۆمـەکی کردنی هەژاران چۆن کاریگەری دەبێت لەکاتێکدا ئەو سەریارەیەی لە ژێری خۆیدا نەك دڵ هەژار بەڵکو دڵـی گـەنجێکی دەوڵەمەنـدیش ڕادەچـڵەکێنێت

کەدەدات بەلایدا؟!! کێ هەیە لە ئێستادا بە ئەندازەی (موفتی زادە) بیر لەسەرما و گەرمای ماڵێکی هەژار بکاتەوە؟ کام (سەعیدی نوورسی)ە لە ئێستادا قەناعەتی بەوە هەبێت لە دەرگای (فەقر)ەوە لە بارەگای خودا بدات و شەوانە و ڕۆژانە لە بیری بەرگریکردندا بێت لە قورئان؟ کام لە مەلا لە ئێستادا ئامادەی ئەوەی تێدایە ماڵ و منداڵ و ژیان و ئیسراحەتی بۆ بەرگریکردن لە ئایەتێکی قورئان بفەوتێنێت؟ کام بیریار هەیە بتوانێت وەك (سوبحانی) لە بەردەم (بەتی سێدارە)دا بڵێت بە سەرۆکی وڵاتەکەی (گومڕایە و خەڵکیش گومڕا دەکات)...؟ لەبەرئەمە و چەندین هۆکاری دیکەیە کە (موفتی زادەکان) دەرناکەون! لە باسەکانی دواتردا کاك ئەحمەدلە بارەی (هاوسەنگی لە نێوان گوفتار و کردار) قسە دەکات...

جا هەروەك وتم، (کاك ئەحمەد) هەموو ئەو قسانەی کە کردوویەتی و ئامۆژگاری خەڵکی کردووە ئەنجامی بدەن لە ژیانی کرداری خۆیدا ئەنجامی داون، بۆیە کاتێك دەڵێت دەبێت ئاگادری ئەوە بن بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانتان دەکەن، خۆی ئەمەی زانیوەو ئاوا مامەڵەی کردووە، لەیەکێك لە دانیشتنەکانیدا هەوڵدادەت باسی شێوازی مامەڵەی دایك و باك و گەورەکان بکات لەگەڵ منداڵ بۆیان ڕوندەکاتەوە کە دەبێت زۆر ورد مامەڵە لەگەڵ منداڵەکاندا بکەن و بزانن چۆن پەروەردەیان دەکەن و بەرامبەر هەڵەیەك دەوەستنەوە کە منداڵەکانتان ئەنجامی دەدەن، ئەو دەڵێت بۆئەوەی بەرامبەر هەر هەڵەیەك بووەستیتەوە و دروست بتوانیت منداڵەکەت پەروەردە بکەیت پێویستە سەرەتا ئەمە بزانیت، کە وەڵامدانەوە و

چارەسەركردنی هەر هەڵەیەك منداڵ ئەنجامی دەدات بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت:

١. تێگەیاند و ڕوونكردنەوە: منداڵ لەسەرەتادا كە ئەو هەڵەیە دەكات نازانێت و هیچ شتێك لەوبارەیەوە ئاگادار نییە، كە ئەم كارەی ئەو كردویەتی هەڵەیە، بۆیە لەسەر دایك و باوك پێویستە لەم قۆناغەدا تەنها بۆی ڕونبكەنەوە و تێبگەیەنن ئەم كارەی ئەنجامی داوە هەڵەیە و سەرئەنامێكی باشی نابێت.

٢. تووڕەبوون: قۆناغی دووەم دوای ئەوە دەست پێدەكات، كە ئەگەر لەپاش ڕوونكردنەوە و تێگەیاندنی هەر لەسەر ئەو كارە بەردەوام بوو، دووبارەی كردەوە و وازی لێنەهێنا ئیتر كاتی ئەوەیە كەمێك لێی توڕەبیت، بەڵام لێی نەدەیت و دەستی بۆنەبەیت.

٣. لێدان: دوای ئەوەی زانیت هێشتا هەر لەسەر ئەو كارە هەڵەیە بەردەوامە و تەركی نەكردووە، ئیتر كاتی ئەوەیە حاڵی بكەیت كە تۆ لە پلەی ئینسانی دەرچوویت و بویتەتە حەیوان، بۆیە پێویست بەوەدەكات لێی بدەیت، بەڵام دەبێت بزانی چۆن لێیدەدەیت، ئەمەش بە بەرنامە دەبێت و شتێك نییە هەڕەمەكی و لە خۆتەوە و وەك جەلاد بنیشیتە سەری و بە ئارەزووی دڵی خۆت لێی بدەیت و غەریزەی توڕەبوونت دەربڕیت تاوەكو دەست و مەچەكت هێزی تێدایە فەلاقەی بكەیت نا! دەبێت بە ڕووخسارێك مەحبووبانەوە لەبەرمبەری بوەستیت، موفتی زادە لەم باریەوە دەیگێڕێنێتەوە و دەڵێت"حەمە ژیان گیان! لەبیرتە كاتێك منداڵ بوویت بەرنامەیەكم دانابوو بۆ جەزادانەوەی هەڵەكانت؟ منداڵ

سەرەتا نازانێت بۆیە هەڵە دەکات بۆیە حاڵی دەکەیت، لەدوای ئەوە بەردەوام بوو تورەدەبیت، لەپاشاندا دووبارەی کردەوە لێی دەدەیت، زۆر جار دەبوویە جیدالمان لەسەر ئەوەی ئەم کارە هەڵەیەی شایستەی ئەوەیە چەند شیلاقی لەسەر بخوات، هەندێکجار خۆی تەسلیم نەدەکرد و دەیگووت هێشتا لە قۆناغی تووڕە بووندایە و دەبێت لێم تورە بێت، چەند جار ئەمە ڕوویداوە... جاری واهەبوو لەسەر ژمارەی شەلاقەکان دەبووە جیدالمان، کە ئایا ئەم هەڵەیە ئەرزشی (١٠ یان ٢٠) شەلاقی هەیە؟ جارێکیان ڕێکەوتین لەسەر (١٠ شەلاق)، جا لەوحاڵەتەی کە لێمدەدا هەردووکمان پێدەکەنین، نەك ئەوەی بڵێیت بە دەمووچاوێکی ترسناك و تووڕەوە وەك جەلاد! جا لە کۆتا شەلاقدا پێم ووت: حەمە ژیان! بە بڕوای تۆ، کاممان زۆرتر ئێشمان پێدەگات؟

ئەویش وتی: من شەلاق دەخۆم و ئێش بەتۆ دەگان؟!

وتم: حەمە ژیان گیان لە تۆ زیاتر ئێشم پێدەگات {ئەوکاتە تەقریبەن تەمەنی لەنێوان(١٢ بۆ ١٣) ساڵاندا بوو}، وتم، بەخوا قەسەم من زیاتر ئازار دەخۆم، تۆ تەنها دەستت ئێشی پێدەگات، بەڵام من دڵم ئێشی پێدەگات!

جا بۆیە وامەزانن هەرکات منداڵ هەڵەیەکی کرد دروستە لێی بدەیت، بەخوا قەسەم لە ناو هەزاران دایك و باوکدا یەکیان لایەقی ئەوەی نییە دەستی بەرزبکاتەوە و زلەیەك بدات لە منداڵێك، تۆ دەبیتە جەلادێك و حیس و غەریزەی تورەبوونی خۆت پیشان دەدەیت! بەڕاستی ئازاری ئینسان دەدات نەك ئەوەی پەروەردەی ئینسان بکات، دەی ئەو ئینسانەی وا خەریکە ئازاری ئینسان دەدات ئەوە پەروەردە و خێر ویستن نییە".

# ئەو كارەی گرنگەی دایك و باوك لە بیریدەكەن!!

یەكێكی تر لەو جێگایانەی (كاك ئەحمەد) دەیكاتە دەروازەیەك و دەیەوێت لە ڕێگەیەوە گۆڕانكاری لە خێزان و شێوازی پەروەردەكردنی منداڵدا درێت بكات بریتییەلە مەسەلەی (سەلامكردن)ی دایك و باوك لەكاتی چوونی هاتنیان لەناوماڵدا. لێرەداو پێش ئەوەی بیروبۆچوونی موفتی زادە لەم بارەیەوە بگوازمەوە بەگرنگی دەزانم لایەنێكی تری (كاك ئەحمەد) بە خوێنەران ئاشنا بكەم، ئەویش ئەوەیە كاك ئەحمەد لەبەرئەوەی ویستوویەتی گۆڕانكارییەكی ڕادیكالأنە لە كۆمەڵگەدا ئەنجامبدا دەبینیت بەجۆرێك كاری كردووە و لەسەر كۆمەڵە بابەتێك وەستاوە كە بەڕاستی ئەگەر كەسێك كەمێك ورد نەبێتەوە و باش لەمەسەی بانگەوازو ئیسلام وەك قوتابخانەیەك تێنەگەشتبێت وا هەست دەكات (كاك ئەحمەد) لەم بابەتانەدا یادرۆشتووە، بەلأم دواتر دەبینیت ئەوە زیاد ڕۆشتن نییە؟ بەڵكو ئەوە دەركی قەڵ و وردی ئەوە ناچاریكردووە لەسەر هەموو لایەنەكان قسەبكات، ئەوە تێگەیشتن و كەشفكردنی دەردكانە وادەكات لە (موفتی زادە) ئەوەندە وردبێتەوە و بڕواتە ناو خانەوادەكانەوەو ولەسەر بابەتی زۆر ورد قسەبكات، بەڕاستی كاتێك لەم بوارەدا لەم زانا ڕادەمێنیتو گوێی بۆ دەگریت واهەست دەكەیت لەبەرامبەر خاوەنی قوتابخانەیەكی كۆمەڵناسییەوە وەستاویت و چەندین ساڵ توێژینەوەی وردی ئەنجام داوە تا پەی بەم لایەنە وردانەی كۆمەڵگە بردووە و ئێستا هاتووە بە دەرمانی تایبەت چارەیان دەكات!! یەكێك لە هۆكارەكانی سەركەوتنی (كاك ئەحمەد) لە مەجالی كۆمەلأیەتی و دەرك كردنی دەردەكانی

كۆمەڵگە بریتییە لە دانەبڕانی و هەمیشە ژیان لەناوی چینەكانی كۆمەڵگەدا! ئەوە دانەبڕانی موفتی زادەیە لە كۆمەڵگە وایلێدەكات لە زەمەنێكی كەمدا بتوانێت بە ئەندازەیەك لایەنگر و جەماوەر بۆخۆی پەیدا بكات كە لە ڕۆژە سەخت و پڕنەهامەتییەكانی ئینقلابدا، لە ڕۆژانێكدا هەموو دونیا چاویان لە دەمی (خومەینییە) ناوی (كاك ئەحمەد) لەگەڵ ناوی ئەودا بەرزبكرێتەوە و شیعاری (درود بری ئاغای موفتی زادە) لە مەیدانە قەرەباڵغەكانی (سنە و كرماشان)دا بوترێتەوە! جگە لەمەش كە لە خەڵك دانەبڕوا توانیوویەتی ڕاستگۆیانە لەگەڵ خەڵكدا بژی و ئەوەی هەیەتی ببەخشێت بەخەڵك (مەلا محەمەدی ڕەبیعی) لە رۆژی ناشتنی جەنازەكەی (كاك ئەحمەد)دا (درود و رەحمەتی پەروەردگار بڕژێت بەسەر گیانی پاكیاندا) وتارێكدەدات و دەڵێت "كاك ئەحمەد ئەو پیاوە بوو كە دەچووە دەرەوە، كەسێكی هەژاری دەبینی چاكەتی لەبەردا نییە چاكەتەكەی خۆی پێدەدا، هەژارێكی دەبینی پێڵاوی لەپێدانییە پێڵاوەكانی خۆی پێدەدا"، ئەم ڕاستگۆیانە ژیانە بوو موفتی زادەی كردە ئەم پیاوە كە ئێستا و بۆئەبەد كورد و كوردستان شانازی پێوەبكات.

جا ئەم كورتە باسە بۆئەوەبوو ڕونبێتەوە كە (كاك ئەحمەد) بەو ئەندازەیە خەمی كۆمەڵگەی بووە بۆ ساتێكیش لێیان دانەبڕاوە و بەردەوام هەوڵیداوە لە دەرد و كەم و كوڕییەكان ئاگادارییان بكاتەوە، بۆیە لە شوێنێكدا دەگاتە ئەوەی ئامۆژگاری دایكان و باوكان بكات دەربارەی (سەلامكردنیان) و بۆیان ڕوندەكاتەوە كە ئەم سەلامە تەنها شتێكی سادەنییە، بەڵكو یەكێكە لەو پرۆسەی پەیوەندی كۆمەڵایەتییانەی كە كاریگەی زۆر لەسەر تاكەكان بەجێدەهێڵت، لەبەرئەوە زۆر گرنگە بۆ باكو دایك بەوردیو بەرپرسیارانەوە

ئاگاداری ئەم پرۆسەیەبن و بزانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدادەکەن، ئەو دەڵێت"پیاو (شو)، کە دەڕواتەماڵەوە (پۆز) نەنوێنێت بەسەر (ژن)دا، بەهەستێکی ڕێزەوە بێژێت (سلام علیك) هەروا کە ژنەکە دەڕواتە ماڵەوە بەرێزەوە (سلام)بکات... ئەمەش خێرویستنە بۆ یەکتری و دوعای خێرکردنە و مامەڵە کردنێکی برا و خوشکی دینییە، صەفا و صەمیمەتە و نیشانەی دڵسۆزییە بۆ یەکتری. (ژن و شو) کاتێك دەبێتە (ژن و شو)ی ئیسلامی کە دڵسۆزی لەنێوانیاندا بگاتە بەرزترین لوتکە، دەبێت لەهەرچی برا و خوشکی دینییە زیاتر خۆشەویستی و صەفا و صەمیمییەت لەنێوانیاندا هەبێت، بۆیە دەبێت کەپیاوێك دێتە ماڵەوە هیچ خۆی پێ بانتر نەبێت، کاتێك ژنەکەی دانیشتووە پێی بێژێت(سلام علیك) ئەویش لەوەڵامدا بێژێت(و علیك سلام ورحمە اللـە)، منداڵ دێتە ماڵەوە هەروا، دایك و باوك دێنە ماڵەوە هەروا، بەڵام بەخوا لەوانەیە، ئەصڵەن هەندێك کەس ئا ئەمانە بکات ماڵەکە و خانەوادە تەحەمولی نەکەن و تێکی بدەن. ئەمەش دوورکەوتنەوەمانە لە ئیسلام و وردەوردە کاتی دەوێت.

جابۆیە دەڵێم، منداڵەکان، ڕۆڵەکانم! عورفی کۆمەڵگەکەمان ئەمەیە، باوك، مامۆ، خاڵۆ، دێنە ماڵەوە(بەندەپێ) هەڵسنەوە لەبەریان و سەلامیان لێ بکەن، دەزانم فێر نەکراون. خەتاتان نییە! مامەڵە کردنی حەیوانانەیە دەڕواتە ماڵەوە و نازانێت(سەلام) بکات! پیاوگەلی کۆمەڵگەی ئێمە هەرچییەك خۆی بەماقوڵتر بزانێت زیاتر لە حەیوان دەچێت.. ئەمەم بەگرنگ زانی ڕوونی بکەمەوە بۆ منداڵگەل چونکە هەندێك لەمنداڵگەل ئێستا لەناو ماندان وەك ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییەی گەرەکیان نەوێت، ڕەفتار بکەن لەگەڵ دایك و

باوكیاندا، ئەگینا حاڵی نابن، هەروا بۆ ئێوە پیاوگەل كە ژن و منداڵتان هەیە، بەئیزنی خودا موخلیص بن لە دیندا، موخلیص بن لەبەندەگی كردنی خوای گەورەدا، حەز دەكەن دەستوری خوا و پێغەمبەرەكەی جێبەجێ بكەن، حەز دەكەن لەمەولا وەك ئەم یاسایانە ڕەفتار بكەن، بەڵام ئەوە بزانن ئەگەر لەكتوپڕدا بتانەوێت بەو شێوەیە ڕەفتار بكەن، ئەوە كارەكە دەشێوێت، چونكە ژن و منداڵتان فێری ئەوە نەبووە، ئێستا بە كتوپڕ بڕۆیتە ماڵەوە و ژنەكەت دانیشتووە بێژیت (سلام علیك)(...بەپێكەنینەوە...) (یاخوا بەخێر بێیت) ئەمەچییە؟ منداڵەكەت ئێژێت"هەی لەوە! باوكم شێت بووە!" {چونكە سەلامی كرد! ئاخر فەقیرە لەوەوپێش نەبینیوە باوكی سەلام بكات ئێستا لەپڕ ئەمەی بینی وادەزانێت شێت بووە لەخۆیەوە سەلام دەكات!!}

دەبێت وردە وردە لەسەرەتاوە، وشە وشە باسیان بۆ بكەن و حاڵیان بكەن و بێژن جاران نەمانزانیووە، خانمەكەم، منداڵەكەم، كوڕ و كچەكەم، جاران ڕەفتارمان ئیسلامی نەبووە، حەیوانی و هەڵە بووە، بێن لەمەولا گشتلایەكمان بكەوینە سەرباری ئیسلام... بەو شێوەیە وردەوردە بنەڕەتی دابنێین، جا لەوەودوا ئیتر پەیوەنییەكی ئیسلامی دروست بكەرەوە. یان بەڕێوبەری ئیدارەیەكە، عادەتی نەگرتووە كە دێتە دائیرەكەی لەكارمەندەكانی(سەلام) بكات، چونكە زیاتر لە حەیوان دەچێت، وەزیر بۆ بەڕێوەبەری گشتی بەو شێوەیە، بەڕێوبەر بۆ فەرمانبەر بە شێوەیەیە! هەروا هەرچی لەڕووی(پۆستەوە) دەچێتە سەرەوە زیاتر حەیوانە و ئەخلاقی حەیوانی زیاتر پەیدا دەكات! هەروا (كش و مات) وەك حەیوانێك دەڕوات بەرێدا و (زل زل)دەچێتە ژورەوە و هیچێك ناڵێت، دەی ئەگەر بەشەری دەبێت (سەلام) بكەیت، بەڵام گەورە

نیسبەت بە بچووك خۆی بەبەشەر نازانێت، بەداخەوە تەربییەتمان وای لێهاتووە.

بە منداڵەكەم وتووە، حاڵیم كردون چونكە لەو فەرهەنگە تەبەقاتییەدا دروست بووین، نابێت ئێستا بتانەوێت لەگەڵ باوك و دایكتاندا ڕێك وەك ئەو بنەما ئیسلامییە ڕەفتار بكەن، باوك، مامۆ، خاڵۆ، دایك، هەركەسێك دێتە ماڵەوە چاوەڕێ بكەن (سەلام) بكات و تۆیش وەڵامی بدەیتەوە، نا ئەو فێرنەكراوە، جارێ تۆ دەبێت وەك ئەو پەروەردەیە ڕەفتاری لەگەڵدا بكەیت، تاوەكو وردەوردە زهی ڕۆشن دەبێتەوە، ئەوە دێتە ژوورەوە و نازانێت (سەلام) بكات، تۆ مادەم ڕێگەی ئیسلام حاڵی بویت، تۆ بەرزە پێ هەستە لەبەری و سەلامی لێبكە، چونكە تۆ حاڵی كراویت كە ئەركت چۆنە، ئەمەش دەبێت بزانین، كەلەگەڵ كەسێكدا نازانێت و حاڵی نەكراوە بزانین چۆن ڕەفتار بكەین...

## ئەركی منداڵ نیسبەت بەدایك و باوك:

لە خوای گەورە بێتە خوارەوە دایك و باوكە بۆ منداڵ چونكە وتمان، تاكەكانی خانەوادە هەمیشە بەیەكەوەن دەبێت زۆر زۆر پەیوەندییان بەیەكەوە گەرم بێت، لەناو كۆمەڵگەدا زۆر گرنگە تاكەكان پەیوەندییان بەیەكەوە گەرم بێت، بەڵام نەك وەك خانەوادە، خانەوادە جۆرێكی ترە...لەچەند جێگەدا لە قورئاندا، دەستور دەدرێتە بەشەر هۆشت بێت و گرفتار و سەرگەردانی(شرك) نەبیت، كەسێك مەبەرە لای خودا و كەسێك وەك(خودا) حساب مەكە، ئیتاعەت و بەندەگی كەس مەكە غەیری خوا، چونكە زەلیل و

بەدبەخت و سەرگەردان دەبیت و شەخصییەتت دەفەوتێت، تەنها گوێڕایەڵی خوا بکە، بەندەی خوای، دەی تەنها بەندەگی بۆ خوا دەبێت.

لەپاڵ ئەمەدا وتراوە(ئیحترامی دایك و باوك). بەندەگی خوا و ئیحترامی دایك و باوك، وە ڕەفتاری پەسەندکراو لەگەڵ دایك و باوکدا، چەندین جار ئەمە لەقورئاندا دووبارە کراوەتەوە، تەوحید و ئیحترامی دایك و باوك لەپاڵ یەکتردان، ئەوەندە باسەکە گرنگە، کە دەزانین بەڕاستی ئەگەر خانەوادە بەو شێوەیە پتەو و محکەم نەبێت، خانەوادەیەکی سالم نابێت، تاوەکو کۆمەڵگەیەکی سالمی لێ دروست ببێت. بەڵام ئەگەر تەواوی خانەوادەگەل ئاوا پتەو محکەم بن لەوەودواش کۆمەڵگەش لەم بەشە پتەو و محکەمانە دروست ببێت، دیارە محکەم دەبێت، ئەرکیان ئەوەیە، کەهەر شتێك پێچەوانەی فەرمانی خوا نەبێت، باوك و دایك بێژن، ڕاستەوخۆ بە گوێیان بکەن، ئێستا کەسێك شتێك بێژێت بە من، باشەرعیش بێت بۆ من، واجب نییە گوێڕایەڵی بکەم، دەکرێت سوننەتیش نەبێت، بەڵام باوك ودایك هەرشتێکیان وت، واجب دەبێت ئیتاعەت کردنی بەمەرجێك پێچەوانەی فەرمانی خوا نەبێت.

گوێڕایەڵی دایك و باوك، وەك گوێڕایەڵی کردنی ڕاهبەرانی دینی واقیعییە، چۆن ئەگەر شتگەلێك موباحێك بێژنە مەردم، بێژن ئەنجامی بدەن، واجبە دەبێت بکرێت، چونکە لەڕووی فەرمانی خواوەیە، ڕەهبەرانی ڕاستی دین شتێك بێژن بەمەردم، فەرمانی خوایە دەیگەیەنن بە مەردم. بە عینوانی گوێڕایەڵی کردن لە فەرمانی خوا واجبە و دەبێت گوێڕایەڵی بکرێت، فەرمانی دایك و باوکیش بەو جۆرەیە، ئەگەر دایك و باوك شتێکیان وت

پێچەوانەی فەرمانی خوا، لەو كاتەدا بەهیچ شێوەیەك نابێت گوێڕایەڵی بكرێت، بەڵام ئەگەر موخالیفی فەرمانی خوا نەبوو، هەرچی (موباح)یش بێت، هەستە ئەو كارە بكە واجبە و دەبێت ئیتاعەت بكەن، ئەمما شەرتیش ئەوەیە، باوك و دایكەكە ئەو باوك و دایكە بن، ئەگەر نا باوك و دایكێك نەزانێت لەسەر ئەساسی وەزیفەی ڕەفتار بكات، كە خۆی گەورە و ڕەشید و موكەلەفە، چۆن چاوەڕێ دەكات منداڵێك كە نازانێت و ڕەشید و موكەلەف نییە، ئەو لەسەر بنەمای ڕەفتار و ئەركی ئیسلام هەڵسوكەوت بكات؟! خۆی نەزانێت ئەركی ئیسلامی لەگەڵ منداڵدا بیات بەڕێوە چاوەڕێ دەكات منداڵ ئەركە ئیسلامییەكانی بە گوێ بكات؟ ئەمە چاوەڕێ كردنێكی هەڵەیە، لە سەرەتادا دەبێت ئاو لە دایك و باوكەوە بڕژێت، باوك و دایك بەرنامەی ئیسلامی پەیڕەو بكات لە بەخێو كردنی منداڵەكەیداو ئیسلامیانە دروستی بكات. ئینجا نۆرەی منداڵە لەبەرامبەر دایك و باوكەوە ئیسلامیانە مامەڵە بكات، چونكە مەعلومە تەكلیف لەسەرەتادا بۆ دایك و باوكە لەوەودوا بۆ منداڵ گوناه بۆ ئەمان مەترەحە، خاس و خراوی بۆ ئەمان مەترەحە لەوەودوا بۆ منداڵ.

شەرت و تەكلیفی منداڵیش ئەوەیە، باوك و دایكێك ئابەو جۆرە بوون، ئەویش ئاوا بێت لەگەڵیاندا... لەوەودوا قسە لە جوزئییاتی هەڵسان و دانیشتن دێتە پێشەوە، كەیفییەتی ئەدەب و ڕەفتارگەل بەداخەوە! لەهەرچی شتی ئیسلامە بێگانە بوینەتەوە!! ئەگەر كۆمەڵگەمان ئیسلامی بێت، خانەوادەگەل تەربییەتی ئیسلامیان پەیدا كردبێت، نوكتەگەلێك دێتە گۆڕێ، كەبەداخەوە ئێستا لە گۆڕێدا نین و قسە لەسەر كردنیشیان سودی نییە

لەڕاستیدا هەندێك شت هەیە، دڵنیام ئەگەر بیڵێم لەوانەیە مەردم سەریان لێ بشێوێت! ئەوەندە لە ئیسلام دوور كەوتوینەتەوە، بۆیە ئەگەر گەرەكمان بێت هەندێك دەستوراتی ئیسلامی بێژین، جێگە ناگرێ و قابیلیەتمان نییە ئەو دەستور گەلە ئیسلامییە بوترێت..!

باوك و دایك لەپاڵ ئەوەدا كەدایك و باوكن بۆ منداڵ، لەلایەنی ئیسلامییەوە لەهەمانكاتدا برا و خوشكن بۆ منداڵی خۆیان، ئەگەر لایەنی موسوڵمانی لەبەرچاو بگرین. (هەروا جارێكیان بە(حەژیان)م ووت، (حەژیان) ئێستا گەورە بوویت و وەختی ئەوەتە بفامیت(من و تۆ) برای دینین، ڕاستە تەكلیفی(باوك و كوڕی) لەنێوانماندایە، ئەوە بە شوێنی خۆی، بەڵام لە ئێستادا لەو باوك و فەرزەنییە لاماندا وە و تۆش گەورە بویت و بوینەتە دوو برای دینی، لەمەولا بەناوی دوو برای دینی ئیتر تەكلیف لەنێوانماندا گرنگترە تاوەكو بەناوی(باوك و كوڕ)). ئەگەر باوك و دایك و منداڵگەل بزانن، ئەوە گرنگە زیاتر لە باوك و دایكی مەسەلەی(برا و خوشكی) بێتە پێشەوە، (هەتا ئەمە زۆر سەیرە ئەگەر بیری لێ بكەنەوە!) ژن و شوو (برا و خوشكی) دینین، لەوە دەچێت پێت سەیر بێت ئەمە چۆن دەبێت، ژن و شو بن و لەهەمانكاتدا برا و خوشكی یەكتریش بن؟! لەلایەنی دینییەوە(ئادەم) و ئێمە برای یەكترین، (حەوا) و ئێمە برا و خوشكین، (ئادەم)و(حەوا) لەگەڵ تەواوی بەشەردا برا و خوشكین، جائەمە باسێكە بەهەرحاڵ ڕونكردنەوەی درێژە دەكێشێت.

لەڕووی تەكلیفی برا و خوشكی دینییەوە، سەروخوار نییە! باوكێك دەڕواتە ماڵەوە وەزیفەی ئەوەیە(سەلام) بكات، ئەگەر منداڵی(٤-٥)ساڵی هەیە،

دەبێت منداڵەکەشی فێربێت، وەڵامی (سەلام) بداتەوە بێژێت (وعليك سلام ورحمه الله)نەك بەئەدا و ئەتواری ئەشرافییەوە (سلام علیکم... سلام علیکم) لەهەموو لایەکەوە دەست بەرز بکاتەوە وەك ئەوەی لەناو دانیشتنە ئەشرافییەکاندا دەکرێت، یەکێك بەپۆزێکەوە خۆی دەکات بەژووردا و (سلام علیکم...سلام علیکم) دەنێتەوە، نا....یەك (سلام) دەکات و ئەویش بێژێت(و علیك سلام)...



# باسی یەکەم:
# پەروەردە و فێرکردن

بابەتی پەروەرش و ئاموزش(پەروەردە و فێرکرد) وەك هەموو ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ فیکری ئەم بیارەدا کردێت دەزانن لە باسە ئەساسی بنەڕەتییەکانە. ئەم بابەتەی ئێستاشی بریتییە لە کورتەیەك دەربارەی چەمکی پەروەردەکردنو گرنگی ئەم پرۆسەیە لە ژیانو بونیادی دروستکردنی کەسایەتی تاکدا، هەروەها ڕونکردنەوەی ئەوەی بۆچی دەبێت لەکاتی ڕیزبەندیکردن بۆ هەردوو چەمکەکە دەبێت پەروەردەکردن لە پێش فێرکردنەوە دابنێرت؟ لەم نووسینەدا کاك ئەحمەد دێت بەزمانە قوڵکەی خۆی باس لەو هۆکارانە دەکات کە لەم سەردەمەدا بوونەهۆی ئەوەی کە هەرچی زانست و زانیاری مرۆڤ بەرەوپێش دەچێت، کەچی دەبینیت ماڵوێرانی و دەردی سەری کێشەو مشکیلەی بەشەرییەت زیاد دەکات، بەجۆرێك جاری واهەیە کاردەکاتە ئەوەی کە داهێنانەکانی مرۆڤ دەبنە هۆکارێك بۆ سڕینەوەی تۆی بەشەرییەت لەسەر ئەم هەسارەیە! ئەم بیریارە لێرەدا دەیەوێت وەڵامی ئەو پرسیارەبداتەوە (ئایا ئەو مەعریفەیەی مرۆڤ دەستی پێیدەگات دواجار دەبێتە ڕزگارکەری یان لەناوبەری خۆی؟!) موفتی زادە دەیەوێت ئەوە ڕوونبکاتەوە کە ئەوە هەڵە تێگەیشتنی فەیلەسوف و بیریارانە لە چەمکی (پەروەردە و فێرکردن) بۆیە تا ئێستاش نەیانتوانییوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزنەوە ئەو دەیەوێت پێمانبڵێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها یەك وەڵام و

یەك ڕێگە چارەهەیە! (کاك ئەحمەد) لە درێژە باسەکەیدا زۆر بەکورتی ئاشنامانده‌کات بە بەرنامەی ئەو مەکتەبەی لەسەرتای بزوتنەوەکەیەوە کاری بۆکردووە ویستوویەتی تاکەکانی کۆمەڵگەی لەسەر پەروەردەبکات و هەموومانی پێ ئاشنابکات. ئەم بیریارە لەسەرەتایی باسەکەیدا بەوە دەستپێدەکات کە بۆچی مرۆڤەکان ناتوانن بەرنامە بۆژیانی خۆیان دابنێت و بنەماگەلێك دابڕێژن و کاری لەسەربکەن و ئیتر پێویستیان بەوە نەبێت لەلایەن سەروی خۆیانەوە بەرنامەڕێژیان بۆبکرێت (بکە و مەکە)کانیان بۆ دیاری بکرێت، بۆ پێشکەشکردنی وەڵامی ئەم پرسیارە بەم جۆرە دەچێنە تاوباسەکەوە: {ئێمە بۆئەوەی بتوانین بەنامە ڕێژی بکەین بۆ چاندنی یەك دانە (تۆو) سەرەتا} دەبێت تایبەتمەندییەکانی ئەو (تۆوە) بناسرێت، و بزانین ئەو (تۆوە) لە چی مەوقیعیەتێکدا قابیلییەتی(پەروەردەکردنی) هەیە، لە چ فەصلێك لە فەصلی ساڵدا دەکرێت(بوەشێنرێت)، لە چ جۆرە زەوییەکدا باش گەشە دەکات؟ چەنێك ئاوی گەرەکە، چ جۆرە (کوتگەلێك) دەبێت بکرێتە بنییەوە؟ چ کاتێك ئاوی نەدرێت و مومکینە چ جۆرە ئافاتێك لێی بدات و چۆن چارە دەکرێت؟ دەبێت هەموو ئەمانە بزانین ئەو کات دەتوانین دڵنیابین لەو (تۆوە) کە دەکرێت بەرهەمدار بێت. بۆیە دەبێت تۆوەکە هەم گونجاندنی ئەو تۆوە لەگەڵ ئەو مەوقیع و(جێگە) و زەوی و هەلومەرجەدا کەتێیدا پەروەردە دەبێت لەبەرچاو بگرین، ئێمە دەمانەوێت ئینسان بەرێگەیەکی دروست لەسەر ئەم کورەی زەوییە زیندەگی بکات ئامادەگییەکانی بە فیڕۆ نەچێت و ئەو نیعمەتانەی لەسەر کورەی زەوین بەفیڕۆ نەچن و بتوانێت سودی لێوەرگرێت، هەر وەك ئەو نمونە سادەیەیی وتم:

لەڕووی ئەم ئینسانیشەوە دەبێت ئەم كارە بكەین. كاتێك ئیمكانی هەیە بتوانین ڕێگەی صەحیح بۆ سودوەرگرتن لە وجودی ئینسان و لە ئیمكانیاتێك لەزەویدا لە ئیختیاری ئینساندا قەرار دراوە بدۆزینەوە كە ئینسان بناسین و ئەو موحیطە وا ئەو تێیدا زیندەگی دەكات و تێیدا چالاكی و ڕوشد دەكات بناسین، هەروەك ئەو نمونە سادەیەیی باسمكرد.

لەسەرەتاوە ئەوە وا سادەو ڕۆشنە ئەمەیە، كە دەكرییەت ئێمە(تۆوێك) بەتەواوی بناسین و تایبەتمەندییەكەی دەرك بكەین و پاشان بەرنامەیەكی باش بۆ پەروەردەكردنی دابنێین، بەڵام ئەم كارە لەڕووی ئینسانییەوە صادق نییە! ناكرێت خۆمان بەو شێوەیە كامڵ و حسابی بناسین، كە ئەو بەرنامە فراوانە بۆ خۆمان دابڕێژین، چونكە ئەوەوا بەرنامە دادەنێت خۆمانین ئەوەش وا بەرنامەی بۆ دادەنرێت هەر خۆمانین، خۆمان هەرچی پێشكەوتوتر دەبین و زانیاریمان زیاتردەبێت وجود و دەرونمان ئاڵۆزتر دەبێت، لەبەرئەوە بەرنامە دانان بۆ ئێمە(ئینسان) موشكیلەتر دەبێت*.

زۆر بەسادەیی، ئەوەی والەڕووی دانەیەك(تۆوەوە) بۆ ئێمە دیاریكراوە لەڕووی ئینسانەوە هەرگیز بۆ ئێمە دیاریكراو نییە، بۆیە بەرنامەیەك كە دابنرێت بۆئەوەی كە ئینسان بتوانێت صەحیح پەروەرش ببێت و دروست لە وجودی خۆی و ئیستعداداتی خۆی سود وەربگرێت و صەحیح لەم

---

*) بۆئەوەی خوێنەر زیاتر لەم بارەیەوە شارەزابێت ڕێنمای دەكەین سەردانی ئەو باسەنەی بیریاری گەورەی كورد (شەهید مامۆستا ناصری سوبحانی) بكات، بەتایبەت بابەتەكانی (خەلقی ئادەم، اثبات وجود، خوداناسی)، كەلەوێدا زۆر بە وردی و بە بەڵگەی فەلسەفی و لۆژیكی ئەوە دەسەلمێنێت ئیمكانی نییە مرۆڤ بتوانێت خۆی بەنامە بۆ خۆی دابنێت!

نیعمەتگەلە ئەوەتا لەكورەی زەویدا ئیستیفادە بكات، بەرنامەی وا تەنها دەبێت لەتەرەف ئەوەوە دابنرێت كە ئینسان وەك خۆی دەناسێت و پەیوەندی ئینسان لەگەڵ ژینگەكەیدا دەناسێت. ئایا هیچ كات دەكرییەت بۆ ئەو جۆرە(تۆوە)كە باسمان كرد و گەرەكمانە پەروەردەی بكەین، خودی(تۆوەكە) بەرنامە دابنێت؟ لە تۆوێك كامڵتر ئایا (حەیوانێك) بۆ پەروەرشی صەحیحی حەیوانێك بۆ بەروبوم وەرگرتنی حەیوانێك گەرەكمان بێت لەو بارودۆخەی كەهەیە و بڕواتە پێشەوە و دەكرێت بڵێین: دەبێت خودی ئەو حەیوانە بەرنامە بۆ خۆی دابنێت؟ یان شتێك لەسنوری خۆیدا بەرنامەی بۆ دابنێت؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر!

ئینسان ئەو تۆوەیە كە بەرنامەی پێویستە ئەو بەرنامەیە ناكرێت ئینسان خۆی بۆ خۆی دایبنێت هەرواكە تۆوەكە خۆی ناتوانێت بەرنامە بۆ خۆی دابنێت. ئەوەوا بەرنامە دادەنێت بۆ مەوجودێك دەبێت تەواو ئاگادار بێت بە ڕازگەلی وجود و تایبەتمەندییەكانی ئەو مەوجودە، چونكە ئینسان ئیمكانی ئەوەی نییە ئەم دەستەڵاتە كامڵە پەیدا بكات! دەلیلێكی زۆر سادە و بچكۆلە ئەوەیە كە(دەروونناسێك) چەند ساڵ تەنها لەڕووی(دەرونی نائاگای) یەك نەفەرەوە موتاڵەعە دەكات هێشتا بەتەواوەتی نایناسێت ئیتر باسی تەواوی لایەنی دەرونی بەتەواوی ئیستعداد و نیروگەلییەوە ناكەین، تەنها لەڕووی بەشێك لەدەرونییەوە كە لایەنی(لاشعوریەتی) جا ناشڵێین ئەو(دەروونناسە) (دە نەفەر یان سەد نەفەر یان هەزار نەفەر) بناسێت.نا... تەنها یەك نەفەر ئائەمە دەلیلێكی بچكۆلەیە بۆ ئەمە كە ئینسان ناتوانێت بەرنامە بۆ ئینسان دابنێت و مەحاڵە. بەم دەلیلە هەروەك چۆن بۆ(تۆو)ەوەكە دەبێت یەك نەفەر تەواو




شارەزا و ئاگادار لێی بێت و بەرنامەی بۆ دابنێت تاوەکو کۆتا ئیمکانی سود لێوەرگرتن سود لەئەو(تۆوە)دروست ببێت لەڕووی ئینسانیشەوە هەر بەو جۆرەیە، دەبێت یەکێك ئاگای لە ئیستعدادگەل و تایبەتمەندی ئینسان و تەواو شارەزا لەو ژینگەی وا ئینسان تێیدا زیندەگی دەکات و ئەو شتگەلەی ئەوەتا لە ئیختیاری ئینساندا و ئەو بارودۆخەی وا بۆ ئینسان فەراهەمە بەرنامەی بۆ دابنێت کە ئاخرین ئامادەگی ئینسان سود وەربگرێت... نەك بەو جۆرەی کە ئەمڕۆ لە ئیستعدادی ئینسان سود وەردەگیرێت تا کارێکی موثبت(پۆزەتیڤ) ئەنجام دەدرێت دەیەها کاری مەنفی(نێگەتیڤ) ئەنجام دەدرێت!

ئەمە نوکتەیەکی زۆر سادەیە لەڕووی پەروەرش و گرنگییەوە، کە پەروەرش، واتە ئەو جۆرە بەرنامە کە ئێمە بۆ تۆوێك دایدەنێین بەو جۆرە بۆ ئینسانێك دابنرێت. لێرەوە تێدەگەین کە ئاگاهییەك بەو جۆرە کامڵی گەرەکە بینا لەسەر ئەمەش ئیمکانی نییە کە خودی ئینسان ئەو کارە بکات، ناکرێت ئینسان ئەوەندە موحیط و ئاگاه و پڕ زانیاری بێت لەبارەی ئینسانەوە. لەوەودواش نوکتەیەکی تر ئـــائەم بەرنامە کاتێك هات و لە ئیختیاری ئینساندا قەرار دراو ئیجرای سپێردرا بە ئینسان خۆی بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی مەوجودێکی عاقڵە(ئاخر بابەتەکان جیاوازن لەیەکتری دانانی بەرنامە شتێکە و ئیجراکردنی"جێبەجێ کردنی"بەرنامە شتێکی ترە) بەرنامە دانان ئەو ئەندازە ئاگاهییەی دەوێت، بەڵام ئیجراکردنی ئەوەندەی ناوێت. بەرنامەکە دادەنرێت و دەدرێتە دەستی ئینسان کە ئیجرای بکات ئیمکانی ئەوەی هەیە شارەزا ببێت لەو نوکتەگەلە کە پێی وتراوە کە بتوانێت بەرنامەکە صەحیح ئیجرا بکات. چ کاتێك مومکینە نەتیجەیەك مەعقول بگیرییەت لە ئیجرای

ئەو بەرنامەیە؟ لەیەك كاتدا دەقیقەن ئەو بارودۆخە وا ئەو كەسەی بەرنامەكەی داناوە بچێت بەرێوە و لێیٰ لانەدرێت، چونكە دەزانین ئەگەر ئاموزش(فێركردن) هەبێت و پەروەرش(پەروەردەكردن) نەبێت، ئائەو دەردە جۆراوجۆرە لەناو كۆمەڵگەدا دروست دەبێت كە نمونەی سادەی ئەوەیە كە ئینسانگەل لەلایەنی وتنەوە(قسەكردن) نمونەیی و شارەزا، بەلاَم لەلایەنی كردار و عەمەل و ئەخلاقەوە پەست و كەسیف! رێگە راستەكە ئەوەیە كە پەروەرش بكەوێتە پێش ئاموزشەوە، بەلاَم مانای ئەمە كە پەروەردە پێش فێركردن بێت یانی چی؟

مانای ئەوە نییە كە بەبیٰ ناسین و زانین ئیمكانی هەیە پەروەردە كردن روبدات...نا...پەروەردە هەمیشە بە شوێن فێركردنەوەیە لە رووی كردار و رەفتارەوە، بەلاَم لەمەسەلەیەك كە فێری ئینسان دەكرییەت هەندێك بنەمای سەرەكی هەیە ئەو بنەما سەرەكییانە فێری تاك دەكرییەت جا ئەو تاكە شەخصییەتی خۆی گونجاو لەگەڵ ئەو ناسینەی وا پەیدای كردووە رێكی دەخات، دوای ئەوە كە بەهەندێك بنەما و مەسەلەی ئەساسییەوە ئاگاهی پەیداكرد و پەروەردە كرا، لەوەودوا ئیتر هەرچی زانیارییە دێت بەشوێنیدا، واتە( فێركردن كاملتر دەبێت گشتی هەر سودی هەیە و هیچێكی زەرەری نابێت) بۆیە كاتێك كە دەڵێین پەروەردە لە پێش فێركردنەوەیە بە دوو مانا دەیلێین:ـ

یەكەم: گرنگی فێركردن فەرعە نیسبەت بە گرنگی پەروەردە كردن، واتە ئەگەر خوێندەواری و زانیاری هەبێت، بەلاَم پەروەردە كردنێكی دروست نەبێت ئەو كاتە خوێندەواری سودی نییە و بەڵكو دەبێتە ژەهر و زەرەر.

دووەم: ئاموزش مەجموعەیەكە زۆر گەورە و بێپایان، ئائەم مەجموعە بێكۆتاییە یەك دەر سەدی(١٪)ی هەتا كەمتریش دەكەوێتە پێشی پەروەردە كردنەوە(١٪) لە ناسینی بنەما ئەساسییەتەكانی هەستی پیشانی ئینسان دەدرێت و ئینسان پەروەرش دەكرییەت، باقییەكەی(٩٩٪)ی مەسەلەی( فێركردن) دەكەوێتە دوای (پەروەردەوە).

بەم دوو ئیعتیبارە بە شێوەیەكی گشتی پەروەردە كردن لە پێشترە لە فێركردن. جابەم جۆرە كورتی بكەمەوە كە جیاوازی (دییانەت{دین}) ئەو بەرپرسیارییەتەی وا پێغەمبەران هەیانە لەگەڵ بەرنامە گوزاریگەلێك بەشەریدا ئالەم ئەساسەدایە كە(قورئان) لەو ئایەتەدا بەئێمە حاڵی دەكات بەرپرسیارییەتی (محمد)(ﷺ)، ﴿يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا﴾* ئەوەڵین كار. ﴿وَيُزَكِّيكُمْ﴾ لەوەودوا ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ﴾ لەدوای گشتینان.

بەشێوەیەكی كورت ئەوەڵ جار مەردم بە گشتی بانگ دەكات بۆ لای (حەق) و حەقیقەت و زیندەگی صەحیح و ئەرزشگەلی واقعی، مەردم لەسەر گەردانی رزگار دەكات و سرنجیان ڕادەكێشێت بۆ ڕێگە ڕاستەكانی زیندەگی كردن بە گونجاوی لەگەڵ ئەو شەرتە جیاوازانەی ئینسانگەل هەیانە لە زیندەگی و بیركردنەوەیاندا، یەكەیەكەیەك لە ئینسانگەل زۆر زوو ئامادەن و بەرەو حەق دەڕۆن و قبوڵی دەكەن... دواتر ژمارەیەكی تر بەشوێنیاندا، ئەمانە كاتێك دەنگی حەقیان قبوڵ كرد(كاری ئیزافە كردنی زانیاری) مەترەح نابێت، بەڵكو

---

*) {كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ }البقرة١٥١

بنەما سەرەتاییەکان فێر دەکرییەن، جا لەوەودوا هەروەك ئەو بنەما سەرەتاییانە ئەمانە پەروەردە دەکرێن دروست دەکریەنْ و پاشان باقی ئەو زانیارییانەی کەماوە پێیاندەدرییەت، کە ئاخر مەرحەلەی ئەوەیە ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ﴾ ئەوەی کە ئیمکانی نییە بۆ بەشەریش بەشێوەیەکی ئاسایی بیزانێت. لەمێژوو پێشکەوتنی زانست و مەعریفەدا ئێمە سەرنجی ئەوە دەدەین کە سەرەتا کاتێك زاناگەل زیهنیان خستۆتە کار(سەرفی نەزەر لەلایەنی هیدایەتی ئیلاهی قسە لەو بەشە ناکەم) لەلایەنێکدا کە ئینسان خۆی فکری کردۆتەوە و چالاکییە زیهنییەکانی دەست بەکار بوون لەسەرەتادا ئەساسترین بابەتێك کە هاتۆتە بەردەمی ئینسان ئەمەیە کە هەستی چییە؟ ئینسان چییە؟

قسەی سەرەتای ئینسان، کە لەئەوەڵی قۆناغی حەرەکەتی فکریدا بۆی پێش هاتووە ئەمە بووە، جا وردە وردە ئەمە بووە بنەمای پەیدا بوونی (فکری فەلسەفی)، واتە هەوڵ و تێکۆشان و لێکۆڵینەوە بۆ پەیداکردنی وەڵامی ئەم پرسیارانە. لەوەودواش مەسەلەی تر هەر بەم کوللییەت و بەم عەزەمەت و گەورەییە، زۆر بە کورتی باسی دەکەم..

لەوەودوا چەند قۆناغێکی جیاواز گوزەریاوە و چالاکییە زیهنییەکانی ئینسانگەل دەربارەی هەستی و ئینسان و مەبدەء و مونتەهای هەستی و نیزامی هەستی و مەسەلە فەرعییەکانی ئەمانە دەست بە دەست بووە و گواستراوەتەوە تا گەیشتۆتە ئەوەی (سێ) لقی لێبووەتەوە:-

یەکەم: بەفەلسەفەی (ئەعلا)، یان (ئیلاهییات) ناوبراوە، باس لە ئەصڵی ڕازی هەستی دەکات ئەوەی وا هەمیشە لەمەقامی ئەوەڵدا بووە.

دووەم: فەلسەفەی سروشت: واتە ئەوشتانەی وا لە(هەستی)دا هەیە، لەم وجودە مادییەدا هەیە، چی زەوی، چی ئاسمان، ئەوەی وا دەیبینین و دیاریدەكەین.

سێیەم: فەلسەفەی رازییات(بیركاری): واتە خەواص و خصوصیات لە نیسبەتگەلی تەركیبی مەسائیل و حەقائق لەگەڵ یەكتردا.

بەگشتی فەلسەفە بوو بەم(سێ) لقە:(ئیلاهییات)، سروشتیان(تەبیعیات)، (ریازییات)..

لەوەودوا هەمدیسان چالاكی بیركردنەوە ئەم عیلمگەل و لق و پۆپگەلە زۆر بوون و لە ئێستاشدا هەر رۆژێك لە هەر عیلمێك لقێكی تازە جیا دەبێتەوە و لەوەودوا بەشێوەی یەك عیلمی سەربەخۆ دروست دەبێت هەر بەو شێوەیە تا دەرۆیت ژمارەی زانستەكان فراوان دەبن. ئەمە خولاسەیەك لە مێژووی گەشەسەندنی زانست وە راسترین پێوانەی سادەە و كورت لەدەستی ئێمەدا بۆ ئەوەی بزانین(زانست) لەناو ئینساندا چۆن دەستی پێكرد و چۆن قۆناغی جیاوازی بڕی تا گەیشتە ئێرە.

لە ئێستاشدا كاتێك ئێمە لەڕووی ئصوڵ و قەواعیدی صەحیحەوە بەدواداچوون بۆ هەر بابەتێك دەكەین سەیر دەكەیت كاتێك ژمارەیەك بابەتی جیاواز لەلایەنێكەوە پەیوەندییان هەیە بەیەكەوە لەسەرەتادا ئەوە گرنگە لایەنی هاوبەشی ئەم بابەتانە، واتە پیشە و ئەساسیاتی ئەم بابەتانە بزانین و لەپاشاندا بابەتە فەرعییەكان. ئەمە یەكەم نوكتەیە دەربارەی هەر زانستێك بۆ نمونە لەبابەتی (زانستی نەحو)دا ئەمە گرنگە كە بزانین(كەلام) واتای چییە و پێكهاتەی وشە بەیەكەوە چۆنە و دەستوری چۆنە؟ لەڕووی بابەتی

(صەرفەوە) ئەمە گرنگە کە بزانین بونیادی وشە چۆنە، گۆڕانکاری و تەحویلاتێك بەسەریدا دێت چۆنە؟ لەبابەتی (بیرکاریدا) یەکەمین شتێك گرنگە ئەوەیەکە بزانین (ژمارە)چۆنە و کەم و زیادی ژمارە چۆنە؟ تایبەتمەندی (ژمارە) چۆنە؟ کرداری بنەمایی کەلەژمارەدا ئەنجام دەدرێت چییە؟ تا لەهەر عیلمێکدا ئەو بنەما ئەوەڵی و ئەساسییە وا لەگشت بابەتەکاندا بوونی هەیە نەزانین هەوڵدانمان بۆ بابەتە فەرعییەکان بێ شوود و پووچە.

سەیر دەکەیت لەڕووی گەشەی مێژووی(زانست)ەوە، دەدۆزینەوە بابەتی سەرەکی چی بووە؟ بابەتی سەرەکی تەواوی ئەم زانستانە واتە تەواوی زانستەکان سەیردەکەین، مەسەلەن هەر لەزانستی(بیرکاری و نەحو و صەرف)، چونکە هەرکام لەم زانستگەلە بابەتێکی ئەساسی هەیە بەشێوەیەکی گشتی هەموو زانستەکانیش هەر کام بەبابەتێك دەزانین، هەر زانستێك بیگریت یەك بابەتە ئەساسی ئەم گشتە زانستەش بریتییە لە (هەستی) (هەستی) چییە؟ ئینسان چییە؟ واتە ئەو ئەوەڵین بابەتەی ئینسان لەبارەیەوە بیرکردەوە کە بریتی بوو لە(هەستی و ئینسان)، چونکە لێرەوە باسکردن و قسەکردن لەبارەی شتەکانەوە دەستپێکرد. ئالێرەوە وردە وردە حەرەکەت شروع بوو ئەم لق و پۆپە جیابوونەوە، بۆیە ئێستاش بۆئەوەی هەوڵەکانی ئێمە، هەوڵێکی عیلمی و مەنتقی و موبتەنی لەسەر ئەصڵ و ڕیشە و مەبنا، کاتێك دەکرێت ئائەم عیلمە جیاوازانەی والەبەردەستماندا لە ڕووی ئەرزشێکی دروستەوە کاری تێدا بکەین و دڵنیا بین کە بەهرەبەرداری دروستی لێدەکەین کە ئەو مەسەلە ئەصڵییەمانە دۆزیبێتەوەو حەلمانکردبێتو زانیبێتمانواتە بزانین (هەستی) چییە؟ (ئینسان)چییە؟

بێگومان ئینسانێك نەزانێت، ژمارە چییە، نەزانێت(١,٢,٣,٤) چییە؟ هەرچی هەوڵبدات و بابەتی ئاڵۆزی (بیرکاری) بخوێنێت هەوڵی پوچە و ناتوانێت لەو گشتە هەوڵەی وادەیدات سود وەربگرێت. مەسەلەی تەواوی عیلمەکان(خودی ئینسانە و هەستی). هەستی، بەناونیشانی مەجموعەیەك کە ئینسان کاری تێدا دەکات، و ئینسانیش بەناونیشانی ئەو ئەصڵە واخەریکە کار دەکات و دەیەوێت سود وەربگرێت لەهەستی بۆ خۆی. ئەصڵی مەسەلە لەتەواوی زانستگەلدا بریتییە لە(خودی ئینسان و هەستی) ئێمە تاکاتێك کەئینسان نەناسین و هەستی نەناسین، هەوڵدانمان بۆئەوەی لەوجودی خۆمان و لە مەواهیبی(هەستی) سودی صەحیح وەرگرین ڕێك وەك هەوڵی ئەو ئینسانە وایە کە هێشتا ژمارە نازانێت و هەوڵی فێربوونی بیرکاری دەدات! ئەو لەو زەحمەتەی دەیکێشێت سود وەرناگرێت ئێمەش لەزەحمەتەکانماندا سود وەرناگرین. ئەمە قاعیدەیەکە زۆر سادە و ڕۆشن و ڕوون...

بەو دەلیلە لەدیندا. ئصولْ هەر بریتییە لەو مەسائیلە ئەساسییە وا تەواوی زانستگەل گشتی پێداگری لەسەر ئەوەدەکات تەواوی زانستەکان گشتیان لق و پۆپیان ئەوەیە. ئائەم مەسەلە ئەوەڵییە بە ئێمە ئەوترێت، کە چۆن کاتێك دەتەوێت(بیرکاری) فێری کەسێك بکەیت سەرەتا ژمارەی فێر دەکەیت ئەگەر وانەکەیت ئامادەگی دەکوژیت و سەرفی دەکەیت، دینیش مەسائیلی ئەوەڵ و ئەساس بۆ تەواوی مەتاڵیبی عیلمی لەبەرامبەر ئێمەدا ئێژێ نەك ئەوەی بەسەتحی(ڕواڵەتی) ئاڕاستەمان بکات لەزانستی جیاوازدا ڕێنمایمان بکات و شناختی فراوانمان پێ بڵێت، بەڵام مەسائیلی ئەساسی هەستمان هێشتا نەزانێت کەتەواوی عیلمەکان گشتی بینا لەسەر ئەو مەسائیلەئەساسییە دەکات،





هەروەك ئەو پێشكەوتنە مێژووییەی واوتم. ئێستاش دووبارە هەركاتێك بتەوێت لەم سەرەوە لەزانستی ئێستاوە بڕۆیتەوە بەرەو دوا، سەیر دەكەیت دووبارە هەر دەگەیتەوە ئەو مەسەلە ئەصڵگەلە، بۆ نمونە(میكرۆب ناسی) قسە لەسەر ئەوە دەكات ئەمانە لەكوێوە هاتوون، وردەوردە دەگەڕێتەوە دواوە و قۆناغ بە قۆناغ دەڕوات تادەگاتەوە ئەو سێ لقە ئەصڵییە و لەوەودوا دەگاتە ئەو نوكتە ئەصڵییەكە(هەستی چییە؟ ئینسان چییە؟)

بۆیە ئائەم دوو مەسەلە، مەسەلەی ئەصڵییە لەتەواوی زانستگەلدا. كاتێك ئیمكانی هەیە هەوڵ و تەلاشی ئێمە لە زانستگەلی جیاوازدا بۆ فێربوونە شتگەلی جیاواز سوودی هەبێت،كە سەرەتادا مەسەلە ئەصڵییەكەمان پێ بوترێت، ڕازی وجودی ئینسان و هەستی بە ئێمە حاڵی بكرێت،دین دێت ئەم كارە دەكات ئابەو جۆرە كە قورئان ڕایدەگەیەنێت:﴿يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾البقرة١٥١.

لەسەرەتادا(تەزكییە)، واتە بونیادنان بە وجودی ئینسان، بەدەرونی ئینسان، و شكڵدان بە شەخصییەتی ئینسان بەناساندنی شتە ئەساسییەكان، ناساندنی(ژێر بینایی)، لەپاشاندا هەر وردەوردە زانیاری زیاد بكات، كاتێك ئینسان ئابەو جۆرە كەیدك نەفەر دەیەوێت(بیركاری) بخوێنێت لەسەرەتادا ژماردن فێردەبێت و لەوەودوا هەوڵدەدات مەسائیل و قەواعیدی دیكە بزانێت، ئەمیش لەسەرەتادا قاعیدە ئەصڵییەكان و مەسەلە ئەصڵییەكان بەوردی حاڵی بوو كە(ئینسان چییە و هەستی چییە؟)لەوەودوا هەرچییەكی تر فێرببێت هەر سودی هەیە،كە گشتی هەر بەهرەبەرداری سەحیح دەكات، ئیمكانی نییە (بۆمبی) ئەتۆم دروست بكات بۆ ماڵی مەردم وێران كردن ئیمكانی نییە(بۆمبی

بایلۆجی)دروست بكات، ئیمكانی نییە(هیرۆین وكۆكاین)و ئەم شتانە دروست بكات، چونكە لەسەرەتاوە لەحەرفی سەحیح سودی وەرگرتووە و سەحیح حاڵی بووە لەمەسائیلی ئایندەشدا سەحیح عەمەل دەكات. ئائەم كردار و ڕەفتارە هەڵەی ئینسان لە هەستیدا ئەنجامی دەدات لەم مەواد و نیعمەتگەلەو بەزانستو ئامادەگی خۆی ئاوا سود وەردەگرێت،كە شتگەلێك دروست دەكات كەدەبێتە هۆكاری نابوت بوون و بەدبەختی ئینسان هەمووی هۆكارەكەی ئەوەیە كەیەك نەفەر لەسەرەتاوە(ژمارە)حاڵی نەبووە و بابەتی جیاواز دەدەیتە دەستییەوەو لەوەودوا ئێژی"فەرموو بڕۆ بینایەك دروست بكە"پاشان ئەوەی دروستی دەكات دەڕوخێت بەسەر دوو مەردمداو دەیانكوژێت، چونكە هەڵە دروستی دەكات چونكە ژماردن و قیاسەكانی هەڵە دەردەهێنێت.

ئەساسی (پەروەردەی دینی) ئەوەیە هەندێك شت بەئصوڵ ناودەبات كە حەقیقەتەن هەر ئصوڵن، هەر ناسینی ئەساسی و ژێر بینایین بۆ ناسینی ماباقی شتەكانی دیكە، ئەویش ناسینی(ڕازی هەستییە) نهێنییەكانی هەستی، كەئەم هەستییە لەخۆیەوە شكڵی نەگرتووە، لەخۆیەوە بەوجود نەهاتووە ئەمە ئەوەڵێن كەلیەو ئەوەڵین تەحلیل و ئەوەڵین وەڵامەكەئینسان دەیدۆزێتەوە لەبارەی ئەمەوە كە(هەستی چییە؟).

لەپاش ئەوەش ئینسان مەوجودێك نییە هەروا بەرەڵا و ئیتفاقی ئەم شێوە ئاڵۆزە گەورەیەی گرتبێت و هاتبێتە سەر ئەم كورەی زەمینە و جێگەی گرتبێت و هەڵسوكەوت بكات لەزەویدا، هەر ئەو ئافەرینەندە(دروستكەرە)وا ئەم(هەستییەی)بەم ڕێكخستنەوە دروست كردووە ئینسانیشی ناردۆتە ناو ئەم

هەستی كە بەهرەداری لێبكات. مەوادی كوللی فراوان لەم هەستییەدا لەئیختیاری ئینساندا قەرار دراوە لەپاڵیشیدا ئامادەگی زۆر بەئینسان دراوە كەلەم مەواصیبانە سودوەرگرێت، هەستی بۆ ئینسانە و ئینسانیش گونجاوە لەگەڵ هەستیدا، پاشان دەزانێت كە ئینسان مەوجودێك نییە یەك بوعدی(لایەنی)، وەك هەر ئینسانێكی دیكە كەهەر حەیوانێك تەنها یەگ(لایەنە) ئینسان سەدەها لایەنی هەیە لە(خاسی)و لە(خراوی)دا بەسەدەها جۆر دەتوانێت زیندەگی بكات، بۆیە ئەمە كە دەتوانێت بەو شێوەیە زیندەگی بكاتشتێكی هەروا سادە و ئاسایی نییە وەك باقی ئاژەڵان بمرێت و تەواو ببێت، نا...لەبەرامبەر ئەمەوە كە ئەم گشتە ئیمكانیاتەی هەیە،دەتوانێت لەئیمكانیاتی خۆی ئیستفادەی باش یان خراپ بكات، واتە دەتوانێت ببێتە باشترین ئینسان یان دەتوانێت ببێتە خراپترین ئینسان. لەدوای(مەرگ) ئایندەیەك بوونی هەیە بۆی، كەبەژیانی (دوای مەرگ) ناودەبرێت، چونكە (حەفتا ساڵ،هەشتاساڵ،سەد ساڵ،هەزار ساڵ) تەمەن بدرێت بە ئینسانگەل هەندێك ئینسان بەئەندازەیەك خراپی دەكەن كەئەگەر بیست ساڵ بەو خراپییەوە بیگوزەرێنن و باقی هەزار ساڵەگشتی زەجر و ئازاریان بدەیت هێشتا حەقی ئەو مەردمەی وا بەدەستی ئەوەوە ئازاریان بینیوە ناسەندرێتەوە لێیان! ئینسانێك ملیۆنەها ئینسان دەخاتە زەجر و نارەحەتییەوە، گەورە و بچوك، ورد و درشت، هەروەها پیلانێك خائینانە كەتەرحی دەكات ئەگەر هۆكارێكی دەرەكی نەبێت بەری لێبگرێتەوە تا ئەبەد ئینسانگەل بەدبەخت دەكات، دەی هەزار ساڵ تەمەن بدە بەم ئینسانە گریمان بیست ساڵ بەو شێوە

خیانەت باقی هەزار ساڵەكە زەجری بدە ئایا ئەو گشتە زەجرەی ئینسانگەل كێشاوییەتی بەدەست ئەوەوە جوبران دەبێتەوە؟! ئیمكانی نییە.
ئینسان بەدەست ئەم جۆرە ئینسانە خائینگەلەوە دەكەوێتە ناوسەرگەردانی و بەدبەختی و نەزانی و زوڵم و ئیمتیازاتەوە، لەوەودواش ئینسانێك پەیدادەبێت كەمەسەلەن بێژین:(سەدساڵ‌یان نۆسەدساڵ‌یان گریمان هەزار ساڵ) تەمەن دەكات، ئەم هەزارساڵە لەكاتێكەوە(ڕوشد) پەیدادەكات تاكۆتاییەكەی هەر لەڕێگەی خزمەت بەخەڵكدا دەیگوزەرێنێت، (دەهەزار ساڵی دیكە تەمەنی پێبدەیت،سەدهەزار ساڵی) دیكە تەمەنی پێبدەیت. سودێك كەئینسانییە لەكارەكان ئەم ئینسانەوە دەستی دەكەوێت ئیمكانی هەیە بەسەد هەزارساڵیش جوبران ببێتەوە؟ هەرگیز!
بەشێوەیەكی گشتی ئینسان دەركی ئەمە دەكات كەئائەم وجودە ئالۆزە و ئەم ئیختیاراتە فرانەوە، ئەم ئیمكانیاتە زۆرە كەئینسان هەیەتی لەوانە نییەكە چوار ڕۆژ تەمەنی دونیا بەكار جەزای باش و هەندێ كاری باش و خراوی هەندێ كار خراو بخوات. دەورانی حەیاتی دونیا كەمترە لەوەی كە بكرییەتە ئێمە بەدەورانی پاداشتی حساب بكەین تازە كاتێك واقیعییەت سەیر دەكەیت هەندێك ئینسان هەیە تاكۆتا ساتەكانی ژیانی هەر خیانەت دەكات بەئینسانگەل دەی یەك ڕۆژ جەزای خیانەتی نابینێتەوە تاوەكو دەمرێت، ئینسانی واشمان هەیە تاكۆتایی ساتەكانی تەمەنی هەر خزمەت دەكات بەئینسانییەت، هەر ناڕەحەت دەبێت و ژیانی خۆی دەخاتە ناڕەحەتییەوە بۆئەوەی ئینسانییەت ڕزگار بكات لەچنگی زوڵم و فەساد و درۆ و دەلەسەو تەزویر، تاكۆتاییەكانی ژیانیشی یەك ڕۆژ پاداشتی جیهادگەلی (تێكۆشانەكانی)

وەرناگرێتەوە، یەك ڕۆژ ئاسایش و ئارامی نابینێت و دەمرێت! کوا جەزای ئەمانە لەکوێیە؟! ئینسانییەت دەزانێت ویژدانی ئاگاهی ئینسان دەرکی ئەمە دەکات کە ئەمە هەروا بەفیڕۆناچێت. ئەو هەرچی خراپی کرد و هیچ و مردو تەواو ئەمیش هەرچی خاسی بوو کردی و مرد و ڕۆشت! چونکە ئەگەر ویژدانی ئینسان دەرەکی ئەمەی نەکردایە هەرگیز شتێك بەناوی(خاسی و خراوی) بوونی نەدەبوو! خاسی و خراوی چییە؟ دوای ئەوەی ئەم هەرچی باشەی کرد هەر ڕۆشت و ئەویش بەو جۆرە بەو هەموو خراپەوە هەر ڕۆشت و ئیتر پاداشتێك بوونی نییە؟ دەی ئەگەر وابێت. باشە چی مانایەکی هەیە و خراپە چی مانایەکی هەیە؟! ئەمە شتێکە ویژدانی ئینسان دەرکی دەکات، نەخێر ئەو خراپە دەکات و غیانەت دەکات ئەم خاس دەکات و سەرئەنجام دەرکی ئەوە دەکات کەنەتیجەی ئەمانە وەك یەك نییە دەی کەی ئەم نەتیجە وەردەگیرێت. خۆ دەزانین تەمەنی تەواوکرد و ئەوەی باشەی کرد مرد و ئەوەش کەخراپەی کرد هەر مرد و هیچ کامیان پاداشتان وەرنەگرت! لێرەوە ئەمەت بۆ دەردەکەوێت کە نەخێر دەبێت دوای مردن ڕۆژێك هەبێت بۆ زیندوبوونەوە و لەوێ ئینسانەکان پاداشتی کردەوەکانیان وەرگرن، بۆیە دەبینین(دین) دێت لەسەرەتادا ئەم ئەساسیاتە بە ئێمە پێدەڵێت، تا ڕواڵەتیمان نەکات باوەك ئەو کەسەمان بەسەردا نەیەت کە هێشتا ژمارەی نەخوێندووە دەچێت مەسائیلی بیرکاری دەخوێنێت!! لەسەرەتاوە پێمان حاڵی دەکات مەسائیلی ئەساس(هەست و خۆمان) چییە؟ لەوەودوا مەعلوماتمان لەبارەی خۆمانو هەستییەوە زیاد دەکات لەبەرئەوە هەرچی پێشرەفتمان دەبێت

هەرچی دەزانین گشتی پۆزەتیف و بەسوود دەبێت، چونكە لەڕووی بنەڕەتێكی دروستەوە دامەزراوە و دروست بووە.

لوكتەی ئەساسی لەمەدا كە(دین) پەروەردە دەخاتە پێش ئاموزشەوە لەبەرئەمەیە نەك ئەوەی كەبێت هیچ حاڵی نەكات بەئینسان هیچ ناسینێك نەداتە ئینسان و پەروەردەی بكات،نا..ئیمكانی نییە. پەروەردەش:واتە دروست كردنی شەخصییەتی ئینسان بەگونجاوی لەگەڵ ناسین و مەعریفەكانیدا بەتەرتیب، بۆیە دین لەسەرەتاوە ناسینە بنەماییەمان دەدات، چونكە ئەو ناسینە ئەساسی و ڕاست و دروستە دەبینیت لەدەرونی ئینساندا نفوز دەكات و شێوە دەداتە دەرونی ئینسان.

١. ئیجرای عمومی هەمانگ و جۆر.

٢. بوونی شەخصییەتی سەحیح بۆ مورەبی.

ئائەم دوو مەرجە بەگشتی زەمینە فەراهەم دەكات بۆ ئەمە كەئەو ناسینە ئەساسیگەلە كاریگەری بكات لەوجودی كەسەكاندا و شەخصییەتێكی پێبدات موتەناسیب(گونجاو)لەگەڵ ناسین و مەعریفەكەی خۆیاندا واتە پەروەردەیەكی سەحیحی ببێت، ئەم پەروەردە دروستە پەیدا دەكات جالەوەودوا وردە وردە مەعلوماتی زیادە وەردەگرێت...

ئەوەتانێ دەبینین ئینسانەكان بەزۆری دووچاری هەڵەكردن دەبن، وادەزانن (زانین) یان بەموستلەحی ئەمڕۆ(فەرهەنگ) مایەیی ڕزگاركردنی ئینسانگەلە لەكاتێكدا عەجیب هەڵەیەك دەكەن! نەزانین و نەفەرهەنگ كەمانایەكی دەقیقتر و لەتیفتری هەیە لە(زانین) هیچ كامیان هۆكاری خۆشگوزەرانی ئینسانییەت نییە! فرە فەرهەنگەلی فراوان و گەورەمان هەیە فرە میللەتگەلمان





هەیە خاوەنی فەرهەنگەلی یەکجار گەورەن. بەلاّم چی پەروەردەیان نییە و پووچن! هەتا دەبینین (قورئان)نقلّی دەکات پێغەمبەرێکی گەورەی وەك حەزرەتی(ئیبراهیم) ئەم نوکتەیەی دەرك نەکردووە لەخوا پاڕاوەتەوە کاتێك نەسلّی خۆی بەجێهێشتووە لە ناچەی (بیت)دا لەو بیابانەدا دۆعاگەلی جۆرجۆری کردووە دەربارەی ئایندەی نەوەکانی یەکێکیان ئەمەیە داوا دەکات﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ البقرة١٢٩ ئەویش(حەزرەتی ئیبراهیم) ڕێك وەك ئەو دەرکە گشتییەی کەبەشەری ئەمڕۆ بەشەری قەرنی بیست و یەك هەیەتی، بیری کردۆتەوە کەئەساس ئەوەیە کەخەلّکی زۆرتر بزانن جالەوەودوا پەروەردە بکرییەن، بەلاّم کاتێك حالّەتی گشتی و صیفەتی تایبەتی ڕیسالەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەیاندەکات، سەرنجمان ڕادەکێشێت کەنەخێر پێوانەکان گۆڕاون کەئەو ئایەتە ڕونم کردەوە﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ﴾ ئەوەی وا حەزرەتی (ئبراهیم) لەمەرحەلەی چوارەمدا تەصەوری دەکرد لێرە بەئێمەی حالّی دەکات کە یەکسەرە دوای بانگی گشتی بەرەو هیدایەت شروع دەبێت، جالەوەودوا﴿وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾البقرة١٥١.

ئەمە خولاّصەیەك لەوەی ڕازی ئەمە کەلەئیسلامدا (پەروەرش) ئەوەندە ئەهمییەتی پێدراوە و خراوەتە پێش(ئاموزشەوە)، لەکاتێکدا بەشەر هەمیشە بەپێچەوانەوە تەصەوردەکات، ئائەم نوکتەیەیە کەلە مەوردی پەروەرشدا لەسەرەتادا ئامەزشگەلی ئەساسی و (شناختگەلی) ئەساسی دەدەرییەتە ئینسان، لەوەودوا شەخصییەتی شکلّی پێدەدرێت کە گونجاو و هاورێکە لەگەلّ ئەو

ئاموزشە ئەساسییەی وەرگرتووە ئەمە دەبێتە (پەروەردە)، پەروەردە: واتە ئەمە بالی شتگەلی ئەساسی بزانێت بەشێوەیە شكڵ بگرێت جالەوەودوا وردەوردە زانیاری زیاد دەكات. جا ئەو كێشەیەی دونیای ئەمڕۆ تووشی بووە لەبەر دوو هەڵەیە:

یەك: وادەزانن ئاموزش موهیمە كەدەیزانن لەولاتی خۆماندا(ئێران) بەڕەسمی (ئاموزش وپەروەرشە)ـ(فێركردن و پەروەردەكردن) ئەو خراوەتە پێشەوە.

دوو: ڕازی پەروەردەكردنیان دەرك نەكردووە! وادەزانن پەروەردە ئەوەیە،كەئینسان بەشێوەی یەك ئاژەڵی بێدەرك و شعور ئاڕاستە بكەیت و قسەی بۆ بكەیت كەبەزۆر بیژێت(وابكە و وابكە) وشك و بێمەنتیق، حەرەكات و سەكەناتێكی پیشان بدەیت، بەو جۆرەی كە ئینسانگەلی ئەمڕۆ پێیان ئێژن(مەبادی ئادابن) كەلەڕاستیدا تەنها(مەیمونێكن) و هیچی تر. ئەم نوكتەیەی دەرك نەكردووە! لەكاتێكدا پەروەردە ئەوەتالەپێش فێركردنەوە بەو شێوەیەی كەوتمان لەلایەكی دیكەشەوە پەروەردە بەمە نائێژن كە ئینسان وشك بێژێ (وابكە و وامەكە) نەخێر ئەوەیە كەلەسەرەتاوە دەربارەی تەواوی شتگەلێك وا لەئایندەدا فێردەبێت و قەرارە بیزانێت، نوكتە ئەساسییەكان بزانێت و دوای ئەوە شكڵ بگرێت(موتەناسیب) لەگەڵ مەعریفەتەكەی خۆیدا*. بەم جۆرە بەرنامەی ئێمە لەم پۆلەماندا كورت دەبێتەوە لەسەر ئەم مەتاڵبە.

هەروەك لە تەفسیری ئایەتەكەدا وتمان وەزیفەو ئەركی ڕابەرگەلی ئەم پەیامەكە(قورئان)ە، بەم جۆرە تەعبیركراوە كە:

---

*) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیەوە دەكرێت سەردانی كتێبی وەرگێڕوی (عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: ئیسلام لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، و.محەمەد چیا) بكەیت.

یەكەم: گەیاندنی پەیامە ئاسمانییەكان بەگوێچكەی ئینسانەكان(یتلوا علیكم ایاتنا)،پاشان بەبێ بەربەست قۆناغی پەروەردەكردن بۆ ئینسانانێك كە نییەتی سالم و مەبەستی دروستیان هەیە و لەكاتی حەق وتن و دیفاع لەحەقدا(لبیك)دەڵێنەوە. مەبەستی ئەوەیە هەرچی مرۆڤە كاتێك گوێیان لەدەنگی حەق دەبێت كاردانەوەیان وەك یەك نییە، ئینسانگەل بە تەرتیب لەگەڵ ئاستی بیركردنەوەیاندا ڕۆحییەت و ئاوات و ئارەزووی جۆری زیندەگی كردنیان حاڵەتی جیاواز پەیدادەكەن لەبەرامبەر دەنگی حەقەوە! هەندێك سەخت دادەچڵەكێن و مشەوەش دەبن و توڕە دەبن لەدەنگی حەق، چونكە بەتەواوەتی دەنگی حەق ئەوەتا لە مقابلی نوكتەی بیركردنەوەیانەوە!! وەك هەندێك لەوخەڵكە بێچارە هەڵخەڵەتاوەی ئەمڕۆ كەئەهلی(تەصەوفن) كەدوچاركران بە شیرك و بت پەرستی كاتێك دەنگی تەوحید و یەكتاپەرستی دەبیستن كە ئەصڵەن دینی ئیلاهی واتە(تەوحید)نارەحەت و توڕە دەبن، كەهەتای ئەوەم بیستووە كەلەمەجلیسێكدا باسێك كراوە لەبارەی منەوە یەك نەفەر لە مەلاكان وتویەتی لاوە ئەوە وێڵكەن ئەوە(موەحیدە) و بەكارنایەت و قابیلییەتی ئەوەی نییە باسی لەبارەوە بكرێت،زۆر عەجیبە! مەلا بێت و ڕەهبەری دین بێت خۆی بەدووربگرێت لەنە فەرێك بەدەلیلی ئەوەی (موەحیدە) دەی دین واتە چی؟! دین واتە(شیرك؟!) ئائەمە بەم ئاستی بیركردنەوەیە بەدڵنیاییەوە لەگەڵ دەنگی تەوحیدی گوێ لێدەبێت توڕە دەبێتو كاردانەوەی پێچەوانەی دەبێت، چونكە غەرق بووە لەو جۆرە بیركردنەوەی خۆیدا تەواوی عەواتف و ئیحساساتی، فكر و ئارەزووەكانی

موتەبیق كردووە لەسەر ئەو جۆرە لەبیركردنەوە، مەگەر زەمانێك وردەوردە كاربكرییەت تا بنەماكانی فكری هەڵوەشێنرێت و داتر بێتەوە سەر رێگا.
جۆرێكی تر هەیە بەتەریب لەگەڵ رێگەی زیندەگییەك كە بۆخۆیان هەڵیان بژاردووە نارەحەت دەبن لەدەنگی حەق، ئینسانگەل كەبەئیمتیازات و جاه و جەلالەوە زیندەگی دەكات و ناز دەفرۆشێت بەسەر مەردمدا، ئیستسمار و تالانی سەروەت و سامانی مەردم دەكات دەنگی حەق ئەو ورد دەكات و داغانی دەكات، بیگومان نارەحەت دەبێت، چونكە هەموو ئیمتیازاتی لەدەست دەچێت، بەڵام ئینسانگەلێك هەن كە نەفكریان وا فاسد و پووچ و دۆگما دروست بووە، نە ئیندەگییان بەوجۆرە دژی خەڵكە یان مومكینە هەشبێت فكری خراپ بێت، زیندەگی دژی خەڵك بێت وەلێ بەكوردی خۆمان تەواو(رەش) نەبوبێتەوە! ئەم ئینسانگەلیشە بەهاورێك لەگەڵ خصوصیاتی ئەخلاقیاتیان، بەهاورێك لەگەڵ چەندین لایەنی جیاواز كەلەژیانیاندا بوونی هەیە پۆلبەندی دەكرێن بۆ پۆلی جاواز جیاواز.
یەكەیەكەیەكیان هەیە زۆر زوو كە دەنگی حەق دەبیستن تێدەگەن كە كۆمەڵگەی ئەوان چەنێك فاسد و پووچ و كەسیفە! بەتەواوی وجودەوە پێشوازی لێدەكەن، هەنێك تاماوەیەك لە گوماندان و هەیانە گومانیان كەم و هەیە كەم كەم رووبەروو دەبنەوە هەیە زۆرەو هەیە كەمەو هەیە زۆرتر، غەیری ئەو دوو دەستەی ئەوەڵە بەتایبەت دەستەی ئیستسمارگەر دەستەی (مەلەء)، ئەوانەكەئیتر شێوازی گشتی زیندەگی و فكر و ئەرزشگەل و ئەخلاقیان لەسەر ئیمتیازاتەوە وەستاوە بەخۆیان ئێژن ماقوڵ و بەخەڵك ئێژن ناماقوڵ، ئەرزشگەلی گەورە بۆخۆیان قایلە و بۆ خەڵك قایل نییە ئائەوانە




بەشێوەیەکی ئاسایی﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ البقرة٦. ڕێگەی ئەوان ئیمان نییە.٠ دوای ئەوەی مەصیری ژیانیان بەوشێوە دەبێت و مودەتها دەنگی حەق بەپاکی و ڕۆشنی بگەیەتە گوێچکەیان چی ئەوان هەر دوژمنی و سەرپیچی بکەن تازە ئیتر بەو جۆرە قورئان بەئێمەی حاڵی دەکات ئەمانە (کافرن)،واتە ئینسانگەلێکن هەوڵدەدەن حەق داپۆشن و گومی بکەن و بیشارنەوە لە خەڵکی ئەمانەئیمکانی نییە شوێن حەق بکەون. بەلاًم ئائەو یەکەیەکە ئینسانگەلە وا بەگشتی خەصڵەتگەلێ جۆراوجۆرێك کەهەیانە، تایبەتمەندییەکی جۆراوجۆر کەهەیانەو جیهەتگیرییەك هەیانە جۆری ژیانێك هەیانە ئیمکانی ئەوەیان پێ دەدات کەزوو پەیرەوی لەحەق بکەن ئەوانە ڕوو دەکەن لەحەق. تەربییەت نیسبەت بەوانە پێدەکات!سەیردەکەیت حەرزرەتی محمد(ﷺ)لەناو مەککەدا بەرپرسیارییەتی پەیدادەکات ئەوەڵ جار (خەدیجە)ی ژنی پێش لەهەرچی کەسە ئیمان دەهێنێت کەئەمەش یەکێکە لە نوکتە گرنگەکان حەساسترین ئینسان نیسبەت بە کەسێك بریتییە لە(ژن) نیسبەت بە (پیاوەکەی)، ئەگەر کەمترین نوکتە زوعفی ناموسی و ئەخلاقی لە محمد(ﷺ)دا ببوایە و ئیدعای بەو جۆرەی بکردایە، وەك شوگەل لەبەرامبەر ژنگەلی ئەم ڕۆژەوە یەکسەر بە پێلاًو دەیدا بەسەریدا و لەت و پەتی دەکرد لەکاتێکدا هێشتا حەقیقەت بۆ خودی حەزرەتی محمد(ﷺ) دەرنەکەوت بوو ئەوەندە هەبوو دەنگی﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾العلق١. بیستبوو، هەروەها دوچاری ئەو نارەحەتی و هەیەجان و لەرزە بوو بوو ماجەرای دەگێڕایەوە بۆ (خەدیجە) لەکاتێکدا لای چۆڵ بوو(کەئەوە باسێکی دورودرێژە)، خەدیجەش، دڵخۆشی پێدا کەدڵنیا بێت

هەرچی هەیە شەڕ و بەڵا نییە، چونكە ژیانی تۆ بەگشتی ئەوە نییە كە خوا بەڵا و موصیبەتت بۆ پێش بێرێت پاشان چوون بۆلای (وەرەق)ە و ئەویش داوایكرد كە(حەزرەت) بۆی باسبكات كەڕوداوەكە چۆن بووە، خودی حەزرەت زۆر نیگەران بوو كە ئەم ڕوداوە غەیر قابیلی تەصەورە، غەیر قابیلی تەحەمولە، كاتێك(وەرەق) تەوزیحی بۆدا كەئەمە ڕیسالەتە، چونكە وەرەق شارەزا بوو ئەمە هەروەك ئەو بەرپرسیارییەتی و حەقیقەتەیە كەوا بۆ(موسی و عیسا) هاتووە و ئێستاش بۆ تۆ هاتووە، پێش ئەوەی خودی محمد(ﷺ) بەتەواوەتی حەقیقەتی بۆ ڕۆشن ببێتەوە لەناو سام و هەیبەتی ڕوداوەكاندا ونبووە، حەواس شپرزە بووە، حەزرەتی خەدیجە ئیمانی پێدەهێنێت ئەوەیە شەخصییەتی داواكراو و سالم و پەسەندیدە، ئەوەشە نیشانەی ڕاستگۆی حەزرەتی محمد(ﷺ) ژنێك كەئەو گشتە حەساسییەتیەی هەیە بەرامبەر بە پیاو، ژنێك كە پانزە ساڵ لە شووەكەی گەورەترە، شووەكەی(چل) ساڵ تەمەنییەتی، بەڵام ئەو (پەنجاو پێنج )ساڵەیە، ئەوەندە پاكی و دۆستی لە شەخصییەتی دۆستەكەیدا دەبینێت كە ئیدعای وا گەورە دەكات، كە هەرچی ئەرزشگەلی عومری(خەدیجە)یە ورد دەكات و لەناویدەبات بەر لەهەرچی كەسە ئیمانی پێ دەهێنێت! لەوەودواش دەبینیت لەناو منداڵگەلدا- حەزرەتی (عەلی)یە، لەناو پیاواندا حەزرەتی(ئەبوبەكر)ە، هەروا یەكەیەكە لە ئینسانگەل ئەو كۆمەڵگە گەورە كەلە مەككەدا بوو دەستی گرت بەسەریدا، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەك ڕاستەوخۆ شەڕیان دەكرد تا كۆتایی تەمەنیان هەر شەڕیان دەكرد، مەگەر كە زەمانێك ئیتر لە ناچاریدا قەراریان گرت و ڕێگەی شەڕیان نەما بوو كە ناچار بوون بەتەسلیم. ئائەم





سیانزە ساڵە كەپێغەمبەر(ﷺ) لەمەككەدا گوزەراندی سەیردەكەیت تەنها ژمارەیەكی دیاریكراو هاتنە دەوری و سودیان وەرگرت لەپەروەردە كردنی، بەڵام ئەم ژمارە دیاریكراوە بەتەنها ئەوانە بوون وا دونیایان ژێرا وژوور كردا چونكە دروست پەروەردە كریان دوای پەروەردە كردنیشیان هەر وردەوردە ئایاتی قورئان دادەبەزی و دەبوویە زانیاری و مەعریفەت بۆیان، لەپاشانیشدا كە پێغەمبەر(ﷺ) هیجرەت دەكات و دەڕواتە(مەدینە) و كۆمەڵگە دروست دەكات ژێر بینایی ئەصڵی ئەو كۆمەڵگەیە هەر ئەو كومەڵە موهاجیرەن، لەوەودوا كۆمەڵەی(ئەنصار)ی مەدینەدێنە پاڵیان،ئەم كۆمەڵەی (ئەنصار)یشە هەرئەو كۆمەڵە كەسەن كەزۆر بەیان پێش ئەوەی (پێغەمبەر(ﷺ) بێت و بگوازێتەوە بۆشاری مەدینە تەسلیم بوون و ئیمانیان هێنابوو، چ ئەوانەی لەلیژنەی نوێنەرایەتی سەرەتادا (دوو)ساڵ پێش كۆچكردن (دوانزە نەفەر) هاتبوون و پێغەمبەریان (ﷺ) بینی و ئیمانیان هێنابوو، چ ئەو (حەفتا وچەند نەفەرە) كەساڵێك پێش لەهیجرەت هاتبوون،چ كەسانێكیش كە زانیاری ئیسلامیان لەزەمانی ئەمانە بیستبوو، ئەمانە ئینسانگەلێك بوون سالم كە زووتر پێش لەهاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامیان دەرك كردبوو و قبوڵیان كردبوو بۆیە بوونە دەستەی مەركەزی كومەڵگەی ئیسلامی، لەڕووی ژمارەوە زۆر كەم بەڵام لەڕووی هێزەوە مەشمولی ئائەو (مِثال)ە وا قورئان بەیانی دەكات ڕاستر بڵێم بەناونیشانی(مَثَل)، (چونكە(مَثَل)ڕاستربووترێت بەعەرەبییەكەی).

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾*
لەوەودواش سەرنجمان بۆئەوە ڕادەکێشێت کەمەبەست ئەوە نییە کەئەم (شاخە) ببینیت و قورئانێك بێتە خوارەوە بۆسەری ،نا...﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾بەعینوانی (مَثَل) بەئێمە حاڵی دەکرییەت، کۆمەڵگەی ئیسلامی سەیردەکات بچوك بەو جۆرە کەقورئان تەصویری دەکات بەجۆرێك بوو مەردم بیانفڕێنن ئەوەندە کەم و زەعیف بوون. کۆمەڵکەگەلی(شیرك) و (ئیمتیازات و تەبەقات) فرە زۆردار و بەهێز چ هۆزەکان(جەزیرەی عەرەبی)، چ حوکمەتگەلی موستەعمیرەی ئێران و ڕۆم لەلایەنی(باکور و باشور)ی جەزیرەی عەرەبیدا، وەچ حوکمەتی ئێران و ڕۆم خۆیان ئەمانە گشتی دوژمن گەلی زۆردار و ترسناك، کۆمەڵگەی بچکۆلەی ئیسلامی (پڕ مشتێك) دەبێت شەڕ بکات لەگەڵ گشتی ئەم قودرەتگەلەدا، بێگومان خۆشیان نیگەران بوون کە چ بەرپرسیارییەتییەکی عەزیم و چ گروپێکی بچکۆلانە! قورئان سرنجیان بۆ ئەم حقیقەتە ڕایاندەکێشێت، کە ئائەم بەرنامە کەئێوە ئیجرای دەکەن بەرنامەیەکە کەقورئان بەئێوەی فێردەکات، جا قودرەتی قورئان بەوجۆرەیە ئەگەر بڕیارِ بێ تەصویری مادی لەبەرچاو بگرین (کێو و قورئان) موتەوەجیهی بکرییەت بەشێوەی یەك مادەی تەقینەرەوە کەئەم کێوە لەت و پەت بکات داغانی دەکات، بەڵام ئەم کێوگەلە والەئێوە دەترسن کێوی نیزامگەل و ڕژێمگەل و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە کە ئینسانگەل دایانمەزراندووە، ئەم عەشایەر و حوکمەتگەلە زۆردارانە وە قورئان یەك

---

*) {لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ }الحشر٢١

.ەی تەقینەرەوەیە كە ئەمانە لەت و پەت دەكات و داغانیان دەكات. بەڵێ
بەرچاری ئێوەوە زۆر بەهەیبەتن ئێوە وادەزانن ئەمانە لەبەین نایەن هەرئەوەی
ـە لە كوردیدا بۆكەسێكی بەهێز و لەبن نەهاتوو دەڵێین"وەك كێو وایە و
بن نایەت لە ڕیشە نایەت، هەڵناكنرێت" لەعەرەبیشدا ئەم مەسەلە هەیە ئێوە
تەصەور دەكەن كە ئەمانە هەڵناكنرێن، بەلاَم ئێوە (شمشێری)قورئانتان
دەستەوەیە. دەی ئەمە بەسە كەگەورەترین كێو لەت و پەت بكات!
و شێوەیە بوو محمد(ﷺ) بەقورئان ئەو كۆمەڵگە بچوكەی پەروەردە كرد،
انی ئەم هێندە گەورانە لەت و پەت بكات و داغانیان بكات. قورئانیش
ەروەك ئەو مەبنایە پەروەردە كردن بەوشێوەیە و لەوەودواش فێركردن
شوێنیدا، پەروەردەش بۆ ئەو ئینسانگەلە كەبەهاوتەریبی لەگەڵ تەرزی
ركردنەوە و جیهەتگیری و جۆری زیندەگی كردنیان، نییەتیان سالم و
ەبەستیان دروست.
ەروەردە بەكورتی عیبارەتە لە: دروست كردنی شەخصییەتی هەر ئینسانێك،
روست هەروەك ئەوەی وەریگرتووە. لەسەرەتادا زانیارییەكی بێ سنور و فرە
فراوانی پێنادەیت و لەوەودوا هەرچی بكەیت سەیربكەیت شكڵ نەگرێت
ێت! وردەوردە حەقائیقێكی پێ حاڵی بكەیت شەخصییەتی پێبدەیت هاوڕێك
ـەگەڵ ئەو حەقائیقەدا، بەعیبارەتێكی زۆر سادەتر لەو مەسەلەی دەوری ئاگا
نائاگا ئینسان شت دەزانێت و لەپاڵیدا صیفات و خصوصیاتی هەیە، چ
ەزانێت ئەم صیفەتە پەیدابكات یەك جۆر دروست ببێت و یەك شێوەی
بێت، نەك دوو شەخصییەتی ببێت شتێك بكات و شتێك بزانێت،ئەوەی
ڕادەیزانێت و دەیلێت جۆرێك بێت، بەلاَم ئەوەی وا صیفەت و ئەخلاق و

ڕەفتارییەتی جۆرێکی دیکەبێت. بەدەربڕینێکی(ئیجادی هاوسەنگی لە نێوان تایبەتمەندی ئەخلاقی و ویژدانی فەرد بە ئەحواڵە زیهییەکەی). چەمکێکی ترمان هەیە کە (زهن)ە، واتە فەعالییەتگەلی فکری، دەرك و مەعلومات و ناسینەکانی ئینسان. (ویژدان) یان ئەخلاق، واتە صیفات و خەصڵەتگەلێك کە ئینسان هەیەتی، ئازا یان ترسنۆك، سەخی یان ڕەزیل، خۆش ئەخلاق یان بەدئەخلاق، پڕموقاوەمەت یان بێ موقاوەمەت و باقی خەصڵەتگەل..
تەربییەتی صەحیح: واتە ئیجادی تەتابوق(هاوسەنگی) لەنێوان خصوصیاتی ئەخلاقی و ویژدانی ئینساندا،لەگەڵ ئەحوالی زهنیدا. ئەو شتەی لە زیهنیدا حاصڵ دەبێت هەروەك ئەوە لەویژدانیشدا حاصڵ ببێت، چی فێردەبێت ئەو شکڵو خصوصییەتە پەیدابکات، واتە هەماهەنگی و یەکڕەنگی بوونی(دەرونی نائاگا بەدەرونی ئاگا). دەرونی ئاگاهی شتێك فێردەبێت حەتمەن ڕەوانی نائاگاهی ئەو شکڵە پەیدادەکات، پەروەردەی دروست واتە ئەمە.
جادوای ئەوەی ئەو شەخصییەتەی کەمەبەستە دروست بوو بۆ ئینسان بوویە، یەك ئینسانی موسبەت یان لەبیناوە دروست کرا مەعریفەی ئەساسی پێدرا و شکڵ درا بەویژدان و دەرونی هاوتەریب لەگەڵ مەعریفەتەکەیدا، ئەوکات سەرەی فێرکردنی(کیتاب و حیکمەتە)وردەوردە زانیاری زیاد بێت و حەقیقەت زیاتر دەرك بکات تائەو سنورەی بۆ هەرکەسێك پێویستە، چونکە ئینسانگەل وەك یەك فەراغەت و ئیمکانیاتی تێگەیشتنی نییە هەر کەسێك تا ئەو سنورەی بۆی دەکرێت لەو سنورەدا لەحەقیقەتی کیتاب و حیکمەت و ئەوشتانەی کە ئینسانییەت ناکرێت خۆی بیانزانێت دەتوانێت فێر ببێت، بۆیە ئەساسی بەرنامەی دینی ئیسلام ئەوەیە کە ئینسانەکان پەروەردەبن! واتە هەر

ئەندازەیەك كە نیازیان هەیە بەهان شێوە پەیوەستبن، یان ئەوەی لە ڕێگەی (دەرونی ئاگاوە) وەریدەگرن لە (دەرونی نائاگا)یاندا دروست بە هەمان شێوە شكڵ بگرێت و پێچەوانە نەبێت، بەم تەرتیبە كەواتە (دەرونی ئاگا و نا ئاگا) بێگانە نین لەیەكتری! بەڵام دەبینین لە غەیری پەروەردەی ئیسلامیدا دەروونی ئاگا و نائاگا تەواو بێگانەن بەیەك، كابرا نەخۆشێكە لەجێگایەكدا لەژێرچاودێری (پزیشكی دەروونناسی)دایە باسی لەگەڵدا دەكات كەچی سەیردەكات زۆر بەباشی لە مەسەلە مرۆییەكان دەكۆڵێتەوە بۆماوەیەكی دوورودرێژ زەحمەت دەكێشێت سەیردەكات هەی هوو خۆ ئەم كابرایە دەرونێكی وێرانی هەیە! دەرونی شكڵ و خصوصیاتێكی تری هەیە و تەواو پێچەوانەی ئەوەیە وا ئێژێت، بەڵام هۆكاری ئەوەی كەبەو جۆرە دەرونی نائاگای بێگانەیە بەدەرونی ئاگای ئەوەیە كە بەونمونەی وایەكەمجار باسمانكرد، وەك مەسەلەن دوودانە (زەرف) لەپاڵ یەكدا و جیالەیەك، زەرفێك هەرلەسەرەتاوە شتی تێدەكریەت و پڕدەكریەت، كەچی ئەو زەرفەكەی تر چۆڵ و هۆڵ واتە بەشی ئاگاهی زانیاری ئینسان هەر لەبەرەوە زیاد دەكات، بەڵام هیچ ئاگادارییەك لەدەرونی نائاگاهی نییە! كەلەچ بارودۆخێكدا پەروەردە دەكرێت؟ ئایا هاورێك لەگەڵ زیادكردنی زانیاریدا پەروەردە دەكرێت؟ یان بە پێچەوانەوە؟ چی نەخێر وانەكراوە، بەڵكو هەر زیادكردنی مەعلومات لەبەرچاوگیراوە بەبێ ئاگابوون لەوەی كەصیفات و خصوصیاتی ئەم ئینسانە چۆن بێت؟ لەئەنجامدا ئەو دژیەتییە دروست دەبێت واباسمان كردا! بۆیە لێرەوە ڕۆشن دەبێتەوە دەرونی ئاگاهی و نائاگاهی ئینسان دژی یەكتری نین، چونكە كاتێك ڕەوانی نائاگاهی بەوجۆرە پەروەردە كرا هەرچی

زانیاری ئیزافە دەکرییەت ئەمە (چرایەکە لەدەرونی ئاگاهی) ئینسانەوە بەرەو دەرونی نائاگاهی و هەر لەپێشەوە ڕۆشنەری دەکات تەواو هاوڕێك لەگەڵ ئەمەدا شکی پێدەبات. وەك وێنەیەك لەگەڵ ئەصڵەکەی خۆیدا لەبەرامبەر نوورێکی بەهێزەوە تەواو شێوەی ئەم دەگرێت، دەرونی نائاگای ئینسانیش بەبۆنەی نورێکەوە کە لەڕەوانی ئاگاوە بۆی دەڕوات وەك شکڵی ڕەوانی ئاگا پەیدادەکات، واتە تایبەتمەندی ئینسان و زانیاری دروستی وەك یەکی لێدێت، زانین و شەخصییەت و ئەخلاقی دروست وەك یەك دروست دەبێت.

جـــا ئائەو بێگانەییەی(دەرونی نائاگا) لە(دەرونی ئاگا)یە، دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە ئینسان بەوجۆرە دوو شەخصییەتیە لە شەخصییەتدا دژ بوون وجودی هەیەا تووشی جۆرەها نەخۆشی فەردی و ئیجتماعی دەبێت، واتە(فەرد) لەسنوری خۆیدا و کۆمەڵگەیەك کە پێکهاتووە لە ئەو(ئەفرادە) ئەو مەرەزە جۆرجۆرە پەیدادەکەن، کاتێك ئینسان شتێك دەزانێ، بەلاَم ئەخلاق و خصوصیاتی غەیری ئەوەیە وادەیزانێت، سەیردەکەیت ئینسانێکە لادەر، درۆزن، ڕیاکار. لەبەرئەو دژایەتییەی والە شەخصییەتیدا هەیە وا دوچاری دوو شەخصییەتی بووە بەتەدریج، چونکە خۆ پێویست ناکات ئینسانی دووشەخصییەتی گشتی وەك یەك خراپ بن، بەلاَم دوو شەخصییەتی بنەمایە بۆ دوچار بوون بەجۆرەها دەرد و ڕیا و تەزویر، ئەمە ڕەوشی پەروەردە و فێرکردنە لە ئیسلامدا. جا بەم دەلیلە ئەم (مەدرەسەی قورئانە)، کە دەڵێین مەدرەسەی قورئانە و دەمانەوێت ڕەوشی پەروەردە و فێرکردنی ئیسلامی لەم مەدرەسەدا زیندو ببێتەوە دەبێت مامۆستایانی ئەم مەدرەسەیە بەتایبەت لەم قۆناغەی سەرەتادا دەبێت ئاگاداربن بەرئەساسی ئەو ڕەوشتەی فێری محەمەد(ﷺ) کراو.




## باسی دووەم:
# ڕوكنە سەرەكییەكانی كەماڵی كەسایەتی مرۆڤ

### لە نێوان( كا فرو موئمین‌و مونافیق)دا:

بۆ ئەمە ئەم مەتڵەبە كە ئێوە پێشكەشی دەكەن تەواو ڕۆشن بێتەوە، هەم جیاوازی(ئیمان) و (ئیسلام) پێویستە بوترێت و ڕۆشن بێتەوە، هەم جیاوازی (ئیمان و كوفر و نیفاق).

لەبارەی جیاوازی (ئیمان و ئیسلام)ەوە باس كاتێك دەست پێدەكات كە لەسەرەتادا جیاوازی(ئیمان و كوفر و نیفاق) بوێژرێت، كەلێرەدا بەشەكانی (ئیمان) ڕوون دەبێتەوە، هەروەها مەرحەلە و مەسائیلێك كە دەبێتە هۆكاری جیاوازی ئەم (سێ) خەصڵەتە، (كەلەسەرەتادا وەك یەكن) تەوزیح دەدرێت، ئەو كاتە لە جیاوازی (ئیمان و ئیسلام)یش حاڵی دەبین.

بەگشتی (سێ) مەسەلە لە ئینساندا مەترەحە كە ئەرزشی وجودی، یان شەخصییەتی ئینسان بەو سێ مەسەلەوە بەندە.

**یەكەم: مەعریفە:** یە یان بە ئیصتلاحێ ئەمڕۆ (شوناسی ئینسان)، دەركی ئینسان، حاڵی بوونی ئینسان نیسبەت بە مەسائیل، (كەلەوەودوا ڕوونی دەكەینەوە) ئەوەی وا لەفەرهەنگی تەعبیراتی دینی و فەلسەفیدا بۆ كەلیمەی (ئیمان) مەترەحە (مەعریفەت و شناختە) نیسبەت بەمەسائیلی ئصوڵی و ئەساسییەكە كە تەئسیر دەكات لەڕەفتار و ڕەوشت و شەخصییەتی ئینسان.

**دووەم: جیهەتگیری ئینسان:** ئینسان چ جۆرە جیهەتێك هەڵدەبژێرێت بۆ ژیندەگی،ئاواتی،ئارەزووی چۆنە؟ گەرەکییە چ مەصیرێك بگرێتە بەر؟ پێش لەوەی لە عەمەلدا(کرداردا) گاریگەری ببینین حاڵەتی دەروونییەکە، ئەو تەصمیمەی کە ئینسان دەیگرێت مەرحەلەی دووەمە.

**سێیەم: کردار(عەمەل):** کە شەخصییەتی ئینسان دادەمەزرێنێت و کاملی دەکات، یان مەزهەرێکە بۆ ناسینی شەخصییەتی ئینسان، بریتییە لە ئەعمالی ئینسان(کرداری) ئینسان.

جا ئێستا ئیشارەت بەوە بکەم کە (ئیمان) لە زمانەوانیدا واتە: (عەقیدەی قاطع و جازم بە هەرشتێك). جا مەفهومی ئەمە گشتییە شاملی هەرچی جۆرە شتگەلە ئەوێت، عەقیدەی قاطع و جازم بە هەرشتێك ئەرزشدار و بێ ئەرزش،گەورە و بچوك.عەقیدەی جازم بەمەکە ئەمڕۆ مەسەلەن فلانە ڕۆژە ئێستا لێرە ڕۆژە و لە فلانە جێگا شەوە،لە فلانە جێگا سەعات ئەوەندەیە و لە فلانە جێگا سەعات ئەوەندەیە، ئەوە فلانە کەسەو ئەوە ئەو یەکەکەی ترە، ئەو مەسەلەن خەڵکی ئەو جێگەیەیە و ئەویتریان خەڵکی ئەو جێگەی ترە،ئەوە ئەو شارەیە و ئەوە ئەو شارەیە....تەواو مەسائیلی بچوك تا دەگەیتە مەسائیلی گەورە گەورە،گشتی کەلیمەی ئیمانی بۆ بەکار دەبرێت. بەڵام لە عورفی خاصی دیندا، هەروەها لە فەلسەفەشدا، فەلسەفە کاتێك کەبابەتێکی دیاریکراوی گەورە گەورەی بەشەری باسدەکات وشەی (ئیمان) بۆ (مەسادەقگەلی بچوك) و بابەتی بچوکی بێ ئەرزش بەکارنابات. دێن بچوکی دەکەنەوە و دەیکەنە ماصەدەقێك موهیم یان جوزێك موهیم لە ئەجزای

ماصەدەقێك کە کەلیمەی ئیمانی بۆ بەکاردەهێنرێت. بەکاری دەهێنن بۆ بابەتگەلێك کە تەئسیری لە ڕێگە و ڕەوشتی ئینساندا هەیە، یان بەدەربڕینێکی تر تەئسیری(کاریگەری) لەمەسەلەی دووەمدا هەیە کە شەخصییەتی ئینسان بەوەوە بەندە کە ئەویش (جیهەتگیری ئینسانە).

ئیمان بەکاردەبرێت بۆ شتێك، واتە عەقیدە بە شتێك مەعریفەت و شناخت نیسبەت بە شتێك، کە وەختێك ئەو مەعریفەت و شناختە حاصڵ بێت(جیهەت) بۆ ئینسان دیاری ببێت. بەشێوەیەکی ئاسایی ئینسان دوای ئەوە ئەو مەعریفەتە پەیدا دەکات، خۆی بە مولزەم دەزانێت کە جیهەتێك پەیدا بکات بە پەیوەندی لەگەڵ ئەو مەعریفەتەدا. ئەمە باسێکی زۆر دوورودرێژە ئەگەر بمانەوێت ئێستا تەوزیحی بدەین، ئەوە وا ماسەدەقی ئیمانە لە ئیسلامدا چەنێك ئەهەمییەتی فرەیە، کە عیبارەتە لە ئصوڵی ئەساسی عەقیدەی ئیسلام، ئەوە زۆر درێژە دەکێشێت، بەڵام بەشێوەیەکی سادە بڵێم...

بەشێوەیەکی گشتی بەو جۆرە وتمان، لە ڕوانگەی دینی و لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە، (ئیمان) بە عەقیدە دەوترێت نیسبەت بەبابەتگەلێکی گرنگ کە کاریگەری هەیە لەسەر جیهەتگیری ئینسان. ئەو ماصەدەقەگەلەی کەکەلیمەی ئیمانی بۆ بەکاردەبرێت لە ئیسلام و ئصوڵی عەقائید،کە عیبارەتە لە(تەوحید): واتە شناسایی نیسبەت بەزات و صیفاتی خوای گەورە، ئەوەی لە نیزامی تەوحید کاریگەری هەیە. هەروەها(مەعاد): واتە ئەوەی ئینسان (خاسی و خراوی)بە فیڕۆناچێت، ئەم دووانە بەبێ جیاوازی نین، بەڵکو جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، پێوەرێك و مەنزڵێك هەیە بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتی خاس و خراوی ئینسان ئەمەش بەتەناسوبی ئەم میقیاسە سابتە،





ئینسان، چونکە مەوجودێکە بەهەرچی بارا دەتوانێت ڕەفتار بکات و وەك ئەفرادی یەك جۆر لەئاژەڵ نییە کە گشتی لەیەك شێوەدا زیندەگی دەکەن ئێم وانیەە! دوو برای دایك و باوکی دەتوانن ئاسمان تا زەوی جیاوازییان هەبێت لە ڕەفتار و خصوصیاتدا. مەئموریەتێك لە تەرەف خواوە تەعین بووە کە بەرنامەیەك ئیلاهی بیهێنن بۆ ئاموزشی ئێمە کە ئەمەش دەبێتە(تەوحید و معاد و نبووەت) یان(تەوحید و نبووەت و معاد). (یەکتاپەرستی، پێغەمبەرایەتی، ڕۆژی زیندوو بونەوە). بەشێوەیەکی گشتی ئائەم ئصوڵە کەهەندێك ئصوڵی فەرعی لێ جیادەبێتەوە وەك ئەمە کە( معاد) موبتەلیزمی (مەبدەئە)، وەك ئەمە کە (تەوحید) بەمانای ناسینی زات و صیفاتی خوای گەورەیە، کەلەتەعلیمی کەلامدا دەبینین بە (پێنج) ناوی دەبەن، کەلەحاڵێکدا(سێ) دانەی ئەوەڵیانەو ئەو سیانە ئەصڵن و ئەو دووانەکە تابیعی ئەو سیانەن. بەهەرحاڵ.

ئەمانە بابەتی بنچینەیی تەواوی هەستی و وجودی ئینسانن هەرچی فەعالییەت (چالاکی) و هەوڵی ئینسان و هەرچی زانستی مەعاریفی ئینسان هەیە لەم باسەدایە، وەك چۆن ئەعداد(ژمارەکان) مەوزوعی(بیرکارییە)، وەك چۆن (وشە) و (ڕستە)،(کەلیمە و کەلام)بابەتی زانستی(نحو صەرف)بەو جۆرەش چۆن ئەو بابەتگەلە ئەرزش دەدات بەتەواوی مەسائیلی فلآنە عیلم، یان تەواوی فلآنە عیلم ئەرزشە وجودییەکەی بەو بابەتەوەیە کە بابەتەکە لە مەسەلەکەدا جەرەیانی هەیە، هەر بەو جۆرە ئەم ئصوڵی عەقائیدی ئیسلامییە ئەرزشی ئەساسی بە گشتی دەدەن بە هەستی و بەتایبەتیش ئینسان و بەدەرك




و چالاکی و مەعریفە و علومی ئینسان. هەروەها بابەتی ئەصڵێن بۆ تەواوی زانستگەل و مەعریفەتگەل و کارگەلی ئینسان.

لە (ئیمان)دا ئیزافە لەئەم مەعریفەت و ئاشناییە نیسبەت بەم ئصوڵە یەك ڕوکنی تریش مەترەحە کە بریتییە لە تەسلیمکردنی ئیحساسات و عەواطف و کردار و ئارەزوو لەتەك مەعریفەتدا. ئەو بوو وتمان (ئیمان) لە دین و لە فەلسەفەدا بەرکاردەبرێت بۆ عەقیدە پەیداکردن بەشتگەلێك کە(جیهەت) بداتە ئینسان و کاریگەری ببێت لەسەر جیهەتگیری ئینسان، بەلاَم کەلیمەی ئیمان بەکاردەبرێت هەم بۆ(مەعریفەتەکە)هەم بۆ (جیهەتگیرییەکە)، کاتێك مەعریفەتێك تەنها بوو کەلیمەی(ئیمان)ی بۆ بەکارنابرێت کاتێك بە مەعریفەتێك دەوترێت (ئیمان) کە جیهەتیش لەتەکیا تەعین بوو بێت، جیهەتێك موناسیب بێت لەگەڵ خۆیدا، جیهەتێك کە ئیقتیزای زاتی مەعریفەتەکە بێت، ئەگەر ئەصڵی مەعریفەتەکە حاصڵ بوو، جیهەتگیرییەکەش هاوتەریبی مەعریفەتەکە حاصڵ بوو ئەوە پێی دەڵێن (ئیمان). بەلاَم ئەگەر(مەعریفەتەکە) هەبوو وەلێ جیهەتگیرییەکە بەرعەکسی(پێچەوانەی) ئیقتیزای مەعریفەتەکە بوو {واتە دژ هاتەوە لەگەڵ مەعریفەتەکە} ئەو کاتە دەبێتە(کوفر).

هەروەك ووتمان بۆ ئیمان دوو ڕوکن مەترەحە:

یەکەم: (پەیدابوونی مەعریفەت و شناختی دروست نیسبەت بە ئصوڵی گەورەی عەقائیدی ئیسلامی.

دووەم: تەتبیق کردنی شەخصییەتی خودی ئینسان لەگەڵ ئەو مەعریفەتەدا، واتە جیهەتێك بداتە ئاوات و ئارەزووگەلی عەواطف و ئیحساساتی

كەموتەناسیب بێت لەتەك ئەو مەعریفەتەدا، كاتێك دەزانێت كە هەستی و لیتفاقی و كەشكی لەخۆیەوە نەهاتۆتە بوون! كاتێك دەزانێت كە ئینسان دەتوانێت بەهەرچی باردا ڕەفتار بكات، خاس بێت، خراو بێت، مەسئولییەتێك مەترەحە بۆی، هەروەها كاتێك بۆی دەردەكەوێت كە بەرنامەیەكی بۆ دیاری كراوە كەلە ڕێگەیەكەوە ڕەچاوی جێبەجێ كردنی مەسئولییەتەكەی بكات، ئاساییە كە خۆ تەتبیق كردن لەگەڵ ئەم مەعریفەتەدا، یانی ئەوە كە ئائەم جۆرە شناخت(ناسین)ە ئیقتیزای ئەمە دەكات كە ئینسان چی بكات، كاتێك ئینسان عەقیدەی لەو شێوەیەیی ببێت پێچەوانە ڕەفتار كردن لەگەڵ ئەم عەقیدە و مەعریفەتەدا چییە و بەو شێوەیە شەخصییەتی خۆی و شەخصییەتی مەعنەوی خۆی دروست بكات و جیهەت بەكردار و ئارەزوو و عەواطف و ئیحساساتی بەجۆرێك بدات كە موتەبیق بێت لەتەك داواكارییەكانی ئەو مەعریفەتگەلەدا.

لەقورئاندا دەبینین هەركات باس لە ئیمان دەكرێت باس لە(عەمەلی صالح)، واتە ڕەفتاری شایستە حەتمەن مەترەحە، كە وتمان بۆ پەیدابوونی ئەرزشی شەخصییەتی ئینسان(سێ) صیفات و خەصڵەت مەترەحە:

**یەكەم: مەعریفەت**

**دووەم: جیهەتگیری**

**سێیەم: ڕەفتار و كردار**

لەئیماندا هەردوو ڕوكنی ئەوەڵ(مەعریفە و جیهەتگیری) جەمە، بۆئەوەی شەخصییەتی ئینسانی موئمین كامڵ بوێت ئالەبەر ئەوە دەبینین كە بەشوێن(ئیمان)دا باس لە عەمەلی صالح دەكرێت، سەمەرە و فائیدەی

بەرچاوی بەدەستهاتووە ئەو مەعریفەت و ناسینە، هەروەها ئـەو تـەتبیقکردنی شەخـصییەتە لەتـەك مەعریفەتـدا، واتـە جیهـەتگیری مەعنـەوی ئینـسان بەتەناسـوب مەعریفەتەکـەی عیبارەتـە لـە ئـەعمال و ڕەفتـاری پەسـەند دیدە(قبـوڵکراو)، ئەگـەر ئینسان مەعریفـەتێکی بـوو خـۆی تـەتبیقی کـرد، شەخـصییەتی مەعنـەوی خـۆی تـەتبیقکرد لەتـەك مەعریفەتەکەیـدا، کاتێـك دەتوانین بێژین سەرکەوتوو بووە و ئەنجامگیری داواکـراوی بەدەسـت هێنـاوە لەم دوو داواکارییە گرنگە کە (عەمەلی) کرداری موتەبیق بێـت لەتـەك ئـەو دوو ئەصـڵەدا... دوای ئـەوەی مەعریفەتەکـەی بـۆ حاصـڵ بـوو ئـاوات و ئارەزووگـەلی و عـەواطـف و شـعور و ئیحـساساتی هەرچـی خەصـڵەتگەلی مەعنەوییـە موتـەبیق کـرد لەگـەڵ ئیمانەکـەدا، لـە(عەمەلـدا)ڕەفتـاردا- دەردەکەوێت کە ئەم ئینسانە ئـەم مەعریفەتـەی هەیـە و ئـەم جیهەتگیرییـەی کردووە، جیهەتێك کەئەم ئینسانە هەیەتی لەڕەفتار و کرداریدا ڕەنگ بداتەوە بۆ ئێمە، ئەگەر بێتـوو لـەکردار و ڕەفتـاردا نیـشانە و تایبەتمەندییـەك لەئـەو مەعریفەت و جیهەتگیرییە نەبێت لە حەقیقەتدا ئەو مەعریفەت و جیهەتگیرییە کەدەبێتە(ئیمان)وەك ئەوە وایە(دارێك) لق و پۆ و گەلا و سەمەری نەبێت بێ ئەرزشە و بێ فائیـدە، یـاخود کـەم ئـەرزش و کـەم فائیـدە، چـونکە لەهـەر زەمانێکدا(ئیمان) ئیمکانی ئەمەی هەیەکەئەم جیهەتە بداتە ئینسان، واتـە ئـەم ئەسەرە بەرچاوەی هەبێت. بەڵام بەگشتی بەرچاوی (ئیمان) بریتییە لە(عەمەلی صاڵح). عەمەلی صاڵح خۆی زاتەن داغڵی مەفهومی ئیمان نییـە ،ئیمـان هـەر ئـــەو دووانەیـــە وا وتمـــان، بـــەڵام بەرووبومـــە بەرچـــاوەکەی، ســـودە بەرچاوەکەی(ئیمان) دەبێتە عەمەلی صاڵح هەر لەبەر ئەمەشە هەمیشە لەتەکیا

لەوێژرێت، دوای ئەوەی كەئەم سێ ڕوكنە بۆ شەخسییەتی ئینسانمان زانی، جا وەختێك ئێژین شەخصیەتی ئینسانی موسوڵمان بەم (سێ) داواكاریە دادەمەزرێت ئالەم (سێ داواكاریی)ەدا جیاوازی(ئیمان و كوفر و نیفاق)مان بۆ دەردەكەوێت. (ئیمان) لەگەڵ (كوفر) لەیەك ڕوكندا یەكێكن و لەڕوكنێكدا جیا دەبنەوە لەیەكتری!

هەم (ئیمان) و هەم (كوفر)، واتە بەدەست هێنانی مەعریفەت بەو ئصوڵە گەورەیەی ـ باسكرا. بەڵام لە ئیماندا تەتبیق كردن مەترەحە، جیهەتگرتن مەترەحە بە ئیقتیزای ئەو مەعریفەتە، لە(كوفر)دا لەجیاتی ئەمەكە وەختێك مەعریفەتەكە حاصڵ بوو كابرا خۆی هاوجیهەت بكات لەتەك مەعریفەتەكەی خۆیدا، دروست بەپێچەوانەی ئەوەوە دەست دەكات بەڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵیدا. مەعریفەتی پەیداكردوە كە ئەمە واقیعەتێكە، بەڵام لەبەر خاتری ئەمە كە ئاوات و ئارەزووەكەی خۆی لەنەزەریدا گرنگترە تائەو مەعریفەتگەلەی كە پەیدایكردوە، یان لەبەر فرەیەك لەبابەتگەلی تر، كەلە ڕەوانی ئینساندا بوونی هەیە و (لەوانەیە قابیلی ژماردن نەبێت. چونكە ئەوەندە زۆرە)! لەجیاتی ئەمە بێت شەخصییەتی خۆی هاوتەریب بكات لەگەڵ مەعریفەتەكەیدا. لەجیاتی ئەمە خۆی تەواو بخاتە سەر جیهەتێك كەمەعریفەتەكەی لێی داوا دەكات دەست دەكاتە مامەڵەكردنی پێچەوانە و دژایەتی كردن لەگەڵیدا، چونكە ئەگەر قەرار بێت كۆمەڵگە لەسەر ئەو خەصڵەت و مەعریفەتە دابمەزرێت جێگەی ئینسانگەلی لەو جۆرەی تێدا نابێتەوە.





بەشێوەیەکی گشتی لەمەنتیق ـ لۆجیك-ی کۆندا بۆ ناسینی هەر شتێك دەیان ووت(جنس و فەصل) لە(مەنتیقی ئەرستۆ)دا کە مەشهورە. بەم شێوەیە(ئیمان و کوفر) لە(جنس)دا بەو دەربڕینە لۆجیکییە یەکێکن: یانی هەردووکیان عیبارەتن لەبەدەست هێنانی مەعریفە بەو شێوە فراوانە. وەلێ لە(فەصل)دا جیادەبنەوە. فەصڵێك کە (ئیمان) جیادەکاتەوە لە (کوفر) بریتییە لە جیهەتگرتن و خۆ تەتبیق کردن، وەلێ فەصڵی (کوفر): بریتییە لە دژابەتی کردن و خۆ تەتبیق نەکردن. جا(کوفر) لەگەڵ (نیفاق)دا، لەشتێکدا لەیەك جیادەبنەوە، دووبارە (نیفاق)لەگەڵ(کوفر)دا لە ئەصڵی بەدەستهێنانی مەعریفەت و خۆ تەتبیق نەکردن لەگەڵیدا وەکو یەکن! بەڵام وتمان(ئیمان) بەوە کامڵ دەبێت کە (عەمەلی صالحی) لەگەڵدا بێت کەدوای (حاصڵ بوونی مەعریفەتەکە و گرتنی جیهەت)ەکە مەترەح دەبێت. لە(کوفر)یشدا ئەو مەرحەلە ناوەڕاستینە کە خۆ تەتبیق کردن و جیهەتگرتنەکەیە مەترەح نییە، بەڵام مەرحەلەی(سێ)یەمیش لە(کوفر)ەکەدا هەر مەترەح نییە، کە بریتییە لە(عەمەلی صالح)، بەڵام (نیفاق) جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ (کوفر)دا لە مەرحەلەی(ئیمان)دا وەك (کوفر) وایە، واتە لەمەرحەلەی(مەعریفەت) و جیهەتگیریدا چۆن (کوفر): بریتییە لەوەی ئینسان مەعریفەت بەدەستبهێنێت، بەڵام خۆی تەتبیق نەکات و دەست بکات بەبەرەنگاربوونەوە لەگەڵیدا. (نیفاق)یش هەرئەوەیە بەبێ کەمترین جیاوازی، بەڵام جیاوازییەك کەلەنێوان(کوفر ونیفاق)دا هەیە لەڕوکنی سێیەمی شەخصییەتی ئینساندایە کە (عەمەلی صالحە)ڕەفتاری چاکەیە! کابرای(کافر) کوفرەکەی سادەیە! کاتێك مەرحەلەی دووەم لەئیمان کە عیبارەتە لەجیهەتگیری مەترەح نەبوو




ئاسایی دەبێت عەمەلی صاڵحیش نەبێت ئەمە كوفرە كەسادە و سالم و ئاسایی، بەڵام (مونافیق) كافرێكە ناڕون و خەتەرناك!! مەعریفەتەكەی بەدەستهێناوە، خۆی تەتبیق نەكردووە لەگەڵ مەعریفەتەكەدا لەجیاتی ئەوەی خۆی تەتبیق بكات و ئەو جیهەتە بگرێت كەمەعریفەتەكەی لێی داواكردووە وە ڕوبەڕوی دەبێتەوە و شەڕ دەكات لەگەڵیدا و حەز دەكات لەناوی ببات و نەهێڵێت جێگیر بێت لەناو خەڵكدا، پاشان لەمەرحەلەی سێیەمدا كەعەمەلی صاڵحە دێت وا ڕەفتار دەكات كە ئیمان بەهەردوو ڕوكنییەوە حاصڵ بووە، واتە فاصیلەی مەرحەلەی یەكەم و مەرحەلەی كۆتای حاصڵ نییە، بەلآم خۆی وایپشان دەداتە كە حاصڵ بووە لەبەرئەوە عەمەلی صاڵحیش نیشان دەدات، بۆیە نیفاق هەر كوفرە واتە مەعریفەت حاصڵ بووە و لایەنگیری دروست نەبووە، بەڵام لە ڕوخساردا وا عەمەل دەكات و خۆی جیا دەكاتەوە لە كوفر و خۆی وایپشان دەدات كە جیهەتگیری كردووە، بەلآم بە گشتی بەپشت بەستن بەم تەعریفگەلە كە بۆ (ئیمان و كوفر و نیفاق) وتمان دەزانین كە ئینسانی(موئمین)، واتە كەسێك كەئەو مەعریفەتە گەورەیەی بۆ حاصڵ بوویێت، هەروەها ئەو جیهەتەی گرتبێت كە ئیقتیزای مەعریفەتەكەیەتی، كاتێكیش ئەم (ئیمانە) ئەرزش پەیدا دەكات كە ڕوكنی سێیەم بوونی هەبێت،كەعەمەلی صاڵحە. جیاوازی ئەم ئینسانەش لەگەڵ (كافر و مونافیق)دا لە ئەساسدا لەئەوەدایە كە ئەم دوای ئەوەی مەعریفەتەكەی بۆ حاصڵ بووە خۆی تەتبیقدەكات لەگەڵیدا، بەلآم ئەوان خۆیان تەتبیق ناكەن و ئەو جیهەتە ناگرن! كافرەكە كاتێك خۆی تەتبیق ناكات لەگەڵ مەعریفەتەكەدا و دەست دەكات بە ڕوبەڕوبونەوەی لە ڕوخسار و كرداریشدا هەر ئەوە دەبینین،

لێرەدا دەبینین دووبارە هاوشێوەییەك لەنێوان (كافر و موئمین)دا هەیە! واتە چۆن (جیهەتگیری و عەمەلی موئمینی كامڵ) موتەناسیب لەگەڵ یەكدا، (جیهەتگیری و عەمەلی كافر) بەهەمانشێوە موتەناسیب لەگەڵ یەكدا، واتە كاتێك جیهەتی خۆی تەتبیق ناكات لەتەك مەعریفەتەكەیدا، ئیتر لە ڕوخساریشدا كرداری باشەش ئەنجام نادات. بەلاَم(مونافیق) نەوەك موئمینە، نەوەك كافر... مەعریفەتەكەی هەیە (كەڕوكنی یەكەمە لە شەخصییەتی ئینسان)دا جیهەتگیرییەكەی نەكردووە كەچی تەماشا دەكەیت عەمەلی موئمینەكەی هەیە!! لەڕوخساردا عەمەلی لە عەمەلی موئمین دەچێت لەكاتێكدا قۆناغی جیاكاری كەسێكی (ئیمان)، یاخود ڕوكنی دووەمی ئیمان، كە بریتییە لە خۆهاوجیهەت كردن لەگەڵ مەعریفەتدا حاصڵ نەبووە، لەوەودواش لە(كافر) دەچێت لەمەداكە جیهەتگیرییەكەی نەكردووە! كابرای(كافر) وەختێك مەعریفەتەكە حاصڵ دەكات دەست دەكاتە شەڕ كردن لەتەكیدا، ئەمیش لەحەقیقەتدا ها لەشەڕدا لەتەكیا، بەلاَم یەت لەمەرحەلەی (سێیەم)دا واخۆی پیشان دەدات كە خۆی تەتبیق كردووە و ئەو جیهەتەی گرتووە، وەلێ درۆیە و واقیعییەتی نییە! ئەگەر وا بێت (كافر) موحتەرەمترە لە مونافیق لەمەدا عەمەلی موتەبیقە لەگەڵ جیهەتگیریدا، وەلێ مونافیق كافرێكە فرە پەست، فرە خەتەرناك بۆ كۆمەڵگە كەلە (ناوەڕۆكدا) دژایەتی مەعریفەتەكەی خۆی دەكات دژی موسوڵمانگەل، دژی ئەوانەن كە مەعریفەتی كامڵ پەیدادەكەن و خۆیان تەتبیقدەكەن لەگەڵ مەعریفەتەكەیاندا، بەلاَم لەڕوخساردا وا خۆی پیشان دەدات كە هاومەصیری لەگەڵ




لەوەندا(موسوڵمانان)دا. ئێستا دوای ئەوەی كە جیاوازی (ئیمان و كوفر و نیفاق)مان زانی جیاوازی (ئیمان و ئیسلام)یش بزانین.

## جیاوازی نێوان ئیمان و ئیسلام:

بەدوو جۆر وشەی(ئیسلام)بەكاردەهێنرێت:

١. یەكێك(ئیسلام) بەمانایی حاصڵ بوونی ئیمان و عەمەل هەردووكیان، مەعنایی كامڵ و موهیمی(ئیسلام) ئەمەیە: واتە هەم (ئیمان)ەكە،هەم (عەمەلی صالّح): واتە سێ ڕوكنی كەماڵی شەخصییەتی ئینسانی هەر سێكیان جەم ببێت، ئینسانێك هەم ئیمانی هەبێت، واتە مەعریفەتی پەیداكرد بێت و جیهەتیگرتبێت لەگەڵ مەعریفەتەكەی خۆیدا و لەوەودواش عەمەلی صالّحیش هەبێت بەمە ئێژن(موسلیم).

٢. بریتییە تەنها لە عەمەلە صالّحەكە،كە دەبێتە خەصڵەتی ئینسانی(مونافیق)، واتە دوای ئەوەی مەعریفەتەكەی حاصڵ بوو جیهەتگیرییەكەی نەكردبێت و خۆی نەخستبێتە سەر ئەو لایەنانەی كە مەعریفەتەكەی داوای لێدەكات. وەلێ وا نمود و حەرەكەت بكات كە وابزانێت والەو جیهەتەدا، هاوجیهەتە لەگەڵ موئمینگەلدا. لەقورئاندا لەم بارەیەوە دەبینین كە باسێك دەكات لەبارەی هەندێك لە(بەدەویگەلەوە) سەران و سەركردەی هۆزە بیابان نشینەكان:

﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾*.

كەمەبەست ئەمەیە ئائەم مانا تایبەتە لە ئیسلام، واتە هەر عەینی خەصلەتی كابرای مونافیقەكەیە، لە ڕوخساردا تەسلیم بووە لەبەرچاوی ئینسانی موسڵمانەوە لە موسوڵمان دەچێت(لە موسڵمانە واقیعییەكە)، بەڵام قۆناغی ناوەڕاستی شەخصییەتی تاكی موسوڵمانی تێدا نییە،كە بریتییە لە جیهەتگیری.
ئەگەر وابێت بەشێوەیەكی گشتی دوو دانە مانامان بۆ (موسلیم) هەیە، هەروا كە ئیسلام دوو مانایی هەیە.
موسلیم بەمانا كامڵەكەی كەسێكە كە ئیمان و عەمەلە صالحەكەی تێدا كۆبێتەوە. مانا ناقص و ڕوخسارییەكەی: بریتییە لەوەی لە باسی مونافیقدا وتمان،مەرحەلەی دووەمی ئیمانی تێدا نییە ئەوەی كە قورئان دەفەرمێت ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ بەئیعتباری فەصڵە شەخصە موشەخەصەكەیە، بە ئیعتیباری ڕوكنە دووەمەكەیە، كە جیهەتگیرییە. ئەصڵی مەعریفەتەكەی بۆ حاصڵ بووە، بەلاّم هیچ خۆی تەتبیق نەكردووە لەگەڵیدا ئەو جیهەتە ناگرێ كەدەبێت موتەبیق بێت لەتەك مەعریفەتەكەی خۆیدا، بەزاهیر وا خۆی پیشان دەدات لەسەر ئەو جیهەتەیە..

---

*) {قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }الحجرات ١٤

## لەدەرەوەی (موئمین و کافر و مونافیق)!

جالێرەدا یەك مەسەلەی فەرعی ئیزافە بکەم، (موئمین)مان ناسی، (کافرمان)ناسی، (مونافیقمان)ناسی، جا ئینسانگەلێك هەن کە داغڵی هیچکام لەم بازنانە نابن! ئەویش ئەو کەسانەن کەخەصڵەتی ئەوەڵ ئەصڵەن لەواندا دروست نەبووە کە بریتییە لە(مەعریفە)کە، چونکە دەزانین خەصڵەتی دووەم لە ئیماندا شوێنکەوتەی خەصڵەتی یەکەمە، هەروەها خەصڵەتی سێیەمیش بە خەصڵەتی یەکەم و دووەمەوە ئەرزش پەیدا دەکات، واتە(عەمەلی صالح). کاتێك خەصڵەتی یەکەم و دووەم بوو پاشان ئینسان پێی دەڵێن(موسوڵمان) بەعەمەلێکی صالح کەئەنجامی دەدات، ئەگەرنا خەصڵەتی دووەم نەبوو عەمەلی صالح لەجیاتی ئەوەی پەسەند بێت کارێکی پووچ و نەفرینکراوە. جا زۆرترین خەڵکی کەسانێکن کە ئەصڵی(مەعریفە)تییان بۆ حاصڵ نەبووە لە سورەتی(فاتحە)دا. سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئاگاداربوون لە سێ جۆرە گروپ لە ئینسانگەل:

- ﴿أنعَمتَ عَلَيهِمْ﴾
- ﴿المَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾
- ﴿الضَّالِّينَ﴾

﴿أنعَمتَ عَلَيهِمْ﴾: ئینسانگەلێکن کە لەدوای ئەوەی مەعریفەتییان بۆ حاصڵ دەبێت و جیهەت دەگرن لەگەڵ مەعریفەتەکەی خۆیاندا و هاو مەصیر دەبن، لەگەڵ مەعریفەتەکەیاندا و پاشان کردەوەکانیشیان موتەبیق دەکەن لەگەڵ جیهەتەکەی خۆیاندا ئەمانە﴿المَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾ن، واتە موسلیم بە مانا

ئەوەڵییەکەی، بەمانا کاملەکەی مانای زاهیر و باطنی موسلیم چی بوو؟ ﴿أنعَمتَ عَلَيهِمْ﴾، واتە ئەوانە.

﴿المَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾: کافرین و مونافیقینن، کەسانێکن کەکاتێك مەعریفەتیان بۆ حاصڵ دەبێت خۆیان تەتبیق ناکەن لەگەڵ مەعریفەتەکەیاندا، ئیتر کەیفی خۆیەتی کردارەکانی لە ڕوخساردا چاك پیشان بدات یان پیشانی نەدات، لەحەقیقەتدا(مونافیق و کافر)ئەرزشی مەنفییەکەیان لەمەدایە کە خۆیان هاوجیهەت ناکەن لەگەڵ مەعریفەتەکەیاندا، ئیتر ئەمە عەمەلێکی زاهیری هەبێت یان نەیبێت هیچ ئەرزشێك ناداتە خاوە نەکەی، واتە کافر ئەگەر کوفرەکەی پێچیدە و مەلموس بکات و سەر لەموسوڵمانگەل بشێوێنێت بەمە کەبێت ئەعمالی ئینسانی موسوڵمان ئەنجام بدات واقیعیەتی ئەوەیە کەکافرییەتەکەی ناگۆڕێت هەر ئەو دوژمنەیە و هەر ئەو شەڕەیە کەلەکۆمەڵگەدا بوونی هەیە، هەتا میقدارێك ترسناکتریش!

گروپی سێیەم، کەسانێکن ئەصڵەن مەعریفەتیان بۆ حاصڵ نەبووە! کە﴿الضَّالِّينَ﴾.

{جا ئێستا با کەمێك ڕونکردنەوەی تربدەم دەربارەی ئەوەی} (یأیها الذین آمنوا)لە قورئاندا هاتووە، بەڵام (یأیها الذین آسلموا) نەهاتووە؟هۆکاری ئەمە چییە؟ بەشێوەیەکی گشتی کاتێك خیتاب دەکرێت لەموسوڵمانگەل بۆئەوە خیطابیان لێ دەکرێت کە موتەعەهید بن بۆ عەمەلکردن، وتیشمان (ئیمان) واتە کۆبونەوەی( مەعریفەت و جیهەت)هەر دووکی بەیەکەوە، ئەوەی کەدەمێنێتەوە بریتییە لە(عەمەل) کردن، بۆیە دوای ئەوەی کە(ئیمان) هەبوو ئەوەی کە هەیە ئەمەیە کەڕێگە و ڕەوشتی ڕاست و دروستی عەمەلیان پێ





پیشان بدرێت، بەڵام ئەی لەبارەی (ئیسلام)ەوە؟ ئیسلام وتمان دوو مانای هەیە یەكێكیان: بریتیی بوو لە مانای كۆبونەوەی(ئیمان و عەمەلی صالح). ئەویتریان تەنها: بریتیی بوو لە عەمەلی صالحی ڕواڵەتی،ئەوەی كە مەنافیقینە هەیانە،عەمەلی صالحیان هەیە، بەڵام لەوەولا ئیمان كە بەشە دووەمەكەی جیهەتگیرییە دروست نەبووە.

جا ئەگەر(خیتاب) لەموسوڵمانان بكرێت (يأيها الذين اسلموا) لەمانای ئیسلامدا، واتە(ئیمان)و عەمەلی صالح گشتی كۆیە ئیتر چی بەرنامەیەكی پێ بوترێت و چی فێر بكرێت؟ ئەگەر ئیسلام بەمانا دووەمەكەشە، واتە تەنها عەمەلی صالحەكە هەیە، بەڵام جیهەتی نییە دەی ئەمەش ئەرزشی نییە تا خیطابی لێ بكرێت، لەئیماندا ئەو دوو بنەما ئەوەڵییە هەیە تەنها عەمەلە صالحەكە ماوە، قورئانیش وردەوردە پەروەردە كردنی ئینسان و كۆمەڵگە دەباتە پێشەوە. دوای ئەوەی كە ئینسانگەل سالم و دروست ئیمانیان دامەزراوە ئا ئەو دوو ڕوكنە ئەساسییە موهیمە بۆ شەخصییەتی ئینسانی لە بوونیاندا دامەزراوە. چییان دەمێنێت بۆ ئەوەی ببنە ئینسانێكی كامڵ هەرلەبەرەوە بەرنامەگەلی عەمەلییان مورەتەب ببێت، تەعەهوداتی ئەخلاقییان كە بنەمای عەمەلە ڕابتەی موستەقیم بەشێوەیەكی ئاسایی لەنێوان ئەخلاق و عەمەلدا هەیە كەلەدوای ئەو دوو مەرحەلە مەترەحە، ئەوەی لەباسی (ئیمان و ئیسلام)دا وتمان یان جیاوازییەكانی (ئیمان وكوفر و نیفاق) مەبەستمان بەیانی ڕەوشتی تەربییەتی ئیسلامی نەبوو،مەبەستمان نوكتەگەلی بەرجەستە بوو لەتەشكیلی شەخصییەتی ئینساندا، ئەگینا كاتێك باس لەڕەوشتی تەربییەتی بكرێت لەسەرەتادا مەرحەلەی ئەوەڵی عەقیدەیە، لەوەودوا تەرزی

تەفەكورە، لەوەودوا ئەخلاقە بەئاوات و ئارەزووی ئینسانەوە كە موتەناسیب دەرتێ لەتەك ئەخلاقیدا، لەپاشاندا عەمەلە كە ئەمە باسێكی ترە*...

لێرەدا كاتێك دەڵێین عەمەلی صاڵح بەمەستمان بەئەخلاقەكەوەیە و ئەخلاقی لەگەڵدایە، عەمەلی صاڵح دەبێت پشتیوانی ئەخلاقی لەگەڵدا بێت ئەمە خصوصییەت و خەصڵەتگەلێك لەڕەوانی ئینساندا كە ببێتە هۆكاری ئەوەی بەو جۆرە ڕەفتار بكات. هەر كاتێك خیطاب دەكرییەت لەموسوڵمانگەل ئەوانەی كە دوو ڕوكنی ئەوەڵی شەخصییەتیان دامەزراوە بۆئەوەی خیطابیان لێ دەكرێت ئامادەبكرێت بۆ عەمەلی صاڵح بەپشتیوانە ئەخلاقییەكەوە. بینا لەسەر ئەمە ئاساییە كەدەبێت بە ئیمان خیطابیان لێ بكرێت نەك بەئیسلام. بەڵام(یأیها المؤمنون)ە ناوێژرێت و (یأیها الذین آمنوا) ئەوێژرێت؟ ئەوە نوكتەیەكی زۆری تێدایە كە لە(زانستی بەلاغ)ەدا باسی لێوەكراوە، جیاوازی چییە لەنێوان(یأیها المؤمنون) تا(یأیها الذین آمنوا)؟

كەلیمەی(المؤمنون) تەقریبەن مانایەكی ستاندارد و وشك و بێحاڵ دەگەیەنێت حەرەكەت و حاڵەت و فعل و ئینفعالی تێدا دیار نییە، (ئیسم) (مەعنا) بەو جۆرەیە. (ئیسم) دەلالەت دەكات لەسەر مەعنایەك دامەزراو، بەڵام(فعل) دەلالەت دەكات لەسەر حدوس(ڕووداو) لەسەر مانای (حەدەسییەت): واتە لەكەلیمەی فعلدا حاڵەتێكی حەرەكەت و جوجوڵی مەعنا مەصدەرییەكە هەیە، لەكاتێكدا لە(ئیسم)دا نییە. جا كاتێك بوترێت(یأیها المؤمنون) ئەو مەعنایەی كە ئیمانەكە حاڵەتی فیعلییەت و حەرەكەت و تەكانی تێدایە(نییە)

---

*) بۆ زیاتر شارەزابوون باسی (پەروەردە و فێركردن) بخوێنەرەوە.

نایگەیەنێت، بەلاّم کاتێك ئەوێژی(یأیها الذین آمنوا) کەسانێکە کە ئیمانیان هێناوە. یا لەکوردیدا ئێمە بەغایب نایلێین، بەمخاطب لەفارسی ئەمانا ئێژن(ئیمانتان هاوردووە) لەعەرەبیدا ناوێژرێت(یأیها الذین آمنتم) (یأیها الذین آمنوا)، چونکە (الذین) ضمیری غایبی بۆ دەوێژرێت، بەلاّم لەفارسی و کوردیدا دەڵێن(ئەی کەسگەلێك ئیمانتان هێناوە)جالەکاتێکدا دەوێژرێت(کەسانێك کە ئیمانتان هاوردووە) بەشێوەیەکی فعلی دەوترێت، یەکەم/ لەسەرەتادا خودی کەسەکە بە(ایُهالذین) دەناسرێت و جیادەکرێتەوە بەناونیشانی مەوجودێك لەدەرەوە، لەوەودوا صیفاتی ئیمانەکە ئیزافە دەکرێت بۆیان، حاڵەتێك مەوصوفێك و صیفەتێك جیا لەیەك هەیە، کەئەمە لە(المؤمنون) دا نییە. بەلّیّ (المؤمنوا) واتایی مەوصوف وصیفەتی تێدایە، چونکە (وەصفی موشتەق)دەلالەت لەسەر زاتێك و صیفەتێك دەکات، بەلاّم بەگشتی هەردووکیان لەیەك کەلیمەدا کۆیە. بەلاّم لە(ایهالذین آمنوا) لە(ایهالذین)ەدا مەوصوفەکان ئەشخاصەکان دەهێننە نەزەر. (آمنوا) صیفەتە موشخەصەکەیانە، بۆیە ئەمە یەك ئیمتیازی گەورە لەنێوان(ایهالذین آمنوا) تا(المؤمنون) دا،لەوەودوا ئەوەش کەباسمکرد کاتێك(امنوا) دەوترێت حاڵەتێکی فیعلییەت و حدوسی و حەرەکەت و تەعەهودی تێدایە، ئەگەر وابێت بۆ ئەمە کەڕێگەیان پیّ نیشان بدەیت کەڕێگەی عەمەلی ئێوە چۆنە، خیطابییان لیّ بکەیت(یأیها الذین آمنوا) فرە ڕاچڵەکێنەترە و تەعەهودەکەیان دەهێنێتەوە بیریان. ئەوە کە خۆیان ڕایانگەیاندووە دێنێتەوە بیریان و پێیان دەڵێت(ڕاتان گەیاندووە کە ئیمانتان هێناوە)، بەلاّم کاتێك کە( یایها الذین مؤمنوا) دەوترێت نە ئەم حاڵەتی حدوس و جەرەیان و موتەحەریکی

تەعەهودە دەگەیەنێت، نە باسی(مەوصوف و صیفەت) ناگەیەنێت. هەروەها نوكتەیەكی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە كە بۆیە (یایهالـڑین امنـوا)ی وتـووە، چونكە ئەم مانایە دەدات، كە "تۆ خاوەنی ئیرادەیت و بە ئیرادە و تەحقیق و گەڕانی خۆت ئیمانت هێناوە نەك ئەوەی خانەوادە و ئابادو ئەژدادەوە بۆت مابێتەوە!". جا لە عورفی گشتی ئێمەدا ئەو ئیمانەی كە كەسێك بە تەقلید و ویراسەت لە خانەوەدەیەوە وەریدەی گرێت ئێمە پێی دەڵێین ئیمان، بەڵام (یایها المؤمنون) ئەم جۆرە موئمینینیشە دەگرێتەوە كە خەصڵەتی ئیمانەكە شتێك نییە كە لەوەو دوا حادس و عارز بووبێت بە تەحقیق و زەحمەتی خۆیانەوە، بەڵكو ئەوانەش كە ئیمانە ئیرسییەكەیان هەیە هەر موئمینیان پێدەگوترێت، بەڵام كاتێك (یایهالذین امنوا) بوترێت مەوصوفەكان لەوەودوا صیفەتی ئمانیان بۆ عارزبووبێت مانای ئیمانی تەحقیقی دەگەیەنێت. جا ئەمە نوكتەیەكی زۆر جالبە، بەڵام ئەمە بە پێوەری عورفی ئێمە ئیمان بەو ئیمانە تەقلیدییە دەڵێین و موئمین بە ئینسانێك دەڵێن كە لەڕووی تەقلیدەوە لەخانەوەدە و كۆمەڵگەوە دەستی كەوتووە، ئەمە ڕاستە، بەڵام لە ئیصتلاحی قورئانیدا وانییە!! لە ئیصتلاحی قورئانیدا ئیمان بە مەعریفەتی تەقلیدی ناوترێت! مەعریفەت مانای تەقلید ناگەیەنێت، مەعریفەت و ناسینێكە ئیجتهاد و تەحقیقی، لە مەوریدی مەعریفەدا دەبێت هەموو كەسێك خاوەنی بیروبۆچون و ئیجتهاد بێت و لەڕووی ئەدیلەیەكەوە ئەو مەعریفەیەی وەرگرتبێت كە هیچ شك و ئیبهامێكی لێی نەبێت نەك لەبەرئەوەی فلانە كەس وتوویەتی و ئیعتمادم پێیەتی بۆیە قبوڵی دەكەم!! چونكە جیاوازی ئیجتهاد و تەقلید ئەوەیە. لە ئیجتهاددا ئینسان خۆی دەلیلی هەیە بۆئەوەی

شتێك قبوڵبکات، بەلاّم لە تەقلیددا دەلیلی نییە و دەڵێت فلاّنە کەس وایوتووە. ئا ئەو جۆرە ئیمانە ئیرسییە، کە چونکە خانەوادەی موسوڵمان بووە، یان فلاّنەکەس وای وتووە، لە عورفی ئێمەدا کەسێك ئەو جۆرە ئیمانەی هەبێت پێی دەڵێن (موئمین)، بەلاّم لە قورئاندا پێی ناڵێت (موئمین)!!، چونکە لە قورئاندا بە کەسێك دەگوترێت (موئمین)، کە ئیمانی لە ڕێگەی مەعریفە و ناسین و دەرك و دەلیلێکەوە وەریگرتبێت کە خۆی تەحقیقی کردبێت.

## چەمکی (ئیمان) لەنێوان لێکدانەوەی(قورئان) و لێکدانەوەی زانستی کەلام و فەیلەسوفاندا:

ئێمە لە قورئاندا دەبینین کە باس لە کەم و زیادی ئیمان دەکرێت، چەند دەفعە باسی لێکراوە، بەلاّم عیلمی کەلام دەڵێت: ئیمان قابیلی کەم و زیادی نییە، زۆربەی فەیلەسوفان نەزەریان وابووە. هۆکاری ئەمە چییە؟ ئەساسی ئەم جیاوازییە لە شناسینی ئیماندا کە لەقورئاندا بەکەم و زیادی ئیمان حوکم دەکات، بەلاّم فەلسەفە وا تەصەور دەکات قابیلی کەم و زیادی نییە لەچییەوەیە؟

ئەساسی هەڵەکە لەمەوەیە کە ئیمانیان بەتەنها مەعریفەتەکە زانیوە، هەرچی تەعریفیان کردووە فەلاسیفە، چی ئیسلامی، چی غەیری ئیسلامی لەبارەی(ئیمانەوە) هەر ئەو ڕوکنە ئەوەڵەی لەبارەی ئیمانەوە وتومانە بۆیان تەصەور کراوە، وەلەوەودوا کاتێك سەرنج دەدەیت بەحسگەلیان لەبارەی ئیمان و کوفر و نیفاقەوە واقیعەن پەرێشانە! مەسەلەن ئەگەر ئیمان بریتیی بێت لە(مەعریفەت)، ئەوە کوفر واتە نەبوونی ئەو(مەعریفەت)ە. لەکاتێکدا

ئەمە وانییە! لەكاتێكدا موكەرەر لە قورئاندا دەبینیت ئەوانە وا ئەهلی(كوفرن)، وەك موسوڵمانەكان مەعریفەتیان هەیە هەتا وەك چۆن منداڵی خۆیان دەناسن بەو جۆرە ئەم(محمد)ە(ﷺ)، ئەم ڕسالەتەی دەناسن و ڕۆشنە لەلایان، لە قورئاندا جۆرەها دەربڕینی لەو شێوەیەمان هەیە، كافرین چ لە(بت) پەرستگەل، چ لەئەهلی دیانەتگەل، چونكە ئاخر ئەوە وا تابعی حەق نییە، واتە (كاتێك حەقی ناسی قبوڵی ناكات) ئەوە پێی ئێژن(كافر)، بەڵام كاتێك حەقی نەناسیوە و دوایشی ناكەوێت، پێی ناڵێن(كافر) هەر وەك ئەو تەعبیرەی وا وتمان پێیان دەڵێن ﴿الضالين﴾، بۆیە هەم ئەهلی كیتاب و هەم موشركین هەندێكیان(كافرن)، هەندێكیان كافر نین، بەڵكو فەقەد (گومڕان) ئەم كەسری دەركە لەبابەتی ئیماندا و باش حاڵی نەبوون لە ئیمان و كورتكردنەوەی ئیمان تەنها لەڕوكنی ئەوەڵدا كە(مەعریفەتە). بۆتە هۆكاری ئەوەی كە وا تەصەور بكەین ئیمان كەم و زیاد ناكات. بەڵێ ئەگەر تەنها عیبارەت بێت لە مەعریفەت و ناسین، ئەو جۆرە كەم و زیادە كەلەباسی پێوەرگەلی تردا كەتەنها مەعریفەت و ناسین نییە حاصڵ دەبێت بۆ ئیمان حاصڵ نابێت، لەوانەیە بەدەربڕینی دیكە بەكاربرێت. وەك (ڕونی و ناڕونی) نەك كەمی و زیادی، لەمەوردی یەك شتی دیاریكراودا كەمی و زیادی بۆ تەنها مەعریفەت و ناسینەكە فرە زەریف نییە بەكاربرێت، بەڵام ڕونی و ناڕونی، كامڵی و ناكامڵی ،مەعریفەت و ناسین بەكاردەبرییەت، چونكە ئیمانیان هەر بە ئەصڵی مەعریفەت و ناسینەكە زانیوە ئالەبەرئەوە وتویانە كەم وزیاد ناكات،جائەمەش هەڵەیە.

لیمان هەم ئەو مەعریفەتەیە و هەم ئەو جیهەتگیری و تـەتبیق كردنـەی خـودە لەگـەڵ مەعریفەتەكـەدا. ئـەوە كـە مـەعنای كـەم و زیـادی ئیمانـە ئائـەم جیهەتگیرییە! چـەنێك كـابرا خـۆی تـەتبیق بكـات لەگـەڵ مەعریفەتەكەیـدا كەئەوە فەوقەلعادە بابـەتێكی تایبەتـە و ناكرێـت ئینـسان تەشـریحی بكـات و بلێت، بۆچی كەسێك خۆی تەتبیق دەكات و كەسێك خۆی تـەتبیق ناكـات؟ یان كەسێك كەمتر خۆی تەتبیق دەكـات و كەسـێك فرەتـر؟ یـانی دەكرێـت بلێین، وەلێ ناتوانین تەواوی دەلیلگەل و تەواوی لایەنە جیاوازەكانی ئەم باسە هەمووی بخەینـە دەرەوە! لـەوانەیـە بـەژمارەی جیـاوازی مرۆڤـەكان دەلیلـی جیاواز بوونی هەبێت. چەند دانە ئینسانمان هەیە ئەوەندە شێوازی جیاوازمـان هەیە بۆ عیللـەتی خۆ تەتبیق كردن یـان نـەكردنی كەسـەكان، چـونكە ئەمـە پەیوەندی بەحاڵـەتی جیاوازی ڕەوانی ئینـسانەوە هەیـە. چ ئاگـا و چ نائاگـا. هەرگیز تۆ دوو دانە ئینسان نادۆزیتەوە تەواوی ڕەوان و ویژدانیان وەك یـەك بێت ئیمكانی نییە دوو دانە ئینسان كامڵەن وەك یەك وابن! بۆیە دەبینیت كـە هەنـدێك دەلیـل هەیـە بـۆ ئەمـە كەسـێك خـۆی تـەتبیق ناكـات لەگـەڵ مەعریفەتەكەیدا، وەك(جاه و جەلالـەكەی) لـەلا خۆشەویـستترە، ئەهەمییـەت زۆرتر بەماڵ و مقامەكەی دەدات، غەرەز گرتویەتی كەوتۆتە لایەنی ئینكاری، ناتوانێت لـەو ئەشرافییەت و ئیمتیازات و خۆشگوزەرانیانەی كە هەیـەتی بێتـە خوارەوە و بەو جۆرە كەلـە(سـورەتە مەكییەكانـدا) دەبیـنین حەملەگـەل لـە بـواری كوفـارا موتـەوەجهی ئائـەم خەصـڵەتگەلی غـرور و ئیـستكبار و خۆشـــگوزەرانی و ..ئەمانەیـــە. بەشـــێوەیەكی ئاســـایی زیـــاتر ئائـــەم خەصڵەتگەلـەیەلە خەصڵەتەكانی كـوفر نیـشان دەدریـەت، چـونكە ئەمانـە

دەلیلگەلی بەرجەستە و گرنگن، نەك ئەوەی هەر ئەمەبێت، بەهەرحاڵ دوو مەرحەلەئەم پەڕوو ئەو پەڕ هەیە، (ئیمان) لە ئەوجدا: واتە تەواو خۆ تەسلیم كردن. (كوفر): واتە تەواو لەبەرامبەرییەوە وەستان، وەلەبەینی ئیمانی كامڵ و كوفردا، مەراحیلی موختەلیفی ئیمان هەیە، كەكەم و زیادی ئیمان ئابەو لیسبەتەیە، بەنیسبەتی ئەو جیهەتگرتنەوەیە، ئاوات و ئارەزووگەل گشتی ڕام بكەیت بە موقتەزایی مەعریفەتەكەی خۆت جیهەتیان پێ بدەیت، تەواوی ویژدان و دەرون و هەرچی شتێك خاڵی بەهێز كردنی شەخصییەتی تۆیە گشتی بهێنیت تەتبیقی بكەیت لەگەڵ مەعریفەتەكەی خۆتدا و نەیەڵێت دایەكی سەرەمویەك خلافی مەعریفەتەكەی خۆت لابدات ئەو كاتە دەبێتە ئیمانی كامڵ، هەرچی لەوە خوارتر بێت ئیمانەكە ناقصە.

جا لێرەدا دەردەكەوێت كە بۆچە میقیاسی ئێمە بۆ كاملّی ئیمان عیبارەتە لەعەمەلی صاڵحی! چونكە وەك وتمان (ئیمان) بەتەنها مەعریفەتەكە ناوترێت، بەڵكو مەعریفەتەكە بەئیزافەی تەتبیق كردن لەگەڵ جیهەتگیرییەكەدا، (عەمەڵگراییە محض)(كرداری ئەبستراكت) كوێر و كەڕ و بێ مەنتیقە! لە(عەمەڵگرایی محض) (كرداری ئەبستراكت) دا. لەفەهمی پراگماتیسیدا ئەوەی كە ئینسانێك ئەنجامی دەدات و حەیوانێك ئەنجامی دەدات هیچ فەرقی نییە، چونكە تەركیز لەژێر بینا و لایەنی دەرونی كارەكە ناكات و تەنها ڕواڵەتەكە دەگرێتە نەزەر، بەڵام عەمەلێك كەلەدیندا مەترەحە لەڕاستیشدا ئەوەندە ئەرزشی هەیە بەو جۆرە ئێوە ئێژنی دەكرێتە میقیاس بۆ كەم و زیادی ئیمان ئەو عەمەلە بەتەنها خۆی قابیلی ئەرزش نییە، چونكە دەزانن وتمان بەكابرای موونافیق دەوترێت موسلیم كە خۆی بە ئیسلامی پیشانداوە وەك




قورئان دەفەرموێت ﴿قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾، بەلاَم ئایا ئەو عەمەلەی ئەرزشی هەیە لە ئیسلامدا؟ نەء...غەیری خوسران و لەکیس چوون هیچێکی تر نییە، لە ئیسلامدا لەیەك عیبارەتی کۆتادا لەلایەکی ترەوە ئەزیادی عەمەل کراوە کەئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت(انما اعمالوا بالنیات) نیەت چییە؟

نیەت: مەحصولّی تەتبیق کردنی شەخصییەت و جیهەتگرتنە لەگەڵ موقتەزایی مەعریفەتدا، واتە کاتێك ئینسان خۆی تەتبیق کرد لەتەك مەعریفەتەکەیدا، یان تەتبیقی نەکرد نیەت بە ئیقتزایی ئەوە حاصڵ دەبێت. تەصمیمی قاتعانە و ئاگاهانەی ئینسان بۆ عەمەل ئەگەر دروست بێت، واتە ئەوەکە خۆی تەواو تەسلیم کردووە بەمەعریفەتەکەی و خستویەتییە سەر ئەو جیهەتە، ئەگەر نادروست بێت واتە خۆی تەتبیق نەکردووە، عەمەڵی ئینسانی موئمین لە میقیاسی ئیسلامدا واقیعەن عەمەلی ئینسانە، واتە ئینسانێك لە دەرونی خۆی لە فکر و مەعریفەتی خۆی و تەصمیمی خۆی دەستور دەگرێت و کار دەکات، بەلاَم عەمەلی عەمەڵگرایانە و عەمەلی پراگماتیستی عەمەلی حەیوانە، عەمەلێکە کە مەبناکەی لە ویژدان و دەرونی خۆیەوە نییە یان بەدەربڕینێکی تر،عەمەلی ئینسانی قانونییە!! حەیوانێك کار ئەنجام دەدات موهیم و ئەرزشدارە بۆمان، هەتا ماشین کە هیچ ئیرادەیەکی نییە، موهیم و ئەرزشدارە جائەم جۆرە عەمەلە دورە لە شەئنی ئینسان، ئینسان لە نەزەری ئیسلامدا فەوقەلعادە موتەعالیتر و بانترە لەوە کە عەمەلی بەمیقیاسی عەمەلی ماشینێك، یان حەیوانێك بناسرییەت کە ڕواڵەتەکەی هەیە و مەبناکەی نییە. ئیسلام عەمەلێکی گەرەکە لەئینسان کە بەحەدێك دەرهاویشتەی ویژدان و دەرونی و مەعریفەت و تەصمیمی خۆی بێت، کە بدەیتە تەوقی سەریدا بێژی

مەیکە هەربیکات! گیانی فیدا بکات بۆئەو عەمەل و بەرنامەی خۆیە ئالەو وەختەدا ئینسان ئەرزش پەیدا دەکات و عەمەلیشی ئەرزش پەیدا دەکات، وەلێ لەڕوانگەی ئەو عەمەڵگرایانەدا ئینسان پەست و بێ ئەرزشەو عەمەلیشی هەرچی بوێت ئەگەر لەیەك لەحزەدا کاری هەزار دانەماشینی کارخانەگەلی گەورە گەورە ئەنجام بدات واقیعەن لەم میقیاسەدا هەر بێ ئەرزش و پەستە. بەڵێ ئیمان بە میقیاس ئصولێ و میزانی ئیسلامی یانی ئائەو جۆرە لە مەعریفەت بەو ئصوڵە وا ڕوون کرایەوە، ئەگەرنا لە مقیاسی مەکتەبی خودی ئیسلام بەو لاوە هەرجۆرێك مەعریفەتێك کەئینسان خۆی تەتبیق بکات لەتەك مەعریفەتەکەیدا هەر پێی ئەوترێت ئیمان. واتە یەك نەفەر(ماتریالیست) چ جۆرە مەعریفەتێکی هەیە نیسبەت بە (کولی هەستی) سەرفی نەزەر لەوەی کەڕاستە یان هەڵەیە، موسەلەمەن دیدی ماتریالیستی ئەگەر دەقیقەن لێیبکۆڵیتەوە سەرئەنجامەکەی دەبێتە هیچ! وە هیچ بەکاری ئەوە ناخوات کە ببێتە مەبنە بۆ (ئیمان) ئەوە هیچ کارمان پێی نییە! ئەگەر ئەو مەعریفەتە کەهەیەتی موتەعەهید بێت پێیەوە، و موخلیصانە و بێ غەل و غەش خۆی تەتبیق بکات لەگەڵ ئەوەی لێی داواکراوە پێی ئێژن(ئیمان) و بەو جۆرەش کەوتمان(کوفر) بەحاصڵ بوونی ئەو مەعریفەتەخاصە ئیسلامییە و لەوەوەودوا خۆ تەتبیق نەکردن پێی، نەك ئەوەی ئەگەر ئینسان مەعریفەتی تری بوو غەیری مەعریفەتی ئیسلامی پێی بێژین(کوفر).نا!!.. ئەو جۆرە مەعریفەتە واهەیەتی کە خلافی مەعریفەتی ئیسلامییە و لەبەرەوە ناکەوێتە سەر ڕێگەی ئیسلام ئەوە نابێتە (کوفر)، خەصڵەتی ئەو ئینسانە (تاریکی) و سەر لێشێواوییە، ڕێگەی لێ ون بووە، وتیشمان(ضالین) غەیری ﴿الْمَغضُوبِ

علَيهِمْ﴾ن، یانی موستەحەقی عقوبەت و موجازات و نفرینی ئاخرەت و دونیا لین، بۆیە لێیان قبوڵە!

جالێرەدا ئەوەش بڵێم مەسەلەی(ئەرزیابی ئینسان) بەئیعتباری(ئیمان) شتێكە و مەسەلەی عەمەل شتێكی ترە. ئصوڵەن لەعەمەلدا موسلیم و غەیر موسلیم فەرق ناكات، كۆمەڵگە ڕێكخستنێكی گەرەكە، میقیاس گەلێكی گەرەكە كە دەبێت دابمەزرێت، كاتێك ئیسلام حاكمە بەسەر كۆمەڵگەیەكدا بۆ سەتحی كۆمەڵگە ئەو قانون و ڕێكخستنەی گەرەكە، بەلام بۆ داغلی كۆمەڵگەیەكی غەیرە ئیسلامی لە مەحدودەی خۆیدا(خودموختاری) پێدەدات، واتە ئەگەر جەماعەتی ماتریالیستی گەرەكیان بوێت خۆیان بە سورەتی جامعەیەكی بچوك لەناو جامعەی گەورەی ئیسلامیدا كار بكەن، شتگەلێك كە بۆ خۆیان و تبقی عەقیدەی خۆیان بەئازادی دەزانن نیسبەت بەخۆیان دەیانەوێت ئەنجامی بدەن ئیسلام مانعیان نابێت هەر وەك مەسەلەن كۆمەڵگەی یەهودییەت، كۆمەڵگەی مەسیحییەت، ئیسلام خود موختاری داخلییان پێدەدات، بەلام نیسبەت بە سەتحی كۆمەڵگە فەرق ناكات، مەتریالیستێك و موسوڵمانێك یەك مەسئولییەتیان هەیە بۆ تەواوی كۆمەڵگە. چۆن لەموسوڵمانێك قبوڵ ناكرێت خیانەت بكات و زەرەر بگەیەنێتە كۆمەڵگە و دەسیسەگەلێك فەراهەم بكات كە ببێتە هۆكار بۆ ئازاردانی خەڵكی و دروست كردنی كوشتن و كوشتار و زەرەری گیانی و ماڵی بۆ خەڵك دروست بكات لەیەك نەفەر ماتریالیستیش قبوڵ ناكرێت كە بێژێت عەقیدەكەی من بەوجۆرەیە، عەقیدەكەی تۆ وایە لەسنوری دیاریكراوی خۆتدا بەو جۆرەیە، نەك نیسبەت بە تەواوی كۆمەڵگە....ئەو ئێژێ "عەقیدەی من وایە كە(هەدەف) وەسیلە




ئاراستە دەكات هەر وەسیلەیەك بێت"...كڵاو بنێتە سەری مەردم،كوشت و كوشتار لەناو مەردمدا دروست بكەیت و خیانەتێك بەرپا بكەیت كەماڵی مەردم وێران بێت و بەهەزاران منداڵ هەتیو بكەوێت بەموباحی دەزانێت و بینا لەسەر ئەوە دەیكەیت ئەمەیی لێ قبوڵ ناكرێت، چونكە ئیتر ئەمە مەسەلەی (بەرپرسیارێتی كۆمەڵایەتییە) عەقیدەی ئازادە، واتە بەشێوەیەكی ئاسایی ئێمە دوو قۆناغ تەكلیفمان نیسبەت بەغەیری موسوڵمان بۆ مەترەحە:

١. مەرحەلە لە حدودی عەقیدە و ئایدۆلۆژیا، عەقیدەی ئازادە، ئایدۆلۆژیای ئازادە. لەكۆمەڵگەی خۆیی و لەسەر ئاستی كۆمەڵگەی ئێمەش دەتوانێت عەقیدەی خۆی بڵێت و باسی بكات و تەوجیهی بكات و تەبلیغی بكات. موتڵەقەن ئازادی ئازادە، تەنها بەشەرتێك صادقانە عەقیدەی خۆی بێژێت.

٢. لەڕووی كردەوەوە: لەڕووی كردەوەوە، ئەگەر بۆ كۆمەڵگەی خۆی بێت خۆی سنوری خۆی دیاری بكات و بەرنامە و تەعەهودادتی خۆی دیاری بكات و گەرەكی بێت بەشێوەی یەك كۆمەڵگەی بچكۆلە و جودی هەبێت ئازادە بۆ خۆی بەناونیشانی(خود موختاری)، بەڵام لەسەر ئاستی كۆمەڵگە هیچ ئازاد نییە، هەر كارێك، هەر بەرنامەیەك كە زەرەری هەیە بۆ كۆمەڵگە ئەنجامی بدات. جا حەزەكات لەو كۆمەڵگە سنوردارەی خۆیدا (مەشوربخانە) و هەر شتێك خۆی دەیەوێت دایی بنێت و بیكات، هیچ ئیشكالێكی نییە بەشەرتێك ئیعلانی مەوجودییەتی خۆی بەناونیشانی كۆمەڵگەیەك بكات، ئەوە وا تبقی مەكتەبەكەی خۆیەتی پێی ئێژن(زمی)،واتە (هەڵبەتە زۆرینە وایانزانیووە(زمنی)، واتە ئەهلی)، نا....

زمی ئـەهلی كیتـاب نیيـە، (زمـی): واتـە كەسـێك كـە تەعـەهودات و بەرنامەی خۆی ئیعلان بكات. ئێژێت(من ئائەمەم). چ ئەهلی كتاب بێت، یان غەیری ئەهلی كتاب بێت، بەگشتی كاتێك ژمارەیەك لـە ئینسـانگەل بەرنامـە و تەعـەهوداتی خۆیـان ڕادەگەیـەنن، مـەیلییان ببێـت دەتـوانن بەشێوەی كۆمەڵگەیەكی بـچكۆلە لـەناو كۆمەڵگـەی ئیـسلامیدا، سـود لە(خود موختاری) وەربگرن و لەناو كۆمەڵگەكەی دیاریكراوی خۆیاندا تەواوی ئەوانە واـ تبقی مەكتەبەكەی خۆیان بەئازادی دەزانـن،بەئازادانـە ئەنجامی بدەن، بەڵام بەشەرتێك لەسنوری دیاریكراوی خۆیاندا بێت.

هەروەك وتم لـەمەسەلـەی عەقیدەی مەكتەبی خۆیاندا تەواو ئازادن بـەبیٚ هـیچ قەیدێك، بەڵام لـەمەسـەلـەی كـرداردا لـە كۆمەڵگـەی خۆیانـدا ئـەوەی وا لـەمەكتەبی خۆیاندا ئازادە بۆیان، لـەوێش بۆیان ئازاد دەكرێت، بەڵام لـەسـەر ئاستی گشتی كۆمەڵگـەی موسوڵـمانان(ئیسلامی) ڕێگەیان پێنادرێت.

جابیلێمەوە ئەگەر بۆ نمونە (شەراب خواردن) یان هەر شتێك بۆ كۆمەڵگـەی گشتی موسوڵمانان زیانی هەبوو، ئەوان هێنایانە دەرەوە ڕێگرییان لێدەكرێت، چونكە ئەو كاتە وەك تەواوی موسوڵمانان لەسەر ئاستی گشتی كۆمەڵگـەی ئیـسلامی بەرپرسـن.چـۆن یـەك نەفـەر موسـوڵمان بەرپرسـە لەبەرامبـەر كۆمەڵگەی ئیسلامییەوە، شەراب بێت، دزی بێت، درۆ بێت، خیانەت بێـت، هەرچی بێـت، چـۆن موسـوڵمان لێـی مەسئولە كەئەگـەر مونحـەریف بـوو موجازاتی لێدەكرێت، ئەویش هەروا بەرپرسە. جا زۆربـەی وا دەزانـن زۆر و زۆركاری بەكاردەهێنرێت لـەبەرامبەری غـەیری موسـوڵمانانەوە، لەكاتێكـدا نەخێر وانییە ئەوان ئازاترن، بـەڵام ئەگـەر هێنایانـە نـاو كۆمـەڵگای گـشتی

ئیسلامییەوە ئەو كاتە وەك موسوڵمان حساب دەكرێن نەك تەنها شدەت،ئەوە وا لەبەرامبەر كۆمەڵگەوە بەرپرسیارێتی هەیە چ موسوڵمان بێت یان غـەیری موسوڵمان بێت هیچ فەرق ناكـات بەرپرسـیارییەت لـەبەرامبـەر كۆمەڵگـەوە یەك جۆر و یەك ئاستە، بۆیە ئەگەر یەك نەفەر موسوڵمان، ماركسی خیانـەت بكات ئێمە ڕێگری دەكەین و موكەلـەفین بـەرگری بكـەین و سازشـكاریمان نەبێت لـەبەرامبەر خیانەتەكەوە، ئەوەڵەن ئەمە پەیوەندی بەعەقیدەیـەوە نییـە، دووەم ئەمـە لـەبـەرخاتری ئـەوە نییـە كـە ماركسـە، بـەڵكو لـەبـەر نەفـسی خیانەتەكەیەتی، موسـوڵمانیش خیانـەت بكـات موكەلـەفین لـەبەرامبەریـەوە دەوەستین و مقابەلـە دەكەین لـەگەڵیدا.

# باسی سێیەم:
# ئیزدواجییەت( دووانەی ) لە کەسایەتی مرۆڤدا، هۆکار و دەرئەنجام و چارەسەری

لێرەدا قسە دەربارەی ئەوە دەکرێت، کەهەندێکجار ئینسان دوچاری حاڵەتێکی تەعاروض(دژایەتی) دێت لە ویژدان و دەرونی خۆیدا! مەسەلەن شتێك دەزانێت باشە و دەبێت ئەنجامی بدات کەچی دەست و دڵی یەکگیر نابێت و تەصمیمی پێناگیرێت ئەنجامی بدات(ناتوانێت بڕیار بدات ئەنجامی بدات)، شتێك دەزانێت خراپە و دەبێت نەیکات کەچی خۆی بۆ ناگیرێت و ئەنجامی دەدات؟ جا ئێستا بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە و پاشان چارەسەر و دەرمانی نارەحەتی کەمێك وردتر تەماشای ئینسان بکەین. هەر کەسێك ئەم پرسیارانەی بۆ دروست دەبێت و دەکەوێتە ئاوا بارودۆخێکەوە وادەزانێت ئەم پرسیار و مەسەلانە تەنها بۆ ئەو دروست بووە و تەنها هەر ئەم مەسەلە هەیە و مەسەلەگەلی تر نییە! لەکاتێکدا بەو جۆرە نییە، تەواوی تاکەکانی ئینسان بەبێ هیچ ئیستسنا (مەگەر پێغەمبەران(درود و سەلامی خوایان لێبێت) و یەکە یەکەیەك لە هەڵبژێرراوان، ئەگەرنا باقی ئینسانەکان موبتەلان بەم دەردەوە! (ئێمە لە دەرسەکانی مەدرەسەی قورئاندا ئەم دەردەمان ناونابوو دەردی (دژایەتی دەروونی) یان (دژایەتی شەخصییەت)، جا بۆیە هیچ کەسێك واتەصەور نەکات کاتێك شێوەیەك لەم حاڵەتە

دژایەكتییە لە خۆیدا دەبینێت وابزانێت ئەمە هەر ئەو گرفتارە، كاتێك ئینسان واقیعیەتی دروستتر ناسی ئەو ئەوكاتە ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ واقیعدا صەحیحتر دەبێت و چارەسەریشی ئاسانتر دەبێت، ئەگەر كەسێك بەپێچەوانەی واقیعییەتەوە وا تەصەور بكات ئەمە یەك مەرەزێكە و تەنها و تەنها بۆ ئەو پێشهاتووە لەم كاتەدا حاڵەتێك تەوەهوم و تەصەوراتی بۆ دروست دەبێت كە مەرەزەكە قورستر دەبێت و لەزهنیدا تەصەوری چارەسەری زەعیفتر دەبێت بەڕاستیش چارەسەری هەر قورستر دەبێت، بەلاّم دەبێت باش دەركی ئەوە بكەین كەهەرچی ئینسانە گرفتاری ئەمەیە؟ بیربكەنەوە لەناو ئینسانگەلێكدا كەدەیانناسن لەسەدا چەندیان (جگەرەكێشە)؟ ئەمە شتێكی زۆر سادەیە، دەی لەهەر (جگەرەكێشێك) بپرسی و بێژی جگەرە چاكە؟

ئەگەر لایەنی شاعیر و عاتفی نەخاتە كار ئێژێ "ئای دوای سیگار بوڕم" (دۆعایەكی كودەوارییە) كورە ئافات و دوژمنی بەشەرە. بەلاّم هەندێكجار لایەنی عاتفی و شاعیریەكەی دەخاتەكار و دەستدەكات بەپیاهەڵدان و تەعریف كردنی بەباشە، ئەمە هیچ بەلاّم ئەگەر فكری بكەوێتە كار لەعنەتو نەفرینی دەكات.

دەی بێگومان ژمارەیەكی زۆر لەئینسان گرفتاری ئائەم شتە سادە و ئاساییەیە! ئەمە كەگرفتارن پێی لەولاشەوە نەفرەتی لێدەكەن هۆكارەكەی چییە؟ دیارە هۆكارەكەی بوونی ئائەو نەخۆشییە (دژایەتییەیە) واوتمان! دژایەتی لەدەرون و لەخودی ویژداندا: واتە بەشێك لە ویژدان شتێك دەڵێت و بەشەكەی تری شتێكی تر دەڵێت! یان بەشێكی شتێك دەڵێت و بەشێكی تری شتێكی تری

دەوێت، خۆ ئەگەر گەرەكمان بێت بەشە جیاوازەكانی ویژدان و ئەو دژایەتییەی دروست دەبێت لەنێوانیاندا و هەر جارەی لەنێوان دوو بەشیاندایە، ئەگەر ئەوانە بێژم فرە درێژە دەكێشێت.

بەشێوەیەكی كولی ئێژین لە(ویژدان و دەرونی ئینسان) دوو لایەن لە بیركردنەوە جۆر بوونی هەیە لەبارەی جگەرەوە:

**لایەنێكی ئێژێ خراوە و مەیكە.**

**هارێكی هانیدەدات كە ئەنجامی بدات و بیكێشێت.**

ئەمە حاڵەتێكە ڕێژەیەكی زۆر زۆر لە ئینسانگەل هەیانە نیسبەت بەم بابەتە كە دەیبینین و هەستی پێدەكەین! بڕۆ بۆ شتی گشتی تر بۆئەوەی دژایەتییەكە زۆر زۆر ڕونتر دەربكەوێت، بۆ نمونە ئالودە بوون بە ماددەی بێهۆشكەر (هیرۆین..) كابرا دەزانێت ئەم ئالودە بوونە سەروەت و ماڵی گشتی لەناو دەبات، دەزانێت لەڕووی جەستەییەوە زەرەر دەكات، دەزانێت ئابڕوو و حیسییەت و شەرەف و ناوبانگی لەدەست دەدات، دەزانێت گرنگترین تایبەتمەندی ئینسانی كە بریتییە لە (ئیرادە) داغان دەبێت و نابووت دەبێت! دەزانێت لەدوایی هەموو ئەمانە دەبێتە هۆكاری ئەوەی خۆیشی لەدەست بدات و بمرێت! هەموو ئەمانە دەزانێت، چونكە هەمووی دیووە كەچی لەگەڵ ئەوەی ئەمانە دەزانێت، كەچی سەیر دەكەیت هەر خەریكی(هیرۆین) كێشانە! هەوڵ دەدات بەجۆرەها ڕێگەگەل بەشكوو لە( قەرانێك دوو قەران) پوول پەیدا بكات و بڕوات (بەستەیەك) هەندێك(هیرۆین) بكڕێت و بەكاری بهێنێت. سەیر بكەن چ تەعاروزێكی گەورەیە! تەعاروز(دژایەتی) لە مەسەلەی ئابڕوو و ئیعتبار لەناو خەڵكیدا! لەمەسەلەی ئیرادە و تەواوی

سەروەت و دارایدا، تەعاروز لەمەسەلەی سەلامەتی و خودی وجوددا!! ئالەمانەدا تەعاروزی بۆ دروست دەبێت کە زۆر ئاشکرایە، کەچی چارەسەری نابێت بۆی!! ئەمەش یەك کەس و دوو کەس نییە، بەڵکو زۆر زۆرن. زۆر کەس هەیە هەر لەسەرەتاوە ئەم هەموو (دەرد و مەینەتییە)ی ئالودە بوون دەزانن کەچی هەر دەڕۆن و خۆیان ئالودە دەکەن. خۆ ئەگەر بێیتە سەر مەسەلەی ورد و غەیرە مەحسوس ئەو کاتە ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کەلە هەموو ئینسانێکدا تەعاروز هەیە، بۆ نمونە فلاّنە کەس حەز دەکات بەیانی زوو لەخەو هەستێت و نوێژەکەی بخوێنێت، دەزانێت نوێژ چ نەخشەیەکی هەیە لە کاملکردنی شەخصیەتیدا، لەولاشەوە ئەوەش دەزانێت ئەگەر بلکێت بەزەویدا و هەڵنەسێت نوێژەکەی بخوێنێت چ لەتمەیەکی داوە لە شەخصییەتی خۆی، زۆر زۆر لەوە زەرەرتر دەکات ئەگەر یەك ڕۆژ نان نەخوات، ئەمانە دەزانێت و دەرکی دەکات کەچی سەیردەکەیت هەر ئەم دیو ئەو دیو دەکات دەڵێ"لاوە دە دەقەیتر خۆجارێ وەختی ماوە..."لەکۆتایدا دەڵێت"کورە لاوە خۆتازە فریا ناکەوم". ئابەو جۆرە خۆی گێل دەکات و ئەوەی هەر لەسەرەتاوە دەیزانێت زەرەر دەکات نوێژەکەی نەخوێنێت، کەچی تەحەمولی دەکات. دەزانێت ڕیعایەتی ڕێزگرتن لە باوکی، دایکی، برای، هاوڕێکانی بکات، لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەیدا قسەی سوك و ناشیرینی پێنەڵێت، کەچی ڕووبەڕووی دەبێتەوە و (کش و کشمیشێك دەبێت) دەستدەکاتە ئیهانەتکردنی! ئابەم جۆرە چەندەها نمونەی لەم جۆرە فرە و فراوان لەبابەتی گەورە و بچوك لەدەرەوە و ناوەوەی(دەرونی) دەبینیت کە ئینسان دوچاری تەعاروز دەبێتەوە، وەك




ولیشمان ئەصڵی تەعاروزەکە لە دەرونیدا ئەو نمونەی لە (سیگار و هیرۆین)ەی باسمان کرد کاریگەرییەکەی لەدەرەوە دەردەکەوێت، ئەگەرنا خودی تەعاروزەکە پەیوەندی بەدەرونەوە هەیە.

لەم نمونەگەلەدا کە باس دەکرێت ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەم بابەتە و پرسیارکردن لەم بارەیەوە پەیوەندی بەتەنها کەسێکەوە نییە و هەر ئەو تووشی ئەو دژایەتییە دەرونییە نابێتەوە، بەڵکو دەردی تەواوی بەشەریەتە!

لەی هۆکاری ئەمە چییە؟

﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ...﴾* لێرەدا مەتڵەب ئەوەیە ئینسان پاك و تەمیز و دروست پەروەردە نەبووە (قسە لەلایەنی جەستەی ناکەین)، بەڵکو قسە لەوە دەکەین وا ئینسان دەکات بە ئینسان. ئەوە جسمەکەی نییە وا ئینسان دەکاتە ئینسان، ئەوە ویژدان و دەرونە ئینسان دەکاتە ئینسان، ویژدان و دەرونەکەی پاك و تەمیز نییە، لەکەدار و چڵکنە پڕلە دوکەڵ و جورمە، تێکەڵ و پێکەڵە و هەڵڕژاوە بەسەریەکدا و پڕ لەشتگەلی بێ پەیوەندی بەیەکەوە... هۆکارەکەی ئەوەیە! مامۆستایەکی گەورە چی دەکات؟

دەڕوات بەرەو دونیای(دەرون) و ئەو چڵکنی و پیسوپۆخڵییە و بێ نەزم و شپرزیگەلە و نەخۆشی و دژایەتیانە گشتی ڕێکدەخات و مونەزەمیان دەکات. دەیکاتە ڕەوانێکی ڕوشد و ساف و زەریف بەبێ ئیبهام و تاریکی.

---

*) {هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ} الجمعة٢

(يُزَكِّيكُمْ ـ يُزَكِّيهِمْ) بەهەردوو دەربڕینەكە لە قورئانـدا هـاتووە، هەنـدێكجار بەشـێوازی (غایـب) و هەنـدێكجار ڕاسـتەوخۆ قـسە ئاڕاسـتەی ئێمـەی موسوڵمانان دەكرێت كەكاری ئەوەیە پاكمان بكاتەوە. بۆیە دەبینیت لـەگـەڵ ئەوەی لـە ئیسلامدا جسم و سەلامەتی جسم زۆر گرنگـە، بـەلاّم دەردەكـانی ئینسان بەبۆنەی جسمەوە دەرمانی ناكرێت، بەڵكو بەدروست بوونی (ویژدان و دەرون) دەرمانی دەكرێـت و پـاك دەبێتـەوە، ئـەی ئـەو جـورم و پـیس و پۆخڵییە چییە(وا دەكات لـەئینسان) بەڕاستی ئەوەندە زۆرن حساب ناكرێن!

چەنێك دونیای ویژدانی ئینسان گەورەیە ئەوەندە ئیحتمالی شێوازی جیاواز لە جورم و كەسافەتگەل لـە دونیای ویژداندا بوونی هەیـە. ئـەی لـە چ كاتێكـدا ئیمكانی هەیە ئەم دەرد و جورمە ڕوبكاتە دونیای ویژدان؟ ئایا لـەیەكەم ڕۆژی لـەدایك بوونەوەیە؟

نـا هـەتا پـێش لـەدایك بـوونیش! بێـژین لـەزەمانێكـەوە كـەژیان دەكرێـت بەبەری(تۆو)دا و (جسم و ڕەوان) مانا پەیدا دەكەن... لـەوانەیە پێش ئەوەش! خۆ لـەڕووی هەندێك لـەبنەمای ئیـسلامییەوە ئیحتمـالی پـێش لـەوەش هەیـە، چـونكە هەنـدێك لـەئـەحكامی ئیـسلامی هەیـە ڕوودەكـات لـە(گـەنجێك) كەهێـشتا ژنـی نـەهێناوە (كوڕێـك یـان كـچێك) كەهێـشتا هاوسـەرگیرییان نـەكردووە، ئەمـەش لـەبەرئـەوەی نـەوەی ئاینـدەیان بـاش بێـت! بۆئـەوەی لـەئاینـدەدا منداڵـەكانیان سـالم بـن، چ لـەڕووی جەسـتەییەوە.چ لـەڕوونی ڕەوانییەوە سالم بن و دوچاری گرێی دەروونی و دژایەتی سەخـصییەت نـەبن! بۆیە دیارە بەرلـەوەی (نوتفەـ سپێرم) لە(ڕەحم)دا جێگیر ببێت باسـەكە سـەر هەڵدەدات! لـەپاشانیشدا لـە فەرمودەی پێغەمبـەر(ﷺ) دەردەكـەوێت پـێش

لەکاتی (گەنجی) تەکلیف دەکات لە ئینسان بۆ نەوەکانی ئایندەیەکی زۆر دوور، واتە پێش ئەوەی تەکلیف لەم (کوڕ و کچە)گەنجە بکات کە چۆن ڕەفتار بکەن، تاوەکو منداڵەکانیان سالم بن، سەرنجمان بۆئەوە ڕادەکێشێت کەمومکینە لە(پێنج، شەش) پشت لەمەوپێش کارگەل و ڕەفتارگەل و حاڵەتێك کاریگەری دروست بکات بۆئەم (پێنج، شەش) پشتەی لەمەودوا، ئیحتمالی هەیە کار و ڕەفتاری تۆ کاریگەری دابنێت بۆ(پێنج، شەش) پشتی ئایندەت. (جائێستا بێینەوە سەر ئەصڵی باس) ئائەم نەخۆشیگەلە کەبۆ ڕوو دەکاتە ئینسان لە ویژدان و دەرونیدا لەکەیەکەوە دروست دەبێت و بنەڕەتەکەی لەکەیەکەوە دادەنرێت؟

بەڕاستی زۆر لەزووەوە، بەڵام ئەوەی والەزووەوە دادەنرێت مومکینە قابیلی دەرك نەبێت بۆ ئێمە، چونکە دەکرێت پەیوەندی ئەو ڕوداوە واڕوو دەدات لەگەڵ ئەم عەواریزەدا والە ئایندەدا ڕوو دەدات بۆ ئێمە لەمس نەکریەت و قابیلی دەرك نەبێت. دەکرێت لەزەمانێکەوە کەحەیاتی ئینسانی دروست دەبێت بۆ(جەنین) (سپێرم) لەوکاتەوە بتوانین دەرك بکەین و بڵێین"ئائەم شتە ئائەم جۆرە لە کاریگەری دادەنێت لەدەرونی ئینساندا" بۆئەوەی زۆر درێژە نەکێشێت ئەم کاتەی دروست بوونی کاریگەرییەکانی سەر دەرون و ویژدان وازلێدەهێنین و دێین بۆ دەورانی(گەشەی منداڵ) دەورانێك کە دەتوانێت بەئارەزووی خۆی بەدیدی تەرکیز بکات و جیاکاری کۆمەڵێك دەنگی دیاریکراو بکات، کەبەشێکی زۆری ئەوەی ڕۆڵی هەیە لە بونیادی ویژدانی

ئینساندا ئەم  دوو هەستەیە(بینین و بیستن)(بصر و سمع)*، سەیردەکەیت لە قورئاندا ئەوەندەی باسی ئەم دوو (هەستە) دەکرێت باس لەهەستەکانی دیکە ناکرێت، باسی (سمع و بصر) (بیستن و بینین)، چونکە بەشی زۆری ئەم دووانەیە و لەم ڕێگەوەیە دەرونی ئینسان چ باش ، چ خراپ دروست دەبێت، شتگەلی تریش کاریگەرییان هەیە، بەلاّم گرنگ نین و ئەم دوانە گرنگن، لەکاتێکەوە کە ئەم دوو هێزە(سمع و بصر) دەکەونەکار ئێمە دەتوانین چاودێرییان بکەین، بۆ نمونە دایك و باوکێك لەبەردەم  منداڵێکدا کەئەم دوو هێزەی کەوتونەتەکار دەست دەکەن بەشەڕ و دەقیڕێنن بەسەر یەکتردا، منداڵ هێشتا مانای شەڕ و ڕووبەڕوو بوونەوە نازانێت لەسەر ئەو فیترەتە پاك و ساڵم و خواییە لەدایك بووە، کەئینسانگەل لەگەڵ یەکتردا تەعاونین و موحیبەت و ئولفەتیان هەیە بەیەکەوە، بۆیە شەڕ و شۆڕ لەفترەتی ئەودا شتێکی بێگانەیە و قابیلی هەزم و دەرك نییە! بەلاّم ئەی ئەو کاتەی دایك و باوك لەبەردەمیدا پێبکەنن چی دەبێت؟ ئایا بۆ ئەمیش صلّدەکاتەوە و ئەمیش بێگانەیە بە فیترەتی؟ نەخێر چونکە ئەمە ئاشنایە پێی.

جاکاتێك ئەو شتە بێگانە لەبەردەم منداڵدا ڕوو دەدات کاریگەرییەك لەسەر ویژدانی دادەنێت، منداڵ تاك و تەنها لەناو ماڵدا دانراوە هەروەك ئەو جۆرەی کەلەدونیای ئەمڕۆدا دەبینرێت، کەخەڵکی مانای زیندەگیان لێشێواوە، دایکەکە(دایکی منداڵەکە) لەجیاتی ئەوەی هۆشی بەلای منداڵەکەوە بێت و

---

*) بۆ زیاتر شارەزابون لەم باریەوە خوێنەر دەتوانێت بگەڕشێتەوە بۆ باسەکانی (مامۆستا ناصری سوبحان) بەتایبەت (خەلقی ئادەم، خوداناسی، قتال فی سبیل الله، ئابووری ئیسلامی، سیستەمی سیاسی ئیسلام).

بزانێت چی باشە بۆی و چی خراپە بۆی، كەچی دەبینیت ڕۆشتووە لەناو چێشتخانەدا سەرقاڵی دروست كردنی خواردنی ڕەنگاوڕەنگە !ئەمە بۆچی؟ ئەمە تەنها بۆ خۆیان یان نەخێر فلانە میوانیان بڕیارە بێت بۆ ماڵیان، دەی ئەم هەموو خۆسەرقاڵییە بۆچی؟ لەولاشەوە وازهێنان لەبەرپرسیاریەتی ئەصڵی كەبەخێوكردنی منداڵەكەیە؟ ئەمەش تەنها لەبەرئەوەیە(هاوسەر كەم نەبم)، چونكە ماڵی فلانە قەوم دەعوەتی منیانكرد و ئەو خۆراكانەیان دانا بوو جامنیش ئەگەر هەروەك ئەو خۆراكانە دابنێم دەبێت تەقلید و پێم دەڵێن(ئای ئەوە لەئێمەوە فێربووە) بەوكارەش شەخصییەتم دەشكێت! بامن ئەو جۆرە خۆراككەلە دروست بكەم و دەركەوێت كە هونەر و شەخصییەتی من لەو لەپێشترە. جا چەنێك هەڵەیە! ئەی هاوار لەو شەخصییەتەی ئەوەندە هیچ و پووچ بێت كەبەدروست كردنی چواردانە خۆراك بچێتە بان! ئەم دایكە بۆئەم كارە فەرعییە كەئەگەر سالم بیكات كارێكی فەرعی و ئەرزشدارە(كەدروست كردنی خواردنە)، بەلام كاتێك ناسالم ئەنجامی دەدات ئەصڵەن كارێكی فەرعی نییە و كارێكی هیچ و غەڵەت و فاسدە، واتە كاتێك خەریكە خۆراكی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەكات و هەستی خۆشەویستی خۆی دەردەخات و دەیەوێت بەوكارە شەخصییەت بۆخۆی دروست بكات. بەبۆنەی ئەم كارەیەوە ئەو بەرپرسیارییەتییە ئەصڵییە كەپەروەردە كردنی ئەو منداڵەیە لەبیری دەچێتەوە لەو كاتەشدا ڕوداوێك پێش دێت:

منداڵێك هێشتا نائاشنایە لەگەڵ ئەم ڕوداوەدا مەسەلەن دوو دانە(پشیلە) لە ژوورەكەدا دەبێتە شەڕیان، تەقەیەكی گەورە پەیدادەبێت، هەروە تریشقەیەكی گەورە پەیدادەبێت، كاتێك ئەم ڕوداوە ڕوودەدات لەئەنجامدا كاریگەرییەك

لەویژدانی ئەم منداڵــەدا بەجێـدەهێڵێت. لەحاڵەتێكـدا ئەگـەر دایـك زهنـی نەشێوا بێت و پێوانـە و ئەرزشـگەل لەبەرچـاوی نـەگۆڕا بێـت و وانـەزانێت ئەرزش ئەوەیە كەبڕوات لـە چێشتخانەدا خـۆراكی حـەوت ڕەنـگ دروسـت بكات، بەڵكو بزانێت ئەرزش زۆر زۆر لـەمە لـەسەرترە، ئەگەر نان و دۆیـەك دابنێت بۆ میوان، بەڵام بتوانێت لـەئاییندەدا منداڵەكەی واپەروەردە بكات ساڵم بێت فرە فرە خاسترِ حاڵی بووە لـە ئینسانییەت و لـەحـەیات، تـاوەكو ئـەوەی دانیـشێت خـۆراكی حـەوت ڕەنـگ دروسـت بكـات، بـەڵام لەئاینـدەدا منداڵەكەی ناساڵم بێت.

دایكێك تێگەیـشتنی دروسـت بێـت لـەوكاتـەدا منداڵەكـەی لەباوەشـیدایە، منداڵەكـە قورئـان دەفـەرمێت"لای كـەمی و بەشـێوەیەكی ئاسـایی پێویـستی بەباوەشـی دایكـە" بـاوەش بـەو مانایـەنا بەبـەردەوامی دەسـتی گرتبێتـەوە و بەباوەشییەوە بێت نا بۆنموونە لـەلای دەستییەوە بێـت، هـەر كاتێـك منداڵەكـە چاو دەكاتەوە دایكی ببینێت، گوێچكە دەكاتەوە گوێی لـەدەنگی دایكی بێت، ئەگـەر دایكێـك بـەئاگاه و دەرك بێـت، كاتێـك منداڵەكـە بەباوەشـییەوەیە دەچێت(سفرەكە) و ئاو و گۆزەڵەیەك(ماست) دەهێنێت و دایدەنێت، ئەگـەر پێویست بوو بچێت بۆدوكان منداڵەكە دەگرێت بەباوەشییەوە و دەڕوات بـۆ نموونە(لـەماڵەوە ماست یان سـەوزەیەك نییـە دەیكڕێـت) و دەیهێنێـت لـەسـەر سفرەكە دایدەنێت و هەرگیز پێـی بـێ شەخـصییەتی نییـە و وانازانێـت بەمـە بچوك دەبێتەوە، لـەنەتیجەدا ئەو دژایەتییـە(عـەوارزە) وابـەو جـۆرە دەرونـی منـداڵ ناسـاڵم دەكـات بەبۆنـەی دووری دایكییـەوە بـۆی دروسـت نابێـت، مەسەلـەن چۆن؟

منداڵەكە لەلای دایكیدا یان لەباوەشیایەتی، لەوكاتەدا(پشیلەكان) دەبێتە شەڕیان یان هەورەتریشقەیەكی گوێ لێدەبێت، یاخود هەر ڕوداوێك ڕودەدات لەوكاتەدا دایكەكە لایەك دەكاتەوە بۆی و زەردەخەنەیەكی بۆدەكات ئیتر تەواو بۆی حەل بوو، لەڕێگەی گوێچكەوە تاگەرەكی بوو بچێت و لەویژدانیدا جێگیر ببێت ئەو دەنگە هەویەتی گۆڕاو بوویە شتێكی ئاسایی ئیتر شتێكی نامەتلوب نییە، بەلام لەحالێكدا ئەو زەردەخەنەیەی دایك وجودی نییە سام و هەیبەتی ئەو دەنگە یان ئەو شەڕە(پشیلەیە) وەك خۆی و بەو خەصلەتە ئیبهام و ترسناكەوە لەناو ویژداندا جێگە دەگرییەت!بەلام كاتێك كە زەردەخەنەی دایكەكە دەكەوێتە نێوان شەڕی پشیلە و ترسی منداڵەكەوە لەو نێوانەدا پێش ئەوەی بچێتە ناو ویژدان و دەرون و جێگە بگرێت دەیسڕێتەوە و حاڵەتەكە لەناو دەبات و دەیگۆڕێت، یان هەر ئەصلەن ڕووناكاتە دونیایی(ویژدان و دەرون) و جێگە ناگرێت یان ئەگەر جێگەش بگرێت بەشێوەیەكی مەتلوب جێگە دەگرێت، جانمونەیەكی بچكۆلە بهێنمەوە، هەندێك منداڵ قینیەتی لە(حەمام)، هەندێك منداڵ خۆشییەتی لە(حەمام)، ئەمە دایكگەل فرە موهیمە بیزانن و هەروەها باوكگەلیش، كەباوكگەلی موسوڵمان بن و ئەدا و ئەتواریان نەبێت (یارمەتی خێزانیان) بەكارێكی تەبەقاتی نەزانن دەبێت ئەم باسە هەر بزانن، چونكە ئەگەر باوكگەلێك باوكگەلی موسوڵمان بن هەركاتێك (كاتیّ بەتاڵ و بیّ ئیشبن) هاوكاری ژنەكانیان دەكەن لەپەروەردەی منداڵەوە تادەگاتە(گسكدان و كاسە و كەوچك شتن و چێشتكردنیش)، بەلام بەشەرتێك بەتێگەیشتنێكی ئیسلامییەوە بێت نەوەك بە زیلەت و پەستی و حەقارەتەوە! ئەمە فەرق

دەکات. ئەم دایکە منداڵەکەی خۆشییەت لە(حەمام)، ئەو دایکەیتر منداڵەکەی هەرکەباسی (حەمام)ی لەلادا دەکەن زیرِ و هورِی لێەرز دەبێتەوە هەتا دەگاتە تەمەنی(٥-٧) ساڵی هەربەو جۆرەیە! لەوەودوا هەتا لەسەردەمی گەنجیشدا لەحەمام بێزارە ئەمە لەبەر چییە؟

ئەمەش لەبەر مامەڵەکردن و ڕووبەڕووبونەوەیەکی(ڕاست و هەڵە)یە بەنمونە، دایکی ئەوەڵ دەرکی ئەوەی کردووە کەدەبێت چی بکات بۆئەوەی منداڵەکەی بباتە حەمام و نارەحەتیش نەبێت، گرێمان تەشتێك ئاوی داناوە(شلەتێن)، واتە (وا گەرم نەبێت دایچڵەکێنێت و وا سارد نەبێت دایچڵەکێنێت)، خستویەتییە ناو تەشتە ئاوەکەوە، منداڵەکە هیچ کاردانەوەیەکی لەگەڵ ئاوەکەدا نییە، چونکە پلەی گەرمای ئاوەکە لەگەڵ پلەی گەرمای جەستەیدا سازگارە، پاشانیش خۆی وردە وردە دەست دەخاتە ناو ئاوەکە(بۆ نمونە منداڵەکەی(٥ـ٦) مانگە)و دەیجوڵێنێتەوە، وێنەی ئەو شڵپەشڵپی ئاوە سەرنجی منداڵەکە ڕادەکێشێت و ئەویش دەستە بچوکەکانی دەخاتە ناو ئاوەکەوە و دەیجوڵێنێتەوە و لەزەتی لێدەبات، ئەم کارە (جارێك ، دووجار، سێ جار) دووبارە دەبێتەوە لەکۆتایدا سەیر دەکەیت(حەمام) لەلای ئەم منداڵە خۆشەویست دەبێت (منداڵێکی بچوکی خزمی خۆمان هەیە هەرکەسێك دەبینێت هاوار دەکات(ئامان)، واتە(حامام)، ئەوەندە عشق و عەلاقەی پەیداکردووە لەگەڵ حەمامدا ئەمەش لەبەرئەوەی دایکی تێگەیشتووە کە چۆن بیبات بۆحەمام، کەحەمامی لەلا خۆشەویست بێت.بەڵام ئەو منداڵەی تر کەلەحەمام بێزارە مەسەلەن بۆچی بێزار بووە؟ لەبەرئەوەی کەدایکەکە میوانی بووە خێرا پەلەپەلی کردووە بێتەوە سفرە

بڕازێنێتەوە لەولاشەوە منداڵەكەی پێویستی بەوە هەبووە بیشوات دەستی كردووە بەپەلە كردن خێرا(شامپۆ یان سابونەكەی) داوە لەسەری و زوو ئاوی پیاكردووە، جارێك ئاوی گەرم و جارێك ئاوی سارد، (كەف) چۆتە چاوی و عەزابی داوە كاتێك كە وێنەی(ئاو بەسەردا كردن و وێنەی حەمامی)لەلا بەرجەستە دەبێت هەمیشە تێكەڵە لەگەڵ نیگەرانی و ترس و وەحشەتدا، ئەمە نمونەیەكی بچكۆلە.
دەی جائێستا وەرە بۆ ڕووداوی قووڵتر منداڵ بۆ نمونە گەیشتۆتە تەمەنی(٦، ٧) ساڵ و هەندێك شت حاڵی دەبێت باوك دەیەوێت بڕواتە دەرەوە و منداڵیش بەهانەی لێدەگرێت و دەكەوێتە شوێنی. (منداڵ لێی دەپرسێ) بۆ كوێ دەچیت باوكە؟
باوك دەچم بۆلای پزیشك، لەدوایدا بۆ منداڵ دەردەكەوێت باوك بۆلای پزیشك نەچووە سەری سوڕ دەمێنێت(ئەمە یانی چی؟). فیترەتی سالمی ئینسان لەگەڵ درۆدا سازگار نییە! فیترەتی سالمی ئینسان لەسەر ڕاستییە، دەزانن منداڵ تاتەمەنی(٣، ٤)ساڵی تا درۆ نەبیستێ ئەصڵەن نازانێ درۆ بكات؟ سەیردەكات شتێك بوو باوكی بەجۆرێك پێی ووت و لەواقیعدا جۆرێكی تر بوو(گریمانەی ئەوە دانێین كەتەمەنی(٦، ٧)ساڵە و وشەی درۆی نەبیستووە) تەنانەت نازانێت پێشی بڵێت درۆ(واتە وشەیەك نادۆزێتەوە ناوی ئەو دۆخەی لێبنێت كە تێی كەوتووە) بەڵام دەزانێت ئەمە شتێكی عەجیبە!
باوكی بەرەو ئەولا چوو كەچی وتویەتی بەرەو ئەملا دەچم! ئەمە یانی چی؟! چۆن شتی وادەبێت؟ (منداڵەكە پرسیار لەخۆی دەكات) لێرەدا ئیبهام و گومان و نەدۆزینەوەی حەلی صەحیح و دروستبوونی گرێی و پەیدا بوونی




دژایەتی لەدەروندا... منداڵەكە چاوی كەوتووە بە(كەلوپەلی یاریكردن)، یان چاوی كەوتووە بە منداڵی خەڵك و جل و بەرگی جوانیان بووە، شتێكی جوانیان بەدەستەوە بووە لەوكاتەدا بیانوو دەگرێت و داوا دەكات، باوكەكە یان دایكەكە بەجۆرەها وەڵامی فریودەر و نادروست قسەی لەگەڵ دەكەن! یان نەخێر توورە دەبن لێی و دەست دەكەن بەنەفرین كردن لێی، یان دەستدەكەنە وتنی قسەگەلێكی ئاراستەكەر كەدەبێتە هۆكاری لادانی زیهنی منداڵە! كە ئەمەش لەبەرئەوەی ئیتر بیانوو نەگرێت، ئەمانە گشتی لەگەڵ فیترەتیدا ناسازگارە و لەویژدانیدا جێگیر دەبێت، بۆ نمونە منداڵەكە بەهانەی شتێك دەگرێت دایكەكە یان باوكەكە پێی دەڵێت"ئەگەر بەهانە بگریت دەتبەم بۆلای(دكتۆر) دەرزیت لێبدات، ها" وەك ئەوەی جاران كەئێمە منداڵ بووین دەیانووت (ئێژن شەو لەبانەكە بێت بتخوات) كەدیارە ئەوە زۆر خراپە، بەڵام ئەم خراپتر! كەئێژی"ئێژم بەدكتۆرەكە بێت دەرزیت لێبدات" بەم قسەیە مقدارێك حاڵەتی ترس لە(دكتۆر و دەرزی) پێدەبەخشێت. بەیانی منداڵ نەخۆش دەكەوێت و پێویستی بەوە هەیە بچێتە لای دكتۆر و دەرزی لێبدات، لەسەرەتادا دكتۆری لەبەرچاوی خوێن تاڵ كردووە ئێستا دەبێت بیبات بۆلای و ڕووبەڕووی ببێتەوە، دەی دیارە منداڵێك بەبۆنەی قسەو ڕەفتاری نادروستی باوك و دایكەوە قین و ترسی لە دكتۆر چۆتە دڵیەوە لەزەت نابات لەوەی بچێتە لای(دكتۆر)، بۆیە دەست دەكات بە گریان و پەلپگرتن...هەركە دكتۆر دەست دەبات و دەرزی لێبدات، لەرز دەكەوێتە سەرتاپای جەستەی و ئەعصابی ناڕەحەت دەبێت! بەوجۆرە دەرد لەبانی دەرد لەویژدانی پاك و خاوێنیدا كەڵەكە دەبێت، ئەو ویژدانەی وا گەردی پێوە نییە




ئەوەی خوای گەورە ناوی ناوە(فطرة)﴿ فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾*، پاكە و لەگەڵ حەقیقەت و واقیعدا سازگارە، واقیعیاتێك دروست و موتەناسب لەگەڵ حەقیقەتدا، لەگەڵ شتی دروستكراو نادروست و رووبەڕوونەوەی ناواقیعدا سازگار نییە، كە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت"كل مولودين يولد على فطرة" واتە:(هەر منداڵێك لەدایك دەبێت لەسەر ئەو فترەتە ئیلاهییەیە، ئەوە خوا داگییە بەئینسان لەدایك دەبێت).

ئەم منداڵە كاتێك لەدایك دەبێت ئەو فترەتەی هەیە، بینا لەسەر ئەمە تبقی ئەو فترەتە، ئەگەر دەركی كرد كە نەخۆشە نەخۆشیش پێویستی بەوەیە بچێتە لای دكتۆر، (دكتۆر) كاری ئەوەیە كە دڵسۆزی بكات بۆ نەخۆش و دەرمانی پێ بدات و خۆشی بكاتەوە. ئیتر صڵ و واهیمەیەكی لە دكتۆر نابێت، چونكە ئەمە داواكاری فیترەتییەتی، بۆیە بەشێوەیەكی ئاسایی پێشوازی لێدەكات و دەچێت بۆلای. بەڕاستی من منداڵی بەوشێوەیەم دیووە كەكاتێك نەخۆش بووە خۆی شەوق و عەلاقەی بووە كە "بچین بۆلای دكتۆر" حەتا ئەوە والەكاری دكتۆردا زۆر منداڵ تووشی ئازار دەكات، دەرزی لێدانە، (جابا نمونەیەكی واقیعی بگێڕنەوە) (حەژیان)ی كوڕی خۆم لەبیرم دێت(٤، ٥) ساڵ بوو لەوكاتەدا كە دەرزییەكەی لێدەدرا دەستی كرد بە(پێكەنین)، كەنیشان بدات دەرزی لێدانم پێناخۆش نییە و دەزانم ئەمە خێرە و مصلەحەتە، چونكە لەسەرەتاوە نەترسا بوو لەدكتۆر و بۆی نەكرابوو بەشەولەبان، لەپاشانیشدا لەوەتێگەیشتبوو كەلەكاتی نەخۆشیدا (دكتۆر) كاری ئەصڵی ئەوەیە

*) {فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ }الروم٣٠

دڵسۆزی بکات و ڕێنمایی بکات (ئەمە بەدەرلە دکتۆری پارەپەرست کەجەستەی نەخۆش دەکەنە تاقیگەیەك بۆخۆیان و لەپاشاندا هەرلەبەرەوە پارەی پێیەیدا دەکەن، ئەمە بەجێی خۆی!!)، بەلاَم ئەصڵ ئەوەیە دکتۆر خێرویست بێت ئەویش لەسەر ئەم ئەصڵە بیری دەکردەوە هیچ ترس و واهیمەیەکی نەبوو خۆی پێشنیاری دەکرد کە نەخۆشم بابچین بۆلای دکتۆر، منداڵی تریشم دیووە باسی دکتۆریان بۆکریەت لەرزیان لێنایەت و نارەحەت نابن، بەلاَم زۆرینەی ئەوانەن کەلەدکتۆر دەترسن.

منداڵ گەورەبوو لەناو مەجلیسدا دادەنیشێت گەرەکییە گوێچکە شل بکات و گوێی لەقسەبێت لەپاشاندا کەقسەیەك دەزانێت و دەیەوێت لەوبارەیەوە نەزەری خۆی دەربڕێت کاتێك دەمدەکاتەوە لە مەجلیسەکەدا پێی دەڵێن"شەرمت بێت، حەیات بێت، لەمەجلیسی گەورەکاندا قسەمەکە" ئەمە یانی چی؟ ئەمە کەی لەگەڵ فیترەتی ئینساندا سازگارە؟ بۆچی لەمەجلیسی گەورەکاندا قسەنەکات؟ کورە! خۆ قسەی ئەم فرە پاك و سالم و حەمیحترە، فرە مەنتقی و دروستترە لە زۆربەی قسەی گەورەکان کەڕیا و درۆ و فریودەرانەیە، ئەم قسەی ئەم فرە فرە ئەرزشدارتر و موحتەرەمترە بەلای خوا و بەندەوە بەلای هەرکەسێکەوە کەعەقڵی سالم بێت، ئەی باوك و دایك! ئەی گەورەگەل! ئێوە بۆچی خۆشتان نایەت لەقسەی پاك و زەریفی ئەم منداڵە؟! گریمان(ئەم منداڵە لەم قسەیەدا) هەڵەی کرد، هێشتا چونکە لەفترەتێکی سالمەوە سەرهەڵدەدات و هێشتا ئالودە نەبووە، چونکە ئەم قسەیە لەسەر ئیحساسێکی ڕاست و دروست وەستاوە فرە ئەرزشدارترە لەقسەی گەورەکان!! جا ئەمە کارێکە ڕاستەوخۆ بنەڕەت لەسەر دەروونی منداڵەکە

دادەنێت. لەپاشاندا ئەم جۆرە لە مامەڵە لەلایەن هاوڕێ و دراوسێ و خزم و مامۆستاكانەوە بەردەوام دەبێت و هەر لەبەرەوە كاریگەری خراپ كەڵەكە دەبێت...

جائەم باسانە هەندێكی پەیوەندی بەخێزانەوە هەیە، هەندێكی بەدەرەوەی خانەوادە زۆر درێژە دەكێشێت ئەگەر گەرەكمان بێت ئەو شتانەی وارەوانی ئینسان نەخۆش دەخات نمونەگەلێكی لێ بێژین لەگشت بارەوە ئەمە زۆر زۆر درێژە دەكێشێت، بەڵام زیاتر لەسەر خانەوادە وەستام، چونكە خانەوادە لەساسە بۆ پەروەردەی منداڵ. بەشكوم لەمەولا خانەوادە موسوڵمانەكان لەم شتەكەمەی وتومانە خۆیان زۆرشت دەرك بكەن و بزانن ئیتر لەگەڵ منداڵیان ڕەفتاربكەن. جابەگشتی ئەم كۆمەڵە شتانەی كەدروست دەبێت دەبێتە هۆكاری نەخۆش خستنی دەرونی ئینسان، ویژدانی ئینسان نەخۆش دەخات، نەخۆشیگەلێك كەلە(دەرون و ویژدان)ی ئینساندا دروست دەبێت بەشێكی زۆری پەیوەندی بەبەشێكی نائاگا و مەخفی ویژدانەوە هەیە، هەندێكی تریش پەیوەندی بەبەشی ئاگاهییەوە هەیە، واتە ئاموزشگەلی هەڵەش، جائەوەی وادەبێتە هۆكاری دروست بوونی دژایەتی و تەعاروزی شەخصییەتی ئینسان شایەت لە٪٩٩ی زیاتری پەیوەندی بەویژدانی نائاگاوە هەیە، واتە دەرونی شاراوە و تاریك(لاشعور) بەشەكەی تریش كە(٪١)یش كەمترە كەلەوانەیە بە(پۆینتیش) بێت پەیوەندی بەئاگایی و مەعلوماتی ویژدانی ڕۆشنی(شعور) هەیە، لەبەرئەوە ئیتر زۆر لەسەر بەشی ئاگایی قسەناكەم. ئائەمانە گشتی دەچنە پاڵ یەكتری و حاڵەت و عەواریزێكی جۆراوجۆری لێدروست دەبێت، كەیەكێك لەم حالات و عەواریزەكە لەوانەیە(دایكە دەردان بێت)واتە بنەماو

ئەساس بێت بۆ زۆرێك لەعەوارز و ناڕەحەتییەکانی تری دەروونی ئینسان ئائەم ناڕەحەتییەیە کەپێی دەڵێن عەوارزی و ئیزدواجیەت لەشەخصییەتی ئینساندا لەشەخصییەتی دەروونی ئینساندا! جا لە پاشاندا بۆ تەشدیدی ئەم تەعاروزە یان بۆ جیهەتدان بەم تەعاروزە، یاخود بۆ تەخصیصی ئەم دژایەتییە بەهەندێك هۆکارەوە، (دژایەتی کۆمەڵایەتی)دەکەوێتە ناوەوە!! شتگەلێك لەناو کۆمەڵگەدا بوونی هەیە دەبێتە هۆکاری ئەوەی بۆ نمونە ئەم تەعاروزە تایبەت بێتەوە بە فلانە شتەوە یان فلانە جیهەت پەیدادەکات، بۆنمونە لەعەقائید(بنەماکانی) دیندا لەبارەی (خواناسییەوە) دوچاری تەعاروز دەبێت لەدەروندا، لەبارەی دەرس خوێندنەوە(قوتابخانە)وە تووشی تەعاروز دەبێت حەزدەکات دەرس بخوێنێت کەچی تەصمیمی پێناگیرێت، کتێبەکە دەهێنێت کەچی یەکسەر باوێشك دەدات و دەست دەکاتە خنەخن و خاوەخاوکردن(خەوی دێت)، حەزدەکات قسەخۆش و ڕووخۆش بێت کەچی سەیردەکات هەمیشە پەژموردەیە، هەرچی دەکات ناتوانێت ڕووی خۆش بێت ناتوانێت قسەی خۆش بێت، حەزدەکات لەگەڵ خەڵکیدا پەیوەندی هەبێت، بەڵام چی تەماشا دەکات پێی ناکرێت. زۆر زۆر شت لەم بابەتە هەیە کەکاتێك جیهەت پەیدادەکات بەشێوەیەکی ئاسایی مەسائیلی کۆمەڵگە هۆکارە بۆ بوونیان! ئەو شتگەلە والەناو کۆمەڵگەدا ڕوودەدەن ئەم (مەرەزی تەعاروز و ئیزدیواج لەشەخصییەتی ئینساندا هەیە) دەیهێنێتە سەر فلانە جیهەت و فلانە بابەتی تایبەت، لەکۆتاییدا لەئەحواڵی عەمەلی ئینساندا دەردەکەوێت، بەڵام ئەمەکە چۆن دەردەکەوێت و لە چیدا دەردەکەوێت، بەشی زۆری پەیوەندی بەو حاڵاتە ئەوەڵییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی

بەرەولاوە هەیە. گرنگ ئەوەیە كەكاتێك ئینسان ڕوشتی پەیداكرد و دەركی كرد دوكار بكات:

یەكەم: لەڕیشەوە ئەو عـەوارزەی لـەڕابردودا هەیـە لـەبن دەری بهێنێـت، كاتێك لـە ڕۆشنبینییەوە لـەڕێگەی(دەروناسییەوە) خۆی یـان ئەگـەر هـاوڕێی هەبێت كەكەسێكی شارەزا بێـت هاوكـاری بكـات، وردە وردە لـەبەرچـاوی بازدەبێت و ئیتر ئەو كاریگەریی ڕابردووە بەسەریەوە نامێنێت.

دووەم: ئەو شتگەلـە والـەناو كۆمەڵگـەدا دەبێتـە هۆكـاری ئـەوەی كەئـەم حاڵەتی تەعاروزە لـەهەندێك لـەهەندێك شتدا بەتـەواوەتی ڕەنـگ بگرێـت و دەربكەوێت ئەوە لـەناوبەرێت، جا ئەگـەر بـەهۆی هەنـدێك هاوڕێیـەوە یـان بەهۆی ئەو پەیوەندییەوە لـەگەڵ هەندێك خەڵكدا كەهەیەتی دەبێتـە هۆكـاری ئـــەوەی كەئـــەو تـــەعاروزە لـــەدەرس خوێندنـــدا بۆدروســـت بكـــات، لـەنوێژنەكردنـــدا بـــۆ دروســـت بكـــات، یـــان لـەنیوەشـــەودا، هەڵنەســـاندا دەربكەوێت....لـەهەركارێك لـەكارگەلیتر ئائەوانە ببڕێت.

ئەم دووانە كارەی كرد لـەوانەیە وردە وردە زاڵبێت بەسەر ئەو جیهەتە خاصە لـەتەعاروزدا و ئەوە دەرمان بكات، جاكەیەكێكی دەرمان كـرد ئـیتر شـێرگیر دەبێت و فێردەبێـت كاریگـەری و دەركەوتـەكانی تـریش دەرمـان دەكـات. بەنیـسبەت قەزییەكـە كـەمم وت، چـونكە فـرە گرنگـە بەتایبـەت ئـەوەی پەیوەندی بەخانەوادەوە هەیـە، بـەلاّم ئیـشەلاّ فكرتـان بخەنـە كـار لـەهـەموو بارێكەوە تەحلیلی بكەن و نەتیجەی فرەی لێبگرن.

# باسی یەكەم:

# پێویستی كۆمەڵگە بە بزاوتن(حەرەكەت و تەكان)

زەمانێك كە بێحەرەكەت و بێتەكان(بزاوت) بەسەر وڵات و میللەتێكدا دەگوزەرێ و، ئەو میللەتە هاوارێ ناكات، دەنگێكی نارەزایی لێ بەرز نابێتەوە، زوڵمی لێدەكرێت ناڵێت بۆچی واملێدەكەن؟ حەق و نا حەق لێك جیا ناكەتەوە و هەموو جۆرە ئیمتیازاتێك بەسەریاندا حوكوم دەكات، سیستەمی تاغوتی و سیستەمی چینایەتی و سیستەمی ئەشرافیەت دەبێتە جێگیرەوەی سیستەمی بێئیمتیاز و بێتەبەقاتی دین. ئەو زەمانە مێژوو راوەستاوە، ئەو زەمانە مەملەكەت نەزۆكە، ئەو زەمانە زەمان لە جوڵە و ژیان كەوتووە! بەڵام كاتێك مێژوو لە مەملەكەتێكدا یان مەملەكەتێك لە مەقتەعێكی زەمانیدا جموجوڵی تێ بكەوێ، هەرا و نارەزای تێ بكەوێ، تەقوو تۆقی لێ بەرزەوە بێت ئەوە نیشانەی ئەوەیە كە ولادەتێكی تازە (لەدایك بوونێكی تازە) خەریكە شروع دەبێت. ولادەت هەمیشە دەردو ئێشی لەگەڵە، هەمیشە مەرگ و نیرۆی لەگەڵە. هیچ منداڵێك لە دایك نابێ مەگەر هەزاران و ملوێنەها سلولی زیندوو لە بەین بچن، مەگەر هەزارەها و ملیۆنەها (خرۆكەی سور و سپی) لەناوبچن! دەبێ ئەم هەموو كوشتە بدرێت ئینجا منداڵێك موتەوەلید ببێت. بەڵام تاقە منداڵێك لە دایك ببێت و




میللەتێك لە دایك ببێت لە كوێ؟ زۆر جیاوازی هەیە لە نێوان لە دایك بوونی منداڵێك و لە دایك بوونی میللەتێكدا:

**جیاوازی یەكەم:** زەمانی بارداری(سكپڕی) دایكێك تا منداڵێك بێتە دونیاوە زۆر كەمە (نۆ مانگ_دە مانگ (ساڵێك) )، بەڵام دەورانی بارداری مەملەكەتێ دەورانی ژان داری میللەتێ بۆ ئەوەی بتوانێ وەچەیەكی ئینقلابی لە خۆی بژێنێت و پەروەردەی كات و پێشكەشی مێژووی بكات درێژە.

**جیاوازی دووەم:** ئەو خرۆكە سورو سپیانە وا دەمرن تا منداڵێك لە دایك دەبێت ئیختیار لە دەستی خۆیاندا نییە و بەوانە ناڵێن شەهید هیچ بایەخێكیان نییە، خۆیان نین كە تەعینی چارەنوسی خۆیان دەكەن، بەڵكو مێژووە و سروشتەو نیزامی ئیلاهیە حاكمە بەسەر ئەواندا، بەڵام لە دونیایی مرۆڤدا لە دایك بوون مانایەكی تری هەیە! ژیانی نوێ مانایەكی تری هەیە، هەروا كە مەرگ هەروا كە نەزۆكی مانایەكی تری هەیە. مرۆڤ خۆیەتی كە خاوەنی مێژووی خۆیەتی، مرۆڤ خۆیەتی كە خالقی مێژووی خۆیەتی، هەقیقەتی مێژوو: بریتیە لە گوزەران و جەرەیان و جووڵەو سەكەناتی زیندەگی مرۆڤ بەسەر مەقاتعی زەماندا. زەمان، جەرەیانی خۆی هەر هەیە چی چاك ، چی خراپ، میللەتێك مردوو بێت یان زیندوو بێت، بەڵام ئەوە مرۆڤە كە دەتوانێت لەو مەقاتعە زەمانییەدا حەرەكەتێكی موسبەت بە وجود بێنێت و مێژوویەك دروست بكات.

بەو بۆنەوە ئەوانە وا لەزەمانی ئێش و دەردی حامڵەگی(دووگیانی) مەملەكەت و میللەتێكدا، وا لە زەمانێكدا كە مێژوو بارداره(حامیلەیە) و خەریكە خەبەری ولادەتێكی نوێ دەدات، خەریكە خەبەری ژیانێكی پڕ

شانازی نوێ دەدات، ئەوانە وا خۆیان بەخت دەکەن جیاوازیان هەیە لەگەڵ سیلولە زیندو و خرۆکە (سور و سپییەکانی) تردا کە لە ولادەتێکی ئاسایدا دەمرن. ئەگەر بڕیار بێت مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ، زەمانی مەرگ و ژیانی مرۆڤ هەر وەك زەمانی نەزۆکی دایکێك یان زەمانی بارداری دایکێك یان زەمانی وەزعی حەملی دایکێك بێت، کەمترین شانازی نە بۆ مرۆڤی زیندووە و نە بۆ ئەو شەهیدانەیە کەوا مرۆڤە زیندووەکان پێشکەشی دەکەن.

بۆ شەهید نامرێت؟ بۆ شانازی هەیە بۆ شەهید؟

بەڵێ لە ڕوواڵەتدا هەزاران خرۆکە و سیلول دەبێت لەناو بچن تا مەوجودێکی بایاخدار کە منداڵێکە لە دایك دەبێت. ولادەتیی (مێژووی مرۆڤ) لێکچونی هەیە بەمەوە لەسەرێکەوە، بەڵام گرنگتر، گەورەتر لە ولادەتی یەك منداڵ! مرۆڤ خۆیەتی مەصیری خۆی دیاری دەکات و مرۆڤ خۆیەتی کە دەیەوێت زوڵم قبوڵ نەکات. مرۆڤ خۆیەتی کە دەیەوێ نیزامی حاکمی زاڵم پڕ جەبەروت بشکێنێت و ووردی بکات. ئەو مرۆڤانە وا پێشکەش دەکرێن بۆ لە بەین بردنی بت و بوتخانەکان، ئەوانە فیدائی ئەو حەرەکەتەن، ئەوانە بە وجودهێنەری ئەو حرەکەتەن، ئەوانە قیسمەتی عەمدەی خالقی مێژووی نوێی ئینسانیەتن!

هۆکاری ئەوە کە شەهید نامرێت. هۆکاری ئەوە کە شەهید بە شانازیەوە ناوی دەبرێت، ئیختیارێکە کە مرۆڤ هەیەتی بۆ دروستکردنی مێژووی خۆی، بۆ دیاری کردنی مەصیری خۆی. ئەگەر بڕیاربێت مرۆڤ دەسەڵاتێکی نەبێت. مرۆڤ دارێك بێت بە دەست مێژووەوە، چی زیندوو چی مردوو، چی چاك، چی خراپ، چی ئەوەی گوللە دەدات لە بەرای خۆی دەیکوژێت، چی

ئەوەی كە دەكوژرێت{مانا و جیاوازییان نابێت!}...بەلام هەموو دەزانین ئەمانە جیاوازیان هەیە. بۆ؟

چونكە مرۆڤە دیاری كەری مەصیری مێژووە، مرۆڤە مێژوو دەمرێنێت، مرۆڤە مێژوو زیندوو دەكاتەوە. قورئان دەفەرموێت ((مەردمی خاوەن ئیمان، ئەگەر راستەكەن خاوەن ئیمانن گێرەو كێشەی زۆرتان لە رێدایە)). ئیمان: واتە بەرپرسیارێتی، ئیمان، واتە پەیمان دان. پەرستشی خودا، واتە سەر نەخەواندن لە بەرامبەر زوڵم و زۆرەوە. پەرستشی خودا،واتە تێهەڵدان لە هەر هێزێكی نارەواو درۆ. بەئێمە حاڵی دەكات، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ وەختێك خەریكین وەزیفەی ئیمانی خۆمان لە بەرامبەر خودای خۆمانەوە دیاری دەكەین. بەمە كە دەڵێین ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بەندەگی تەنها بۆ تۆ دەكەین، ئەمر تەنها لە تۆوە وەردەگرین، سرنجمان بۆئەوە رادەكێشێت،(ئەم رێگەیە) گرفتاری زۆرە، یەكجار كێشەمان بۆ دروست دەبێت، یەكجار تەڵە دەخەنە بەر رێمان. زۆرمان لێ دەكوژن، صەبری دەوێ موقاومەتی دەوێ یارمەتی دەوێ.

كۆمەكی چی؟ كۆمەكی دەست و بازوو؟ ...نا... كۆمەكی دەروون، كۆمەكی رەوان، كۆمەكی ئیمان. ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، دوای تەوحیدی عیبادەت نۆرەی تەوحیدی (ئیستعانەت)داواكردن دێت.

ئەگەر بڕیار بێت مرۆڤێك خۆی بە خاوەن ئیمان بزانێ دەبێت خۆی بۆ دەردی سەر ئامادە بكات ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ (خاوەن ئیمانەكان). ئیمان جەفەنگ نییە، ئیمان شیعار نییە، ئیمان لەقەب نییە، ئیمان هێزی بزوێنەری دەرونی مرۆڤە. ﴿اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاةِ﴾عەزیەتی زۆرتان دەكەن و گرفتی زۆرتان بۆ دروست دەكەن. یارمەتی وەرگرن لە دوو شت، پایەداری و




موقاومەت و تێك نەشکان، بەلاّم پایەداری بۆ ئەوە ئاگاهانە بێت، بۆئەوە بێمەنتق نەبێ دەبێ لە سەرچاوەی قودرەتی هەستی یارمەتی وەرگرێت، بۆیە دەفەرموێت (الصَّلاةِ)پاش پایەداری (کە قاعیدە گشتیەکەیە) زەخیرەی بەهێزی ئەو پایەدارییە (نوێژە). مرۆڤی با ئیمان لە کاتێکدا تۆ خەریکی مەسئولیەتی ئیمانی خۆت ئەدا دەکەیت، قودرەتە نا حەقەکان، زاڵمەکان، زۆر دارەکان دەترسن، دەزانن تەخت و عەرشیان دەکەوێتە لەرە لەر، دەزانن مەوجودیەتیان دەکەوێتە خەتەرەوە پەلە قاژە دەکەن و بەرگری دەکەن. چۆن بەرگری دەکەن؟ گولە بدەن لەتۆ و هێرش بهێننەسەرت دەنگی تۆ خەفە دەکەن. ئابەو جۆرە لە بەرامبەرتەوە بەرگری دەکەن. بەلاّم تۆ بزانە تەنها نیت، ئەتۆ بزانە بە رێکەوت نەکەوتویتەتە سەر ئەم زەوییە! تۆ بزانە حەق و باتڵ فەرقی هەیە. ئەتۆ بزانە نیزامی هەستی نیزامێکی سەرسەری و پوچ نییە فەرقی نەبێت لە چاك فەرقی نەبێت لەخراپەدا. ئەو نیزامە دروست کەرێکی هەیە کە ئەو دروسکەرە نیزامی پێداوە ئەتۆ لە لایەنی ئەو دروستکەرەوە خاوەنی ئەو تایبەتمەندییەت و هاتوویتە سەر ئەم زەویەو بوویتبە خاوەنی ئەم زەویە. بزانە ئەو دروستکەرە دەنگی حەقی لەسروشتی هەستیدا جێگە کردۆتەوە، بزانە ئەو دروستکەرە فیترەتی مرۆڤی سازگار لەگەڵ حەق دروسکردوە، لەبەرئەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەو دروس کەرەی خۆت پەیدا بکەی.

نوێژ بکە، ئەگەر نوێژت کرد قودرەتت بەهێز دەبێتەوە، هەموو قودرەتی گەورە گەورەی دنیا لە بەرامبەرتەوە بچکوڵە دەبێتەوە، ئەگەر فێر بوویت سەری بەندایەتی بۆ خوا بنەوێنیت، ئیتر سەرت بەرزترە لەوەی بۆ بەندایەتی کردنی ئەربابی دنیا بخەوێنیت (بنەوێنیت)، مرۆڤی یەکتاپەرست قەدت لە

بەرامبەری هێزەوە سەر نانەوێنێت، زمانی مرۆڤی موئمینی یەکتاپەرست قەد لەبەرامبەر زۆرەوە بێدەنگ نابێت*.

مرۆڤی بە ئیمان! ئیمان: واتە یەکتاپەرستی، واتە یەك گەورەت بێت، واتە تەنها لە یەك جێگەوە فەرمان وەرگری، ئەویش فەرمان لە خواوە وەرگرە و هیچ کەسی تر. (لاتاعت لمخلوق في معصية الخالق) هەر کەس هەر فەرمانێك بدات. زەڕەیەك موخالەفەی لەگەڵ فەرمانی خوادا بێت، هیچ مرۆڤێك مۆڵەتی نییە بە قسەی بکات، ئەگەر مرۆڤێك گوێڕایەڵی کرد لە فەرمانێك کە پێچەوانەی فەرمانی خالقە ئەو مرۆڤە یەکتاپەرست نییە ئەو مرۆڤە بت پەرستە، ئەو مرۆڤە تاغوت پەرستە. تاغوت پەرست بە کەسێك دەڵێن، کە لەجیاتی ئەوەی گوێ لە فەرمانی خوا بگرێ و مەسیری ژیانی خۆی بە پێی دەستوری خودا دیاری بکات،گوێڕاگرێت بۆ فەرمانی ئەربابی دونیا بۆ زوڵم و زۆرداران بۆ پوڵ داران بزانێ ئەوان چی دەڵێن، بزانی ئەوان چیان پێ خۆشەو بەقسەی ئەوانە بکات، ئەوە تاغوت پەرستە مووەحید نییە.

قودرەتێك کە نوێژ دەیدات بە مرۆڤ ئەوەیە، کە دەڵێت حەزرەتی ڕەسول اللە(ﷺ) (اذا حسب هم امرٌ فذع الى الصلاة.). پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) تاکە مرۆڤێکە لە بارودۆخی ئومییەت و جاهیلییەت لەسەر ئاستی دونیادا نەك تەنها (جزیرەی عەرەب) مەئموریەتی پێدراوە بەرهەڵستی تەواوی قودرەتی دونیا بکات، بەر هەڵستی هەموو نیزامێك هەموو فکرێکی باتڵ، هەموو پەیوەندیەکی باتڵ، هەموو زوڵمێك هەموو درۆیەك، هەموو خیانەتێك

* ) لێرەدا (کاك ئەحمەد) ئاماژە بە شیعرێکی فارسی دەدات بەداخەوە نەتوانر شیعرەکە وەربگێڕیت بە هۆی کێشەی تەکنیکییەوە لە دەنگەکەیدا و ڕوون نەبوونی وشەکان.

هەموو، خەڵك خەڵەتاندنێك بكات... ئەم مرۆڤە لە مەیدانی فراوانی دونیادا بە تەنیا خەریکە ڕووبەڕوو دەبێتەوە. چاك تێگەیشتبوو لەو دەستورەی خودا کە دەفەرموێت﴿اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ﴾ کاتێك فشاری دەورووبەر، و دروست بوونی زەحمەت و دەردی سەر لە دوژمنە دورو نزیکەکانەوە خەریك بوو پەرێشانی بکات، بۆخاتری ئەوەی ڕێگای لێنەشێوێت و ئیستیقامەتی لێتێك نەچێت فەورەن دەچوو نوێژی دەکرد. ئەگەر نوێژی دەکرد دووبارە تەجدیدی حەیاتی دەکردەوە. دەزانن چۆن؟

براکانم! لە (تەبریز، ئەصفەهان، تاران، مەج، کرماشان)دا لە هەموو شارەکانی ئێراندا موسوڵمانان لەم دەورانی تازەی ولادەتەدا {مەبەست ئینقلابی ئیسلامی ئێرانە} ئەم مەتڵەبە تێگەیشتن و حاڵی بوون (نازانم ئێوە زانیبێتان یان نەتانزانی بێت، بەڵام من خەبەرم هەبوو) ئەوانە کێ بوون کە خەڵکیا تازە دەکردەوە و، گیان و هێزی تازەیان دەدا بە خەڵك؟ ئەوانە مزگەوتەکان بوون. هەر وەختێك کۆمەڵێك لە موسوڵمانان وەڕێ دەکەوتن یەکێك لەو مەرکەزانەی فەسادییان ووردو خاش دەکرد ماندوو دەبوون و شپرزە دەبوون و کوشتەیان دەدا، دەنگی خودای گەورە، دەنگی قورئان لە مزگەوتەکانەوە بەرز دەبوویەوە خەڵکی بانگ دەکرد. خەڵك دەچوون دوو ڕکعات نوێژیان دەکرد، یەکێك لەو ڕەهبەرە دینیە موجاهیدانە قسەی دەکرد بۆ ئەو موسوڵمانانەو ژیانی تازەی پێدەدانەوە و دەیناردنەوە بۆ مەیدانی ڕووبەڕوو بونەوە! ئالێرەدا ئەمە دیارە مێژووی ئێمە خەریکە زیندوو دەبێتەوە. ئەو ڕێگایەی وا پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)داینا دووبارە موسوڵمانان دەیدۆزنەوە. چوار سەدە بوو زوڵم دەکرا لە موسوڵمانان درۆ دەکرا لەگەڵ




موسوڵمانان ڕێگەو شوێنیان لێ ون بوو بوو ئەڵێن ئەوە موسوڵمانان خەریكە دەكەونە سەر ئەو ڕێگەو شوێنە.

﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ﴾ئەوانە كەوا لەبەر خاتری ڕێگایەك كە خوا دایدەنێت دەكوژرێن پێیان مەڵێن مردوون. ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَكِنْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ئەوانە زیندوون. بەڵام شعوری ئاسایی ئێوە لەوانە كار ناكات، ژیان تێگەیشتنی جیاوازی هەیە. شعوری ئاسای ئێمە. نەك عەقڵ. عەقڵ تێدەگات، بەڵام شعور تێناگات، شعور: واتە دەركێكی سەریع، دەركێكی سادە، شعوری سەریعی ئێمە، شعوری عادی ئێمە، دەركی سادەی ئێمە لە جۆرێك لە مانای ژیان تێدەگات. ئەو جۆرە ژیانە كەوا بەحەواسی زاهیری دەركی دەكەین، لەوە بەولاوە بە ژیان نازانین. خوای گەورە لە ئێمەی حاڵی دەكات كە ئەوانە ژیانێكیان هەیە جیاواز لەو ژیانە كە دەبێت بەچاو بیبینیت.

## مرۆڤ و جۆرەكانی وجودی

براكانم! هەر ئێستا لە هەر فەردێك لە ئەفرادی ئەم (كۆمەڵگەیە)دا دوو جۆر وجوود (بوون) هەیە:

١. وجودێكی بێئەرزش: ئەوەیە وا بەچاو دەیبینی، جسمەكەیە، هەیكەلەكەیە.

٢. وجودێكی عالی: ئەوەیە كەوا چاو كاری لێناكات، ئادەی نیشانم بدە عەقڵی كابرا، ئادەی نیشانم بدە ویژدانی كابرا، ئادەی نیشانم بدە عەواتفو ئیحساساتی كابرا هیچ دیار نییە. جودی عالی وایە، وجودی

عـالی بـانترە لـەوەی قـابلی دەرك بێـت بـۆ حـەیوان، ئـەوەی وا بەچـاو دەبینرێت مرۆڤ و ئاژەڵ دەیبینێت. ئەوە مـرۆڤ و ئـاژەڵ تێیـدا موشـتەرەكە (وەك یەك وان)، بەڵام ئەو كاتەی وجود ئەرزشـی دەچـێتە سـەرەوە ئـیتر فەقەت لێرە مرۆڤە جیایی بكاتەوە و ئاژەڵ دەركی ناكات.

ئاژەڵ ناتوانێ بزانێ عەقڵ واتە چـی، شـعور واتـە چـی؟ ویـژدان واتـە چـی، بیركردنەوە واتە چی، ئاژەڵ مەحرومە لـە دیـاریكردنی ئەوانـە، ئـەوە مرۆڤـە دەبێت دەركی بكات. مرۆڤ بە بەشعوری نا، شعور بـۆ دەركێكـی خێرایـە بـە (تەعەقول) بە عەقڵ. ئێمە بە شعور نازانین كە شەهید زیندووە. بەڵام بە عـەقڵ دەزانین. خوای گەورە نەفی حەیات بۆ ئیمكـانی شـعوری دەكـات، نـەك بـۆ ئیمكانی عەقڵی! دەفەرموێ "شعوری ئێوە بەوە ناشكێت، چونكە ئەوەی بەوە بە ئێمە ئاشنایە ئەم جۆرە ژیانە. بەڵام ئەگەر عەقڵ بخەینە كار دەزانـین ئەوانـە بەڕاستی زیندوون، دوو دانە ژیان. ژیانێك دونیا هەروایـە (سـوخت و سـازە) دەبێت بمرێت و چتێك زیندوو بێتـەوە. هـەروەك لـە ولادەتـە سروشـتیەكەدا ووتمان، كە تا منداڵێكی ئـەرزش دار لـە دایـك دەبێـت هـەزاران میلیۆنـەها سیلولی زینـد و خرۆكـەی سـپی و سـور دەبێـت بمرێـت ئـەمجا ئـەو منداڵـە دەتوانێت سالم لەدایك ببێت.

بەشەریەت یەك واحیدە یەك مەوجودە ...(مثل بنی ادم في تـوادهم و تـراحمهم كمثل جسد الواحيد، اذا اشتكا منه عضه فدعا سائِر اباء بالسهر و الحُما). لـە دیدگایی دینەوە یەك واحیدە دەستی بە حەرەكـەت كـردووە لـە زەمانـدا تـا وەختێك ئەم كورەی زەویە هەیەو مرۆڤ دەتوانێت لەسەر ئەم كـورەی زەویـە ژیان بوگوزەرێنێت، ئەگەر وابێت ئەم یەك واحیدە دەبێت ئەفرادێكی كوشـتە




بدات تا ئەوانەی مردوون زیندوو ببنەوە. جۆرێك لە ژیان کە عـەقڵ دەرکـی دەکات ئەوەیە کە یەکە یەکە یەك دەمرن بەپێی بێڕەحمی زاڵم ئەم یەکە یەکـە یا زۆرن یا کەم.

ژمارەی قوربانی بە پێی ئەم دوو خاڵە زیاد و کەم دەکات:

یەك: نەخشەی دروس، بەرنامەی دروست.

دوو: میزانی بێ شەرەفی و نا ناکەسی زاڵم.

بەپێی ئەم دووانە ژمارەی کوشتن سەرو خوار دەکات، بەلاّم بە هەر ڕێگەیەك بێت لـە هەر شەرائیتێکدا ببێت ژیانی تازە مەرگی دەوێت، ئەگەر وابێت ئەو مرۆڤانانە وا گیانی خۆیان دەکەن بە پێشەنگ، وا بـەر لـە هـەموو کەسـێ دەمرن ، ئەوانە مایەیی (هۆکـاری) ژیـانی میللـەتن، ئەوانـە دەمـرن ئـەمجا میللـەت زیندو دەبێتەوە، بۆیـە لـە ڕاسـتیدا مـەرگی ئەوانـە سـەرەتای ژیـانی میللەتن، ئەوانە نامرن، چونکە بەبۆنەی ئەوانە میللەت زیندوو دەبێتەوە. لەوەو دوایش ژیانێکی تریش هەیە بۆ ئەم مرۆڤە سەرسـوڕهێنەرو غەریبـە کـە ژیـانی لـە ژیانی هیچ گیاندارێکی دیکە ناچێ دەورانی کۆتای تەمەنی دونیا بەش ناکات.

خەڵکینە! سەیری هەر جۆرە گیاندارێك بکەن، تەواوی تاکـەکانی هـەر وەك یەك زیندەگی دەکەن، بەلاّم سەیری مرۆڤ بکەن زاڵمێك هەیە هەزاران جـوان دەکوژێ و شەهید دەکا، مرۆڤێکیش هەیە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی شەهید دەبێت.

ئەو دووانە یەکن؟! چۆن ئەوانە هەروا بمـرن و بوگـوزەرێ؟! نـاء ...حـسابی دروستکەری ئـەم جیهانـە ئـاوا کەشـکی (بێسـەروبەر) نییـە! حـسابی ئـەم مەوجودە سەر سوڕهێنەر و غەریبە وا دەتـوانێ ئەوەنـدە عـەجیب و غـەریب زیندەگی بکات هەروا سادە نییە! مرۆڤ بونەوەرێکی دوو لایەنەیـە، کـە لـەو





دوو لایەنەی خۆی هەزار جۆر زیندەگی بۆ خۆی هەڵبژێرێت. دەتوانێت چاك بێت، دەتوانێت خراپ بێت، لە هەر جۆرە ژیانێكدا، چاكی لە هەزاران پلەدا، خراپی لە هەزاران پلەدا. دوكان داریێ دەتوانێت بە ئینصاف و بە شەرەف بێت لە وەختی خۆیدا شتێك كە پێویستی خەڵكە بە نرخی واقیعی خۆی بیداتە خەڵك. دوكانداریێ دەتوانیێ نامەردو بێشەرەف بێت لە وەختێكدا خەڵك پێویستیان هەیە، خەڵك لێقەوماویان هەیە، خەڵك مردن و زیندوویان هەیە ، خەڵك گرفتاریان هەیە بە فورسەتی بزانیێ شتەكان لە نرخی خۆی گرانتر بكات . دوكاندارە لە وەختێكدا براو خوشكە كوردەكانمان منداڵە كوردەكانمان لە(عێراق)دا تۆپ باران دەكرێن و ماڵیان وێران دەكرێت و دەر بە دەر دەكرێن و مەجبور دەبن مەڕو ماڵا تیان دەفرۆشن بڕوات بزنیان لێبكرێت بە( ٣٠ تمەن)، مەڕیان لیێ بكرێت بە(٥٠ تمەن).ئاوا هەیە، ئاواش هەیە گیانی خۆی فیدا دەكات با ئەو مەزڵومانە ڕزگار بن.

حاكمە و قودرەتی هەیە، دەتوانێت وەك محمد (ﷺ) بێت، دەتوانیێ وەك (عومەر) بێت، دەتوانێت وەك فەرمان ڕەوایانی مێژووی ئیسلام بێت، دەتوانێت وەك زاڵمەكانی ڕۆژگاری خۆمان بێت، دەتوانێت وەك ئەو مرۆڤانە بێت كە مێژوو دەبێت هەمیشە خوێنی خەجاڵەتی و شەرمەزاری لە جیاتی فرمێسك بڕژێنێت لەبەر خاتری ناوی ئەو مرۆڤە كەسیفانە لە هەر جۆرێك ژیاندا دەتوانێت چاك بێت، دەتوانێت خراپ بێت، لەبەرئەوە خوای گەورە وا ئەم مرۆڤەی دروستكردوە كە وەك باقیی مەوجودات بمرێت و بڕوات و تەواو بێت. كابرای زاڵم (٧٠ ساڵ ٨٠ ساڵ) (خوا جوانە مەرگی بكات) دەژی بە خوێن مژی و بە مرۆڤ كوشتن و هیچ دەرەقەتی نایەن، حەقێكی لیێ ناسێننەوە،

مەبەست ئەوە نییە هەر یەك نەفەر لەیەك زەماندا، سەدەها مرۆڤ لە درێژی مێژووی ژیانی مرۆڤدا لە سەدەها شوێنی دونیادا نمونەش بۆ ئەمە زۆرە. ئەو مرۆڤە دەمرێت بێئەوەی تۆڵەی كەمترین تاوانی لێ بسەنرێتەوە. دەی تۆ وەرە حسابی تاوانەكانی بكە، چەندین مرۆڤی كوشتوە ئەوەندە جار بیكوژەوە، چەندین دایكی جەرگ سوتاو كردوە، چەندین جەرگی بابی سوتاندووە و چەند منالی هەتیو خستوە ئائەو بێ دایك و باوك كەوتوانە ئەو جەرگ سوتاوانە چەندە زەجر دەكێشن وەرە ئەوەندە زەجریان بدەرەوە .

چەندە ماڵ ڕووت و قوتە چەند منداڵ ڕووت و قوتە چەندە سك برسیەتی، چەندە هەژار و فەقیر لە زستانا لە بەرامبەر سەرماو گەرما بێ دیفاعن. وەرە ئەوەندە زەجرو گەرماو سەرماو ڕووتی و برسییەتی بدەوە، بزانە ملیۆنەها ساڵ بەشدەكات؟ بەش ناكات. چۆن دەتوانی جەزای زاڵمی وا بدەیتەوە؟! تازە ئەگەر مرۆڤێكی چاك نەیەت و ئەو مێژووە پیسە ئەو دروستی دەكات ڕای نەوەسێنێت فەسادی ئەو هەر نابڕێتەوە و ملیۆنەها مرۆڤ هەردەبێت زەجر و ئازار بكێشن. بەڵام ئەو مرۆڤە چاكە وادێت گیان و ژیانی خۆی فیدا دەكات بۆ ڕزگاری خەڵك (٦٠ – ٧٠)ساڵ ژین دەگوزەرێنێت بە جیهادەوە، بەڕوو بەڕوو بوونەوە بە تەنگ و چەڵەمەوە بە كوێرەوەریەوە بە سەختی و برسێتیەوە و تونیەتیەوە بۆ ڕزگاری خەڵك. چۆن جەزای ئەوە بدەمەوە؟! حیسابی بكە چەندین خەڵك لە مەزایایی جیهاد و موبارەزەی ئەو مرۆڤە بەرخوردار دەبن، چەندین خەڵك لە زوڵمی زاڵم ڕزگار دەبن بەهۆی جیهادی مرۆڤێكی موجاهیدەوە! كەی زەمان بەشی جەزای ئەوە دەكات؟ دنیایەكی بێ سەروبەر نییە. دونیایەك نییە چاكەو خراپە فەرقی نەبێت. تەمەن

زەمانێكە، مەقتەعێكە كەبە شوێنیدا زەمانی حسابی شـروع دەبێـت، كاتێـك زەمانی حسابی دەستی پێكرد. زەمانی ئەوە گەیـشت كـەئیتر مـەودای هـەروا بەدەمیەوە(كات بەردەوامی دەبێت) بـۆ جـەزای خراپـەی خراپـەكاران و بـۆ جەزای چاكەی چاكە كاران، ئەو شەهیدانە نـەمردون، ئەوانـە وان لـەژیانی واقیعدا، ئەمە دوو جۆر ژیان بۆ مرۆڤی شەهید.

## شەهادەت چییە؟

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنْفُسِ وَالثَّمَرَاتِ..﴾ژیان سـادە نییـە! وتمـان ولادەت دەردو ئێـشی هەیـە. زەجـرو ئەشكەنجەی هەیە، مەرگی هەیە و دەبێت ببێت. ولادەتی بەشەرییەت ئـەرزش دار ترە لـە ولادەتی منداڵێك. لـەبەرئەوە خوای گـەورە خەبـەر بـەوە دەدات "ئەی میللـەت كە خەریكی زیندو ببیتەوە و ئاواتت هەیە بژیت دەبێت خـۆت بۆ مەشەقەت (ئەشكەنجە –ئازار) حازر بكەیت، بـۆ برسـیەتی بـۆ عـەزیز لـە دەسدان بۆ ماڵ وێران بوون بۆ كێڵگە سوتان، بۆ هەزار بەلاَ و ئافات دەبێـت خۆت ئامادە بكەیت".

زۆر هەن زەجر دەكێشن. بەڵام پاشان شكست دەخۆن، چونكە پایـە داریـان نییە(بەردەوامی – نەوەسـتاوی)، چـونكە موقاوەمـەتیان (بـەرەنگاری)كەمـە، تەنها كوشتە دان بەس نییە، تەنها زەجرو ئازار كێشان كـافی نییـە. پایـەداری هەڵبەتە لـە ڕێگەیەكی ڕاستەوە.

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ محمد (ﷺ) لە ناو ئەو قورسیەی ژیانـدا، لـە نـاو ئـەو ئـەمواجی موتەلاشـی مێژووەدا مژدەی ژیان بە كۆمـەڵێك بگەیەنـە، كـە پایـەدارن و موقاومـەتیان هەیە، دڵیان نالـەرزێ و دڵیان ناسك نییە بڵێن"ئەی داخەكەم خۆ كوشتەماندا دەی با لێگەڕێن بەسە"، واناڵێن.

﴿إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّـهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ رَاجِعُـونَ﴾. كاتێـك بەڵایـەكیان بەسەرا دێت، كاتێك شەهید دەدەن و پێیان وانییە زەرەریـان كـردووە، نـا... ڕێگایەكە لـە ڕووی ئوصول و حیسابەوە دانراوە، دەڵێن "ئێمە خودا دروسـتی كردووین موتەعەلیقین بە خودا دەبێت بەو ڕێگایە كە خودا دیـاری كـردووە ژیان بگوزەرێنین، ئەگەر وابێت پاش ئەوە مەسیری ئێمە هەر بۆلای خوایـە بـا لـەسەر ئەو ڕێگەیە كە خودا دایناوە بۆ خۆشگوزەرانی ژیانی خەڵك بكـوژین و گیانمان بەخت بكەین، پاش ئەوە هەر من ئەمرم. وەك خالیدی كوڕی وەلید (ﷺ) لـە كاتی وەفاتیدا ووتی"ئەی داخەكەم ئەو هەموو تیرە بارانە كرام، ئەو هەموو برینە گەورەم لێكەوت، ئەلئان لـە نـاو جێگـا بێدەسـەڵات خەریكـە ئەرم". مەرگ هاتە سەر ڕێگەی لەناو جێگا كەوت بوو.

مژودە بدە محمد(ﷺ) مافی ژیان بۆ ئەو میللـەتەیە كە لـە كاتێكدا بەڵایـەكیان بۆ پێش بێت لـە جیاتی ئەوەی ئیرادەیـان لـە دەس بـدەن، لـە جیـاتی ئـەوەی سست بینەوە بە پێچەوانەوە عەزمیان و ورەیان بـەهێز تـر دەبێـت! (صـەبر و پایـەداریان) بـەهێز دەبێـت! صـەبر نـەك بـەو مانـا كوردییـە بـڵاوە، كـە یەعنی(ڕاوەستان) نەء!! صەبر، واتە ئیستیقامەت، موقاومەت.

صەبرو پایەداریان زیاد دەبێت و دەڵێن"ئێمە پەیوەستین بە خودا و ئەوەش ڕێگەی خودایە، ڕێگای عەدالەت كە دەبێت مرۆڤ لە زوڵم ڕزگار بكات. خودا دیاری كردوە ئێمە لەسەر ئەو ڕێگەیە خۆمان فیدا دەكەین و (بەدەرەك) با بڕۆین با خەڵكی تر زیندو ببنەوە، با عەزیزی خۆمان لە دەست بدەین و مرۆڤایەتی زیندوو ببێتەوە".

حەقیقەت ئەوەیە كە چەندین سەدە گوزەرا، مێژوو لەم وولاتەدا لە زۆر جێگادا ڕاكیب بوو، ئێران چەند ساڵ لەمەوبەر خەریك چەژنی (٢٥٠٠)ساڵ زوڵم و داگیركردن و مرۆڤ كوژی دەكرد. ئەوەمان لە بیرە، لە وەو دوا چی؟ لە وەودوا زۆر پاینا بە كەڵكەوە! زۆر سەری نا بە لەغاوەوە، زۆر غرور دای لە سەری. دەستی كرد بە هەموو خودسەری و نامەردیەك، وەك فیرعەونە مەشهورەكانی مێژوو ووتی"هیچ گەورەیەك شك نابەم بۆ ئێوە ئیلا خۆم، هیچ كەسێك هەقی یاسا دانانی نییە بۆ ئێوە ئیلا خۆم". دەستی كردە ئیهانەت كردن بە مەركەزە دینیەكان و هێنای مێژووی كۆچی (محمدی كوڕی عبداللە)ی خەت بەسەرا كێشا (سڕییەوە) و مێژووی (كورشی) گوڕ بە گوڕی زیندوو كردەوە! شوكر بۆ خوا شكستیان خوارد، پێیان وابوو(١٤سەدەیە) هەوڵدەدرێت ئەو میللەتە موسوڵمانانەی ئێران بگەڕێتەوە بۆ مێژووی نەنگی (بۆگەنی) شاهەن شاهی بەر لە ئیسلام! پێیان وابوو تازە میللەت مردوە، دەكرێت پێیان بڵێیت ناوی (محمد) لەبیر بەرەوە و ناوی (كورش) زیندوو بكەرەوە، زۆر گەوج بوون نەیان فامی!!




میللەت نەمردوە. بەڵێ، ئەوان گەوج بوون، بەلاّم بە سودی ئێمە تەواو بوو! ڕەنگ بوو ئەگەر ئەوەنە موبالەغە(زیادەڕۆی)یان نەكردایە لە بێئەدەبیدا میللەت ئەو تەكانەی نەدەخوارد.

بەڵێ ئەفرادێكی بێویژدان بوون كە زۆر زوو وەریان گرت، بەلاّم یەكەیەك بەو جۆرە كە قبوڵیان دەكرد كە ناوی محمد(ﷺ) و مێژووی كۆچی محمد (ﷺ) بكوژێتەوەو ناوی (كورش) زیندوو بیێتەوە، بەلاّم لە بەرامبەرەوە میللەتی موسوڵمانی ئێران چی؟

هەستایەوەو قیامیكرد، دەزانن چی كرد میللەتی ئێران بەڕاستی ڕووی مێژووی بەشەرییەتی سپی كردەوە.. میللەتی موسوڵمانی ئێران كە تاغوتی ناچار كرد بڵێت "میللەت هەڵەمكرد مێژووی ئیسلام زیندوو دەكەمەوە"..

لەبیرمانە جەنابی(شەریف ئیمامی) خەڵك خەڵەتێن! خەریك بوو لە مەجلیسدا یاسای دەخوێندەوە، بەپێی مادەی فلاّنی قانونی ئەساسی، مادەی فلاّنی تەواوكەری قانونی ئەساسی، مێژووی ئەم كیشوەرە (وولاّتە) لە هیجرەتی (محمد بن عبد اللە) (ﷺ) دەست پێدەكات، هەر مێژوویەك جیاوازی ئەو مێژووە قاچاغەو خیلافی قانونە. ئەی كێ بوو یەكەمجار دەستوریدا ئەو مێژووە لابەرن و مێژووی (كورش) دابنێن؟ ئاغای (شەریفی ئیمامی) تازە دوای چی ئەم قسانە دەكەیت؟!

سوپاس بۆ خوا، بێحەیایی تاغوت گەشتە جێگایەك كە ئیتر سەبری میللەت بڕا، كە ئیتر موقاوەمەتی نەما، میللەت نەیتوانی قبوڵی بكات لە جیاتی ناوی محمد(ﷺ) ناوی (كورش) بەسەر مێژووی ئێرانەوە بنووسرێتەوە. ئەو قیامەی

كرد كە ئابەو جۆرە تەختی زوڵمی لەراندەوە. ئائەو جوڵە تازە ئەوە ئومێدی لە دایك بوونی تازەیە و ئەوە هەواڵی ژیانی تازەیە.

موسوڵمانەكان! میللەتی ئێران، هەموو لە دەردو ئێشی ولادەتی تازەی میللەتدا شەریكین، هەموو زەجرمان كێشاوە، هەموو كوشتەماندا، هەموو زیندان و دوورخستنەوەمان تەحەمول كرد، بەڵام ئاگات لێبێت میللەتی كورد، دەردێكی هەیە سەر باسەی دەردان! زەجری لە ئێوە زۆر تری كێشاوە! میللەتی كورد ناوێرێ بڵێ من میللەتم، ناوێرێ بڵێ من كوردم، میللەتی كورد ئیجازەی نییە بە زمانی خۆی لە فەرمانگەو لە قوتابخانەدا قسە بكات و دەرس بخوێنێت و دەرس بڵێتەوە! میللەتی كورد ئیجازەی نییە بەزمانی خۆی ڕازی دەرونی خۆی دەر ببڕێت و لەسەر كاغەز بینووسێ.

بەڵێ دەزانم میللەتی تریش زۆر هەن لە ئێراندا كە ئەو زەجرانە دەكێشن، بەڵام ئیسلام دەڵێ چی؟

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (١٣سورة الحجرات)

**سێ قانون:**

یەك: قانونی یەكسانی مرۆڤایەتی، هەموومان فەقەت لە باب و دایكێك دروس كردوە. حەزرەتی عەلی (ﷺ) ئەو ئایەتەی قورئانی لە چەند بەیتێكدا كورت دەكات"النـاسُ مِـن جيهَـةِ تِمثـالِ اَطفـال اَبُهُـم اَدم و لأُمُ حـوا".هەر ئەوەندەی مەتڵەبە، لە ئەوەڵەوە یاسای خودا بۆ ئێمە ئەوەیە كە بەشەر هەمووی لە دایك و باوكێكە هەمووی یەكسانە. هیچ میللەتێك حەقی شانازی فرۆشتنی بەسەر میللەتێكی ترا نییە، هیچ میللەتێك حەقی خواردنی

مافی میللەتێكی تری نییە، هیچ میللەتێك حەقی لە ناوبردنی مافی فەرهەنگی میللەتێكی تری نییە. دەڵێن مەملەكەتی ئیسلامییە ، مەملەكەتی ئیسلامی یانی چی؟ دەڵێن ئیسلام پەناهە.

مەملەكەتی ئیسلامی، واتە ئەوە بە قانونی ئیسلام ڕەفتار بكرێت، واتە ئەوە تەنها فەرمانی خودا حوكوم بكات، بەلاْم بلێم چی لە مەبەستی (ئیسلام پەناهە)قەپان نایخوێنیٚ چەندە جورمە، چەندە كوفرە، پەناگایی ئیسلام فەقەت خودایە، پەناگایی موسڵمانان فەقەت خودایە.بە دوژمنی خوداو بەدژی دینو، دژی تەوحید دژی ئیمان بلێم پەناگای ئیسلام، بە وڵاتێك كە بت پەرستی حوكمی تێدا دەكات بلێیت مەملەكەتی ئیسلامی!!{مەبەست ئێرانی سەردەمی حوكمی شایە، كە ئیدعای ئەوە كراوە ئێران ئسلام پەنایە}.

لە یاسای ئیسلامدا مافی میللەتەكان یەكسانە، هیچ میللەتێك ناتوانێت بلێت بە میللەتێكی تر تۆ حەقت نییە بە زمانی دایك و باوكی خۆت قسە بكەی، بەزمانی دایك و باوكی خۆت كتێب بنووسیت، بە زمانی دایك و باوكی خۆت كتێب چاپ بكەیت.

دەزانم هاودەردی میللەتی كورد هەیە لە ئێراندا، بەلاْم ئەوەندە كەمن لە وڵاتی كوردەواریدا دەركی دەكەم، لە وڵاتەكانی ترا ڕەنگە دەركی نەكەم، دەردی كوردەواری زۆر دەردێكی گرانە.

لە بیرمە جارێكیان هەیئەتێكی تەحقیق لە مەركەزی عیلمی تارانەوە هاتبوون بۆ لای من، بۆ (سنە)، سوئالاتێكیان دەكرد دەربارەی كوردستان، یەكێك لە سوئالەكانیان ئەوەبوو، ئەرێ كوردەواری بۆ دانیشمەندو زانای گەورە گەورەی كوردی كەم لیٚ هەڵكەوتووە؟




وتم: ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟ بەچی دەلیاێك وادەڵێیت؟

وتی: بە پێی ئاسار و نووسراوەكانیان.

بەحسی زۆرم بۆی كرد، بەلاّم وتم: برالە، ئەمن لەوانەیە بەقەد زۆرێك لەوانەی وا قەڵەم وا بەدەستیانەوە لە تارانداو دەنووسن، خوێندەواریم هەبێت و خوێنەوارتریشبم! بەلاّم بۆ نانووسم؟

وتم: حاڵی خۆمت پێ دەڵێم، مرۆڤێك كە بە زمانی خۆی دەنووسێت، یەك زەحمەتی هەیە، كە فكر دەكاتەوە فكرەكەی خۆی دەخاتە ناو ڕستەوە، بەلاّم ئەگەر مرۆڤێك بەزمانی خۆی نەنووسێ و بەزمانێكی تر بنووسێ، دوو زەحمەت دەكێشێ، زەحمەتەكەی یەكەمجار بە ئیزافەی زەحمەتێكی تریش، مرۆڤ بە شێوەیەكی ئاسایی عادەتی ئەوەیە كە لە شتێك لە فكریا هەیە دەیخاتە ناو زمانە دایك و باوكیەوە، ئەمە یەك زەحمەت، دواتر دەبیێت بێت ئەو عیبارەتە تەرجومە بكات بۆ زمانەكەی تر، وتم زەحمەتی كوردەواری ئەوەیە، ئەمن كە میقدارێك توناییم هەیە قەڵەم بەدەستەوە بگرم و بنووسم ئارەزووم ئەوەیە بەكوردی بنووسم، چونكە زەحمەتی كەمە....

ووتم: ئەمن كاتێك خەریكم بە كوردی دەنووسم، چەمكەكانی زمانی خۆم، دەربڕینەكانی زمانی خۆم خوازراوەكانی زمانی خۆم هەموو دەرك دەكەم و دەتوانم جوان جوان هەمووی بهێنمە سەر كاغەز، بەلاّم ئەگەر من موكەلەفبم بەوە لەجیاتی ئەوەی بەزمانی خۆم بەزمانی فارسی بنووسم ئەو توانایەم لە دەس دەچێتن، چونكە وشە و چەمك هەیە بە كوردی زیاتر دەیزانم ماناكانی پێ بڕزێنمەوە بە فارسی نایزانم و پەكم دەكەوێت! شەوق و نەشاتی نامێنت..

**ووتم: كاكــە گیـــان! مەســـەلە ئـــەوە نییـــە كـــە كـــوردەواری زانـــای لێ هەڵنەكـەوتووە، هـەر ئائێـستا زۆر كتێبـی گـەورە گـەورە هەیـە لـە بابـەتی جیاوازی كوردیدا لـە كتێبخانەكانی شار و دێهاتدا كەوتوون و تـۆز دەخـۆن، ئەگەر بەكوردی دەینووسی چاپ ناكرێت، ئەگەر قەرارە بەفارسـی بینووسـێ ناتوانێ جوان بیڕازێنێتەوە وەك زمانە دایكێكەی خـۆی، ئاسمـان بـەرزو زەوی سەخت!!**

**دەردی كوردەواری ئەوەیە، من ئێستا ئەگەر خـەیاڵم بێـت ئـەو مەسـائیلـەی بەكوردی دەیلێم بە فارسی بیلێم، یـەكجار زەحمـەتم زۆر دەبێـت كـە ئێـستا خەریكم بە كوردی دەیلێم.**

**برا ئێرانیەكان، خوشكە ئێرانیەكان، هاودەردین شوكور بۆ خودا هیچكاممان لەوی تر جێنەماوین. هەموو لـەئەم زەمـان و حـەیات و تەكانـەدا وەكیـەك زەجرو ئێش قبوڵ دەكەین و تەحەمول دەكەین، بەڵام برا ئێرانیەكان لـەبیرتان دێت ئێوەش زووڵمتان كێشاوە لـەم مێـژووە نەنگینـەدا ئێمـەش زوڵممـان كێشاوە، ئەگەر بەئومێدی خودا ئەو دەورانی زوڵم و ستەمە لـەبـەین چـوو نابوت بوو، ئەم تاغوت و ئیستیبدادانە ڕوخان و وێران بوون شـەراكەتەكەتان لـەبیر نەچێتەوە، میللـەتی كوردستانتان لـەبیر نەچـێتەوە. میللـەتی كـوردی هەروا هاو دەردی ئێوەیە لـەهەموو دەردەكانتانـا، ئائـەو دەردە گەورەیـەش هەیە، دەردی مەحرومیەت لـە مافی نەتەوەی خۆی.**

**نمونەیەكی بچكۆلـەتان بۆ دەگێڕمەوە، تاقە منداڵێكم هەیە كوڕێكە ناوی (حمە ژیانە)، ئەولادی هەمووومان بۆ خێر مووەفەق بن، حـەیاتیان بەسـەر بـەرزی و ئیمان تەواوە بێت، ئەوە ئەساسە. (سێ ساڵ) لـەمەوبەر ناردم بـۆ مەدرەسـەی**




ڕەهنمایی هاتەوە گووتی"بابە! گووتویانە دەبێت(پانتۆڵ)لە پێبکەیت"، گووتم "ڕۆڵە گیان! ئەتۆ منالی زۆر مەسئەلەی وا هەیە فەقەت ئەوەنەندەی بەر تۆ دەکەوێت، خۆت ئەوەندەی حاڵی دەبیت و زەجری ئەوەندەی دەکێشیت".

ووتم "ڕۆڵە گیان! تا ئێستا پانتۆڵ و شەرواڵیشت لە پێ کردووە، من پێشنیارێکت بۆ دەکەم، وەرە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی منداڵانە، جیهادێکی منداڵانە دەس پێبکە، ووتی چۆن؟

ووتم: ئیتر پانتۆڵ لە پێمەکە.

ووتی: ئاخر لێم دەدەن.

ووتم" ڕۆڵە! ئەگەر توانایی ئەوەت هەیە لێت بدەن، شەلاق بدەن بەناو دەستدا، خەمەخۆو مەگری ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە دەس پێبکە، دەستی پێکرد، دەهاتەوە جارجار دەستی پیشان دەدام.

دەیووت: بە کێبڵ بەو سیمە ئەستورانە داویانە بە ناو دەستمدا!

ووتم: ڕۆڵە گیان! ئەوە مانای ئەوەیە هەیت، ئەگەر نەبوویتایە لێیان نەدەدایت.

دەورانی مەدرەسەی سرەتایی تەواو کرد، ئەم ساڵ چوو بۆ ئامادەیی، دیسان بەزم دەستی پێکردەوە.

بەڕێوەبەر و جێگری قوتابخانەی ئامادەیی زۆریان بۆ هێنا بە وەسیلەو واستەکاری ئەم سەرو ئەو سەر، چونکە من دیفاعم لێکرد ئاخری ووتم بە بەڕێوەبەری قوتابخانە"نامەوێت لێپرسراوی بکەوێتە سەر شانی ئێوە، مەسئولیەت دەگرمە عوهدەی خۆم، ئێوە نامە بۆ من بنووسن، بنووسن ئەم کوڕەی تۆ نەزمی دەستوری قانونی شکاندووە".کامە دەستور؟

ووتم: كاغەزێكم بۆ بنووسن، بڵێن م كوڕەی تۆ بێنەزمی دەكات و دەستور دەشكێنێت ئەوسا من جوابتان دەدەمەوە، با مەسئولیەتەكە بێتە ئەستۆی من، ئەمن گووناهم زۆرە با ئەوەش سەر باری گوناهان بێت.

ئا ئەوە ماجەرایەكە برا موسوڵمانەكانی سەرتاسەری ئێران، كە ئێمە گرفتاری بووین و تاقە منداڵێكم هەیە هەموو دەزانن منداڵ چەند خۆشەویستە، چەند جار دیومە ناو دەستی(تلۆقی) كردوە. لەسەر چی؟ لەسەرئەوە شەرواڵی لەپێ كردوە، میللەتی كورد زەجری ئاوا دەكێشێت!!

براكانم! لەبیرتان بێت ئەو ڕۆژە كەوا ئێشی زاڵمان تەواو دەبێت میللەت خەریكە موتەوەلید دەبێت و بە ولادەتی ئیفتیخار و سەربەرزی و ئیمان و ئیسلامەوە، لەبیرتان بێت كە كوردەواری زەجری لەئێوە زۆرتر كێشاوە، هەر كوردەواری نا میللەتانی تریش.

لە بیرتان بێت ئەو حقوقە(میللی)ە وا تەحقیر كراوە دەبێت لەو تەحقیرە ڕزگاری ببێت، دەبێت ئەو مافە ئازاد بكرێتەوە. ئەوە بە عینوانی تەحقیری زمانی فارسی ناڵێم، ئەوە بە عینوانی تەحقیری موبارەزانی برا فارسەكانم ناڵێم. ناء بەعینوانی ئیهانەت بە زووڵمی زاڵم، زاڵم لە هەموو كەس زوڵم دەكات، بەڵام هەركەس بەپێی شەرائیتی خۆی زوڵمی لێ دەكرێت و فارس تەحەمولی ئەو زوڵمە دەكات، كوردیش تەحەمولی دەكات، بەلوجیش تەحەمولی دەكات، تورك تەحەمولی دەكات، ئازر باینجات تەحەمولی دەكات، هەمووی تەحەمولی دەكات. بەڵام ئەو میللەتانەی وا ئیجازەیان نییە بە زمانی خۆیان قسە بكەن و بنووسن مەحرومیەتی ئەوانە زۆرترە، ئەوەندەتان لە بیربێت، كەلە ڕۆژی ئازادیدا ئائەو حقوقانەش ئەسیرن، هەروا كە خۆمان تا





ئێستا بە هەموو شتێکمانەوە ئەسیر بووین، ئەو مافە ئازاد بکەن. ئەوجار ئەی موسەڵمانەکان، ئەی بابێك کە جەرگت سوتا ئەی برایەك کەبرای خۆت پێشکەش کرد بۆ ژیانی میللەت، ئەی دایکێك کە جەرگت سوتاو ڕۆڵەت لە کیس چوو بۆ ئەوەی میللەتێك بژێتەوە.. سەربەرزی بۆتۆ، شانازی بۆ تۆ، سەلام و ڕەحمەتی خوا بۆ تۆ، ئەی برای شەهیدم، ئەی ڕۆڵەی شەهیدم شانازی دەکەم کە ولاّتم ڕۆڵەی وەك تۆی هەیە. لەکانگای دڵمەوە دەڵێم، تاقە منداڵێکم هەیە ئارەزوم هەیە ئەویش وەك ئێوە بمرێت، ڕۆڵە شەهیدەکانم.. فەرقی ئێوە لەگەڵ منداڵەکانی خۆم ناکەم، بەئیمانم، بە خودام، بەدینم، بە قورئانم، بە محمدم...ئارەزووم ئەوەیە کە خۆم و منداڵ و خۆشەویستم و هەموو کەسم لە بەر خاتری ڕێگەی خودا بمرن .

﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾* دوو هەدەف:

یەك: موسوڵمان و گیانبازی ناکەن لەبەر خاتری ڕێگای خودا، موسوڵمانی بەوە ناڵێن.

دووەم: ﴿وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾.

ئەگەر موسوڵمانی دەبێت گیان بازی بکەیت، گیانت بەخت بکەیت لەبەر دوو شت:

---

*) ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾(٧٥) سورة النساء

یەك: ڕێگای هەواو هەوەس ڕێگای تاغوت، ڕێگای شـەهوەت پەرسـتی، کـە بەسەر میللەتاندا جێبەجێ دەکرێت، مـەحفی کەیتـەوەو لاییبـەیت و ڕێگـای خودا دامـەزرێنیت، چـونکە فەقـەت خـودا بەنـدەکانی خـۆی دەناسـێ تـوو هەرکەس فەقەت لـە حاڵی خۆی تێـدەگات نـاتوانێ لـە حـاڵ هـەموو کـەس تێبگات فەقەت خودایە لـە حاڵی هەموو کەس تێدەگات وە فەقەت بەرنامـەی ئەوە بە کاری بەشەر دێت.

ئەوەڵێن دەستوری گیان فیدا کردن، ئەوەیە ئەو بەرنامانەی وا بەشـەر سـازی دەکات هەرکام بە پێی فیکر و ئاوات و ئارەزووی خـۆی، جـا بـرێ چـاك و برێ خراپ یا خراپ ترو خراپ تر ئەوانە هەمووی داون لـە ڕێگەی ئـازادی بەشەردا، داون لـە ڕێگەی مافەکانی بەشەر دەبێت هـەمووی لـە نـاو بـچێت فەقەت بەرنامەی خودا دامەزرێت بەرنامەی خودایەك کە ئیمتیازاتی تێدا نییە، تەبەقاتی تێـدا نیيـە، بـان و خـواری تێدانییـە. ﴿...إِنَّـا خَلَقْنَـاكُمْ مِـنْ ذَكَـرٍ وَأُنْثَى...﴾ (١٣)سورة الحجرات

لـەوەودوا ،لـەبەر شتێکی تر خۆتان فیدا بکەن.

﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا﴾ لـەبەر داماوان، لـە بەر زوڵـم لێکـراوان، لـەبـەر تەحقیر کـراوان چ پیـاو، چ ژن، چ منـداڵ کـەوا ژیانیـان لـێ تاریـك بـووە ئومێـدێکیان بـەجێگاو ڕێگـای خۆیـان نـەماوە و نیـشتمانیان لـێ بێـزراوە، نیشتیمانێك کە لـەگەڵ گیانی مرۆڤ تێکەڵـە، نیـشتیمانێك کـە تـانوپۆی مـرۆڤ بەوەوە گیرساوە. "هاوار دەکەن دەڵێن خوایا ڕزگارمان بکە لـەم مەملەکەتـە

وا فەرمان ڕەواکانی زاڵمن، وا زۆر دارەکانی ڕەحم و بە زەییان نایەت لە بە ژن نە بەپیاو نە بەمندالاّ خوایا لە تەرەف خۆتەوە دۆستێك و یاریدەدەرێکمان بۆ بنێرە". گەر موسوڵمان ڕاستدەکات موسوڵومانە تەنها بە خۆشگوزەرانی و بە عینوانی موسوڵمانی وبە ڕۆژو نوێژ نابێتە موسوڵومان، بە گیان فیداکردن دەبێتە موسوڵمان. پێغەمبەر (ﷺ) صەحابە، گیان بازیانکرد زەحمەتیان کێشا، زەجرو موشەقەتیان تە حەموڵکرد تا حەقی بەشەرییەت زیندو بویەوە، تا زوڵم و داگیرکاری لە هەموو شوێنێکی دونیادا ڕووخا، بەشەریەت هەروا بە ئاسانی ڕزگاری نەبوو، ئێستاش هەر وایە. دەبێت حەتمەن گیان بازی بکرێت:﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾* ئازادی سفرەیەك نیە ڕاخرا بێت، بلێین جا قوربان فەرموون بخۆن. نا٠... ئەسارەت (ئەسیر) مەعلولی حاڵەتێکە کە ئێمە هەمانە. ئازادی بەر عەکسی ئەو حاڵەتە پەیدا دەبێت، لەو حاڵەتەدا وا ئەسیرین وا زەلیلین چی مەسائیلێك مەترەحە بۆ ئێمە؟ ڕۆحییەمان چۆنە؟ شەرائیتمان چۆنە؟ ئەخلاقمان چۆنە؟ ئەو ئەخلاقیەت و شەرائیت و ڕۆحییەت و سیفات و خصوصیاتە بگۆڕین ئیستیحقاقی حەیاتی تازە پەیدا دەبێت.

﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾(٦٢سورة الأحزاب) ئەمە نیزامێکە خوای گەورە بۆ ژیانی بەشەرییەت دایمەزراندوە لە (ئادەم)ەوە تا هەر کاتێك بەشەر لە سەر زەوی بمێنێت ئەم نیزامە وا

---

* ) ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ ﴾(١١) سورة الرعد




دیمەزراندوە نایگۆڕێت، دەبێت كاتێك حەق بێت بۆ ئێوە قبوڵی بكەن و بە گیان و دڵ پێشوازی لێبكەن، جا ئەو وەختە دەتوانن مافی ژیان پەیدا بكەن.

بە داخەوە هەڵە زۆرە، فیكری ناصەحیح زۆرە! بڕێك كەس باش تێدەگەن لە مانای ڕووبەڕوو بونەوە لە مانای جیهاد لەمانای شەهادەت بڕێك كەس خراپ تێدەگەن. حەقائیقی ئیسلام زۆرە و نەوێژراوە، قەرنها نەوێژراوە بۆیە میللەت مردووە. لەو كاتەوە ڕەهبەرانی دین دەسیان كردوە بەوتنی حەقائیق ئەوەتا میللەت ژیاوەتەوە، بەڵام زۆری تریش هەیە كە نەوێژراوە! ئیسلام هەر تەنها عیبارە نییە لە ئایدۆلۆژی ، عیبارەت نییە لە بەرنامەیەكی فیكری، عیبارەتە لە نیزامی سیاسی، نیزامی كۆمەڵایەتی، نیزامی ئابوری، عیبارەتە لە نیزامی پەروەردەی و نیزامی پەیوەندیەكان لەناو كۆمەڵگەدا و نیزای پەیوەندیكردنی كۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەوانی دیكە. ئیسلام كۆی ئەوانەیە...

حسابی ئیسلام بۆ حقوقی میللەتان ئەوە بوو كە ووتم، حیسابی ئیسلام بۆ ئیقتیصادی كۆمەڵگەدا بە جۆرێكی كورت كراوە بڵێم*... دوو مەرحەلە بە نمونە دەگێڕمەوە، مەرحەلەیەكی نیزامی (ئیخاء ) (برایەتی) كە بۆ یەكەمجار لە شەرائیتێكی پڕ لە ترس و خەتەردا، كۆمەڵگەیەكی بچكۆلەو جوان و خاوێنی ئیسلامی كەلە (مەدینەی منەوەرە) دروسدەبوو پێغەمبەر(ﷺ) پیادەی كرد .

نیزامی (برایەتی) برایەتی هەموو جانبێك. مەبەستم زیاتر برایەتی ئیقتیصادی ماڵ. لە نیزامی برایەتیدا پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەرفەقیرێكی كردە برا بەشی دەوڵەمەنێك، كۆمەڵێك فەقیرو كەم دەست بوون، كۆمەڵێك

---

* ) لە باسەكانی دواتری هەمان بەشدا باسێك ئامادەكراوە دەربارەی كۆمەڵگەو ئابووری ئیسلامی.

دەوڵەمەند بوون. دەوڵەمەندەکان بەرەو موسوڵمانی هاتبوون و بەدڵ موسوڵمان بوون و تەواوی نیزامی ئیسلامیان قبوڵ بوو،(هەڵبەتە جگە لە ژمارەیەکیان کە ئەوانە لەدەروەی ئیسلام بوون و موناڤق بوون!).

پێغەمبەر (ﷺ) یەکەمین نیزامی ئابوری بۆ ئەوەڵین کۆمەڵگەی ئیسلامی کە تەشکیل دەبێت (برایەتی) دیاریکرد. هەر فەقیرێك برا بەشی دەوڵەمەنێك! با بڵێین ئیمان چی کرد، زۆر بوون لە دەوڵەمەنەکان پێشنیاریان بۆ برا بەشە فەقیرەکەیان ئەکرد، "کە کاکە ئەمە بەم جۆرە دیار نییە کەتۆ زوڵمت لێنەکرێت، تۆ تاقە نەفسێکی و ئێمە زۆر، ئێمە چەند سەر خێزانین و تۆ تاقە کەسێك ئەگەر ئاوا بخۆیت و بخۆیتەوە ئەوە کەی برا بەشییە؟ دەبێت لێگەڕێیت دیوارێك لە ناو ماڵەکەماندا دروسبکەین و بیکەینە دوو بەش ئەقەڵەنە ئەوە وا موستەغەلاتە و ماڵێکە کە دەکرێت بەشبکرێت بێتە دووبەشەوە، هەرچی وەسائیلی ناوماڵە بیکەینە دوو بەشەوە، من هەرچەند دەرۆم کاسبی دەکەم و دەرامەتم ببێت ئێوارە بێم بەشی بکەم لەگەڵ تۆ دەنا ئەگەر بەو جۆرە بێت ئێمە چی دەخوێن تۆش ئەوە بخۆیت، ئێمە چوار نەفەر، پێنج نەفەر، دە نەفەر، ئەوە کوا برایەتییە؟!" ئاوا برایەتییان قبوڵ کردوە، کە خۆیان ئەو پێش نیهادەیان دەکرد.

یەکێکی تر لە پێش نیهادی تر، کە دەورانی برایەتی دەورانێکی ئابوری پاك و جوانی ئیسلامی بوو لەو ئەوەڵی ڕۆژی ژیانی ئیسلامییەدا. ئاخر دەوران دەورانی(دیوانە)کە (حەزرەتی عمر بن الختاب)(رضي الله عنه) تاعینی کرد. حەزرەتی عمر، خەبەریدا بە شورای موسوڵمانان کە بۆ ساڵێکی تر وەها بەرنامەی ئابوری ئیسلام پیادە ببێت لە تەواوی سەر زەمینی فراوانی ئیسلامدا لە

نیوەی(ئاسیا و ئەفەریقا) هیچ مرۆڤێك لە تەواوی ساڵا تاقە درهەمێکی لە مرۆڤێکی تر، زیاتری نەبێت و خەرجی نەکات! زۆر بەکورتی ئەوە نیزامی ئابوری بوو لە ئیسلامدا.

نیزامی ئابوری لە ئیسلامدا ئەوەیە کە هەرکەس بەقەد پێداویستی خۆی دەبێت سود بکات لە حەقی گشت شتێکی کۆمەڵگدا. بەڵام حیسابی ڕەهبەران لە ئیسلامدا موستسنایە ئەوان ناتوانن وەك خەڵك بن، یانی چی؟ موستەسناء واتە ژیانێك خۆشتریان بێت؟! شورا پێش نیاری کرد بۆ (عمری کوڕی ختاب) ووتی: وەزعی موسوڵمانان زۆر خۆشەو داهاتی تۆ یەکجار کەمە خەبەرمان هەیە ماڵت چوڵە، منالت ڕووتە، ژنت برسییەتی ئیجازە بدە با حقوقت بۆ دوو بەرامبەر بکەین، خەبەریشت هەیە وەزعی موسوڵمانان چەند خۆشە ئێمە ئەوەمان پێ تەحەمول ناکرێ کە ماڵ و منالی(عمر) بەو سەختی و ناڕەحەتییەوە ژیان بگوزەرێنن{حەزرەتی عومەر ئەمە قبوڵ ناکات}.

دواتر دەچن بۆلای کچەکەی عمر(حەفصە) کە خێزانی پێغەمبەر بوو داوای لێدەکەن کە بڕوات قسە لەگەڵ عمر بکات، پێیان ووت(بانەزانێ لەلایەن ئێمەوە نێرراویت بە زمانی خۆتەوە)، چونکە ئەتۆ دوو پەیوەندیت هەیە لەگەڵ (عومەر) یەك کچی ئەوی، چونکە کچی ئەوی عاتیفە لەبەینتانایە. دوو خێزانی پێغەمبەر بوویت (ﷺ) لەبەرئەوە ئیحترامی دایکیت هەیە بەلای عومەرەوە، بەو دوو قودرەتەوە بچۆ مەیدان و باسی ئێمە مەکە ، ئەتۆ خۆت باسی بۆ بکە ، بڵێ: بابە گیان تۆ بۆ ڕازی دەبیت ماڵی خۆمان براکانم خوشکەکانم ئەوەندە ناڕەحەت بن، (حەفصە) هات بۆلای بابی بۆلای عومەر. کامە عومەر؟ ئەوە وا شاهەن شاهی ئێران لەبەر هەیبەتی، لەبەر ناوی لەرزاو

ڕووخا، ئەوە وا پادشای ئێران کونە مشکی لێ بوو بە عەماراو لەهیوالی لەبەرامبەری هەیبەتی عومەردا خۆی ڕابگرێ، ئائەو عومەرە وەزعی ژیانی ئاوایەو لە حاڵێکدا قودرەتی سەروەری ئیسلام ئەوندە زۆرە.
(حەفصە) هات بۆلای پێش نیاری بۆ کرد.
عومەر ووتی"حەفصە تۆ ژنی پێغەمبەر بویت (ﷺ) . تۆ بۆم باسکە بزانم پێغەمبەر (ﷺ) چۆن ژیانی ئەگوزەراند؟
ووتی: بابە گیان! کاتی وا هەبووە مودەتها گوزەراوە ئێمە لەسەر زەوی خەوتوین و فەرش و پێخەف نە بووە، زۆر ڕۆژ بووە کەناومالەکە سەر تا ئێوارە بۆ ئەوەی کەمترین خواردنمان هەبێت. زۆرێك لەمانەی تر.
ووتی: ڕازیت، ڕۆڵە پێغەمبەر چاکی کرد یان خراپی کرد؟
(بەگریانەوە)ووتی: بەقوربانی ناوی بم زۆر چاکی کرد.
زۆر چاك حاڵی بوو لەمانای ژیان و زۆر چاك حاڵی بوو لە مردنی ئینسانی، ئینسان دەبێت ئاوا بمرێت. نەك هەر خەریك بێت جسمێك بلەوەڕێنێت لە وەو دوا بکەوێتە ناو ئەو قەورە بۆ ئەوەی مارو مێروو بیخوات.
ووتی: دەی ڕۆڵە خەبەرت هەیە دوای پێغەمبەر (ﷺ) و (ابوبکر) چۆن زیندەگی کرد؟
باسی ژیانی ابوبکریشی بۆ کرد.
ووتی: بابە ابوبکریش زیندەگی کردنی جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ژیانی پێغەمبەر.
دەزانی لەسەرەتای خەلافەتیدا دەچوو کرێکاری دەکردو بەپارەی کرێکاری خۆی و ماڵ و منداڵی دەژیاند. تا لەکۆتایدا سەیریان کرد وەزعی کۆمەڵگە زۆر جوان بەڕێوە ناچێت،ئەگەر ئەو بەیانی تا ئێوارە بڕوات کرێکاری بکاتو

ئێوارە بێتەوە بۆ ماڵ ، ئەوجا موچەیان بۆ بڕیەوە. هیچ حازر نـەبوو حقوقێـك بداتە ماڵەوەو كەمترین خۆشگوزەرانی بۆ ماڵ و منداڵەكەی فەراهەم بكات.

ووتی: حەفصە! ڕازیت لـە ژیانی ابوبكر؟ پێتوایە ابوبكر هەڵەی نەكرد؟ پێـت وایە ئەو ڕێگایەی ابوبكر جیا نابێتەوە لـە ڕێگاكەی محمـد (ﷺ) پێتوایـە لـە قیامەتا (محمد و ابوبكر) لـەسەر یەك مەنزلاٌ ئەگەنەوە یەك؟

ووتی: ئیمانم هەیە وایە.

ووتی: جا ڕۆڵەگیان! ئەگەر ئیمانت هەیە ڕێگەی (محمد) (ﷺ)ڕاسـت بـوو. ئەگەر ئیمانت هەیە لــە مـەنزلاٌ ابـوبكر دەگاتـەوە ئـەو جێگەیـە وا (محمـد) پێیگەیشتوە؟ بۆ پێشنیارێكم بۆ دەكەیت كە كەمێك ڕێگاكەم لە ڕێگای (محمد و ابوبكر) جیا بكەمەوە؟

ووتی: ڕۆڵە گیان! ئەگەر كەمێك ڕەفاه و خۆشی بخەمە ماڵی خۆم(هەوەسم) لیٌ زیاد دەبێت. هەوەسم لیٌ زیاد بوو دڵم وورده ورده دوور دەكەوێتەوە، نەختێك هەوەس لـەمندا زیاد بوو، صەد بەرامبەر لە مەئمورینی ولاٌتدا زیاد دەبێت، عەدالـەت ئەو كاتە لـەناو دەچێت! ڕێگەی من لە ڕێگـەی (محمـد و ابوبكر) جیا بوویەوە ناگەمە ئەو مەنزڵە وا (محمد و ابوبكر) پێی گەیشتن.

ووتی: ڕۆڵە! ڕازیت ئەمن لـە مەنزلاٌ جیا ببمەوە لە (ابوبكر و محمد). ڕۆڵە! ئەگەر منت خۆش دەوێت پێش نیهادم پیٌ بكە بەڕێگەی (ابوبكر و محمد) وێڵ نەكەم.

دیسان بەگریانەوە ووتی: بابە گیان! چاك دەكەیت و تكادەكەم ئەو ڕێگایـە تـەرك مەكە. قەیناكا با براو خۆشەویستەكانی من هەر وەك خۆت برسیان بێت.

واقیعەن لـە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا مەرجی ئابوری جیاوازی هەیە لــە خـەڵكی تر، خەڵك دەبێت هەمووی وەك یەك بێـت. بـەلاٌم ڕەهبـەر دەبێـت سـەخت

بیگوزەرێنێت، ڕەهبەر دەبێت وەك شوانێك بە دیار ڕانەوە كـە ڕانەكـەی لـە ئاسایش و خۆشیدا بێت ئەو لـە ناخۆشیدا بێت، ڕەهبەر دەبێت ئاوا بێت.

دەڵێن وڵات وڵاتی ئیسلامییە وایە؟

ڕەهبەری وڵاتی ئیسلامی (محمد)ە (ﷺ) ئەو دەورانە درەخشانەش وازلێبێنن! (بەنی ئومەیە) شاهەن شاهییان زیندو كردەوە لە سەر زەمینی ئیسلامدا، هەم ئیمپراتۆری (ڕۆم)، هەم شاهەن شاهی (ئێران) بە تـەواوی حـسابی زوڵـم و داگـیر كاریـیـەوە خولاسە بوویەوە لە دەرباری (بـەنی ئومەییـەدا)، بـەڵام ئینـسانێكی مـوئمین لـەو خانەدانە پیسە هەڵكەو كە (عمر بن عبد العزیز) بوو. (عمـری بـن عبـد العزیـز) حەزرەتی شافیعی دەفەرموێت"بەڵێ .لە لەحازی جۆری دەسەڵات گرتنـە دەسـت خەلیفە نییە، بەڵام لەلایـەن جـۆری ڕەفتـارو بـەڕێوەبردنی وڵاتیـەوە خەلیفەیـە". لەبەرئەوە بە خەلیفەی پێنجەمی دەناسێ. كاتێك ڕەهبەر كەوتە دەست (عمر) تاقە باخێكی بوو كە (٢٠٠) دارێك بوو خۆی چەقاندبووی دەرامەتی ئەو باخـەی دالـا بۆ ماڵ و منـداڵی، لـەوە زیـاتر هیـچی نـەبوو. بـەڵام پـەنا بـەخوا میوانێـك ڕێـی بكەوتایەتە (دەربار) كۆڵە وار دەبوون!

ڕۆژێكیان ژنێكی پیری مێرد مردوو لە (میصر)ەوە هاتبوو بۆ ماڵی عومـەر بـە میوانی. چونكە ئەو ڕۆژە پیرە ژنێك هاتبوو بووبوویە میوان نیزامی ئیقتیصادی دەربار تێكچوو! چونكە حسابی وا كردبوو شەوێك خۆیی و ماڵ و منالی نـان و پیازیان دەخوارد، شەوێك نیسكی كولاو ئـەو ڕۆژە پـیرە ژنێـك بـەمیوانی هاتبوو دەربار خواردنی نەما، شەو هیچ نەبوو بیخۆن، چونكە خەرج كرا بوو بۆ نیوەڕۆی پیرە ژنەكە، (عمر بن عبـد العزیـز) ئـامۆزای (عبـدالملك) بـوو،

ژنەکەشی کچی (عبد الملك)بوو (عبد الملك و عبد العزیز) برا بوون.
عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو، ژنی (عومەری) کچی (عبد الملك) بوو.
کوڕەکانی (عبد الملك) هەم دەبوونە ژن برای ( عومەر عبد العزیز)، هەم دەبوونە ئامۆزای، یەکێك لە کوڕەکانی (عبد الملك) هات بۆ ماڵی (عومەر) بۆلای خوشك و، خوشکەزاکانی، کاتێك چوو بینی منداڵی بچکۆلە بچکۆلە کە تەواو دانیان نەهاتووە وردە نانی ڕەق ماوەتەوە، قەراغە نان، دەیکەنە ئاواو دەینێنە دەمییان ئەوە دەخۆن. کابرا پرسی چی ڕوویداوە؟!
فاتمەی خێزانی عومەری بن عبد العزیز وتی"وەڵا بۆ نیوەڕۆ ژنێکی میصری میوانمان بوو، لەبەر پێشوازی لە ئەو مەجبور بووین خواردنەکەی خۆمان بدەینە ئەو، ئێستا شتێکمان نەماوە بۆ شەو".
بەنی ئومەیە. زۆر هەوڵیان دەدا کە عومەر بخەنەوە سەر ڕێگاکەی خۆیان و نەدەکرا. ئامۆزاکەی ڕۆشت بۆلای (عومەر) و دەستی کرد بە نەسیحەت کردنی، پێیوابوو ئەمە ڕووداوێکی عاتیفە وروژێنەرە و، بەڵکو تۆزێك دڵی نەرم ببێت و تۆزێك خۆشی و ڕەفاه بخاتە ناو ماڵ و منالی، عومەر جوابی دەداتەوە، چونکە بە ئیمان بوو نەفرینی خانەدانی بەنی ئومەیەی دەکرد، دەیگووت"تەنها خولەفای ڕاشیدین حەق بوون و باقی باتڵ بوون".
ووتی: ئەو پارەی لە بەیتول ماڵدا هەیە بۆ ئەمیرو خەلیفەکان حەڵاڵ نییە، ئەوە ماڵی میللەتەو ئەوانەی خیانەتی لێبکەن شایستەی لەعنەتن. ئاوا دەبێت ڕەهبەری ئیسلام، ئاوا دەبێت ئابوری ئیسلام. نەصلێك زۆر درۆ کراوە لەبارەی ئیسلامەوە. ئەفرادێك و یەکە یەکەیدك بوون بەناو ڕەهبەری دین، کە قورئانیان گۆڕیوەو مانایی قورئانیان لە خەڵك تێکداوە. درۆو دەلەسەیان

لەجیاتی ئایاتی خودایان بە خەڵك داوە. موسوڵمانەكان نەخەڵەتێن، داخی داخانم ئەفرادێكی نەشارەزا سوء ئیسفادە دەكەن لەوە كە یەكە یەكەیەك بەناوی ڕەهبەری دین ئەو بێ دینیەوە بێ شەرمیانە دەكەن، ئەو خەیانەتە دەكەن بە میللەت و بە خەڵك. بیستومە لەم ڕووداوانەی (بۆكاندا) یەكێك لە هاوڕێكانی خۆم درۆی كردوە. (لە زەمانێكدا لە لەحزەیەكدا واهەڵكەوتوە كە كەسێك لە ڕابەرانی دین دیار نەبوون)

ووتویەنی: خەڵكینە ئەوە گەلە دەبێت تەماشا بكەن بزانن دانەیەك ڕەهبەری دینی هەیە لە ناوماندا؟ با ئەوەمان لە بیر بێت. بێ ئینصافی كردوە خودی شەهیدەكانمان هینی بنەماڵەی دینی بوون، خودی شەهیدەكانمان موسوڵمان بوون.. سەیرێكی تەواوی ئێران بكەن بزانن ئەوانەی دیارن و ناوی خۆیان دەڵێن و ئاگاداری بڵاودەكەنەوە بە ئیمزای خۆیانەوە(مەبەستی ئەوەیە ناترسن لەوەی كەشف بن و دەستگیر بكرێن)، دەكوژرێن ئازار دەدرێن كێن؟ هەر ڕەهبەرە دینیەكانن. بزانن ئەوانە وا مزگەوتەكان بە دەنگی قورئان دەلەرزێننەوە ئینسان و موسوڵمانەكان وە حەرەكەت دەخەن كێن؟ ڕەهبەرە دینیەكانن. بزانن هەر لەشاری (موكریانی)خۆتاندا. لە بەرامبەر ئەو یەكە یەكە دین فرۆشانەوە وا ئەمیری دەزگان، وا لەبەر قەران قەرانێك پوڵ خیانەت بە دین و بە ئومەت و میللەت دەكەن، لە بەرامبەری ئەوانە ئەمسالی (مەلا شێخ عیزە الدین)تان لە بیر نەچێتەوە ئەری براكانم، ئەری موسوڵمانەكان! ئەوە بزانن لە زەمانێكدا كە خەڵك دەترسا، كەسێكی تر نەبوو لەمەیدانی عمومیدا وتار بخوێنێت تا بڵێ مەلا بۆ نەیكرد؟ عمومی خەڵك زەعیف بوو، عمومی خەڵك تەحەمولیان زۆر بوو، وەختێك خەڵك

تەحەمولی نەما، پێشەنگی هەموو خەڵك هەر ڕەهبەرە دینیەكان بوون. براكانم گشتمان دەزانین (مەلاشێخ عزالدین ) لەكەیەوەكە خەریكە و مەسائیلی ئیسلام دەڵێت. براكانم! لە زەمانێكدا كەس زاتی نەبوو قسە بكات (مەبەستم ئەوە نییە باسی خۆم بكەم، مەبەستم ئەوەیە بزانن مرۆڤی موسوڵمان ناترسێ).

لە بیرتانە مەرحومی (حاجی ڕەحمان ئاغا) وەفاتی كرد بوو. لەهیچ لایەك دەنگێكی موبارەزە (ڕووبەڕوو بونەوە) نەبوو. ئەمن هەر لەو مزگەوتەدا نزیكەی (دوسەعات)چیم كرد؟ لە بیرتانە تەواوی ئەوەی كە هەموو مرۆڤێك لە ووتنی ئەلەرزا من وتم!! جەرەیانی مەرگی (كاك فوئاد)تان لە بیر نییە؟ ئەوە كێبوو لە (سابلاغ)دا ئەو قسانەی كرد؟!

چی بكەم ڕاست دەكەن ئەوە وا دەڕوات مەداحی و سەناخانی دەكات ئەو وا دەڕوات ئایەتی قورئان بە هەڵە مانا دەكات مێزەرەكەی وەزنی من دەبێت! عباكەی شانی چواری وەك منی تێدا ون دەبێت!! براكانم ئێستا و لە هەموو زەمانێكدا ئەوە وا بەڕاستی و نەترسانە قسە دەكات هەر ڕەهبەری دینە. بەلاّم بلێم چی، ڕووی ئەو بێشەرەفە ڕەش بێت وا جاسوسەو بەناوی ڕەهبەری دین ئابڕوی دین دەبات.

براكانم! ئاگاداربن لێرە بەدواوە وشیار بن بەڵێ، میللەت تەكانی خواردوە، میللەت زیندوو بۆتەوە، میللەت خەریكە ئێش و دەردی ولادەت تەحەمولّ دەكات وە بە ئیزنی خوا ژیان بەشوێنییەوە دەبێت، ولادەت بە شوێنیەوە دەبێت،بەلاّم خالێك هەیە دووبارەی دەكەمەوە، كەدەبێت هەموومان بیزانین و لەو بارەیەوە ئاگادار بین و بێ ئینصافی نەكەین، ئەویش مەسەلەی بەشداری كردنی مەلا و مامۆستایانی ئایینیە لەجولاّنەوەكاندا، هەندێك دەڵێن مەلاكان





لە خۆپیشاندانەکاندا ئامادەییان نییە! ئەرێ ڕاگەیاندنەکانی منتان نەدیووە کە تائێستاش بەردەوام ڕایدەگەیەنم، لەکاتێکدا من قسەم کردووە کەسێك نەبووە لە وڵاتدا بتوانێت قسە بکات.

کاتێك مەرحومی (حاجی رەحمان ئاغا) وەفاتی کرد من ئایەتی(تەوحید)م دەخوێندەوە و نەفرینی هەموو بت و بتخانەیەکم دەکرد و چەندین ساڵ دوای ئەوەش ئەو گەنجانەی خۆیان وا پیشان دەدەن ڕۆشنفکرن و جەژنی(٢٥٠٠)ساڵەیان دەگێرا! ئەوە بۆ بێئینصافی دەکەن، لەهەر بارودۆخێکدا هەر ڕەهبەرانی دین بەهێز تر بوون، بۆ کوردستان مەرحومی (قازی محمد)دیارە و، مەرحومی(مەلا خەلیل)دیارە، هەروا لەهەر جوڵانەوەیەکدا چ بەهێز چ لاواز تەماشادەکەیت هەر ڕەهبەری دین دیارە، ئەو بێ ئینصافیانە مەکەن. هەی هاوار! هەندێکجار لە دانیشتنە تایبەتمەندییەکانیشدا دەڵێن"قسەی نەفرەت ئەنگیز مەکەن". ئەی براکانم! بۆ ئێوە خۆتان لەو جۆرە قسانە دەکەن، ئێمە ئاگامان لە قسە و باسەکانمان بێت، بەڵام ئێوە ئاگاتان لە قسە و باسەکانتان نەبێت! جاتو خوا ئەوە ئینصافە؟!

ئەوە بۆ ئەوەندە بێئینصافی دەکەن کە ئێمە لەهەموو کاتێکدا ئامادەین و ناهێڵین ئەو ڕۆحییەتە ئینقلابییە لەوجودی هەر کەسێکدا کەتێیدا بێت بکوژێتەوە، بەڵام ئێوە (کەسە بێ ئینصافەکان) بە بۆنەی بینینی کەسانێکی خائینی پەستی بێشەرەفەوە ئەو هەموو موجاهەدات و گیان بازی و ئازایەتی و شەهامەتە کە ڕابەرە دینییە صادقەکان هەیانە نادیدەی بگرن؟ جا ئەمە بۆ ئەوە ناڵێم منەتتان لەسەر بکەم، میللەت خەیاڵی ببێت زیندوو بێتەوە دەبێت ئاگاهی زۆر بێت، دەبێت بەهێز و لاواز لەیەك جیابکاتەوە، دەبێت حەق و

باتڵ لەیەك جیا بکاتەوە، دەبێت چاك و خراپ دیاری بکات، بەیەك یاسا نەڵێت هەمووی خراپە، بەیەك یاساش نەڵێت هەمووی چاکە! پێوەری چاکیو خراپی لە زیهنی خۆیدا بچەسپێنێت، لە کۆمەڵێکدا چاکی تێدابێت جیایی بکاتەوە و خراپی تێدابوو لەیەك جیابکاتەوە! جا بۆیە ئەو یاد خستنەوانە بە میللەت دەدەم، ئەگەر میللەت ئائەو وشانەی بە زماندا بێت، ئەو سپڵەیی و ناسوپاسیانەی هەبێت تێکدەشکێت!

براکانم! دەڵێن لەو کاتەدا کە ئێمە موصیبەتمان بەسەردا هات موسوڵمان دیار نەبوون! کورە ئاخر شەهیدەکان خۆیان موسوڵمانن و لە خێزانی موسوڵمانن. دایك و باوکیان نوێژ دەخوێنن، ئەوە بۆ نابینن؟ ئەوانەی هاتوون هاودەردییان دەردەبڕن هەموویان موسوڵمانن. ئاخر بێ ئینصافی مەکەن! ئەگەر بڕیار بێت ئەم قسە تەفرەقە ئەندازیانە بکەن و خەڵکی وریا ببێتەوە سبەینێ تەنیا دەکەون و کەستان لەگەڵ نامێنێت، بۆیە ئەوە دەڵێم بۆ ئایندەی خۆتان وریا بن، بۆیە ئەوانە دەڵێم، چونکە ئەو ناسوپاسیانە دڵی خەڵکی سارد دەکاتەوە، ڕاستە ئینسانی ڕاهبەر و بەرپرس بەهەڵەی خەڵکی دەست لە بەرپرسیارێتی خۆی هەڵناگرێت، بەبێگومان کەسانێکی وەك(مەلا شێخ عیزەدین و مەلا ئەبوبەکر)کە کاسەی صەبریان پڕ بووە دەستیان بەکاری خۆیان کردوە، وەك(کاك شێخ جەلال و ئاغای شافعی) کە خۆتان دەزانن لەو ڕۆژانەدا چ هەیەجان و تەکانێکیان داوە بەخەڵکی تازە ئەوانە ناشکێنەوە و ناچنە دواوە!

جائەوە بزانن، وانییە کە هەموو مەلایەك خائین بێت، واشنییە کە هەموو ڕۆشنفکرێکی ئەندازیار خائین بێت، لەناو ڕۆشنفکری ئەندازیاردا ئینسانی

وەك (د.علی شریعتی) و (د.یەزدی) و (موهەندس بازرگان) و (موهەندس بەدیع زادەگان)هەیە، لەناو مەلاشدا كەسی وەك(مەلا عیزەدین و خومەینی و شەریعەت مەداری....)هەیە دەبێت بە ئینصافەوە قەزاوەت بكەن با تووشی هەڵە نەبن و دوژمن لەو فكرە ناپوختانەتان سوود وەربگرێت و هێزتان لەناوبەرێت! هەروەها مەرجی گەورەی ئاگاهی ئەوەیە كە مرۆڤ هێزی باتنی(ناوەكی)زۆرتر بێت لەوەی وا زاهیری دەدات، مرۆڤ هەرچی هەیە نابێت بیرێژێتە مەیدان، نابێت تەواوی هێزی خۆی لە ڕۆژێكدا لەدەست بدات! موسوڵمانەكان ئاگاداری ئەوە بن شەهیددان پێویستە، بەڵام مەتلوب لەوە نییە هەر مرۆڤ بمرێت! شەهید دەبێت بیدەیت و بزانیت بۆچی، شەهیدی بۆ ئەوەیە ژیان بەدەست بهێنیت، دەبێت ئاگاتان لە خۆتان بێت ئەگەر بڕیار بێت هەر كوشتە بدەن لاواز دەبن، بزانن دوژمن زاڵمە و بێ ڕەحم و شەلەلەتە، وابە سەختی خۆپیشاندان و ئیزهاری وجود مەكەن كەتا دەتوانن لێتان بكوژن و ئەوانەتان وا قیمەتدارن و سەرمایەی ئایندەن لەناو بچن، تكاتان لێدەكەم قودرەتی واقیعی خۆتان ڕابگرن، چونكە زۆری ماوە، هێشتا ئێشی زامان تەواو نەبووە، هێشتا زەمان زۆر دەگوزەرێت تا میللەت بتوانێت موتەوەلید بێت، لەبەر خاتری ئەوەی لە قودرەت نەكەون و توانایتان لەدەست دەرنەچێت هەموو خوێنێكی خۆشەویست مەڕێژن! خودداری بكەن لە شەهید دالدا، بەڵێ شەهید دەدرێت، بەڵێ ئینسان تا نەكوژرێت ژیان مەقدور ناكرێ! بەلام دەبێت ئینسان چەندە كوشتە دەدات دە بەرامبەر سوودی لێوەربگرێت.

براكانم! موسوڵمانەكان! نەزمێكی صەحیح و ئارامشێكی مەعقول نە نەزمێكی خوێڕیانە نە ئارامشێكی ترسنۆكانە، نەزمەكە صەحیح و ئارامشەكە مەنتقی و

مەعقول بێت، ئەنجامی کاری ئێمە چەند بەرامبەر دەکاتەوە. دڵنیابن ئەو ڕۆژە وا لە (تاران)دا (سێ ملیۆن) موسوڵمان لە بەیانییەوە تا ئێوارە پیادە ڕەوییان کرد و کاتێك سەربازەکانیان بینی و گوڵبارانیان کردن ئەو کاتە دڵی زاڵم زۆرتر دەلەرزا تا ئەوکاتەی وا بەردیان دەگرتە بەرپرسەکان(سەربازەکان). بینیان هەرواش بوو ئەوە بوو بەنی(پەتی)زاڵم تەحەمولی نەما و سەیری کرد میللەت ئەوەندە ڕوشدی هەیە کە خەریکە گوڵ فڕێ دەدات بۆ سەربازەکان! ئائەوە بوو تەکاندەر و هەواڵی ناخۆش.

براکانم! هەواڵم زانی کەلە ناوچەی کوردەواری خۆشمان(مەهاباد)کاری وا کراوە، گوڵبارانی سەرباز کراوە، ئا ئەوەیە موقاوەمەتی مەنتقی، ئەوە کاری مەعقولە!

براکانم! کوشتن زاتەن مەتڵوب نییە، کوشتن بە ناونیشانی هۆکار مەتڵوبە، کوشتەدان و شەهیددان بەناونیشانی پێشەکییەك بۆ ئەنجام گرتنێك مەتڵوبە! کە نەتیجەکەش عیبارەت بێت لە ئازادی و نەمانی زوڵم و زۆر! ئەگەر بەمەنتق بڕۆنە پێشەوە ئازادی نزیکتر دەبێتەوە، ئەگەر بێمەنتقیش بڕۆنە پێشەوە هەرچەند کوشتەی زۆرتر بدەن ئازادی دوورتر دەکەوێتەوە. میللەتەکان لەبەرامبەر (جەنگیز)ەوە بێحساب کوشتەیاندا، بەڵام بێ نەزم و مەنتق، نزیکەی دوو سەد ساڵ(دوو سەدە) یاسای(جەنگیزی) حکومەتی کرد بەسەر ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئێستاش مەسەلە هەر ئەوەیە پێتان وانەبێ ئەگەر(٤-٥)کەس بکوژرێت ئیتر ئەوان خەجالەت دەکێشن و دڵیان دەسوتێت و دەڵێن(ئۆی)! چوار ماڵمان عەزیەتبار و تەعزیەبار کرد، نەء...ئەو کاتە کەیف خۆشتر دەبن بۆیە(دیقی پێ بکەن)کوشتەکەم بدەن و سەرکەوتنتان زۆر بکەن بەنەزم و تەرتیبەوە.



براكانم! خۆپیشاندان: واتە قودرەت نمای، نەك واتە بەرد فڕێدان، نەك واتە زیادەڕۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا! خۆپیشاندان: واتە بە دوژمن و دونیای پیشان بدەیت كە هەیەت و تەسلیم نابیت و شكست ناخۆیت، ئەگەر كوشتەی زۆر بدەیت شكست دەخۆیت ئەو كاتە ئەو خۆپیشاندانەت مەنفی دەبێت. كارێك بكە كوشتەی زۆر نەدرێت! خۆپیشاندان بكە بە مەعقولی وئارامی وەك لەو ڕۆژانەی(تاران)،كە گولّبارانی سەربازەكانیان دەكرد! خۆپیشاندانی وا بكەم كە لە هەموو دونیادا بلّێن میللەتی ئێران ئیحساساتی نییە و مەنتقییە، میللەتی ئێران مافی ژیانی هەیە! لەم ڕۆژەدا پەیوەندی ئێران لەگەلّ هەموو جێگەیەكدا زۆر خێرایە هۆكارەكانی پەیوەندی كردنی جەمعی زۆر سەریعە و زۆر زوو خەلّكی حالّ دەبن لە هێز و لاوازی ئێوە، بۆیە بە مەنتقی و ئصولّی كار بكەن نەك ئیحساساتی! تكاتان لێدەكەم ئیتر بەس بێت شەهیددان، ئەو شەهیدانە هەلّگرن بۆ قۆناغی تر با كوشتە و زەرەر كەم بێت.

## باسی دووەم

# بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی، وەك ئیمتیازێکی مرۆڤ بوون

میللەتان لە مێژووی خۆیانا بان و خوار و چاڵی و چۆڵی و خۆشی و ناخۆشی زۆریان بینیوە، تەنها میللەتێك مافی ژیانی هەیە و لایەقە زیندەگی بکات و، وەك ئینسان ژیان بگوزەرێنێت، کە مەسئولیەت و وەزیفەی خۆی بناسێت و لەوەزیفەی خۆی لانەدات.

سادەترین وەزیفەیەك کە ئینسان هەیەتی، تەنانەت هەرچی گیاندارانە هەیانە، بریتیە لەوەی ئینسان لەسەر(حەق-ماف)ی خۆی بێتە جواب و دیفاع لە حەق بکات. میکرۆبێکی بچکۆلە تادەگاتە زیندەوەری ورد ورد، تا دەگاتە ئاژەڵی گەورە گەورە گشتی ئەم تایبەتمەندیەی هەیە، کەپارێزگاری لە(ماف)ی خۆی بکات. بەڵام حەق(ماف) بۆ ئینسان گەورەترە، ماف بۆ ئینسان هەر ئەوە نییە مەسەلەن(مێشێك، مێرولەیەك) چەنێك دەزانێت لەو سنورەدا کورت ببێتەوە! زۆر گەورەترە لەوە. ژیانی ئینسان چەنێ گەورەیە حەقی ئینسانیش ئەوەندە گەورەیە.

میللەتێك کاتێك بەناوی یەك میللەت بەیەکەوە ژیان دەگوزەرێنن لە ئاستی (میللەت)ی بوونیا مافێکی هەیە، هەروەك چۆن لەسەر ئاستی تاك، هەر تاکێك مافێکی هەیە بۆ خۆی، بۆ نمونە چەند فەرد لەناو یەك خێزاندا پێکەوە دەژین مافێکیان هەیە کە بەژدارن پێکەوە. میللەتێکیش کە لەیەك




مەملەکەتدا پێکەوە زندەگی دەکەن، لەیەك کۆمەڵگەدا زیندەگی دەکەن، ئەمانیش مافێکیان هەیە و شەریکن پێکەوە.

مافی هەر تاکێك لە تاکەکانی میللەت، مافی منە، مافی هەر تاکێکی وەك من مافی تەواوی مەملەکەتە، کاتێك کۆمەڵێك لە خەڵکی خۆیان ناونا(میللەت) دەبێت وەك یەك ماڵ وەك یەك خانەوادە حقوقی خۆیان بەهاوبەش بزانن لەگەڵ یەکتریدا، ئامادەبن هەروا ئینسان دیفاع دەکات لە خانەوادەی خۆی، لە مافی خانەوادەی خۆی، دیفاعیش بکات لەمافی تەواوی ئەو میللەتە.

ئەگەر میللەتێك ئەوەندە وریا بوو، ئەوندە بەئیمان بوو، ئەوەلدە هەستی بەبەر پرسیارێتی کرد، کەکاتێك مافی میللەت خوراو نرایە ژێرپێ لەسەری بێتە جواب، ئەو میللەتە مافی ژیانی هەیە، هەر چەندە فلانە کەس زەرەری لە خۆی نەدابێت... لەوانە یەك نەفەر تا ئێستا لەم سیستەمی کۆمەڵایەتی ئێرانەدا (سی ساڵ چل ساڵ) زیندەگی کردبێت، زۆر ڕەفاه(خۆشگوزەرتن)ی بوبێت. .. زۆر خۆشگوزەراندبێتی، مافی، داهاتی، ڕێزیان لێ گرتبێت، پشگیری بوبێت لە هەر فەرمانگەیەکدا هەرچی وتبێت( فەرموو قوربان، قوربان) وەلأمیان دابێتەوە، لەهیچێکی کەم نەبوبێت.. بۆ هیچ شتێك دانەمابێت، ئەم یەك نەفەرە نابێت بڵێت من لەچیم کەمە تا لەخۆمەوە خۆم ماندو بکەم، ئەگەر حەیوانە دەتوانێت وا بلێت، ئەویش چی حەیوانێك؟ نەك حەیوانێك وەك(مێرولە)؟! چونکە(مێرولە) لەسەر یەکتری دێنە جواب، (مێرولە) خوای گەورە بە جۆری غەریزی هەرەوەزییەکی پێداون، شارە مێرولەیەك هەست بە بەرپرسیارێتیان هەیە لە بەرامبەر یەکەوە.نەء... حەیوانێك فرە وەحشی و دڕندە، بۆ نمونە(ڕێوی )، (گورگ)، کە تێکەڵ

نەبێت لەگەڵ حەیواناتی تردا، ئەگەر ئەو کەسە وا ئیحترامی بووە و ژیانی خۆشبووە، خۆی بەحەیوان دەزانێ و خۆی بە ئینسان نازانێ، بەڵێ... لەسەر خەڵك نەیەتە جواب و بڵێت(من لەچیم کەم بووە؟ چی زوڵمێکم لێ کراوە تا ئێستا لەخۆمەوە نارەزایەتی دەر ببڕم ؟). بەلاّم ئەگەر خۆی بە ئینسان دەزانێت، ئەگەر خۆی بەیەکێ لەم میللەتە دەزانێ، هەر زوڵمێك لەهەر فەردێك لە ئەفرادی ئەم میللەتە کرابێت دروست وەك ئەوەیە لە ئەوکرابێت. ئەگەر ئینسانێك شەرەف و حەیسییەتی ببێت، کاتێك دەڕوات لە شوێنێکدا لە فەرمانگەیەکدا کارێکی هەیە، موشکیلەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ دروست دەبێت لە لایەنی ماڵییەوە توشی کێشەیەك دەبێت، سەیر دەکات ئیمتیازێك بۆ ئەو هەیە، وەلێ ئەگەر خەڵکی هەژارو نەدار بێت وەلاّمیان نادرێتەوە، دەبێت قینی بێت لەوەی وا خۆی ماقوڵتر دەگرێت لە چاوی ئەوانی ترەوە، قینی بێت لەوە وا ئیمتیاز دەدەن بەو.

ئەگەر کەسێك مەسەلەن دەڕواتە ناوشوێنێك مامەڵە بکات، دەڕواتە ناوڕیزێك سواری سەیارە ببێت(بەتایبەتی لەو شارانەی کە خەتی پاصیان هەیە و هاتوو چۆ دەکەن) سەیر بکات زیادە ئیحتیرامێك بۆ ئەو بوونی هەیە، ئەیخەنە پێش ئەوانی دیکە، ئەوە واتای چی؟ واتای ئەوەیە حەق دەکرێت بەناحەق و ناحەق دەکرێتە حەق، واتە لەبەر خاتری ئەو کەسە حەقێك پێشێل دەکەن. ئەو کەسە ئەگەر شەرەفێکی ئیسلامی و ئینسانی هەبێت دەبێت قین(ڕق)ی بێت لەوە، قینی بێت لەوەی زیادە ڕێزێکی بۆ هەیە، چونکە وەختێك بەناوئینسانێك لەمەملەکەتێکدا ژیان دەگوزەرێنێ ئەشێ مافی یەکسانی بۆ خۆی و ئەوانی تریش بوێت.

حەزرەتی ڕەسول الله(ﷺ) لە زەمانێكدا ڕیسالەتی بۆ هاتووە، ئەگەر درۆ نەبێت وەزعی بەشەر لە ئەمڕۆ خراپتر بووە...(ئێژم ئەگەر درۆ نەبێت)، چونكە بەڕاستی كەم جێگەهەیە لەدونیا بەدرێژای مێژوو بەئەندازەی ئەم دەورانی ئاخیرەی میللەتی ئێران دەسەلاتی كەسیف و خراپی بووبێت، ئەوپەڕی فەساد و خرپەكاری بووە كە ئێمە دیومانە، لەوانەیە زیادە ڕۆی نەبێت ئەگەر بڵێین دونیای(١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێش بەقەد ئەم دەورانە كە ئێمە دیومانە لە ئێراندا فاسیدو خراپەكاری بووبێت. تەبەقات، ئیمتیازات، ماقوڵی و نا ماقوڵ، زۆردار و بێ زۆری، دەوڵەمەندی و فەقیری، هەرچی جۆرە ناحسابە لەناو خەڵكیدا بووا. كەسێك دەوڵەمەند بوو، كەسێك ساحێب دەسەلات بوو، خەڵكی دەكوشت، ماڵی خەڵكی تالان دەكرد، كەسێك نەبوو بڵێت ناحەقتە، مەسەلە مەشهورەكە لە عەرەبیدا پەیوەندی هەبوو بەو عورفەوە بە ئەو ژیانەوە، (الحق لمن غلب ) (( هەر كەسێك زۆردار بێت ئەوە حەقییە)).

قانونی بەشەرییەت ئەمە بوو، زۆر دار حەقیەتی، وەك ئێستا زۆردار هەزاران ئینسان دەكوژێت، هیچ خەبەرێك نییە! بەلام خەڵكی جنێوێك دەدەن تاوانێكی گەورەیە! تەقریبەن شتێك بوو بەو جۆرە، ئەڵبەتە نەك وەك ئێستا چەپەڵ بەلام تەقریبەن وەك ئەمە بوو، هەركەسێك زۆردار بوو هەر ناحەقێكی دەكرد هیچ موشكیلەیەكی نەبوو، بەلام كەسێكی بێ دەسەلات بوو بێ سەرمایە بوو هەرچیەكی بكردایە بە ناحەق حساب دەكرا.

لەو كۆمەڵگەیەدا، (كەئائەوە بارودۆخەكەیان بوو). خوای گەورە نورێكی نارد بۆ ئینسانایەتی، هیدایەتێكی نارد بەرنامەیەكی نارد كە ئەو بەزم و بەساتە

لەناو بچێت، و بەشەر ڕێگەی زیندەگی خۆی بدۆزێتەوە. ئەم گشتە سەرو خوارو جیاوازییە لەناو بچێت، حەزرەتی محمد(ﷺ) دەستەلاّتی پەیداكرد. میللەتێك لە لوتكەی زەلیل و بەدبەختیدا بوون، بەرزی كردنەوەو گەورەیی پێدان. میللەتێك ئەوەنە مەزلّوم و بێ چارە و نەفام بوون خۆیان بە دەستی خۆیان خوایان دروستدەكردو دەیان پەرست، میللەتێك سەری دادەنەواند لەبەرامبەر میللەتەكانی ترەوە، لەبەرئەوە ئەو ئینسانە زۆردار بوو، لەبەرئەوەی ئینسانێكی زالّم بوو كە(مەولانا ئیقبالّی لاهور) (عەلەهی ڕەحمە) لەمباسەدا دەلّێت و باس دەكات لەبارەی وەزعی ئینسانەوە دەلّێت :

(( ادم از بی بصری بندگی ادم كرد))، چونكە ئینسان بەصیرەتی دەركی نییە دەچێت ئەوێتە بەندە، دەبێتە كۆیلەی ئەوانی دیكە، (( گەوهەری داشت، ولی نزی قوباد جمكرد)).

شەخصیەتی خۆی كردە فیدای پاشاكان. تەفسیرێك زۆر جوانی دەكات، شەخصیەتی ئینسان لەبەرامبەر پاشاكان و لەبەرامبەر زالّمەكانەوە سەردەنەوێنن.

دەلّێت:((یاعنی از خوی غلامی ز سگان پستر است، من ندیدم كسنگی پیش سگی سرخن كرد)).

(سەگ)گشتی یەك جۆرە، هەرگیز ئێوە بینیوتانە (سەگێك) بچێتە سوژدا لەبەرامبەر(سەگێكی) دیكەوە سەرداخات و ملكەچ كات؟ كەس شتی وای نەدیووە....

ئەوەندە ئینسان تەبیعەتی بەد بێت لە(سەگ) بەدتر بێت، كابرا شازە، دەولّەمەندە، زۆری هەیە، مەقامی هەیە، سەربازی هەیە...نازانم بینیوتانە؟



چۆن دەکەون بەسەرمەقولات لەبەرامبەرییەوە، چی سەگێك ئەوەنە بێ شەرەفە؟ هیچ سەگێك. وەك (مەولانا ئیقبالٚ ) ئێژێتی. ئاوا بەشەر بێشەرەف و بێ شەخصیەت بوو، ئاوا سەر لێشێواو بوو، ئاوا گەورەی خۆی لێ ون بوو بوو، ئاوا سەرو خواری تێدا دروست بوو بوو.

ئەم لێپرسراوە ئیلاهیە هاتوو سەرو سامانی دایە ئەم وەزعە، نمونەیەك لە رەفتاری ئەم لێپرسراوە ئەوە بوو، کە خەڵکی فێری ئەوە کرد. ئەم بان و خوارە نەبێت، خەڵکی فێری ئەوە کرد لەگەڵ هەرچی ئەفرادا هەیە وەك یەك رەفتار بکەن، خۆی هاتووە خەڵکی رزگار کردووە، دەبێت ئەگەر قەرار بێت رێز بۆ کەسێك بگیرێت، ئیحتیرامی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت چەنێك لەسەرەوەی خەڵك بێت؟ ئەو خەڵکەی دەورو بەری فێری سەرو خوار بوو بوون، سەرو خواری دونیایی، نەك رێزی(دین) کە بریتیە لەوەی کە هەر حەقێکت گوێ لێیە قبوڵی بکەیت.

ئیحتیرامی دونیا، وەك فەرموو قوربان، یان لەبەر کەسێك هەڵسی و لەبەر کەسێك هەڵنەسی، فەرموو لەسەرەوە دانیشە فەرموو لەپێشەوە برۆ، ئەم جۆرە رێزە دونیاییە. خودی ئەم زاتە گەورە، ئەم شتانەی تەرك کرد بەموسوڵمانان، ئەو ئەفرادە بەوبەختە وا فێری ئەو زیللەت و بەدبەختیە بوو بوون، کاتێك موسوڵمان بوون پیشانیدان کە ئیتر ئەم سەرو خوارە نەمێنێت، خودی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) رزگارکەری بەشەرییەت هاتوە لەناو مەجلیسا دانیشتووە، خەڵکی فێر بوون یەك نەفەریان لەبەری هەڵنەساونەتەوە، موسوڵمانان لەسەرەتادا لەبەرچاویان قورس بووە! ئەوان لەبەرامبەر شاکانەوە هەڵئەسان، ئێستە لە بەرامبەر ئەم رزگار کەرەوە چۆن




هەڵنەسن؟!! لەبەرامبەر ئەم نورەوە كە دونیای تاریكی ڕۆشن كردوتەوە چۆن هەڵنەسن؟ قورس بوو لەبەر چاویان، بەڵام حاڵی كردن و فێری كردن كە هەڵنەسن.

پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)، كە دەچووە مەجلیسێكەوەو قەرار بوو كۆمەڵێك لەو مەجلیسا دانیشن، فەرموو فەرموو نەبوو جێگە خاڵی كەن و فەرموو قوربان، ئەمەی پێ تەرككردن، لەسەرەتاوە عورفو عادەتیان بوو، ساڵەهابوو فێری ئەوە بوو بوون، دەهات لەهەر شوێنێكا جێگە ببوایە دادەنیشت، لە ژوور مەجلیس بوایە، لەناوەڕاست مەجلیسەوە ببوایە! هەتا زۆر جار بووە لەناو كەوشەكاندا دانیشتووە!! واتە وەختێك هاتووە مەجلیسەكە هەركەس لەجێگەی خۆی دانیشتووە ئەو لە كەوشكەنەكا دانیشتووە، كۆمەڵەی مەجلیس كە كێ بوون؟ هەر ئەو ئینسانە بت پەرستانە بوون واخۆی ڕزگاری كردن و كردنیە ئینسان. توخوا ئەگەر قسە لە ماقوڵی بكرێت، كێ بەقەدەر پێغەمبەر(ﷺ) ماقوڵە؟ لەبەر دین ناڵێم هەر لەبەر عەقڵ، عەقڵ حسابكە، كێ هاتووە بەو جۆرە خزمەتی كردبێت بە بەشەرو بەشەری لەو گشتە فەساد و زوڵمە ڕزگاركردبێ شەخصیەتی ئینسانی ئەوەندە بردبێتە سەرەوە؟! لەچی شوێنێكی دونیا دەبینیت كە بان و خوار نەبێت؟ جگە لەمەكتەبی پێغەمبەری ئیسلاما(ﷺ) نەبێت؟ لەچی شوێنێكی دونیادا دەبینیت ڕەهبەر و ڕزگاركەر، لەگەڵ خەڵكی ئاساییدا لەهەرچی بارەوە وەك یەك ژیان بگوزەرێنن؟

لەهیچ شوێنێكدا نەبووە و نییە، بەحسابی عەقڵ بە حسابی دین ناڵێم! گەورەترین و خۆشەویسترین ئینسان بۆ هەر ئینسانێك، كە ئینسان دۆست بێت، كەبەشەری خۆش بوێت عیبارەتە لەپێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، ئەگەر

کەسێك دینیشی نەبێت، ئەگەر کەسێك شوێن کەوتەی ئیسلامیش لەبێت، زۆر هەن لە بیریاران کەموسوڵمان نین و لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەن لەبارەی کەسایەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەر لەڕووی لێکۆڵینەوەکەوە نەك لەو ڕووەوە کە لە دین حاڵی بن و قبوڵیانکردبێت، کاتێك سەیری ئەم کەسایەتیە دەکەن کە چی کرد و چۆن بەشەرییەتی نەجاتداو خۆی چۆنی ڕەفتارکرد، لەبەرامبەرییەوە سەری ڕێز دادەنەوێنن، پێداگری لەسەرئەوەدەکەن گەورەترین ئینسانی عالەمە. هەر لە ڕووی لێکۆڵینەوەیەکەوە، جا بیربکەنەوە موسوڵمانەکان ئێمە پەیڕەو لە ئەو(محمد) (ﷺ) دەکەین. دەی بۆچی ڕەفتارمان وایە تێمە ناوئەم جەماعەتەوە هەڵەسن لەبەرم؟! کورە خۆ خودی پێغەمبەر(ﷺ) بهاتایە نەدەبوو کەس لەبەری هەڵسێت، ڕێگەی نەئەدا کەس لەبەری هەڵسێ، ئاخر من بە خۆڵی ژێری پێیەکانی حسێب ناکرێم، لەو ڕێگەی نەدەدا کەس لەبەری هەڵسێ من چی لیاقەتێکم هەیە؟ بەچی حەقێ، بەچی قانونێکی ئیسلامی خەڵکی لەبەرم هەڵئەسنەوە؟ ئەمە چییە؟ ئەمە ڕێگەی(محمد) وێڵ کراوە.

ئەمە ڕێگەی محمد(ﷺ) نەشێوییایە فرە قورسبوو، هەرگیز کاری وامان نەدەکرد، کەمن تێمە ماڵۆ ئێوە هەڵەسن، وەلێ یەك نەفەر لەمن بەتەمەن تر، ڕیش سپی، بەباوکی من دەشێت.. یەتە ماڵۆ سلاّم دەکات بەلالوتەوە وەلاّمی دەدەنەوە، ئەمە ئەخلاقی ئیسلام نییە؟!! بۆچی وامان لێهاتوە؟ لەبەر ئەوەی زاڵم و زۆردار، خائینەکان و دین فرۆشەکان ڕێگەی ئیسلامیان لێ تێکداین و دووبارە ڕێگەی بت پەرستیان تازە کردەوە بۆمان. بت پەرستی، واتە هەر لەو

بان و خوارە. ئەساسی ئیسلام بان و خواری لەناوبرد، بەڵام لەم (چوارده قەرنە)دا شەیتانەکان(بان و خوار)یان دروستکردەوە.

ئائەم ئینقلابەی کە لەئێستای ئێراندا هەیە، بۆ گشت شتێکە کەئەمە نمونەیەکییەتی، ئا ئەمە نمونەیەکی سادەیە کەگشتمان لەم مەجلیسەدا دیمان، یەکێك وەك من دێمە ژوورەوە، کە(٤٠ بۆ ٤٥) ساڵ تەمەنمە لەبەرم هەڵدەسنەوە، بەڵام یەکێك دێت کە(٦٠ بۆ ٧٠ساڵە) لەبەری هەڵناسنەوە، توخوا ئائەمە ئەدەبە، ئەمە ئەخلاقە؟ ئەمە پێی دەڵێن موسوڵمانی؟!!

موتڵەقەن ئەمە بۆنی موسوڵمانی لێ نایەت، ئەگەر قەراربێت هەڵسانەوە دروستبێت دەبێت لەبەری ئەو(٦٠ بۆ ٧٠) ساڵە هەڵسنەوە نەك لەبەر من، ئەمە نمونەیەکی بچکۆلە کەچەنێك ڕێگەی ئیسلامیمان ونکردووە. باقی مەسائیلی تریش ئاوا، سەیری بان و خوار بکە. تەماشای ماڵی خۆڵ و ماڵی کاشی بکە. سەیرکە هەر لەتەنها شارێکدا ژیانی ئەشرافی و سەیری ماڵەکانی تریشبکە ڕەش و ڕووت برسی مەحروم.

نمونەیەك کە بەچاو خۆم بینیومە لە(تاران)دا بۆتانی دەگێڕمەوە:

لەبەردەم دوکانێکدا وابزانم لە دەوروبەری شەقامی(شا ڕەزا) بوو سەیارەیەك فرە فرە ئەشرافی وەستا، دوودانە منداڵ لەناو سەیارەکەدا بوون، سەیارەکە زۆر گەورە بوو لەناوەوە.. تەقریبەن یارییان تێدا دەکرد، کەل و پەلی یاری منداڵانەی زۆر لە ناو سەیارەکەدا بوو یارییان دەکرد.

منیش بەسەر شەقامەکەدا خەریك بوو تێدەپەڕیم، سەیرمکرد دوو دانە منداڵیش لەقەراغی (پیادەڕەو)شەقامەکەوە وەستاون و هەروا قسەیاندەکرد دوودانە منداڵی ڕووت و فەقیر، مەعصوم، پاك، بێ گوناه.




حاڵـەتی ئـەم منالأنـە کەسـەیری منالّـەکانی نـاو سـەیارەکەیاندەکرد منـی جەزبکرد–سرنجی ڕاکێـشام–، بەڕاسـتی وەهـا سـرنجیان ڕاکێـشام لـەشـوێنی خۆمدا وەستام و نەمتوانی بچم بەڕێگەدا. هەر ڕووانینەکەیان بـە تـەنها بـەس بوو ئەگەر قسەشیان نەکردا! هەڵبەتە قسەیاندەکرد بەیەکەوە، بەڵام من گوێم لێ نەبوو، حەزیشم نە دەکـرد بـچمە پێـشەوە بۆئـەوەی قـسەکەیان لێ تێـك نەدەم... هەر ئەوە کە دەیان ڕوانی بۆ منداڵـەکان لـەناو سـەیارەکا باعیـسی ئەوە بوو کە من لـە جوڵە کـەوتم و نـەمتوانی بـڕۆم!! سـەیرمکرد دوو دانـە دوکان بوو یەکێکیان کەل و پەلی یاری منداڵ بوو ئەوی تریان میـوە فرۆشـی، کابرا هاتە خوارەوە چووە دوکانی کەل و پـەلی یارییەکـەوەو قـسەی ئـەکرد لـەگەڵ منالّەکا لـەناو سەیارەکا کە کامەیانی دەوێـت، ئـەویش بـە ئیـشارەت ئەیوت ئەوەو ئەوە، هەنێك کەل و پەلی تـری بـۆ کـڕی لـەکاتێکـدا بەڕاسـتی لەوانەیـە بـای(٢٠٠٠ –١٥٠٠)تمـەن– کـەل و پـەلی تـری یـاری لـەناو سەیارەکەدابوو لـەبەردەم دوو منالّەکەدا، یەکیان دەیوت بە ئیـشارەت ئـەوەم دەوێ و ئەوەم ناوێ، ئەویش دەیهێنایـە نـاو سـەیارەکەوە. لـەوەودوا هـەنێ میوەی کڕی و هێنایە ناو سەیارەکەوە ئەم دوو منداڵـەی دەرەوە بە مونتـەهای داخ و حەسرەتەوە ئەیانڕوانی بۆ منالّەکانی ناو سەیارەکە، لەپاشاندا جەوەکە گەرم بوو شوشەی سەیارەکە دادرابوویەوە یەکێك لـە منداڵەکانی هەروا وەك ئەوەی تەفریح(بۆخۆشی) بەبێ ئەوەی هەستبکات پێویستی پێیەتی دەستی بـرد لەپاکەتێکدا سێوێکی دەرهێناو قـەپێکی لێ گرتـو فڕێـی داو کەوتـە نـاو ئـەو جۆگەی کە ئاوی پێدا دەچوو، جۆگەکەش ئـاوی چـڵکاو بـوو... هـەردوو منداڵە کەهەرچـی داخ و حەسـرەتە لـەدڵیان دەرچـوو ڕایـان کـردوو ئـەو

دانەسێوە کە قەپی لێگیرا بوو کەوتبوویە ناو ئاوەکەوە!! (ئەمە شتێك بوو بەچاوی خۆم دیم کەتەقریبەن(٢٠)ساڵ لەمەو بەربوو...)

دوو منداڵەکە ڕایانکرد بەشوێنیدا و چونە ناو ئاوەکەو پێلاوەکانیان تەڕبوو گرتیانەوە وهێنایان و بە نۆرە، ئەو قەپێکی لێ دەگرت و ئەوی تریان قەپێکی تری لێ دەگرت.

جا بەشەر خۆی بەبەشەر بزانێت و ئەمە حاڵی زیندەگیکردنی بێت، خۆمن ناڵێم ئەو دوو منداڵە مەعصومە لەناو ئەو سەیارا گوناه کارن، بەلاَم نەفرین لەو کۆمەڵگایە کە تەبەقاتێك بەو جۆرەی تێدا بێت، کە ئەو منداڵانە بەئەوجۆرە، لەناو یاری و میوا غەرق بن، قەپێك بەو جۆرە بگرن و لەبەر ناپێویستی فڕێی بدەن، بەلاَم ئەو دوو منداڵەکەی تر ئەوە بەدەسکەوت بزانن و هەرچی داخ و حەسرەتیانە لەبیریان بچێتەوە کە سێوێك، کەوتۆتە ناوچڵکاو دەریبهێننەوە و بیخۆن.

ئەمە نمونەیەکە بۆ زیندەگی کۆمەڵگەی ئێمەدا، هەر ئەم شاری ئێمەیشە نمونەو مەزهەێکە لەمە! تەواوی ئێران ئاوایە. ئەمە چییە؟ حوکومەتی تاغوتیە... حوکومەتی تاغوت، تاغوت: کەلیمەیەکە قورئان دەفەرموێت، بریتیە لەوەی کەشتێك بێخود ئەرزشی زۆری پێبدرێت، ئەوە پێی دەڵێن تاغوت: ئینسانێك لەئینسانەکانی تر زیاتر ئەرزشی هەبێت ئەو ئینسانە دەبێتە تاغوت، وەك من براکانم، ئەگەر لەبەر من هەڵسنەوە لەبەر یەکێکی تری وەك هەڵنەسنەوە منیش دەبمە تاغوت، ئەگەر منیش ڕازی بم، منیش نەفرینی خوا دەمگرێتەوە. جا با بەلایەنی کەمەوە لەم مەجلیسەدا ئەوەند باس بکەم ئەقەلەن نەفرینەکە من نەگرێتەوە.




ژیانی تاغوتی، واتە ژیانێ کە سەرو خواری تێدابێت، ماقول و ناماقولی تیدا بێت. کەلیمەتی تاغوت، کە قورئان دەفەرمێت لە ڕیشەی(توغیانە). توغیان، واتە: لە سنور و ئەندازە دەرچوون، هەرشتێك چەنێك واقیعەن ئەرزشی هەیە لەوسنورە زیاتر ئەرزشی هەبێت دەبێتە تاغوت.

کۆمەڵگەیەك تاغوتی بوو، واتە دینی نەبێت ئەم ڕووداوانەی تێدا ڕوو دەدەن، ئەم سەرو خوارەی تێدا دروست دەبێت، جا سەرو خوار لە ڕووی حقوقی مادیەوە یان حقوقی مەعنەوییەوە.

**بان و خوار لە ڕووی مادیەوە:** ئەوەیە کەسێك فرەی هەس، کەسێك کەمی هەس، کەسێك لەناو خانوی دوو قاتدا زیندەگی دەکات، کەسێك ژوورێکی دەست ناکەوێت، کەسێك بۆینباخی(٢٠٠ تمەن)ی لەملدایە، کەسێك یەخەی کراسەکەی شڕەو ناتوانێت پینەی کات.

**سەرو خواری مەعنەوی:** بریتیە لەوەی کەسێك بچێتە ناو مەجلیسێك و خەڵکی بەرزە پێ هەڵسنەوە لەبەری، بەڵام کەسێکی تربێت و کەس لانەکاتەوە لێی.

ئەمانە گشتیان نیشانەکانی ژیانێکی تاغوتین، کۆمەڵگەی ئیسلامی دەبێت ڕەنگی تاغوتی تێدا نەبێت و گشتی لەبەین بچێت، خوا کۆمەك بێت، هەدەفی ئەساسی ئینسانانێك باش لەدین تێگەیشتوون ئەمەیە، کەئەم کۆمەڵگەی تاغوتییە لەناو بچێت و پاکۆبێت و کۆمەڵگەیەك(یەکتا پەرستی) لەجێگەیدا دامەزرێ. ئینشاالله. کۆمەڵگەی یەکتاپەرستی لەیەك حرکومەتی ئیسلامیدا بوونی هەیە، واتە یەك گەورەمان هەبێت، ئیتر گەورە لەدوای گەورە پلە پلە نەیەتە خوارەوە و سیلسیلە مەرتەبە نەبێت. فلان لەسەروی فلانەوە و فلان




لەسەروی فلانەوە بوونی نەبێت، یەك گەورەمان هەیە تەنها (خـوا)، لـەبەرئـەوە ئیتر ئینسانەکان حقوقیان یەکسانە هیچ سـەرو خـوار لـە نێوانیانـدا نییـە، یـەك سیستەم و بە یەك حوکومەتەوە کە ئیسلام و قورئان دەستوورییان داناوە، ئەوەیـە لەجیاتی یەك نەفەر بەهێزی ماڵ و سامان و خانەوادەو نفوس و بەهـەر جۆرێـك حوکومەت بکات بەسەر میللەتدا، یـەك ژمـارە لەکەسـانێك کـەئاگادارن لـە بابەتەکانی کۆمەڵگە ئەوانە حوکومەتیان بەدەستەوە بێـت، حوکومـەتی ئیـسلام حوکومەتی شورایە﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ بـەو جـۆرە قورئـان دەفـەرموێت، حوکومەتی تاکە کەسی نییە، تاکە کەس مافی نییە ئەمرو نەهی بکـات. (شـورا) مافی هەیە حوکم بکات، شورا بەهـەرجۆرێك مـەیلی هەیـە تەقـسیمی ئـەرك و هێزەکان دەکات بە بەشی جیاوازەوە، کۆمەڵگەی بەو جۆرە ئەصـڵی ئامـانج و بەرنامەی کەسانێکە کەلە ئیسلام بەڵەون، وا خۆشە کەسـانێکن کـە خـەریکن زەحمەت دەکێشن و هەوڵ دەدەن و گیان فیدا دەکەن، کـە ئیـسراحەت و ژیـان ئەگوزەرێن لە ئەوەڵەوە بزانن ئامانجیان چییەو بۆکێی ئەکەن.

براکانم! تەنها بۆ ئـەوەی حوکومـەتێك بـەوجۆرە دروسـت بێـت کـە بتوانێـت کۆمەڵگەیەك یەکتاپەرستی بخاتە جێگەی ئەم کۆمەڵگـە تاغوتیـە. ئەوەڵـەن لـە کۆمەڵگـەی ئیـسلامیدا(شـاه) بـوونی نییـە، ئـەو کەسـە وا لـەلایـەن شـوراوە دەکرێتە(سەرۆکی قوەی قەزائی)، دەکرێتە(سەرۆکی سوپا)، دەکرێتە(سـەرۆکی قوەی جێبەجێکار)، دەکرێتە مەسەڵەن(قوەی ئاموزش)، چونکە قوات(هێزەکـان) لە ئیسلامدا قابیلی تەفکیکە، دەکرێت بکرێتە(چوار، پێنج هێـزەوە) کەگـشتیان دروست بوونیان لەلایەن شوراوە دەبێت، ئەو یەك نەفەرە بێتە نـاو مەجلیـسێك بەو جۆرە، لەگەڵ فەردێك عادییا کەهیچ کەس نایناسێت فەرقێکیان نەوێت.

## دروست بوونی كۆمەڵگەیەكی بێتەبەقاتی:

كۆمەڵگەیەك بەو جۆرە داواكراوەو ئێمە هەوڵ بۆ ئەوە دەدەین، لەئێستاوە زۆر تەكلیف لەسەرمانە كەكار بكەین بۆ كۆمەڵگەیەك لەو جۆرە و دەبێت زۆر هەوڵ بدەین، شتی گەورەو ئەرزشدار زەحمەتی گەورەو ئەرزشداری دەوێت، بەخۆڕایی نایەتە دەستی ئینسان، كۆمەڵگەیەك بەو جۆرە كەمەسەلەن ئەو كەسە كەئەوەتا لەسەری سەرەوە بچێتە فەرمانگەیەك، لەگەڵ كەسێكدا كەكەس نایناسێت وەك یەك لەگەڵیدا ڕەفتار بكرێت، ئەمە هەروا ئاسان دروست نابێت. زەحمەت و هەوڵێكی زۆری دەوێت، یەكێك لەو هەوڵانەی كەئینسان دەبێت بیدات، بریتیە لەوە كە بتوانێ بە ئاسانی(ڕای خۆی دەربڕێت).

مانگرتنی گشتی، جۆرێكە لە دەربڕینی ڕائی، نازانم بیستوتانە پێری جەنابی(ئەزهاری) سەرۆك وەزیرانی تفەنگ و موسەلسەلا نەك سەرۆك وەزیرانی ئیمان و عەقڵ و فەهم و شعور، تەنها سەرۆك وەزیرانی تفەنگ و موسەلسەلا كە بیژیێ قسە بكەیت دەتكوژم*!!

ئەم شتە غەریب و عەجیبە قسەی دەكرد، چی قسەی بێ مانای دەكردا! ئەك لە ڕووی سیاسیەوە، لە ڕووی یاساییەوە، یاسایی سادە، كە هەر كەسێك كەمێك لە یاسا بزانێت وەڵامی ئەم كابرایەی دەدایەوە. قوڕ وەبان سەر لەو

---

* ) وەك دیارە ئەم بابەتەی (كاك ئەحمەد) لەسەرەتایی ڕۆژەكانی ئینقلابدا بووە، بۆیە هەندێك ئاماژەی تێدایە تایبەتە بەو سەردەمە، تەنها لەبەر گواستنەوەی ڕۆحی بابەتە(ئەگەر توانیبێتمان!) دەستكاری ئەو بابەت و دەستەواژانە نەكراوە..

میللـەتە كە شتی وا قبوڵ بكات، مەوجودێك بەو جـۆرە بكرێتـە ڕەهبـەری و بەرنامە دابنێت!!!

دەیـووا "ئەگـەر كەسـێك مانبگرێـت و نەڕواتـە سـەر ئـیشەكەی ئێـژین پارەكەی(مەعاشەكەی)ببڕن، ئەگەر غایباتی زۆری ببێـت دەڵـێین دەری بكـەن، چاوەڕێش دەكەین مەجلیسی شورای میللی یاسایەك لـەم بوارەوە دەر بكات".

بەڕاستی قوڕ بەسەر مەجلیسی شورا، نەك سەرۆك وەزیران، سەرۆك وەزیران هەرچی هەیە هەر ئەوەیە، بەڵام مەجلیسی شورا دەبێت چـەندێك مەسـخەرە بێت كە سەرۆك وەزیرانێكی موسەلسەل و تفەنگی وا چـاوەڕێ بكـات تبقـی ئارەزوی ئەو هەرچی هەڵەیە بەناوی یاساوە دەریبكەن!!

براكانم! هەندێ یاسا هەیە نێودەوڵەتییە، واتە لـەسەرەتادا فیكرەكە پێـشكەش دەكرێت لـەوەولا كۆمەڵێك دەوڵەت ئیمزای دەكـەن و كـاری پـێ دەكـەن، یەكێك لـەم یاسایانە (یاسای نێودەوڵەتی كارە)،(كـە تەصـەور دەكـەم(١٩-٢٠)ساڵ لـەمەو بەر من لـە (تـاران)دا بـووم باسـی زۆر گـەرم و گـوڕ بـوو. ئێرانیش یەكێكە لـەو دەوڵەتانەی ئەم یاسایەیی ئیمزاكردوەو پەیمانی داوە).

دەقی یاسایی نێودەوڵـەتی كـارە، نـەك یاسـایی نـاوخۆی ئێـران، كـە بڵێـت بـەئارەزوی خـۆم دەیگـۆڕم، دەقـی یاسـای نێودەوڵـەتی دەڵێـت"كارگـەر و فەرمانبەر هەرچی بێت ڕێگەیان پێدراوە مانبگرن بۆ داواكارییەك كـە هەیانـە، جا دوای دەرەكەوێت داواكەیان نادروستە دەڕۆنەوە سەر كـار، یـان ئەگـەر دروستە لێكۆڵینەوە لـە قسەیان دەكرێت و وەڵامی دروستیان پێ دەدرێتـەوە" ئەمە دەقی(یاسایی نێودەوڵەتی مافی كار)ی هەر كارگەرێكە.

سەرۆك وەزیرانێك ئەوەندە دەركی نەبێت بڵێت كاتێك من قسەیەك دەكەم با یەك نەفەربێت حاڵیم بكات! ئاخر بێچارە كاتێك خۆت نازانیت لەم مەملەكەتەدا كەسێكی شارەزا پەیدا نابێت لێی بپرسیت؟!

خۆی وتی "من لە سیاسەت شارەزا نیم"، كەچی هاتووە سەرۆك وەزیرانی دەكاتی!! قورِ بەسەر، سەرۆك وەزیران، واتە بەڕێوەبردنی وڵات، ئیدارەی وڵات بێ سیاسەت نابێت، ئەی هەرگ وەبان سەرت سیاسەت چۆنە ئیجرا دەكەیت؟ دەستورت پێ دەدرێت ئیجرای دەكەیت؟ خۆ دیارە جگە لەوە ناتوانێت هیچی تر بكات. لەوەودواش خەریكە دەم لەبابەتی یاسایی دەدات بێ ئەوەی لەیاسا بزانێت، چەنێك ڕیسواییە بۆ وڵات، ئاخر ئەو كەسانەی لە نزیكەوە ئێرانیان نەدیوە، گاڵتەیان لێ یەت ئێژن"توخوا سەیر كەن ئەم میللەتە (٣٥ ملیۆنی)ە ئینسانێك نەفامێك بەو جۆرە وەزیرە".

خۆی ڕایدەگەیەنێت سیاسەت نازانێت، هەرچی باس دەكات پێچەوانەی قانونە، خۆ ئاخر پێچەوانەی قانون ڕەفتار بكات جیاوازی لەوەی خۆی بە ئاشكرا ڕایبگەیەنێت، ڕوون و ئاشكرا باسی دەكات كە دەبێت وابێت و دەبێت وابێت، لەپاشانیشدا دەڵێت "چاوەڕێ دەكەم مەجلیسی شورا یاساكەش دەركات". ئاخر نەزان و بێ سەلیقە، نە خوێنەوار، مەجلیسی شورا دیارە كە دەوڵەتییەو ڕسوایە، بەلاّم ئەوەندەش وەك تۆ(سەرۆك وەزیران) بێشعور نین، كە سەیری یاسای نێودەوڵەتی كار نەكەن. دەزانم شەخصیەتیان تیانییە، یەكە یەكەیەكی تیابێت ئیستسنایە، بەلاّم خودی مەجلیسەكە مەجلیسێكی خراپ و بێ شەخصیەتە، بەلاّم كەسێكیان تیایە چاوی شتێك

ببینێت و کتێبێك بخوێنێتەوە و بزانێت یاسای نێودەوڵـەتی کـار چـی دەڵێـت.
ئەوان چۆن ئەوەند ڕسوان بەگوێت بکەن، ئەمانە گشتی بەجێگەی خۆی!!
هەڕەشەکەشی هەروەك سیاسەت و لـە یاسـا شـارەزانە بوونەکـەی. فـەرموو من(کاك ئەحمەد مەبەستی خۆیەتی) بەسـەریکی بـانگی تـەواوی موسـوڵمانانی ئێران دەکەم بەمانگرتنی سەرتاسەری، دەتوانێت چی غەڵـەتێك بیکات، مەگەر نەیزانیوە خەڵکی موسوڵمان چەنێك یەکگرتوو و یەك دەستن، یەشترا ئەمـەی حاڵی نەبووە، مەگەر دەتوانێت بەرامبەر ڕەهبەرانی دین لـەمە زیاتر بێ ئەدەبی بکات، ئەوەڵـەن دەمکوتێك بۆ ئەو، دووەمیش فرە فـرە مـەمنونم و تەشـەکور دەکەم لـە گشت لایـەك هاوشـارییەکان و فەرمانبـەران گـشتی بـەبازاڕی و دوکان دارەکان، کە یەك دەنگ بن بەڕاستی ئەگەر پەنجا دوکان حەتا بیـست دوکان لـەم ناوشارا بکرایەتەوە، میقدارێك بێ ئابڕوی بوو بۆ شـارەکە، واتـە ئەم شارە گشتی نافامێت بەیەکەوە بـە(ئیزهـاری) بلێـت غەڵـەتتکرد، بـەلام کەبەکۆمەڵ دوکانتان نەکردەوە واتای ئەوەیـە ئـەم شـارە بەیەکـەوە دەڵـێن: غەڵەتتکرد، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە، ئەگەر یەکەیەکەیەکیش بووبێت دەرکی ئەم بابەتەیان نەکردوە، لـەبەر خـاتری سـودێکی تایبـەتی خۆیـان، یـا مەسەلـەن ڕۆژێ زیاتر کاربکەن(۲۰تمەن-۳۰ تمەن -۲۰۰تمـەن ۳۰۰تمـەن) بەدەست بێنن، بەڕاسـتی ئـەوەڵین عـەیبیان ئەوەیـە، کەسـابتی دەکـەن لـەم میللـەتە نین، هەتا ئینسان نـین، هـەتا ئەرزشـی مێلورەیـەکیان نییـە، چـونکە (مێلورە) لـەگەڵ باقی تر هاوکاری دەکات، بێ شـعوری و نائینـسانی خۆیـان پیشان داوە. لـەوەو دوا، ئەمە ئەرکی تەواو هاوشارییەکانمە ئەم داوایە حاڵیبن، لـەسەرەتاوە وتمان(میللـەتێك مافی ژیانی هەیە، وریا بێت و ئاگاداربێت، ئەگەر

شتێ بەو جۆرە پێشهات، نەخشەیەکی گشتی دانرا و مانگرتنێکی گشتی ئەنجام بدرێت، کارێك بکەن یەك دەست بێت، یەکە یەکەیەك نەبن و شپرزەی بکەن)، هەرچەند ئەمجارە شپرز نەکرا، یەکە یەکەیەك بوون دوکانیان کردبوویەوە، وتبویان، چونکە درەنگ بووە نەمانزانیوەو خەبەرمان پێ نەگەیوە، لەگەڵ هەواڵیان پێ دان فرە زوو دوکانیان داخست، ویژدانەن کەس نەبوو دوکان بکاتەوەو پێچەوانەی ڕێگەی میللەت بچێت، بەڵام نەبۆ تەنها مانگرتن، نەك تەنها بۆ ئەم باسانە، بۆ مەبەستی تریش ئەمە بەتەواوی بەخەڵکی بگەیەنن، کەکاتێك ئێمە لیاقەت و مافی ئەوەمان هەیە لەم بارودۆخە خراپە ڕزگارمان بێت و کۆمەڵگەیەك پاك و تەمیزی ئیسلامی پەیدا بکەین و لەئێستەوە ڕێگەی ئیسلام بپێوین، لەئێسەوە حازربین واز بێنین لە ماڵی دونیاو لەسودی تایبەتی خۆمان لەبەر حەق، هەتا ئینسانی موسوڵمان دەبێت لەگیانی بگوزەرێت لەبەرخاتری حەق، گیانی فیدا بکات لەبەرخاتری حەق. نەك یەك ڕۆژ کاسبی، یان دە ڕۆژ کاسبی، ئەوە هیچ نییە، ئینسانی موسوڵمان موکەلەفە وەختێك ئێژێ موسوڵمانم گیانی فیدابکات لە ڕێگەی حەقدا.

ئومێدەوارم ئەم باسانە بۆ ئەوە دەکەم دەماو دەم بگێڕێتەوە لەناو خەڵکدا، بە ئومێد خوای گەورە ڕۆژ بە ڕۆژ زوتر بچێتە پێشەوە. دڵمان سارد نەبێتەوە لەبەر خاتری چوار قەران پول، لەبەر خاتری دوو سەعات ئیسراحەت و ئاسایش لە وەزیفەی جیهادێك کەهەمانە سەرفی نەزەر نەکەین و ڕێگەی خوا وێڵ نەکەین، لەبەر تەماعی دونیا، ئومێدەوارم وەها موحکەم ڕێگەی خۆمان ببڕین تا ئەو کۆمەڵگەیەی حەزرەتی محمد(ﷺ) دروستیکرد، کۆمەڵگەیەك کە هەرچی ئینسانە ئازادە هەر عەقیدەو هەر فیکرێکی هەیە بێت بیژێتی. نەتەنها

ئازادە هەرچی ئینسانە موكەلەفە هەرچی بەحەقی دەزانێت بیلێـت، ئەگـەر كەسێك شتێك بەحەق دەزانێتو نەیلێت لە گۆمەڵگەی ئیسلامیدا گوناهی دەگات. كۆمەڵگەیەك كە بان و خواری تێدا نەبێت، كۆمەڵگەیـەك زۆردارو بـێ زۆری تێـدا نـەوێت، كۆمەڵگەیـەك دەوڵەمـەن و فـەقیری تێـدا نـەوێت دروستیبكەین و ڕووی ئەوەمانە بێت بڵێن ئێمە موسوڵمانین. انشا اللـه.

## دەربارەی ئەنجامدانی جیهادی واقیعی

جیهاد بەوجۆرە كە پێغەمبەر(ﷺ)، قۆناغەكانی دیاری كردوە سێ پلەیە:

(من راه منكم مكرا فليغيره بيده، فان لم يستطيع فابليسان فانه لم يستطيع فا بالقلبه).

دەرەجەی ئەوەڵ لە جیهاد ئەوەیە، كەبەتەواو وجودەوە ئینـسان شـەڕ بكـات لـەگەڵ ناحەقدا، لـەگەڵ نا حسابا.

دەرەجەی دووەم ئەوەیە، كەمەوقیعییەت ڕێگـەی ئـەوە نـەدات مەسـڵەحەتی حەق نەبێت كەبەتەواو وجودەوە شەڕ بكات، لەم قۆناغی دووەمـا قۆناغێـك خوار ترە، كەباسكردنە، ئاگادار كردنەوەیە، ڕوونكردنەوەی فكری خەڵكە.

دەرەجەی سێیەم، كەئیتر خوارترین دەرەجەی جیهادە، بریتیە لـەوەی ئینـسان ناڕەزای خۆی پیشان بدات، شوێنكەوتەیی نەكات، شوێنی تاغوت نەكـەوێت و نیشان بدات بە دڵ ڕقیەتی لە زوڵم، بۆ نمونە كەسێك زوڵمێـك دەكـات و قسەیەكی خـراپ دەكـات، ئەگـەر كەسـێك دەرەقـەتی نەیـەت حـەقی لـێ بسەنێتەوە بەزۆر، نـاتوانێ قـسە بكـات، بەلایـەنی كەمـەوە قـسەی لـەگـەلا نەكات، ئەمە كەمترین پلەی جیهادە.

مانگرتن جۆرێکە لەمە، کاتێك خەڵك ماندەگرێت خۆ لازم نییە گشتی ئاگادار بکاتەوە، یان شەڕی چەکداری نییە بە تەواوی وجودەوە، دوکانەکە داخات، واتە غەڵەتت کرد ئاغای(ئیزهاری)-سەرۆك وەزیران-، هیچی نەوتوەو بەبێ دەنگی ڕوو بەڕوو بۆتەوە.

بەکورتی ئینسان ڕووی ڕازی بوونی خۆی پیشانی زوڵم نەدات، لەوە خوارترین دەرەجەی جیهادە لە دونیای ئەمڕۆدا، لە ڕوو بەڕووو بونەوەی سیاسی ئەمڕۆدا ناسراوە بە(موبارەزەی مەنفهی-ڕوبەڕوبوونەوەی شاراوە-)، ئەم چەمکەتان بیستووە.

هەرکام لەمانە بە تەناسوبی هەر بارودۆخێك ئینسانی موسوڵمان لەنجامی بدات دەبێتە جیهادی واقیعی. لەکاتی خۆیدا ڕوو بەڕوو بونەوەی چەکداری بە تەواوی وجودەوە ئەوە خیهادی واقیعییە. ئەوە دەستی نەدا جیهادی ئاگادارکردنەوەو بە قسەکردن-پلەی دووەم-، پیاوی موسوڵمان شتێك دەزانێت بڕوات بۆ ماڵ و منداڵەکەی باس بکات، فکریان ڕۆشنبکاتەوە، بڕوات بۆ دووکەسی وەك خۆی باس بکات، هاوڕێیەکی ببینێت حاڵی بکات، ئەمە جیهادی واقیعییە. ئەمانە گشتی لای ئیسلام جیهادی واقیعین.

لەم سیانە بەرەو خوار تر ئیسلام قبوڵی ناکات، هەروەها کەخودی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(وذالك اظعفوا ایمان)، ئائەم پلە لە جیهاد کە عیبارەتە لە(ڕووبەڕوو بوونەوەی شاراوە) ئەمە زەعیف ترین پلەی ئیمانە، کەسێك ئەگەر موبارەزەی مەنفیشی نەکرد ئەوە ئیتر ئیمانی نییە.

ئەو کەسە وا ئامادەنابێت ڕووبەڕوو بوونەوەی شاراوەش ئەنجامبدات بۆ لەناو چونی زوڵم کە ئیتر کەمترین زەرەری لێ دەکەوێت، قسەکردن نییە تا بڵێیت




ئەمناسن و بەیانی توشی گرفتاری دەبم. هەڵسانەوەی چەكدارانە نییە تا بڵێیت ئەمكوژن، زەعیف ترین حەرەكە دوكانەكە دادەخەم، كەسێك ئەم حەدە ئەنجام نەدا بەفەرمایشی پێغەمبەر(ﷺ) ئیتر لە زەعیف ترین ئیمانیش مەحرومە، هیچ ئیمانێكی نییە.

لەخودی پێغەمبەر(ﷺ) جیهادی واقیعی دەستی پێكردوە و هەر كەسێك بە پێی تواناو زەمانی خۆی لەهەر قۆناغێكدا توانی و ڕوو بەڕوو بوویەوە، موسبەت كە دەبێتە تەبلیغ و ئیرشادو موسەلەحانە، یان مەنفی وەك مانگرتن و دوكان داخستن و بە گوێ نەكردن ئەمانە گشتی جیهادی واقیعییەو لەلای خوا هەموو قبوڵە.

## باسی سێیەم:

# هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆیلایەتی لە نێوان ئیسلامی و سیستەمی ڕۆژئاوایدا.

لەم باسەدا (کاك ئەحمەد) دەیەوێت بەشێوەیەکی ورد و ئاسان دەربارەی بابەتێکی زۆر تایبەت و هەستیار بەزمانێکی واقیعی و لۆجیکی قسە لەسەر ناشرینترین سیستەمی بەشەری بکات، کەبریتییە لە(سیستەمی کۆیلایەتی). ئەو دێت بەزمانە فکری و فەلسەفی و زانستییەکەی خۆی هەموو ئەو لێڵی و توهمە و پرسیارانە بەڕوونی وەڵام دەداتەوە کەلەدەوری بازنەی(کۆیلایەتی)لەئیسلامدا دەسوڕێنەوە، چونکە تاوەکو ئێستاش زۆرێك لەخەڵکی بەتایبەت(گەنجان) لەبارەی ئیسلام و ڕووبەڕووبونەوەی نەهێشتنی کۆیلایەتییەوە گومانیان هەیە و لەوە پرسیار دەکەن، کە بۆچی لەبارەی کۆیلایەتییەوە لەقورئاندا دەستورێکی سەریحی نییە بۆ حەرامکردنی کۆیلایەتی وەك باقی بابەتە حەرامکراوەکانی دیکەی؟ ئەمەش وەك خاڵە لاوازی ئاینی ئیسلام قسەی لەسەر دەکەن، جا بۆ قسەکردن لەم بارەیەوە (کاك ئەحمەد) بەم جۆرە دەست پێدەکات:

سەرەتا پێش چوونە ناو باسەکەوە پێشەکییەك باس دەکەم کەیارمەتی دەرێکی باش دەبێت بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکان...




بەرنامەگەلێك یان مەكتەبگەلێك كەهەوڵ دەدەن كێشەیەك لەكێشەكانی كۆمەڵگەی بەشەری چارەسەر بكەن بە ئیعتباری ڕەوشی كار و چالاكییان دەتوانین بیان كەینە دوو دەستەوە:

**دەستەی یەكەم: شیعاری**

**دەستەی دووەم: عیلاجی(چارەسەری)**

واتە دەستەیەكیان زیاتر پێداگرن لەسەر شیعاردان و عیبارات دروست كردنێك كەتوانای ئەوەی هەبێت سەرنجی خەڵكی ڕابكێشێت، بەڵام سەنخی كاراییان و كاریگەرییان بۆ چارەسەركردنی كێشەی كۆمەڵگە لەخوارەوەی ئەو شیعار و بانگەشانەیە دەیكەن! ئەو دەستەكەی تر كە(چارەسەرین)، واتە لایەنی بانگەشە و دروشم مەترەح نییە بۆیان كاریان زیاتر بریتییە لە چارەسەركردنی كێشەی كۆمەڵگە بێئەوەی گرنگی بدەن بەلایەنی بانگەشەیی.

لەم باسەدا دەتوانین بۆ موقایەسەكردن نمونە بهێنینەوە بەكاری(پزیشك).

دوو جۆر پزیشك دەتوانین ڕووبەڕووی نەخۆشێك ببنەوە، جۆرێكی ئەوەیە كەڕێك وەك دەستەی یەكەمە كەكاری تەنها بریتی بێت لە شیعار(دروشم) و بانگەشەكردن بۆ خۆی، جۆرەكەی تری كاری ئەوەیە كەچارەسەری نەخۆش بكات. لەهەندێك كاتدا ئەگەرچی پزیشك تەنها مەبەستی ئەوەیە نەخۆش چارەسەر بكات، تا سنورێك پێویستی بەشیعار و تەبلیغ دەبێت، لەهەندێك كاتیشدا كەسێك كەمەبەستی بریتیی بێت لە شیعاردان تا سنورێك مەجبورە كە كاربكات و چارەسەری هەبێت. مەبەستم ئەوەیە كاتێك ئێژم، مەكتەبێك یان بەرنامەیەك كاری تەنها شیعاردانە، ئەمە مانایی وانییە كەئەو لایەنەی تری كە(چارەسەرە)هەر نییەتی یان ئێژم، بەرنامەیەك یان مەكتەبێك كاری




چارەسەرکردنی نارەحەتییەکانی کۆمەڵگەیە. مانایی ئەوە نییە کە هیچ پێویستییەکی بە شیعار و تەبلیغ نەبێت، جیاوازییەکەیان لەوەدایە کە ئەملایان پێداگرە لەسەر شیعار و کەمتر تەرکیز لەچارەسەرکردنی کێشەکان دەکات، ئەولاش تەرکیز لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکانە و کەمتر پێ لەسەر شیعارو تەبلیغ دادەگرێت.

پزیشکەکان، نمونەی زۆریان هەیە لەم پەڕی یانی لەو پەڕی. پزیشکمان هەیە کاتێك بانگ دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشێك لەسەرەتادا کەمێك تەبلیغ بۆ شەخصی خۆی دەکات، بەلاّم لەڕووی دەرمالەوە بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کەناسینیشی نیسبەت بەنەخۆشەکەش کامڵ بێت و ڕێگەی دەرمانیش بزانێت کەچی کارێکی حسابی و ئەساسی ناکات، بەداخەوە ئەمە زۆر بڵاوە کە پزیشکانی واهەیە نەخۆش دەکەنە سەرچاوەیەکی داهات بۆ خۆیان! کارێکی وادەکەن بەشێوەیەکی(بەردەوام) ئەم نەخۆشە پێویستی هەبێت و سەردانیان بکات، هەر جارێکیش سەردانیان دەکات شتێکی تازەی پێدەدەن و پارەی لێوەردەگرن،نمونەی زۆریشم دیووەو بیستوشمە لەچەند ڕۆژێك پێش ئێستا باسی پزیشکێکیان کرد لە(تاران)دا،کە یەکە ژمارەی (٦٠٠) تمەنی و یەك ژمارەی (١٠٠) تمەنی بەدوو ناونیشان لەکەسێکی نەخۆش سەندووە و تاقیکردنەوەیەکی پێداوە کە بڕوات ئەنجامەکەی بهێنێتەوە، کاتێك کە تاقیکردنەوەشی بردۆتەوە دووبارە(١٠٠)تمەنی تری لێوەرگرتووە! هەر بەم جۆرە زۆر کەس هەڵدەکەوێت نەخۆشێك بۆ چارەسەرکردنێکی زۆر سادە و موختەصەر بەرنامەی وای بۆ دادەنێن مەجبور بێت چەندین جار سەردانی پزیشك

بکاتەوە! ئەم پزیشکگەلە لە گروپی ئەو جۆرە ئینسانگەلەن کە زیاتر گرنگی بەتەبلیغات دەدەن، لەبەر خاتری نییەتێکی ناسالم کەهەیانە کەئەویش چارەسەری واقیعی کێشەی خەڵك نییە، بەڵکو مەبەستیان سودوەرگرتنی خۆیانە. لەبەرامبەر ئەمانەشەوە پزیشکێك هەیە کەکاتێك نەخۆشێك سەردانی دەکات تەبلیغێك بۆ خۆی ناکات مەگەر لەسنورێکدا تەصەوری ئەوە بکات کە نیازی دەرونی ئەو نەخۆشە داوای ئەوە دەکات، کە ئیعتماد(سیقە)بەو پزیشکە پەیدا بکات و (بۆیە شیعار و تەبلیغاتێك لەسنورێکدا بۆ خۆی دەکات) واتە ئەصڵی هەدەف و بەرنامەی بریتیی نییە لەشیعاردان و تەبلیغ کردن بۆ خۆی، بەڵکو ئەصڵی هەدەفی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشەیە. صەمیمیانە چاودێری دەکات و نەخۆشییەکەی دیاری دەکات و دەرمانی بۆ دەنوسێت بەجۆرێك بتوانێت تەنانەت ئەگەر ئیمکانی هەبێت بەبەکارهێنانی یەك نوسخە لەو دەرمانەی بۆی نوسیوە چاك ببێتەوە، لەولاشەوە نوسخەی دەرمانەکەش ساخت و پاخت ناکات لەگەڵ سەنتەرەکانی دەرمان دابەشکردندا و فرۆشتنی دەرماندا، بەڵکو بەدەرمانگەلێکی زۆر سادە و بەتێچونێکی زۆر کەمەوە دەرمانی پێویست دەنوسێت بۆ نەخۆش.

مەکتەبگەلیش رێك وەك ئەم نمونانەن، هەندێك هەن هەدەفی ئەصلییان(شیعاردان و تەبلیغ کردنە)بۆ خۆیان، بەلاّم لەبەرئەوەی شیعار و تەبلیغ بەتەنها ناتوانێت کاریگەری و قورسایی هەبێت لەناو خەڵکیدا ناچارن هەندێك کێشەی چارەسەر بکەن! ئەمەش لەدونیای ئەمڕۆدا زۆر دەبینیت! مەکتەبێکی تریش هەیە ئەصڵی هەدەفی ئەوەیە کێشەی خەڵکی چارەسەر بکات، بەلاّم لەوانەیە پێویستی بەوەش بکات کەمێك تەبلیغ بکات بۆ

بەرنامەكەی خۆی، هەندێك شیعارگەل بێژی كەدەرونی خەڵكی ئامادە بكات بۆ سود وەرگرتن لەو مەكتەبە. ئیسلام لەجۆری ئەم مەكتەبەیە كە لێژین هەدەفی دەرمانی خەڵكە نەك شیعاردان و تەبلیغ كردن، ئەمەش لەبەر لایەنی جۆراوجۆر كەیەكێكیان لە گشتیان گرنگترە. ئەویش ئەمەیە كە زۆرێك لە(مەرەزگەل)–نەخۆشی–لە كۆمەڵگەدا هەیە كەخەڵكی بەشێوەیەكی دەقیق و ورد ناتوانن بوعدەكانی ئەو (مەرزە) دەرك بكەن، هەروەها خەڵكی توانایی فكری ئەمەشیان نییە كەرێگەگەلی دەرمانی بەدروستی دیاری بكەن. ئەو مەكتەبە دێت رێگەگەلێك دەدۆزێتەوە و بەبێ رونكردنەوە و تەفسیركردنی دوورودرێژ بۆئەوەی ئەو(مەرەزە)ی كەلەكۆمەڵگەدایە چارەسەری بكات و ریشەكەنی بكات. ئەو ئەم كێشەیە ریشەكەن دەكات كەچی هێشتا خەڵك نازانن چی كراوە، هەروەك پزیشكێك كەدەچێتە سەر منداڵێك و ئەو منداڵە رِوشد و دەركێكی نییە ناتوانێت لەتەبلیغ و شیعارات حاڵی ببێت، بەڵام پزیشكەكە مەبەستییەتی ئەو منداڵە چارەسەر بكات بۆیە چارەسەری دەكاتو خۆشی دەكاتەوە بەبێ ئەوەی هیچ شیعار و تەبلیغێك بدات، چونكە ئەو منداڵە نافامێت و دەركی ناكات، چونكە مەوردێك بۆ شیعار و تەبلیغ مەترەح نییە، لەكاتێكدا ئەو پزیشكە ئەگەر نەخۆشەكەی كەسێكی گەورە بێت و لەرِووی دەرونییەوە ئیحساسی ئەوە بكات پێویستی بەوە هەیە ئیعتمادێك بەم پزیشك و شێوازی دەرمانە كەئەم هەیەتی بكات، ئەو كاتە بەپێویستە بزانێت كەمێك تەبلیغی بۆ بكات، بەلەبەرچاوگرتنی ئەم حەقیقەتە كۆمەڵگەیەك كەئیسلام لەسەرەتاوە پەروەردەی كردووە لەرِووی ئاگایگەلییەوە هەروەك ئەو منداڵە وایە وا(پزیشكێك) دەچێت چارەسەری

دەكات نیسبەت بە زۆرێك لەكێشە كەهەیبووە، واتە چۆن پزیشكێك تەنها ئەوەی لەسەرە چارەسەری منداڵێك بكات و ئیتر هیچ پێویستییەك نییە بۆئەوەی تەبلیغ و باسێكی بۆ بكات، ئەو كۆمەڵگەی یەكەمە كەئیسلام هاتووە و پەروەردەی كردووە بۆئەوەی باری مەسئولییەتی هەڵگرتنی دین و گەیاندنی بەجێگەگەلی تری دونیا تەعەهود بكات، هەروەك ئەو منداڵە بووە نیسبەت بەزۆرێك لەكێشەو بابەتی كۆمەڵگەی خۆی و نەیتوانیووە دەركی بكات، ئیسلام هاتووە بەتەدریج و هەنگاو لەدوای هەنگاو دەرمان و چارەسەری كردووە بەبێ ئەوەی كەئەصڵەن شیعار و تەبلیغی بۆ بكات، چونكە(كۆمەڵگە)حاڵی نەبووە تاوەكو ئەم شیعاری بۆ بدات و تەبلیغی بۆ بكات، پێش ئەوەی بچمە سەر بابەتی(كۆیلایەتی) كە بابەتێكی سیاسی و كۆمەلآیەتی و ئابوری گەورەی سەردەی خۆی بووە. لەیەكێكی تر لەبابەتەكان كە(دین)هاتووە و ڕێگەی دەرمانی بۆ داناوە لەناو كۆمەڵگەدا لەكاتێكدا كەخەڵكی لێی حاڵی نەبوون باس بكەم:

لەئیسلامدا شتگەلێك كەزەرەریان هەیە بۆ زیندەگی بەشەر و تێكەڵی مادە خۆراكییەكان بوون، یاخود تێكەڵی زیندەگی ئینسان بوون ناونراون بە(حەرام)، بەلآم حەرامگەلێك زەرەری مادی لەپێكهاتەیەكی كەمی(گەردیلەكانیشیاندا)هەبێت ئەو حەرامگەلە ناونراوە(نەجەس)، واتە حەرامگەلێكی (موضاعَف)لاواز. شتگەلێك كەترسناك و زەرەرە بۆ بەشەر ئەگەر ترسناكی مادی وای هەبێت كەئەگەر بەشێكی بچوكیشی تێكەڵی مادەیەكی خۆراكی ئینسان ببێت لەوانەیە ببێتە هۆكاری لەتەلێدانی، ئائەوەی تەئكیدكردۆتەوە و لایەنە حەرامییەكی ناوناوە(نەجەس). ئیسلام دوای برینی

قۆناغی جیاواز و ئامادەكردنی بەشەر بۆ تەركی(مەشروب) لەحوكمی كۆتاییدا بە(نجس)ناوی دەبات، جابابزانین ئەو كۆمەڵگە توانیویەتی دەركی ئەوە بكات كە هۆكاری چییە (مەشروب) بە(نجس)ناسێنراوە؟

وەڵامەكەی بەنەخێر دەبێت، كەواقیعەن نەیتوانیووە دەركی بكات! چونكە لە كاتێك بەمێژووی(فقه)ی ئیسلامدا دێیتە خوارەوە سەیردەكەیت تاوەكو لەم سەدەی دواییانە(فوقەها)سەرگەردانی ئەوەن كەعیللەتی حوكمی(نجاسەت) بۆ (مەشروب)دەبێت چی بێت! بۆ ئەمەش وەڵامێكیان نەدۆزیوەتەوە. عیللەتی حەرامییەكەی دەزانن و دەركی دەكەن ئێژن"چونكە مەشروب(مەستی)دروست دەكات و ئەمەش دەبێتە هۆكاری شێوالی دەرك و شعوری ئینسان".ئائەمەیان دەرك كردووە كەدەبێت حەرام بێت، بەڵام عیللەتی (نجاسەت)ی دەرك نەكراوە، چونكە وتویانە بۆ نمونە، ئەگەر ئینسان كەوچكێكی بخوات مەستی ناكات و زەرەرەكەی دیار نییە، جاكاتێكیش شتێك بە(نجس)ناونرا مانایی ئەوەیە كەكەمترین بەشیشی زیانی هەبێت بۆ زیندەگی، كاتێك(مەشروب) ـ واتە ئەم مەوادە(كحولیانە)- میقدارێكی كەمی زیانی هەبێت بۆ(جەستە) ئەو زەرەرەی ئەوان دەركیان كردووە كەنابێتە هۆكاری(مەست بوون) دەی ئیتر بۆچی دەبێت لە(حەرامی) حوكمی زیاتر بێت؟ بۆچی دەبێت بە(نجس) ناوبنرێت؟

وەڵامی ئەمەیان نەدۆزیوەتەوە تاوەكو چەند ساڵێك پێش ئێستا كە بلاْوكراوەكان ڕاگەیاندنی (كۆمیتەیەكی جیهانی بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ(الكحول)دا)یان بلاْوكردەوە، لەوێدا ئەم خاڵەی ڕونكردەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە كەبە درێژای(چواردە سەدە) بەشوێنیدا دەگەڕان، ئەو




کۆمیتــەی بەرەنگاربوونــەوە لەگــەڵ (الکحـول)دا هــیچ یــەکێك لـەبەرپرســە بالأکان ئینسانێکی موسوڵمان نەبوون، تاوەکو تەصەوری ئــەوە بکرێــت کــە بەهۆی کاریگەری دیدێکی دینییەوە حوکمێك دەربکات و قەزاوەتێك بکــات لەبارەی(کحولەوە)، هەشت دانــە دەوڵــەت بیریــار و پسپۆڕێکیان ناردبوو بەشداری لەو دانیشتنە دوورودرێژانەدا بکەن کەلەبارەی (کحولــەوە) بــاس و لێکۆڵینەوەیان ئــەنجام دەدا و قــسە لەســەر زیانــەکانی دەکــرا لــەدوای ئــەو دانیشتن و لێکۆڵینەوانە بەیانی کۆتاییان ڕاگەیاند. (ئەوەش بڵــێم، هــیچ کــام لەو زانکۆیانەی بەشدارییان کردبوو لەو لێکۆڵینەوە و دانیشتنانەدا پەیوەست نەبوون بە جیهانی ئیسلامییەوە گشتی دەوڵــەتی غــەیر ئیــسلامی بــوو).کۆتــا بیروڕا کەئەو کۆمیتە ڕایگەیاند، بەکورتییەکەی ئەمە بوو"کە کحولات تــەنها یەك قەترەشی دەبێتە هۆی دروست کردنی کاریگەری خراپ".

دەی (چواردە سەدە)تێپــەڕی ئینجــا بەشــەر تــوانی دەرکــی ئــەم خاڵــە دەرك بکات! دوای ئەوەش ئێستا ئێمە حاڵی دەبین کەبۆچی لەبابــەتی (کحولیاتــدا) تەنها حوکمی بە(تحریم)نەدراوە، بەڵکو حوکمەکەی لــە حــەرامی لەســەرترە کەبە(نجاسەت)دراوە وەڵامەکەشی ئەمەیە، چونکە(نجاسەت)حــوکمی شــتێکە کەمیقدارێکی کەمیشی زیانی هەیە بۆ سەلامەتی و تەندروستی ئینسان، ئەمەش زانراوە بۆمان کە(کحول)قەترەیەکیشی زیانی هەیە بۆ عەقڵی بەشــەر، ئەگــەر وابێــت حــوکمی(نجاســەت)شــاملی دەبێــت! دەی بــە ســەرنجدان لەمــەی کە(چواردە سەدە) تێپەڕیووە و تازە بۆمان دەرکەوتووە هۆکاری(نجاسـەت)ی کحولیات چییە؟ بیربکەینــەوە کەبەشــەر لــە(چــواردە ســەدەی)لەمەوپێــشدا یەشەر هێشتا (چواردە سەدەی) ماوە کە گەشە بکات و لەم نهێنییــە تێبگــات

قۆناغی جیاواز و ئامادەکردنی بەشەر بۆ تەرکی(مەشروب) لەحوکمی کۆتایدا بە(نجس)ناوی دەبات، جابابزانین ئەو کۆمەڵگە توانیویەتی دەرکی ئەوە بکات کە هۆکاری چییە (مەشروب) بە(نجس)ناسێنراوە؟

وەڵامەکەی بەنەخێر دەبێت، کەواقیعەن نەیتوانیووە دەرکی بکات! چونکە لە کاتێك بەمێژووی(فقه)ی ئیسلامدا دێیتە خوارەوە سەیردەکەیت تاوەکو ئەم سەدەی دواییانە(فوقەها)سەرگەردانی ئەوەن کەعیللەتی حوکمی(نجاسەت) بۆ (مەشروب)دەبێت چی بێت! بۆ ئەمەش وەڵامێکیان نەدۆزیوەتەوە. عیللەتی حەرامییەکەی دەزانن و دەرکی دەکەن ئێژن"چونکە مەشروب(مەستی)دروست دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆکاری شێوانی دەرك و شعوری ئینسان".ئائەمەیان دەرك کردووە کەدەبێت حەرام بێت، بەڵام عیللەتی (نجاسەت)ی دەرك نەکراوە، چونکە وتویانە بۆ نمونە، ئەگەر ئینسان کەوچکێکی بخوات مەستی ناکات و زەرەرەکەی دیار نییە، جاکاتێکیش شتێك بە(نجس)ناونرا مانایی ئەوەیە کەکەمترین بەشیشی زیانی هەبێت بۆ زیندەگی، کاتێك(مەشروب) ـ واتە ئەم مەوادە(کحولیانە)- میقدارێکی کەمی زیانی هەبێت بۆ(جەستە) ئەو زەرەرەی ئەوان دەرکیان کردووە کەنابێتە هۆکاری(مەست بوون) دەی ئیتر بۆچی دەبێت لە(حەرامی) حوکمی زیاتر بێت؟ بۆچی دەبێت بە(نجس) ناوبنرێت؟

وەڵامی ئەمەیان نەدۆزیوەتەوە تاوەکو چەند ساڵێك پێش ئێستا کە بڵاوکراوەکان ڕاگەیاندنی (کۆمیتەیەکی جیهانی بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ(الکحول)دا)یان بڵاوکردەوە، لەوێدا ئەم خاڵەی ڕونکردەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە کەبە درێژای(چواردە سەدە) بەشوێنیدا دەگەڕان، ئەو




کۆمیتەی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ (الکحول)دا هیچ یەکێك لەبەرپرسە باڵاکان ئینسانێکی موسوڵمان نەبوون، تاوەکو تەصەوری ئەوە بکرێت کە بەهۆی کاریگەری دیدێکی دینییەوە حوکمێك دەربکات و قەزاوەتێك بکات لەبارەی(کحولەوە)، هەشت دانە دەوڵەت بیریار و پسپۆڕێکیان ناردبوو بەشداری لەو دانیشتنە دوورودرێژانەدا بکەن کەلەبارەی (کحولەوە) باس و لێکۆڵینەوەیان ئەنجام دەدا و قسە لەسەر زیانەکانی دەکرا لەدوای ئەو دانیشتن و لێکۆڵینەوانە بەیانی کۆتاییان ڕاگەیاند. (ئەوەش بڵێم، هیچ کام لەو زانکۆیانەی بەشدارییان کردبوو لەو لێکۆڵینەوە و دانیشتنانەدا پەیوەست نەبوون بە جیهانی ئیسلامییەوە گشتی دەوڵەتی غەیر ئیسلامی بوو). کۆتا بیرورا کەئەو کۆمیتە ڕایگەیاند، بەکورتییەکەی ئەمە بوو"کە کحولات تەنها یەك قەترەشی دەبێتە هۆی دروست کردنی کاریگەری خراپ".

دەی (چواردە سەدە)تێپەڕی ئینجا بەشەر توانی دەرکی ئەم خاڵە دەرك بکات! دوای ئەوەش ئێستا ئێمە حاڵی دەبین کەبۆچی لەبابەتی (کحولیاتدا) تەنها حوکمی بە(تحریم)نەدراوە، بەڵکو حوکمەکەی لە حەرامی لەسەرترە کەبە(نجاسەت)دراوە وەڵامەکەشی ئەمەیە، چونکە(نجاسەت)حوکمی شتێکە کەمیقدارێکی کەمیشی زیانی هەیە بۆ سەلامەتی و تەندروستی ئینسان، ئەمەش زانراوە بۆمان کە(کحول)قەترەیەکیشی زیانی هەیە بۆ عەقڵی بەشەر، ئەگەر وابێت حوکمی(نجاسەت)شاملی دەبێت! دەی بە سەرنجدان لەمەی کە(چواردە سەدە) تێپەڕیووە و تازە بۆمان دەرکەوتووە هۆکاری(نجاسەت)ی کحولیات چییە؟ بیربکەینەوە کەبەشەر لە(چواردە سەدەی)لەمەوپێشدا بەشەر هێشتا (چواردە سەدەی) ماوە کە گەشە بکات و لەم نهێنییە تێبگات

چ شیعارێك بدرێت؟ چ لایەنێكی شیعاری بەكاردەهێنرێت بۆ ئەو كۆمەڵگەیە لەباس و خواسی ئەمەدا كە(كحول) (نجس)ە؟ دیارە كەناتوانێت هیچ دەرك بكات! دەی زۆرێك لەم بابەتانە لەئیسلامدا وتراون و بەشەر حاڵی كراوە، لەكاتێكدا بەشەر نەیتوانیووە فەلسەفە و ڕازەكەی دەرك بكات! لەهەمان كاتدا ئەوەش دەزانین شیعار: بریتییە لەوەی كە مەتڵەبێك ئەوەندە پەرۆپۆی پێ بدرێت، ئەوەندە تەبلیغی بۆ بكرێت كەزیاتر لەوەی هەیە زیهنگەل جەزببكرێت(ڕابكێشێت)بەرەو لای. لەكاتێكدا زیهنی كەسێك ئامادەیی نییە كەلەڕازی یەك مەتڵەب حاڵی ببێت وە مەكتەبێكیش دێت ئەو مەتڵەبە فێری خەڵكی دەكات(واتە خودی حوكمەكەی نەك ڕازی حوكمەكەی فێری خەڵكی دەكات) و دەستور دەداتە خەڵكی وارەفتار بكەن و وامەیكەن، دەی لەم كاتەدا چۆن شتی وامەترەح دەبێت، كە بێت تەبلیغ بكات و لەبارەیەوە شیعار بدات لەبارەی بابەتەكەیەوە؟! ئائەم نمونە بچوكەش بەسە بۆ ئەوەی كەلەمەوە ئیلهام بگرین بۆ بابەتی(كۆیلایەتی).

لەكۆمەڵگەی(چواردە سەدەی) لەمەوپێشدا لەناوچەی(مەركەزی جزیرەی عەرەبی)دا كۆیلایەتی یەكێك لەئەركانە زۆر زۆر گەورەكانی زیندەگی بوو! ئیسلام مەكتەبێكە بۆ چارەسەری تەواوی كێشە فەردی و كۆمەڵایەتییەكانی بەشەر هەوڵ دەدات، نەك یەك بەرنامە و یەك كێشە، بەڵكو تەواوی ئەوەی وا لەزیندەگی و مەعنەوی ئینساندا مەترەحە، چ فەردی،چ كۆمەڵایەتی.

كۆمەڵگەی(جزیرەی عەرەبی) و هەروەها دونیای دەوروبەری جۆرەها زوڵم و فەسادی تێدابوو، بەشەریەت جۆرەها زەجرگەلی دەكێشا، جۆرەها ئیمتیازات و تەبەقات بەسەر كۆمەڵگەدا حوكمی دەكرد، بەڵام نمونەیەك زۆر

خوێنتاڵ و نالەبار لەناوچەی جزیرەی عەرەبی بریتی بوو لە(ستەمی كۆیلایەتی) نەك ئەوەی كێشەی كۆمەڵگە تەنها سیستەمی كۆیلایەتی بێت نا، بەڵكو كۆمەڵگە لەهەرچی ڕووەوەیە نەخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی كۆیلایەتیشی تێدابوو، واتە دەبێت مەعمولەن مەبانی شتێك لەكۆمەڵگەدا تەحەقوقی هەبێت، پاشان ئەو شتە شێوازی كرداری پەیدا بكات! كۆمەڵگەیەكی سالم ئەگەر كێشەیەكی هەبێت حەل دەبێت، بەلاَم ئەگەر كۆمەڵگە سالم بێت ئیمكانی نییە كێشە لەو كۆمەڵگەدا پەیدابێت و شێوەی تەحەقوق پەیدابكات. لەسەرەتادا كۆمەڵگەو ئینسانگەل و فیكر و دەركگەل و دەرونگەل ناسالم لەپاشان یەك مەرەزی كۆمەلاَیەتی لەكۆمەڵگەیەكدا تەحەقوق پەیدا دەكات. كۆمەڵگەكانی دونیا گشتی ناسالم بوون لەناویشیاندا ناوچەی مەركەزی جزیرەی عەرەبی كەبەبۆنەی ناسالمییەوە ئەم كێشەیەی تێدا پەیدابوو كە بریتیی بوو لە(كۆیلایەتی) و چووبوویە ناو لایەنە جیاوازەكانی ژیانیانەوە، كاتێك كەئیسلام هاتووە و ڕووبەڕوو دەبێتەوە مانایی ئەوە نییە كەلەگەڵ كۆیلایەتیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵكو ڕووبەڕووی ژێرخانگەلێك دەبێتەوە كە لەعەقیدە و دەرك و فیكر و فەهم و تایبەتمەندییەكانی ئەخلاقی ئینسانگەلدا نفوزی كردووە! ئەو نەخۆشیگەلە دەرمان دەكات تاوەكو بتوانێت وردە وردە بابەتگەلێك كەلە سەتحی كۆمەڵگەدایە چارەی بكات. زووتر قسەم لەبارەی(ژێرخان) و (سەرخان)ەوە كردووە، كە(ژێرخان): خودی ئینسانە، بەلاَم نەك جسمی، واتە دەرونی ئینسان ژێرخانی هەر بابەتێكە بۆ تاك و بۆ كومەڵگە. لێرەشدا بەكورتی باسم كردووە،كە(ژێرخان) نەخۆش كەوتووە و وا بۆتە هۆكاری سەرهەڵدانی ئەم گشتە نەخۆشییەی

(سەرخان)کەلە کۆمەڵگەدا دروست بووە! واتە دەرولی بەشەریەت کەئەویش(زانینگەل و تایبەتمەندی و ئەخلاقی)، واتە دەروونی ئینسان لەم دوو بەشە پێکهاتووە. ئەم دوو بەشە ناسالم بوو بۆیە کۆمەڵگەش تووشی لەو نەخۆشیگەلە جۆراوجۆرە بوو. جابەشەریەت لەهەر شێوە و سیستەمێکی کۆمەلاّیەتیدا کاتێك لەڕووی دەرونییەوە ناسالم دەبێت کێشەی جۆراوجۆری کۆمەلاّیەتی تێدا دروست دەبێت.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەم حەقیقەتەو بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەبیروبۆچوونی ئیسلامدا ئینسان خۆیەتی عاملی دیاری کردنی نەخشەی زیندەگی و بەرنامەی خۆیو باقی بابەتەکانی تر گشتی موتەعەلیق بەئینسانن و مەسائیلی ئینسانە نە ئابووری، نە سیاسەتو دینو مەزهەب هیچ کام لەو مەسائیلانەی لەکۆمەڵگەدا(ژێرخان)نین، بەڵکو گشتی سەرخانە و ژێرخان خودی ئینسانە. ئەوە ئینسان خۆیەتی ئەم بابەتانە لەکۆمەڵگەی خۆیدا دیاری دەکات چ باش، چ خراپ، ئەگەر ئینسان خۆی خراپ بوو بابەتەکانی کۆمەڵگەشی خراپ دەبێت، ئەگەر ئینسان خۆی باش بوو بابەتەکانی کۆمەڵگەکەشی باش دەبێت. کۆمەڵگەی ئینسانی هەر نەخۆشێکی هەبێت ڕێگەی چارەسەر کردنی ئەو نەخۆشییە ئەوەیە کەخودی ئینسان چارەسەر بکەیت، چونکە نەخۆشییەکە لەخودی ئینساندایە بۆیە وا نەخۆشی کۆمەلاّیەتی دروست بووە، هەروەها لەڕووی کردارییەوە هەر قوتابخانەیەك لەدونیای ئەمڕۆدا کاتێك سەرنج لەکۆمەڵگە دەدات و گەرەکییەتی سیستەمێك لەناو ئەم کۆمەڵگەیەدا جێبەجێ بکات، عەمەلەن لەم ڕەوشتە سودوەردەگرن کەدێت ئینسانگەل چارەسەردەکات. لەسەرەتادا دێت کار لەسەر دەرونی ئینسانگەل دەکات و ئەو




دروست دەكات، هەرچەند لەناونیشانی مەتڵەبەكەیدا بەوشێوەیەش نەڵێت و ئینسان بە ژێرخان حساب نەكات و بۆ نمونە(نەتەوە)، ئابوری، سیاسەت(حوكمەت)، یان هەر جۆرە بابەتێكی تر بێژین و ئەوە بە(ژێرخان)حساب بكات، بەڵام عەمەلەن كاتێك دەڕواتە مەیدانی كارەوە سەیردەكەیت پیشانی دەدات لەبیروبۆچوونی ئەویشدا(ژێرخان) بریتییە لەخودی ئینسان و دەرونی ئینسان، بۆئەوەی بتوانێت بەرنامەكەی خۆی جێبەجێ بكات دروست دەستدەكاتە پەروەردەكردنی دەرونی ئینسان و كار لەگۆڕینی دەرونی ئینساندا دەكات. لێرەوە ڕێگە خۆش دەكات بۆ خۆی بۆئەوەی بتوانێت فۆڕمێك بگۆڕێت و فۆڕمێكی تر دابنێت.

ئیسلام ئەم واقیعیەتە دەرك دەكات و دەزانێت ئینسان خۆی حسابە و كاتێك كۆمەڵگەیەك نەخۆشە لەبەرئەوەیە ئینسان خۆی نەخۆشە، فكر و ئەخلاقی نەخۆشە! بۆیە دەست دەكاتە دروست كردنی ژێرخان{واتە دەستدەكات بە دروستكردنی ئینسان، ئەویش بە پێدانی زانیاری و تایبەتمەندییە ئەخلاقییەكان}.

سیانزەساڵ سەردەمی ڕووبەڕوو بوونەوەی یەكەمی ئیسلام بوو،(سەردەمی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) مانەوەی لەمەككەدا) كەلەو (سیانزەساڵ)ەدا بەماناگەلی جیاواز هێشتا كۆمەڵگەیەك دروست نەبوو بوو، بەڵكو هەستەیەكی مەركەزی و ژێربینایەكی بەهێز و دروست بۆ دروست كردنی كۆمەڵگەیەك بەوجود هاتبوو، ژمارەیەك لە ئینسانگەل كەلەڕووی دەرونییەوە لەهەرچی لایەنەوەیە بەهێزبوون پەروەردە بوو بوون كەئەمان بتوانن ببنە پایە بۆ دروست بوونی یەك كۆمەڵگەی ڕاست و دروست و محكەم.




(سەرخان)كەلە كۆمەڵگەدا دروست بووە! واتە دەرونی بەشەریەت كەئەویش(زالینگەل و تایبەتمەندی و ئەخلاقی)، واتە دەروونی ئینسان لەم دوو بەشە پێكهاتووە. ئەم دوو بەشە ناسالم بوو بۆیە كۆمەڵگەش تووشی ئەو نەخۆشیگەلە جۆراوجۆرە بوو. جابەشەریەت لەهەر شێوە و سیستەمێكی كۆمەڵایەتیدا كاتێك لەرِووی دەرونییەوە ناسالم دەبێت كێشەی جۆراوجۆری كۆمەڵایەتی تێدا دروست دەبێت.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەم حەقیقەتەو بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەبیروبۆچوونی ئیسلامدا ئینسان خۆیەتی عاملی دیاری كردنی نەخشەی زیندەگی و بەرنامەی خۆیو باقی بابەتەكانی تر گشتی موتەعەلیق بەئینسانن و مەسائیلی ئینسانە نە ئابووری، نە سیاسەتو دینو مەزهەب هیچ كام لەو مەسائیلانەی لەكۆمەڵگەدا(ژێرخان)نین، بەڵكو گشتی سەرخانە و ژێرخان خودی ئینسانە. ئەوە ئینسان خۆیەتی ئەم بابەتانە لەكۆمەڵگەی خۆیدا دیاری دەكات چ باش، چ خراپ، ئەگەر ئینسان خۆی خراپ بوو بابەتەكانی كۆمەڵگەشی خراپ دەبێت، ئەگەر ئینسان خۆی باش بوو بابەتەكانی كۆمەڵگەكەشی باش دەبێت. كۆمەڵگەی ئینسانی هەر نەخۆشێكی هەبێت رِێگەی چارەسەر كردنی ئەو نەخۆشییە ئەوەیە كەخودی ئینسان چارەسەر بكەیت، چونكە نەخۆشییەكە لەخودی ئینساندایە بۆیە وا نەخۆشی كۆمەڵایەتی دروست بووە، هەروەها لەرِووی كردارییەوە هەر قوتابخانەیەك لەدونیای ئەمرِۆدا كاتێك سەرنج لەكۆمەڵگە دەدات و گەرەكییەتی سیستەمێك لەناو ئەم كۆمەڵگەیەدا جێبەجێ بكات، عەمەلەن لەم رِەوشتە سودوەردەگرن كەدێت ئینسانگەل چارەسەردەكات. لەسەرەتادا دێت كار لەسەر دەرونی ئینسانگەل دەكات و ئەو





دروست دەكات، هەرچەند لەناونیشانی مەتڵەبەكەیدا بەوشێوەیەش نەڵێت و ئینسان بە ژێرخان حساب نەكات و بۆ نمونە(نەتەوە)، ئابوری، سیاسەت(حوكمەت)، یان هەر جۆرە بابەتێكی تر بێژین و ئەوە بە(ژێرخان)حساب بكات، بەڵام عەمەلەن كاتێك دەڕواتە مەیدانی كارەوە سەیردەكەیت پیشانی دەدات لەبیروبۆچوونی ئەویشدا(ژێرخان) بریتییە لەخودی ئینسان و دەرونی ئینسان، بۆئەوەی بتوانێت بەرنامەكەی خۆی جێبەجێ بكات دروست دەستدەكاتە پەروەردەكردنی دەرونی ئینسان و كار لەگۆڕینی دەرونی ئینساندا دەكات. لێرەوە ڕێگە خۆش دەكات بۆ خۆی بۆئەوەی بتوانێت فۆڕمێك بگۆڕێت و فۆڕمێكی تر دابنێت.

ئیسلام ئەم واقیعەتە دەرك دەكات و دەزانێت ئینسان خۆی حسابە و كاتێك كۆمەڵگەیەك نەخۆشە لەبەرئەوەیە ئینسان خۆی نەخۆشە، فكر و ئەخلاقی نەخۆشە! بۆیە دەست دەكاتە دروست كردنی ژێرخان{واتە دەستدەكات بە دروستكردنی ئینسان، ئەویش بە پێدانی زانیاری و تایبەتمەندییە ئەخلاقییەكان}.

سیانزەساڵ سەردەمی ڕووبەڕوو بوونەوەی یەكەمی ئیسلام بوو،(سەردەمی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) مانەوەی لەمەككەدا) كەلەو (سیانزەساڵ)ەدا بەماناگەلی جیاواز هێشتا كۆمەڵگەیەك دروست نەبوو بوو، بەڵكو هەستەیەكی مەركەزی و ژێربینایەكی بەهێز و دروست بۆ دروست كردنی كۆمەڵگەیەك بەوجود هاتبوو، ژمارەیەك لە ئینسانگەل كەلەڕووی دەرونییەوە لەهەرچی لایەنەوەیە بەهێزبورن پەروەردە بوو بوون كەئەمان بتوانن ببنە پایە بۆ دروست بوونی یەك كۆمەڵگەی ڕاست و دروست و محكەم.

لەپاشاندا (هجرت)دەستی پێكرد لە(مەككە)وە بۆ(مەدینە) و كاتێك هجرەت كرا وردە وردە بنەمای تەشكیلی یەك كۆمەڵگە لە(مەدینەی منەوەرە)دا فەراهەم بوو. ئەگەر كەمێك دیقەت بكرێت لەبارەی بەرنامەی چالاكی پێغەمبەرەوە(ﷺ) و بزانرێت ئەو كاتە ئەوكەسەی لەبارەی(كۆیلایەتی لە ئیسلامدا و نەمانی ئەم سیستەمە)هەر پرسیارێكی بۆ دروست ببێت دەتوانێت وەڵامی خۆی بداتەوە هەرچەندە من لەكۆتایدا بەدرێژی دەیڵێم.

وتمان، سیانزەساڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مەككەدا تەنها ئەو هەستە مەركەزی و ژێرخانەی یەك كۆمەڵگەی ئیسلامی پەروەردە كرد، و لەپاشاندا هجرەتی كرد بۆ مەدینە. كەهاتیش بۆ مەدینە دەتوانین بڵێین لەلایەكەوە گروهگەلێك دابەش بوو هەبوون بۆ ڕوبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئیسلامدا، واتە تەنانەت شاری مەدینەش دەربەستی یەك كۆمەڵگەی ئیسلامی نەبوو، لەپاشانیشدا وردە وردە و كەم كەم ئیسلام پەرەیسەند و نفوزی كرد بۆ دەوروبەر. دواتر ئەوەش دەزانین كە ئیسلام موتەعەقید بەیەك كۆمەڵگەی بەستەی جوگرافیایی نییە(واتە لەڕووی جوگرافییاییەوە نەك فەرهەنگ و فكرییەوە)، واتە موتەعەقید بە نیزامی دیاری كراوی جوگرافیایی نییە،كەواتە(مەرز)بوون ناناسێت{واتە سنورداربوون ناناسێت}، بەو نیسبەتە كە موتەعەقید نییە بە(مەرز)بوون لەسەردەمی خودی پێغەمبەردا(ﷺ)مورەتەب سەرزەمینی ئیسلام(گوستەرش)ی پەیدا دەركرد بەو مانایەی كە مورەتەب لەدەوروبەرەوە خەڵكی ڕوویان دەكردە ئیسلام و موسوڵمان دەبوون، لەسەدەمی(دە ساڵەی)مانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدینەدا هەرگیز كۆمەڵگەیەك بە سنورێكی جوگرافیاییەوە وجودی نەبووە، دوای ئائەم كەمە لەڕوونكردنەوە ئێمە




دەتوانین دەركی ئەم نوكتە بكەین: كەلەحاڵێكدا كۆمەڵگەیەك بەسنورێكی جوگرافیایی موسەلەم وجودی نەبێت، جێبەجیٚ كردنی سیستەمی كۆمەڵایەتی بەشێوەیەكی تەواوەتی نامەعقولە، تەصەورێكی پووچ و هەڵەیە! ئەم باسە كوللیە ئێژم جالەوەودوا ڕوونكردنەوەشی باس دەكەم.

## ئیسلام و ڕووبەڕوو بوونەوەی سیستەمی كۆیلایەتی

كۆیلایەتی، بەوشێوەیەی كەباسم كرد ئەساسێكی فەوقەلعادە بەهێز و گرنگ بوو بۆ سیستەمی كۆمەڵگە، لەوانەیە لەڕووی ژمارەیەك ئامارەوە(هەڵبەتە بەشێوەیەكی دەقیق نا، چونكە ئینسان ناتوانێت ژمارەیەك دەقیق لەبارەی كۆیلەكانەوە لەو سەردەمەدا پێش لە ئیسلام بدات بەدەستەوە)، بەڵام لەڕووی هەندێك ژمارەی جیاوازەوە كەهەیە لەوانەیە ئینسان بتوانێت بێژێت (یەك لەسەر سێی) كۆمەڵگە لەو هەرێمە مەركەزییەدا و لەو شارگەلەدا كە لایەنی ئەشرافی وجودی هەبووە بریتیی بووە لە(كۆیلە) تەنانەت لەوانەیە(یەك لەسەر سیٚ)ش كەمێك زیاتر!

ئەوەش دەزانین كە لەو كۆمەڵگانەدا سەرچاوەی سەروەت و دەرامەت كەم بووە و بەو بۆنەیەشەوە كار ئێجگار كەم بووە، ئەگەر ئیسلام گریمانەی ئەمە بكەین سنورێكی جوگرافیایی دیاری بكردایە و مەرزێكی(سنور) بەدەوردا بكێشایە(ئەمە گریمانەیە، چونكە كاری وای نەكردووە) لەدوای ئەوەی گریمان كە سنورێك و جوگرافیایی دیاری كرد، ئەگەر لەسەرەتاوە بهاتایە بەیەك فەرمانی گشتی كۆیلایەتی هەڵبوەشاندایەتەوە و پەیوەندی(ماڵك و

كۆیلـــە)ی ببڕیبایـــە یەكـــەمین كۆمـــەڵ و دەســـتە كەلـەتمـــەیان دەخـــوارد خودی(كۆیلەكان)بوون! چونكە دەتوانین نمونەگەلێكی دونیای ئـەمڕۆ بێنینـە بەرچاوی خۆمان، بۆنمونە هەر لەكۆمەڵگـەی خۆمـان سـەیردەكەیت ئەگـەر ئینسانێك پەیوەندییەكی كاری و بەرهەمهێنـەری كەلـە كۆمەڵگـەدا هەیـەتی ئائەوەی لێوەربگریتـەوە بەتـەواوەتی لـەكار دەكـەوێت. لـەو سەردەمەشـدا سەرچاوەكانی سەروەت ئێجگار كەم بـوو، هـەروەها ئـەو میقـدارە كەمـەی كەهـەبوو خـەڵكی(ئـازاد) و (كۆیلـە)ش لـەو سەرچـاوە كەمـە سـودیان وەردەگرت و زیندەگی خۆیان دابین دەركـرد، ئەگـەر ئیسلام بـەبێ ئـەوەی بتوانێت سیستەمێكی كامڵ و هەمە لایەنە جێبەجێ بكات لـەناو كۆمەڵگـەدا، بـەبێ ئـەوەی بتوانێـت ئمـوری كۆمەڵگـە گـشتی بگرێتـە دەسـت بێـت و ڕایبگەیەنێت كۆیلایەتی قەدەغەیە و كۆیلەكان گشتیان ئازادن.

١. یەكەمین كێشە كـە سـەرهەڵدەدات ئەوەیـە، كـە فـەرموون كۆیلـەكان ئازادبوون چی بكات؟ خۆ لەكۆمەڵگەدا(كار)نییە، بۆیە یەكەمین كەسێك كە تووشی لەتمە دەبێت خـودی كۆیلەكەیـە! چـونكە كـار نییـە بیكـەن لـەبرساندا دەمرن.

٢. ئـەمان(موسـوڵمانەكان) یـەك بەشـی بـچوكن لـەناو یـەك كۆمەڵگـەی گەورەی بێ سنوری جوگرافیایی، وەك ئەوەی باسم كرد هەرگیز سنوری جوگرافیـایی وجـودی نـەبووە بـۆی مورەتـەب لەهەرزەمانێكـدا لەهـەر خەتێكـەوە ئیـسلام كـەمێك پێـشكەوتووە هـەر نوكتەیـەك بـووە لـەناو سەتحێكی گەورەدا بـاقی بەشـەكانی تـری كۆمەڵگـە هێـشتا موسـوڵمان نەبوون. بەشێكیش لەسەرچاوەی داهات و سەنتەری كـار و سـەروەتیش

لــە ئیختیــار و دەســتی ناموســوڵمانەکاندا بــووە، دەی ئــەم بێــت و بــۆ موسوڵمانگەلی ئیعلام بکات کە کۆیلایــەتی هەڵوەشــاوەتەوە خــۆ غــەیرە موسوڵمانەکان قبوڵی ناکەن، خۆ ئەو کۆمەڵگەیــەك لــە ئیختیاریــدا نییــە تاوەکو ئەوەڵ تا ئاخیری گشتی بەفــەرمانی ئــەو بگــەڕێت{واتــە هــەموو کۆمەڵگــە لەژێردەســتی موســوڵمانەکاندا نــەبووە، و فــەرمانی هــەموو کۆمەڵگــەی نــەکردووە}. بەشــێك لــەناو کۆمەڵگــەدا لــەژێر فــەرمانی ئەودایە و دەتوانێت بەڕێوەی بەرێت باقی بەشــەکانی دیکــە لــەئیختیار و لەژێر فەرمانی ئەودا نییە، چۆن دەتوانێت مەســەلەن لەشــاری(مەدینــە)دا یەك ژمــارەی دیــاریکراو موســوڵمانی لــە ئیختیاریدایــە، بــەلاّم بــاقی تــر کەبەشی عومدەی ناموسوڵمانن، (یەهودی، نەصارا، موناڤقین). مونــافقین: واتە ئەوانەی کەبــە ڕوخســار دەیــانووت موســوڵمانین، بــەلاّم لــەبابــەتی گرنگدا هەرگیز پــەیڕەوییان لــە ئیــسلام نــەدەکرد، بــۆ تــەکلیفی ســادە مەسەلــەن(نوێژ)بکەن خۆیان بەموسوڵمان پیشاندەدا، بەلاّم بۆ بەرنامەگەلی قورســی کۆمەلاّیــەتی پــەیڕەوییان لــە ئیــسلام نــەدەکرد وەك زۆرینــەی مەسوڵمانانی ئەم سەردەمە!

بەلەبەرچاوگرتنی ئائەم واقیعە لــەو کۆمەڵگەیــەدا کەئێمــە دەرکــی دەکــەین دەزانــین ئەگــەر ئیــسلام بهاتایــە و فــەرمانێکی دەرکردایــە کــە(کۆیلایــەتی هەڵوەشــاوەتەوە)تــەنها ئــەوە بــوو یــەك وشــەی مەســخەرەی دەووت، واتــە وشەیەك کە ئەصڵەن قابیلی جێبەجێ کردن نییــە! فــەرموو ئــەوە فەرمانیــشی دەرکرد کەس بەگوێی ناکــات! یــەك ژمــارەی دیــاریکراو موســوڵمان هەیــە کاریگەرییەکیان لەسەر کۆمەڵگە نییە کە کۆیلە ئازادە بکەن یان نەیکەین.

**لەبەرچاوگرتنی ئەو دوو هۆكارە:**

**یەكەم: ئیسلام چارەسەری كۆمەڵگە دەكات نەك شیعاردان.**

**دووەم: موسوڵمانگەل بەشێكن لەكۆمەڵگـە نـەك تـەواوی كۆمەڵگـە،**
هەروەها مورەتەبیش هەر لـەگۆشـە و كـەناری جیـاوازەوە ئیـسلام خەریكـە
نشرەوی دەكات. بەڵام هەرگیز لـەیەك سـنوری جوگرافیـادا نەوەسـتاوەتەوە
لەم دوو ئەصڵەوە ئێمە موتەجیهی ئەوە دەبین كەتەرحی ئەوەی"ئیسلام بهاتایە
و لـەیەك ڕۆژدا ئیعلامی نیهائی بكردایە.كەكۆیلە نەمێنێت" ئەصـڵەن شـتێكە
شێوازی یەك شیعاری پووچ و بێ مانا پەیـدا دەكـات! كەكـەمترین ئەرزشـی
كۆمەڵایەتی نییە و ئیمكانی جێبەجێ كردنی نییە بەدەر لـەوەی كە زەرەری بـۆ
خودی كۆیلە هەیە.

## بەكێ دەگوترێت كۆیلـە؟

جا با ئێستا بێین لـەلایەكی ترەوە لـە كۆیلــەو كۆیلایـەتی بكۆڵینـەوە، بـزانین لـەباسی كۆیلایەتیدا ئەوەی وا گرنگە تـەنها ناونیـشان و دەربـڕین و وشـەیە، یاخود محتەوا و مەسائیلی پەیوەست بە ناونیـشان و دەربـڕین و وشـەیە؟ ئایـا هەرئەوەندە ئینسان ناوی كۆیلـە نـەبوو پێیـات وت(ئـازاد) بـە(اسـم)—نـاو— مەتڵـەب حەل دەبێت؟ هەرئەوەی كە ئینسان ناوی كۆیلـەبوو هەرچـی كێـشە هەیە ڕووبەڕووی دەبێتەوە؟ وەڵامەكان نەخێرە! لـەئێستادا زۆرێـك لـەخـەڵك هەیە لـەدونیادا پێیان ئێژن(ئازاد) و سیستەمی كۆیلایـەتی بـوونی نییـە، بـەڵام خۆزگە بەو كۆیلانەی والـەسەردەمی ئیـسلامدا زینـدەگییان دەكـرد! فـەهمی




صەحیح و دەقیق ئەوەیە ئەو شتگەلە وا وشە دەلالەتی لەسەر دەكات لەنەزەردا بگرێت ، نەك خودی وشە و ناونیشان ئەوەی وا كۆیلایەتی خوێنتاڵ دەكات بریتییە لە ئیستسماری ئینسان! لەمەدا چوار بابەت گرنگە:

١) خۆراكی جیاواز بێت، لەگەڵ خاوەنەكەیدا.

٢) جل و بەرگی جیاواز بێت، لەگەڵ خاوەنەكەیدا.

٣) شوێنی نیشەجێ بوونی جیلاواز بێت، لەگەڵ خاوەنەكەیدا.

٤) ئەندازەی كاری هەر كۆیلەیەك زیاتر بێت لەئەندازەی كاری هەر ئازادێك كەوەك خۆی بێت لەڕووی شارەزایی و توانایی و جسمی.

ئەوەی وا مەفهومی كۆیلایەتی خوێنتاڵ و ناپەسەند دەكات ئەم چوار خەصڵەتەیە. ئەگەر كەسێك ناوی كۆیلە بوو، بەلاّم لەگەڵ ئەربابەكەیدا(خاوەنەكەیدا)،(جلوبەرگ و خۆراك و شوێنی نیشتەجێ بوون و حەوانەوە و كاری وەك یەك بوو) ئایا دەكرێت ئێمە ئەوە بەناونیشانی یەك شتی ناپەسەند ناوبەرین؟ وەك ئەو كار بكات، نان بخوات، جلوبەرگ بپۆشێت، شوێنی حەوانەوەی وەك ئەو بێت، ئەویش بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئەو كۆمەڵگەی كەكاری تێدا دەست ناكەوێت خۆ ئەگەر كەسێك خۆی ئازاد بێت و بڕوات كار بكات هێشتا هەر (بژی و مەمرە)یەكیشی دەست ناكەوێت، بۆ نمونە كۆمەڵگەی ئێران لەبەرچاوبگرین پێش ئەوەی بەو جۆرەی بەتالاّن(نەوت)ی بهێنرێتە دەرەوە و بفرۆشرێت بە دونیا و ئەم گشتە پارە بڕژێتە ناو ولاّت و گشتی بەدبەخت بكات و خەڵكی دڵ خۆش بكەن بێژن كار زۆرە! بیرلە پێش ئەوە بكەنەوە و بزانن (١٥ ساڵ) لەمەوپێش كە هێشتا ئەم چالاكی(نەوت)دەرهێنان و فرۆشتنی ئەوەندە نەچووبوویە سەرەوە

لە زۆرێك لەم كوردەواری خۆمانەدا بزانن خەڵكی چەنێك بارودۆخی لاڵ بووە؟ سەیرت دەكرد لەهیچ شوێنێكدا كەسێك كاری دەست نەدەكەوت، تا كەسێكی بێ كار دابەزرێت و برێك نان بەدەست بهێنێت، بەڕاستی زۆرێك لەئینسانگەل ڕازی بوون بڕۆن لەماڵێكدا كار بكەن و بژی و مەمرە كاربكەن تەنانەت بە پەستترین(خراپترین)مەرجیشەوە! ئامادە بوو بڕوات لەماڵێكدا دابەزرێت(نانەبەن)(بەدەربڕینی كوردییەكەی خۆمان) هەرئەوەندە نانێكی بدەنێ ئیتر ئەگەر(پاش خۆراك)یش بێت، جلە شڕە و شوێنێكی هەبێت تێیدا بخەوێت، دەی(١٥-٢٠ساڵ)لەمەوبەر ئائەمە لەكۆمەڵگەی خۆماندا هەبوو كەزۆرێك لەخەڵكی هەبوون كەلە دێهاتەوە دەهاتن بۆ شار یان لەشارەكانیشدا زۆرێك هەبوون تەنانەت خوێندەواریش بڕوانامەشیان هەبوو، خواخوایان بوو لەشوێنێكدا دابەزرێن و هەرئەوەندە تیكە نانێك بخۆن، هەتا ئەگەرچی جیاوازیشی هەبێت لەخۆراكیاندا لەگەڵ خاوەن ماڵەكەدا، بارودۆخەكە بەو جۆرە بوو كە خوێندەوارێكیش بەوە ڕازی دەبوو، دەی هێشتا كۆمەڵگەی ئێمە لەچاو ئەو كۆمەڵگەیەی كەخەریكین باسی لێوەدەكەین زۆر زۆر پێشكەوتووترە لەڕووی ئابوری و كاركردنەوە، بۆ ئەو كۆمەڵگەی ئەوكاتە بەڕاستی ئەگەر(كۆیلەیەك) بەیانی تا ئێوارە كاری بكردایە و زەحمەتی بكێشایە هێشتای ئاسانتر و باشتر و ئاسودەتر بوو، تاوەكو ئەوەی ببوایەتە ئینسانێكی ئازاد و بڕۆشتایە لەناو كۆمەڵگەدا كاری دەست نەكەوتایە، وەك(١٥ساڵەكەی)لەمەوپێشی ئێمە! بەوجودی ئەو بارودۆخە كۆمەڵایەتییەیە یەكەمین حوكمێك كەئیسلام بۆ موسوڵمانگەلی دادەنێت، چونكە خۆ كۆمەڵگە گشتی پەیڕەوی لەبەرنامەی ئەو ناكات، تەنها ئەوانەی

واموسوڵمانن و قابیلی جێبەجێ كردنی بەرنامەكـەن، ئـەم حوكمـەی بـۆدان كە(كۆیلـە)لـەگەڵ ئەربابی خۆیدا:

١/ خۆراكیان وەك یەك.

٢/ جلوبەرگیان وەك یەك.

٣/ شوێنی نیشتەجێ بوونیان وەك یەك.

٤/ ئەندازەی كاریان وەك یەك.

ئالـەم بابەتـەدا چـیرۆكێكی كـورت دەگێڕمـەوە كەلـەگـەڵ ئـەوەی كـەمێك لـەئەصڵی باسەكەش دووردەكەوینەوە،كەبۆ ڕوونكردنەوەی بابەتەكە گرنگە.

لـەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی(عومەر)دا (ﷺ) كابرایەك (حوشـتر)ێكـی لێ دزرابوو، كەوتە شوێنی و سەیری كرد لـەدەشـتێكدا حوشـترەكەی بەدەسـت كابرایەكی ترەوەیە، كابرای گرتوو بە(حوشتر)ەكەوە هێنایەوە بۆ شار و چـوو هەواڵی دابە عومەر.

وتی: من حوشترێكم ون بووە و كابرایەك دزیویەتی.

عومەر وتی: بانگی بكە و بزانم.

هات بۆلای و وتی: "ئەم قسەیە ڕاستە".

كابرا وتی: ڕاستە.

(جائەمـەش شـتێكی تایبەتـە! لـەئیـسلامدا سـنور دیـاری كـراوە، كاتێـك ئینسانگەلێك خیانەت بكەن بەكۆمەڵگەیەكی سالم دەبێت ئەوانە تەمێ بكرێن، بـەلاٌم بەمـەرجێك كۆمەڵگـە سـالم بێـت ئەمـە نوكتەیـەكی جالبـە! كاتێـك كۆمەڵگە سالم بوو نابێت كەسێك ناڕەحەت و ناڕازی بێت، لـەبەرئەوە ئیسلام هەشت شوبهەی دیاری كردووە بەبوونی ئەوانە(حەد)ئیجرا ناكرێت، یـەكێك




لەحەدگەل حەدی (دەست بڕین)ی دزە، چ كاتێك دەستی دز دەبڕیەت؟ كاتێك كۆمەڵگە واقیعەن پاك و تەمیز و سالم بێت، هیچ دەلیلێك نەبێت بۆئەوەی كابرا ئەم دزییە بكات، كاتێكیش ئەم دزییە دەكات خەریكە وردە وردە ڕێگەی ئالودە بوون و فاسیدبوونی كۆمەڵگە دەكاتەوە، بۆیە ئەم(تەمێ)كردنەی ئەو دەبێتە هۆكاری ئەوەی كۆمەڵگە بەرەو ئالودە بوون نەچێت، چونكە ئالودەبوون كەم كەم دەست پێدەكات و هەرلەبەرەوە زۆر دەبێت. كۆمەڵگەی سالم ئەوە نییە لەیەك لەحزەدا ناسالم بێت! بەڵكو كەم كەم بەرەو نەخۆشی دەچێت. كاتێك كۆمەڵگە بەوجۆرە سالم بوو، بەلام ئینسانێك خەریكە دزییەكی تێدادەكات، یاخود باقی ئەو شتانەی كەلە ئیسلامدا سنوریان بۆ دیاری كراوە ئەو كاتە خەریكە خیانەت لە كۆمەڵگە دەكات دڵسۆزی كۆمەڵگە ئەوەیە بێژێ دەبێت ئەوە كەسە تەمێ بكرێت،هەر جۆرە تەمێیەك، بەلام مەرجی هەیە. مەرجەكەشی ئەوەیە كەحەقیقەتەن ئەو كەسەی دزییەكەی كردووە لەدەست كەوتەكانی كۆمەڵگەی سالم بەرخوردار بوبێت، لەبەرئەوە (عومەر) پرسیاری لەتایبەتمەندییەكانی كابرا كرد پاش ئەوە كاتێكی دیاری كرد دوای(١٥-٢٠ڕۆژ)كە دانیشتنی ڕەسمی دادگا تەشكیل ببێت بۆ گەشتن بەحەلی كێشەكە. بەڕاستی لەنەزەری خەڵكیدا ئەمە شتێكی ئیستسنائییە بۆچی دەبێت دادگا تەشكیل بكرێت، واتە ڕووبەڕوو بوونەوە لەنێوان دوو ئینساندا دروست ببێت؟ نا حیسابییەك لەناو كۆمەڵگەدا بكرێت؟ ئەو كۆمەڵگەیە لە(١٤سەدە)لەمەوبەردا ناحسابی نەدەبینی، نادروستی نەدەبینی، چونكە كۆمەڵگە سالم بوو،كاتێك باسێكی وا بلاو دەبێتەوە كەڕۆژێك دادگا

دادەنیشێت زۆر زۆر جێگەی سەرنجی خەڵكی بوو. (بەڵام بڕۆن ناو دادگای شاری سنە ببینن ئائەوە بۆ یەك مەملەكەت بوو! لێرەدایە جیاوازی سیستەمی كۆمەڵگە ئالەمانەدا دەردەكەوێت).

عومەر، بۆ ئەوماوە دوورودرێژەی دیاری كرد، لەملاوە كۆمەڵێك كەسی ڕاسپارد كەبڕۆن لەبارودۆخی ژیانی ئەو كۆیلەیە لێكۆڵینەوە بكەن، دوای ئەوەی ئەوان لێكۆڵینەوەی خۆیان تەواوكرد و گەڕانەوە بۆلای عومەر. ڕۆژی دانیشتنی دادگا هاتە پێشەوە و خەڵكی بە ئیشتیاق و شەوقی زۆرەوە هاتن كەیەك مورافەعە ببینن. ژمارەیەكی زۆر لەناو مزگەوتدا دانیشتبوون، هەروەها كابرای دز و كابرای ماڵ دزراو هەردووكیان ئامادەبوون، عومەر لەبەردەم كۆمەڵەكەدا پرسی لەكابرای (ماڵ دزراو)كە ئیدعات چییە؟

كابرای ماڵ دزراو وتی: شتێكی واڕویداوە (ماڵم دزراوە).

عومەر وتی: كابرای دز تۆ وەڵامت چییە؟

كابرای دز وتی: وەڵامێكم نییە و ڕاست دەكات.

عومەر لەناو مەجلیسەكەدا ڕووی كردە كەسێكی تر و وتی: بەبۆچوونی تۆ حوكمی چییە؟

كابرای پرسیارلێكراو وتی: خۆ مەعلومە،حوكمی دەست بڕینە.

عومەر وتی: دەستی ئەو دزە ببڕین؟

خەڵكی سەریان سوڕما! كە عومەر بۆچی لەو دەپرسێت.

عومەر ڕووی تێكردو وتی:ئیسلام لەبارەی پەیوەندی لەگەڵ كۆیلەدا چی وتووە؟ تۆ خۆت بەناوی موسوڵمان ناساندووە، ئیسلام، وتوویەتی. كەدەبێت(كۆیلە لیباسی وەك لیباسی ئەربابی، خۆراكی، مەسكەن، كاركردنی دەبێت وەك ئەو

بێت)، بەلاّم من لەوكاتەی دیاریم كردووە خەڵكم ناردووە بۆلای لەو ناوچەیەی كە تۆی تێدا دەژیت و لێكۆڵینەوەیان كردووە، دەركەوتووە كە تۆ (دە نەفەر) كۆیلەت هەیە،كەئەمە یەكێكیانە. هەروەها باروذۆخی(خۆراك، مەسكەن، لیباس، كاریان)ناعادیلانە و غەیرە ئیسلامییە. ئەگەر وابێت تۆی عاملی دزی كردنی ئەم كۆیلە، نەك خودی ئەم كۆیلە، بەلاّم چونكە تۆ ڕاستەوخۆ بەشداریت لەم كارەدا نەكردووە لەجیاتی ئەوەی دەستی تۆ ببڕم جۆرێكی تر حوكم ئیجرا دەكەم.

"دە كۆیلەكەت گشتی ئازادە و هەر یەكێكیشیان یەكێك لە(حوشتر)ەكانی تۆ بەناونیشانی موڵك دەبێت ببەن، تاوەكو بڕۆن كاسبی پێوە بكەن و سودی لێوەربگرن".

ئەم داستانە كورتەم بۆیە گێڕایەوە سودی لێوەربگرین بۆ باسەكەمان، لەسەرەتادا دەتوانین (سێ) شت لەم باسەدا حالّی بین:

**یەكەم:** لەكاتێكدا هۆكارەكانی فەساد و ناحسابی و ناڕاستی خەڵكی هەیە، موجازاتی خودی خەڵكی ناكرێت، بەڵكو دەبێت عامل(هۆكارەكە) موجازات بكرێت، ئەمەش مەسەلەن بابەتێكی فەرعییە لەناو ئەم حوكمەی حەزرەتی(عومەر)دا.

**دووەم:** ئەم حوكمە(ئیجماعی)بوو، واتە دوای ئەوەی حوكمەكەیدا شورای ئیسلامی قبوڵیان كرد كەبەڵێ،چونكە ئەم مەرجانەی كەئیسلام دیاری كردووە بەجێ نەهاتووە ئەم (كۆیلە)ئەگەر دزی كردووە خەتای (ئەرباب)ەكەی بووە ئەگەر وابێت دەبێت ئەو ئەربابە تەمێ بكرێت.





سێیەم: بەڕاستی ئەگەر ئەو مەرجانەی وا ئیسلام بۆ پەیوەندی لەگەڵ کۆیلەدا دیاری کردووە، ئەگەر ئەوە مەترەح بێت ئەصڵەن ئیتر چ مەفهومێکی نالەبار و ناشرین لەوشەی(کۆیلە ـ بەندە)دا دەدۆزیتەوە؟ ئەویش بەلەبەرچاوگرتنی ئەو کۆمەڵگەیەی کەبارودۆخەکەی بەو جۆرە بوو واباسمان کرد، کە زۆر زۆر قورستر و تاڵتر بوو لەکۆمەڵگەی(١٥٠٠ ـ ٢٠٠٠ساڵ)ی پێشتری ئێمە! کە (١٥٠٠ ـ ٢٠٠٠)ساڵ لەمەوبەر نەك تەنها مەردمی نەخوێندەواری دێهات، بەڵکو خوێندەواری شارستانگەل ئامادە بوون بە(نانەسکێ)لەشوێنێکدا کاربکەن، دەی چ کێشەیەکی خودی (زاتی)دەمێنێتەوە لەم باسەدا؟ بەدەر لە ناونیشان، ئەگەر کارمان بەشیعار و ڕواڵەتەوە نەبێت، ئەگەر بێین و بارودۆخی کۆمەڵگە لەبەرچاو بگرین و سەیربکەین حوکمێکی بەم جۆرە لەبارەی(پەیوەندی لەگەڵ کۆیلەدا)دەرچووە ئیتر واتی کۆیلایەتی چ شتێکی نامەتلوبی دەمێنێتەوە؟! خۆ ئەگەر ئازادیش بێت ئەصڵەن کۆمەڵگەکە لەم ژیانە باشتری نییە، چونکە هێشتا کۆمەڵگەکە لە کۆنترۆڵی ئەودا نییە ئەو دەتوانێت تەنها بۆ ژمارەیەك لەخەڵکی حوکم دەربکات کە موسوڵمانن، نەك ئەوەی بێت کۆمەڵگەیەك ڕێکبخات کە موسوڵمان نین و غەیرە موسوڵمانیشی تێدایە،کە زۆرتر و بەهێزترن!

ئەمە یەك مەتڵەب. لەپاشانیشدا بەو تەرتیبە کەوتمان ئیسلام کاری دەرمان کردنی نەخۆشییەکانی بەشەرە نەك شیعاریان بۆ بدات، خۆتان موقایەسە بکەن لەبارەی کۆیلەوە کە دوو حوکم دەرچووە یەکێکیان لە(چواردە سەدە) لەمەوپێشدا، یەکێکیشیان لە(سەدەی ١٩)دا. ئیسلام بەرنامەی

## هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دانا، هەروەها(ئابراهـەم لینکـۆڵن)*یـش یاسـای

---

*) ابراهم لینکۆلن، لە (١٢ی فوریە١٨٠٩)، (هاوکات لەگەڵ ەل دایك بوونی داروین)دا لـە خانەوادەیـەکی هـەژار لـە ناوچەی (ای چوبی) لـە کێڵگەی (سـینکینگ اسپرینگ) هاتە دونیـاوە. بـاوکی(تۆمـاس لینکـۆڵن) دایکـی (نـنـسی هـالکن) هەردووکیان نە خوێنەوار بوون. ابراهم یەك خوشکی لـەخۆی گـەورەتری هـەبوو بـەناوی (سـارا لینکـۆلن)کـە لەسـاڵی (١٨٠٩) لە دایك بووە.

دایك و باوکی ابراهم بەرپرسی کلیسایەکی پرۆتستانی بوون، کـە بـەهۆی پارێزگـاریکردن لـە کۆیلەکانـەوە لـە کلیسـا جیابووبونەوە. ئەبراهم لـەسەردەمی منداڵـیەوە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ئیحساسی هەبوو لـەگەڵ کۆیلایەتیـدا، لـەبەرئەمـەش هەرگیز نە دەچووە کلیسـای دایك و باوکی ن هیچ کلیسایەکی ترەوە.

ابراهم بە ڕەسمی تەنها (١٨ مانگ) خوێندوویەتی، هەرلەبەرئەمە مامۆسـتای تایبـەتی هـەبووە و خـۆی خـۆی فێرکـردووە. هەرکتێبێك کە دەیتوانی بەقـەرز وەربـدەگرت و دەیخوێندنـەوە، ئـەو (ئینجیـل، کارەکـانی شکـسپیر، مێـژووی بـەریتانیا و ئەمەریکا) بەتەواوەتی خوێندووەتەوە.

ڕۆژێك کتێبێکی کۆ کە (مشك) لێی خواردبوو بەدەستەوە بوو، کە بریتی بوو لـە شەرحی ژیانی (واشنطن)، ئەو کتێبەی بـە ووردی و دیقەتەوە خوێندبوویەوە، بۆیە وا پێدەچێت فکر و کەسایەتی لە ژێر کاریگەری ئەو ئەودا بووبێت....

ابراهم لینکۆڵن، لە تەمەنی (١٨ ساڵی)دا لـە دوکـانێکی بـچکۆلەدا دەسـتی بـەکارکردن کـرد، لەگەڵـەوەشـدا کاتێـك فەرمانگەی دادگا کرایەوە، هەندێك ڕۆژ بەیانیان زوو بۆ بینین و بیـستنی قسـەکانی دادوەر و داسـتانی تاوانبـار و بێتـاوان دەچووە دادگا و تا ئێوارانی درەنگ لـەوێ دەمایەوە و دواتر دەگەڕایە ماڵـەوە. لینکۆڵن لەگەڵ کڕیارەکانیدا زۆر بە جـوانی ڕەفتاری دەکرد، جارێکیان بە هەڵە(٦سـەنت)ی وەرگرتبوو، بۆیە شـەو نزیکەی (٣میل) ڕێگـەی کـرد تـاوەکو پـارە زیادەکـە بگەڕێنێتەوە بۆ کڕیارەکەی.

ابراهم لینکۆڵن، کە لـەخانەوادەیەکی هەژار پێی خستە دونیاوە بە درێژی تەمـەنی زۆر ناکـامی ڕووبـەڕووی بوویـەوە، لـە هەشت خولە هەڵبژاردندا بۆ سـەرۆك کۆماری ئەمەریکا شکستی هێنا و دوو جـاریش لـەکاری بازرگانیـدا. چـەندین جـار ڕوویداوە هەموو شتێکی لـەدەست داوە و دووچاری تەسـلیم بوون بۆتەوە، بەڵام خۆی تەسلیم نەکردوو و زۆر قارەمان بوو هەرگیز یاس و نائومێد نەدەبوو، بۆیە لـە کۆتایدا لە ساڵی(١٨٦٠)لە تەمەنی (٥١)ساڵیدا گەشـتە پلـەی سـەرۆکی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بوویە شانزەیەمین سەرۆکی ئەمەریکا. لـە ساڵی (١٨٦٥) لـەکاتی دووبارە خۆ کاندیـد کردنـەوە بۆ سەرۆك کۆماری تیرۆ کرا.

خۆی دەڵێت: "ڕێگایەکی ماندوکەر و پڕوکێنەربوو، پێیەکم هەڵکەوت و کێشای بە پێیەکەی ترمدا تاوەکو پێکـەی تریـشم لە ڕێ و ڕۆشتن بکەوێت، بەڵام من بە خۆمدا چومەوە ووتم ئەمە تەنها پێی‌هەڵکەوتنێکە نەك لە پێ‌کەوتن".

ئەبراهەم، کوڕی پیاوێکی پێڵاوساو(پینەچی)بوو، ئەوکاتەی سـەرۆك بـوو لـەکاتی پێشکەشکردنی وتارێکیـدا ڕووبـەڕووی ئەشرافییەکان بوویەوە، دیارە ئەشرافییەکان هەمیشە قین لە دڵن. لینکۆڵن، لـەو ڕۆژەدا کە ڕۆشت بۆئەوەی یەکـەم وتـاری دەستبەکاربوونی وەك سەرۆك لـەبەردەم (مەجلیسـی سـەنای ئەمـەریکی)دا بخوێنێتـەوە، لـەوکاتـەدا ئەشـرافی زەدەیـەك لێـی هەستایە سـەپێو ووتی"کاکی لینکۆڵن! هەرچەند تۆ بەرێکەوت پۆستی سەرۆکایەتی ئەم کشوەرەت وەرگرت، بەڵام لـەیادت نەچێت هەمیشە بەهاوڕێیەتی لـەگەڵ باوکتدا دەهاتیتە ماڵی ئێمە، تاوەکو پێڵاوەکانی خانەوادەکەمان چاك و پـاك بکەیتـەوە.

هەڵوەشاندنەوەی كۆیلەی ڕاگەیاند، (سیانزە ساڵ) تێپەڕیووە و لـەم (سـیانزە سەدەیە)دا وردە وردە هەرلەبەرەوە بەشەر بەرەو پێشچووە و ڕوشـدی زیـاتر بووە و دەرك و شـعوری چـۆتە پێـشەوە، واتـە دەبێـت ئەگـەر یاسـایەك بـۆ نەهێـشتنی كۆیلــە دوای سـیانزە سـەدە ڕابگەیـەنرێت ورد و نفـوزی چـەند بەرامبەری ئەو یاسایە بێت كـە(سـیانزە سـەدە) پێـشتر دانـراوە، كەخـەڵكی لــەبارودۆخی ســەرەتایدا ڕاگەیــەنراوە. دەی جائــەوەی(ئابراهــەم لینكۆڵ)ڕایگەیاند كاریگەری چی بوو؟ خۆ خـەڵكی هیـچیان لـەبیر نـەمابێت كاری سپی پێستەكانیان لەبیرە دەربارەی ڕەش پێستەكان، لـەبەرخاتری ئەمەی كەكەمێك فشار لـەلایەنی حوكمەتەوە هەبوو كـە دەبوایـە شـتێك عادلانـە و

---

ئێستا لێرەدا زۆرێك لە سیناتۆرەكان ئامادەن كە باوكت پێڵاوەكانی پێیانی دروستكردووە، لەبەرئـەوە هـیچ كـات ئەصـڵی خۆتت لەبیرنەچێتەوە".

ئەم پیاوە وابیری دەكردەوە قسەكانی ئەبراهەم تەحقیر و نابووت و خەجاڵەت دەكات، بەڵام ئەو وەڵامی دایەوە:

"من زۆر سوپاسی تۆدەكەم كە دروست لەكاتی یەكەمین وتارمدا لەبەردەم (مەجلیـسی سـەنا)دا باوكمـت خـستەوە بیرم! باوكم چەنێك سەلیقەی جوانی هەبوو! چەنێك هونەرمەندێكی ئەخلاقی بوو، كە هیچ كەس ناتوانێت وەك ئەو پێڵاوی جوان دروست بكات. منیش دەتوانم كاری باش لەنجام بدەم و سەرۆكێكی باش بم، بەڵام هەرگیز پێشی ئەو نادەمەوە! لەبەرئەوە لە ئێوەی ئەشرافی زەدەكان داوادەكەم! ئەگەر پێڵاوی دەستكردی دەسـتی بـاوكم قاچتان ئـازار دەدات، مـن هـەمان هونـەر لەژێردەستی باوكم فێر بووم(هەڵبەتە من پێڵاوسازێكی باش نیم)، بەڵام بەلایەنی كەمەوە دەتوانم پێڵاوەكانتان چاك بكەمەوە، بۆیە تەنها ئەوەندە بەسە پێم ڕابگەیەنن تاخۆم بەتایبەت بێمەماڵتان بۆ ئەوكارە".

دووای قسەكانی ئەبراهام لینكۆڵن بێدەنگیەكی قوڵ مەجلیسی تەنی!

لینكـۆڵن، هـەوڵێكی زۆریـدا بۆلـەوەی (كۆیلایـەتی) ڕابگرێـت و بەتـەواوەتی (كۆیلەفرۆشـی) بنـەبڕ بكـات. لەسـاڵی (١٨٦٢/٩/٢٣)دا بە ئەندامانی كابینەكەی خۆی ووت"من پەیمانم بە خـوای خـۆم داوە و ئـەم كـارە لـەنجام دەدەم". بۆیـە ئازادبوونی كۆیلەكانی ڕاگەیاند و لەو سەروبەندەشـدا (٤ ملیـۆن) كۆیلـە ئـازادبوون، ئـەم دەسـتپێـشخەریەی (ئەبراهـەم لینكۆڵ) بە گەورەترین ڕووداوی سەدەی (١٩) لەژمارد دەكرێت.

لە(١٤/اوریل/١٨٦٥)دا لە كاتژمێر(١٠ و چەند دەقیقەیەكی شەو)دا پێنج ڕۆژ دوای كۆتای هاتن بە جەنگی چوار ساڵەی ناوخۆی لەمەریكا، یاریزانێكی تەمەن (٢٦)ساڵەی (ئەلاتێر) لە لایەنگرانی (كۆنفراسیۆلی ئەمەركا) بڕیاریـدا و چـووە مـاڵی (ینكۆڵن)ەوە كە لەگەڵ خێزانەكەی دانیـشتبوو لــە دووری مەترونیوێكـەوە یـەك گوللـەی نـا بـە پـشتەسەری (ئەبراهـەم لینكۆڵن)ەوە و تیرۆری كرد.




لۆژیکتر لەگەڵ(ڕەش پێستەکان)دا ڕەفتاریان بکردایە، ئەوان دژەکاریان ئەوەندە شەدید بوو دەستەیەکیان دروست کردبوو بۆ ئازاردان و ئەشکەنجەدانی(ڕەش پێستەکان)! شیعارەکەشیان ئەوە بوو، جلوبەرگی ڕەسمییان بریتی بوو لە جلێکی سەرتاپا سپی، بەجۆرەها شێوە ڕەش پێستانیان سزادەدا، لەبەرئەوەی چونکە دەوڵەت ئێژێت دەبێت ڕیعایەتیان بکەن و کەمێك مافەکانیان نزیك بێت لەمافی(سپی پێستەکانەوە)، ئائەم وشەیە بەبۆچوونی سپی پێستەکانی(ئەمەریکا) ئیهانە بووا کەئەو گروپە تاوانکارەیان دروست کردبوو لەهەر شوێنێکدا(ڕەش پێستێکیان) دەست کەوت بەجۆرەها ئەشکەنجە و ئازار دەیانکوشت، لەکاتێکدا کۆمەڵگەش یەك کۆمەڵگە بووا ئیسلام ئاوا کۆمەڵگەیەك یاسای و ڕەسمی دروست نەکرد بوو کەبێت ئەو بەرنامەیە ڕابگەیەنێت، هەروەها باقی باس و کێشەکانی تریش مەترەحە، لە(سیانزە سەدە)لەمەوپێشدا خەریکی کارکردنە، بابهاتایە و وەك(ئابراهەم لینکۆڵن) ڕای بگەیەندایە کە (کۆیلایەتی)قەدەغەیە، دەی ئەمە بۆئەوەی لەم ڕۆژەدا زەقی شیعار و پەسەندی ئێمە بێژێ"ماشەلاّ،ڕاستە، دەستت خۆش".

وادەستی پێکرد، کە(ئابراهەم لینکۆڵن) کاتێك ڕایگەیاند و یاسایی دانا بوویە مەسخەرە، زەجر و فشار و عەزاب بەرامبەر بە کۆیلە ڕەش پێستەکان چەند بەرامبەری جاران بوو، بهاتایە بەو جۆرەی بکردایە باشتر بووا؟ لەبەرئەوەی زەوقی خەڵکی بە ئیصتلاح(ڕۆشنفکر)ی ئەمڕۆ پەسەندی بکات؟ ئا ئەوە باشە یان ئەوەی کەبەرنامەیەك دابنێت کەیەك(سەدە)نەگوزەرێت و کۆیلە نەمێنێت؟ بەبێ ئەوەی کەمترین زوڵم بکرێت! نەك کەمترین زوڵم! بەڵکو بارودۆخێکی وا دروست بکات، کەهەر لەو سەدەیەدا پیاوێکی گەورە کە

تا ئەبەد و قیامەت ئوستازی ئومەتی(محمد)ن(ﷺ)کە عیبارەتن لە(قورائی سبع ـ حەوت قاریئەکە) شەش دانەیان (کۆیلە زادەن) کەبەبۆنەی ئیسلامەوە ئازادییان دەست کەوتووە، بەو جۆرە بەرنامەی ئازادکردنی کۆیلە پیادە بکات کەتەنها شیعار و تەبلیغێك و هەراو بەزمێك نەبێت، بەڵکو سەدەیەك بگوزەرێت و دانەیەك کۆیلە نەمێنێت و بارودۆخی کۆمەڵایەتی واجۆر بکرێت و دەروونی خەڵکی وائامادە بکرێت، ئائەمانە(کۆیلانە)وا جاران پەستترین چینی کۆمەڵگە بوون ئەمڕۆ ببنە ئوستازی ئومەت! بەدەرلە(بیلالی حەبەشی) چونکە تەنها باسی(حەوت قاریئەکە) دەکەم، چونکە(بیلال) نمونەیەك بوو بۆ ئەو کارە ئەساسییە کە ئیسلام کردی، ئەویش لەزەمانێکدا کەئیسلام خاوەنی کۆمەڵگەیەك نەبوو لەو سەردەمە سەرەتاییەدا بوو لە(مەککە)دا کەتەنها تاکی موسوڵمان ئامادەییان هەبوو، (ئەبوبەکر)کە پێشتر بازرگانێکی ئیستسمارگەر و خوێن مژ بوو بە بۆنەی ئیسلامەوە بوویە ئەو موسوڵمانەی کە تەواوی سەروەتی لەڕێگەی(ئیسلام)دا خەرج کرد، یەکێك لەوانە کڕینەوە و ئازاد کردنی (بیلال)بوو، کەلەژێر ئەشکەنجەی ئەشرافگەلی مەککە ئازادی کرد و پاشان (بیلال) بوویە ئەو شەخصییەتە گەورەیە لەمێژووی ئیسلامدا، کەبەجۆرەها لایەنی جیاواز نەك تەنها لەبەرئەوەی کە کۆیلە بوو، هەروەها لە خوارترین چینی کۆمەڵگەدا جێگەی گرتبوو، بەڵکو بەلایەنی جیاوازەوە لە کۆمەڵگەدا تەحقیر و ئیهانە دەکران! چونکە کۆیلەکانیش تەبەقاتی بوون ئەوەی کەمەسەلەن کاری تایبەتی دەزانی موحتەرەمتر بوو، یان ئەوەی کە هەیکەل و بالآی بەهێزی هەبوو، لەبەرئەوەی(ڕەش پێستان) سێ چینن، چینێکیان زۆر لەم سپی پێستە

نەژاد(ئاریایی - یان هیندۆئەوروپایی) درێژتر و قەوی و هەیكەلترن، هەیالە هەروەك ئێمەن، هەشیانە زۆر ورد و بچكۆلەن،كەبەعەرەبی(*)پێدەوتن، كە گەورەترین ئیهانە بوو! (بیلالی) فەقیر لەو جۆرەی سێیەمیان بوو هەر ئەوە نەبوو كە كۆیلەیەكی نەخوێندەواری بێ كاریگەر بوو، بەڵكو لەكۆمەڵە زۆر ورد و بچكۆلەكان بوو، جالەو كۆمەڵگەیەی پێش ئیسلامدا، كە(ئەبوبەكر)چوو (بیلالی) كڕییەوە لە پەستترین چینی ئەم كۆمەڵگەیە بوو، ئەوە هیچ لە ئیسلامدا بوویە ئەو ئینسانە بەرزە گەورەیە، باقی كۆیلەكانیش بە تەدریج لەكۆمەڵگەی ئیسلامدا بەئامادەگی دەروونییەوە هاتوون جێگەی خۆیان كردۆتەوە، لە ئوستازگەلی ئومەتی(محمد)(ﷺ) كەبە(حەوت قاریئەكە) بەناوبانگن، شەش دانەیان لەوانەن كەبەبۆنەی ئیسلامەوە گەشتونەتە پلەی ئازادی، كاتێكیش پێی گەیشتوون چوونەتە ئائەو پلە بەرزە لەڕووی مەعنەوییەوە، جا ئێستا ئەم جۆرە دروستە یان ئەو جۆرەی یاسا ڕاگەیەنێت و هیچ كاریگەرییەكی نەبێت؟ ئیسلام لە كام پزیشكە؟ ئەو پزیشكەیانە چارەسەری نەخۆش دەكات، نەك ئەوەی كەشیعار بدات بۆ نەخۆش وهەر نوسخەی بۆ بنوسێت و پارەی لێوەربگرێت و زیاتر نەخۆشی بخات.

---

(*) لێرەدا (كاك ئەحمەد) وشەیەك بەكاردەهێنێت، كە بەداخەوە توانای تێگەیشتنمان نەبوو لێی و نەدەتوانرا بكرێتە نووسین، بەڵام وەك خۆی دەڵێت وشەیەكە بۆ ئیهانە و گاڵتەكرد بە رەش پێستەكان بەكارهێنراوە.

## بەرنامەی تایبەتی ئیسلام بۆ ئازاد كردنی كۆیلە:

جـا داوای ئەمانــە ئـیتر ئیـسلام وروورده ورده هــات بەرنامــەی دانــا بـو ئازادكردنی كۆیلـەكان، ئەویش لـەم ڕێگانەوە:

### یەكەم: كەفارەتی گوناه

جا دوای ئەمەش بەرنامەگەلی جوزئی ئیسلام لـەپاش ئـەوەی مـافی كۆیلــەی یەكسان كرد لـەگەڵ مافی ئازاددا كەئەوە ئەوجی مەتڵەب بوو. بـانترین پلــە بــوو بۆئــەو كۆمەڵگەیــە كــەئیتر واقیعــەن مــەفهومێكی بــۆ وشــەی كۆیلــە نەدەهێشتەوە. لـەپاش ئەمانە ئیسلام هات وردە وردە هەر لـەبەرەوە بەرنامــەی دامەزراند بۆ ئازادكردنی كۆیلە بەناونیشانی(كەفارەت)ی گوناه هــەر جــۆرە گوناهێك كەفارەتی ئازادكردنی كۆیلەبوو. هــەر جــۆرە زوڵمێـك كــەفارەتی ئازادكردنی كۆیلەبوو، واتە لــەپێش هەرچــی شــتەوەیە كۆیلــە ئــازادكردن، ئەمــەش هــەر وردە وردە، چــونكە هــەر وردە وردە لــەناو كۆمەڵگــەدا زۆر دەبوو، هەر بەتەدریجە خەریكە شێونی كۆمەڵگە دەگرێتە دەست، كارگــەل و سەرروەت و سامان دەگرێتــە دەستی، بۆیــە بەتــەدریجیش كۆیلایــەتی بــەرەوە ئازادی هێنا، ئەمە جۆرێكی.

### دووەم: یاسایی مكاتب:

جۆرێكی تری كە(جــۆری كۆتاییــەتی)بریتــی بــوو لــەوەی كــەدوای ئــەوەی كۆمەڵگەیەكی دروست كرد تەقریبەن لـەلایەنی جیـاوازەوە لــەژێر ئیختیــاری خۆیدا بوو، كۆمەڵگەیەك كەبەیاسای خۆی بــەڕێوە بــچێت یــەك یاسـای لــە



مەوردی کۆیلەکانەوە ڕاگەیاند. کەیاسای(مکاتب)بوو یان(کتابات). لەسەرەتاوە ئەوە دەزانین کەلەو ماوە دوورودرێژەدا ڕۆحیەتی کۆیلەکانی ئامادە کردووە بۆ ئازادی، چونکە شەرتی یەکەم ئازادی ڕۆحیەتی خودی کۆیلەیە، بەڕاستی لەئێستادا زۆرێك هەن ناویان ئازادە، بەلاّم ئەگەر بێتوو لەو پێگە نەنگینە وا(مادە) دەخەنە بەردەمیان بیانهێنیتەوە بەرەو مەقامی ئازادی ئینسان، پێیان بێژی، زیندەگی بکەن(دیق) دەکەن، چونکە تەنها لەو پێگەیەی خۆیاندا دەزانن زیندەگی بکەن،گرنگ ئەوەیە ئەو ئینسانە لەسەرەتادا لەڕووی دەروونییەوە ئامادەی بکەیت بۆ ئازادی.

ئیسلام بەدرێژای ئەم ماوە دوورودرێژە ئەوانەی وا کۆیلەگەلی موسوڵمانن ڕوویانکردۆتە جیهانی ئیسلام ئامادەگی ڕۆحی پێداون بۆ ئازادی، لەپاش ئەوە یەك یاسای دامەزراندووە ئەویش یاسای(مکاتبات). پشتیوانی ئەم یاسایەش(بیت المال)ی ئیسلامە، واتە(وەزارەتی ئابووری ئیسلامی)،(وەزارەتی دارایی) هەرشتێك بێژیت فەرق ناکات، بەدەستوری قورئان لانی کەم یەك لەسەر هەشتی سەروەتی(بیت المال)ی ئیسلامی لە(دەرامەتی گشتی ئیسلامی)تایبەت کرا بەژیانی کۆیلەکانەوە، کەهەر کاتێك پێویستی کرد بەشێکیان بدرێتێ بۆ ئازادکردنیان، هەروەها بەشێکی تری بۆ دوای ئازاد بونیان ئەویش بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خۆیان، چونکە کار کەم بوو. وە زۆرینەیەکیش هەبوون لەکۆمەڵگەدا کەلە حقوقی(بیت المال)یان دەخوارد، چونکە لەڕووی ئیسلامییەوە نابێت لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئینسانێکی بەتاڵو برسی تێدا بێت، نابێت ئینسانێکی گرفتار و داماوی تێدابێت، لەسەر(بیت المال)تەکلیفە ئەو ئینسانە بژیەنێت، کەیفی خۆیەتی ئەگەر دەتوانێت کاری بۆ




بدۆزێتەوە، ئەگەر ئەوە ناتوانێت دەبێت بیژیەنێت و ژیانی بۆ ببات بەڕێوە، کاتێکیش کۆیلەیەك لەڕێگەی(مکاتب)ەوە یان لەهەر ڕێگەیەکی ترەوە ئازاد دەبوو یەك لەسەر هەشتی دارایی موسوڵمانگەل کەبەلایەنی کەمییەوە بوو دیاری کرابوو بۆئەوەی یان کاری بۆ فەراهەم بکات یان حقوقی بداتێ و ژیانی بۆ تەئمین بکات. جا ئەمە مانای ئەوە نییە(یەك لەسەر هەشتی بێت)، بەڵکو بەپێی جیاوازی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە تا(یەك لەسەر چوار و یەك لەسەر دوو)قابیلی بەکارهێنانە، واتە نیوەی تەواوی دارایی حوکمەتی ئیسلامی دەکرێت سەرف بکرێت بۆ ئازادکردنی کۆیلە و بەڕێوەبردنی ژیانی ئەگەر هەبێت!

(مکاتب)قەرار دادەکەی سەرەتایەتی،(مکاتب)چی ئێژێت؟ ئێژێ هەر کۆیلەیەك ئارەزووی هەیە خۆی ئازاد بکات بە ئیختیاری خۆی، بەلام واقیعەن ئەوە بوو زۆرێك لەخانەوادەکان هەبوون و هەژار و فەقیر و هەتیو، ئەگەر بێتوو بەزۆر کۆیلەکەیان لێبسەنرێتەوە ئەو کاتە ئەمان دەبوون بە کۆیلە و ئەمان فەلەج و بەدبەخت دەبوون! بۆیە دێت پارەی موکاتب دادەنێت و ئێژێت ئەگەر تۆ مەیلت هەیە خۆت ئازاد بکە و قەرارداد ببەستە بۆ ئازادی خۆت، ئەمەش بەوجۆرەیە کەبۆ نمونە(مانگێك ـ دوومانگ ـ دەمانگ) هەر جۆرێك کە بگەنە(تەوافوق)بڕوا کاری ئازاد بکات بۆ خۆی و کار نەکات بۆ ئەربابەکەی، لەم کارە ئازادەی پارە بهێنێت و بەپێی ئەو تەعاهودەی پڕی کردۆتەوە مانگانە بیداتە ئەربابەکەی، یاخود نا...ئەگەرکاری دەست ناکەوێت(بیت المال)ئەو مانگانەیە لەئەستۆ دەگرێت و بڕیاردەدات پارەکەی بدات، بۆیە کۆیلە دەڕوات قەرارداد لەگەڵ

ئەربابەكەیدا دەبەستێت بۆ نمونە لەماوەی(١٠ــ١٥ــ٥٠مانگ)دامانگی (١٠ــ١٠٠ــ١٠٠٠تمەن) (هەر جۆرێك بەگوێرەی بارودۆخ، وەزعی كۆمەڵگە، پارە دەدرێتە خاوەنی كۆیلەكە، بە قیستێك، یان بەدووان و سیان...)بەهەر جۆرێك خۆی مەیلی هەیە قەرارداد ببەستێت، خۆ ئەگەر خۆی ناتوانێت پارەكە پەیدا بكات(بیت المال)دەیداتێ و ئازاد دەبێت لەپاش ئەوەی ئازاد بوو، (بیت المال)دوبارە نانی پێشكەش دەكات، خۆ ئەگەر خاوەنی كۆیلەیەك ڕازی نەبێت ئەوكاتە(بیتالمال)قەراردادەكەی بۆ پێشكەش دەكات تبقی پێویستی سیستەمی ئەو كۆمەڵگەیە.

بەلەبەرچاوگرتنی ئائەم سیستەمە كۆتاییەی دوای باقی سیستەمی موقەیماتگەلێك كەئینسان دایمەزراندن دەزانیت كەئیتر مانەوەی كۆیلەیەك لە ژیانی كۆیلایەتیدا تەنها بەبارودۆخی خۆیەوە پەیوەستە، ئەگەر دەتەوێت بێژی من یاسایەكی سەریحم گەرەكە، كەبەگشتی ڕایبگەیەنێت و بێژێ"كۆیلەكان گشتی ئازادن" ئەمە ئەو یاساگەلەیە، بەلاَم لایەنە شیعارییەكەی تێدانییە!!

یاسای(مكاتب)یان(كتابت)كە دەستورێكی گشتییەو بەخودی كۆیلە دەدرێت و ئیختیاریشی پێدەدرێت و (زامنی ئیجرا)بوونیشی كە خودی حوكمەتی ئیسلامی دەیكات چ یاسایەكی كامڵكە بۆ ئازادی كۆیلە!

ئەگەریش دوای ئەم یاسایە كۆیلەیەك لەكۆیلایەتیدا بمێنێتەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە كەبەڕاستی ئەو كۆیلەیە بەرژەوەندی لەوەدایە هەر كۆیلە بێت، یان لەڕووی دەروونییەوە یان لەڕووی بابەتی شەخصی و عاتفییەوە لەگەڵ خاوەنەكەیدا جۆرە! ئەگەرنا تاكاتێك دەیەوێت ئازاد بێت فەرموو ئەوە ڕێگە.

بۆیە لەكۆتایدا دەیڵێینەوە بەلەبەرچاوگرتنی ئائەم(ئصول)ە كەوتم ئیسلام لەسەرتاوەی بەو تەرتیبە دەست دەكات بەچارەسەركردنی كۆمەڵگە لەهەموو لایەنێكەوە و دەرونی كۆمەڵكە ئامادە دەكات بۆ چاكسازی و ئینقلاب لەتەواوی پێكهاتە و بەشەكانیدا. لەسەرەتاوە بۆ كەسانێك كە تابعی پەیڕەوی خۆین ئەو نیزامە بەو كەیفییەتە دادەمەزرێت كەئەو شتەی وادەبێتە هۆكاری نارەحەت بوونی كۆیلە لەناوبچێت، كۆیلە بارودۆخێك پەیدا بكات وەك ئینسانگەلی ئازاد لەپاشاندا وردە وردە هەر لەبەرەوە ڕێگە دیاری دەكات بۆ ئازادبوونی كۆیلەكان لەكاتێكدا كەخۆی دەسەڵات پەیدا دەكات كەئەگەر كۆیلەیەك ئازادبوو پەكی نەكەوێت و لەبرساندا نەمرێت، چونكە ئیتر خۆی(بیت المال)ی پەیداكردووە و دەسەڵاتێكی ئابوری پەیداكردووە، لەدوای ئەوەی ئەم دەسەلاتەی جێگیر دەبێت ئەو یاسا كۆتاییە ڕادەگەیەنێت یاسای(مكاتب)كە ئیتر ئیختیاری بەخودی كۆیلەگەلە. جا ئەمە مەتلوبتر و دروستترە بۆ چارەسەركردنی ئەم نەخۆشییەی لەكۆمەڵگەدا هەیە یان ئەمە كە مەسەلەن لەساڵی یەكەمی هیجرەتدا ڕایگەیەنێت كۆیلە دەبێت هەمووی ئازاد بێت و كۆیلەداری قەدەغەیە(خۆ ئەوە دیارە ئەم ڕاگەیاندنە ناكرێت بڵێین پێش هیجرەت ڕاگەیەنرێت هیچ كەسێك ئەوەندە گەمژە نییە قسەی وابكات، چونكە پێش هیجرەت كۆمەڵگە نەبووە و دواترتاكی بۆ پەروەردە كرد).یان ئەم ڕێگەیە وابەو جۆرە دەستی پێكرد كەئیتر ئیختیار درا بەخودی كۆیلەگەل و دەوڵەتی ئیسلام بە هێزی سیاسی و ئابوری خۆیەوە پشتیوانی بۆ ئازادی كۆیلە كرد كارێكی لۆژیكی ترە؟.

# باسی چوارەم:
# ئیسلام و مەسەلەی (جارییە)

## گرفتەكانی كۆمەڵگە و ڕێگە چارەكان.

من لێرەدا زۆر بە كورتی و بەناونیشانی پێشەكییەك هەندێك لەم بارەیەوە قسەدەكەم*.

جارییە، بەشێكە لە(كۆیلایەتی)، چونكە بە پیاو وتراوە (كۆیلە) بەژنیش وتراوە(جارییە). بەگشتی ئەم دوو ناوەیان هەبووە. سەرەتا ئەمەتان لەلا ڕۆشن بێت بۆ چارەسەركردنی كێشەی ئینسان دوو جۆر ڕێگە هەیە: ڕێگەیەكی مەسنوعی و فشاری و (میكانیكی)ە بە زۆر و زۆركارییە، وەك ئەوەی دەوڵەتێك بەزۆری یاسا بیەوێت بابەتێك بسەپێنێت بەسەر خەڵكدا و پێیان ئەنجام بدات! ڕێگەیەكی تریش بەگرتنەبەری تەحەولات(وەرچەرخان)، كە بەشێوەیەكی سروشتی خەڵكی لەگەڵ تەرح و بەرنامە تازەكەدا هەمامەنگی دەبێت و قبوڵی دەكات. لای هەمووان ئەوە ئاشكرایە ئینسان مەوجودێكی عاقڵە و خاوەنی ئیختیارە و بە پەروەردە كردن دەبێت وای لێبێت كە خراپی نەكات و خراپی قبوڵ نەبێت، نەك بەو جۆرەی كە بەزۆری

---

*) وەك (كاك ئەحمەد) خۆی ئاماژەی پێدەكات، بابەتی (جارییە) سەر بە بابەتی كۆیلایەتییە، بۆیە وا دەردەكەوێت هەندێك لە باسەكە وەك دووبارە دەربكەوێت، بەڵام ئەمە دووبارەی باسی پێشووتر نییە، بەڵكو وەك تەواوكەرێكی ئەو باسە وایە، هەر لەبەر ئەمەشە ئێمە بەشوێن یەكدا دامانناون بۆئەوەی خوێنەر زیاتر لەم بابەتە تێبگات و زۆر تر بۆی ڕۆشنببێتەوە.




یاساو و كوتەك ڕووبەڕووی ببیتەوە و بابەتی بەسەردا بسەپێنرێت! مەگەر لەیەك كاتدا ئەوەی وا ڕێگە مەعقولەكەی بڕرابێت {بەسەریاندا جێبەجێكرابێت} و یەكەیەكەیەك هەبن قبوڵی نەكەن، ئەو كاتە كێشە نییە بۆ یەكەیەكەیەك بەزۆر یاسا بەكاربهێنرێت و ڕووبەڕوو بوونەوەی قەهری(بەتووڕەیی) بكەیت، بەڵام بۆ هەموو ئینسان بە ڕووبەڕوو بوونەوەی قەهری كارێكی باتڵە. خەیاڵت وابێت هەر بەزۆر یاسا و سیستەمێك بسەپێنییت بەسەر مەجموعی ئینسانییەتدا، لە دیندا ئەوە قبوڵ نەكراوە، بەڵكو (دین) هەوڵدەدات ئینسانێك لە جاهیلییەتەوە كە قبوڵی یاسا و بڕیار و ئاداب و ڕسوم و ئەفكار و ئەخلاقی جاهیلییەتە تەكان بدات و روشد(گەشە)ی پێ بدات و بیهێنێت بەرەو لای ئیسلام كە خۆی ئازاد بكات لە هەموو ئەو شتانەی وا لەلایەن بەشەرەوە دەسەپێنرێت بەسەریدا، جا چ سەپاندنێكی نائاگاهانە و بەزۆر، چ سەپاندنێكی تەدریجی و وردە وردە كە بەبۆنەی تەڵقینەوە قبوڵی كردووە! كاری دین ئەوەیە كە ئینسان لەو جاهیلیەتەوە بێنێتە سەر ڕێگەی ئیسلام و ئەو ئازادەگییەی پێ بدات كە ئەوانەی وا دروست كەری ئینسانە، كە ئینسان ئەهلییەت و لییاقەتی ئەوەی نییە كە بەرنامە دابنێت و بیسەپێنێت بەسەر ئینسانییەتدا، ئەو لە پێشڕی و خۆبەگەورە زانینەی كە هەندێك ئینسان هەیانە پوچە، دین هات ئینسان ئالەوانە ڕزگار بكات. لەدوای ئەوەی كە هەوڵی خۆی دەدات، حەرەكەت دەدات بەئینسان، تەكان و ڕوشد پەیدا دەبێت لەناو ئینسانییەتدا وردە وردە خۆیان لە جاهیلییەت ڕزگار دەكەن كۆمەڵگەیەك پێك هاتووە لەیەكەیەكەیەك لەتاكەكانی ئینسان حاڵەتێكی تر پەیدا دەكات، بەڵام هێشتا




مومکینە کەسانێك هەبن بەپێچەوانەی بەرژەوەندی کۆمەڵگە بۆ مەبەستی پەستی خۆیان پێیان خۆش بێت ئینسان دووبارە ببێتەوە بەدیلی بیروبۆچوون و تیۆرییەکانی ئینسان دووبارە ژمارەیەك لە تاکەکان حوکم بکەن بەسەر ژمارەیەکی تردا، حوکم بکەن بەسەر کۆمەڵگەی ئینسانییەتدا! جا بەدرێژایی مێژووش هەر وابووە ئەمە واقیعییەتە، هەمیشە واقیعیەتێکی پەیدا کردووە هەمیشە واقیعییەتیش پەیدا دەکات، هەر وابووە(دین) هاتووە بەشەریەتی رزگار کردووە، گەشە و دەرکی پێداوە و لەئەسارەت و زیلەتی تاکەکانی ئینسان و قبوڵ کردنی حوکم و یاسای ئینسانی رزگاری کردووە کەچی لەپاشاندا کەزەمان گوزەرا ئینسانی(خۆویست) و (پلە و پایە ویست) وردە وردە دووبارە ئینسانیان کردۆتەوە دیلی بیروبۆچوون و تیۆرییەکانی خۆیان! هەڵبەتە زۆر بەکەمی ئەم کارەیان بە هێز و زۆر کردووە، زۆرترین کات لەرێگەی فرِوفێڵ و بەکارهێنانی عیبارات و دەستەواژەی واکەئینسان باوەری پێدەکات و قبوڵی دەکات(زوڵمی تەزویر ئیجگار زۆرترە تا زوڵمی زۆر و هێز)کەمێکی بە زۆر و هێز بووە زۆرترینی بە فرِوفێڵ بووە ئێستاش هەروایە و لەمەودواش هەروا دەبێت. هەرواکە دین هەوڵ دەدات ئازادی بداتەوە تاکەکانی ئینسانییەت و لەئەسارەتی بیروبۆچوونی ئینسانەکانی ترەوە رزگار بکات، هەر لەخودی ئینسان تاکگەلێك هەن هەوڵ دەدەن دووبارە ئینسان بخەنەوە ژێر بیروبۆچوون و تیۆر و لێکدانەوەکانی خۆیان و ئەفکاری خۆیان بسەپێنن بەسەریاندا،ئەمەش هەمیشە بووە!

جا گرنگ ئەوەیە موتەوەجیە بین ئەگەر ئینسانییەت بەو شێوەیەش مەسخ و پووچ ببێتەوە و هەموو لەبەرامبەر بیروبۆچوونی تاکگەلێك لە ئینسانەوە




سەرنجەوێنێت نابێت بە(زۆر)بێژی وامەبە، بە زۆر بێژی بێن بەرەو ئازادەگی و سارەتی ئینسانی وەك خۆت وەرە دەرەوە، نابێت وا بكەیت، بەڵكو دەبێت (متحەولی) بكەیت، تەكانی تێدا دروست بكەیت، زهن و ویژدان و فكری بگۆڕیت و ئازادی بكەیت كە بێتە دەرەوە لە ژێر ئەو فشارەدا، ئەمە ڕێگەی(دین)ە، خۆئەگەر لەدوای ئەوەی وامانكرد یەكەیەكەیەك هەبوون دیسان هەر خەیاڵیان هەبوو خۆیان بسەپێنن بەسەر خەڵكیدا و ئیستیسماری خەڵك بكەن، چ مادی و چ مەعنەوی ئەو كاتەیە دەبێت بەتوڕەی ڕووبەڕویان ببیتەوە. ئەمە كولی بەرخوردی(دین)لەگەڵ ئینسان و كێشەكانی ئینساندا.

جا(كۆیلایەتی)یەكێكە لەو كێشە ئینسانیانەی كە جاهیلییەت دروستی كردووە! كە بەهۆی شەڕ و زۆرەوە كەسانێك لە ئینسانەكان دەسەڵات دەگرن بەسەر كۆمەڵێك لەئینساندا زیاد لەوەی كە خەیاڵ و فكریان دەستگیر (تەسخیر)بكەن جسمیشیان دەستگیر(تەسخیر) دەكەن، كەواقیعەن (تسخیر)* بەدیلگرتن و كۆنتڕۆڵ كردنی جسم لەچاو بەدیل و كۆنتڕۆڵكردنی فكردا شتێكی بچوكە، ئینسانێك ببەیت و زیندانی بكەیت زۆر كەم زەرەرترە تاوەكو ئەوەی بێیت فكری بگۆڕیت و دیلی بكەیت. لە جاهیلییەتی دونیایی ئەم ڕۆژەدا وەك جاهیلییەتی درێژایی مێژوو (تسخیر) و دیلی فكر دەكەن كەئەوە بەدبەختییە، ئەو قوتابخانە بەشەری و یاسا و سیستەمە بەشەریانە زۆر زاڵمانەتر كاردەكەن لە چاو ئەو ئەشكەنجانەی لە زیندانەكاندا دەدرێن! چونكە (جسمی تسخیر) ناكەن{دەست بەسەر جسمیدا ناگرن}، بەڵكو (دەرونی تسخیر)دەكەن{دەست بەسەر دەروونیدا دەگرن}، جا دەرون

*) تسخیر: داگیركاری، كار یان ڕەوتی داگرتن و دەستبەسەردا گرتن.

گرنگترە تا جسم، هەركە دەرون تسخیر كرا ئازە ئیتر ئینسان نییە! جسمیش شوێنكەوتەی دەرونە و بە قسەی دەرون و فكری دەكات.

فكربكەرەوە زۆردارێك وا خەیاڵ دەكات دوو دانە ئینسان تسخیر بكات، یەكێكیان لە دڵ و فكرەوە تەسلیم بووە، بەلاَم ئازادە، ئەویتریان لە دڵ و فكرەوە تەسلیم نەبووە دەیبات دەیخاتە زیندان و دەیخاتە زنجیرەوە دەی لەم دووانە كامیان ئازادترن؟ بەدڵنیاییەوە ئەو ئازادترە وا لەناو زنجیرەكەدایە كە زهنی ئەسیر نەبووە، ئەوە ئەسیر و بەدبەختە كە ئازادە و بەم لاو بەو لادا دەڕوات، بەلاَم بەدڵ و زهن و ویژدانی خۆیدا تەسلیم بووە ئەسارەت و بەدبەختی ئەوەیە!!جا لەوە بگوزەرێین لە(سیستەمی كۆیلایەتی)دا ئەو جۆرە زوڵمەیە كە جسمی كابرا ئەسیر دەكات و دەیكاتە شوێن كەوتەی خۆی! دیاریشە بۆیە دەتوانێت بەو جۆرە جسمی تسخیر بكات، چونكە بنەڕەتەكەشی گرتووە،كە فكرەكەیە. وردە وردە لەناو سیستەمی كۆمەڵگەدا بە زۆر و پول و فڕوفێڵ كاریان كردووە و خەڵكیش بڕوایان پێ كردووە و ناسیویانە و قبوڵیانكردووە! بۆیە ئەوەندە بڕەكات و...ئەم سیستەمە دروست بووە بۆتە عورفی گشتی ئەو كۆمەڵگەیە دەی دەبێت چۆن بەرخوردی لەگەڵ بكات؟! ئایا یاسایەكی تەحویلی ڕابگەیەنێت و كۆیلە ئیتر تەواو دەبێت؟ یان وردە وردە بینایی فكری و دەرونی ئینسان بگۆڕێ، چ ئازادە زاهیرەكان،چ كۆیلەكان؟ دیارە ئەم ڕێگەی دووەمە(ڕێگەی بیناكردنەوەی فكر و دەرونی ئینسانەكان)مەعقولە نەك ڕێگەی یەكەم*.

---

*) بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەم بارەیەوە بگەڕێرەوە بۆ باسی پێشووتر.

## جارییە، وەك چارەسەر

جا ئێستا بابێینە سەر مەسەلەی(جارییە). لەرێگای جیاواز جیاوازەوە ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆ(دین) دێت و تەکان بە ئینسانی جاهیل دەدات و دەیگۆرێت، کە ئەوەڵین و ئەساسترین و لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە دێن فکری شرکاوی و بت پەرستانە لادەبات و فکری تەوحیدی پێدەدات ئێژن"تۆ تەنها لەگەڵ خالقی خۆت و هەستی جیهان پەیوەندی بچوك و گەورەت هەیە بۆیە گوێڕایەڵی ئەوبە ئیتر گوێڕایەڵی غەیری ئەو مەبە هەر شتێك خیلافی ئەو بوو قبوڵی مەکە"جا ئەمە ئیتر هەموو زنجیرێك دەقرتێنێت و هەموو قەید و بەربەستێك بەتاڵ دەکاتەوە! تەوحید بینا و پایە و ئەساسی ئازادی ئینسانە! ئینسان لەرێگەی تەوحیدەوە وایلێدێت سەری بۆ هیچ شتێك دانەنەوێنێت غەیری ئەوەی ئە جیهانەی دروست کردووە"خلق"، چونکە غەیری خالقی عالم هەموو ئەوانی دیکە یان هاوپلەی خۆیەتی کەدەکاتە ئینسانەکان یان غەیری مادەیە(ماوەرای ئینسان)ئەوەی کەلەم جیهانەدا هەیە ئەگەر ئینسانە ئەوە هاوپلەی خۆیەتی، ئەگەر غەیری ئینسانە(مجهولی خۆیەتی)! بۆیە تەنها سەر بۆ خالقی خۆی دادەنەوێنێت کە دروست کەری عالەمە! جا لێرەدا قسە لەوەیە ئەم تەوحیدییە تەنها بە قسە (لەفز و کەلیمە)نەبێت، ئەگەر ئینسان بەڕاستی (موەحید) بێت واتە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦)﴾ بەندەگی و گوێڕایەڵیمان تەنها بۆ تۆیە و چاوەڕوانی و کۆمەك لە(ماوەرای عالەمی شەهادە)و پەیوەندی زاهیری تەنها لە تۆیە، ئەگەر ئینسان ئاوای لێهات زۆر گەورەیە ئیتر هیچ شتێك نییە بتوانێت گەورە بێت بەسەریدا، هیچ شتێك بتوانێت ئەمر و نەهی بەسەردا بکات.





دین لەئەصلێكی ئاوا بونیادیەوە دەست دەكات بە دروست كردنی تەحەول (وەرچەرخان) لە ئینساندا، ئینسان لەو جاهیلیەت و پەستییەوە كە دیلی یاساكانی ئینسانە(جا ئێستا تۆ ناوی یاسای زانستی دەنێیت، ناوی مەكتەبی لێ دەنێیت، ناوی زۆر و زۆردار دەنێیت) هەر ناوێكی لێدەنێیت. لەو حاڵە جەهالەتییەوە ڕزگاری دەكات و دەیهێنێت بەرەو ئەوەی كە ئیتر هیچ شتێك لە هیچ كەسێك قبوڵ نەكات غەیری ئەوەی كە ئینسان و ئەم عالەمە عەجیبەی خەلق كردووە. دیاریشە جگە لەوەی ئەم جیهانەی دروست كردووە باش دەتوانێت بەرنامە بۆ ئینسان دابنێت، چونكە مەخلووقی خۆیەتی و باشی دەناسێت و باش دەزانێت دەبێت چۆن بەڕێوەی بەرێت! جا ئەمە گرنگترین دروستكردنی وەرچەرخان(تەحەولە) لە ئینساندا لە پاشاندا وردە وردە لەلایەنی تریشەوە موتەوەجیهی ویژدان و فكری ئینسان دەبێت و بەهەموو بارێكدا دەیگۆڕێت لەناو ئەوانەشدا مەسەلەی(كۆیلە)! مەسەلەی كۆیلەش بەجۆرێك كاری تێدا دەكات، كەلەیەك لایەندا وازی لێناهێنێت و كاری تێدا ناكات، بەڵكو لەچەندین لایەنی جیاوازدا كاری لەسەر دەكات لە قوڵای ویژدانی ئینسانەوە دەست پێدەكات كار لەسەر ئەوە دەكات ئەو ویژدانە بۆچی ڕازییە كۆیلە بێت؟ دیارە چونكە شێواوە و باتڵ كراوەتەوە بۆیە سیستەمی كۆیلایەتی قبوڵ دەكات، فكر و شعور و عەواتف و ویژدانی و ئیحساساتی هەمووی باتڵە بۆیە ئەو سیستەمە زاڵمانەیە قبوڵ دەكات.

ئەم ویژدانە باتڵە وردە وردە پاك دەكاتەوە لەو خەوش و خاڵە نەنگینە، پاكی دەكاتەوە و ئەوانەی لێ لادەبات دەیشواتەوە و تەمیزی دەكات، جا بەشێك لە(كۆیلە) ــ جارییەیە ــ هەروا بۆ مەجموعی مەسائیل لەلایەنی

جیاوازەوە داخلی ویژدانی ئینسان دەبێت، هەروا کەبۆ کۆیلە لەلایەنی جیاوازەوە داخلی ویژدانی ئینسان دەبێت بۆ مەسەلەی جارییەش هەر بەو جۆرەیە. لەلایەنی جیاواز جیاوازەوە داخلی ویژدانی ئینسان دەبێت و وەرچەرخانی تێدا دروست دەکات.

## ئەو گۆڕانکارییانەی دین دەیهێنێت بەسەر کەسێکی (جارییە)دا:

### یەکەم: گۆڕانکاری بونیادی فەرهەنگی ئینسانی

یەکەمین تەحەول(وەرچەرخان)یش ئەوەیە کە تەماشای دید و بینشی سەردەمی جاهیلیەت بەرامبەر بە(جارییە،واتە ژنی کۆیلە)بکەین و بزانین چۆن بوو؟ بزانین چی بینش و تێڕوانینێکیان هەبوو دواتر دەزانین بەبۆنەی ئەو تێڕوانینەیانەوە ڕەفتاریان چۆن بووە بەرامبەر(جارییە)جا دوای ئەوە بزانین ئیسلام هات چی کرد و چی سیستەمێکی هێنایە جێگەی ئەوە.
بەڕاستی شەرم هاوەرە ئینسان بێت بەشێوەیەکی دور و درێژ باسی لێوە بکات!! لەڕووی مەسائیلی جنسییەوە وەك حەیوان زۆر نەنگین تەماشای جارییە دەرکرا، هەروەك چۆن لە بڕێك ئینحرافات(لادان)ی جنسیدا. لەناو هەندێك لەخەڵکیدا نیسبەت بەحەیوان جۆرێك لە کردەوەی نادروست هەیە، لەناو ئەوانیشدا(سەردەمی پێش ئیسلام)بەرامبەر بە جارییە بەو شێوەیە مامەڵەیان دەکردا هەتا مەسەلە تەنها بەرخوردی زەرەرمەند و نەنگینی خاوەن جارییە لەگەڵ جارییەدا نەبوو... جارییەیان دەدایە کری! دەیان نارد بۆ کابرایەکی دەوڵەمەند و سەعاتێك دوو سەعات، شەوێك دوو شەو هەرچەند مەیلیان هەبوو لەلای دەبوو دوایش ئەو پارەی دەنارد! ئا ئەمە

بەرنامەی ئەوان بوو هەم پەیوەندی جنسی ناشرین و پەست و تەحقیرئامێزی خۆیان، هەم بە کرێدانیان بە کەسانی دیکە، بەڕاستی زۆر ناخۆشە ئینسان ناتوانێت ئەو دەربڕینانە زۆر سەریح و ڕۆشن بێژێت، زۆر نەنگینە زۆر ڕسواییە بۆ بەشەرییەت!! ئێستا بۆ ئێمە گێڕانەوەکەی نەنگینە، کەچی ئەوان عەمەلیان پێدەکرد! بەهەموو شێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرد(بە رهن، بەکرێدان...)ئیسلام دێت لەگەڵ ئەم دوو جۆرە ئینحرافە جنسییە ڕووبەڕوو دەبێتەوە. سەرەتا لەگەڵ ئەو بەرنامانەدا کە چ خۆیان و چ غەیری خۆیان بەزۆر (ئیتر جارییە ڕازی بێت یان ڕازی نەبێت قسەیەك نییە) بەزۆر ئینحرافی جنسیان پێدەکردن و بەپارە دەیان دانە کەسی تر ئیتر ڕازی بوون بەهیچ شێوەیەك لەناو باسدا نەبوون، فەرمووی﴿....وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا....﴾* ئەو کچە جارییانە(ئەو ژنە جارییانە)کە پێیان خۆشە شەخصییەتی خۆیان محکەم ڕابگرن بەزۆر وایان لێنەکەن ئینحرافی جنسی ئەنجام بدەن، چ لەگەڵ خۆتان چ لەگەڵ کەسی تر. ئەمە جۆرێك لە دروست کردنی گۆڕانکاری لە ویژداندا جالەو عیبارەتەدا﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً﴾ زۆر ئیلهام بەخشە!! ئەو پێی خۆشە وەکو شەخصییەت کە جارییە، شەخصییەت لەبیروبۆچوونی ئەودا ئەرزشی هەیە، بەڵام تۆکە خۆت بە ئازاد دەزانی شەخصییەت لە تێڕوانینی تۆدا ئەرزشی نییە؟! ئائەمە زۆر تەکاندەهەیە لە دەروون و ویژدانی ئینساندا ئەو بەشەی ﴿إِنْ

* ) {وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }النور٣٣

أَرَدْنَ تَحَصُّناً﴾، كە ئەگەر قەرار بێت بۆ ئەرزشی گەورە گەورە ڕێز قایل ببێت ئێوە كە بانگەشەی ئازادیتان هەیە و ئەوانیش بەدیل و بێ ئەرزش و تەبەقەی خوارەوە و پووچ دەناسن خۆتان دەبێت زیاتر بۆ ئەو ئەرزشە گەورانە ڕێز قایل بن تائەوان، ئەوان ئەرزشی بۆ قایل بن ئێوە قایل نەبن بۆی؟! ئەمە جۆرێك لە تەحەول(وەرچەرخان) بوو لە بونیادی فەرهەنگی ئینسانیدا جانەك لە خودی فەرهەنگەكەدا، فەرهەنگەكە ڕواڵەتییەكەیە لە بونیادەكەیدا،لە بناغەكەیدا(عەواتف ـ فكر)وەرچەرخانی لەوەدا دروست كردا

## دووەم: بەرەو هاوسەرگیری

مەرحەلەیەكی تری دێت تەكانێكی ئێجگار گەورە دروست دەكات ئەویش بریتییە لە﴿ئیزدواج﴾. لێرەدا بەتەواوەتی ئەو جۆرە پەیوەندییە جنسییە هەتا ئەگەر جارییەش ڕازی بێت بەتاڵی دەكاتەوە! گریمان جارییەش ڕازییە لەگەڵ خاوەنەكەی یان لەگەڵ كەسێكی تر پەیوەندی گرت ئەویش بەتاڵ دەكاتەوە! ئەگەر جارییەكان كەسوكاریان هەبوو بە ئیجازەی(ڕەزامەندی) كەسوكارییان، ئەگەر نەبوو حوكمەت ئەو كارە دەكات و مارەیان دەكات، جا ئەمەش (كاتی نییە) وەك ئەوەی (مەزهەبی شیعە) هەیانە ئێمە شتی وامان نییە، چونكە تێڕوانین و بۆچونی ئێمە (ئەهلی سوننە)دا زەواج هەر یەك جۆرە جا ئایەتەكە دەفەرمێت﴿وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ئەوەش نەك هەر ئەوەی مارەی ببڕیت، بەڵكو هەر وەك ژنێكی ئازادە مارەیی ئەوانەی لەسنوری ئیمكانیات و دەسەڵاتی پیاوەكەدا دەبێت(هەروەك چۆن بۆ ژنێكی ئازادە مارەیی دیاری دەكات بۆ ئەمیش كە جارییە مارەیی دیاری دەكات). جائەوەش بڵێم لە پێش

ئەمەشەوە دروستكردنی گۆڕانكارییەكی تر لە بناغەی فەرهەنگییدا كە(ئەفكار و عواتفی ئینسانییە) دروست دەكات، ئەویش ئەوەیە كە پێش لەوەی بەوشێوەیە تەكان بدات و وردە وردە یاسای بۆ دابنێت دێت (جارییە) دەكاتە هاوماڵی (ژن)! ژن مەبەست زەوجی پیاوەكە دەیكاتە هاوماڵی ئەو زەوجە جائەمە ئیتر تەكانێكی زۆر گەورەیە كەلەسەرەتاوە دەست پێ دەكات وشەی جارییە لەگەڵ (زەوج) بەكاردەهێنێت! چونكە فكری ئەوان فكرێكی تەبەقاتی(چینایەتی)بوو بانترین(بەرزترین پلە)تەبەقە ئەشرافی خاوەنی كۆیلە و جارییە بوون پەستترین و خوارترین تەبەقەش بەندە و جارییە بوون. تەبەقات شتێك نەبوو هەروا ئاسان بێت وەك لە دونیایی ئەم ڕۆژەدا ئیمكانی هەیە كەسێك لە تەبەقەی ئەشراف(ئەشرافی) زەواج بكات، لەگەڵ كەسێكدا لەتەبەقەی خواروو،نا...ئەوان جێگە و پێگەیان دیاری كراو بوو وەك سەردەمی ئێرانی شاهنشاهی. كورە هەروەك ئێستایی ئێران!!مەلاكانی شیعە بە كچی موسوڵمان ئێژن عیبادەتە (سیغە)بكەن و شوو بەئێمە بكەن دەی(بە مەلای دوابڕاو) بڵێن ئەگەر عیبادەتە كچەكانی خۆتانیان بدەنێ! دوابڕاوە، شەیتانە، خەڵەتێنەرانە بۆ كچی موسوڵمانان عیبادەت و سواب و چاكەیە بێت(سیغە)بكەن بە ئێوە، بەلاَم ئێوە پێان عەیبە جارێك كچ و كوڕی خۆتان بنێرن و بە سیغە!تەركیزی ئەوە بدەن بەتەمەنیان خۆیان نایكەن و بە نەنگینی دەزانن!! ئەمە هەر بووە! تەبەقاتی پێشتر زۆر خراپتر بووە لە ئێستاش مافێكی كەمیان بووە هەروەك چۆن ئێستا(سیغە)كردن بەرنامەیەكە بۆ خەڵك بەتایبەت هەژار و فەقیران، چونكە كچە ئەشرافیش سیغە ناكات شتی وایان





نییە و كەسێكیش باسیان ناكات، مەلایەك ناڵێت بە كچێكی ئەشرافی ئاوەرە(سیغە) تەنها هەر هەژارانن.

چۆن ئێستا دەبینین ئاوادەكریە كە ئەمەش كاری مەلایە ئەمە پەیوەندی بە مەزهەبەوە نییە و تایبەتە بەكاری مەلای فزول و فێڵبازە، دووبارە بۆیە دەیڵێمەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە تەوهین(ئیهانە)، بە مەلای بەتەقوا و بە ئیمان، بەڵام بۆ كچی خۆیان عەیبە! ئائێستا یەك نەفەر(عەوامی شیعە)بڵێت بە مەلایەكیان"بیزەحمەت كچەكەت بدا بە سیغە"، بزانن چۆن جوابی دەداتەوە پڕ جنێوی دەكات، چونكە هەرچەندە نایڵێن و ڕویان نایەت بیڵێن، بەڵام لەناخی دڵیانەوە ئەم یاسایە تەحمیل دەكرێت بە هەژار نەك بۆ خۆیان! جا ئەو كاتەش هەبوو شتێكی ڕەسمی بووە و بە زمانیش دەوترا و هیچ عەیب و ڕەخنەیەكی تێدانەبوو! خاوەن كۆیلە تەبەقەیەك بوون لەو سەری سەرەوە هەموو ئیمتیازاتێكیان هەبوو كۆیلایەتی و جارییە تەبەقەیەكە بوون لەو خواری خوارەوە بە هەموو مەحرومیەتێكەوە. لە سیستەمێكی ئاوا چینایەتیدا ناكرێت ئێژی(ژنی ئازادە)لەگەڵ(جارییە)ناو ببرێت! بازۆر دوور نەڕۆین ئەو ماڵانەی وا منداڵدارن بڵێیت بەكابرای خاوەن ماڵ(ژنەكەت و منداڵەكانت بنێرە بۆ فلانە كار)بزانن چەنێك پێی ناخۆشە و سڵ دەكاتەوە لە ڕستەیەكی وا(ژنەكەی و منداڵەكانی)بەیەكەوە دەكاتە هاو پلە و هاوماڵ! یان سەیر بكە و بزانە ژنی ئەو كابرایە چەنێكی پێ ناخۆشە، یانی چی ژنی كابرایەكی ئەشرافی لەگەڵ منداڵەكانیدا ناوی دەبریەت. هەر ئێستاش كە گوایەموسوڵمانین و سیستەمی چینایەتی بەو محكەمییە كۆنی لەناوماندا نییە(جا

بەخەیاڵی خۆمان وادەزانین و بەشێوەیەكی ڕەسمی و یاسای نییە، بە یاسا دیاری نەكراوە! بەڵام هێشتا ئەوەندە لە زهنماندا جێگەی هەیە...).
نا...تۆ بڕۆ بوێرە ژنی كابرا و منداڵەكانی بەیەكەوە بۆ كار و جەرەیانێك ناوبەرە و بیانكە هاوپلە بزانە شتی واتەحەمول دەكرێت! دەی بۆ ئەو زەمانەی كەدێت ژنی كابرا و جارییە دەكاتە هاوماڵ زۆر تاڵتر بووە، قورئان یەكەمجار دایاندەچڵەكێنێت گوێچكەیان دەزرنگێتەوە دەڵێت(أزواج لەگەڵ ماملكت ایمانكم)زۆر دووبارەی دەكاتەوە"ژنەكانتان،جارییەكانتان...)دەیانخاتە لای یەكتری هەڵبەتە لەسەرەتاوە زۆر سڵدەكەنەوە و ئەصڵەمنەوە، ئەمە چییە ئەمە بۆ گەورە و بچوكی نەماوە؟! دەزانن چۆن ئەشراف قسەیان بە پێغەمبەر(ﷺ)دەدا كەتۆ گەورە و بچوكت نەهێلا، ئەدەب و حەیا و شەرمت لەناو برد دیارە ئەو گەورە و بچوكی و حەیا و شەرمەی وائەوان بوویان ئەو شەیتانییە پیسە مەلعونییە كە دەبێت هەر لەناوبچێت!
جائەشراف لەسەرەتاوە بەڕاستی بەو شێوەیە سڵیاندەكرد لەم وشانەی قورئان دەتەزین﴿أزواجكم أو ماملكت أيمانكم،أزواجهم. أيمانكم..﴾دەیانووت ئەمە چییە؟! بۆچی وادەكات و سەروخوار ناهێڵێت؟ بۆ ماقوڵ و ناماقوڵ وگەورە و بچوك ناهێڵێت؟ائەو هەموو گلەییەیان لە دانیشتنە تایبەتی و (پەیمانی ئاشتی بەستن)دا دەكرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و صەحابییەكان لەدەرەوەی ئەو دانیشتنانەشدا ئەو هەموو جنێوەیان دەدا دەیانووت(محمد) هات و دونیای شێواند و سەروخواری كردا...قورئان دێت لەسەرەتاوە بەو جۆرە ڕایاندەشەكێنێت دەی بابسڵەمێنەوە و جنێو بدەن و هاوار بكەن و بقیڕێنن، كەیفی خۆیانە تاماوەیەكدادەی وردە وردە دەگاتە ئەوی جێگەیەی دەڵێت،

﴿فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾ تادەگاتە ئەوەی هەروەك ژنێکی ئازاد حەقێکی بۆ دیاری دەکرێت، وەك کچی کابرا بخوازیت﴿وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، دەی ئائەمە رەوشت و رێگەی دینە لەکاتی رووبەڕوو بونەوەی لەگەڵ تەواوی کێشەکانی ئینساندا. ئاوای لێدەکات لەهەموو لایەکەوە دەست دەکات بەکارلەسەرکردنی و وردە وردە ئەو ویژدانە پیسەی وا توانیویەتی ئەو سیستەمە پیسە قبوڵ بکات موتەحەولی دەکات و دەیگۆڕێت و دەیکاتە ویژدانێك کە بتوانێت سیستەمێکی باش قبوڵ بکات.

## یاساکانی جارییە لە سەردەمێکدا کە ئیسلام هێزی پەیداکرد

{هەموو ئەوانەی لە پێشەوە باسمکرد لەکاتێکدا جێبەجێدەکرا کە ئیسلام هێزی نەبوو، یاساکانی ئیسلام حوکمی تەواوی کۆمەڵگەی نەدەکردا} جا ئەم جارەیان وای لێدێت دەگاتە ئەوەی کە ئیتر ئیسلام قودرەت پەیدادەکات. ئەو یاسا و بەرنامەیە بۆ زەمانێك بووە کە ئیسلام هێز و قودرەتی پەیدانەکرد بوو، بۆیە یەکەیەکەیەك لە ئەفرادی موسوڵمان هەن لەناو دەریایەك لە جاهیلیەتدا وردە وردە هیدایەت ئاراستەی ئەمان دەکرییەت،خۆ باقییەکەی تر بەقسە ناکرێ!بەڵام هەر ئەوەندەی مەتلەبێك بچێتە ناو کۆمەڵگەوە، هەروەك ئەوە وایە بەردێك بخەیتە ناو ئاو شەپۆل دروست دەکات مەوج دەداتەوە لەکۆتایدا وردە وردە دەگاتە ئەوەی هەموو لایەك دەگرێتەوە و کۆمەڵگەش موتەحەول دەبێت بەمەرجێك ئەم بەردە لەسەریەك لەسەریەك فڕێ بدەیت تا لە بنەماوە ئەو دەریا لە زەلکاو پڕ دەبێت و لادەچێت و هەمووی دەڕژێت بەملاو بەولادا ئەو فەرهەنگە پیسە هیچی نامێنێت.

کاتێك ئەو کێشانەی لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە، ئەو مەسائیلەی کە بونیادی و ئەساسییە، ئەصڵی عەقیدیە، دەبینیت ئیسلام لەسەرەتاوە لەئەصڵی(عەقیدە)وە دەست پێدەکات، چونکە عەقیدە بناسە بۆ تەواوی دەروونی ئینسان. لەوێوە دەست پێدەکات و وردە وردە دێتە پێشەوە...تادەگاتە ئەوەی کۆمەڵگە بۆتە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی، لە پاشاندا کۆمەڵگەی ئیسلامی ئیتر یاسای بۆ دادەنێت، یاسایەك بۆ خودی حوکمەت ئەو یاسایانەی لەسەرەتاوە کە ئاراستەی شەخصەکان دەکرێت بەرامبەر بە جارییە، کە مەنعی تەجاوزە، یان ئەو یاسایەی کە مارەیان بکەن ئەوە تایبەتە بە تاکەکانی کۆمەڵگەوە، بەڵام ئێستا یاسا بۆ حوکمەت دادەنێن، کە بەلایەنی کەمەوە(یەك، هەشتەمی)دارایی حوکمەت دەبێت دابین بکرێت بۆ ئازاد کردنی کۆیلەکان، چونکە ئیتر حوکمەت دروست بووە و هێز هەیە و (بیت المال) و ئابووری هەیە و دەتوانێت کار بکات. تاوەکو دەگاتە ئەو ئاستەی سەیردەکەیت کێشەی(کۆیلایەتی)تەواو بووە و حەل بووە.

جا(یەك،هەشتەمی)دارایی دابینکردن بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان لایەنی کەمییەتی دەتوانێت (تا یەك، چوارەم و تا نیوەشی) ببەخشێت، تا ئەو ئەندازەی کۆیلە بوون هەیە و پێویستی پێیەتی. هەروەها دەبێت (بیت المال)ئاوا کاربکات و کۆیلە ئازاد بکات یان نانیان بداتێ،یان کاریان بۆ پەیدابکات، چونکە لەڕووی ئابورییەوە کێشەی گەورە ئەوە بوو، کە ئەگەر کۆیلە ئازاد بکرایە لە برساندا دەمرد، چونکە کارێك نەبوو بیکات و نانێك پەیدا بکات.... جا ئیتر خۆ ئەمەی لە ئیسلامدا دەکرێت لەگەڵ ئەوەی لەئەمریکا دەکرێت بەراورد بکەن! کە ئینسانێکی بە ئیمانی مەسیحی





دڵسۆزی خێر و ویست، وەك(ئابراهام لینکۆل) هەوڵیدا بۆ ئازادکردنی کۆیلە چەندین ساڵ هەوڵیدا، بەڵام ئەسەری چی بوو؟ چونکە دەیویست بە یاسایەکی بەزۆر هەرچەند ڕێنمایی زۆری دەکرد و کەسێکی دانیشمەند و بە ئیمان بەتەقوا بوو لە دیانەتی خۆیدا کە مەسیحی بوو، هۆشداریەکی زۆریان کرد و هێزێکی باشی ئاگادارکردنەوەیان لەدەستدابوو، بەڵام چونکە تەقریبەن ڕووبەڕوو بونەوەیەکی ناگاهانی بوو، داغڵی ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی تەحقیرانە بوو دەی لەگەڵ کۆمەڵگەدا بەو شێوەیە بەرخورد ناکرێت، بەڵکو دەبێت لەسەرەتا کۆمەڵگە موتەحەویل بکەیت سەیردەکەیت خودی(کۆیلەکان)زیاتر بەدبەخت بوون بەهۆی ئەم یاسایەوە! ئەو هەموو کوشت و کوشتار و ئازاردانە کە دوای دەرچوونی ئەم یاسایە دەستیان پێکرد لە پێشدا کاری وایان بەرامبەر بەردەکان نەدەکرد، ڕاستە لەوەو پێش وەك سیستەمی کۆیلایەتی دەیانکوشتن، بەڵام ئەمجارە بوون بە داخ لەدڵ دژی کۆیلەکان لەزەتیان لەوە دەبرد کە بەرنامەی ئەشکەنجەدانیان بۆ دروست بکەن...

ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵەش هێشتا باس هەر ماوە! هێشتا لە کۆمەڵگەدا جێگەی نەگرتووە، دەی لەوکاتەدا چی؟ لەوکاتەدا، چونکە بونیادی فەرهەنگی دەگۆڕێت،کە بریتییە لە(فکر، عەقیدە، ئەخلاق، شعور، عەواتف، ئیحساسات) وایلێدێت کۆیلەیەکی وەك(بیلالی حەبەشی)دەبێتە شەخصییەتی دووەم لەدوای پێغەمبەر(ﷺ)! دەبێتە گەیەنەری فەرمانەکانی پێغەمبەر بە تەواوی موسوڵمانان، دەبێتە زمان و موبەلیغی ئیسلام! بەڵێ کارێکی بونیادی بکرێت دەرئەنجامێکی ئاوای دەبێت،کارێکی غەیری بونیادی بکرێت، چونکە لەگەڵ میزاجی ئینساندا سازگار نییە ئاوای لێدێت.

# باسی پێنجەم:
# بنەما و سەرەتاكانی ئیقلابی فەرهەنگی و گۆڕانێكی ڕیشەی لە كۆمەڵگەدا.

باسی ئینقلاب یان(تەصفیەی) فەرهەنگی باسێكە دورودرێژە، و لە لایەن موسوڵماناناتەوە دیقەتی لەڕادەبەدەر و شەدیدی گەرەكە بە تایبەت دەربارەی: قسە كردنمان، ئەدەبیاتمان، هونەر،و زیندەگیمان، پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵكدا، هەرچی شتمانە دەبێت لە بێژنگی بدەین، ئەشێ پاڵفتەی بكەین، ئەوە وا پاشماوە فەرهەنگی دژی بەشەریە، پاشماوەی فەرهەنگی (شاهەن شاهی كۆنی ئێران)ەو دووبارە زیندو بۆتەوە و لە فەرهەنگی ئێمەدا وجودی هەیە دەبێت فڕەی بدینە دەرەوە، لەبەرئەوە بەڕاستی قسە كردن لەبارەیەوە زۆر درێژە دەكێشێت!

هەندێك لە باسە فەرهەنگییەكان زۆر گرنگەو پەیوەندی بە تەواوی موسوڵمانانەوە هەیە و موسوڵمانگەل دەبێت هەوڵی بۆ بدەن ئەویش ئەوەیە، كە ئەو (ناواندی) وا یادگاری (شاهەن شاهی ئێران)ی بەر لە ئیسلامە و ئەو مێژووە كۆنە زیندو دەكاتەوە، و بیرەوەری ئەو دەورانە پیسە تازە دەكاتەوە بۆ موسوڵمانگەل، ئەو ناوگەلە دەبێت لابرێت! ئەمە كاری گشت موسوڵمانگەلێكە، هەر موسوڵمانێك ئەگەر ناو خۆی، ناو خانەوادەگی، ناو منداڵەكانی، ناوی كەس و كاری، یادگاری ئەو مێژووە پیسەیە بكەوێتە هەوڵێ تەلاش بۆ گۆڕینی. بۆنمونە كەسێك ناوی (خوسرەو، پەروێز، فەرەیدون)ە




ئالـەم جۆرە ناوگەلـە... بکەونە هەوڵ و تەلاش بە جۆرێکی گـشتی ئـەم نـاوە پیسگەلـە لـەناو کۆمەڵەی ئێمەدا بچێتە دەرەوە، چونکە وەختێك منـاڵی مـن، خۆشەویستم، یا شەخصی خۆم ناوی یەکێك لـە (شاکانی ئێران) یـان یـەکێك لـە قارەمانگەلی ئەفسانەی ئێران کە یادگـاری دەورانـی (شـاهەن شـاهیی)ە و سیستەمی شاهەن شاهی بەر لـە ئیسلامە لـە ڕوومانەوە بوو ئەوە هۆی ئەوەیـە کە هاوبەستەگی ئێمە لـەگەڵ ئەو سیستەم و جۆری زیندەگیـەدا نەپـچڕێت و بەردەوام بێت! هەروەها ئەو سیـستەمە بتوانێـت لـە ڕێگـەی ئـەم عەناصـرە فەرهەنگیەوە کە هەیەتی لـەناو فەرهەنگی گشتی ئێمەدا هۆکارێك بدۆزێتـەوە بۆ تازە کردنەوەی ژیانی خۆی. وەك پێشتریش وتوومە "گیایەك هەرزە لـە نـاو بێـستانێکدا سـەوزەبێ، ئـەم گیـا هەڵدەکـەنی ئەگـەر ڕەگ و ڕیـشەکەی هەڵنەکەنی ئەم ڕیشەیەی کە خواردن وڤیتامین(تەزغییە) لـە گیا ئەصـڵییەکان وەردەگرن وردە وردە گەشە پەیدا دەکەن و دووبارە دەبنەوە بە بژاریێ قەوی کە گیا ئەصڵییەکە لـە بەین ئەوەن". هەر بەو جۆرە هەر ڕوداوێـك بەبۆنـەی عەناصری فەرهەنگی خۆیـەوە دەتوانێـت تەغزیـە بکـات لـە مەوجودییـەتی میللـەتێکدا و ئەو تان و پۆگەلـە وا هەیەتی ئەگـەر لـەناو فەرهـەنگی ئێمـەدا بمێنێت، ئاخری هەر زیندو دەبێتەوە، هـەروەك ئـەوەی کـە ئیـسلام (شـاهەن شاهی ئێرانی) لە لـەناوبرد و میللـەتی ئێـران گەشـتە ئـازادی و گـەورەترین ئازادییەك کە میللـەتی ئێران دەزگیری بوو ئەمە بوو، کە توانی حـەقی خـۆی لـە نووسینی، خوێندن بێرێتە دەس، ئەمە فرە ئازادییـەکی گـەورە بـوو، بـەڵام میللـەتی ئێران دەقیقەن تەعقیبی ئەم قەزیەی نەکرد کە هەرچی وابەسـتەگییە




بەفەرهەنگی كۆنەوە هەیە لە بەینی بوات، ئاخری دووبارە سەیردەكەین شاهەن شاهی زیندو بویەوە!

ئێسەشە براكانم! مەسەلەی ئینقلاب مەسەلەی شۆخییەك نییە! مەسەلەی ئینقلاب، كاتێك گەرەكمانە لە صەمیمانە و ڕیشەو جەدی بێ، ئەمە نییە دەستەیەك فەقەد دەستەیەك لە بەین بوات، تا .... ئەشێ فیكر و پاشماوە و فەرهەنگی و فكری ئەو لابەرێت لەناو كۆمەڵگەدا، ئینجا لەناوچونەكە ئەسەری هەیە، ئەگەرنا هەزار جار سیستەم و، حوكومەتێك لە ناوبەرە، تا ئەو سیستەم و حوكومەتە لە فكر و فەرهەنگی خەڵكیدا نفوزی هەبێ ئاخری دووبارە سەر هەڵدەداتەوە.

ئەم جۆرە شتگەلە ناو (ناوی خانەوادەگی) یەكێكە لە عەوامیلی ئەوەی كە ڕیشەی فەرهەنگە كۆنەكە تەغزییە دەكات لە ژیانی خەڵك و دووبارە ئەو گیا هەرزە سەوز بێتەوە. بەڵام كارێكی میقدارێك قورسە ئینسانگەل گشتیان بكەونە هەوڵدان و هەرچی لەو ناوە خراپانەیە كەبە خۆیانەوە یان منالّ و كەسوكاریانەوەیە بیگۆڕن، جا ئەمە ئەگەر بە تەشریفاتی ئیداری ئەنجام بدرێت زۆر درێژە دەكێشێت،{واتە ئەگەر بێت و هەموو ئەو ڕێگاو شوێنانەی لەڕووی یاسایی و ڕۆتینەوە پێویستە بگرێتە بەر بۆ گۆڕینی ناوێك، هەموو ئەوانە ئەنجام بدرێت كارێكە پێویستی بەكاتی زۆرە} ، زۆرێك لە برا ئیدارییەكانما لەم ماوەیەدا زەحمەتی فرەیان كێشاوە، خزمەتی فرەیان كردگە،

بە هۆی ئینسانیەت و زەحمەتی ئەوانەیە ئەمڕۆ* جەنابی (ئەزهاری) هەڕەشەی دەکردو کوتەکی دەدا بە زەویدا، ئەویش لەبەرئەوەی ئەگەر کەسێك لەوانەی لە دائیرەدا کاردەکەن نەڕواتە سەر کار حقوق (مەعاش)ی ئەوڕین و چی دەکەین و چی دەکەین ... هەرگ وەبان سەر ئەو میللەتە، وائیختیاری دەکەوێتە دەست یەك دانە نیزامی کە لە یەکەمین دانیشتنی (مەجلیس)دا ئێژێ "وەلاّ من لە سیاسەت بەڵەو نیم"، ئاخر ئەی دوا بڕیاگ، سیاسەت نافامی بۆچی هاتووی دەبیتە (ڕەئیسی دەوڵەت). ڕەئیسی دەوڵەت، واتە موجرییەی سیاسەت. هەر بەو جۆرە کە لە ئیعلامییەکانمدا وتوومە، خۆتۆ ئەچیت سیاسەتێك ئیجرا بکەی وەختێ نافامی کەواتە بۆت دەنووسن، سیاسەتت بۆ دەنووسن و ئیجرا دەکەیت. ئەوەیش هیچ! لەولاوە ئەوە بێشعور و نەفامە ئەوەنە نابەڵەدە لە قانون کە نەفامی (مانگرتن) ناوێتە هۆکاری دەرکردنی کارمەند، ناوێتە هۆکاری بڕینی حقوقی کارمەند(مەعاش). هەڕەشەی فەرمووە! "کە ئەگەر هەر کارمەندێ مانبگرێ، هەرکارمەندێ نەڕواتە سەر کار حقوقی ببڕن و لە کۆتایدا دەریکەن".

غەڵەتی فەرموو، مەگەر شارەزا نییە لە قانونی ئێران. بەڵێ، نیزام و حوکومەتەکە نیزامی قانونی نییە. قانون مەترەح نییە، بەلاّم کاتێك مەسەلە مەسەلەی هەزاران ئینسانە و تەواو کارمەندانی ئیداری گشتیان مانیانگرتووە،

---

* ) دیارە ئەم وتارەی (کاك ئەحمەد) لەسەرو بەندی ڕووداوی ئیقلابدایە و دەستەلاّتی (شاە) بەتەواوەتی نەڕووخاوە، بۆیە لێرەدا (کاك ئەحمەد) ئاماژە بەو هەڕەشەیە دەکات کە سەرۆك وەزیرانی حوکمەتەکەی (شاە) ئاڕاستەی فەرمانبەرانی دامەزراوە حوکمییەکانی کردووە.

ەڵەت دەكات، ئەم تەهدیدە ئیجرا دەكات! "ئەگەر كارمەندێ مانیگرت بێن قوقەكەی قەتع كەن".

راكانم! نیگەران نەون براگەلی ئیداری وا مەزانن ئەم هەڕەشانە هیچ كارێك دەكات، ئەم هەڕەشانە، وەك ئەو لەشكر كێشییە، هەروەك ئەوە لە سەرەتاوە خودی دەوڵەتی نیزامی هاتە سەر كارو گولەی موسەلسەل*(ڕەشاش)ی گرتە مەردم، كە ئەگەر مەردم قسە بكەن دەیان كوژم، بەڵام خەڵكی كاری خۆی كرد و بەردەوامی بە ڕووبەڕوو بوونەوەكانی خۆیدا، فەقەد بە تەغیری ڕەنگەوە. لە هەر وەزعێكدا جۆرێك و لە كۆتایشدا هەر شكستیان خوارد. هاتن زیندە بادیان دروست كرد هەر شكستیان خوارد. ئێستاش هەڕەشەی كردووە هەر شكست دەخوات، ئەڵبەتە ئەمە ئاخیرین ئیقدام(دەستپێشخەری) نییە كەمن لێرەوە ئێژمی ئیقدامی(دەستپێشخەری) جدی دەكەم بە ئومێدی خوای گەورە.. نیگەران نەون، موتلەقەن براگەلی ئیداری نیگەران نەون وا بزانن ئەم قسە موفتە كە (ئیزهاری)كردی قەرانێك دەهێنێت! كەمترین ئەرزشی نییە، ناتوانن هیچ غەڵەتێك بكەن. هیچ كاتێك ناتوانن بە عینوانی مانگرتن هەقی یەك نەفەر و فەرمانبەری ئیداری، حقوقەكەی (هەتا ئەگەر چوار مانگ مانبگرێت و كار نەكات) ناتوانن حقوقەكەی ببڕن.

جا بە لەبەرچاوگرتنی ئەمە، كە كارمەندگەلی ئیداری زەحمەت فرەیان كێشاوە و، ئینسانیەت فرەیان كردگە لەم بابەتەیشدا كە چاوەڕێی ئەوەدەكەم هەرچی زووتر بڕۆن و ناوە خراپ و بەدەكانی مێژووی ڕابردوو لە

---

*) جۆرێك ئامێری شەڕ گەرمە، كە فیشەك بە ڕیز دەدەقێنێت. تیرباران، ئاگرباران، شێستیر....

کۆمەڵگەی ئێمەدا لابەرن. کەسێك بەناوی (فەرەیدون و کۆرش)و ئەم جۆرە ناوە گۆڕ بەگۆڕە موتڵەقەن نەمێنێ و ناوگەلێك صەحیح و پەسەندیدە، ناوگەلی ئیسلامی جێگەیان بگرنەوە! ناو ئیسلامی واتە چی؟

واتە ئەمە کە یا خاتری ئینسانگەلی خاس زیندو کاتەوە، لە زەمانی زووتردا ناوی پیاوانێك باش بوو بێت، کە ئینسان بۆ منالی خۆی ئینتیخابی بکات، یان واتایەك خۆشی هەبێت، گرنگ ئەوە نییە ناو ئینسانگەلێ باش بێت، نا مەسەلەن کوڕ ناوبنێ (هەڵۆ)، واتە بە قودرەت، یان ناوی بنێ (شێر)، ناوی بنێ(پڵنگ) ئەمانە ناوی خۆش و ماناداریان هەیە! یان کەنیشك مەسەلەن ناو بنێ (شەتاو – ئاسۆ) ئەمانە ناوی ئیسلامین، واتە ئیسلام خۆشی تێ لەم ناوگەلە، خۆشی تێ لەناوێ یان خاترەی ئینسانگەلی باش زیندو بکاتەوە، یان وێنەیەك لە هەستیدا کە بگونجێت لەگەڵ پیاوا یا ژندا بێرێتە زهنی ئینسانەوە. ئەم ناوگەلە پێی ئێژن ناوی ئیسلامی، ئەو ناوگەلە وا خاترەی کۆنی ئێرانە گشتی بسڕێتەوە. جا ئەمەش پێویستی بەوە هەیە ئەو برایانەی لە بەشی ئامار کاردەکەن گەورەو بچوك هاوکاریمان لەگەڵدا بکەن، ئەگەر لە ڕێگەی ئیدارییەوە ئەم کارە بکرێت و ئەنجام بدرێت و، بچێتە دادگا و چەند مانگێك درێژە بکێشێ بە مورافەعەو ئستیدلاو شاهید کار ئەنجام بدرێت خەڵکی یاس (بێتاقەت) دەبن. داوام ئەوەیە لە براگەلا کارمەندگەلی ئامار! لێرەوە لە هەر شارێکی تردا کە خەڵکی ئەم مەتڵەبە دەرکەکەن و پێشوازی لێ دەکەن بە سورعەت کار بۆ خەڵکی ئەنجام بدەن. هەر کەسێك دەڕوات و گەرەکییە ناوەکەی بگۆڕێت، یان ناو خانەوادەگییەکەی بگۆڕێت بێ تەشریفاتی ئیداری (ڕۆتین) فەورەن بۆی ئەنجام بدەن. جا ئیتر ڕێگە چارەکەی لای خۆیانە چۆن

ئەم کارەیان بۆ ئاسان دەکەن، چونکە من شارەزا نیم و نازانم چوّن دەکریّ تا کاریّ وابکەن کەبیّ تەشریفاتی دوروو درێژی ئیداری ئەم داواکارییە لە مەردم قبولّ بکەن. داوام ئەوەسە زهنی خۆیان بخەنە کار تبقی زەوابت و قەواعیدێك کە هەسیان کارێك بکرێت کە مەردم فرە یاس نەویّ. مەردم پێشوازی دەکەن لە ئیدارەی ئامار، برۆن زوو ناوگەلی خۆیان و ناوگەلی خانەوادەگی بگۆڕن، ئەوانیش ئەم همکاریشە بکەن کە فرە بەپەلە ئەم داوایە ئەنجام بدەن و کاری مەردم بخەنە ڕیّ. چاوەڕێی ئەوەش لە خەڵکی دەکەم سەعاتێك لە کاتی خۆتان بگرن ئیشکالی نییە برۆن هەر ناوێك کەخاترگەلی کۆن زیندو دەکاتەوە لە تەرەف ئیدارەی ئامارەوە بیگۆڕن..

**ئینقلاب بۆ گۆڕینی فەرهەنگی ئەشرافی:**

لە بابەتی ئینقیلابی فەرهەنگیدا، دوو مەتڵەب زۆر گرنگ و ئەساسی و تەقریبەن فراوانە و کۆمەڵگەی ئێمەی گرفتار کردوە کە یەکجار گرنگە ئێستا ئاماژەیان بۆ بکەم:

**یەکەم: ڕەنگدانەوەی ئەشرافی لە زیندەگیماندا:** لەتەواوی زیندەگیمان لە بابەتە تایبەتی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

**دووەم: حاڵەتگەلی غەرب زەدەگی.**

لە بارەی ڕەنگی ئەشرافیدا، ئاماژە بە هەندێك شتبکەم، ئەوە وا ئێمە لە قورئاندا دەبینین لە بارەی حەرەکەتی تەئریخی بەشەرییەتەوە، لە بارەی ئینقلابگەلیّ دینییەوە تەماشا دەکەین کورت دەبێتەوە لەمەدا: کە جەماعەتێك ئەشرافی و خۆشگوزەران ئیستسماری خەڵکیان کردگە! ئەم ئەشراف و




خۆشگوزەرانە لە تەئریخی ئیسلامدا بەناوی دوژمنی خەڵك دەناسرێنەن.
بەناوی دوژمنی پێغەمبەران(علیه الصلاة والسلام) موستەكبیرین، موترەفین، یان ناوە گشتییەكە یان (مەلەء). ئەمانە بە درێژی مێژووكارێكیان كردگە لە رێگەگەلێ جۆراوجۆرەوە بە فرو فێڵگەلێ جیاواز، وورده وورده بەرهەمی رەنج و زەحمەت و تەلاشی خەڵك بێتە لای ئەوان، خەڵك تەنگی بێ، نارەحەت زیندەگی بكات، بەڵام ئەوان خۆشبگوزەرێنن!! با ئائەم نوكتە لە مێژووی ئیسلام بگەڕێنمەوە.
ئینقلابی ئیسلام وەك باقی ئینقلابگەلی دینی، جیهەتگیری كرد عەلەیهی ئەشرافییەت، ئەوە وا بە شێوەی ئەشرافییەت لە كۆشكی سەڵتەنەتەوە بیگرە تا سەرۆكی عەشرەتەكان، لە كۆمەڵگەكاندا دەبینرا هەوڵیدا هەمووی بسڕێتەوە و لەناوی ببات! جا شوكور بۆ خوای گەورە لە ماوەیەكی كەمدا ئینقلابی حەزرەتی رەسول اللە (ﷺ)،زۆر كاركرا و، لە پاشانیشدا لە سەردەمی (خولەفای راشیدین)یشدا كەم یا فرە جەرەیان تەعقیب كریا، بەڵام بەداخەوە زەمان زۆر نەگوزەریا خوگەلێ ئەشرافی، غەفڵەتگەلێ ئەشرافی ورده ورده هاتەوە و ڕووی كردەوە ناو كۆمەڵگە، یەكێك لە سیفاتی ئەشرافی كە ئیسلام نەفرینی دەكات ئەمەیە ساختمان(بیان)ێك ڕازاوە تربێت لە ساختمانی موتەوەصیتی زیندەگی مەردم! مەردم بە شێوەیەكی ئاسایی چۆن زیندەگی دەكەن حەدی موتەوەصیتی زیندەگی خەڵك هالە چی حەدێكدا، ئینسان ساختمانی خۆی لەوە ئەشرافی ترو ڕازاوە تر دروست بكات، جۆرێك بێت كە حەد(سنور)ی موتەوەصیت(ناوەڕاست)ی زیندەگی خەڵكی نەتوانێ دروستی بكات. ئەمەش لە نەزەری فیكر و شارستانییەتی ئیسلامییەوە شتێكە

نەنگین و خوێن تاڵ لەناو کۆمەڵگەدا. دیقەت بکەن ئەگەر یەك نەفەر لەناو شەقامدا بچێتە بە ڕێگەدا دانەیەك (کلکە ڕێوی) بکاتە بان سەریدا و چەند ئاوێنە و زەرق و بەرق بەم شان و ئەو شانیدا ئاوێزان بکاتەوە!! ئائەمە لەنەزەر خەڵکیدا شتێکی خوێن تاڵ و خراپە. لەبەر چی؟! چونکە فەرهەنگی کۆمەڵگە شتی بەوشێوەیە قبوڵ ناکات! ئێستا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا جۆرەها کۆشك و زوڵم و ئیستیبدادگەل دەبینین، بەڵام چ خوێن تاڵ نییە !چ فرەیەك لە ئینسانگەل نەفرینی ناکەن و قیزیان لێی نارشێتەوە ئارەزوو دەکەن و دەڵێن" ئاخ من شتێکم بوایە وەك کۆشکی سەعد ئابات، ئاخ شتێمکم بوایە وەك کۆشکی مەڕمەر، شتێکم بوایە وەك ماڵی فلانە ئەشراف" ئەوە لەبەر چییە؟ لەبەر ئەوەیە کە فەرهەنگمان نەخۆش کەوتووە و ئالودە بووە! ئەگەرنا لە فەرهەنگی ئیسلامیدا ئائەو (کۆشکانە) مەزهەری بێشەرەفی و خوێن تاڵییە (موسوڵمانەکان ئەم فەهمە لە خۆتاندا زیندو بکەنەوە، کاتێك دامودەزگایەك ئەشرافی دەبینن بە شێوەیەکی ئایدیاڵ کە ئارەزوی بکەن تەلەقی مەکەن، بەڵکو بەشێوەی لەکەی لەنگیەك، خراپەك بێتە بەر چاوتان).{وەك ئەو کەسانە مەکەن}، کە ئەچوون بە حەماسەت سەراییەوە (بە حەماسەتەوە) وێنەیان دەگرت، مەسەڵەن لە تەختی جەمشید، یا مەسەڵەن لە تاقی (مەداین)! نیشانیان دەدا بە مەردم کە "سەیربکەن بکەن گوزەشتەی ئێمە چەنێك پڕ ئیفتیخار بووە"، ئەمە لە چی کاتێکدا؟ بەناو ئیفتیخار دەکرێت نیشان بدرێیەن؟ لە کاتێکدا فەهمی خەڵکی ئەوەنە دژی دینی بێ کە ئەشرافییەت بە گەورە بزانن، بە ئیحتیرام بزانن، بە ماقوڵی بزانن، بەڵام کاتێك فەهمی دینی زیندوو بوو ئەشرافییەت، واتە نیشانەگەلێك لە خیانەت،

واتە نیشانەگەلێ لە دووشمنی بەرامبەر بە خەڵك، نەك واتە لە فەرهەنگی کۆمەڵگەی ئێمە هەرکەسێ زیندەگی ئەشرافی بێت ئەوە دوژمنی خەڵك بێت، نا... ئەساسی ئەشرافییەت دوژمنییە لەگەڵ خەڵکدا، جا لەناو کۆمەڵگەدا پەیوەندییەك نیزامێك پیادە دەبێت، خەڵکانێك خۆشی گەرەك نییە خیانەت بکات، مەبەستی نییە خیانەت بکات، بەڵام نیزامە ئیدارییەکە وای لێ دەکات مەسەڵەن فلانە کەس، کارمەندێکە موچەیەکی زۆری هەیە و لە ئیدارەیەکدا دامەزریاوە حقوقی زۆری هەیە، خێزانەکەشی بەهەمان شێوە حقوقی زۆری هەیە و مانگی (پانزە، بیست، چل، پەنجا هەزار تمەن) موچە وەردەگرن، ئەگەر تەخەصوصاتێکیان هەیە ئاساییە، مانگێ (پانزە بیست هەزار) تمەن لە سەتحێکدا، (چل پەنجا هەزار تمەن) لە سەتحێکدا زیندەگی ئەشرافی دروست دەکات، ئەو شەخصە خەتای نییە، ئەو شەخصە ئەگەر سودوەردەگرێت لە ئەم پولێ و حقوق و دەرامەتە و دێت ماڵی ئەشرافی و زیندەگی ئەشرافی پێ دروست دەکات، ئەو کەسە زاتەن موقەسیر نییە لە کارەکدا، بەڵکو (سیستەمی کۆمەڵگە و پەیوەندی ئابووری کۆمەڵگە) کەسیف و چەپەڵە وا ئەو شەخصە دەتوانێت وا بکات!! چۆن؟

بۆ نمونە کرێکار یان کارمەند لەو کارگە یان لەو دامەزراوەدا کار دەکەن ئەو موهەندیسە یان ئەو تەکنیککارە، یان ئەو موتەخەصیصە کار دەکات، سیستەمی ئیداری مەملەکەتەکە وای کردوە کە حقوقی کەم دەدرێت بەکارمەند، حقوقی کەم دەدرێت بە کرێکار، و خزمەتگوزارەکان، بەڵام حقوقی فرە دەدرێت بە فلانە موتەخەصیص، ئەمە سیستەمی کۆمەڵگەکە وایکردووە نەك ئەوەی ئەو موتەخەصیصە خائین بێت! نا ئەو موتەخەصیصە





لەم كارا خیانەتی نەكردوە، بەڵكو سیستەمی كۆمەڵگە خەتابارە. صەدها ئینسانی زەحمەتكێش دەبێت بەرهەم و زەحمەتیان بچێتە گیرفانی فلان دەوڵەمەندەوە، بۆیە ئەمە مانای ئەوەنییە ئەو كەسەی كە ئێستا دەوڵەمەند بووە لە ئەم سیستەمەدا خۆی خیانەتی كردبێت، ئەصلی سیستەمەكە بەوشێوەیە دامەزریاگە كە وردە وردە لە ڕێگەگەلی موتەخەلیفەوە بەرهەمی دەسترەنج و زەحمەتی مەردەم بدزرێتەوە، مەسەلەن ئەگەر لەو واحیدە تەولیدیا (یەكەی وەبەرهێنان)دا لەو دامەزراوەیەدا، (سەد) نەفەر كاردەكەن ئەگەر لە پەیوەندی ئابووری سالمی ئیسلامیدا حەساب بكرێت لە ساڵێكدا (۱۰۰ ملیۆن تمەن) خەرج دەكرێت لەم دامەزراوەیەدا، ئەشێ بفەرموون هەركام لەم خانەوادەگەلە (میلیۆنێكی) پێ بدرییەت، ئەگەرنا مەسەلەن (۱۰ هەزار، ۲۰ هەزار، ۵۰ هەزار)دەدەن بە هەندێك لە خانەوادەگەل، بەلاّم بەیەكێكی تر لە خانەوادەكان (۲میلیۆن، ۳ میلیۆن) دەدرێت، ئەمە دەبێتە هۆكاری ئەوەی هەندێك كات زیندەگی ئەشرافی بۆ ئەشخاصێك دروست دەبێت! بەلاّم ئەوەنە گرنگە ئێمە بزانین لە ئەساسدا زیندەگی ئەشرافی ڕەمزی خەیانەتە، خۆی زاتەن. زاتەن خەیانەتكریاگە لەم كۆمەڵگەیە!!

بۆچی لە كۆمەڵگەدا هەندێك كەس ماڵەكەی (مەڕ مەڕە) و هەندێكیش ئەصلەن ماڵی نییە تێیدا دانیشێت؟! كابرا(۶۰ ساڵ ۷۰ ساڵ)تەمەن دەكات هێشتا هەر كرانشینە!! لەملاو لەولاوە. دەبێت هەر خەریكی ماڵەو ماڵ و مەحەلە و مەحەلە بێت و باربكات. ئەمە پەیوەندی فاسدی كۆمەڵگەكە كارێكی كردگە كە ئەم كارە حقوقەكەی دزراوە و دراوە بە كابرای ئەشرافی (جا مومكینە فلاّنە شەخصی ئەشرافی كە ئێستا زیندەگی ئەشرافی دەكات

خـۆی ڕاسـتەوخۆ نەیـدزیبێ مومكینـە فـلان كـەس زینـدەگی ئەشـرافی دروسـتكردبێت، بـەلام خـوی ڕاسـتەوخۆ خـەتای نـەبێت! كـە صـەدمەی گەیاندبێتـە ئـەو میللەتـە فـەقیرە وا(٦٠، ٧٠ سـالٚ) تەمەنەكـەی هـەر بـە كوێرەوەری و دەردسەر ئەژین، بەلام واقیعیەتی مەتلەب ئەمەسە، ئەگەر چـی ئـەو شەخـصە خـۆی خـەتای نییـە كـە ( ٤٠ – ٥٠) هـەزار تمـەن موچـە وەردەگرێت، یا (عایداتێك) فرەی هەس لـە سیستەمی بازرگـانی مـەوجودا و دەتوانێ مالێ ئەشرافی دروست بكات. بەلام دواجار ئەوە خـانووی خـەلكی كاگلێیە(خۆلە)، و مالەكەی ئەو ئەشرافیە ئەوە واتە ئەم مالـە (كـا گلێیەیـە) چووە لـەو مالە ئەشرافییەدا سەرف كریاگـە!!! واتـە ئەگـەر ئـەم دوو مالـە هەركام (١٠٠٠ تمەنیان) تێدا خەرج بكریایـە، ئـەم دانەیانـە (بیـست هـەزار تمـەن)ی تیـا خـەرج كـراوە و (هەشـتا هـەزار)ەكـەی چـووەتە سـەر ئـەو مالەئەشرافیەو لەوا خەرج كراوە. بۆیە ئـەو مالـە ئەشـرافیە (هەشـتا هـەزار تمەنی) هی مالە فەقیرەكەیە.

بۆنموونە، دوو دانە مالٚ هەن لـە نیزامـی ئیقتیـصادیدا ئـەم مالـە هـەركام (٥) نەفـەر خێزانیـان هەیـە، بـۆ نـانی نیـوەڕۆ (یـەك كیلـۆ گۆشـت) لـە بـان سفرەكەیانەوە بێت لە نیزامی ئیقتیصادی ئیسلامیدا ئەشێ وابێ (ئاو گۆشتێ) دروستبكەن بە (یەك كیلۆ گۆشت)، بەلام تەماشـا دەكـەین لـە یـەكێك لـە مالەكاندا (كیلۆیەك گۆشت) دروست كریاگەو (هێلكەو ڕۆنێكـیش) ئـەوەتا لە پالێدا، بێگومان كاتێك (هێلكەو ڕۆنێـك) ئیزافـە بـووە بـۆ ئـەو (كیلـۆ گۆشتە) ئەشێ ئەم مالەی تر لـە (كیلۆ گۆشت)ەكەی كـەم بووبێتـەوە{واتـە ئەو مالەی تـەنها (كیلۆیـەك گۆشـت) لەسـەر سـفرەكەیانە ئـەو مالەكـەی





تردەبێت (سێچارەك گۆشت و هێلكەورۆنێك) بێت، چونكە ئەوان (هێلكەو رۆنێكی) زیادەیان هەیە}، تا ئەم ماڵەی تر لە (كیلۆ گۆشت)ەكەی كەم نەكات ئیمكانی نییە دانەیەك (هێلكەو رۆن) ئیزافی بێت، لە تەواوی مەسائیل ئیقتیصادی كۆمەڵگەدا بەو جۆرەیە! ئەشرافییەت نیشانەی ئەوەیە لە رێگەگەلێ راستەوخۆ و ناراستەوخۆوە دزی كراوە ز خیانەت كریاگە لە ئەفرادی كۆمەڵگە! زۆرێك لە خانەوادەگەلی فەقیركەوتون و مەزلوم بوون، بێ تان، بێ زندەگی، بێ ماڵ و رووت وە حقوقی ئەمانە چووە لەولاوە وەك (قارچك) هەڵتۆقیاوە، بۆتە ماڵگەلی ئەشرافی! بووەتە زیندەگیگەلی ئەشرافی! بەو تەرتیبە دووبارە تەئكید دەكەمەوە نە بەمانای ئەمە یەكە یەكەی ئەم ئینسانگەلە خۆیانن خائین، نا ...سیستەمەكە خائینە، سیستەمەكە كاری بەوشێوەیەی كردووە كە بەشێوەیەكی ئاسایی حقوقی مەردم نەگاتە دەست مەردوم. ئەشێ مەسەلەن (١٠٠)دانە جۆگە دروست بكرێ هەركام (هێكتارێ) زەوی لەبەردەمیدایە تاوەكو ئاوداری بكات، ئەم (١٠٠) دانە جۆگە مەسەڵەن هەر دانەیەكیان (٢ ئینج) ئاو ببەن بۆ سەر هێكتا زەوییەكە، سیستەمی حوكمەتەكە ئیقتیصادێكی وا ناسالم دروستی دەكات لە جیاتی ئەم (١٠٠) دانە جۆگە ئەڕوات سیستەمەكە هەمووی تێك دەدات بەسەر یەكاو نا عەدالەتي دروست دەكات....

بۆیە كاتێك ئەشرافی دەبینن ئەشێ پێ بكەنن و مەسخەرەتان لێبێت، ئابەو جۆرە فەهمی ئیسلامی لە رووی پەیوەندی ئابوورییەوە جێگەی ئەم فەهمە خراپە بگرێتەوە، كە لە كۆمەڵگەی ئێمەدا بوونی هەیەو هەرچی كەسە هەوڵەدات بەشكوم زیندەگییەكەی خۆی بێتە ئەشرافی، بەشكوم ئەمیش

بتوانیْ بگاتە فلاْنە ئاغاو فلاْنە ئاغا پلە پلە تا دەچێتە ژوورەوە! ئەم فەهمە لەتەك دەركیْ صەحیحی ئیسلامیدا سازگار نییە! ئەوە بزانن كە كەسێك كە دەركیْ صەحیحی ئیسلامی هەبێت كاتێك زیندەگی ئەشرافی ببینێت قیزییەتەوە، چونكە دەزانیْ ئەوە شوێنی خیانەتە، ئەوە شوێنی دزییە، ئەوە شوێن كلاْو نانە سەرە، جا چی خودی ئەو شەخصە دەخاڵەتی تێدا هەبێت، چی دەخاڵەتێكی تێدا نەوێت و خەتای دەوڵەت بێت. دەی بزانن چۆن كارێكیان كرد ئەم فەهمە ئیسلامییە لە بەین بچێت، ئەم دەرك و شعورو ئیسلامییە لە بەین بچێت، كە مەردم وەزیفەیان ئەوەسە قیزیان بچێتەوە لە زیندەگی ئەشرافی، كارێكیان كرد كە مەردم قیزی نەچێتەوە لییْ و خۆشەویست بێت بۆی، چۆن؟

ئەگەڕێینەوە بۆ مێژووی سەرەتای ئیسلام حەزرەتی ڕەسول الله(ﷺ) مزگەوتی دروست كردووە تەماشا دەكەین، مزگەوتێك كە خودی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەلاْن دروستیانكردگە هەروەك زیندەگی ماڵی كرێكارەكانە! نمونەی ماڵێكە كە كرێكارەكان هەیانە و هیچ فەرقێكی نییە. لەوەودوا زەمان ئەگوزەرێت وردە وردە وەختێك تەماشای مزگەوتەكان دەكەین، هەی هو.... چیی بۆتە شتێكی تر، ئەوەڵین خەیانەتێك كە ئەوانە وا فەرهەنگی ئیسلامییان گۆڕی و كردیان بەرامبەر بە كۆمەڵگەی ئیسلامی ئەمە بوو كارێك بكەن، هەتا مەراكیزی ئیسلامی (سەنتەرە ئیسلامییەكان) ئالودە بكەنەوە بە ڕەنگی ئەشرافی! كاتێك موسوڵمانگەل هەمیشە سەنتەری دینیان، هەمیشە مزگەوتگەلییان ڕەنگی ئیسلامی بووایە، كێشەبوو خوی ئەشراف پەسەندی، خوی ئەشرافییەت لەناو مەردما جیْ بگرێت، چیان كرد؟

بەنی ئومەیە، بەنی عەباس، هاتن مزگەوتگەلێکیان دروستکرد ڕێك لە شێوەی کۆشکی خۆیان، سەیربکەن چی خیانەتێك گەورە؟! ئیسلام ئێژێ نەمێنێ، ئێژێ بەدە، ئێژێ ئاوڕو چونە ئەشرافییەت. ئەو ئاوا حەق دەسێنێتەوە لە ئیسلام، ئێژێ دەبێت سەنتەرە دینییەکەی خۆت ئالودە بکەم. ئیسلام ڕەنگی ئەشرافییەت و کۆشکەکانی ئەوی لەبەین برد، بەڵام ئەو هات مزگەوتگەلی ئیسلامی بەشێوەی (کۆشك) دروست کرد. ئا ئێستا تەماشا بکەین بەسە بۆ نیشاندانی گەڕانەوەی فەرهەنگی کۆمەڵگەی ئیسلامی، بەسە بۆ نیشاندانی ئەمە کە موسڵمانگەل چەنێك لە فەرهەنگی ئیسلامی دور کەوتونەتەوە! تەماشای (مسجد حرام و مسجد نبی) بکەن لە مەککە و مەدینەدا.

هەرکەس دەڕوات تەماشای (بەیت) دەکات، تەماشای (مسجدی نبی) دەکات وەلا لە (کۆشك)دەچێت!!. بۆچی حەزرەتی ڕەسول الله(ﷺ) ئیجازەی ئەدا ماڵی موسوڵمانگەل ئاوا خەرج بکرێت و وەك (کۆشك) دروست بکرێ ؟ بۆچی تەواوی خەڵك دەیتوانی ماڵی بەو جۆرە هەبێت ئائێستا بێیت بەناو مزگەوت بەناو سەنتەری دینی ئەم شتە ئەشرافییە دروست بکرێ؟ ئائەمە یەکێك لە خیانەتگەل بوو کە (بەنی ئومەیە و بەنی عەباس)، یانی ( ئومەیەگول و عەباسیگەل) دەستیانپێکرد بۆ لەبەین بردنی خصوصیاتی فەرهەنگی ئیسلامی.

کاتێك مزگەوتە گەورەکان، سەنتەرە ئیسلامییە گەورەکان وورده وورده ڕەنگی فەرهەنگی ئیسلامی ون دەکەن و ڕەنگی ئەشرافی دەگرێن ئیتر ئاساییە خوێن تاڵ نابێ لەبەر چاوی خەڵکی {ئیتر ژیانی ئەشرافی خوێن تاڵ و نابووت دەرناکەوێت لەبەرچاوی موسوڵمانانەو، چونکە ئەوانە مزگەوت و سەنتەرە

دینییەکانیان بەوشێوەیە ئەشرافی دروست کراوە!!}. کاتێك خەڵکی دەچنە(مسجد الحرام) دەچنە(مسجد النبی) ئەم گشتە زەرق و بەرقە ئەوێنن ئێژن(ماشا الله، اللهم مصلی علی محمد وعلی الە محمد). خوێن شیرین ئەوێت لە بەر چاویان!!! نمونەیەك بچکۆلە بگێڕمەوە، لە (مەشهەدا)بووم چوین بۆ زیارەتی حەزرەتی (ڕەزاق). پێشتر ئەوە بڵێم، (کە زۆر تر بت پەرستی و شرکە ڕۆینی ئێمە بۆ زیارەتی ئەمانە، زیارەت ئەوەسە کە دەڕۆیت دوعای خێر دەکەیت بۆ ئەو شەخصە کە مردووە. بۆ ئەمە کە بتوانی ووردە ووردە ڕۆحییەتی خۆت مونتەبق بکەیت لەگەڵ ڕۆحییەتی ئەودا، لەگەڵ خصوصیاتی ئەودا، نە ئەوە بچیت داوای خێری لێبکەیت، ئەمانە کوفرە، ئەمانە شیرکە).

بەهەر حاڵ چوین بۆ زیارەت حەزرەتی (ڕەزاق)، کاتێك هاتمە دەرەوە، بەچاوی خۆم عەیان، عەیان چاوم پێوە بوو، جوانێك خوێنەوار و تێگەیشتو وەخکاتێك خەریك بوو ئەهاتە دەرەوە بەبێ ئەدەبی ئەزانی پشت هەڵبکات لە حەزرەتی(ڕەزاق) بچێتە دەرەوە. بەڵام تەماشام کرد نەء، چاوی ئەڕوانێت بۆ گومەزییە تەلاَکە (ئاڵتون) و سەردائەخات، بەڕاستی ئیتر وەك عەین ئەمە بوو لە قاڵبی کەلیما ئەم مەعنا ئەدا بکرێت، کە بەبێئەدەبی دەزانی پشت لە ئاڵتونەکان بکات، وەسەری دائەخست. خۆ دیار نەبوو خودی قەبری حەزرەتی (ڕەزاق) کوێ کەوتووە، بەڵام چاوم بەچاویەوە بوو ئاوا سەری لە بەرامبەر گومەزییە ئاڵتونەکانەوە دا ئەخست!!

ئاوایان کرد کە مەردم لە فەرهەنگی ئیسلامی بێگانە بکەنۆ. ئینسانگەلی موقەدەسی گەورە بێرن، قەبرەکانیان بێرن بە پەسترین نەوعی ئەشرافیەت





بیرازێننەوە. ئەمە یەكێكە لە حەقائیقی مێژووی ئیسلام. حەزرەتی (علی) (كرم الله وجهه) یەكێك لە مەئموریيەتگەلی ئەمە بووە، ساڵی یەكجار حەزرەتی ڕەسول الله(ﷺ) دەستوری پێ فەرمووە بڕۆ بگەڕێ بە قەبرسانەكانی موسڵمانانداو بزانە ئیمتیاز لەناو قەبرسانگەلا نەوێ، ئیسلام ئێژێ لەناو زیندوگەلدا ئیمتیاز نەوێ، چ جای بڕۆی لەناو مردوگەلیشدا، بڕۆی مەسەڵەن مردووەكەی خۆت برازێنیتەوە بە سەكۆ و ساختمان و بەزەرق و بەرق!!

حەزرەتی(علی) ساڵی یەكجار چووە سەردانی قەبرسانی كردوە، ئەگەر دانەیەك كوچكێكی ئیزافی، زەڕەیەك ئیمتیاز بۆ قەورێك هەر ئینسانێك بێت لای بردوە و قەبرەكانی وەك یەك لێكردووە، ئەمە بەرنامەی ئیسلامە. جا تەماشا ئەو بەرنامە لەكوێ، و ئەمە لەدوای حەیاتی پێغەمبەر(ﷺ) دوای مودەتێك دەوران ئەگوزەرێ لە كوێ؟! بزانە هەتا بۆ خودی مەرقەدی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خودی(مسجد النبی، خودی مسجد الحرام) چیان كرد؟ چۆن ڕەنگی ئەشرافیان هێناوەتەوە؟!

بە درێژای مێژووی چەندین سەدە، و لەوەودوا تەماشا بۆ قەبری ئینسانگەلی گەورە، ئاخر ئەگەر ئەم ئینسانە گەورەو موقەدەسە زەخیرەكردن ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ﴾ * تان بیستوە، خوای گەورە لەعنەت دەكات لەو كەسگەلە وا سەروەت پاشەكەوت دەكەن و لەدەس مەردمی دەرەكەن، خصوصەن تەلاو نوقرە(زێڕو زیو) ئەم ئینسانە، ئینسانێ گەورەیە واتە لە

* ) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيراً مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ } التوبة٣٤




ڕووی ئیسلامەوە پیاوێکی گەورە بووە. ئێستا تۆ ئێژیت تەلاّو نوقرە پاشەکەوت ئەکەیت بەسەر قەبرسانەکەیەوە؟! تۆ دێیت ساختمانی ئەشرافی دروست ئەکەیت بە عینوانی مەقبەری؟! بزانن چی خەیانەتێك کراوە بە فەرهەنگی ئیسلامی!

کاتێك کابرا دەچێت بۆ زیارەتی یەکێك لە پیاوانی ئیسلام چەند ڕەنگەلێ ئەشرافی دەبینێت. دەچێت بۆ گەورەترین مەرکەزی شارستانییەتی ئیسلامی: کە بریتییە لە (مسجد نبی لە مەدینە و مسجد الحرام لە مەککە)، چەنێك ڕەنگەلێ ئەشرافی دەبینێت، چکە، چکە لە خۆیەوە عەلاقەیەك پەیدا دەکات بەو ڕەنگ و خصوصیاتە. واتە ئەشرافییەت مەقبول و مەتبوع ئەوێت بۆی! لە جیاتی ئەمە خوێن تاڵ و خراپ بێت بۆی!! ئەگەر کۆمەڵگە کۆمەڵگەی ئیسلامی بوایە، ئەگەر مسجدەکان گشتی مەسجدی ئیسلامی بوایە، ڕەنگی ئەشرافیەت نەبوایە، فرە ئاسان بوو بە مەردم بێژی"لە هەر کاتێکدا نیشانەیەك لە ئەشرافییەت دەبینن قیزتان لێی بیێتەوەو نەفرینی بکەن"، بەلاّم هەی هاوار، بەم مەردمە چۆن بێژی کە تۆ نەفرینی ئەشرافییەت بکە لە کاتێکدا هەرچی سەنتەری دینی هەیە خۆیان وان!! ئاه .سەیری ئەم مزگەوتە ئەمە گشتی ئاساری ئەشرافییەتە پێیەوە، ئەمە گشتی خیانەتە بە فەرهەنگی ئیسلامی. فەرهەنگی ئیسلامی تێکدراوە.

جا براو خوشکەکانم! ئەوانە تا ئیسە ئەنجام دریاگە موشکلە بۆ ئێمە کە گەرەکمان بێ بیگۆڕین، بەلاّم بەلایەنی کەمەوە جارێ فکرەکەی خۆمان بگۆڕین لە هەر شوێنێکدا دەبینین ئینسانێك جلێکی فرە ئەشرافی لە بەردایە، دەبینین خانمێك مەسەلەن، موسیلەی چەند (صەد هەزار تمەنی) لە دەستدایە،

یا مەسەلە ئاغاییی دوا بڕیاوەکەی (بانکی صادرات) کلکەوانەی(٢٧٠ میلیۆن تمەنی) لەدەستدایە، لە هەر کاتێکدا مەزاهیرێك لەمە دەبینین قیزمان بێتەوە، نەك ئەوەی چاومان ئەبلەق بێت و زاقبینەوەو بە تەحسین و سەرسوڕمانەوە تەماشای بکەین. بەسەر سوڕمان و گرنگییەوە سەیری ڕوخساری ئەشرافی مەکە.

ئەوە بزانن خەڵکی یەك تەمەنە مەعلولی فەرهەنگی غەیر ئیسلامین، ئەگەر فلانە ئینسان موسوڵمانی بە ئیمانێ بە صەفاو صەمیمی دەبینیت کە تەماشای دەکەی ماشا اللە پانتۆڵی ئوتو کراو، ماشا اللە یەخەیی ئوتو کراو. ماشا اللە بۆینباخ ، (دوور لە ئیسە. وەك پانزە یان بیست ساڵ لەمەوبەر خۆم). نمونەی جوان پۆشی دەبینیت قیزت لێی بچێتەوە*. نە ئەوەی کە بە تەحسینەوە تەماشایی بکەیت. کە ئەو جۆرە سەیر کردنەیە دەبێتە مایەیی ئەوە کە ئەو ئینسانە حەزەکات و لەزەت دەبات لەو جل و بەرگە پڕ زرق و برقەی پۆشیوییەتی.

ئیستا لەم دانیشتنەدا زۆرێك دەبینم و چاوم هاپێیانەوە ئینسانگەلی واقیعەن بە ئیمانن، بەڵام غەرق بوون لەناو فەرهەنگی ئەشرافییەتی کۆمەڵگەدا، ئێستا

---

* ) لێرەدا پێویست دەکات ئەوە ڕوونبکەینەوە، کە مەبەستی (کاك ئەحمەد) ئەوەنییە کە ئێمە لەگەڵ خۆ جوانکردن و جوان پۆشیدا نەبین، وەك بەداخەوە کە هەندێك لە موسوڵمانان لێی حاڵی بوون و خۆ ڕێکخست و تەنسیقکردن بە شتێکی نا ئیسلامی دەبینن لە کاتێکدا ئیسلام نەفی پێچەوانەکەی دەکات، بەڵکو مەبەستی (کاك ئەحمەد) ئەو ئیسراف و پارە خەرج کردنەیە کە هەندێك لە موسوڵمانان دووچاری بوون و بۆ کڕینی تەنها (کراسێك) پارەی سێ کرس خەرج دەکەن، هەروەها مەبەستی ئەو ڕۆحییەتەیە کە لە ناخی ئینساندا دروست دەبێت و بەو ڕۆحییەتە ئەشرافییەوە دێت و جل و بەرگ دەپۆشێت و ڕەوت و ڕێگا دەکات....




چاوم هاوە ناو چاویانۆ، غەرق بوون و ڕێگەیان ونكردوە، لە هەمانكاتدا نمونەی ئینسان و صەداقە و پاكین. ئەوانە وا بیردەكەنەوە كە عەیبە ئەگەر دەچنە زانكۆ، ئەگەر دەچنە ئیدارە، ئەگەر دەچنە قوتابخانە، ئوتوی پانتۆڵەكەیان ناتەواو بێ عەیبە، یەخەكەیان ئوتو نەكرابێت، عەیبە چاكەتەكەیان پاك و تەمیز نەویێ، ڕاسیشەكەن واقیعەن عەیبە، بەڵام تەكانێكی گەرەكە، بێن مەردو مەردانە ئەم تەكانە هەمووتان دەستپێبكەن.

براكەم! دەستوری ئیسلامی ئەوەیە ئینسان هەرچی دەڵێت بە خەڵكی، سەرەتا خۆی دەست پێ بكات بەڕاستی كام لەناو ئێوەدا جل وبەرگی زۆر ئشرافی ترە، جل وبەرگی من (١٥-٢٠ ساڵ) لەمەوبەر لە گشتان جوانتر و، ئاوڕو بەرتر بوو! لە گشتان زیاتر دژی ئیسلامی بوو، بەڵام لەبیرتان دێت كەسانێك كە دەمناسن لەساڵی(١٣٤٣) (١٩٦٣) هاتومەتەوە ئێرە{مەبەستی كاك ئەحمەد لە (سنە)یە بۆ زیاتر خوێندنەوە لەم بارەیەوە بگەڕێرەوە بۆ (كتێبی یەكەم)*} لەسەرەتادا وردە وردە شەرواڵم كردە پێم، ئەویش لەناو ماڵی خۆماندا، هێشتا كۆمەڵگە هەزمی نەدەكرد، و دەیانووت"عەیبە تۆ لە ناو ماڵدا بۆچی شەرواڵ ئەكەیتە پێ؟!"

هەتا ئەمەیان دەووت "عەیبە خەڵكی بە چێوارت دەزانن".. دەی باشە با چێوار بن چ عەیبی هەیە؟! لەوەو دوا وردە وردە لە ماڵ هاوردمە دەرەوە و بەردەرگا، ناو بازار سەرجادە... دەی وردە وردە ماڵی دراوسێكەمان، ماڵ خزمەكانم، ماڵ ڕەفیقەكەم. وردە وردە ئیدارە، وردە وردە ئەم شارو ئەو شار.

---

* ) سەرووت عەبدولا: كاك ئەحمەدی موفتی زادە و دەروازەیەك بۆ خەباتێكی نەناسێنراو(كتێبی یەكەم)، چاپی یەكەم ٢٠١٠، چاپی دووەم ٢٠١١.

لەكۆتایدا شكور بۆ خوا دەبینم لە (١٤، ١٥سالْ)ە فرەیەك لە گەنجان شەهامەتیان پەیدا كردووە، خوێنەوار و مامۆستای زانكۆم، پزیشك با شەخسیەت لە كۆمەڵگەدا پێیان عەیب نییە جلی كوردی دەكەنە بەر!! دانەیەكی تریش تەكان بدەن، بەتاییەت ئینسانە پێش ڕەوەكان ئەوە وا زەرق و بەرقە و ڕەنگی ئەشرافیەتە لای بەرن. چونكە بزانن لە نەزەری ئینسانی وەك مندا و لە نەزەر هەركەسێكدا كە ئاشنایی بە فەرهەنگی ئیسلامی هەبێت ڕەنگیی ئیشرافیەت خوێن تاڵە، ڕەنگی ئیشرافیەت نیشانەی دزی و خیانەتە، هەرچەندە ئەو كەسە خۆی خەتای نەوێت، بەلاّم لە كۆتایدا دزی و خەیانەتی كۆمەڵگە بووەتە هۆكاری ئەوەی ئەفراد ڕەنگی ئەشرافییەت پەیدا كەن. بۆ گوزەشتەمان لەمەولاو وردە وردە تەلاش ئەكەین، بەلاّم بۆ ئایندە هیمەتی ئینسانی پێشڕەوی گەرەكە، فلاّنە خوێنەوار بكەوێتە پێشەوە و كراس و شەرواڵەكەی وەك من بێت، فلاّنە مامۆستای زانكۆ كە نمونەی شەخصیەت و موسوڵمانیە لەناو خەڵكدا بكەوێتە پێشەوە و رەنگی ئەشرافییەت لە خۆی بكاتەوە. (دەسی خۆش بێت ئەوە كەراواتەكەی فڕێدا، ئینتیزار ئەكەم هەر لەم مەجموعەوە شروعی بكەن (بۆینباخ)ەكانتان فڕێ بدەن .....

لەوانە وا مەزهەری شەخصیەتن، ئەوانە دەتوانن بن بە سەرمەشق بۆ كۆمەڵگە، لەوانە وا ئینسانگەلێكن كە بە ڕاستی ئەهلییەتی ئەوەیان هەس فەرهەنگی ئیسلامی قبوڵكەن، چاوم پێیانەوەیە كەراواتەكەیان فڕێدا، ئومێدم هەس بە خوای گەورە ئەڕۆن بەرەو ماڵ و وورده وورده، لە مۆدێلەكەیان، لە ئەشرافییەكەیان لە كۆت و شەرواڵەكەیان لە هەرچی شتیان هەیە بگەڕێنەوە.





لەوانەیە لەسەرتادا كەمێك قورسبێت ئەم كارە ئەنجام بدەن، چونكە كۆمەڵگە فێری ئەشرافییەت بوو، بەڵام كاتێك زەمان گوزەرا وانامێنێت، (من ئەوەم لەبیرە چەنێك تانەوتەشەریان لێ دەدام كە بە شەرواڵەوە دەهاتمە دەرەوە! بەڵام ئێستا كەس تانەم لێ نادات). كاتێك زەمان گوزەریا، كاتێك حەقیقەت كەوتە ڕوو و باسكرا ئەمانە{ئەوكەسانەی لەسەرەتاوە دەست دەكەن بە لابردن و گۆڕینی فەرهەنگی ئەشرافی} بە عینوان پێشڕەوگەلێك ئینقیلابی ئیسلامی دەناسرێن.

ئێستە چەنێك خۆت ئەوڕی و خۆت ئەكوژی، خۆت ئەدەیتە دارو بەردا، بۆ ئەمە بتوانین مەسەڵەن بە ئیصتیلاحی ئەمڕۆ (دیكۆراتی ماڵەكەت) بگۆڕی ئەوە وا بەو بەدبەختی و زیلەت و كوێرە وەرییە تەحەمولی دەكەیت بۆ نەخش و نیگاری ماڵەكەت، كورە لایە، دوو دانە بەڕە داخە، فەرشێكی سادە داخە، جا لەوەودوا خۆت ئەزانی چەنێ خۆشە ئەصلەن لەزەتی هەیە، ئەوگشتە مانوبونەت بۆ دەگەڕێتەوە، ئەوگشتە كار و زەحمەت و هەوڵدانە دەگەڕێتەوە بۆت.

{لەم بارەیەوە نمونەیەكتا بۆ دەگێڕمەوە} بە یەكێك لە خانمانم ووت، كە هەم خۆی خانمێ فرە موسوڵمانە، هەم شووەكەی فرە مووڵمانە، جارێكیان دەعوەتمانی كردبوو، سەیر دەكەم سفرەیەك (بێ ئەدەبی نەوێت لە خزمەتیا) سفرەیەكی شاهانەی داخستوە.

ووتم: ئەمە چ وەزعێكە؟! بۆچی وا دەكەیت؟! میقدارێك قسەم كردوو دوای دوو سێ دانیشتن ئاخری. ووتم پێی، "خوشكەكەم! تۆ دەبێت چەند سەعات كار بكەیت تا ئەم سفرە شاهانە دادەخەیت، لەوەودوا چەند سەعات كار

بكەیت تا پیسییەكان پاك دەكەیتەوە، كاسەو كەوچكەكان دەشۆیت و دای دەنێیت، دەی خوشكەكەم تۆ منداڵی زۆرت هەیە، تۆ خۆت جوانیت و پێویستت بەوەیە كایەبكەیت، مرۆڤ تا تەمەنی(٦٠ بۆ٧٠ ساڵی) پێویستی بە كایەكردن هەیە و ئەشیٚ ئینسان هەمیشە كایەیی هەبێت، خۆ نابێت بەرنامەی ژیانی هەر خۆكوشتن و كاركردن بێت بۆ پوڵ دەرهێنان، نەشاتی گەرەكە، رۆح دەبێت نەشاتی هەبێت، جیسم دەبێت جولاٚنی بێت، كایەكردن بەعینوانی نەشاتی رۆحی و وەرزشی بەیەنی لاٚزمە بۆ تەمەنی(٦٠ –٧٠ ساڵی). جا تا جوان ترە كایەو وەرزشەكەی قورس ترە، وەختیٚ تەمەنی گەورە دەبێت، وەرزشەكەی سوك تر دەبێتەوە.

ووتم خوشكەكەم! تۆ ئەوەڵەن خۆت كایەتگەرەكە، ئەوە یەك. دووەم: منالەكانت كایەیانگەرەكە، منالٚ كاتێك منالی تۆیە كە تۆ كایەیی لەگەلاٚ بكەیت، خۆشەویستیت ببێت لە گەڵیدا، فاصیلەگەلی و جیابوونەوە لەنێوانتاندا نەمێنیٚ، منالٚ نەترسیٚ لێت، سام و هەیبەتی نەویٚ. ببیتە رەفیق لەگەڵ منالەكەی خۆتدا، كە منالٚ هەر موشكیلەیەكی هەیە هەر رازو نیازێكی هەیە بێت مەترەحی بكات (باسی بكات) لە گەڵ تۆدا.

ووتم: خوشكەكەم! تۆ بۆ سفرەیەك وا دوو رۆژ لەوەو بەر زەحمەتی خۆت دەدەی، رۆژێك دوای ئەوەش زەحمەتی خۆت ئەكێشی ئەمە بۆچی؟! سفرەیەك و داخستووە تا چەند نەفەر بێت و بلێن"ماشا الله چەنێك رەنگینە".

ئەوەڵەن، كاتێك داوای لێبوردنی كرد، ووتی"خەجاڵەت خۆم".

ووتم: ئەشۆم بیلا هەقتە بلێیت خەجاڵەت خۆم، چونكە خۆ من (شاه) نیم مرۆڤێكم بۆچی وات كردووە؟

ئەمە ئەوەڵین جار، سەرەتا چاوەڕێی ئەكرد من بڵێم، نەخێر وا مەڵێ ماشا الله زەحمەت باشت كێشاوە، دەستت خوشبێ سفرەكەت ڕەنگینە. نەوەڵا وتم"واقیعەن جێگەی خەجاڵەتیە سفرەی بەو جۆرە، سفرەیكە شاهانەس، ناوێ لە ماڵی بەشەرا داخرێ، ئەشۆم بیلا ئەشێ ئینسان خەجاڵەت بكیشێ كاتێ سفرەی واداخات"!!

ئەمە یەك، دووەمیش: ئەم گشتە وەختە تۆ سەرفت كردوە دەی برۆ بخوێنەوە و موتاڵەعە بكە، شت فێربە، فێر بوون بۆتۆ گرنگترە تا خواردن، تاوەكو خواردن دان بە خەڵك! ئەویش (خواردن) لازمە، بەڵام بەو ئەندازەیەی پێداویستی لاشە پەیدا دەكات، نەك شتی ڕەنگاو ڕەنگ و پڕ زەرق و برق دانان لەسەر سفرە. مناڵەكەی تۆ سالم بێت، مناڵەكەی تۆ یاری بكات لەگەڵتدا، مناڵەكەی تۆ خۆشەویستیت لەگەڵا پەیدا بكات گرنگ ترە، ئەمە ئێژم تەنها بۆ دایكان نیە، بۆ باوكانیشە. هاوار لەم كۆمەڵگەیەیی ئێمە!! كە باوكی بێ چارە دەڕواتە دەرەوە لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ خۆی ئەكوتێ دوای دێتەوە بۆ ماڵەوە پەرێشان، خەستەو مردوو منالێ سەلامی دەكات بەحاڵ توانای هەیە وەڵامی سەلامی منداڵەكەی بداتەوە! دوای نیوەڕۆ یەلاّ ماندوبوون شەو یەتەوە ماڵ منالێ دێت بەرەورووی مەسەلەن دەیەوێت مەحەبەتێك (خۆشەویستی) ببینێت لە باوكییەوە چی باوكی بێچارە تاقەت و توانای مەحەبەتی نیە باوكی چی، ئەوە كەی باوكە؟! خۆ من نایەژم خەتای شەخصی ئەوە، بەڵكو پەیوەنییە كەسیف و پیسەكە وای كردووە دەبێت ئەو بەیانی تا ئێوارە زەحمەت بكێشێت بۆئەوەی ماڵەكەی شتێكی كەم نەوێ لەماڵی فلانە دراوسێ، فەرشەكەی كەم نەوێت پێداویستیەكانی چێشت

خانەكەی كەم نەوێت، كاسەو كەوچكی كەم نەبێت موبیلاتی كەم نەبێت!!
ئەو بێچارە مەجبورە وا دەكات، بەڵام لە ئێستاوە ووردە ووردە تەكانێ بدەن
لە خۆتان. ئەی مەردم و ئەهلی كۆمەڵگەیەك وا خەریكن بەرەو حوكومەتی
ئیسلامی دەچن لە ئێستاوە چكە چكە ئەوەی فەرهەنگی ئەشرافییەتە فڕەی
بدەن، ئەوە وا فەرهەنگی ئیسلامییە دابمەزرێنن لەناو خۆتاندا. ئەگەر ئەو پیاوە
فەقیرە وا بەیانی تا ئێوارە دەچێت خۆی دەكوژێت و خۆی ماندوو دەكات
ئەمە بۆچی؟ لەبەر ئەوەی دیكۆریماڵەكەی بگۆڕێت و نەخش و نیگاری
زۆر تر بێت، لە جیاتی ئەوەی بێت دانیشێت دوو قسەی خۆش بكات لەگەڵ
ژنەكەیدا، دوو ڕووداوی ژیانی دەرەوەی خۆی باس بكات و بیگێڕێتەوە بۆ
ژنەكەی، گوێ بگرێت بۆ ژنەكەی دوو كێشە لە كێشەكانی خێزان باس
بكات بۆی، دوو بابەت لە بابەتەكانی پەروەردە كردنی منداڵەكانی باس
بكات بۆی، ئەو وەختە باوكە. بۆچی باوك یەعنی ئەوە تەنها منالی ببێت؟!
ئەگەروابێت هەرچی حەیوانە باوكە، مەقامی باوكی ( پلەی باوكی) یان پلەی
دایكی زۆر گەورەیە، دایك و باوك لە مەنتقی ئینسانیدا، واتە مەسئولییەت
لەبەرامبەر منداڵەوە، واتە ئەوە كەدایك بتوانێ مەزهەری عاتیفە(سۆزو
خۆشەویستی) بێت بۆ سالم كردنی ڕەوانی منداڵ واتە ئەوە كە باوك بتوانێت
مەزهەری فێركردن و تەعەهودی لێپرسراوێتی بێت بۆ پەروەردە كردنی
دەرونی منداڵ بۆ ئاگاهی زیاد بوونی. ئەگەر باوك و دایك كاریان هەر ئەوە
بێت ئەو بڕواتە دەرەوە جا هەر كامیان بێت فەرقی نییە، هەر هەوڵ بدەن و
پارە پەیدا بكەن، با سەیارەكە وابێت، با فەرشەكە وابێت، با بیناكەمان
وابێت، منالی بێچارە چی منەتێ بكات باوك و دایكی هەیە؟! نان و ئاو





هونەرێکی نییە، جل و بەرگ هونەرێکی نییە، باوك و دایکی ڕاستەقینە ئەوەیە کە صەفاو موحیبەت و گەرمی دەدەنە منداڵ! ئەوەیە کە نەشاتی ڕۆحی دەدەنە منداڵ نەك تەنها نان و ئاو پێدان، دراوسێیەکیش دەتوانێت نان و ئاو بدات.

ئومێدەوارم ئالەم لە حزەوە ووردە ووردە ئەو ئینسانانەی بە غیرەترن، ئەو ئینسانانەی وا ڕابردویەکیان هەیە، وەختێ دەرکی ئەم مەتڵەبە دەکەن، کە ئەشرافییەت خراپەو شانازی نییە، دیکۆراتی ماڵەکە وابێت و فەرشەکە وابێ نیشانەی خیانەتی کۆمەڵگایە، ناڵێم خیانەتی خودی ئەو فەردە نیشانەی ئەوەیە کە کۆمەڵگا خیانەتی کردووە. وا لێرە زەرق و بەرق هەڵتۆقیوەو وەلێ لەو لاوە ماڵەکان گڵکاری و خۆڵن.

ئومێدەوارم کەسانێك کە ئەمە دەرك دەکەن لای خۆیانەوە دەست پێبکەن، دەست پێکردنی جددی بە تەصفیەکردنی فەرهەنگی (پاڵاوتنی فەرهەنگ) لە کۆمەڵگەکەماندا، (من ئەزانم چەنێك جیاوازی لە نێوان خێزانەکاندا هەیە، چەنێ ڕووبەڕوو بونەوەو ناخۆشی لە نێوان ژن و پیاوا هەیە، من پیاوانێك ئەناسم هەن کە لە شەوو ڕۆژێکدا جارێك چاویان ناکەوێت بە منداڵەکانیان لەبەر چی؟ نە لەبەر جیهاد، نەلەبەر لێپرسراوێتی گەورەی کۆمەڵایەتی، نەوەڵا لەبەر مادییەت، لەبەر پارە پەیداکردن. من دەزانم دایکانێك هەن کە حەوسەڵە (تاقەتیان) نییە یەك کەلیمە خۆشەویستی پیشانی منداڵەکانیان بدەن، گشتی تەنها لەبەر ئەشرافییەت، لەبەر ژیانی ئەشرافی).

ئەو ئینسانە هۆشیارانە بنە پیشڕەو سەر مەشق دانێت بۆ ئەو ئینسانانەی کە هۆشیاریان کەمە، یان ئەو ئینسانانەی کە توانای پلان و نەخشە دانانیان کەمە، بەپلان دانانی بەهێزیان ئەوە وا زەرقەو بەرقەو پێویست نییە، ئینسان

پێویستی پێی نیە لایەن لەماڵی خۆیانداو فرێی بدەن، ئەوەش وا پێویستە ببێت لە قیمەتی (نازڵدا) تەهیەی بکەن، چی جلوبەرگ، چی وەسائیلی ناوماڵ چی پێخەف، چی هەرشتێ تا لە ئاخرۆ خۆیان سەیرکەن ژیان سەیر خۆشتر دەبێت... واقیعیەتیش ئەمەیە بەڕاستی ئەو دایکە وا لەجیاتی هەمیشە بەدیاری خواردنۆ بێت، وا هەمیشە بڕوات لە ئیداراتدا بە نارەحەت پارە بێنێتە ماڵەوەو لە ماڵدا خەریك بێت چێشت دروست بکات کارگەلێك زیادە ئەنجام بدات، ئەگەر ئابەوجۆرە میقدارێك خەریك بێت ژیانی خۆی بچوك بکاتەوەو ئەشرافیەت و زەرق و بەرق لاببات، و لە جیاتی ئەوە کایە بکات و شۆخی بکات لەگەڵ منداڵەکانیدا، سەیر دەکات ماڵی دەبێتە ماڵ! هەروەها پیاوانیش ئەگەر بێت لە جیاتی ئەوە موحیبە لەگەڵ ژنەکانیاندا بکەن، گوێکە شلکەن بۆ دەردە دڵی ژن، گوێچکە شلکەن بۆ کێشەیەك کە هەیەتی لەبەرامبەر منداڵەوە، لە بەرامبەر خەڵکی گەڕەکەوە، لە بەرامبەر دراوسێکانیەوە، لە ئەسنای کاری فەرمانگەکەیدا، لە ئەسنای کاری ماڵیدا. بزانن ئەم ژنە چی دەردە دڵێکی هەس؟ با کەم ببێتە گرێ لە دڵی منالاًو لە دڵی خودی پیاویشدا، خۆشی دانیشێت دەردە دڵی خۆی بگێڕێتەوە. ئەو کاتە تەماشا دەکەیت پەیوەندی ئەوەنە گەرمە کە دەکرێت پێی بڵێین "یەك خێزانی ئیسلامی". بەلاًم تا ئێستا داخەکەم یەکجار کەم هەمانە خێزانێکی ئیسلامی، کە بەڕاستی پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوان تاکەکانی خێزانەکە گەرم بێت.

## دەربارەی غەربزەدەگی

یەکێکی تریش لە هۆکاری بەدبەختی ئێمە لە نەخۆشی فەرهەنگیمان بریتیە لە ( غەرب زەدەگی)، یەك کەلیمە لەبارەی غەرب زەدەگییەوە دەڵێم. جا لەوەو دوا موراجەعە بکەن بە کتێبی (جەلالی ال احمد) بەناونیشانی (غەرب زەدەگی) هەرچەند کەمێك قورسە، بەڵام بەپێی پێویست، سەرنجڕاکێش و گرنگە، بە ئەندازەی واقیعییەتی کۆمەڵگە تەصویر دەکات بۆ ئینسان کە ئەگەر ئینسان خوێنندەوەی زۆر نەبوبێت بەڵەو بێت لە شێوازی نوسینی (جەلال ال احمد) خۆی دەتوانێت سود لەو کتێبە ببینێت.

ئەم بابەتە زۆر گرنگە کە دەکرێت لە کاتێکی ترا بە درێژی باسی لێوە بکرێت و دەربارەی ئەوەی بۆچی دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ میللەتێکی غەیری میللەتی خۆیا پەیوەندی ببەستێت؟!

هۆکاری پەیدابوونی ئەم نەخۆشییە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا کە بۆچی پەیوەندی پەیدا دەکات بە فەرهەنگێك جیاوازی فەرهەنگەکەی خۆی، باسێکە تولانی، بەڵام ئەوەندە دەڵێم: لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا هەرشتێك ببینن کە دەلیلێکی نییە، زیادەیە و خەڵکی لەخۆیانەوە دەیکەن و ئەنجامی دەدە، سەیر دەکەن زووتر لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەم کارانە بوونی نەبووە، ئەمانە مەزاهیری غەربزەدەگییە، کە ئەگەر ئێستا بمەوێت بچمە ناو باسەکە زۆری درێژە دەکێشێ.

هەر شتێك زیادەیەو لە پێداویستیەکانی ژیان نییەو هەروەها فەرهەگی کۆن و ئالودەی خۆمان ئاشنایی نییە لەگەڵ ئەو شتانەدا ئەوە مەزاهیری غەربزەدەگییە، لە ڕەفتارمان، لە قسەکردنمان، لە جل و بەرگمان، لە ملوانکە لەمل کردنمن لە (جاجکە جوینمان لە ناو بازاڕدا!) لە ئەداو

ئـەتوارمان لــە مــەجالی جیــاواز جیــاوازا، ئەمانــە گــشتی ڕوخــسارێکن ا
غەربزەدەگی، ئومێدەوارم لـە فورسەتێکدا بتوانین بەیەکەوە باسیان بکەین .
ئەوە وامۆهیمە ئەشرافییەتەکەیە کـەوا ئیـشارەتمان بـۆ کـرد ئـەوە وا لـﻪش
ئەمەسە کە لــە زیــادەو لــە حــەدی ئیمکــانی مــەردم هاتگــەو لــە جێیەک
کۆبۆتەوەو ژیان زەرق و بەرقی پەیـدا کـردووە. ئـەو شـتە زیادانـەی کەا
دەرەوەی عادات و تەقالیدی خۆمانە غەربزەدەگییەو هـەوڵ بـدەن وردە و
کاری بۆ بکەن با پاکۆ بێت و نەمێنێت.

هــەروەها دەربــڕین و وشــەو موصتەلــەحاتیــشمان ئــالودە بــووە بــە فەرهــەن
ئەجنەبی، ئەوە بوو کەلـە (حوسەین)ەدا باسم کرد نیشانەیەك لە ئـالودە بـو
فەرهەنگمان ئەوەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئێـژن بـۆ نمونـە"شـاهی فـلان... شـا
مەدینە" استغفر الله. نقلّی کوفر کوفر نییە!!! چی کوفرێك، چی ئیهانەتێك!!
ئینسانێك کە لـە تەرەف خواوە مەئمورییــەتی پـێ دراوە نیزامـی پـێ دراوە "
(شاهن شاهی) لـەناوبەرێت، تۆ هەستیت پـێ بلّێـت (شـاه)!! یـا مەسـەڵەن
کەسێك وەك (حەزرەت حسین) یان(حەزرەت عومەر) پێیان بلّێیت (شاه زادە
ئەمە یانی چی؟!

هەر بەوجۆرە کەسێك تەعارف دەکات لـەگەڵ کەسـێکدا، پێـی ئـەڵێت (
قوربانتبم. نۆکرتم)، یان وەك ئەوانەی لــە سـەردەمی (شـاه) وەك (د.ئیقب
لەکاتی (سەرۆك وەزیریانیدا)هەرچـی نامـەی دەنووسـی بـۆ شـاه دەینووس
(غولامێ خانە زاد). دەزانن غولامێ خانە زاد یانی چـی؟! هــەرگ وەســەر
خۆ لـەبرسا نامریت!! وەزیری بۆچی دەکەیت، واتە لــە مـاڵ ئـەوانا لــەدا
بووە!! بە کوردی خۆمان ئێژن(حەرام زادە).. بەدبەخت. جا هەر ئـەو جـۆ

فەرهەنگی چینایەتییەیە ئەمە دروست دەكات. ئـاخر براكـەم درۆ دەكـەیت، وەلاّ بەقوربانم نابیت، بۆچی من تەنها ئێژم چۆنی، تۆ ئێژی بە قوربـانتبم؟ دەی ئاخر درۆمەكە.

ئێژیێ نۆكەرتم، كوا؟ چی نۆكەرییەك، چی زەحمەتێك ئەكێشی بۆ مـن؟! ئائـەم وشانە نیشانەی ئـەو فەرهەنگـە نەخۆشـەیە، بـا ووردە ووردە ئەمانیـشە لـە فەرهەنگنندا لابەرین.

بە هەر حاڵ دەزانم ئەمە كاری یەك دانیشتن و دووان نییە،كاری یەك بەحس و دووان نییە، فەقەت ئەوەی كە لـە كـوردی خۆمانـدا ئـەڵێ (كەسـێ ،كەسـە حەرفێ بەسە). بۆ ئەوانە وەزیفەیان ئەوەیە ڕەهبەرو پێـشڕەوی كۆمەڵگـەبن، ئومێدەوارم ئـەم یـەك جەلـسە كـافی بێـت.... ئومێـد دەكـەم لـە ئاینـدەدا فەرهەنگی خۆمان پاڵفتـە بكـەین و هەرچـی شـتی غـەیر ئیـسلامییە بیكەینـە دەرەوە. ئومێدەوارم هەم من موەفەقبم لـە جەلـەساتی تـرا باسـی بكـەم، هـەم هەركەس لـەناو كۆمەڵگەی ئێمـەدا ئـەم مەسـئولیەتە ئیحـساس دەكـات لـە هەموو بارودۆخێكدا زیاد لـەوەی خۆی كاری پێ بكات وردە وردەش پـەیامی ئینقلابی فەرهەنگی لـەناو كۆمەڵگەدا بگەیەنرێتە گوێچكەی خەڵكی.

## باسی شەشەم:

# ئابووری ئیسلام، و بنەبڕكردنی (مەوداكان)* لە كۆمەڵگەدا

### دەربارەی ئایەتی ﴿أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم﴾

سەرەتا یەك لایەنی ئەم ئایەتە لەبەرچاو دەگرین كەئەویش لەفزی(أَنفِقُواْ)كەیەكێك لەبیریارانی ئێرانی دەربارەی وشەی (ألفاق) تەفسیرێكی جوانی كردووە، گەڕاوە و ڕیشەی واقیعی وشەكەی دۆزیوەتەوە! (انفاق)بەمانایی(دەستگیری كردن و كۆمەك كردن نییە)، بەڵكو بەمانای (پڕكردنەوەی مەودا"فەواصیل")ە، بەو جۆرە وادیومانە لەژیانی ئینساندا لەبە ئەو جیاوازی و ئیستعدادانەی وا هەیە جیاوازییەكی دەرەجەدی دروست دەبێت كەلە جیهانی حەیواناتدا نییە، چونكە حەیوان بە سیستەمی(غەریزە)دەژی و خودا سیستەمێكی تری پێداوە بەجۆرێكی ئاسایی زیندەگی خۆی بەڕێوەدەبات و هەر جۆرەشی لەحەیوان لەیەك پلەدا بەڵام ئینسان جۆرێكە ئەو جیاوازی ئیستعدادەی هەیە، ئەو عەقڵ و دەرك شعورەی هەیە، لەبەرئەوە سەیردەكەیت ئەگەر بەتەنها(غەریزە)زیندەگی بكات ئائەم بەدبەختی و ئەوزاع و ئەحواڵەیە كەوا تێیدا گیری كردووە! لە ئەم هەموو فاصیلە و كەم و كورتییە كەلە زیندەگی ئەفرادا بەو جۆرە دێت (إنفاق)واتە پڕكردنەوەی ئائەوانە...حەقیقەتە و لە ڕیشەی(نفق)هاتووە

---

*) مەودا: نفق = فاصلە

(نفق)یش: واتە (فاصیلە)بەین و شكاو(مەودا). لەزیندەگی ئەفرادا ئەگەر(دین)نەبێت بەهۆی ئەو جیاوازی و ئیستعدادەوە هەمیشە (نفق)وجودی هەیە، بۆیە(إنفاق): واتە پڕكردنەوەی فاصیلە، ئەگەر وابێت بەشێوەیەكی ئاسایی جیاوازییەكە دروست دەبێت بەهۆی هەوڵ و ئیستعدادی جیاوازی ئینسانەوە بۆیە ئەمجار نۆرەی ئەوەیە بەرنامەیەكی بۆ ببێت كەئەم فاصیلانە پڕببێتەوە، بۆیە دەبێت بەم پێیە بێت ئەوەی لەبارەی(أنفقوا)وەوە دەوترێت بەمانایی(كۆمەكی)بكەن بەیەكتری نییە و ئەو مانایە هەڵەیە! بەڵكو نا...كۆمەڵەی موسوڵمانان موكەلەفن كۆمەڵگەیەك بۆ خۆیان دروست بكەن كە دین دەیەوێت لێیان، واتە(فاصیلەی تێدا نەبێت)هەمیشە كە ئەوێژرێت(أنفقوا)غەیری مانای(كۆمەك)كردنە، واتە مەهێڵن لەناو كۆمەڵگەتاندا تەفاوت(جیاوازی) و فاصیلە بوونی هەبێت ئائەوە لەناوبەرن، ئەصلی مانایی(إنفاق)ئەوەیە، ئەمە لەلایەكەوە، لەلایەكی ترەوە لەئێستادا ئێمە پێوەرێكی صەحیح نییە بەدەستمانەوە بێین تەماشا بكەین بزانین بەرنامەی ئابوری ئیسلام چۆن ئیجرادەكرێت خۆمان بەكۆمەڵگەیەكی ئیسلامی دەزانین لەكاتێكدا سیستەم وحوكمەتێكی ئیسلامی لەوڵاتەكەماندا بوونی نییە، بۆیە زۆرێك لەو پرسیارانەی دەربارەی ئابوری ئیسلام دەكرێت كاتێك وەڵامی دروست دەدرێتەوە كەبزانین تەكلیفات و خیتاب بۆ(كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی لە كۆمەڵگەیەكی ئیسلامیدا خۆ تاكەكان ئیجازەیان نییە، رێیان پێنادرێت) وەزیفەماڵی لازم و واجب كەلەسەر شانیانە خۆیان ئەدای بكەن و بیگەیەننە دەست ئەشخاصی تر. بۆ نمونە،ئەگەر كابرا موكەلەفە ساڵی(٢٠هەزار تمەن) پارە ببات بۆ (إنفاق)، واتە لەناوبردنی فاصیلەی تەبەقاتی ئیجازەی نییە خۆی




بیبات و بیڕێژێتە دەستی خەڵكی، لەلایەكەوە بەنیسبەتی ئەم(منـەت)دروسـت دەبێت، لـەلایەكی ترەوە بەنیسبەتی وەرگرەوە(تەحقیر)دروست دەبێـت، بۆیـە بەموتڵەقی ئەمـە لـەڕووی ئیـسلامییەوە دروسـت نییـە! دەوڵـەتی ئیـسلامی موكەلـەفە بەم كارەوە، كابرای پـارەدار موكەلـەفـە تـەواوی ئـەوەی لـەسـەر شـانییەتی بیـدات بـە(مـەئموری دەوڵـەت) جـا لـەقەواعیـدی فیقهیـدا بـاس لـەمەسائیلێك كراوە، بەڵام چونكە ئێستا كۆمەڵگە ئیـسلامییەكە بـوونی نییـە سەیردەكەیت بەشێوەیەكی سەحیانە دەردەكەوێت كاتێك ئەم باسی(قەبض و إقباض)كەلـەباسی (سەرفیترە و زەكاتدا)هەیە (كەئەوە من ئەوەنـدە دەرامـەتم بووە ئەوەندە زەكاتی دەكەوێت ئەوە دامە تـۆ...مـن ئەوەنـدە منـداڵم هەیـە ئەوەندە سەرفیترەم دەكەوێت ئەوە دامە تۆ..)بـۆ كۆمەڵگـەی ئێـستای ئێمـە هەڵەیە، چونكە ئەوە بۆ كاتێكە كە ئموری دەوڵەتی ئیسلامی نزارەت دەكات لـەمەسائیلی ئابوریدا كەدەبێت ڕۆشـن بێـت مەئمورەكـە چـی وەرگرتـووە و كابرا چی پێداوە، تا بزانرێت ئەوەی ئەو لـەسەری بـووە بەتـەواوی داویـەتی، مەئمورەكەش بەشی(بیت المال)ی بەتەواوی وەرگرتووە یان نا...بەڵام كاتێـك كەكۆمەڵگەیەكی ئیسلامی نییە موتەوەجیە دەبـین ئـەو شـیعارە تەشـریفات و زاهیریانە هەمووی هەڵەو زیادەیە كابرای هەژار یان فەقیر ئێستا لـەكۆمەڵگەی ئێمەدا كاری دەوڵەتەكە ئەنجام دەدات و خۆی نصولی ئەو موتاڵەباتە دەكات لـە دەوڵـەمەندەكان، چ كاری هەیە بەوەوە كەكەم درابێتی یـان زۆر درابێـت، كوا دەتوانێت تەحقیق بكات بزانێ ئـەم كـابرا دەوڵـەمەنـدە ڕاسـت دەكـات زۆریداوە یان كەم؟ ئەگەر وابێت دەبێتە شتێكی سیاسی!!




بۆیە بەم پێیە ئەم ئصولانە بۆ كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی دانراوە واتە كۆمەڵگەیەك كە حوكمەتێكی هەبێت بینا لەسەر بەرنامە و ڕەوشێك كە ئیسلام دایناوە تاك بەڕێوەببرێت و كۆمەڵگە بگەڕێنن، لە كۆمەڵگەیەكی بەو جۆرەدا ئیتر پرسیاری ئەوە دروست نابێت كەبۆچی دەبێت كۆمەڵێك دەوڵەمەند هەبن(كۆمەك بكەن) بەكۆمەڵێك فەقیر؟ وانییە! لەكۆمەڵگەیەكی ئیسلامی تەواوی وەزائیفی ماڵی دەوڵەتی ئیسلام وەردەگیرێت، هەروەها تەواوی ئەوانەی حقوق وەردەگرن لەدەوڵەتی وەردەگرن بۆیە لەڕووی ئیسلامییەوە موستەحەق چ وەزیرێك، چ هەتیوێكی بچووكی كەم توانا، چ ئینسانێكی ئیفلیج، فەرق ناكات! موستەحەق، واتە ئەو كەسەی كەدەبێت لە(بیت المال)بەشی پێبدرێت.

ئیستحقاق و لییاقەتی ئەوەی هەیە لە(بیت المال)بەشی پێبدرێت لەسیستەمی ئیسلامیدا تەواوی ئەوانەی واپارە دەدەن دەبێت بەحوكمەتی بدەن ئەوەش كەپارە وەردەگرێت لە حوكمەتی وەردەگرێت ئەگەر وابێت ئەو تەصەوراتەی دەربارەی دەوڵەمەند و كۆمەكی كردنی هەژاران تەصەورێكی هەڵەیە و لەئیسلامدا شتی وامەترەح نییە.

جاباسی شتێكی تریش بكەم كەئەوە دەزانم ئەگەر بمەوێت بەوردی باسی بكەم زۆر دوورودرێژە، ئەوەیش ئەوەیە كەلە سیستەمی ئابوری ئیسلامیدا نوكتەی تەركیز(انفاق)ە، واتە لەناوبردنی فەواصیل تەبەقە، تەبەقە وجودی نەمێنێت. سیستەمی ئابوری ئەركان و ئصولی هەیە. ئەركانێك كە ئیسلام دایناوە سابتە و دەستكاری ناكرێت و ناگۆڕێت، بەڵام شێوە و ئەشكالی دەكرێت بگۆڕێت و جۆراوجۆر بێت هەدەفی ئابوری ئیسلامیش وەك وتم(إنفاق)ەكەیە واتە،

نەبوونی فەواصیل کە میلاکی دەبێتە(حەدی وەصەت)لەهەر کۆمەڵگەیەکدا ئابوری ئیسلام هەوڵ دەدات کەهەر کۆمەڵگەیەك تەواوی تاکەکانی لەحەدی موتەوەصیتدا بەهرەداری بکەن، حەدی وەصەتی کۆمەڵگەش جیاوازە و بەپێی جیاوازی کۆمەڵگە لەگەڵ یەکتری و بەپێی جیاوازی زەمان دەگۆڕێت، بەڵام میلاکی حەدی موتەوەصیت لەدونیایی ئەمڕۆدا ئاسانە بە ئامارێك دیاری دەکرێت لەجەمعییەتی جێگایەك لە دەرامەتی وجودی حساب دەکرێت کەمەسەلەن سەرانەی هەر کەسێك چەنێکە ئەمەش لەدونیای ئەمڕۆدا زۆر ئاسانە. مەقبول لەئیسلامدا ئەوەیە کە سیستەمی ئابوری ئیسلامی جۆرێك ئیجرا بکرێت کەهەموو خەڵك بگاتە(حەدی موتەوەصیت)زیندەگی بکەن بۆ ئەمەش ئەمە ڕووبدات دوو مەتڵەب مەترەحە:ـ

**یەکەم: ئەرکان.**

**دووەم: شێوە و ئەشکال.**

ئەرکان سابتە و ناگۆڕێت، بەڵام شێوە(صور)گۆڕاوە و دەگۆڕێت.

ئەرکان لەئابوری ئیسلامیدا زۆرە، بەڵام بڕێکی ئەساسن بۆ باقییەکەی تر، لەئەصڵی نەوعی فەعالییەتی تەولیدیدا(سێ)شت هەن ئەوانە دەبنە هۆکاری دروست بوونی(نفق)، واتە پەیدابوونی فاصلە، فاصلە لەناو خەڵکدا:

١. بەپارە، پارە پەیدا دەکەم: هۆکارێکی گەورە و ترسناکە بۆ(نفق)بۆ پەیدابوونی فەواصیلی تەبەقاتی.

٢. ئیختیار: دیارە هەرزانی و گرانی(جنس ـ شمەك)لەهەر زەمان و کۆمەڵگەیەکدا پەیوەندی بەتەناسووب یان عەدەمی تەناسوبی(عەرزە و

تەقاضـا)ـ(عەرز و تەڵەب)عەرز، واتە میقدارێك لـەو شـتانەی واپێویـستی خەڵكە لەئیختیاری خەڵكدا قەرار بدرێت.

تقاضا: واتە پێویستی خەڵك بەو شتانە، ئەگەر عەرز بەئەندازەی تـەقازا بێـت گرانی پەیدا نابێت، بەڵام ئەگەر تەقازا ئیحتیاج و زۆر بوو، بەڵام شمـەك كـەم بێت و كەم عەرز بكرێت خود بە خود شمەك گـران دەبێـت زۆرینـەی كـات لەحەدی كافیدا بەو ئەندازەیەی خەڵكی ئیحتیاجی پێیەتی بوونی هەیە، بـەڵام كەسانێكی بیٚ ئینصاف بۆئەوەی كە ئیستیفادەی زۆرتـر لەسـەرووەت و مـاڵی خەڵكی بكەن جۆرێك(نەفەق)دروست دەكـەن بەیـەك فیكـرەی موزەویرانـە كەئەویش(ئیحتیكارە)، واتە ئەو شمەكەی لەكاتێكدا پێویستی خەڵكە عـەرزی ناكـەن(نایخەنـە بـازاڕەوە)، نایـدەن بەخـەڵكی ئـەوە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی كە(تەقاضا)زۆر دەبێت خەڵك ناعیلاجن بۆئەوەی بەدەسـتی بهێـنن پارەیـەكی زۆریش بدەن تادەگاتـە ئـەوەی واخـاوەنی ئـەو سـەرمایەیەن هـەر لەبـەرەوە دەوڵەمەند دەبن و باقییەكەی تری دێتە خوارەوە بەمە(نفق)فاصـیلە دروسـت بوو بۆیە هۆكاری دووەم بریتییە لە ئیحتیكار.

٣. گران فرۆشی: واتـە هەرچـەند ئـەو بـازاڕە دروسـت كـراوە فـرەی بـۆ تەقازابوونی نەبێت و دروستی نەكات، بـەڵام كـابرا شمەكگـەلێكی هەیـە بەنیسبەتی ئەوەوە كەچەنێك ئەرزشی هەیە نرخی دەباتە سـەرەوە زیـاتری ببات گرانی، جاگرانیش یەك نەواخت نییە، بۆیە یەك جۆر شمەك لـەوانەیە یەك لـەسەدی نرخ بچێتە سەری هێشتا هەر گران بێت بـۆ شمـەكێكی تـر لەوانەیە سەدلەسەد، دوو سەد لەسەد نـرخ بـچێتە سـەری هێـشتا هـەر گران نەبێت، ئێستا لـەئێراندا پێوەرێكی ئێجگار ئەحمەقانە هەیە كە حساب

دەكەن، بۆ نموونە حدودی(لە صەدا دە یان پانزە یان بیست) نەفعێكە ئینسانێكی كاسب لە شمەكێك دەیفرۆشێت وەریبگرێت، لەكاتێكدا هەیە! چونكە هەندێك جۆری شمەك هەیە كەتەولیدی(بەرهەمهێنانی) ئاسانە بۆ نموونە كارگەیەكی ئۆتۆماتیكی هەیە لەهەمان كاتدا هەرچەند بهێنێتەوە لەناوناچێت ئائەمە ئەگەر لە(صەد یەك)یش نەفعی لیٚ بخوات هێشتا هەر زۆرە، بەڵام هەندێك شمەكی تر هەیە بەرهەمهێنانی ئێجگار گرانە، بۆ نموونە كاری دارتاشی، خەیاتی...ئەم جۆرە كارە دەستیانە كەهەیە لەوانەیە مەسەلەن(خۆم لەسەفەرێكی مەریواندا بینیم) كابرایەكی پیری ڕیش سپی بە پێی پەتی خەریكە بەناو ڕێگەدا دەگەڕا(نانەشان)ی لەسەر شان بوو كەهەر نانەشانێك بە (پێنج تمەن) سەیربكەن لەسەرەتاوە تا تەواو كردنی چەنێك زەحمەتی دەبێت! دەبێت بڕوات تولەكانی لەدارێك ببڕێت پاشان پاك كردنی پاشان چنین لەكۆتایشدا بەو جۆرە بەسەر شان بگەڕێت و بەپێی خاوس ولاتە و ولات بگەڕێت و بیداتە پێنج تمەن! بەڕاستی ئائەمە ئەگەر(لەصەدا پێنج صەد) نەفع بخاتە سەری هێشتا هەر كەمە، واتە(دوو هەزار، پێنج هەزار دەر صەدیش) بخاتە سەری هەر كەمە، بەڵام فلانە كارخانە(ماشینی پەیكان) دروست دەكات گریمان ڕۆژێك صەد ماشینی دروست كرد، یەكەم، خراپ نابێت. دووەم، زەحمەت و هەوڵیشی ناوێت. بۆ فرۆشتنی بەئاسانی هەر كەسێك بیەوێت دەتوانێت لەفرۆشگاكان وەریبگرێت بەبیٚ كەمترین زەحمەت ئەگەر قەرار بێت ئەو كابرا ئەو (نانەشانە)بەهەموو زەحمەت و مەشەقەتەوە بە (پێنج قەران)یش تولەكەی بكرێت و دواتر بیداتە(پێنج تمەن). كابراش ئەگەر(پەیكانێك)





بە(دەهەزار تمەن) بۆی تەواو بووە بیداتە(دە هەزار وصەد تمەن) واتە صەد تمەن بخاتە سەری کە دەوروبەری(لەصەدا یەکە)هێشتا هەر گرانی داوە!

(کار، زەمان، ئینرژی ئینسان) ئەمانە (سێ) هۆکارن بۆئەوەی(ئەرزشی شمەك)دیاری بکەن، خودی شمەکەکە حساب نییە بێژی چەندی تێچووە، لەصەدا دەی، لەصەدا بیستی، بخەسەری لەڕووی ئیسلامییەوە ئەمە مەترەح نییە (ئینرژی ئینسانی)خۆی ئەرزشی هەیە، زەمان ئەرزشی هەیە، خودی شمەکەکەش ئەرزشێکی هەیە.کار: کەبریتییە لە میقداری ئینرژی ئینسانی لە زەمانێکدا لەڕووی شمەکێکەوە ئەمە تەفاوت و دەرەجەی هەیە، کابرا لەسەبەتەکەدا(نانەشان)ەکەدا دەبینێتەوە، (لەصەدا دە، بیست، پەنجا، صەد)ئەصڵی شمەکەکە کاری ئینسانەکە، واتە کۆی ئینرژی لەزەمانێکدا کەبۆی سەرفکراوە ئەرزشی هەیە و زۆرترە لەئەصڵی شمەکەکە، بەڵام لەماشینەکەدا کاری ئینسانی نییە ئەگەر حسابی بکەیت کاری ئینسان، ئەوە کاری کارگەرەکانە. بەڵێ، هەرچەند وەربگرێت بۆ کارگەرەکان ئاساییە، بەڵام دوای نەفعی کارگەرەکان(لەصەدا یەکیش لە هەزارا یەکیش) بهێنێتەوە بۆ خاوەنی کارگە لەوانەیە زیادە... زیادە لەوەی کەلەڕووی ئیسلامییەوە و بە بیروبۆچوونی زۆرێك لە بیریارانی ئیسلامی ئەصڵەن ناکرێت(کارگە)شەخصی بێت، چونکە لەفەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ)هەیە(سێ شت)گشتین و نابنە موڵکی خاص:

**یەکەم: ئاو**

**دووەم: لەوەڕ**

**سێیەم: ئاگر**

جـا(ئاگر) مەبەست (كارگەیە) نەك ئاگری ئەو(سـۆبا یـان عـەلادین)ە، كـە ئێستا من دایگرسێنم، یان مـەجبور بم لـەتێكی بنێـرم بـۆ مـاڵی خـەڵك بۆیـە مەبەست لـە ئاگر (كارگەیە)، چونكە لەو سەردەمەدا چەمكێكی وەك كارگە بوونی نەبووە.

بۆیـە لـەم ڕووەوە زۆرێـك لـەبیریارانی ئیـسلامی ئێـستا و هـەتا زووتـریش وتوویانە، ئەگەر كار وایلێهات لەچالاكی ئیسلامی كەم سوودی وەرگـرت و بەشێوەیەكی(ئۆتۆماتیكی)ئەنجام درا ئەوە ئیتر فەردی نییە و فلأنە سـەرمایەدار كارگەیەك بكاتە موڵكی خۆی... بەدەر لەمەش ئێستا ئەگەر لەمە بگوزەرێین لەسیستەمی ئێستادا كەلە(ئێران)دا كارگە بـوونی هەیـە حـسابی هـەرزانی و گرانـی بكـەین خـاوەنی(پـەیكان) لـەصـەدا هـەزاری لـەوەی واخـەرجی تێچووە(مەبەستم خەرجی مەوادەكەیە، خەرجی كارەكە ناڵێم) لـە(هەزارا یەك نەفع) بۆخۆی وەربگرێت هێشتا هـەر زیـادە، بـەڵێ، لەئەصـڵی شمەكەكـەدا تێـچووە، گریمانـەی ئـەوە بكـە كەلـە صـەدا پـەنجای، لەصـەدا صـەدی وەردەگرێت بۆ كارگەرەكان(كرێكارەكان) هیچ موشكیلەی نییە، بەلأم قـسە لەبارەی نەفعی خۆیەوەیەتی هەڵبەتە لەڕووی ئیسلامییەوە بەوجۆرەی كەباسم كرد نابێت نەفعی كارگە بۆ فەرد(تاك)بێت، بـەلأم ئێـستاكە هەیـە لەحـسابی گرانی و هەرزانیدا لەهەزار یەكیش وەربگرێت هێشتا هەر گرانە، چونكە بـۆ نمونە بە(دە هەزار تمەن) ماشینێك تەواو دەبێت گریمان كرێكاریش(پێنج هەزار تمەن)بیات(ئەمە گریمانەیە هەرچەند نایبات) ئەمە دەكاتە(پانزە هەزار تمەن) لـە صەدا یەكی ئەم پانزە هەزار تمەنە دەكاتە (سەد و پەنجا تمەن)ڕۆژی(صەد دانـە صەدوپەنجا تمەنی)دەزانن چەنێك زۆرە؟! لەكاتێكدا پێموایە زۆر زیاتر لە(صەد

ماشین)بەرهەم دەهێنن، بەڵام سەیری كابرای سەبەتە(نانەشان)دروستكەر بكەن، ئەگەر حسابی بكەیت بەو جۆرەی باسمكرد لە صەدا دە هەزاریش واتە(صەد بەرامبەریش) لەقیمەتی ئەصڵی وەربگرێت هێشتا هەر كەمە، چونكە چەنێك كاتی دەڕوات و بەچی كوێرەوەری و زەحمەتێك و شاربەشار گەڕان تامەسەلەن لەڕۆژێكدا(چوار بۆ پێنج) نانەشان بفرۆشێت! یان بۆ نمونە لە(سەوزە فرۆش)ێك ئەگەر(لەصەدا پانزە یان بیست)زیاتر نەفع وەردەگرێت بۆ شمەكێك دێن جەریمەی دەكەن، بەڵام خاوەن كارگەكە دەوروبەری(لەصەدا صەد) وەردەگرێت (بەو جۆرەی بیستومە پەیكانێك مەسەلەن دە هەزار تمەنی تێدەچێت، پێنج هەزار تمەنیش بۆ كرێكارەكان بەنیسبەتی ئەمانە هێشتا(لەصەدا صەد) (سێ هەزار تمەن) زیاتر وەردەگرێت!.. بۆیە لێرەوە دەردەكەوێت یەكێكی تر لەهۆكارەكانی دروست بوونی(فەواصیلی تەبەقاتی) بریتییە لە گران فرۆشی،گرانفرۆشیش واتە ئەگەر تەصەوری مەجموعی ئەم سێ هۆكارە (كاری كابرا، ئینرژی و كات، هۆكاری ئەصڵی شمەك و كوتاڵەكە)كەئەمانە بەگشتی دەبنە سیان كارەكە دووانە و باقی شمەكەكەش یەكێك ئەمە سیان، كۆی ئەم سێ هۆكارە لەگەڵ یەك حسابی بكەیت و بیانخەیتە پاڵ یەكتری چەنێك ئەرزش هەڵدەگرێت بۆئەوەی زیندەگییە موتەوەصیتەكە والە ئیسلامدا مەتلوبە لەنەبوونی فەواصیلی تەبەقاتی چەنێك هەڵدەگرێت ئەوەندە(نەفع)بچێتە سەری لەوە زیاتربوو دەبێتە گران فرۆشی كاتێكیش گران فرۆشی بوو(نەفەق)دروست دەبێت...سەیردەكەیت كابرای(نانەشان)فرۆشی فەقیر ئەوەتا لەچی پلەیەكی زیندەگیدا و كابرای خاوەن(ماشینی پەیكان)ئەوەتا لەچی پلەیەكدا!! ئەم سێ

ڕوکنـــە لـــەئابوری ئیـــسلامدا(مـــەنعی نـــزور، مـــەنعی ئیحتکـــار، مـــەلعی گرانفرۆشی)لەهەر کات و بارودۆخ و شێوەیەکی ئابوریدا ئـەم سیالە ئەساسـن هەڵبەتە فەرع هەیە نیـسبەت بـە ئـەم ئەرکانـە، ئـەوانیش (فەرعـەکانیش)هـەر ئەرکانن، بەلاّم لەبەرامبەر ئەم سیانەوە دەبنە فەرع لەهەر کۆمەڵگەیەکـدا ئـەم سیانە مەنع کرا(ڕێی لێگیرا)ئیمکانییە نەفەق فەواصیلی تەبەقاتی دروست ببێت.

ئەوەش بلێم ئەم سیانە پەیوەندییان بەژێرخانی ئابوری کۆمەڵگـەوە لـەزەمالی بەرهەمهێنانـدا ئینجـا لـەدوای تەولیـد(بەرهـەمهێنان)مەسـەلەی بـەهرەداری (سوود وەردەگرێت)لەپارە دێتە پێشەوە شـتێك کـەزیان بـەخش وعـەزاب و ئازارە بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی بریتییە لەوەی لە(بەهرەبەرداری پارەدا)حالەتی نەفەقەکە پیشان بدرێت و دیاربێت! واتە هەندێك کەس بەهرەبەرداری زیـاتر بکات و هەندێك کـەم بـۆ ئـەمیش(سـێ ڕوکنـی سـابت-جـێگیر)لـەئابوری ئیـسلامیدا هەیـە کەبـە وجـودی ئـەو سـێ ڕوکنـە ئیمکـانی نییـە(نەفـەق لەبەهرەبەرداری)دا دروست ببێت، ئەو سێ ڕوکنـەی کـە ناهێڵێـت نەفـەق لەبەرهرەبەرداریدا دروست ببێت:-

**یەکەم:** کـەنز مەمنوعـە،کـەنز: واتـە پاشـەکەوتی غـەیر قـابیلی ئیـستفادە پاشەکەوت دوو دانەیە:

١. جۆرێکی ئەوەیە کەکابرا دەرامەتی ڕۆژانەی(٣٠تا٥٠)تمەنە ناتوانێت لـەم دەرامەتە ڕۆژانە ماڵ دروست بکـات وردە وردە پاشـەکەوت دەکـات و ماڵی پێدروست دەکات ئینسان ساڵی دووجـار وەسـائیلی مـاڵی تەهییـە دەکات، دێت پاشەکەوت دەخات بۆ ئەوانە، خولاصە پاشەکەوت کردن بۆ ئەو شتانەی واپێویستی زیندەگین پاشەکەوت کردن قبوڵە.




٢. بەڵام پاشەكەوتێك دەكات بۆ(مەسرەف)، واتە پارەی زیادی هەیە و ناتوانێت بیگێڕێت دەڕوات لە(بانكەكاندا)دەیخەوێنێت یان لە سندوقی خۆیدا دەیخەوێنێت ئائەمە(كەتری) پێدەڵێن و لەئیسلامدا مەمنوعە! واتە كاتێك ئینسان ئەوەندە پارەی زیادەی هەبوو نەیتوانی بیگێڕێت ئەوە ئیتر تازە پارەی ئەو نییە و شەرعەن پارەی(بیت المال)ە، (بیت المال)یش نوێنەری كۆمەڵگەیە واتە پارەی كۆمەڵگەیە.

**دووەم:** تەبزیر: ئەمیش مەمنوعە، واتە كابرا پارەی هەبێت و شتێكی خەرج بكات لەزیندەگی ئینساندا پێویست نییە، بۆ نمونە پارە بۆ(قومار،مەشروب...) سەرف بكات لەڕووی ئیسلامییەوە ئەمەش مەمنوعە.

**سێیەم:** ئیسراف: واتە خەرج كردنی زیادە لەپێویست، بەڵام بۆ شتی گرنگ!ئینسان پێویستی بە خۆراك هەیە لەم خوراكانە واپێویستە یان بەسودە بۆ ئینسان بێت لەمانە مەسرەف بكات، بەڵام زیاد لەئەندازە و موتەوەصیتی كۆمەڵگە، میلاكی ئیسرافیش دێتە سەر ئەو دەرامەتەی بەئامار دەزانرێت واوتم لەهەر كۆمەڵگەیەكدا و لەهەر زەمانێكدا مەعلوم بكرێت كە دەرامەتی موتەوەصیت چییە لەوە زیاتر دەبێتە ئیسراف و مەمنوعە، ئەگەر لەو سنورەدا بوو ئازادە... جا لەكۆمەڵگەیەكدا ئەگەر لەئەصڵی تەولیددا ئائەو(سێ) ڕوكنە لەبەرچاو بگیرێت لەوەودواش لە(مەسرەف و خەرج كردن)دا ئەم (سێ) ڕوكنە لەبەرچاو بگیرێت خود بەخود ئیتر ئیمكانی نییە نەفەق دروست ببێت، چونكە وەك وتم نەفەق لەتەولیددا بەهۆی یەكێك لەم سیانەوە دروست دەبێت لە بەهرەداری و مەسرەفیشدا بەهۆی یەكێك لەو سیانەوە




دەبێت، ئەوەی کە قورئان دەفەرمێت(أنفقوا)مەبەستی ئەوەیە ئەم بەرنامەیە ئیجرا بکەن کۆمەڵەی موسوڵمانان قسەش بۆ کۆمەڵگەیە نەك بۆ تاك کۆمەڵێك کە کۆمەڵگە و حوکمەتێکی ئیسلامییان هەیە.

﴿أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم﴾فەواصیل لەناوبەرن بەو سەروەتەی کە ئێمە داومانە بەئێوە بە مەجمەعی ئێوە، چونکە﴿مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾، تەواوی ئەوە وا لەزەویدایە بۆ تەواوی ئێوەی خەڵك فەراهەممان کردووە نەك بۆ یەکێك بەری زۆرتر و برێك کەمتر ئەوەی والەزەویدا هەیە و لەدەست ڕەسی بەشەردا هەیە، چ سەروەت لەسەتحی زەوی، چ معادن ئیستخراج بکرێت هەمووی بۆ هەموو ئێوەیە ئەگەر وابێت کۆمەڵگە، واتە هەیکەلێك موتەرەکیب و موتەشەکیل لەتاکی بەشعور و عاقڵ و موختار وەخاوەنی ئائەم تەکلیفە﴿أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم﴾بەچی؟ بەلای کەمەوە ئەو ئەرکانە ئیتر سەرفی نەزەر لەشێوەکان شێوەی ئابوری هەر جۆرێك بێت گرنگ نییە لەئیسلامدا شێوەی جیاوازمان بووە بۆیە گرنگ نییە شێوەکە چۆن بێت ئەم ئەرکانە سیالی بەلایەنی کەمەوە لە تەولیددا سیانی لەمەسرەفدا لەبەرچاو بگیرێت. ئائەمەیە ئەو بەرنامە دینییەی واوتم کەئەگەر ببێت ئیتر ئائەم گرفتاری و بەدبەختیانە بۆ خەڵکی دروست نابێت، بۆیە ئەساسی مەسەلە لەبەرئەوەی ئینسان نەناسراوە، پێداویستی ئینسان دەرك نەکراوە، ئینسان مەخلوقێکە بەو جۆرە...عەمەلەن دەبینین ئەگەر سیستەم نەبێت فەواصیل دروست دەبێت، بەلأم سیستەمێکی هەیە بۆئەوەی ئەو فەواصیلە لەناوبچێت و بێتە سەر سیستەمێکی دروست زیندەگییەکی یەکسان و خۆش و پڕلەخێر و سەعادەت بۆ هەموو کەسێك نەك بۆ برێك کەس ڕێگاکەشی بریتییە لەو(إنفاق)ەی

كـــەمانایان خـــراپ لێكداوەتـــەوە و بەناونیـــشانی ڕەخنـــە ســـەیردەكەن و دەڵێت(بۆچی دەبێت لـەكۆمەڵگەدا برێك شت بدات بەبڕێكی تر).

یەكەم: فەقیر و دەوڵـەمەند ئەو شتە تەبعییە وا باسمكرد.

دووەم: دەبێت بەسیـستەمی دیـن بەرنامـەی ئینـسان ڕێكبخرێـت، سیـستەمە دینییەكەش ئەوەیە كە دەوڵـەتێك دێت(إنفاق)دەكات، ئەو انفاق و تـەعاون و هەمبەستەگییە واخەڵكی دەیكەن بەهێزی دەوڵـەتەكە ڕێكدەخرێت...دەوڵـەت دێت ئەوانەی لـەخەڵكەوە زیادە جائەو دێت هەر لـەســەرەتاوە ناهێڵێـت ئـەو سـێ ڕوكنـە لـەناوبـچێت لـەپاشـاندا مەسـرفیش ناهێڵێـت ئـەو سـێ ڕوكنـە لـەبەرچاو نەگیرێت كاتێك بەم جۆرە كراو ئەم سیستەمە ئیجاد كرا ئیتر خـود بە خود فەواصیل لـەناو دەچێت...

دین، واتە ڕێگە و ڕەوش وبەرنامە بۆئەوەی ئینسان لـەعەقڵ و ئیختیارێـك كـە نیسبەتی بە عەقڵـەكەی هەیەتی وەهـا ســوود وەربگرێـت بـۆ خۆیـشی و بـۆ خەڵكی تریش خەیر و سەعادەتی تێدابێت، ئەگەر وابێت ئینسان بەناونیـشانی مەوجودێكی كاملتر لـەحەیوان بەتەنها(سیستەمی سروشت)ناژی، چونكە كـە حەیوان كاملتر بوو لـەباقی مەوجودات نەدەژیا، حەیوان ئیحتیاجی بە غـەریزە بوو ئینسان غەریزەشی هەیە: واتـە حـەیوان سیـستەمی سروشـتی غـەریزەیی هەیە، ئینسانیش بەهـەمان شـێوە سیـستەمی سروشـتی غـەریزەیی هەیـە ئـەم دوو..بەشێكی زیاتریشی هەیە كەزیاترە لـەحەیوانات ئەویش دینە بۆیە ئینـسان بەسێ نیزام دەژی:

<u>یەكەم</u>: نیزامی سروشتی، بەشەكانی وجودی ئێمە، گۆشت و موو و ئێـسك و ئەو شتانە، ئەو چالاكییە سروشتییەی خۆیان ئەنجامی دەدەن بەبێ ئـەوەی لـە




ئیختیاری ئێمەدا بێت، واتە بۆ نمونە(مووی سەر)گەشە دەکات، ئێسکەکانی جەستە بەشێوەیەکی سروشتی گەشە دەکەن بەبێ ئەوەی لە ئیختیاری ئێمەدا بێت واتە بەبێ ئەوەی بەعەقڵ یان غەریزە دەخالەتی تێدا بکەین خۆی ئەنجام دەبێت.

<u>دووەم:</u> نیزامی غەریزە، خۆ ئێمە بەعەقڵ و فەلسەفە حاڵیمان نابێت(برسیمانە یان تونیمانە)گەرما یان سەرمامانە ئێش و ئازارێکمان هەیە! بەڵکو ئەمانە بەحوکمی غەریزە حاڵی دەبین، ئەمە دوو بەشیان و ئەگەر لەم دوو بەشەدا وازبهێنین ئەوە ئەو کاتە تەنها حەیوانێکین! چونکە مەوجودێکین کاملتر زهنێکی ئاوا پڕ توانامان هەیە زیادە بەشانەیەکمان پێدراوە کە ئەویش دینە.

<u>سێیەم:</u> دین، ئەگەر دین لە ئینسان وەربگریتەوە وەك ئەوە وایە غەریزە لەحەیوان وەربگریتەوە! کاتێك حەیوان کاملتر بوو لەباقی مەوجوداتی تەبیعی، ئەگەر غەیزەی نەبێت ناژی، چونکە کاملترە، دەی چونکە کاملترە پێویستی بەنیزام و مەنهەجێکی تر هەیە کە غەیزەیە، ئینسانیش کەکاملترە لەحەیوان ئەگەر زیادە بەشانەیەکی نەبێت ئیمکانی نییە بتوانێت ژیان بگوزەرێنێت! هەر دەبێتەوە حەیوان و ژیانێکی بۆ نابێت بەناوی (ژیانی ئینسانی)ئەوەش کەئەم ژیانە ئینسانییەی پێدەدات(دین)ە هەرچەند لەڕووی مادییەوە زیاتر پێشبکەوێت. بەڵام ئا ئەو مەتڵوب و مانایەی کەئێمە هەمانە لەزیندەگی ئینسانیدا کە سەعادەت وئاسایش وئارامشێکی فکری و ڕۆحی بۆ کەسێك ئائەو ئیمکانییە بەبێ(دین) بۆ ئینسان فەراهەم ببێت هەندێك کەس باش لەمانای سەعادەت تێناگەن ئێستاش من نامەوێت بەڕوونی و دوورودرێژی باسی بکەم... هەرئەوەندە دەڵێم: سەعادەت: بریتییە لەو (ئارامش و ئاسایشەی واهەموو کەس بەلیسبەتی ژیانی خۆی وژنی و منداڵی هەیەتی و




هیچ نیگەرانی وخەمێکی لەبێت سەعادەتێکی واقیعی واتـە ئـەوە... ئـا ئـەو جۆرە سەعادەتە بە زیندەگییەك مادی ئیمکانی نییە فەراهەم ببێت ئەگەر دینـی لـەگەڵ نەبێت! ئێستا ئەگەر سەرێکی دونیـا بکـەین بـۆ نمونـە، لـەجێگایـەکی وەك(ئەمــەریکا)کەباشــترین نمونەیــە دەتــوانین پیــشانی خــەڵکی بــدەین کۆمەڵگەیــەکی زۆر پێــشکەوتوو لــەڕووی زینــدەگی مادیــەوە، لــەڕووی تەکنیکــەوە دەژیــن وەك(ســور پێــستەکان) بــەراوردێکی بکــەین لـەگـەڵ کۆمەڵگەیەکـدا کەلــەڕووی مادییــەوە زۆر کەوتۆتــە دواوە ســەیردەکەیت لــەڕووی زینــدەگی مەعنــەوی و لــەڕووی مــەفهومی زینــدەگی ئینــسانییەوە ئەو(ئەمەریکایە)زۆر لـەدواترە، پەیوەندی تاك لـەکۆمەڵگەی(سور پێــستەکان) کەوتۆتە دواوە زۆر ئینسانی تر و مەنیقی تر و مەعقولـترە، تـاوەکو پەیوەنـدی ئینـسانەکان لـەکۆمەڵگـە(سـپی پێـستەکان)دا...کەواتـە ئـەو بابەتـەی ئێمـە واخەریکین قسەی لەسەر دەکەین کە ئینـسانە، بەمەنهـەج و بەرنامەیەکـەوە ژیانی کامڵ دەبێت و ژیانێکی ئینسانی بۆ فەراهـەم دەبێـت، ئـەو مەنهەجـەش بریتییە لـەو شتەی وا لایەنی(مەعنەوی زینـدەگی)بـۆ تـەئمین بکـات. لایـەنی مادییەکەی ئەوەتا هەوڵی بـۆ دەدات بـەبێ ئـەوەی کـە زینـدەگی مەعنـەوی فەراهەم ببێت یان نەبێت، لایەنی مادی ئیمکانی هەیـە و هـەوڵی بـۆ دەدات، بەڵام ئەوەی واگرنگە بۆ ئینسان کەسەعادەت و بەختەوەری بۆ تەئمین بکات بریتییە لی لایەنی(مەعنەوییەکەی)ئـەو لایەنـەش بـەبێ بەرنامـە و مەنهـەجێك ئیمکانی نییە خۆش بێت، جا ئێستا وەرن سەیربکەن و هەڵوێستەیەك لـەسـەر ئەوە بکەین کەلای زۆرێك لـەخەڵکی بۆتە پرسیار کە"بۆچـی خـوای گـەورە برێکی دەوڵـەمەند دروست کردووە وبرێکی فـەقیر؟". لێـرەدا ئەصـڵی مـەوزوع

هەڵەیە! خوا بڕێكی دەوڵەمەند نەكردووە و بڕێكی فەقیر، بەڵكو خوا ئینسانی دروست كردووە ئینسانی عاقڵ و خاوەنی زیهن و فیكر دروست كردووە، پاشان تەكلیفی لێكردووە بەتەناسوبی ئەوەی كەعەقڵ و فكر و زیهنی قەویە و دەتوانێت چاكە بكات دەتوانێت خراپە بكات بەرنامەی بۆ داناوە ئەگەر تبقی ئەو بەرنامەیە ڕەفتار بكات ئیمكانی نییە ئەو ئیختیلافاتە ببێت! دەی بە پێچەوانەشەوە تبقی لەو بەرنامەیە كار نەكات ئەو بەدبەختیانە دەبینێت وا دەیبینێت!

بۆیە باسەكە لەم نوكتەیەدا كورت دەبێتەوە كەئائەمە درۆیە خوا بڕێكی دەوڵەمەند دروست كردووە و بڕێكی فەقیر، بەڵێ، ئەوەش ڕاستە كەخوا جیاوازی كردووە لەو ئیستعدادەی بە ئینسانی داوە، ئەمە ڕاستە كەئیستعدادی جۆرجۆر هەیە لەئینساندا. بۆ نمونە، دوو ئینسان لەبابەتێكدا ئیستعدادیان هەیە مومكینە یەكێكیان بانتر بێت و ئەویتریان خوارتر، كەپەیدابوونی ئینسانی(نابیغە)شاهیدە بۆ ئەم باسە و ئەویشدەلیلی هەیە كەناكرێت ئێستا باسی بكەم،چونكە لەبابەتەكە دووردەكەومەوە كە بۆچی خوا دەرەجەی بان و خواری ئیستعدادی* داوە بەخەڵكی؟ لەپاشاندا مەتڵەبی دووەم ئەوەیە كە جیاوازی ئیستعداد هەیە، واتە هەر كۆمەڵێك بۆ بارێك ئیستعدادیان هەیە ئەویش ئەگەر باسی بكەم زۆر دوورودرێژ دەبێت!

بەڵام زۆر بەكورتی ئەوەندە دەڵێم(زیندەگی ئینسانی پێویستی بەم دووانە هەیە، هەم بان وخواری ئیستعداد، هەم جیاوازی ئیستعداد،"هەر كۆمەڵگەیەك بۆ بارێك") زیندەگی ئینسانی پێویستی بەوە هەیە. ئەوە ڕاستە خوا ئەو كارەی

*) جیاوازی ئیستعدادەكان: بۆ زیاتر شارەزابوون و حیكمەتی ئەم جیاوازیانە بگەڕێرەوە بۆ باسەكانی(م:ناصری سوبحانی)لە خلقی ئادەم+ئابوری).

کـردووە ئـەوەش صـەحیحەکە لەئـەنجامی جیـاوازی ئیـستعدادەوەیە جـــا لەباری چاکەدابێت یان لەباری خراپەدا، کەیەك نەفەر زۆر دەوڵەمەند دەبێت یەك نەفەری تر بـێ سـەروەت و سـامان دەبێـت ئائەمـە دیارەکـە لەبەرئـەو ئیستعدادەیە کەخوا بەتاکـەکانی بەخـشیووە، بـەلاّم لەسـەرەتاوە تەصـەوری ئینسانمان کرد کە دەبێت چۆن بێت نەك بۆ هەر مـەوجودێکی سروشـتی یـان نەك هەر بـۆ مـەوجودێکی (سروشـتی و غـەریزەی) وەك(حـەیوان) دەتـوانین گریمانەی بکەین، بەڵکو مەوجودێکی موکەلـەف و عاقڵ بۆیە هەرچەند خوای گەورە ئیستعدادی زیادی دابێتە ئینسان، یان ئیستعدادی جـۆر جـۆری دابێتـە ئینسان پاشان ئەمە دەبێتـە هۆکـاری ئـەوەی کەهەنـدێك لەژیانـدا لـەڕووی زیندەگی مادییەوە پێشدەکەون و برێك لـەدواوە دەمێنـەوە، بـەلاّم مەتلـەب لێــرەدا تـــەواو نابێــت! دوای ئائەمانــە شــتێکی تــریش مەترەحــە، کەئەوەیە(ئینسان)مەوجودێکی عاقڵە و تەکلیفی لەسەرە، حەیوان کەکەمێك کـامڵتر بـوو لـەباقی مـەوجودات بـۆ فـەردی خـۆی تـەکلیفی لەسـەربوو بەشێوەیەکی غەریزەیی لە هەمان کاتدا تەعاونیشی(کۆمەك)ی کردنیشی هەیە لەگـەڵ یـەکتردا ئـەمیش هـەر بەشـێوەیەکی غـەریزەی ئینـسانی کـامڵتر لەحەیوانات تەکلیفی زۆرتری هەیە، هەم بۆ تەئمینی ژیانی فـەردی، هـەم بـۆ تەئمینی ژیـانی کۆمەڵگەکـەی، بۆیـە کاتێـك بابـەتێکی بـەو جـۆرە مـەترەح دەکرێت کە بۆچی برێك لەخەڵکی دەوڵەمەند و برێـك فـەقیر ئـەوە بـزانین ئەمە پەیوەندی بەو نیزامەوە هەیە کە دەبێت لەناو کۆمەڵگەدا ئیجرا بکرێـت و ئیجرا نەکراوە! نەك بەوجۆرەی تەحی مەسەلە بکەین کە بۆچی خوا برێکی دەوڵەمەند خەلق کردووە و برێکی فـەقیر؟ ئەمـە هەڵـەیـە و پرسـیارێکی زۆر

ناشیاوانەیە، خوا جیاوازی ئیستعدادی داوە و لەبەرئەمە سەیردەکەیت کەسێك لەبەر هەوڵی خۆی ڕزقی زۆری دەست دەکەوێت، بەڵام ئەمە تەنها لایەکی قەزییەکەیە، لێرەدا کەبەم جۆرە باسی ئینسان دەکرێت تەنها لەشێوەی حەیوانێکدا گریمانە کراوە(وەك حەیوانێك تەماشا کراوە) لایەکی تری قەزییەکە مەترەحە کە فەرامۆشکراوە، ئەویش بریتییە لەوەی کە ئینسان(مەوجودێکی عاقڵە) و بەرنامەی دەوێت، دەی کاتێك باسی بەرنامەکە هاتە پێشەوە ئیتر لەم ئیستعداد و هەوڵدانە جیاوازەی واهەیە سەعادەتی تەواوی کۆمەڵگە تەئمین دەبێت، بۆیە لێرەوە هەڵەکە دەردەکەوێت کەئەویش ئەوەیە، کاتێك تەرحی ئەم بابەتە دەکرێت، وا سەیری ئینسان دەکرێت کە مەوجودێکی عاقڵ و موختار نەبێت هەروا بەشێوەیەکی سروشتی و دەوڵەمەند و فەقیر دروست کرابێت لەکاتێکدا وانییە.لەلایەکی تریشەوە موتەوەجیهی ئەمە بووین، کەئەمە واقیعییەتە و هەیە، کەبرێك بەهەوڵی خۆیان دەوڵەمەند دەبن و برێك کەمتر دەی ئەگەر وابێت چارەسەری چییە؟ دیسان هەر لەم ڕێگەیەوە موتەوەجیهی ئەوە دەبین کەچارەسەر ئەوەیە بەرنامەیەك هەبێت کە ئینسان بۆئەوەی بگاتە مانایی صەحیحی زیندەگی ئینسانی لەڕووی تاك و کۆمەڵگەوە تبقی ئەو بەرنامەیە بەڕێوە بچێت، چونکە کاتێك بەرنامەکە نییە ئائەوە ڕوودەدات کە دەیبینیت. جگە لەوەش خودی ئەو پرسیارەی کەمەترەح دەکرێت(لەبارەی دەوڵەمەندبوون و فەقیربوونی هەندێکەوە) شاهیدی ئەوەیە کە پێویستمان بە بەرنامەیەك هەیە، (بۆئەوەی ئەو جیاوازییە نەهێڵێت)، بەڵام ئەوەی هەڵەیە لێرەدا تەرحی پرسیار و باسەکەیە،کەوا تەرح دەکرێت و باسدەکرێت کە ئینسان بەشێوەیەکی

سروشتی وایە، دەی بەشێوەیەکی سروشتی فەقیر و دەوڵەمەند نییە و هەمووی وەکو یەك لەدایك دەبن، بەڵکو بەشێوەیەکی سروشتی جیاوازی ئیستعداد بوونی هەیە ئەم جیاوازییەش ئەنجامەکەی ئەوەیە کەیەکێك بۆ نمونە لەڕووی جیاوازی مادییەوە سەردەکەوێت و یەکێك لەدواوە جێدەمێنێت لێرەوە سەیردەکەین دەبینین ئەمە واقیعییەتە یەکێك هێز پەیدادەکات و یەکێك بێ دەسەڵاتە...کاتێك دەبینین ئەم جیاوازییە واقیعیەتێکە و هەیە دەبێتە شاهید، بۆئەوەی بڵێین ئائەم مەوجودە ئەوەندە جیاوازی و ئیستعداد و پلەی هەیە و وەکو حەیوانات نییە، پێویستی بە بەرنامەیەك هەیە کە صەحیح ئیدارە ببێت و ئائەم کێشانە دروست نەبێت. دین، واتە ئەوە. لێرەشەوە دووبارە دەگەینەوە بەو ئەصڵە(چونکە ئینسان مەوجودێکی کاملترە بە نیزامە سروشتی و غەریزەییەکە ئیدارە نابێت، بەڵکو نیزامێکی تریش پێویستە لەبارەی زیندەگی مەعنەوی لەڕووی تاك و کۆمەڵگەوە تەنزیم بکات).

ئێستا زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت کەهۆکاری سەرهەڵدانی ئەوەی کە یەکێك دەوڵەمەندە و یەکێك فەقیر پەیوەندی بەوەوە هەیە کە(سوء ئیستیفادە)کراوە لەو جیاوازییە ئیستعدادییەی ئینسان هەیەتی، بۆئەوەی چارەسەری ئەو (سوء )ەش بکرێت دێین کار بە(نەزمی دینی)دەکەین و ئەو چارەسەری ئەو جیاوازییانە دەکات کەلە عەقڵدا دروست دەبێت.

جائێستا لەبارەی چارەسەری(دین) بۆ ئەو فاصیلە و جیاوازییەی کەدروست بووە(بەشێك دەوڵەمەند و بەشێك هەژار) بە پشت بەستن بە ﴿أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم﴾ دەبێت!!!

## باسی یەكەم:

# هەدەف لە دروستبوونی مرۆڤ
# لە نێوان سوبحانی و موفتی زادەدا.

یەكێك لەو پرسیارانەی بە درێژی ژیانی هەر تاكێكی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی درێژدەبێتەوە و، بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە (كات و شوێن)ەوە نییە (بەتایبەت دوای ئەوەی بابەتی دین و خوا و ئیلتزامات بە فەرمانەكانی خواوە سەر هەڵدەدەن)بریتییەلە (پرسیار كردن لە هەدەف لە بوونی مرۆڤ)، واتە (ئامانجی خودا لە دروستكردنی ئەم جیهانە چییە؟)

دیارە ئەمە زۆر جەوهەرییە بۆیە دەبینین زۆربەی زۆری، و بگرە بیریاری دونیای ئیسلامی نییە ئەم پرسیارەی ڕووبەڕوو نەكرابێتەوە، و ئەویش بە بیركردنەوە و تەئویل و تەحلیلی خۆی و هەندێكجار بە پشتبەستن بە پێشینانی وەڵامێكی نەدابێتەوە، ئێمە لەم باسەدا هەوڵدەدەین لە ناو كاروانی بیری ئیسلامیدا تەنها دوو دانە لەو بیریارانە بهێنین و وەڵامەكانیان بخەینە ڕوو، ئەوانیش زانای كورد (مامۆستا ناصری سوبحانی و كاك ئەحمەدی موفتی زادە)ن.

هەندێك پێیانوایە هەدەفی خودا لە دروستكردنی مرۆڤ ئەوەیە: كە (عبودیەتی) بۆ بكەن، بۆنمونە (نوێژ)، بەڵام ئەوە دەزانین كاتێك وەڵامی




پرسیارێك لــە بەرامبــەر پرســیارەكەوە قبوڵــدەكرێت، كــە وەڵامەكــە نەبێــە سەرچاوە بۆ كردنی پرسیارێكی دیكە، وەك ئەوەی (ئەی خودا چــی كــارێكی بەوە هەیە ئێمە نوێژی بۆ بكەین؟)

هەرچەندە وەڵامی ئەم پرسیارەش ڕوونە، چونكە ئەوە ئێمــەین ئیــشمان بــەوە هەیە نوێژ بۆ خودا دەكەین، بەڵام لـەبەرئەوەی لــوتفی "خــودا ئەوەنــدە زۆرە ڕێگەی پێگەیــشتن و لێ نزیــك بوونەوەشــی پێوتــووین كــە نوێــژە، ئەمەجگــە لـەوەی خودا بە زمانی حاڵ پێمان دەڵێت "بەشەرییەت! ئەگەر بێتوو ڕێگــەتان پێپیشان نەدەم بۆ عبودییــەتی خــودا، ئــەوا وەك هەمیــشە یــەكێك لــەخۆتان دەكەن خودا و دەیپەرستن و نوێژی بۆ دەكەن..." بــەڵام وەك دیــارە ئەمــەش نابێتە وەڵامی سەرەكی پرسیارەكەمان، چونكە ئەگەر تەماشا بكەن ئێمە هــاتین لــە ڕێگــەی بەشــكردنی پرســیارەكەوە چــەند وەڵامێكــی فــەرعیمان دایــەوە نەمانتوانی ئەصڵی مەتڵەب ڕونبكەینەوە! لـەبەرئەمەیە دەبێت ئێمە ئەم پرسیارە وەك خۆی بگرین و قسەی لـەسەر بكەین. لـە كتێبی (مەسەلـەكانی ئافرەت)دا لـە (مامۆستا ناصری سوبحانی) دەپرســن "ئایــا ئایــەتی -٥٦-ی ســورەتی - الـزاریات- ﴿وَمَا خَلَقْــتُ الْجِــنَّ وَالْـإِنسَ إِلَّــا لِيَعْبُــدُونِ﴾ ناكرێتــە ئیــستدلالی (حیكمەتی) دروست بوونی مرۆڤ؟" مامۆستاش لـە وەڵامدا دەڵێت"ئەم ئایــەتی باس لـە بابەتی(كاری مرۆڤە) نەك (حیكمەتی) دروست بوونی". پــێش ئــەوەی ڕونكردنەی باسەكە ئەوە بڵێم، كە (مامۆستا ناصــر) لــە جیــاتی (هــەدەف - ئامانج-) وشەی (حیكمەت) بەكاردەهێنێت، كە لـە ڕووی ناوەڕۆكەوە هــیچ جیاوازییەك لـە باسەكە و ئەصــڵی مەبەســتدا دروســت ناكــات، چــونكە لــە هەردوو بارەكەدا قسە لـەسەر نەزانراوێكە، هەوەك چۆن ئەگەر (مــرۆڤ) یــان




(عالەمی هەستی – جیهانی بینراو–)بەکاربهێنین هیچ فەرقێك ناکات، واتە بڵێیت هەدەف لە دروست بوونی مرۆڤ چییە؟ یان هەدەف لە دروست بوونی جیهانی هەستی چییە؟ لە خودی پرسیارەکەدا جیاوازییەکی وانابێت و دەتوانرێت لە ڕێگەی قسەکردن لەسەر یەکێکیان بگەیت بە وەڵامێك کە بۆ هەردووکیان بەکاربرێت، چونکە هەروەك وتم قسەکردن لەسەر هەدەفەکە کە نەزانراوە، نەك مرۆڤ یان جیهان...

لە دیدی (مامۆ ستا ناصری سوبحانی)ەوە مرۆڤ لەکاتی کردنی ئەم جۆرە پرسیارانەدا بابەتێك هەیە دەبێت دەرکی بکات و بە گرنگ وەری بگرێت، کە دواجا شارەزا بوون و جیاکردنەوەی ئەم بابەتە دەبێتە یارمەتی دەری لە دەستکەوتنی وەڵامەکاندا، ئەویش بریتییەلە بابەتی (لێپرسراوێتی مرۆڤ و پەیوەندی بە تواناکانییەوە)، واتە کاتێك مرۆڤ پرسیارێك بە زهنیدادێت و دەست دەکات بە لێکۆڵینەوە و گەڕان بە شوێن وەڵامەکەیدا، لەسەرەتادا دەبێت ئەم قاعیدە ئەساسییەی لە بەرچاو بێت، کاتێك خوای گەورە مرۆڤی وەك جێنشین لەسەر زەوی دانا بۆ دوو مەبەست بوو:

**یەکەم: تەتبیقی بەرنامەی خوا لەسەر زەوی.**

**دوو: ئاوەدان کردنەوەی زەوی*.**

ئەگەر کەمێك ورد بینەوە و تەماشابکەین دەبینین هەر خودی (خەلیفە)بوونەکەی بریتییە لە (بەرپرسیارێتی)، جا بە خوێندنەوە و قوڵبوونەوەی (سوبحانی)لە قورئان ئەوەی دەرککردووە، کە خوای گەورە

---

*) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیەوە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باسی (خلق ادم)، مامۆستا ناصری سوبحانی، CD.





بۆئەوەی مرۆڤ هەستێت بە ئەنجامدانی ئەم بەرپرسیارێتییە و ئەركەكانی سەرشانی لەو دوو زەمینەیەدا ڕاپەڕێنێت كۆمەڵێك لە توانایی و ئیستعدادی پێبەخشیوە. ئەم (توانایی و ئیستعداد)انەش بە ئامادەبوونی (كۆمەڵێك لە ئیحتیاجات)وادەكەن لە مرۆڤ بە بەردەوامی لە حەرەكەتدا بێت و هەوڵبدات و كۆشش بكات، لە كۆتایشدا لەم ڕێگەیە وە (جێنشین بوونی خۆی) ئەنجام بدات و ئەركەكانی سەرشانی جێبەجێبكات، جا بەبڕوای (مامۆستا ناصر) لەبەرئەوەی خوای گەورە خاوەنی (صیفاتی رەحمان و رەحیم)*ە هاتووە تەواوی ئەو تواناییانەی مرۆڤ لەم دونیایەدا بۆ ئەداكردنی مەسئولییەتی پێویستی پێیەتی پێی بەخشیوەو و مسقاڵە زەڕەیەك لە (توانایی)نییە مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی كارێكی پێویستی پێی بێت و ئەو پێی نەدابێت!! لێرەشەوە (سوبحانی) دەگاتە ئەوەی بێت خوێندنەوەیەكی تایبەت بۆ بابەتەكە بكات و دەربارەی ئەو پرسیارە وەڵامی تایبەت بداتەوە..

كەواتە بەپێی ئەم قاعیدەیەبێت، دەبێت ئێمە كاتێك دەمانەوێت كارێك ئەنجام بدەین، یان پرسیارێك بكەین ئەوە لەبەرچاوبگرین، كە ئایا ئەم كار و پرسیارە چی پەیوەندییەكی بە ئەنجامدانی بەرپرسیارێتییەكەمانەوە هەیە؟ لە خۆمان بپرسین ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە نەزانین تا چ ئەندازەیەك دەبێتە ڕێگر لەبەردەم كارەكانماندا؟ ئایا ئەم پرسیارە پەیوەندی هەیە بە لێپرسراوێتیمانەوە یان نا؟ ئەگەر پەیوەندی هەبێت ئەوە بێگومان خوای گەورە لەگەڵ دروست بوونی مرۆڤدا ئەو توانایيە پێبەخشیوە و دەتوانێت ئەو كارە ئەنجامبدات، یان

---

*) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیەوە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باسی (اثبات وجود، نظامی سیاسی، اسماء الحسنی)، مامۆستا ناصری سوبحانی، CD.




وەڵامی ئەو پرسیارەی دەست بكەوێت، ئەگەر پەیوەندیشی نەبێت ئەوە هیچ پێویست ناكات خۆی زەحمەت بدات و بەشوێت وەڵامەكەیدا بگەڕێت، چونكە خوای گەورە توانایی ئەوەی پێنەداوە وەڵامی ئەو پرسیارەی دەستبكەوێت.

جا ئێستا با بێین پرسیاری (هەدەف لە دروست بوونی مرۆڤ) بەپێی ئەم قاعیدەیە لە دیدی (مامۆستا ناصری سوبحانی)ەوە ئاراستەبكەین.

مامۆستا ناصر، دەڵێت"پرسیاری ئەم جیهانە بۆچی دروست بووە؟ پەیوەندی بە لێپرسراوێتی مرۆڤەوە نییە، كە پەیوەندیشی نییە خواش توانایی پێنەداوە دەركی بكات و بیزانێت". ئەو دێت بۆ زیاتر ڕونكردنەوەی باسەكە نمونەیەكی سادە دەهێنێتەوە، كە لەڕێگەیەوە هەوڵدەدات ئاسانكاری بكات بۆ تێگەیشتنی ئەو كەسانەی ئاوا پرسیارێك دێت بە زیهنیاندا.. دەڵێت "من لە ماڵەوە دانیشتوم لە پەنجەرەوە تەماشایی (خیابان)-شەقامێك- دەكەم، كەسێك هات و بە بەردەمی مندا تێپەڕ بوو، واتە لەمبەری شەقامەكەوە چوو بۆ ئەو بەری شەقامەكە، منیش نازانم ئەم كەسە بۆچی دەچێت، حیكمەتی چوونی ئەو بەم ڕێگەیەدا چییە؟ هۆ و پاڵنەری ئەو حەرەكەتەی چییە و كۆتایی ئەنجامی ئەم حەرەكەتەی چی دەبێت؟ جا ئەو كەسە كارەكە ئەنجامدەدات هەر خۆیەتی و دەشزانێت بۆچی دەچێت. دەی بەمن چی؟! بەڵام كەسەكە چونكە كارەكە هی خۆیەتی دەزانێت بۆچی دەچێت و حیكمەتی چوونەكەی چییە، بەڵام چونكە كاری من نییە، ئەم نەزانینەی من لە چوونەكەی ئەو هیچ لە كارەكەی كەم ناكاتەوە! لە هەمان كاتدا ئەگەر خۆی نەیزانییایە بۆچی دەچێت ئەوكاتە چونەكەی هەڵە دەبوو، یان

نەدەڕۆشت، یان سەرگەردان و بێمەبەست دەڕۆشت"[1]. کەواتە لێرەوە تێدەگەین، لەبەرئەوەی زانینی من هیچ پەیوەندییەکی بە چوون یان نەچوونی ئەوە نییە، کەواتە من پێویستیم بە زانینی وەڵامی ئەو پرسیارە نییە، کە دەڵێت (ئاخۆ ئەو پیاوە بۆچی چووە ئەو بەری شەقامەکەوە؟).

ئەوەش بڵێم، کاتێك (تۆ) لەماڵی خۆت دانیشتویت و سەیری خیابان دەکەیت، ئەوە بزانە لەو کاتەدا (تۆ) بەرپرسیاریت لە ئەنجامدنی کارێك بۆیە بۆت گرنگە وەڵامی ئەو پرسیارە بزانیت، چونکە دەبێت لێرەدا لەوە ئاگاداربیت، ئەگەر تۆش بەبێمەبەست لە چون و نەچوونی ڕێبواران پرسیار بکەیت بەبێئەوەی هیچ پەیوەندییەکی هەبێت بە ئەدای مەسئولییەتەکەتەوە، خەڵکی بە جۆرێکی تر تەماشات دەکەن، لەوانەشە هەر پرسیاریش نەکەیت، بەڵام لە هەمان شوێندا دابنیشت و ئەمجارە پێت بڵێن "چاودێری ئەو دوکانەی بەرامبەرت بکە"، ئێستا لەبەر ئەوەی چاودێریکردن ئەرك و بەرپرسیارێتییە دەبینیت زۆر گرنگە زانیاری تەواوت هەبێت لە چوونە ژوورەوەی هەرکەسێك بۆ دوکانەکە، ئەگەر ئەو زانیارییەت نەبێت ئەوا تۆ نەتوانیوە بەرپرسیارێتییەکەی خۆت ڕاپەڕێنیت. بۆیە (مامۆستا ناصر)، دوای ڕونکردنەوەی بابەتەکە دەڵێت "دواجار پێویست ناکات من زهنم مەشغوڵ بکەم، بۆچی من نازانم ئەو کەسە بۆچی دەچێت؟ چونکە ئەو کارەکەی بە نەزانینی من پەکی ناکەوێت. دەبێت من هۆشی ئەوەم هەبێت کارانێك لە سەرشانمن زانیاریم لەبارەیانەوە هەیە، پاشان چۆن بەرنامە دادەنێم بۆ

---

[1])مامۆستا ناصری سوبحانی: مەسەلەکانی ئافرەت،ئامادەکردنی، سالم بێـ٠'' ،چاپی یەکەم.

جێبەجێكردنیان، كەواتە دروستكردنی ئەم جیهانە بە مرۆڤیشەوە كاری دروستكەری ئەم جیهانەیە، كە تەنها خۆی دەزانێت بۆچی دروستی كردووە و لە خۆی نەزانراو نییە، بەڵام من تەنها ئەوەندە لێپرسراوم بزانم بەندایەتی دروست بوونم چۆن ئەنجام دەدەرێت؟ كەسێك بڵێت هەردەبێت وەڵامێكم دەستبكەوێت لە حیكمەتی دروست بوونی ئەم جیهانە، وەڵام ئەوەیە ئاماژەم بۆ كرد، مرۆڤ دەبێت قەدری خۆی بزانێت، لەبەرەی خۆی پێ زیاتر رانەكێشێت، ئەگەرنا وەك ئەو كەسەدەبێت كەدەڵێت"چونكە میكرۆب هەیە دەبێت بە چاو ببینم"! با هەشتا ساڵی تەمەنی سەرف بكات و تەماشایی دەستی بكات هەرچەندە میكرۆبی پێوەبێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێت ببینێت! ئیدی هەم لە كارەكانی تری دەكەوێت، هەم بەرهەمیشی دەستناكەوێت".

كەواتە بەبڕوای (مامۆستا ناصری سوبحانی) ئیمكانی نییە مرۆڤ بەم توانایی و بەرپرسیارێتییەی ئێستا هەیەتی بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە دەست بخات و بیزانێت، هۆكارەكەشی نەتها لەبەرئەوەیە زانینی وەڵامی ئەو پرسیارە پەیوەندی بە (بەرپرسیارێتی) مرۆڤەوە نییە، كەواتە خوداش توانایی زانینی ئەوی پێنەداوە، چونكە لای خودا یاسایەك كاردەكات كە دەڵێت "هەموو ئەو توانایی و ئیستعدادەی پێویستە بۆ ئەنجامدانی بەرپرسیارێتی مرۆڤ لەسەر زەوی پێمان بەخشیوە، هەرشتێكیش پەیوەندی بەم توانایی و ئیستعدادەوە نەبێت پێمان نەداوە و ناشتوانێت ببێت و دەستی بكەوێت...".

ئەوەی تا ئێرە خوێندتەوە شرۆڤە و وەڵامی (سوبحانی)ە، لێرە بەدواوە دێین بیرو بۆچوون و لێكدانەوەكانی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) دەخەینە ڕوو. ئەو لە كۆبوونەوەیەكی تایبەتیدا كە ئێستا بە باسی (هەدەف لە خەلقی





ئینسان) بەناوبانگە دەربارەی ئەم بابەتە بەم شێوەیە دەستدەكات بە وەڵامدانەوە و ڕوونكردنەوە:

ئەو پرسیارەی بۆ كۆمەڵێك لە براو خوشكان دروست بووە، مەسائیلی گرنگن و گرفتاری جۆر جۆری زهنی و فكریان دروستكردووە، ئارەزوومان ئەوەیە بەئومێدی خوای گەورە بتوانین ڕوونكردنەوەیەك بدەین كەئەو كێشەو گرفتە زهنیانەی دروست بوون بڕەوێتەوە....

یەكێك لە پرسیارەكان كەلە زۆرینەی خەڵكەوە دەیبیستم ئەمەیە كە(هەدەفی خوای گەورە لە خەلقی جیهان بەگشتی و بەتایبەتی خەلقی ئینسان چییە؟ خوا مەبەستی چییە و بۆچی ئەم جیهانەی دروست كردووە؟ بۆچی ئینسانی دروست كردووە؟

بەكورتی ڕوونی بكەمەوە لە زەمینەی مەسائیلی بەم جۆرەدا، واتە هەدەفیابی (ئامانج لەبارەی هەر شتێكەوە) بێژم جالەوەودوا دێینە سەر ئەصڵی مەتڵەب. بەشێوەیەكی ئاسایی ئەمە لەخەصڵەتگەلی موهیمی ئینسانە كەهەمیشە ئەوەتا لە تەعقیبكردن و پەیداكردنی هەدەفی دروست بوونی شتەكاندا، شتگەلێك كەدەیبینیت لە مەوجودات، یاخود لەڕوداوگەلێك كە پێشدێت بۆی گرنگە كەبزانێت هەدەف چییە ئەم مەوجودە بۆچی دروست بووە، جاچ مەوجودێكی سروشتی و ئاسایی، چ مەوجودێكی دەستكرد (دروستكراوی دەستی مرۆڤ)، یاخود ڕوداوێك ڕویداوە، یان ئینسانێك هەستاوە بە ئەنجامدانی كارێك، جوڵەیەك لە كۆمەڵگەیەكدا دەستی پێ كردووە، ئەمانە بۆ چ مەبەست و هەدەفێك بوون؟

ئەمە لەتایبەتمەندییەكانی ئینسانە و زۆریش گرنگە و فرەش ئەرزشدارە ئەم (هەستی بە شوێندا چوونە) لە ویژدانی ئینساندا بۆ دەركی هەدەف لە دروست بوون و ڕودانی ڕوداوەكان خەصڵەتێكی فرە ئەرزشدارە كە خوای گەورە بە ئینسانی بەخشیووە. هەروەها بەزۆری ڕازی بزاوتبوونی (حەرەكەت بوونی) ئینسان (پوویا بوونی ئینسان) ئەم خەصڵەتەیە!{واتە یەكێك لە ئەو هۆكارانەی كە بۆتە هۆی ئەوەی مرۆۋ ئەوەندە بزاوو گەڕۆك بێت بەشوێن شتەكاندا و دەست بۆ كەشفی هەموو شتێك بەرێت ئەوەیە كە خەصڵەتی ئەوەی تێدایە هەوڵدەدات ئامانج لە ڕوودانی شتەكان بزانێت}. هەڵبەتە زۆر شت هەیە كە هۆكارە بۆئەوەی كە ئینسان (پوویاس)، ناتوانێت ڕاكین و ساكین بێت وەك باقی مەوجوداتێك كەدەیانناسین. بەگشتی ئینسان بە پێچەوانەی تەواوی مەخلوقاتەوە هەمیشە ئەوەتا لە حەرەكەتدا و بەرەو كەماڵ دەڕوات ئەمە هۆكاری زۆری هەیە، بەلاّم یەكێك لە هۆكارە بنەڕەتییەكانی هەر ئەم خەصڵەتەیە كە لەنیهادیدا لە ویژدانیدا جێگەی كراوەتەوە، (هەدەفیابە)، واتە بە شوێن هەدەفی شتەكاندا دەگەڕێت! هەوڵ دەدات هەدەف و غایەتی شتگەل بدۆزێتەوە. جا نمونە گەلێك لە(ئامانجداری) لەلایەنی كردارییەوە موتاڵەعە بكەین و كاریگەری و جێكەوتەی ئەم (بەشوێن هەدەفدا چوونە)دا لە دوو بارودۆخی دژ بەیەكدا، بخەینە بەرباس و لێكۆڵینەوە(ئەو كاتە زۆر شتمان بۆ ڕون دەبێتەوە). لە حاڵەتێكدا كەهەدەف بۆ ئینسان دەرنەكەوتبێت یاخود هەدەفی دەركەوتبێت. لە زهنی خۆتاندا ئینسانێك تەصەور بكەن كە هێشتا پەیوەندی لەگەڵ دونیای ئینسانی ئەم ڕۆژەدا پەیدا نەكردووە، بۆ نمونە (لە جەنگەڵەكانی ناوەڕاستی ئەمەریكا یان

ئەفریقا) زیندەگی دەكات و هێشتا خەڵكی ڕێگەیان نەكەوتۆتە ئەو شوێنەوە و (نازانن لە شوێنێكی وادا خەڵكی دەژین)، هەروەها ئەو خەڵكەی لەوێیە پەیوەندی لەگەڵ خەڵكی دەرەوەی خۆیدا نەكردووە تا ئەو مەسائیلانەی بۆ ئینسانی دونیای ئەمڕۆش پێشهاتووە دەركی بكات. بەشێوەیەكی(جەنگەڵی) و نیوە وەحشی یاخود تەواو وەحشی زیندەگی دەكات. ئەوەش بڵێم ئەو ئینسانەش هەر خاوەنی خەصڵەتی(بەشوێندا چوونی هەدەف)ی هەیە هەر چەند زۆر زۆر سەرەتایی بێت. هەڵبەتە ئەمەی كەدەیڵێین بەشێوەیەكی گریمانەیی ئینسانێكی بەوشێوەیە تەصەور بكەین خۆ لەڕاستیدا دەكرێت ئەمە واقیعیەتی هەبێت و ئێستا كەسانێك هەبن بەو شێوەیە بژین، چونكە لە ئێستادا تەواوی جێگەكانی دونیا هێشتا نەناسێنراوە و كەشف نەبووە بۆ مروڤی شارستانی و پێشكەوتوو، دەكرێت لە گۆشەگەلێكی دونیادا ئەفرادێك لە ئینسانگەل هەبێت كە پەیوەندییان لەگەڵ ئینسانەكانی دیكەدا پەیدانەكردبێت و بەشێوەی ژیانی سەرەتایی مابێتنەوە، چونكە حەرەكەتی زیندەگی حەرەكەتێكە دەستەجەمعی، ئەفرادێك كەدابڕاون لە كۆمەڵگەی بەشەری ئاسایی ئەو حەرەكەت و پێشكەوتنەی كۆمەڵگەی بەشەری دەیكەن ئەوان نایكەن، جا چی ئەمە واقیعیەتی هەبێت، چ نەی بێت مەسەلەكە قابیلی دەرك و تەصەورە، ئەگەر واقیعیەتی نەبێت دەتوانین گریمانەی ئینسانێكی بەو جۆرە بكەین. لەو فەزایەیی وا ئەو ئینسانە زیندەگی دەكات بەتەنها و بێبوونی پەیوەندی لەگەڵ بەشەرییەتی پێشكەوتوودا تەصەوری ئەوە بكەن؟ دەزگای(ڕادیۆ)ی دەست كەوتبێت(بەهەر جۆرێك بێت ڕێی لێكەوتبێت) ئەو ئینسانە كاتێك ڕێی لەم (ڕادیۆ)یە دەكەوێت بەهۆی خەصڵەتی




(هەدەفیابی)(بەشوێن هەدەفدا چوون) و گەڕان بۆ دۆزینەوەی مەبەست و هەدەفی شتەکان سەرنجی ڕادەکێشێت بۆ ئەو دەزگای ڕادیۆیە و ئارەزوو پەیدا دەکات کەبزانێت ئەم دەزگا چییە و بەکاری چی دێت؟ چ هەدەف و مەبەستێك هەیە لەدروست بوونی ئەم دەزگایەدا؟
دوو حاڵەتە پێچەوانەکەی سەرەتا وتم لە مەوردی ئەم شەخصەدا و ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ ڕادیۆ و هەوڵدانی بۆ دۆزینەوەی سود و هەدەفی ڕادیۆ لە زیهنی خۆتاندا تصویر بکەن، حاڵەتێکی ئەمە بێت کەکەسێك نەبێت پێی بڵێت"ئەمە دەزگایەکە بەم کەیفییەتە و کاری ئەوەیە" حاڵەتێکی تری ئەوە بێت کەکەسێك بۆی بەیان بکات و بۆی ڕوون بکاتەوە. لەو کاتەی کەکەسێك نییە پێی بێژێ کەئەم دەزگایە چییە و بەکەڵکی چی دێت ئەم ئینسانە دەکەوێتە هەوڵ و ماندوبوون(بۆئەوەی هەدەفەکەی دەست بکەوێت) ئەویش بەپێی ئەو تواناییانەی کەهەیەتی بۆغونە، لەسەرەتادا دێت و هەر سەیری ڕوخساری دەرەوەی (ڕادیۆ)کە دەکات، ئەم دیو ئەو دیوی، سەرەوەی، خوارەوەی..بەتەواوی ئەو هێزە زیهنییەی کەهەیەتی دەکەوێتە گەڕان لە ڕووی ڕوخساری ئەم دەزگاوە کەچاوی پێی کەوتووە ڕازی سودو مەبەست و هەدەفی دروست بوونی ئەم دەزگایە کەشف بکات، کاتێك شتێکی دەست نەکەوت دەکەوێتە دەست دان لە(پارچەکانی لە دوگمەکانی) وردەوردە ئەگەر کەشفی نەکرد دەکەوێتە تەشریح و کردنەوەی و دەست دەکات بەگەڕان لەناویدا، تاوەکو لەکۆتایدا ئەو حیسە ئەوەتا لە وجودیدا ئیرزای بکات، جاچ بگاتە کەشفی یان نەگات پێی، مەتڵەب ئەوە نییە کە ئایا سەرکەوتوو دەبێت لە زانینی دەزگای بەردەستی یان سەرکەوتوو نابێت،




هەوڵدەدات بۆئەوەی کە مەبەست و هەدەفی دروست بوونی ئەم دەزگایە بدۆزێتەوە، ئێستا شێوازی کەسی دووەم بهێننە بەرچاوی خۆتان ئەوەی کە دەیزانی هەدەف لە دروست بوونی دەزگاکە چییە:

لەکاتێکدا کەئەم ئینسانە بەتەواوی شەوق و ئارەزووە ئەوەتا لەهەوڵی ئەوەدا بەشکوم کەشفی ئەوە بکات کەئەم دەزگا بۆچی دروست بووە؟ یەك نەفەر لە مەردمی دنیای ئەمڕۆ بڕوات و ڕێگەی بکەوێتە ئەو(جەنگەڵە) و پەیوەندی پەیدابکات لەگەڵ ئەو ئینسانەدا، سەرفی نەزەر لەو ڕووبەڕوو بوونەوە ئەوەڵییەی کەیەکەمجار دەیبینن...(لێرەدا قسە لەوەدایە کە گەیشتۆتە ئاشنایی و یەکتریان ناسی) و توانیان بەهۆکارێکەوە لەزمانی یەکتر حاڵی بن، شتێکی بەو شێوەیە تەصەور بکەن، بۆنمونە یەك نەفەر لە قەبیلەی ئەو ئینسانە کەبەشێوەی وەحشیگەری زیندەگی دەکات، وافەرز بکەین لەمنداڵیدا، لە گەنجیدا لەو فەزایە هاتبێتە دەرەوە و پەیوەندی لەگەڵ دونیای پێشکەوتودا پەیدا کردبێت و شتگەلێك فێربووبێت و گەڕابێتەوە ناو جەنگەڵ پەیوەندی پەیدابکات لەگەڵ ئەو فەردە جەنگەڵییەدا، (ئەمە بۆ ئەوە ئێژم کەئەم تەصەورە دروست نەبێت ئاخر چۆن دەبێت ئینسانێك لە دونیای پێشکەوتودا بڕوات ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ ئینسانێکی بەو شێوەدا و بکرێت تەفاهومیان بێت؟! بە چ زمانێك قسە بکەن؟ لەبەرئەوە دەیڵێم ئەگینا پێویست ناکات، ئەم فەردە دەڕوات و چاوی دەکەوێت بەو ئینسانە هەوڵی ئەو ئینسانە جەنگەڵییە دەبینێت بۆ کەشفی سود و مەبەست و هەدەف لەدروست بوونی ئەو دەزگایەدا، دەست دەکاتە ڕونکردنەوە بۆی ئێژێ "بەڵێ ئەمە یەکێکە لەکارەکانی بەشەر کە مەرکەزگەلێك دروست دەکرێت بەناوی(وێستگەی




ڕادیۆی) و لەوێوە كەسانێك قسە دەكەن و بەوەسیلەی ئەو وێستگەوە شەپۆل بلاودەبێتەوە دەزگایەكی وادروست كراوە پێی ئێژن(ڕادیۆ) ئەم ڕادیۆیە كاری ئەوەیە كەئەو شەپۆلانە جارێكی دیكە دەكاتەوە بە دەنگ و دوای گەڕان و كەناڵ گۆڕین، ئەو دەنگەی خۆی مەبەستییەتی دەستی دەكەوێت و گوێی لێدەگرێت". شتێكی بەو جۆرە ڕوون دەكاتەوە بۆ ئەو ئینسانە جەنگەڵییە، جالێرەدا حاڵەتی ئەو ئینسانە بپێون لەگەڵ حاڵەتی یەكەمدا، كە كەسێك نەبوو بۆی ڕونبكاتەوە ئەم دەزگایە چییە؟(بیربكەنەوە) بزانن چەند فەرق دەكات؟!

سەد و هەشتا دەرەجە حاڵەت و تێڕوانین و هەوڵدانی ئەم ئینسانە دەگۆڕێت! چۆن؟! لەسەرەتاوە هەر بەحوكمی ئەو ئەنگیزەیەیی ئەوەتا لە دەرونیدا هەر هەوڵدەدات و هەوڵدەدات... بەشكوم هۆكاری ئەوە بدۆزێتەوە كەئەم دەزگایە بەكاری چی دێت، بەلاَم لەگەڵ بۆی ڕونكرایەوە كەئەم دەزگایە خاسیەتی ئەوەیە ئیتر هەوڵدان تەواو دەبێت و لە هەوڵدان دەوەستێت، ئیتر كارێك ناكات. بۆچی؟ لەبەرئەوەی هەرچەندە ناسینی مەوجودێك خۆشە، بەلاَم ناسینی مەبەست و پەی پێبردن بەنەتیجە ئەوەندە گرنگە كەئیتر ئەو مەسائیلە موهیمە دەكەوێتە نێوان هەوڵدان و ئەنجام گیربیەوە، لەكار دەكەوێت مەسائیلەكانی (ناو ڕێگاش) ئەو ناسینانەیە كە وردەوردە حاصڵ دەبێت تاوەكو ئینسان بەهۆیانەوە بگاتە كەشفی نەتیجە و سود لە بەوجود هاتنی دەزگایەك، كاتێك كە ئینسان دەگاتە ئەو نەتیجە گرنگە و حاڵی دەبێت هەدەف و مەبەست لەدروست بوونی دەزگایەك، یاخود پێشهاتنی ڕوداوێك چییە، ئەوەندە ئەو مەتڵەبە گرنگە تازە ئیتر هەوڵدانی بچكۆلە بچكۆلەی ناو




ڕێگا گشتی دەوەستێت! ئەمەیشە بەشێوەیەکی بەرچاو لە زیندەگی گشتماندا دەبینین، لە ئێستا ئینسانگەلێك کەئاشنان بەڕادیۆ و دەزگایی ڕادیۆیان هەیە و سودی لێوەردەگرن، چونکە مەبەست و هەدەف .بەدروست بوونی ڕادیۆ دەزانن ئەم ئەنگیزەیان لە ویژداندا نیە کە هەوڵبدەن بۆ ناسینی بەشەکانی ڕادیۆ! مەگەر کەسانێك بەتایبەتی هەدەفێکی تریان هەبێت بۆ نمونە، گەرەکیان بێت ببنە (ڕادیۆساز) ئەوە مەسەلەیەکی ترە. بەلاّم بەشێوەیەکی ئاسایی بۆ ئینسانییەت ئەم هەوڵدانە ئیتر نامێنێت(کاتێك کەهەدەفیان بۆ ڕۆشن بوویەوە)هەرچی ماڵە تەماشا دەکەیت دەزگایی ڕادیۆی هەیە و سودی لێوەردەگرن و دوای گوێگرتن لێی دەیکوژێننەوە و تەواو! ئیتر هەوڵ و تەلاشێك نیە بۆئەمە کەشفی ئەم ڕادیۆ بکەن و جوزئییاتی بناسن، تاوەکو ڕازی نیهائی دەرکەوێت بۆیان. ڕازی نیهائی کەدەرکەوتووەی ئیتر شتە سەرەتاییەکان گشتی لەبیر دەچێتەوە.

جائێستە بێینە سەر وەلاّمدانەوەی پرسیاری ئەصڵی، کە هەدەف چییە لە خەلقی ئینسان؟ یان گشتگیرتر هەدەف لەخەلقی تەواوی ئەم هەستییە چییە؟ وتمان دوو دانە شێوە هەیە بۆئەوەی کەکاتێك ئینسان پرسیاری بۆ دروست دەبێت لەبارەی هەدەف لەدروست بوونی شتێکەوە، شێوەیەکی ئەوەیە کە بۆی ڕونبکرێتەوە هەدەف چییە، شێوەیەکی دیکەی ئەوەیە کەبۆی ڕوننەکرێتەوە و خۆی هەوڵبدات هەدەفەکە بدۆزێتەوە، لەشێوەی یەکەمدا کەبۆی ڕونبکرێتەوە ئیتر هەوڵدانێکی نامێنێت و چالاکی ڕادەوەستێت، بەلاّم لە شێوەی دووەمدا کە بۆی ڕوننەکرێتەوە هەر هەوڵ دەدات و هەر تەکۆشێ تاوەکو بەشێوەیەکی کۆتایی بگاتە ئەو مەبەستەی کەهەیەتی ئەویش ئەوەیە

سودی دروست بوونی ئەو دەزگایە بزانێت، زانیمان كەئینسان مەوجودێكە پڕ تەحەڕوك و پڕ جوڵەجوڵ! حەرەكەتی ئینسان دەتوانین بكەینە دوو دەستەوە:

**یەكەم: دەستەیەكە هەوڵدانە بۆ زانین.**

**دووەم: دەستەی دووەم باقی هەوڵەكانی ئینسان بەگشتی.**

ئەساسی حەرەكی بوون(پویایی) ئینسان دەستەی یەكەمە، كە هەوڵدانە بۆ زانین، باقی هەوڵەكانی تر(واتە دەستەی دووەم) كە زیندەگی ئینسان داگیردەكەن گشتی دەگەڕێتەوە بۆلای ڕیشەی عەلاقە بەزانینی ڕازەكان(واتە دەستەی یەكەم)، عەلاقە بە زانینیش پلەی جیاوازی هەیە، یەكێكیان: عەلاقە بەزانینی شتگەلی بچوك و فەرعیی یەك ڕووداوە، یەكێكی تریش: ئەو دەرەجەی نیهائییە یەكەیە...

مەجموعەیەك كە ئێمە پرسیارمان هەیە لەبارەیەوە كەهەدەفەكەی بزانین عیبارەتە لەتەواوی هەستی، یاخود نا.. بچوكتر بێژین عیبارەتە لە (ئینسان). ئەمە پرسیارمانە. بزانین هەدەف و سود لە دروست بوونی ئینسان چییە؟ هەدەفی دروست بوونی هەستی بەگشتی چییە؟ ئەگەر لە كاتێكدا كەئێمە بەڕێگەوەین و حەرەكەت دەكەین بەرەو زانینی ئەم هەدەفە پێمان بوێژرێت" هەدەف چییە؟" هەروەك ئەو نمونەی وابۆ ئینسانە جەنگەڵییەكە هێنامانەوە هەردوو شێوەكەمان باسكرد. نەتیجە دەبێتە چی؟ لەكاتێكدا ئێمە لە هەوڵداندایین، واتە تەواوی بەشەرییەت لەهەوڵدایە بۆ زانینی فەرعی كە ئومێدی نیهائی ئەم هەوڵدانە ئەوەیە كە زانینی ئەصڵی بزانێت، واتە پەیبردن بە سودی ئەساسی لە دروست بوونی ئینسان و تەواوی هەستیدا، لەكاتێكدا ئێمە خەریكین و حەرەكەت دەكەین و هەوڵ دەدەین بەو جۆرە كە هەمومان



دەزانین.. تەواوی بەشەرییەت لە هەوڵی ئەوەدایە كە زانینی زیاد بكات، عیلم و مەعریفەت و شناختی نیسبەت بەوە والەم هەستییەدا هەیە، چ خۆی چ غەیری خۆی... هەمیشە بەشەر خەریكی هەوڵدانە و ئەكۆشێ كەبەشێك لە هەوڵی ئینسان كەوتمان بیكەینە دوو دەستەوە، ئەم دەستەیە زانینگەل ئەگەر لەم كاتەدا وابەشەر ئەوەتا لە هەوڵ و حەرەكەتكردندا، ئەوەتا لەناوەڕاستی ڕێگەدا كەبەرەو زانینگەلی كۆتایی بڕواتە پێشەوە پێی بوێژرێت كە سود لە دروست كردنی مرۆڤ چییە؟ یان سودی دروست بوونی هەستی چییە؟ بەنەزەری ئێوە چی پێش دێت بۆ ئینسان؟! دیارە خۆ! سكوت كردن و نەمانی حەرەكەت! ئەمە بۆچی؟

چونكە كاتێك بانترین زانین، زانینی كۆتایی بۆ ئینسان حاصڵ بوو كە بریتییە لە پەیبردن بەسود و مەبەست و هەدەف لە بە وجود هاتنی شتێك تازە ئیتر زانینە فەرعییەكان لەناو ڕێگەدا هیچ ئەرزشێكی نییە، وەك كابرا وتمان، كاتێك دەزانێت(ڕادیۆ) بۆچییە ئیتر هەوڵدان بۆ ناسینی بەشەكانی(ڕادیۆ) و كەیفییەتی كاری و پەیوەندی ئەم پارچانە لەگەڵ یەكتردا ئیتر مەتلوب نییە، ئیتر ئینسان هەوڵ نادات و ئەو زەحمەتانەی دەیدات بۆ ناسینی بەشەكانی(ڕادیۆ)دەوەستێت!

جا لەوانەیە بێژن ئەگەر لەبارەی تەواوی هەستییەوە بۆ ئینسان ڕونبكرێتەوە كە هەدەف و مەبەست چییە، هەوڵی ئینسان ڕابوەستێت، بەلآم هەدەف لە دروستبوونی تەنها ئینسان، تەلاشی ئینسان ڕاناوەستێنێت باشە...لەبارەی ناسینی خۆیەوە هەوڵدانی نەمێنێت، بەلآم خۆ خۆی هەمرو هەستی نییە، هەوڵدانی بەردەوامی وەردەگرێت لەبارەی باقی بەشەكانی تری هەستییەوە




کە هێشتا نەیناسیووە و مەبەست و هەدەفەکانی بۆ دەرنەکەوتووە، بەڵام ئەمە هەڵەیە! ئەگەر ئێمە بتوانین تەنها هەدەف لە دروست بوونی ئینسان بزانین ئەوە وەکە ئەوە وایە هەدەفی دروست بوونی تەواوی هەستیمان زانیبێت! هیچ جیاوازییەکی نییە بۆمان ئەمەش لەبەر دوو دەلیل:

**دەلیلی یەکەم:** ئێمە ناسینی هەستیمان بۆ چییە؟ دەی دیارە بۆ خۆمانە بۆ خودی ئینسانەکە کە خۆمانین، هەستی شناسی بەو ئیعتیبارەی کەبۆ ئینسان ئەرزشی هەیە و مەترحە و ئێمە هەوڵی بۆدەدەین، بۆیە کاتێك خودی ئینسان ناسرا ئیتر ئەو شتگەلە والە وجودی ئینساندا هەیە دەبێتە عامل بۆ عەلاقە بەکەشفی ڕازی دروست بوونی هەستی جموجوڵی لە ویژدانماندا نامێنێت! حەرەکەت و هەوڵدانمان ڕادەوەستێت بۆ ناسینی باقی هەستی، واتە ناسینی ئەو بەشانەی کە موقەدیمەن بۆ ناسینی مەبەست و هەدەف.

**دەلیلی دووەم:** ئەمەی کە ئینسان ڕووداوی عومدە و موهیمی ئەم هەسییەیە، هەروەها لەناو ئەم هەستییەدا تائەو ئەندازەی ئێمە ئاشنایمان هەیە و دەتوانین ئاشنایی پێ پەیدابکەین تەنها مەوجودێکە کەئەم خەصڵەتەی هەیە، کەبەهۆی ئەو هێزانەوە کەلە وجودیدایە هەوڵدەدات بۆ ناسینی تەواوی هەستی ئینسان تەنها مەوجودێکە بەم جۆرە هەوڵ دەدات! هەروەك ئەو وایە تەواوی هەستی تەنیا بۆ ئەو بێت، واتە هەوڵدانی بۆ ناسینی ئەم هەستییە بە جۆرێکە وەك ئەوەی ئەم هەستییە دراوەتە ئەو کەبیناسێت ڕاستییەکەشی هەرئەوەیە، ئیتر باسی ئەو بەشانە ناکەین لەم گەردونەدا هەیە و ئێمە لێی شارەزا نین، تەنها قسە لەسەر ئەو بەشە دەکەین کەلێی شارەزاین جازۆر شارەزا یان کەم واقیعەن وەك ئەوە وایە درابێتە دەست ئینسان کە فەرموو"هەوڵبدە و بیناسە

پەیوەستە بــە خۆتــەوە". بۆیــە ئینــسانێك كەمــەوجودێكی بــەم شــێوەیەیە كەموتەصەریفە لەم هەستییەدا و هەستی پەیوەندی بەوەوە هەیـە ناسـینی وەك "ناسینی كولـلە نیسبەت بە جوزء". وەك ناسینی سەد دەر سەدە نیـسبەت بـە پەنجا دەر سەد، ئەگەر لەڕووی مادییەوە ئینسان دەرسەدێك كە زۆر بـچكلە و لاوازە لەم هەستییەدا لەڕووی(مەعنەوییەوە) كەئەم خەصـڵەتگەلەیە والـە ئینسان و هەستیدا دەبینین كە(زۆر بە كـورتی) وەك ئـەوە وایـە ئینـسان وەك (صاحب و مالیكی) هەستی لێ هـاتووە هەوڵـدەدات بـۆ ناسـینی هەسـتی و تەصەروف كردن لەناو هەسـتیدا ئالـەو لایـەنی مەعنەوییــەوە بیگریـت وەك ئەوەیە ئینسانێك و جلەكانی، جلەكانی بەشـێكی بـچوك و پەیوەندیـدارە بـە ئینسانەوە، كاتێـك ئینـسان ناسـرا ئـیتر ناسـینی جـل و بـەرگ چ سـودێكی دەمێنێت؟! جل و بەرگ بە ئیعتیباری ئەوەی بۆ ئینسان ئەرزشی هەیە، كاتێـك دەزانین ئینسان پەیوەندییەكی بەو جـۆرەی هەیـە لـەگـەڵ هەسـتیدا كـە وەك ئەوەیە خاوەنی هەستی بێت، وەك ئەوەیە هەستی درابێتە دەستی ئـەو و هـەوڵ بدات بیناسێت و تەصەروفی تێدا بكـات! ئەگــەر ئێمـە بەشـێوازێكی نیهـائی ئینسانمان ناسی، واتە (زانیمان هەدەف و مەبەست لـە دروست كردنی ئینسان چییە ئەمە عومدەكەمان زانیووە) ئەو بەشـەكەی تـر كەهــەدەف و مەبەسـت چییە لـە دروست كردنی باقی بەشەكانی تری هەستی لەچاو دروست كردنـی ئینساندا فەرعی و تابیعە(شوێن كەوتەیە) ناسینێكی بچكۆلـەیە! دەی ئیتر ئەمـە چ گرنگییەكی دەمێنێت؟ لەكاتێكدا بـەو ڕونكردنـەوەی لەسـەرەتاوە دامـان هەرچییەك هەیە لـە هەستیدا بە ئیعتیباری سودی بۆ ئێمە ئەرزشی هەیە، ئەگەر لەبەرئەوە نەبێت سودی هەیە بۆمان(هەرگیز) هەوڵ نـادەین بـۆ ناسـینی هـیچ





شتێك لەم هەستییەدا، هەر بۆیە ئەصڵی ئەنگیزەی حەرەکەتمان بۆ زانینی شتێك لەبەرئەوەیە ئەو زانینە بەسودە بۆمان، ئێمە و هەستی وا خەلق کراوە کەئەم هەستییە بەسودە بۆمان لەبەرئەوە هەوڵدەدەین بیناسین. کاتێك ئێمە مەسەلەی نیهائی خۆمانمان بۆ حەل بوو بۆمان (واتە هەدەفی دروست بوونی خۆمانمان بۆ کەشف بوو)ئیتر شتەکانی تر گشتی بچوکن، ئەگەر قەرار بێت لەدەرەوە(وجودێك) بیژێت بە ئینسان کەهەدەف لە دروست کردنی تۆ(ئینسان) چییە، هەروەك ئەوەیە پێی وتبێتی هەدەف لە دروست کردنی کوللی هەستی چییە، ئەم دوو پێوتنە یەك نەتیجەیان هەیە! نەتیجەکەش ئەوەیە کە کاتێك مەتڵەبی کۆتایی لەبارەی ڕووداوێکەوە زانرا مەتالبە فەرعییەکان{ئەوانەی لەکاتی حەرەکەت کردن بەرەو مەتاڵبە کوللییەکە دێنە سەر ڕێ} ئەوانە ئیتر ئەزرش و گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن! ئەگەر وابێت ئیتر ئینسانێك کە زانی هەدەف لەدروست بوونی ئینسان چییە، حەرەکەت(جووڵە)ی نامێنێت! باشە دەی خۆ دەزانین ئینسان بەم جوڵەو حەرەکەتەوە ئینسانە! ئایا باش یان خراپ؟ یان ئایا وەك باقی ڕووداو و دروستکراوە بێ‌گیان و گیاندارەکان بووایە باشتر بوو یان ئەمەی کە ئێستا هەیە؟ ئەوە بابەتێکی ترە!! بەلاٚم بلفعل ئینسان ئەمەیە کە دەزانین، و ئەم ینسانە بەم کەیفییەت و خەصڵەتەوە کە دەیناسین بەبۆنەی ئەوەوە کە هەمیشە لەهەوڵدان و جووڵە و کامڵبووندایە ئەرزشی و هەیە و ئینسانە، ئەگەر هەوڵدان و حەرەکەت و کامڵ بوونی لێبسەنرێتەوە ئیتر کەی ئینسانە؟!

ئەگەر قەرار بێت خوایەك کە ئینسان و هەستی خەلق کردووە و ئەم خەصڵەتگەلەی داوە بە ئینسان بیژێت بە ئینسان و لەوە حاڵی بکات کە

هەدەف لە دروست كردنی ئەم هەستیە چییە، ڕاستەوخۆ و پێچەوانە و (دژ) دەبێتەوە و لەگەڵ ئەوەدا كە ئینسانی بۆ خەلق كردووە. (ئێمە دەزانین خوای گەورە) ئینسانی بۆ(خەلاف) جێنشینی خەلق كردووە هێز و توانا گەلێكی پێداوە كەلە قیسمەتێك لەدەرەوەی نیزامی عام و حاكمی هەستی، (كەئەوە ئیتر جەبرە) بەئارەزووی خۆی بزانێت و تەصەروف بكات. دەی كاتێك ئەو ئینسانی بۆ ئەوە خەلق كردووە و خەلافەت و ئیختیاری پێدەدات كار بكات لەوەلاوە پێی بێژێت تۆ سودت ئەوەیە و هەدەف لەدروست كردنی تۆ ئەوەیە، ئەمە موعارز و دژ دەبێتەوە لەگەڵ ئەوەی پێداوە بۆچی؟ چونكە هەرئەوەندەی كەزانی هەدەف و مەبەست چییە لەدروست بوونی ئیتر حەرەكەتی نامێنێت و لە هەوڵدان دەكەوێت خۆئەوەش دەزانێت غەیری خوایەك كەئینسان و هەستی دروست كردووە هیچ شتێكی تر نییە كەبتوانێت(هەدەف لەدروست كردنی ئینسان و هەستی)بزانێت! ئەگەر قەراربێت بەئینسان بوترێت، مەگەر تەنها لەلایەن ئەو كەسەوە وائینسان و هەستی خەلق كردووە پێی بوترێت، هەرگیز لە جێگەیەكی ترەوە ئیمكانی نییە. ئەویش ئینسانی ئاوا خەلق كردووە لەحەرەكەت بەردەوام بێت و زانینی هەدەف و مەبەستیش ئینسان لەحەرەكەت دەخات دەی ئەگەر وا بێت لەڕووی لۆژیكییەوە دەبێت خوای گەورە ئینسان ئاگادار نەكاتەوە لەهەدەف و مەبەستی نیهائی لە دروست كردنی ئینسان و جیهاندا، چونكە لەگەڵ ئاگاداری كردەوە ئیتر ئەم ئینسانە نییە و ئەم حەرەكەتو هەوڵانەی دەبێت بیدات، تەواو دەبێت و لەدەست دەچێت كەئەمیش لەزەرەری ئینسان تەواو دەبێت.

جابا ئێستا بەڕوویەكی تردا تەصەور بكەین بێژین ئەگەر خۆمان هەوڵ بدەین ئاخۆ دەگەینە ئەوەی كەهەدەف و مەبەست لە دروست كردنی ئینسان و جیهان بە شێوەیەكی گشتی كەشف ببێت بۆمان؟ باشە ئەوە لەلایەن خواوە بەئێمە نەوتراوە كەهەدەف لە دروست كردنی ئینسان و ئەم جیهانە چییە؟ بەڵام ئایا لەم هەوڵانەدا كەخۆمان هەمانە مومكینە بگەین پێی و ڕۆژێك ئەوە بزانین؟ وەڵامی ئەوەیە(بەدەر لەوەی كە مومكین بێت بگەین یان نەگەین)هەركاتێك گەیشتین پێ تازە ئیتر ئێمە ئەم ئینسانە و ئەم مەوجودە نابێت كەهەین ئیتر حەرەكەتمان نامێنێت و دەبینە مەوجودێكی تر! بینا لەسەر ئەمە دەتوانین بێژین كە نەخێر ناگەین ئەی لەڕووی عەمەلییەوە چ كاتێك ئیمكانی هەیە بگەین؟ نمونەی (ڕادیۆ)كەمان باسكرد هەر لەونمونەیە ورد بینەوە ئەگەر كەسێك نەبێت بێژێتە كابرای جەنگەڵی تائەم ڕادیۆیە بەو شێوەیە بەكاریەت و بەكاری فلاَنە شت دێت و هەدەف و مەبەست لە دروست بوونی ئەم ڕادیۆیەدا ئەوەیە ئەو كابرا جەنگەڵییە دەبێت چی بكات تابگاتە هەدەف لە دروست بوونی ئەو ڕادیۆیە؟دەبێت بێ‌ئەندازە كار بكاتو هەموو بەشەكانی ئەم ڕادیۆیە سەر و ژوور بكات و ئەم دیوئەودیوی لێبكات و تەواوی بەشەكانی بەشێوەیەكی یەكسان بناسێت و پەیوەندی هەر بەشێكی لەگەڵ بەشەكانی تردا بزانێت و لەولاشەوە كاریگەری هەربەشێك بەسەر بەشێكی ترەوە كەشف بكات و لەئەنجامدا لەم هەوڵ و گەڕانەدا ئەو تایبەتییە نیهائییەی كە(ڕادیۆ) هەیەتی بیدۆزێتەوە و كەشفی بكات! بۆیە تاوەكو نوكتەیەكی شاراوە لەم دەزگایەدا بێت ئەم ناتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامە كەئەم ڕادیۆیە بەكاری چییەت. جابەدەر لەم دەزگایە شتگەلێكی تریش هەیە كە(

درێژە دەکێشێت باسی بکەم)، واتە ئەگەر هیچ نوکتەیەکی شاراوە لەناو ئەم دەزگایەدا نەمێنێت هەر مومکینە نەگاتە ئەوەی بزانێت هەدەف لەدروست ئەم دەزگایە چییە بۆچی؟ چونکە ئێمە ئەوە دەزانین ئەو دەزگایە(ڕادیۆ) پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەوەدا وا دەنگی بۆدەنێرێت هەیە لەگەڵ شەپۆلانێکدا کەئەو دەنگانە دەنێرێت دەبێت ئەوانەش بدۆزێتەوە بینا لەسەر ئەمانە ئەگەر تەواوی خانەکانی ڕادیۆ بەشێوەی دنکە دنکە یاخود بەشێوەی پەیوەندی ئەم خانانە لەگەڵ یەکتریدا و کاریگەریان لەسەر یەکتری هەموو ئەمانەش بزانێت هێشتا ناگاتە ئەو هەدەفە کۆتاییەی کەڕادیۆ بۆی دروست بووە، جالەمەش بگوزەرێین بەگشتی بڵێین کەکاتێك ئیمکانی هەیە(کابرای جەنگەڵی) هەدەف لە دروست بوونی ئەم ڕادیۆیە دەرك بکات کە هەوڵەکانی تەواوی بەشەکانی ئەم ڕادیۆیە گرتبێتەوە لەهەرچی لایەنەوە ئەو کاتە ئیمکانی هەیە، دەی ئەگەر وابێت کاتێك ئیمکانی هەیە هەوڵەکانی ئێمە بگاتە ئەو نەتیجە مەتلوب و کۆتاییە، کە وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە تەواوی هەستی کەبەشێکی بریتییە لە ئینسان بە وردی و بەتەواوی بەشەکانییەوە بەتەواوی بارودۆخییەوە بەزانینی پەیوەندی و کاریگەری تەواوی بەشەکانی بەیەکەوە بۆئێمە زانرابێت و کەشف بووبێت، کەهەڵبەتە وەك لەنمونەی ڕادیۆکەدا ئاماژەم پێدا لێرەشدا ئاماژەی پێ بدەم بەگریمانەی ئەوەشەوە(واتە هەموو ئەو شتانەش کەشف بکەین و بیزانین) هێشتا مافی نییە بۆئەوەی ئێمە هەدەف لەدروست کردنی هەستیمان بۆدەربکەوێت هێشتا هەر دەرناکەوێت، چونکە هەستی بەتەنیا خۆی هیچ نییە بەڵکو شتبوونی لەئەنجامی ئەو ئیرادەوەیە کەوا حاکمە بەسەریەوە و دەیجوڵێنێت، (هەروەك ڕادیۆکە لەئەنجامی ئەو شەپۆل و نێرەرانە





بۆتە شت). بەلاّم لەو لایەنانەش دەگوزەرێین و بەگەورە نایگرین! ئەگەر بەئێمە بە ئێمە نەوترێت سود و هەدەف لە خەلق كردنی ئەم هەستییە چییە و ئێمە گەرەكمان بێت خۆمان وەلاّمی ئەم پرسیارە بدۆزینەوە دەبێت هەولّدانەكانمان ئەوەندە درێژە بكێشێت كەهەرچی گەردیلەی هەستییە لەهەرچی لایەنەوەیە كەشف بووبێت بۆمان ئەو كاتە دەكرێت تەصەوری ئەمە بكەین ئیمكانی هەیە(هەدەف) لەهەستیمان دۆزیبێتەوە! دەی جا چی بگەینە ئەم سنورە و چی نەگەین، بیربكەنەوە ئێمە لەكوێ و دەست گەیشتن بەزانست و زانیاری دەربارەی گەردیلەی تەواوی هەستی لەكوێ! ئەمە شتێكە ئەصلّەن قیاس ناكرێت و نابێت، ئێمە هێشتا دەربارەی واقیعەتی هەستی نازانین، ئەگەر وابێت گریمان لەزەمانێكدا بەشەر بەتوانای خۆی ئەوەندەی زانیبێت لەبارەی ئەم هەستییەوە ئیمكانی ئەوەی بۆ دروست بووبێت ئەگەر پرسیارێكی وای بۆ پێشبێت و بەحەقی دابنێین و بەپرسیارێكی مەنتقی حسابی بۆ بكرێت، بۆ ئێستایی ئێمە كە یەكەم، دەزانین لەلایەكەوە پێمان نەوتراوە و زانیشمان بۆ پێمان نەوتراوە. دووەمیش، لەهەولّەكانی خۆماندا بۆ ناسینی هەستی چەنێك لەسەرەتای رێگەداین!

بینا لەسەر ئەمانە دەزانین بۆ ئێمە پرسیاری بەو شێوەیە مەترەح نییە! زیهنی ئینسان پرسیار دەكات، بەلاّم هەندێ پرسیار لەئەصلّدا هەلّەیە بۆ نمونە(لەوانەیە مامۆستایانی(بیركاری) چەندین جار ئەمایان بیستبێت)"كەئایا ناتوانین بلّێین(مالانیهایە) بەبێ نیهایە بە ئیزافە یەك؟"

مامۆستا لەوەلاّمدا دەلّێت(لە بێنیهایەت لەسەرتر نییە).

شاگردەكە(قوتابییەكە) دەڵێت"بۆچی نا! دەتوانین بڵێین بێنیهایەت بەعەلاوەی یەك، بێنیهایەت بەعەلاوەی نیهایەتێكی تر".

هەموو ئەمانە دێن بەزیهندا، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەرچی هات بەزیهندا مانای هەبێت و لۆژیكی و دروست بێت، نەء..كاتێك كەدەڵێیت(بێنیهایەت)ئیتر وتنی بەعەلاوەی یەك هەڵەیە، چونكە ئەگەر وتت بەعەلاوەی یەك، واتە(موتەناهییە) ئیتر بۆچی (بەعەلاوە) قبوڵ دەكات؟ ئەگەر بێ نیهایەت بێت چۆن (بەعەلاوە) قبوڵ دەكات؟!

هەروەك ئەو پرسیارە وایە كەدێت بەزیهنی ئینساندا(باشە تەواوی ئەم هەستییە خوا دروستی كردووە ئەی خوا كێ دروستی كردووە؟

بەڵێ ئەم پرسیارە دێت بەزیهندا، بەڵام هەڵەیە، چونكە تاكاتێك مەخلوقیەت(مەخلوق بوون) مەفهومی هەیە كە(نەقص) وجودی هەبێت، كە ئەو شتەی لەبارەیەوە پرسیار دەكەین شتێكی (لاموتەناهی) نەبێت، كاتێك ئەو شتەی والەبارەیەوە پرسیار دەكەین(بێ كۆتاییە) و نەقصی نییە هەرچەند پرسیار دێت بەزیهنماندا، بەڵام هەڵەیە...خودی پرسیارەكە هەڵەیە، ئەم پرسیارەش لە ئێستادا بۆ ئێمە(هەدەف لە دروست بوونی ئینسان و جیهانی هەستی چییە؟) لەخودی خۆیدا هەڵەیە، جائەگەر لەخودی خۆیدا لەرووی لۆژیكییەوە هەڵە نەبێت ئەوە لایەنی عەمەلی و واقیعی هەڵەیە. ئەوەی وترا (بەئەندازەی بێ كۆتایی بە عەلاوەی یەك، یاخود دروستكەری خوا كێیە؟)ئەمانە هەڵەنین لەرووی لۆژیكییەوە، بەڵام بەرووی عەمەلییەوە هەڵەیە! هەروەك ئەوە وایە بڵێیت ئەگەر كابرایەك چنگ بكات بە(ئەلبورزا) بیخاتە دەستی ڕاستی و چنگ بكات بە(شاخی هیمالایا)دا و بیخاتە سەر





دەستی چەپی ئاخۆ تاچەند سەعات دەتوانێت بەو شێوەیە دەستی ڕاوەستێنێت و بەریان نەداتەوە؟

ئەم پرسیارە لەڕووی لۆژیكییەوە هەڵەنییە، بەلاَم لەڕووی عەمەلی و عەینییەوە خودی پرسیارەكە هەڵەیە، بۆیە ئەم پرسیارەی ئێمەش لەبارەی كەشفی هەدەفی دروست بوونی ئینسان و هەستییەوە، ئەگەر لەڕووی لۆژیكییەوە هەڵە نەبێت، بەلاَم لەڕووی واقیعیەت و عەینیاتەوە كەسەیری دەكەین دەبینین زانینی هەدەف و مەبەست پێویستی بەوە هەیە كەشفی تەواوی نهێنی و تایبەتمەندییەكانی بەشەكانی هەستی و هەروەها زانینی ئەوەی كەئێمە لەوبارەیەوە چەنێك كەم دەزانین ئیتر ئالەم لایەنەوە پرسیارێكی ئاوا هەڵەیە. بۆیە پرسیاری ئاوا زۆر زۆر لەوە گەورەترە(پرسیار بكەیت ئاخۆ لەكەشكەشانی حەوتەم و هەشتەمدا چەند دانە(سەیارە) بوونیان هەیە؟)دەی كاتێك تۆ كەشكەشانی(چوارەم)ت نەناسیووە چۆن دەربارەی كەشكەشانی (حەوتەم) پرسیار دەكەیت ئەویش دەربارەی ژمارەی سەیارە لەوی؟! ئێمە لەكوێ و پرسیاری لەو شێوەیە لەكوێ!

دەبێت ئینسان توانای خۆی بەو شێوەیە والەواقیعدا بوونی هەیە، نەك(خەیاڵ پلاَوانە)بەراورد بكات و لەوەودوا هاوتەریب لەگەڵ ئەو توانایەیدا هەوڵ بدات بۆ كەشفی نهێنییەكان، كەشفی نەزانراوەكان بكات. بەلاَم هەنگاو لەڕووی ئەو ئصوڵەوە دەنرێت. ئینسان هەنگاوی یەكەم دەنێت لەدوای ئەو هەنگاوە هەنگاوی دووەم دەنێت، لەكاتێكدا هەنگاوی یەكەم نەنرا بێت نۆرەی هەنگاوی دووەم نییە. هەرجۆرە قسەكردنێك لەبارەی هەنگاوی دووەمەوە هەڵەیە، حەرەكەتی دەست خستنی زانست هەروەك هەنگاونانە

لەشوێن و مەصیرێكدا وردە وردە هەوڵ دەدەیت و هەنگاوێك دەنێیت بەرەو نەزانراوێك و كەشفی دەكەیت، بەبۆنەی كەشفی ئەو نەزانراوەوە توانایی پەیدا دەكەیت بۆ كەشفی نەزانراوێكی تر حەرەكەتی ئینسان ئابەم جۆریە، دەی ئێمە ئەوەتاین ئالەم سەرەتای ڕێگایەوە پرسیاربكەین دەربارەی كۆتایی ڕێگا چەنێك هەڵەیە؟! جابۆیە زۆر زۆر گرنگە بۆ ئینسان توانای زیهنی و زانستی خۆی بزانێت و هاوتەریب لەگەڵ ئەو توانایەدا هەوڵ بدات و پرسیار بكات، ئەگەرنا هەوڵگەلی ئینسان بە فیڕۆ دەچێت، زهنی ئینسان بێ خود ماندوو دەبێت لەگەڵ شتگەلێكدا كەهیچ سودێكی نییە جائەمە هەر بۆ ئەم باسە تایبەتییە نایلێم.

(رحمه الله امرأً ترك مالایعنیه لما یعنی) ئەمە دۆعایەكە كەپێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئینسانگەلێكی دەكات، كەئالەم لایەنەوە كەبزانن چ شتێك(مەقدورە) و لەدوای ئەوەی(مەقدورە) مەتلوبیشە، چونكە زۆر شت هەیە مەقدورە، بەلام مەتلوب نییە، ئێوە دەزانن چەنێك بەشی عیلمی لەدونیای ئەمڕۆدا دروست بووە! ئینسانێك كەدەڕواتە بەشێكەوە دەست دەكات بەهەوڵدان تێیدا(شتگەلێك زۆر ورد و نیهائی هەیە لەبەشەكانی تردا ئەمە مەتلوب نییە بۆ ئەم) بینا لەسەر ئەم ئەگەر كتێبێك دەخوێنێتەوە دەربارەی بەشەكەی خۆی لەپڕ كتێبێكی تر دەكەوێتە بەر دەستی پەیوەندی بەبەشەكەی خۆیەوە نییە و نایەوێت لەو بەشەدا زانیاری پەیدا بكات هەڵەیە زهنی معطوفی ئەوە بێت و دەست بكات بە خوێندنەوەی ئەوە و ئەو كتێبەی تایبەتە بەبەشەكەی خۆی بیخاتە ئەو لاوە، كەسێك سودمەند دەبێت لەڕەحمەتی ئیلاهی (ڕەحمەت لەم لایەنە گەورەوە) كە فیوزاتی زانین مورەتەب بڕژێت بەسەر زیهنیدا، یاخود

فیوزاتی سەرکەوتن بڕژێت بەسەر کارەکانیدا کەئەوە واداوانەکراوە لێی بیخاتە ئەولاوە و بکەوێتە شوێن ئەوە واداوای لێکراوە، کەهەڵبەتە ئەوەش گرنگە(چ شتێك داواکراو بێت؟) دەبێت دیاریکردنەکە دروست بێت (خۆ ئەگەر باسی ئەوەش بکەم درێژە دەکێشێت!) چونکە بەزۆری شتگەلێك دەبێتە داواکراو بۆ ئینسان هاوتەریب نییە لەگەڵ ئیستیعداد و توانایدا، هەڵەیە... لەکۆتایدا ئەوە بڵێم لەهەر زەمینەیەکدا ئەو دۆعا خێرەی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەرچاوتان بێت زهنتان بگرن بەشتێکەوە کەداواتان لێکراوە.

بەگشتی نوکتەی تەرکیزی قسەکردن ئەوە بوو کەبەهەر شێوەیەك و بەهەرهۆکارێك ئینسان زانی هەدەف و سودەکانی(ڕادیۆ) چییە ئیتر هەوڵنادات و زەحمەت ناکێشێت بۆئەوەی بەشەکانی ڕادیۆ بناسێت، بەڵکو زەحمەت و هەوڵدانی تاکاتێکە کە هەدەف و ئەنجامی نەزانیوە جاهەدەف و ئەنجامەکەی خۆی بیدۆزێتەوە یان کەسێکی تر پێی بڵێت، یان بەشێوەیەکی ئیتفاقی یا نەتیجەی تەحقیقی خۆیەتی. لێرەدا ئەم دوو شتە گرنگە:

**یەکەم: هەوڵدان تاکاتێك بەردەوام دەبێت، کەهەدەف لەدروست بوونی شتێك نەزانرابێت.**

**دووەم: هەوڵدان کاتێك دەوەستێت کەهەدەف لەدروست بوونی شتێك زانرا.**

جائێستا بڕۆینەوە سەر ئەنجامگیری کۆتایی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) کەتەکلیفی ئێمە ڕۆشن دەکاتەوە، یاخود بەعیبارەتێکی تر کەلەفەرمایشتی ئەو ئوستازە حەکیمە کە(رحم الله ان عرف قدرة و لم يتعدد طور) "ڕەحمەتی خوا لەگەڵ ئەو کەسەدا بێت وا ئەندازەی توانای خۆی دەزانێت و لەو سنورە تەجاوز ناکات و دوچاری خەیاڵ پڵاوی نابێت، هێزگەلی خەیاڵاتی

بۆخـۆی تەصـەور ناكـات"، بینـاش لەسـەر ئەمـە پرسـیارگەلی ئایـدیالی و خەیالاویشی بۆ دروست نابێت، بەڵكو بـەپێی سـنوری توانـای خـۆی هـەوڵ دەدات و لـەو سنورەشـدا پرسـیاری بۆدروسـت دەبێـت و هـەوڵ دەدات نەزانراوەكان كەشف بكات، هەر ئینسانێك وانـەبێت لـەو ڕەحمەتـەی خـوا كەپەیوەندی بەم (باسانەوە هەیە) بەهرە نابات. جا بۆمامەڵـە كـردن لەهـەر جەرەیان و ڕوداو باسێكدا (خۆتان بناسن) ئێوە كێن؟ چین و تواناتان چەنێكە؟ لـەوەودوا لایـەنی دیكـە دێتـە پێـشەوە،وەك خـەیر و مـصڵەحەتی ڕاسـتی بۆخۆتانو بۆ ئـەوانی تـر؟ دوای ئەمانـە پرسـیارتان بـۆ دروسـت بێـت یـان هەوڵبدەن. ئەگەر وانەبێت ئەو پرسیارگەلەی وا پێشكەشم كـرد(مەبەسـت پرسیاری"ئەگەر كێوێك بخاتـە دەسـتی ڕاسـتی و ڕایكێـشێت بیخاتـە دەسـتی چەپی، ئایا تاچەنێك دەتوانێت بەدەستییەوە بێـت...) ئالـەو پرسـیارانەتان بـۆ دروست نەبێت و خەیاڵ پلاوی نەكەن.

## باسی دووەم:

# حەقیقەتی دین، پێغەمبەر، قورئان.

بابەتی قادیانی و بەهائییەکان لە دونیایی ئیسلامی و موسوڵمانانیدا یەکێکە لەو بابەتانەی چی لە ڕوی سیاسی، چی لە ڕووی مێژووی و فیکری و ئاینییەوە شوێنگەی خۆی دایگیرکردووە و بە بەردەوامیش شایەنی قسە لەسەرکردن و هەڵوێستەکردنە بەرامبەر کارو ئاکار و بیروڕاو مەبەست و ئامانجیان. قسەکردن و نووسینی بیریاران و مێژوو نووسان دەربارەی ئەم دوو ڕەوتە ئاینییە بە درێژایی مێژووی دروست بوونیان هەیە و بەردەوامیشە، چونکە ئەمان لە مەیدانی دین و تەررحکردنی بیرۆکەی دینیدا لەگەڵئەوەی پێگە و توانی قسەکردنیان لە ڕووی هێزەوە بە پێی ناوچەکان کەم و زیاد دەکان، بەڵام هەر بەردەوامە و بوونیان هەیە. کوردستانی خۆشمان لە فیکرەی ئەمانە بێبەش نەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی سوپاس بۆخوا بە درێژی مێژوو (کاك ئەحمەد)ەکان زۆر بوون نەیانتوانییەوە بەئاسانی جێگە خۆشبکەن و ژەهریان بڕێژنە دەریای بیری ئیسلامییەوە، چونکە هەمیشە بەپێی سەردەمەکان کەسێك بووە بەرامبەر نیاز و مەبەستەکانیان بووەستێتەوە وەڵامی گومان و پرسیار و ئەگەرەکانیان بداتەوە...





ئێمە لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین دەربارەی (بەهائی و قادیانی)ەکان ئەگەر بەکورتیش بووە عەقیدە و بیروباوەڕیانەوە بخەینە ڕوو*، و پاشان لە ڕێگەی (کاك ئەحمەدی موفتی زادە)وە دەربارەی چەند پرسیار و گومانێکی ئەمانە

* قادیانیەت: دینێکە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمی میلادی لە لادێی قادیان، کە یەکێکە لە لادێ نزیکەکانی (پنجاب هەندستان) سەری هەڵدا. بە سەرپەرشتی (میرزا غلام سید ئەحمەدی قادیانی)، کە بەهاوکاری و بۆ پاریزگاریکردن لە دەستکەوتوو و بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز کاری دەکرد.

عەقیدە و بیروباوەڕی قادیانیەت:

١. : باوەڕی تەواوی بە دۆنادۆن (تناسخ ارواح) هەیە.

٢. باوەڕیان وایە، کە خوا وێژدەکات و ڕۆژوو دەگرێت و دەخەوێت و لەوێوە هەڵە دەکات. میرزا دەڵێت"خوا پێی وتم: من رۆژوو دەگرم و نوێژ دەکەم و بێدار دەبم و دەشخەوم".

٣. باوەڕیان وایە کە نبووەت بە حەزرەتی محەمەد(ﷺ) کۆتایی نایەت، بوڵکو بەردەوامی هەیە، خودا هەرکاتێك بیەوێت بەپێی پێویست پێغەمبەری خۆی دەنێرێت لە ناویشیاندا (میرزا محەمەد) لە باشترینییانە و، حەزرەتی جوبرەئیل پەیامی و ئیلهامی بۆ هێناوەکە هەمان ئەو قورئانەیە.

٤. دەڵێن: قورئان بەشێك نیە لەوەی کە (غلام ئەحمەد) هێناوییەتی، هەروەها فەرموودەیەکیش نیە جگە لەوەی لە کتێبە ڕێنمایکەر و فێرکراوەکانی ئەو، وە پێغەمبەرێك نیە مەگەر لەژێر سەروەری (غلام ئەحمەد)دا بێت، هەوەرها لەو باوەڕەدان کە کتێبی ئەوان لەلایەن خوداوە نێرراوە و ناویشی (الکتاب المبین)ە و جیاوازە لە قورئانی کەریم.

٥. بڕوایان وایە ئەوان پەیڕەوانی دین و شەریعەتی تازەن و هەروەك ئەو صەحابانەنە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون. لە (فجل، ژمارە ٩٢)دەڵێت"هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و پەیڕەوانی میرزا غلام ئەحمەددا".

٦. باوەڕیان وایە حەجی گەرە بریتیە لە سەردانکردنی قادیان و زیارەتکردنی گۆڕی قادیانی. لە کتێبەکەیاندا هاتووە، کە لەسەر زەویدا سێ جێگە پیرۆزە(مەککە، مەدینە، قادیان) لە کتێبەکەیاندا بڵاوکراوەتەوە"حەجکرد بۆ مەککە بەبێ حەج و سەردانکردنی قادیان هیچ سودێکی نیە و قبوڵ نیە".

٧. شەراب و ئەفیون و مادە بێهۆشکەرەکان حەڵاڵن.

٨. تەواوی موسوڵمانان، تا کاتێك دینی قادیانی قبوڵنەکەن کافرن، هەروەها کچ پێدان و کچ مالەکردن لێیان هەر کافر بووەنە.

٩. قادیانی باوەڕیان وایە خواکەیان ئینگلیزە بۆیە ە ئینگلیزی قسەی لەگەڵ دەکەن!!

١٠. بەهیچ جۆرێك باوەڕیان بە جیهاد و غەزاکردن نیە.

١١. باوەڕیان وایە ئینگلیز وەلی ئەمری موسوڵمانانە.

بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم پێگەیە بکە:

http://www.paldf.net/forum/showthread.php?t=٦٣٠٦٤




قسەیەك بکەین. لەڕاستیدا ئەم بابەتەی (کاك ئەحمەد) وەك لە لە خوێندنەوەی درێژەی بابەتەکەدا دەردەکەوێت بریتییە لە قسەکردنێکی کورتی ئەم بیریارە لە یەکێك لە مزگەوتەکانی (مەریوان)دا، کە بە باسی بەهائییەکان بەناوبانگە. موفتی زادە لێرەدا ویستوویەتی لەو کاتە کورتەی لەبەردەستیدایە وەلامی پرسیارگەلێك بداتەوە کە بەڕاستی پرسیارانێکن لەو کاتە و لە ئێستا و لە ئایندەشدا بەبەردەوامی ئامادەییان دەبێت و زیهنی هەموو تاکێکی هۆشیاری کۆمەڵگە دەگرنەوە، کە ئەوانیش پرسیارانێکن دەربارەی (قورئان و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و پێویستی پێغەمبەران لە سەردەمانی پێشوو و گرنگی بوونیان لە ئێستادا و پێویستی مرۆڤ بەقورئان و توانی قورئان لە چارەسەرکردنی کێشەکانی سەردەمی مۆدێرنەدا...). هەرچەند بابەتەکەی (موفتی زادە) لە سەردەمێکی مێژوویدا کردوویەتی، بەلاّم وەك وتمان ئامادەی ئەم باسانە پەیپێی بارودۆخەکانی کۆمەڵگە بەبەردەوامی لە تازەبوونەوە و سەرهەڵدانەوادایە! بۆیە ناتوانین لە چوارچێوەی مێژوویەکدا قەتیسی بکەین... کا ئەحەد، بۆ دەست پێکردن بە باسەکەی سەرتا لە ناساندنی تاکێکی موسوڵمانەوە دەستپێدەکات، و قسە لەسەر ئەوە دەکات، کە ئایا موسوڵمان کێیە و بەکێ دەڵێن؟ ئەو دەڵێت:

(موسوڵمان بوون هەروا نییە، کە لێیان پرسی تۆ چیت بێژیت، یان لەسەر (کێلی گۆڕەکەی) بنوسن موسوڵمان، ، یا ئەگەر نوێژێکی کرد، نوێژێکی دزی ئەوە بەس نییە، موسوڵمان بوون ئەوە نییە، موسوڵمان بوون تەکلیفاتی زۆرە، دەردی زۆرە، کە بەهەمووی ئەوانە بەجارێك دەبێتە موسوڵمان.

موسوڵمان لەوێوە دەستپێدەکات، کە خوای گەورە یەکێك لە ئینسانە خۆشەویستەکانی خۆی بەناوی حەزرەتی (محمد بن عبد اللـه) (ﷺ)دەکاتە مەئمور، تاوەکو بەشەریەتی سەرگەردانی و سەر لێ شێواوی مەزڵومی بەدبەخت هیدایەت بدات و ڕێگەی هەق و عەدالەت و نووری پیشان بدات، جا بۆ ئەمە بەشەر بگاتە سەر ئەو ڕێگا حەق و عەدالەت و نوورە، قاعیدەو دەستوری بەرنامەیەکی فیکری و عەمەلی بۆ دادەنێت. بە بەشەر حاڵی دەکات دەبێت عەقیدە و فکرت چۆن بێت، لە پاشاندا کە فیکرو عەقیدەی پاك کردەوە پێی نیشان دەدات کە دەبێت ئەخلاقت چۆن بێت، ڕێوشوێن و بەرنامەی زیندەگیت چۆن بێت، لەگەڵ خەڵك چۆن مامەڵە(هەڵسوکەوت)بکەیت. لەسەرەتاوە عەقیدەو فیکرەکە، لەپاشانیشدا ئەخلاق و عەمەل دەست پێدەکات، ڕێگەو شوێنێك ئیسلام داناوە بۆ تەربیەت و هیدایەتی خەڵك، ئەوەیە لەسەرەتادا لە دەرونەوە ئینسان دەبێت بە ئینسان، ئەگەر ئینسانێك لە دەرونەوە نەبێتە ئینسان هەزار ڕووالەت و هەزار عەلامەتی تێدا ئاوێزان بکە ئیمکانی ئەوەی نییە ناوی بنرێت ئینسان، ئەگەر کەسێك لە دەرونەوە نەبێت بە موسوڵمان، هەزار مەدالییای موسوڵمانی لێدە ئیمکانی نییە ببێت بە موسوڵمان، مەداڵی حاجیگەری لێ بدە، مەداڵی شەهادەتی لێدە، مەداڵی مەلایەتی لێدە، مەداڵی سۆفییەتی(شێخییەتی)لێدە هەزار تابلۆ دروست کات بڵێت من موسوڵمانم ،من لە ئومەتی (محمد) (ﷺ) بەمانە نابێتە موسوڵمان!!

خوای گەورە لە سەرەتادا وتویەتی دڵ دەبێت موسوڵمان بێت، دڵی موسوڵمان کامەیە؟

دڵی موسوڵمان ئەوەیە كە لەپێش هەموو شتێكەوە بڵێت ((لاالـه الا الله))هیچ گەورەیەكم نییە، هیچ كەسێكم نییە كە ئیتاعەتی لێ بكەم، هیچ كەسێك نییـە كەبێ چۆن و بۆچی فەرمانی لێ وەرگرم (الا)یەكێك، خوا.
هیچ كەسێك نییە حسابی لێ بدەم، هیچ كەسێك نییە لێی بترسم، هـیچ كەسـێك نییە واهیمەم لێی ببێت (الا) خوا، هیچ كەسێك نییە هەقی بەرنامە دانـانی ببێـت بۆمن، هیچ كەسێك نییە ڕێگەو شوێنم بۆ ڕۆشن بكاتەوە (الا) خوا .
لەدوای ((لاالـەالا الله)، ((محمد رسول الله)) (ﷺ)، ئا ئەمـە ئەصـلی فیكـری ئینـسانی موسـوڵمانە، لـەپاش ئـەوە كـە ڕازی بـوو تـەنها یـەكێك هەیـە لەسەرەوەی بەشەر كە ڕێگەی بۆ دادەنێت و دەستوری پێ دەدات، تەنها لـەو دەترسێت، تەنها حساب بۆ ئەو دەكات و هـیچ كەسـی تـر، لێـرەوە نـۆرەی ئەمەدێت، كە بزانێت ئەوە وا خوا پێیخۆشە، ئـەو ڕێگـە وا خـوا دینـاوە بـۆ بەشەر چۆن دەگاتە دەستی بەشەر؟ ئا بەم ڕێگا دەگات ،((محمـد رسـول الله)) (ﷺ). (محمد) ئـەو ئینـسانە گـەورە عەزیمـە فروسـتادەو مـەئموری خوایـە، لەلایەنی خواوە مەئمورییەتی پێ دراوە، ئەوانە وا ئیرادەی خوایـە، ئەوانـە وا بەرنامەی هیدایەتەو لەتەرەفی خواوە هاتووە بۆ بەشـەر ڕای بگەیـەنێت و بـە بەشەری حاڵی بكات.
دوای ((لاالـەالاالله، محمد رسول الله)) (ﷺ) مەترەحە:
یەكەمجار ئینسان بەوە دەبێتە موسوڵمان ،دڵی خۆی پـاك بكاتـەوەو پەرسـتنی هیچ كەسێكی تێدا نـەهێڵێت، جگـە لـەخوا، وەك فەرشـێكی پیـسی پـڕ لـە جاڵجاڵۆكەو بەردو خۆڵ، ئەگەر بمانەوێت فەرشێك پاك بێتەوە دەبێت جـوان جوان بیتەكێنین و لەوەودوا بیدەینە بەرئاو بیشۆرینەوە، دڵی ئێمە پڕە لە بوت

پەرستی، پـڕە لـە دنیـا پەرستی ...وەختێـك بەڕاستی دەتـوانین بڵـێین (موسوڵمانین) و خوا پەرستین، ئەو چڵك و پیسی و شتانە كە هەمووی هینـی دونیا دۆستییە، هەمووی لەبەر دونیا دۆستییە ئەنیشێتە تەختی دڵمان هەمووی لابەین و دڵمان بتەكێنین تەنها خوا دۆستی و خوا پەرستی تێدا بچێنێتـەوە. جـا لەدوای ئەوە خوا دۆستی و خوا پەرستی بەڕاستی لە دڵـی ئێمـەدا دامـەزرا، ئەمجار نۆرەی ئەوەیە كە ڕێگا و شوێنمان چییە؟

ڕێگا و شوێنمان ئەوەیـە كـە خـوای گـەورە لـە ڕێگـەی مـەئمورانی خـۆی ناردویەتی بۆ ئێمەو ئێمەی حاڵی كردووە. لە زەمانی (ئادەم)ەوە تا گەشتۆتە زەمـانی (محمـد بـن عبـد اللـه -ﷺ-)خـوای گـەورە (بـە جـۆرە موتەوالی)پێغەمبەرنی ناردووە، ئەمانەی كردوتە كارمەند بۆ هیدایەتی خـەڵك، خەڵك ئەگەر هیدایەتی خوای نەبێت، گەورەترین عالم بن، گەورە ترین دكتۆر بن، گەورەترین موهوندیس بن گەورەترین شارەزابن لە وەزیفەی دین و دونیا ئاخری هەر گومڕا دەبن، فەقد و فەقد ... لە ڕێگەی خوا پەرستییەوەیە دەچن بە ڕێگەی ڕاست و دروستدا.

ئێـستا ئـەی خەڵكینـە ئـەم جیهانـە هـەموی گـومڕاو بەدبەختـە، بڕێـك لـە خوێنەوارەكان دەڵێن: خوێنەواری نییە، بۆیە وایە، بەڵام هەڵەدە دەكەن لەبەر نەخوێنەواری نییـە، وەڵاهـی زۆر زۆرمـان هەیـە دیتمـان كـە خوێنـەواری و مەعلوماتی تێدا نییە، زۆر سالم و زۆر ڕاستن، زۆر دروسـتن، بـەڵام ئەوانـە وا دكتۆری گـەورە گـەورەن، یـان موهەندیـسی گـەورە گـەورەن وا یـەكجار خوێنەوارن ئەوانە تاڵانی خەڵك دەكـەن، ئەوانـە دوژمنـی خـەڵكن! ئەگـەر

حساب بكەیت ئێستا هەرچی نەگبەتی و بەدبەختی ئەم كۆمەڵگەیە بەدەست خوێنەوارەكانەوەیە.

**هەموو خوێنەوارەكان بوونەتە هۆكاری سەر لێ شێواندی خەڵك، بەتەنها خوێنەواری كار دروست نابێت و، كار جێبە جێ نابێت، وەختێك خوێنەوار بەكار دێت كە لەگەڵ ئیمان بێت، چەكێك بێت بە دەستی ئیمانەوە، بەدەستی خوا دۆستییەوە، ئینسانێك بوو بە دكتۆرێك، ئەگەر خواناس بوو، ئەگەر ئیمانی بوو سەیر دەكەیت ئەو (ماستەر) ئەو (دكتۆرای)ە چەكێكە بە دەستییەوە كە سودی لێوەردەگرێت و هەرچی خراپە وردی دەكات و دەیكاتە كۆمەك بۆ حەق، بەڵام ئەو كەسەی ماستەری هەیە یان دكتۆرای هەیە و ئیمانی نییە سەیر دەكەیت دەبێتە دوژمنی میللەت، دەبێتە میكرۆب بۆ میللەت و خەڵك تاڵان دەكات و ماڵ و سەروەتی خەڵك بە خۆڕای دەبات، بە هەموو جۆرێك یاری بە ژیان و موقەدەساتی خەڵكی دەكات.**

ئەمە كورتەیەك بوو بۆ ئەوەی سەرنجتان بۆ ئەوە ڕاكێشم كە بە تەنها خوێندەواری كار دروست نابێت ئەوە قسەیەكی هەڵەیە، پێش لە خوێندەواری و زانیاری، دەبێت دەرون ئاوەدان بێت بە ئیمان بە خواناسی بە تەوحیدو بەخوا پەرستی، جا دوای ئەوە دەرون ئاوەدان بوو بەمانە، ئەوسا خوێندەواری بەكار دێ، هەتا دەتوانین موقایەسەی بكەین كە ئینسانێكی نەخوێنەواری بە ئیمان لەگەڵ ئینسانێكی خوێنەواری بێ ئیمان، ئەو ئینسانە نەخوێنەوارە بە ئیمانە یەكجار باشترە بۆ مرۆڤایەتی تا خوێنەوارە بێ ئیمانەكە، فلانە دكتۆری خوێنەواری بێ ئیمان گیانی خەڵكی لەناودەبات و ماڵی خەڵكی تاڵان دەكات، بەڵام ئەگەر نەخوێنەوارێك ئیمانی هەبوو، بە

كرێكاری بێ، بە حەماڵی بێ، بە هەرشتێك بێت هەر خزمەت بە خەڵك دەكات و زەرەریشی بۆ خەڵك نابێت، ئەگەر وابێت خودی ئیمان چەكێكی ئەرزش دارە بۆ خەڵك نەك خوێندەواری، بەڵام ئەوەڵی ئەوەڵ ئیمان.

**قۆناغی دیاریكردنی مەنهەج:**

لە دوای ئیمان، ئەم بابەتە مەترەحە، كەمن چۆن بزانم خوا چۆنی پێ خۆشە و چی ڕێگەیەك بەباش دەزانێت پێیدا بچم؟

خۆ خوێنەوارەكان ڕێگای دروستیان نەدۆزیوەتەوە، ئەوانە وا خوێنەوارترن ئەوانە ترسناكترن لەناو كۆمەڵگە، ئەگەر وابێت ڕێگا ڕێگای خوێنەواری نییە، ڕێگایەكی ترە. كامەیە ئەو ڕێگایە ؟

ئەوەیە كە پێغەمبەران لە لایەن خواوە دەیهێنن و پیشانی دەدەن بە خەڵك، كابرا خوێنەوار بێت یان نەخوێنەوار بە ڕێگەو شوێنی پێغەمبەراندا بچێت ڕاست دەڕوات، خۆ ئەگەر لەڕێ و شوێنی پێغەمبەران لابدات هەڵە دەچێت.

لەسەرەتاوە خوا كە ئینسانی لەسەر ئەم كورەی زەمینە دروست كردووە بەرنامەی بۆ ناردوەو پێغەمبەرانی بۆ ناردووە لە حەزرەتی (ئادەم)ەوە بەرنامە هاتووە بۆ بەشەر تا گەشتۆتە حەزرەتی (محمد) (ﷺ).

ئێستا مەسائیلێكی زۆر هەیە قسەو باسی لەسەر بكرێت، لەناو ئەو هەموو مەسائیلە دوو مەسئەلە باس دەكەم.

یەكەم: ئایا دوای (محمد بن عبد الله) پێغەمبەری دیكە پێویستە؟

دوو: ئەی دوای (محمد بن عبد الله) دوای ئەوەی ئەو گەڕایەوە بەرەو ڕەحمەتی خوا،كێ وەزیفەی هەیە ئەوە وا ڕێگەو شوێنەو خوا داناوە بە ئێمەی حاڵی بكات؟




لەبارەی بابەتی پرسیاری یەكەمەوە:

مرۆڤی بێسەلیقە یان لادەر، فێڵزان و كەڵەك باز، لەوانەیە بڵێن، خوا لەسەرەتاوە (ئادەمی) ناردووە تا حەزرەتی (محمد) (ﷺ) لەوەولاش دووبارە دەبێت مەئمور بنێرێت، پێغەمبەر بنێرێت یەكێك لەناو ئەو فێڵزانانە یان ئەو لادەرانە (بەهائییەكانن)!!

بەهائی، كۆمەڵێكن موتەقەلیب(لادەر و فێڵباز) كە لە ئەسڵی ڕیشەوە، زەمانی خۆی (ڕوس)بەرلەئەوان كابرایەكی مەئموری نەفامی لادەری خۆی هێنا، هەم نەفام بوو لەبەر خوێنەواری و زانیاری كەم، هەم لادەر بوو لەبەر ئەو ڕێگەو شوێنەی كە نیشانیان ئەدا، بەناوی ((محمد علی باب)) ئەوەی كردە مەئمور لە ئێراندا بۆ خەڵك گومڕا كردن، كە بەڵێ (محمد) (ﷺ) خاتەمی پێغەمبەران نییە و لەدوای ئەویشەوە هەیە.

لەوەو دوا سەیریان كرد ئەو كارێكی باشی پێ ناكرێت، لە ئینگلستان خصوسی ئینگلیز، كە ئەو وەختە كاری زۆر بوو بۆ تالآنی ئێران و هیندو باقی ئەم ولاّتە ئیسلامیانە لەم دەورو بەرا، فكریان كردەوە كە (محمد علی باب ) نەیتوانیوە كارەكە بە تەواوەتی ئەنجام بدات، نەیتوانیوە فكری موسوڵمانان بە تەواوی بشێوێنێت ئەگەر وایە با بەكەسێكی تری بسپێرین، كابرایەكیان هەڵبژارد بەناوی (بەهائو الله) مەلا شڕەیەك بوو موختەصەر مەعلوماتێكی بوو، ئەمما یەكجار كەم، عەجیبیش ئەوەیە كە ئینگلستان بەو هەمووە مەئمورەوە بەو هەموو خائینەوە نازانم بۆ نەیتوانی ئینسانێكی خوێنەوار تر لە (بهاء الله) هەڵبژێرێت بۆ مەئموری خۆی؟! بۆ نەیزانی پێغەمبەرێكی تێگەیشتو ترو خوێنەوار تر دروست بكات؟ ئا ئەو پێغەمبەرە نەخوێنەوارە چی




بوو؟!! بەهەر حاڵ سوپاس بۆ خوا، هەتا ئینگلستان بەو هەموو فێڵ و تەڵەكە بازییەوە وەختێك دەیەوێت دەخاڵەت لە كاری خوا بكات ئاوا سەری لێ دەشێوێت. لە ناو ئەو هەموو مەئموورو جاسوسانە وا هەیەتی لە كورەی زەمینا (بەهائو اللـه) هەڵدەبژێرێت بۆ پێغەمبەر، باسی ناكرێت، ئەرزشی ئەوەی نییە (بهاء اللـه) باسی لێوە بكەیت.

تەنها كەلیمەیەكی سادە دەڵێم، هەموو ماڵێ قورئانی تێدایە، بەهائییە لادەرو فێڵ بازەكان هەڵدەسن بە جووتە جووت لەلای ئەم كەس قسەیەك و لای ئەو كەس قسەیەك نەخێر فەرموون(ئیقانو ئیتیقان و حەوت پەیكەرو) ئائەو قسە موزەخرەفاتە هیچ و پوچانە وا (بهاء اللـه) نوسیویەتی لە قسەی شێتیش ئەحمەقانە ترە، ئەوانە چاپ بكەن و لەناو خەڵكیدا بڵاوی بكەنەوە، پێویست ناكات لە لای ئەم یەكەوە قسەیەك و لەلای ئەو یەكەوە قسەیەك، ئازای ئەو قسە مەخسەرانە (بەهاء اللـه) وتویەتی، ئەوانە چاپیكەن و لەناو خەڵكا بڵاو بكەرەوە.

چی بۆ ئێوە بڵێم دەربارەی ئەو كتێبانە، كە چەند ئەحمەقانە نوسراون!! ئەی ڕووی(ئینگلیز)ڕەش بێت بۆ پێغەمبەری، ئەی ڕووی (روس) ڕەش بێت بۆ كۆمەكێك كردی بە ئینگلیز، كە تەهدیدی ئەو پێغەمبەرەیەت كرد. پێغەمبەرێك دروست وەك شێت نەوەك ئینسانی نەخوێنەوارێكی سادە، وەك شێت دەكەوێتە ناو كەلیمەیەك و خۆشی لەو كەلیمانە یەت. سەیر دەكەیت دەیدات بە یەكدا و لەڕیشەی ئەو كەلیمە پەنجا كەلیمە دروست دەكات، هیچی مانای نییە! ئەمە مەسەلەیەك تایبەت بە (بەهائی)وتم كە (بەهائی) ئەرزشی ئەوەی نییە باسی بكەیت، بەڵام جگە لە (بەهائییەكان)یش ئینسانی

نریش هەن وا لەبەر فێڵبازی یان لەبەر نەزانی دەڵێن چۆن و بۆچی ڕیسالەتی ئیلاهی لە حەزرەتی (محمد)دا تەواو بێت؟

هەزاران ساڵ گوزەشت خوای گەورە پێغەمبەرانی نارد با لەدوای پێغەمبەر (محمد) پێغەمبەری دیكەش بێت. ئەمە قسەیەكە كە دەیكەن. بەلاّم موسوڵمانەكان باش ئاگاتان لە خۆتان بێت با كلاّوی ئەم قسە نەچێتە سەرتان، كابرایەكی بەهائی یان كابرایەكی وریایی موتەقەلبی لادەری فێڵ زان، لەوانە بەم قسە بتان خەڵەتێنێت، بڵێت"ئەمە چیە بۆ بەهاتنی (محمد) ئیتر تەواو بوو؟ بۆ دەرگای ڕیسالەت بەسترا؟ بۆ خوا مەئموری دیكە نانێرێت؟" ووریا بن و باش وەلاّمەكەی بزانن، خوای گەورە پێغەمبەران بۆچی دەنیرێت؟ بۆ هیدایەتی خەڵكی، بۆ ڕۆشن كردنەوەی فكری خەڵكیان دەنێرێت، لەوە زیاتر ئیتر كارێكیان نیە پێغەمبەران كاتێك زهنی خەڵك ڕۆشن كریاوە، بەرنامەیەك درا بە خەڵك كە ئیتر بەسی بێت، ئیتر كاری پێغەمبەران تەواو دەبێت .

بەكورتی و سادە عەرزتان بكەم، لەزەمانی خەڵقی حەزرەتی ئادەمەوە، بەشەر وەك منداڵێك بوو كە تازە تازە لە دایك ببێت، ئائەو منداڵە فەهمی ئەوەی نەبوو كە خوا كامڵ ترین دینی بۆ بنێرێت و ڕای بگرێت و دەست بەدەست بیگەیەنێتە زەمانی ئایندەو نەصلی ئایندە، خوای گەورە لەو ئەندازە كە قابلی تێگەشتن بوو ئەی توانی ڕیگرێ ئەوەندەی بۆ نارد لەوەو دوا زەمان گوزەرا ئینسانی موتەقەلیب و حوقەباز یان ڕەهبەرانی دینی خائین، یان مرۆڤی دونیا پەرست دەخاڵەتیان كرد لەو حەقائیقەدا وا (حەزرەتی ئادەم) هێنا بوری زەمان چووە بەرەوە پێداویستیەكان گۆڕان و بوون بە شتێكی دیكە.

هەروەك منداڵێك تازە لەدایك دەبێت و بەرنامەیەكی بۆ دا دەنێت، ساڵێك لە تەمەنی تێدەپەڕێت بڕێك شتی تریشی دەوێت، هەندێ قسە كردنی دەوێت، نازو سۆزی دەوێت، دەبێتە دوو ساڵ بڕێك شتی تری دەوێ ، دەبێتە چوار ساڵ هەروا پێنج ساڵ هەروا شەش ساڵ تەواو دەكات و دەڕواتە حەوت ساڵ قوتابخانەی دەوێت، لە قوتابخانە ساڵی ئەوەڵ دەخوێنێت میقدارێك زهنی دەكرێتەوە، پاشان دوو سێ، چوار و پێنج هەرزا .

بەشەر ئەو وەختە منداڵێك بوو تازە لە دایك بوو بوو، خوای گەورە تەنها ئەوەندەی منداڵێكی تازە لەدایك بوو پێویستی پێیەتی، ئەوەندەی بە وەسیلەی حەزرەتی ئادەم تەعلیماتی نارد بۆ بەشەر .

زەمان گوزەرا پێداویستی بووبەوەی دوو بارە زانیاری لە لایەن خوا بنێررێتەوە، هەم ئەو زانیاریانەی وا حەزرەتی ئادەم هێنا بووی دەست كاری كرا بوون، هەم بەشەریش ژیانی گۆڕا بوو، تەعلیماتی تازە پێویست بوو، واتە پێغەمبەرێكی تر، دووبارە هەر بەو نەوعە كە مەگەر لە عیلمی خوا بێت چەند سەد هەزار ساڵ گوزەرا یان هەتا چەند ملیۆن ساڵ مەعلوم نییە، بەلاّم خولاسەیەك لە تەعریفی ئینسانی پێش لە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ئەمەیە كە بەشەری بەر لە ئیسلام هێشتا نەگەیشت بوویە ڕشدی كاملی(گەشەی كاملی) خۆی، بەڵگەش بۆئەوەی نەگەیشتبویە گەشەی كاملی خۆی، ئەوەیە وا تەعلیمات لە تەرەفی خواوە ئەهات هەمووی، یان لەناو دەچو یان دەسكاری دەكرا. سەیریكە دەڵێن (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەر لە تەرەفی خواوە هاتووە، ئەڵبەتە ئەمە دەلیلی حەتمی نییە یان قورئان فەرمویێتی یان پێغەمبەر (ﷺ) حەتمەن فەرموی بێت، مەعلوم نییە وابێت یان وانەبێت، بەلاّم بەهەر





حاڵ ئەوە دیارە پێغەمبەرانی زۆر لەتەرەفی خوازە هاتووت، غەیری (تەورات‌و ئینجیل)نەبێت كوا یەكێك لە بەرنامەی پێغەمبەرەكان ماوە؟

هەمووی لەناو چوو بۆ؟ چونكە بەشەر ئەو مندالّـە بـوو كـە ئیمـڕۆ تـەكلیفی بۆدەكەیت‌و بۆی دەنووسیتەوە بەیانی دڕاوەو فڕێداوە، ئەو بەشـەرە بەكـەڵكی ئەوە نایەت ئەو شتە كەدەبێت تا كۆتای تەمەنی لەلای بمێنێتەوە بیدەیتە دەسی.

لە ئاخرەوە ووردە ووردە ڕشدی(گەشە) پەیاكرد گەیشتە زەمـانی حـەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا، بەكاری ئەوە هات تۆزێك ڕای گرێت لە لای خۆی، (تەوراتی و ئینجیلی) نارد، كـە كـاملترن نـسبەت بەتـەواوی ئـەوی لەبـەر ئیسلام ناردبوی بەلاّم هێشتا ڕشدی بەشەر هەر ئەوەندە نـەبوو كـە بتوانێـت سالم و تەمیزو پوخت بەو جۆرە كـە خـوا ناردویـەتی ڕایگرێـت و نـەهێڵێت دەسكاری بكرێت، ئەلئان سەیر دەكەیت ئینجیل بەڕەنگی جیـاوازو شـێوازی جیاواز نوسراوەتەوە، تەورات شتی وای تیایە كە تەواو ئاشكرا ئاشكرا دیـارە كە قسەی فلاّنە دەسـتەلاّت دار یـان سـەرۆك عەشـیرەتێك،یان مالیكێـك و، ئەربابێك بووە، یان مەسەلەن (مالوم)مەلایـەكی ڕەهبـەری یـەهودی كـە بـۆ مەسڵەحەتی خۆیان دەستكارییان كردووە .

تا بەر لە زەمـانی حـەزرەتی (محمـد) (ﷺ) بەشـەر قۆنـاغ بـە قۆنـاغ هـات گەشەیكرد، گەورە بوو وەك گەیـشتبێتە (١٥، ١٦، ١٧، ١٨، سـالأن ٢٠) سالأن، بەلاّم ئەوەندە ڕشد وگەشەی پەیدا نەكردبوو كە بە كەڵكی ئەوە بێت كاملترین بەرنامەكەی بۆ بنێرێت و بتوانێت ڕایگرێت و نـەهێڵێت دەسـكاری بكرێت و لەناو، بەو دەلیلە هەتا (تەورات، ئینجیل) كە ئاخیرینیان (ئینجیلە)، واتە كە زەمانێكە كە ئیتر ڕشدی خەریكە كامڵ كامڵ بێت دەسكاری كـردوو

كەلیمەكانی گۆڕا، ئیتر تەكلیفی تەورات مەعلومە لە كاتێكدا كە ئینجیلێك سەدەها ساڵ دوای تەوراتە دەسكاریان كردبێت مەعلومە كە دەبێت تەورات چی وەزعێكی بەسەرا هاتبێت، بەلاَم بەشەری زەمانی (محمد) (ﷺ) تا بڵێیت جاهیل بوون، تا بڵێیت سەر لێ شێواو بوو، تا بڵێیت پڕ لە زوڵم و زۆر بوو، بەلاَم پێگەیشتو گەیشتبویە تەمەنی (٢٠ ساڵ) . ئێمە دوو جۆر ڕشد(گەشەكردن)مان هەیە:

١. گەشەكردنێكی سروشتی، كە بریتیە لەوە كە ئینسانێك دەگاتە تەمەنی (٢٠ ساڵ) جیسمی سالم و هێزی هەمووی هەمەجۆرو فكری كامڵ و ئەوانە.

٢. گەشەكردنێكی تەربێتی(پەروەردەی)، كە بریتییەلەوەی ئینسان بە بۆنەی خوێندن و دەرس یان هەر جۆرە بەرنامەیەكەوە فێری دەبێت .

بەشەری زەمانی حەزرەتی محمد (ﷺ) ڕشدی بوو ئەمما كام ڕشد؟ ڕشدە تەبیعییەكە(گەشە سروشتییەكە)، واتە وەك جوانێكی تەمەن (٢٠ ساڵ) وا بوو. بەلاَم ڕشدە تەربێتی و تەعلیمییەكەی(گەشە پەروەردەییەكە) نەبوو، لە هەموو دەورانێكی بەشەرییەت بەد بەخت ترو مەحروم تر و بێ سەواد ترو نەفام ترو مەزڵوم تر بوو، ئەو ڕشدە كە بوونی ڕشدە سروشتیەكە بوو، چونكە ڕشدی سروشتی گەیشتبویە دەورو بەری (١٨، ١٩، ٢٠) ساڵ جوانی، ئیتر وەختی ئەوەی گەیبوو، وەختی هیدایەتی ئەدەیت و زهنی ڕۆشن دەكەیتەوە ئەو بەرنامەیەی وا بەكاری تێت تا ئەو كاتەی بەشەر هەیە بەكەڵكی یەت بۆی بنێریت.

خوای گەورە وەختێك پێغەمبەری نارد (ﷺ) لە زەمانێکدا ناردی کە بەشەر ئەوەندە ڕشدی پەیدا کرد بوو وەك جوانە (٢٠ساڵ)ەکە وای لێهاتبوو ( نوکتە(سەروبۆر) بۆ قورئان دبنێت و حەرف و کەلیمە ژمێری قورئان بکا، کە وەختێك بەشەر ئاوای لێهات تازە کام لادەرو حوقە باز دەتوانێت دەسکاری قورئان بکات و دەستی لێ بدات، لەوەودوایش بەدرێژای مێژوو خۆ خەڵکی هەژارو فەقیر نەبوو کتێبە ئاسمانییەکانیان دەسکاری کردووەو گۆڕیویانە، موتەقەلیب و حوقەبازو زۆردارەکان بوون بە سودی خۆیان بۆ کەر کردنی میللەت دەسکاری کتێبە ئاسمانییەکانیان کردووە، ئەوە هۆکاری چی بووە توانیویانە؟ لەبەر ئەوە بوو کتێبە ئاسمانییەکان تەنها لەدەستی ئەوانەدا بووە نەیان هێشتوە بگاتە دەستی خەڵکی، لەوەولا چی؟ لە زەمانی حەزرەتی محمد (ﷺ) چی؟ وەك لەسەرەتاوە ووتم، هەموو ماڵێك قورئانێکی تێدایە، جا فەرموو چی زۆر داری، چی مەلایەك، چی حوقەبازو موتەقەلیبێك چی شێخێك ئەتوانێت دەست بخاتە ناو قورئان؟

ئەوە یەك، بڕۆن بگەڕێنەوە بۆ سەرەتای مێژووی ئیسلام، (باسەکە زۆر دوورو درێژە، کات نییە هەموویتان بۆ باس بکەم!) کاتێك کە خوای گەورە قورئانی نارد بەشەرییەت لە لایەنی ڕشدی تێگەیشتن و پەروەردەییەوە زڵت(کلۆڵ) بوو، ڕشدی تەبیعی فەقەد کامڵ بوو وەك جوانێکی (٢٠) ساڵە کە هیچ نەفامێ، هیچ دەرك نەکردوە، کە لە ڕووی تەبیعییەوە ساڵمەو هەرچی پێ بڵێیت دەتوانێت باش وەریبگرێت و زەبتی بکات، بەڵام هیچی لێ حاڵی نەبوو. بەشەر ئاوا بوو، تەبەقات و ئیمتیازات بێ حەد و حساب بوو، جا هەموو کورەی زەمین نەك تەنها (عەرەبستای سعودی) ئەوە وا لە مێژووی



ئیسلامدا دەڵێن جاهیلیەت، جاهیلییەت بە تەنها (عەرەبستانی سعودی)ە نەبوو هەموو جیهان بوو، بۆ ئێران بوو بۆ ڕۆم بوو بۆ كورەی زەمین بوو .

## جاهیلییەت چیە؟

جاهیلییەت و نەفامی ئەوەیە كە خوا وێڵكەین و شوێن خەڵك بكەویت، چی شتێك لەوە خراپترە؟!! بەشەری ئەو وەختە ئاوا بوو، لە جیاتی بەندەی خوا بێت بەندەی خەڵك بوو، بەندەی فلآنە ڕەهبەری دینی بوو، بەندەی فلآنە ساحێبی سەروەت بوو، بەندەی فلآنە ئەرباب بوو، ئەمەیە جاهیلییەت، جاهیلییەت بە نەخوێنەواری ناڵێن، جاهیلییەت بەوە دەڵێن لە ئەساسی ترین بەرنامەدا دووچاری هەڵە بێت، ڕێی خوای لێ بشێوێت و بكەوێتە شوێن ڕێی هەواو هەوەس .

جاهیلییەت ئەوەیە كە ئینسان خوا كە ساحێبی نیزامی عالەمەو ئەو بەرنامەیە دەنێرێت بۆ بەشەرییەت كە تا هەزاران ساڵ بگوزەرێت هیچ ئینسانێك ناتوانێت ڕەخنەیەك و نوقتە زوعفێك، لە قورئان بگرێت لە دینی ئیلاهیدا بدۆزێتەوە.

ئەوە من لێرەوە دەڵێم بە هەموو ئەوانەی دژی دین، بە هەموو بەهائی، بە هەر كەسێك كە لەبەر جاسوسی و تەڵەكە یان لەبەر نەزانییەتی، كێیە دژی دین؟ كێیە زۆر خوێنەوار فەرموو لەگەڵ من قسە بكات.

جار جار دەبیسم برێك لە بەهائییان یان لە جواناى مونحەریف، ئەڵێن قورئان كۆن بووە هی زەمانێكی تر بووە، پڕ بوو لە هەڵە، ئەرێ بۆ یەكێك لەو بەهائییە موتەقەلیبانە لەو جوانە خوێنەوارە موتەقەلیبانە نایەن بە من بڵێن با منیش بزانم قورئان هەڵەی تێدایە .وەلاهی ئەگەر قورئان هەڵەی تێدا بێت كەلامی خوا نییەو نامەوێت فڕەی ئەدەم، بەڵام ئاخر هەی هاوار منێك





عومرێکە موتالەعەی قورئان دەکەم و ئیستیفادەی لێدەکەم و شاگردی قورئانم من بۆ هەڵەیەکم لێ نەدۆزییەوە؟! بەڵام جەوانێکی نەزان و نەفام، جەوانێکی بەهائی ئەحمەقی بێ شعور، بۆ لە من شارەزاترە لە قورئان؟! بۆ ئەو دەزانێت قورئان هەڵەی تێدایەو من نازانم؟

کورە هەی خەڵکینە، من عومرم فەقەد لەگەڵ قورئان سەرف بووە لە دوای قورئان لەگەڵ باقی مەسائیلی تر، من ئەو هەمووە زەحمەتەم کێشاوە تۆسقاڵێك خەوش و ئیرادم لێ نەدۆزیوەتەوە، نازانم کابرایەك کە هیچ خەبەر و ئاگای لە قورئان نییە، نازانم جار جار لە تاقێکدا دیبێتی یان جار جار بە نەخوێنەواری کردبێتییەوە لێی حاڵی بووبێت یان نەبووبێت! نازانم ئەوە بۆ دەتوانێت هەڵە لە قورئاندا بدۆزێتەوە؟! ئەوە بە ئامادە بوونی ئێوە دەیڵێم، کێ لە (مەریوان)دا هەیە بەهائیە، لامەزهەبە هەر کەسێك هەیە، دەك ڕووی ڕەش بێت، ئەگەر قسە لەگەڵ من نەکات. با نەیەیت و کڵاو نە نێتە سەر خەڵك، خەڵك نازانێت و شارەزا نین، نازانن قورئان چییە، ئەگەر ئازایت و ڕاست دەکەیت قورئان ڕەخنەی تێدایە بێت من هیدایەت بکات و بێت من حاڵی بکات کە قورئان ئیرادی تێدایە.

جا ئەو وەختە من با باشتر خەڵکی حاڵی بکەم کە بەڵێ ڕاستە قورئان هەڵەی تێدایە. قورئانێك ئیرادی تێدا بوو، قورئانێك هەڵەی تێدا بوو قورئانێك غەڵەت و پەڵەت بوو قسەی خوا نییە، کەلامی خوا ئیرادو هەڵەی تێدا نییە، ئەو کابرا ئەگەر ڕاست دەکات پڕیەتی لە هەڵەو ئیشتیباە، چونکە وام بیستووە، ئەو بەهائییانە وا باس دەکەن کە قورئان پڕە لە هەڵەو تازە بەکاری ئەم ڕۆژە نایەت....

دەی وەرن ئەوە وا پڕە لە هەڵە دانەیەكی پیشانی من بدەن، وەڵاهی تەنها دانەیەكم پیشان بدەن و بۆم دەركەوێت هەڵەیە، بەتەواوی پشت لە قورئان هەڵدەكەم، بەڵام ڕوویان ڕەش بێت بۆ نایەن لەگەڵ منی شارەزا لە قورئان قسە بكەن؟ بۆ لەگەڵ جوانێك یان ئینسانێكی ڕیش سپی كە خەبەری نییە لە قورئان دەستی خاڵی، گومڕای دەكەن و سەری لێ دەشێوێنن؟!

ئەوە بزانن ئەو كەسانە وا پسە پس لەملاو لا قسە دەكەن، ئەوە بزانن ئەوانە حوقەبازن، ئەوانە كڵاو بەردارن، ئەوە موتەقەلیبن، ئەگەر ڕاستە دەكات بێت ئاوا وەك من قسە بكات. كەسێك كەڵەك نەبێت لە كاریدا، حوقەبازی نەبێت و حسابی دونیا پەرستی نەبێت، پلەو مەقام نەبێت ڕاست قسە دەكات لەناو خەڵكا بۆ ئەوەی هەموو كەس بیبیستێ، ڕەئیس دەبیستێ بیبیستێ، پشت خزمەت دەبیستێت بیبیستێت، خوێنەوار دەیبیستێ، نە خوێنەوار دەیبیستێ، سەید دەیبیستێ، مەلا دەیبیستێ، هەر كەس دەبیستێ كەیفی خۆیەتی، حەقیقەتەو دەیڵێم و لەكەس ترسم نییە، بەڵام ئەگەر پسە پسم كرد، بە دزییەوە چوم بەلای ئەوەوە كەلیمەیەك، بەلای ئەوەوە كەلیمەیەكم ووت ....ئەوە فڕو فێڵێك هەیە لە كارمدا.

### مرۆڤ و پێویست بوونی بە دینێكی دیكە:

ئێستا وەرن قسە دەربارەی ئەوە بكەین، بزانین ئایا حەقیقەت لە دوای قورئان پێویست هەی كە خوای گەورە دینێكی دیكە بنێرێت بۆ بەشەر یان پێویست نییە؟ بەو ڕێگەو شوێنەی كە لە سەرەتاوە ڕۆشنمان كردەوە، كە خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ناردوە، چۆنی ناردوون (علیهم السلام)؟

تێگەیشتین، كە لەكاتێكدا بەشەر بوو بە جوانێكی خاوەن هێز و، بتوانێ ئەوە وا دەدرێتە دەستی ڕایگرێت و نەیەڵێت تێك بدرێت، ئالەو كاتەدا خوای گەورە ئاخر بەرنامەی بۆ دەنێرێت، یەك نوكتە كە گرنگە ئالێرەدا ئاماژەی پێ بدەم، ئەوەیە كە بزانین ئائەو بەشەرەی كەوا لە ڕووی ڕشدی تەربێتیەوە(گەشەی پەروەردەییەوە) ئەوەندە لە دوا بوو بە بۆنەی ئیسلامەوە چی لێهات؟ دوای چی ڕشتێكی تەعلیمی و تەربێتی پەیدا كرد؟!

وەك باسێكم كردو چومە سەر باسێكی دیكە، تەبەقاتی یەكجار زۆر لە جەزیرەی عەرەبی و لە كورەی زەویدا زۆر بوو، زوڵم زۆر حەدو حسابی نەبوو، لەناو جەزیرەی عەرەبدا مەحروم ترین تەبەقە بریتی بوون لە بەردە(كۆیلە) ئەوانە وا بەندەی خەڵك بوون، ئەوانە مەحروم ترین و پەست ترین تەبەقات بوون.

حەتمەن ئەوانە وا دەخوێننەوە بیستومانە، وە دەزانین یانی چی، مومكینە ئەوانەش وا نەخوێنەوارن و زۆر موتاڵەعەیان نەكردبێت هەر بیستبێتیان، لەتەواوی موسوڵمانەكاندا حەوت مامۆستامان هەیە لە خوێندنەوەی قورئان و تەلەفوزی قورئاندا، حەوت ئوستاز، كە پێیان دەڵێن (قراء السبع)، واتە خوێنەرانی قورئان كە حەوت كەسن: ئەو حەوت مامۆستایەمان هەیە لە مێژوی ئیسلامدا، لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ)تا ئێستاو تا قیامەت مامۆستای ئومەتی (محمد) بۆ تەعلیمی تەلەفوزو عیبارەتی قورئان و خوێندنەوەی جیاوازی قورئان حەوت كەسن، كێن ئەم حەوت كەسە؟ یەكێك لەم حەوت كەسە بەردە(كۆیلە)و بەردە زادە نییە، ئەو شەشەكەی تر بەردەو بەردە زادەس، جا تەبارەكە اللە سەیربكەن ئینقیلابی ئیسلامی چی دەكات؟! ئەو

بەردەو بەردە زادانە وا لە جۆرەها ئازارو مەحرومییەتدا ئازاریان دەکێشاو ژیانیان دەگوزەراند، شتێك پێیان دەوت ژیان، ئیسلام هات، وازیندو بوونەوە وا بەرز بوونەوە کە حەوتن قورئان خوێنەکان، مامۆستاکانی ئومەتی محمد (ﷺ)حەوتن، شەشیان بەردەو بەردە زادەی ئازاد کراوە،کە لەرێگەی ئیسلامەوە گەشتونەتە نیعمەتی ئازادی! بەشەرێك ئاوای لێهات کە زەعیف ترین و مەحروم ترین تەبەقات هەڵسێت ببێتە ئوستازی ئومەت. تازە موتوقەلیبەکان کێن ئەچن دەسکاری ئەو قورئانە بکەن ؟کێن ئەو رێگا پەیدا دەکەن؟ وەختێك بەردەو بەردە زادەکان، مەحروم ترین تەبەقە ئوستازی قورئانن و قورئان بە ئێمە حاڵی دەکەن، کام دەستەلاَت دار؟ کام خوێنەوار؟ کام موتەقەلیب، ئیمکانی ئەوەی هەیە بڕوات حەرفێکی قورئان سەرەو خوار بکات؟ کەلیمەیەکی لێ لابات یان کەلیمەیەکی لێ زیاد بکات؟

لە سەرەتاوە وتم، ئەوانە وا ئەهلی جاهو جەلالن و سودیان لەوەدا دەست دەکەوێت، سودیان لە گەوجی خەڵکدا هەیە، ئەوانە کە کتێبە ئیلاهییەکان دەگۆڕن، خۆ خەڵکی هەژارو فەقیر دەسکاری کتێبەکان ناکات، بەلاَم لە دوای ئەوەوە قورئان هات، لە دوای ئەوە دینی ئیسلام هات بۆ حەزرەتی محمد(ﷺ) خەڵکی هەژارو فەقیر ئاوا زیندو بونەوە! کە فەقیر ترین و مەحروم ترین ئینسانەکان بونە مامۆستای ئومەتی محمد(ﷺ) تا رۆژی قیامەت. خەڵکێك ئاوا وریا بێتە تەبەقەی ئاوا مەحروم بکەوێتە سەرو بانترێت تەبەقاتی تەربێتی، ئەڵبەتە تەبەقاتی کۆمەلاَیەتی یان تەبەقاتی ئابوری لە ئیسلامدا نییە تەبەقاتی عیلمی و مەعنەوی هەیە. مەحروم ترین کەس بکەوێتە




سەرترین تەبەقاتی عیلمی و مەعنەوی لە كۆمەڵگەی وا، كام حوقەباز كام دنیا پەرست دەتوانێ دزە بكاتە ناو قورئان؟ ناو ئەو پەیامە ئیلاهییە؟

ئەمە لە لایەكەوە، كە شایەتە بۆ ئەوە كە بەشەر گەشەی كردووە. جا ئەوەشتان عەرز بكەم ئەگەر لە زەمانی ئادەمیشدا بەشەرییەت ئەوەندە ڕشدی ببوایە كە ئەوە وا خوا دەینێرێ بۆی هەمووی زەبت كات و ڕایگرێت و بیگەیەنێتە جیلەكانی دواتری ئیتر خوا پێغەمبەرانی دیكەی نەدەنارد، خۆ پێغەمبەران بۆ سەرگەرمی نین، بۆ شەڕو كێشەو جەدەل كردن لەگەڵ كەسانی تردا نین بۆ هیدایەتی خەڵكن، پێغەمبەران مامۆستان نەك مامۆستای فلانە دەرس و فلانە بەرنامە! مامۆستای زهن ڕۆشنكردنەوەن، مامۆستای چاكسازی و بابەتەكانی كۆمەڵگەن، مامۆستای ڕزگار كردنی خەڵك، مامۆستای ئەوانەن، ئەگەر لە زەمانی (ئادەم)یشدا پێغەمبەران هاتوون خەڵك بیتوانیایە تەعلیماتەكە ڕابگرن هەتا بەشەر هەیە لە كورەی زەمین هەر ئەوەڵ پێغەمبەری دەناردو هیچی تر، بەڵام وەكو ووتم بەشەر ئەو ڕشدەی نەبوو نەیدەتوانی ئەو تەعلیماتی ئیلاهییە ڕاگرێت، وەختێك گەشتە زەمانی حەزرەتی محمد(ﷺ)، بەشەر بەڵێ مەزڵوم، بەڵێ ستەم لێكراو، بەڵام ڕشدی تەبیعی ئامادەیە كاتێك خوای گەورە دینی بۆ دەنێرێت قورئانی بۆ دەنێرێت، نزم ترین تەبەقاتی كۆمەڵگەی پێ دەكەوێتە سەرەوە، دەكەوێتە بان و ئەوێتە مامۆستای قورئان، تازە ئیتر ڕێگەیەك نامێنێت بۆ دەسكاری كردنی قورئان، لەدوای ئەوەش بەرنامەیەكی ئابەو جۆرە لە لایەن خوای گەورەوە هات بۆ خەڵك كە ئینسان بۆی نەبێت دەسكاری بكات، دەی ئیتر ناردنی پێغەمبەران بۆ سەرگەرمییە؟ مەگەر فلیمی سینەمایە هەر ڕۆژێ بیگۆڕێت؟ مەگەر




حوکومەتە، مەگەر وەزیرە، مەگەر فەرمانبەرە؟! مامۆستای بەشەرییەو بەرنامە بۆ بەشەر دێنێت، بەرنامەی هێناوە بۆ بەشەر، بەشەر توانیویەتی ڕایگریت و نەیەڵێت دەسکاری بکرێت، تەواو بوو ئیتر، پێویستی نەما بەوە کە خوای گەورە دووبارە پێغەمبەر بنێرێت.

**قورئان لەنێوان کۆن و تازەدا:**

لێرەدا دەربارەی پرسیا و گومانێکی دیکە قسەدەکەم، کە زۆرێك لە خەڵکی بەلاڕێدا بردووە، ئەویش بابەت کۆن و تازەی قورئان بۆ ئەم سەردەمە، هەندێك کەس وەك (بەهائییەکان) لەو مەردوم خەڵەتێنانە، دەڵێن "ئەو دییانەتە، ئەو قورئانە بۆ(١٤ قەڕن)ی لەمەو پێش بەکار هاتووە تازە ئیتر بەکاری ئێستا نایە، ئێستە بەشەر ڕشدی پەیدا کردوە، فەهمی پەیدا کردوەو ژیانی گۆڕاوەو کەوتۆتە سەر دەوری پێشکەوتن، دەبێت ئێستا بەرنامەیەکی دیکە بۆ خەڵکی ببێت، ئەوەوا لە(١٤ قەڕن)دا خەڵکی بەڕێوە بردوە ناتوانێت لە ئێستادا خەڵکی بەڕێوە ببات".

ئەمەش جۆرێك لەو حوقەبازی کەڵەکەکانیانە، بەڵام جوابی ئەوەشتان عەرز بکەم.

**بەشەر دووباری ژیانی هەیە:**

**بارێکی زیندەگی مادی:** واتە ئەوە وا مەجموعەن بە جەستەی ئینسان پەیوەستە.

**بارێکی زیندەگی مەعنەوی:** ئەوە وا بە ڕۆحی، بە فکری، بە دەرکی پەیوەستە.

**بۆ ژیانی مادی:**

خوای گەورە بۆ ئەوە کە پێداویستیەکانی بەشەر لە هەردوو بارەکەوە دابین بێت، هەرکامی ڕێگایەکی بۆ هەڵبژاردوە، بەڵام هەردوو ڕێگاکە وەك یەکە، لە

ڕۆژێکەوە کە خوای گەورە ئینسانی هاوردە ڕووی ئەم کورەی زەمینە ئەم کورەی زەمینەی دروست کردوە، دوای ئەوە داویەتیە دەست ئینسانەوە، ئینسانی ئەو وەختیشە سودی بینیوە لە کورەی زەمین ئینسانی هەزار سالی لەوەو دوا، سەد هەزار سالی لەوەو دوا سودی بینیوەو ئینسانی ئێستاش سود دەبینێت، تاکاتێك مرۆڤ لەسەر زەوی بمێنێت و ئەم کورەی زەمینە عومری باقی بێت ئەمە هەر هەیەو بەشەر ئیستیفادەی لێدەکات .

هۆکاری چیە؟ ئەی بۆ نالێین ئاخر کورەی زەمین هی دە هەزار سالْ لەمەو بەر بوو تازە کۆنەو بەکار نایەت؟!دەبێت خوا شتێکی دیکە بنێرێت بۆ مرۆڤ، بۆ ئەوە نالێیت ؟لەبەر یەك دەلیل (هۆکار) وا نالێین، یەك دەلیلمان هەیە، چیە دەلیلەکە؟ خوای گەورە کورەی زەوی بە مەوادەوە دروست کردوەو داویەتیە ئێمە، کورەی زەوی بە (ئاوان ودەساوان و دەساڕو..) ئەوانەوە دروست نەکردوە و پاشان دابێتییە ئێمە. خوای گەورە بە ئاسن و ئاو خاك و مەوادی جیاوازەوە ئەم زەمینەی دروست کردوە، لە سەد هەزار سالی لەمەو پێشدا خەلکی سودی لێ بینیوە، بۆ موناسبی ژیانی خۆی لە دە هەزار سالی لێرەو بەردا سودیان لێ بینیوە بۆ ژیانی خۆیان و ئێستاش سودی لێ دەبینن و لەمەو دوایش سودی لێ دەبینن .

زەمانێك بوو سودەکەی بەشەر لەم زەوییە ئەوە بوو تەنها گیاو بەروبومی دارەکانی دەخوارد، زەمانێك بوو برێك کەوتە پێشەوە بەردی دەتاشیو کاری جۆر جۆری لێ دەکرد، زەمانێك بوو (فلزات)یشی هێنایە ناوەوە، فلزی دروست دەکردو چەقۆی دروست دەکرد، مەسەلەن نێزەی دروست دەکرد، (کەمانی) لە دار دروست دەکرد لەم جۆرە وەسائیلانە کەوتۆتە ئەمرۆ




(تەسجیل)(ڕیکۆردەر) دروست دەکات، ڕادیۆ دروست دەکات ئەنواعی وەسائیلی فەنی دروست دەکات، تا دەگاتە ئەو موشەکانە وا دەیاننێرێت بۆ فەزا، تا دەگاتە ئەو مانگە دەسکردانە وا بەدەوری فەزادا دەگەڕێن و دەڕۆنە کوراتی ترو دەچنە مانگ و کوێو کوێی تریش، ئەمانیشە دەڕۆ، ئەگەر بەشەر خۆی نەبێتە بەلاَ بۆ گیانی خۆی، عیلمی خۆی نەبێتە ئافات بۆ خۆی، وەك باڵی مێرودەبێتە بەلاَی سەر، عیلمەکەی نەبێتە باعیسی ئەوە ئەتۆم دروست بکات بۆمب و تفەنگ دروست بکاو نارنجۆك دروست بکات خۆی پێ لەناو ببات زۆری ماوە و هێشتا وا بەرێوە، هێشتا هیچ حاڵی نەبووە، هێشتا هیچ پێش ڕەفتێکی عیلمی نەبووە! دەگاتە زەمانێك ئائێستا وەك گرو گاڵ کردن وایە، ئەوەندە عیلمی پێش دەکەوێت، دەگاتە زەمانێك هەر بەناو نیشانی قورئان....کە هەی هوا!مانگ و ئەوانە هیچ نین دەگاتە زۆر مەراحیلی گەورە لە زانست.

کورەی زەوی بەکاری ئەو کاتانەش دەخوات، هەروا کە بەکاری ئێستا دێت، هەروا بەکاری هەزار ساڵ و سەد هەزار ساڵی لێرەو بەر هاتووە بەکاری سەد هەزار ساڵی تریش دەخوات، بۆ؟! لەبەر ئەوە خوای گەورە بەشێوەیەك دروستی نەکردووە کە تەیارە بێت یان تەجیل بێت یان ڕادیۆ بێت، نا...ئاسن و مەوادی مەعدەنییە، پێتخۆشە (ئاوان و دەساوانی) لێ دروست بکە، ڕیکۆردەر و کۆمپیوتەری لێ دروست بکە! چۆنت پێ خۆشە دەگونجێت و بەکار دێت.

بۆ باری زیندەگی ماددی، خوای گەورە زەمانی داوەتە بەشەر ئابەم شێوەیە، بە مەوادەوە بەشەر لە هەر زەمانێكدا چەنێك ڕوشتی بێت ئەوەندە سود وەردەگرێت لە زەوی.

بۆ ژیانی مەعنەوی:

ژیانی مەعنەوییە، بەشەر ئاخر خۆ هەر هەوڵی مادی نییە، هەر جیسم نییە، دەزانین كە حەیوانات هەر جیسم بەسە بۆیان هیچی تر مەترەح نییە، بەلاّم ئاشكرایەو بەڵگە هێنانەوەی زۆری ناوێت هەموومان دەزانین بەشەر بە تەنها ژیانێكی مادی ئیدارە نابێت. بەشەر دەركی دەوێت، تێگەیشتنی دەوێت، دەبێت بزانێت چی دەكات، نیسبەت بەخۆی چی دەكات، نسبەت بە خەڵك چی دەكات. ئەوە وا نسبەت بەخۆی چی دەكات و نسبەت بە خەڵك چی دەكات ئەوە پێی دەڵێن بەرنامەی مەعنەوی، ئەوە وا لایەنی پێداویستی مەعنەوی خەڵكە ئابەو بەرنامە مەعنەوییە تەئمین دەبێت .

خوای گەورە بۆ ئەوە چی كردوە؟ بۆ ئەوەش وەك ئەو مودەتها زەمانێك بەشەر ڕشدی نەبوو نەیدەتوانی ڕایگرێ مامۆستای دەنارد كە پێغەمبەران بوون (علیه السلام) وردە وردە دەستی بگرن تا بیگەیەننە زەمانێك كە ڕشدی ببێت ڕای گرێت، وەختێك گەیشتە زەمانی ڕشد، قورئانی بۆ ناردوە، قورئان بۆ ژیانی مەعنەوی ئینسان وەك زەوییە بۆ ژیانی مادی ئینسان، هەرگیز ئێمە ڕاست نییە بڵێین ئەی وەلاّ زەوی خۆ هی هەزار ساڵ لەمەوبەرە كۆنە وازی لێبێنە، ئەی هەوا، عەیب نییە، خەڵكی یەك ملیۆن ساڵ لەمەوبەر هەوایان هەڵمژیوە ئێستا ئێمەی پێشكەوتو هەر هەوا هەڵمژین؟! سەد هەزار



ساڵ لەمەوبەر ئاویان دەخواردەوە عەیب نییە منی ساڵی قەڕنی ئەتۆم و قەڕنی فەزا هەر (ئاو) بخۆمەوە؟ کەس قسەی وا (کەرانە ناکات)، ئەی بۆ ئەوەندە قسەی کەرانە دەکات ئێژێ، هەی هو خوا چواردە قەڕن لەمەوبەر قورئانی ناردوە، ئێستا من گوێ ڕایەڵی بکەم. ئەم قسە بەقەد ئەو قسە کەرانەیە کە کابرا بڵێت"وەلاّ بۆ من عەیبە چۆن چواردە قەڕنی لێرەو بەر، سەد قەڕنی لێرەو بەر مەردوم هەر (ئاویان) خواردۆتەوە ئێستا منیش هەر وەك ئەو کۆنە پەرستانە بم هەر ئاو بخۆمەوە".

براله! ئاو هەر ئاوەو ئاسن هەر ئاسنە مەوادی ئەوەڵی هەر ئەو مەوادە ئەوەڵیە. نەوعی سود وەرگرتن لەوانە دەگۆڕێت، دەڕوات تێرێت لەو ئاوە شەربەتی جۆراو جۆر دروست دەکات زەمانێك ئەوانەی نەزانیوە هەر ئاوێکی سادەی خواردوە، هەر بەو حۆرە هەموومەوادەکانی تر .

مەسەلەی سود وەرگرتنی ئێمەش لە قورئان، سودی بەشەرییەت لە قورئان ئەوەیە، قورئان وەك زەمینە بۆ زیندەگی مادی، بەلاّم قورئانەکە بۆ لایەنی ژیانی مەعنەوییە خوای گەورە جوزئیاتی بەیا نەکردووە کە لیباسەکەت وابێت، کەوشەکەت وابێ، کلاّشەکەت وابێ، مزگەوتەکەت دیواری وابێت، حوکومە وابێت موعامەلەکە وابێت، جوزئیات بەیان ناکات، ئوصول بەیان دەکات، کولییات بەیاندەکات، واتە مەواد بەیان دەکات. چۆن بۆ ژیانی مادی ئاو ئاگرو هەواو خۆڵ و فلاّنە شت دەداتە بەشەر، بۆ زیندەگی بەشەر هەروا کولییات دەداتە دەستی لەجیاتی جوزئیات، جوزئیات ناداتە دەستی، مەگەر برێك جوزئییات ئەویش تا بەشەر بەشەرە پێویستی بەوانە دەبێت،




ئەگەر نا باقییەكەی تری كولییاتە، جا وەزیفەی ئینسانی تر و كۆمەڵـەی تـرە كە فەهمی ئەم كولییاتە بكەن.

خوای گەورە بەشێوەی كولییات دەیداتە بەشەر، بەشەریش لـە هەر سـەردەم و زەمانێكدا چی بەكاری زەمانی خۆی بێت و لازمە ئەوە هەڵدەهـەێنجێت لـە قورئان، ئەو دەردەهێنێت لـە قورئان، عەینەن ئەوە كابرا بڵێت "چواردە قەرنی لـەمەو پێش ئەمە بەكاری خەڵك هاتووە و ئێـستا مـن بـڕۆم بكەومـە شـوێنی قورئان؟ دەبێتە كۆنە پەرستی"، هەروەك ئەوەیە بڵێت "ئەی بابە چواردە قەرنی لێرەو بەر خەڵكی ئاوییان خواردوە ئێستا منیش هەر ئاو بخۆم؟! ئەوە وەلاَ بـۆ من عەیبە دەبێتە كۆنە پەرستی."

عەین ئەوەیە، بۆ؟ چونكە قورئان هەر وەك بۆ ژیانی مادی خوا مەوادی كـولی ناردوە ئـەویش هـەڵگری مـەوادێكی كولییـە وەك كـورەی زەوییـە، شـتانی جوزئی دیاری نەكراوە بۆ ئینسان، بەرنامـەی كـولی زینـدەگی ئینـسانەو ئـەم بەرنامە كولییە دەبێت سودی لێ وەربگیرێت.

## قورئان و ڕێگەو شوێنی سود وەرگرتن لێی:

جا دەمێنێتەوە سەر شێوازی سود وەرگرتن لـەم بەرنامە كولییە، پـێش ئـەوەی باسی شێوازی سود وەرگرتن بكەم لـەم سیستەمە كولییە، یەك شتی تر بڵـێم، دەربارەی ئەم مەتڵەبە دوای (قورئان) پێغەمبەرانی دیكەش دێن، یەك كەلیمـە هەی كە پێویستە هەمووومان بیزانین.

## پێویستی هاتنی پێغەمبەرێك دوای پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ):

دەڵێن خەڵك پێویستی بە دیانەتێكی تر {پێغەمبەرێكی} تر هەیە، چونكە ژیان گۆڕاوە، و پێشكەوتووە، لەبەر ئەوە مەسەلەن (بهاء اللـه) هاتوە بۆتە پێغەمبەر (جا پێغەمبەری –لەندەنی –ئەوە باسێكی ترەو بەجێگەی خۆی...

باشە قبوڵمانە فەرزەكەین پێغەمبەرێكی دیكە بێت و بەرنامە بهێنێت، بەلأم براكان، ئەگەر قەرارە پێغەمبەرێكی تر بێت دەبێت چی بێت؟ دەبێت وابێت كە (قورئان) ناقص بێت، ناتەواو بێت، نەتوانێت بەشەرییەت بەڕێوە بەرێت، ئەو پێغەمبەرە بەرنامەیەكی كامڵتر بهێنێت، ئەگەر بەرنامەیەكی وا كامڵتر پێیە وەرە باسی بكە، بەلأم بیربكەنەوە ...ئاخر ئێوە هەمووتان توانای ئەوەتان نییە موتاڵەعە بكەن و كتێبەكان بخوێننەوە، فكر بكەنەوە ئەوانە وا زۆر خوێنەوارن توانایان نییە كتێبەكانی (بهاء اللـه)بكەوێتە دەستیان، بۆ ؟!!

من لە (تاران)دا دوانزە جەلسە لەگەڵ ئەم لادەری فێڵبازانەدا بەحسم بوو، ئاخرین جار توانیم (سێ) كتێبیانم دەسكەوت، (دووەمیان) لێ دزیەوە(سێ) كتێبیان دەس كەوت(حەوت وادی و ئیقانا و اشراقات)*، ئەم(سێ)كتێبەیانم

---

*) كتابەكانی بهاوالله:

١. كتابی اقدس: ئەم كتێبە بە زمانی عەرەبی لە شاری (عەكا) نووسراوە، یەكەم كتێبیەتی كە وتوویەتی وەحیە و دابەزیوە بۆم، هەوڵیداوە لە ڕستەكانی لە ڕستەی قورئان بچن. لە (٤٧٠)ئایەت پێكهاتووە. هەموو بنەما و ئەحكام و سنورەكانی ئاینی (بەهائی) تێدایە.

٢. كتابی ایقنا: لە ڕووخساردا بە فارسی نووسراوە، بەلأم زۆرتر وشە و ڕستەكانی عەرەبییە، بهاوالله دەڵێت ئەم كتێبەی بە وەحی بۆ دابەزیووە و هەڵگری حەقانییە و دەستبەكاربوونییەتی وەك باب و نبوەت و اصولی دینی و استدلالاتی تێدایە.

٣. كتاب اشراقات: ئەمەیان هەروەك كتێبی (بیان) – سیدعەلی محەمەد باب–ە كە بەزمانی فارسی و عەرەبی نووسراوە و شاملی ئەحكام و سنورەكانی دینی بەهائییە.

دەسكەوت (دووەمیان) دزییەوە، دەی دواتان ببڕێت! ئەگەر ڕاستدەكەیت، ئەگەر دینەكەت كاملترین دینە ئادەی پیشانی بدە؟! بیهێنە بەردەسی خەڵك كتێبەكان بڵاوبكەرەوە با خەڵك بزانێ وایە، موتەقەلیبی حوقەباز بۆ كتێبەكانت ناكەوێتە دەستی خەڵك؟

بۆ ئەگەر بەلای كەسێكەوە بێت دەیدزێتەوە؟! ئەوە پیاوانی زانا، ئەوە گەنجانی خوێنەوار، كێ تا ئێستا لەچی كتێبخانەیەكداو لە ماڵێكدا توانیویەتی كتێبی ئەو پێغەمبەرە لەندەنییە ببینێت؟! بۆ نییە؟ لەبەرئەوەی ڕووی ئەوەی نییە بێتە ناو خەڵك، لەبەرئەوەی ئابڕوی دەچێت، ڕستەی وای هەیە هیچ شێتێكی ئەحمەق ڕستەی وا ناڵێت، سەرفی نەزەر لەوەی هیچ مەتڵەبێكی خوێنەوارانە نییە و هیچێكی تێدا نییە، ڕستەی وا هەیە كە بەڕاستی بەهیچ جۆرێك مانای بۆ دروست نابێت، هەر كەلیمەیەو ناوێتی بەیەكەوە، بۆ نمونە ((الناس والمنصور متنصرو موتەنەصرو موفتار ))دەی دەی چی كەلیمەی (نون و ص و ڕێ)ئەوانەی وا عەرەبی دەزانن ئەوە دەزانن. ئەم شێتە سەرگەردانە كە دەستی پێ كردوە خۆی پێ نەگیراوەتەوە، وەك سەیارەیەك ئیستۆپی تێدا نەمێنێت هەر گیزەی هاتووە و هەر كەلیمەی ڕیز كردووە و(هیچی مانای نییە!!)

---

٤. كتابی هەفت وادی: ئەمەی بۆ (شێخ عبدالرحمن كركولی) نووسیوە، چونكە كركوتی خۆی لە شێخ و صوفییەكان بورە، بهاوالله چەمك وزاراوە صوفی و عارفانەكانی لەوێدا بۆنووسیوە.

متابی(الواح السلاگین): بە زامانی فارسی و عەرەبی نووسراوە، كە بریتییە لەو نامە و الواحانەی كە بهاوالله بۆ پاشا و كاربەدەست و سەرۆكی ولآتانی نووسیوە نزیكەی (٦٦ لەوح). بۆ خوێندنەوەی زیاتر لەبارەی مێژووی ئەم گروپەوە سەردانی ئەم پێگەیە بكە (http://www.bayanebahaian.blogsky.com/١٣٨٥/٠٥/٢٣/post-٤/)

دەی (مەنصوری)* موتەقەلیبی حوقەباز، ماڵی خەڵكت تاڵان كرد بەست نییە؟ هەی ڕوڕەش، هەی نەعلەت لەوە وا تۆی ناردە مەریوان، وا ئیجازەی پێداویت لە مەریواندا دانیشی، ئێستا خەریكی فكری خەڵكی تاڵان دەكەی، ئیمانی خەڵكیش تاڵان دەكەی، كورە هەی خەڵكینە وریا بن ئەمانە دوژمنی ئێوەن، ئەمانە زاڵون و ماڵتان دەبەن و ئیمانیشتان دەبەن و هیچتان بۆ ناهێڵنەوە ئاگاتان لە خۆتان بێت، نەیەڵن و كڵاو نەچێتە سەرتان، بەڵێ مەزڵومن، بەڵێ فەقیرن و هەموو كەس قسەتان لەگەڵ دەكات و دەتان خەڵەتێنێ، بەڵام زەڕەیەك بچنەوە بەخۆتانداو وریابنەوە نەیەڵن تا ئاخیرین حەد تاڵانتان بكەن، نەیەڵن كابرای (بەهائی) موتەقەلیب بەبۆنەی ئێوەوە هەزاران هەزارو ملیۆن ملیۆن و خستۆتە سەر یەك... سەروەتی ئێوەی بردوەو ئێوەی هەموو فەقیر خستووە ئێستا بێت ئیمانەكەشتان تاڵان بكات، عەقیدەكەشتان تاڵان كات.

ئەگەر ڕاست دەكەی جەنابی (مەنصوری) تەبلیغ دەكەیت بۆ پێغەمبەری (لەندەنی بهاءالله) دەڵێت خوا پێویستە دوای (حەزرەتی محمد) (ﷺ) دووبارە پێغەمبەر نێرێت، بەڵێ ئەگەر بەهاءالله بەرنامەی هێناوە كامڵتر لەبەرنامەی حەزرەتی (محمد) (ﷺ) باشە قبوڵمە، بەڵام چی هێناوە؟!

من لەو سێ چوار ڕۆژا كە مەجالم بوو ئەو كتێبە موزەخرەفە چەندانەم دەسكەوت، لەناویدا تێ پەڕیم ئەصڵەن شتی وای هەیە پڕە لە شتی هیچ و پوچ كە ئینسان هیچ سەری لەبەردەر ناكات، ووردە ووردە مەسەلەن كە

---

*) وەك لە قسەكانی (كاك ئەحمەد)دا دەردەكەوێت، مەنصور یەكێكە لەو كەسانەی كە هاتۆتە شاری مەریوان ئیدعای دینی بەهائی دەكات و لە ناوخەڵكدا بڵاوی دەكاتەوە....

دەگاتە نەزم و بەرنامە، تەواوی بەرنامەیەك کە(بەهاء اللـه) دایناوە لـە ئێـران، عەینی ئەوەیە کە (مەلا میرزا سەید ئەحمەدی قادیانی) لــە (هیندســتان) داینــا. هەردووك پێغەمبەری لەندەن و هــەردووکیان لەتــەرەفی لـەندەنــەوە مــەقامی (سێر–sir–) واتە مەقامی ئەربابی گەورە دراوە پێیان، (سێر بەهاو اللـه)چـی (سێر میرزا سەید ئەحمەدی قادیانی)وەختێك نـاوی (لـەنـدەن)بــەیت، وەختـیٚ ناوی ئینگلیز ببەیت هەروەك ئەوەی ئیهانەت پیٚ کردبن، بەهائییــەکان ئەوەنـە پێیان ناخۆشە.

جا نەعلەت لــە (ئینگلیــز) بـا هــەر پێیــان نـاخۆش بێــت، ئـەو دوو نەفـەرە مەئمورییەتیان پێدرا، لـەیـەك کاتـدا، (داخەکـەم دەبێـت مێژوویـەکی دوورو درێژتان بۆ بـاس بکــەم)، بــەکورتی ئــەویش لەکاتێکـدا بــوو، ئینگلــستان و فەرەنسا موسوڵمانیان خەڵەتانـدبوو بەریاندابوونــە گیــانی یــەکتری و خۆیــان هاتبوون حوکومەتیان دەکرد، بــەلاٚم یــەك نوکتــە لــە ئیــسلامدا هــەبوو کــە نەیدەهێلاٚ ئەمانە بەئاسانی حوکومی خۆیان بکەن، ئەویش ئــەوە بــوو کــە لــە ئیسلامدا (جیهادی) تێدایە، یەکێك لە وەزیفەکانی سابت(نـەگۆڕ)ی ئینـسانی موسوڵمان (جیهادە)، ئینسان موکولـەفە بەمە کــە (جیهــاد) بکــات، ئینــسانی موسوڵمان ناتوانێت دەست لە (جیهاد) هەڵبگرێت. ئەم مەسەلـەی (جیهــادە) بووە هۆکاری ئەوەی ئینگلــستان و فەرەنــسا نەیانــدەتوانی بــە دڵخۆشــییەوە لەناو سەر زەمینی موسوڵماندا دانیشن، ئەگەر وایە چی بکەن؟ پێغەمبەرانێکی تازە بنێرن (جیهاد) باتڵ بکەنەوە، کە بە ڕاستیش وایان کــرد*. تاکــە هــەولی

---

*) دەربارەی عەقیدەو باوەڕی بەهائییەکان:

١. خودا لە مەخلقەکانیدا دەردەکەوێت، یەکێك لەو مەخلوقانە خودا خۆی تێدا پیشانداوە (باب)ە!

ئەم دووانە (میرزا سەید ئەحمەدی قادیانی)و (بەهئو الله)، کە ئەو (هیند)بوو ئەمیش (ئێرانی)، ئەوەبوو (جیهاد) بەتاڵبکەنەوە! دەیانووت"جیهاد گوناهەو هیچ کەس مافی ئەوەی نییە جیهاد بکات". ئەمەتا فڕوفێڵ کەوەتە دەرەوە بە دەربڕینی خۆمان (کلکی کەڵەشێرەکە کەوتە دەرەوە).

ئەوە مەعلوم بوو کە (لەندەن و ڕوس) لە زۆربەی کاتەکان، شەڕیان بوو بەیەکەوە لێدەدا یەکڕان بۆ کۆمەکی (بەهاو اللە)، چونکە هەردوو لە جیهادی ئیسلام دەترسان لەوانەیە (٥٠) ساڵەکان لە بیریان بێت (ڕوس) لەلایەکەوە دەهات و (ئینگلیز) لە لایەکەوە دەهات بۆ ئەوەی ماڵی (ئێران) و ئەم سەر زەمینە ئیسلامییانە بخۆن، ئەمە بەرنامەیەکی دوورو درێژیان بوو ڕاستە دوژمن بوون و ڕووبەڕووی یەکدەبوونەوە، بەلاّم بۆ بەهێز کردنی

---

٢. باوەڕیان بە تەناسوخی ئەرواح هەیە.

٣. باوەڕیان وایە هەموو دینەکان ڕاستن و (تەورات و ئینجیل) دەستکارە نەکراون، هەروەرها دەبێت هەموو دینەکان لە یەك دیندا کۆبکرێنەوە کە دینی(بهاءالله).

٤. بڕوایان وایە، دینی (بوزا، کۆنفۆشیۆس، ابراهما، زەردەشت) دینی دەسەلاّتدارانی(هند و صین و ئێران)ن.

٥. هاوڕان لەسەرئەوەی کە حەزرەتی مەسیح لە خاچ دراوە.

٦. ئینکاری بوونی(پەرجوی پێغەمبەران، فریشتە، جن)دەکەن، هەروەك ئەوەی ئینکاری بوولی (بەهەشت و دۆزەخ) دەکەن.

٧. بەهەموو شێوەیەك حیجابی بۆ ئافرەت حەرامە و مەتعە حەلاّلە.

٨. دینی(محمەد عەلی باب)دینی پێغەمبەر موحەمەد(ﷺ)ی نەسخ کردۆتەوە.

٩. نوێژی جەماعەت جائیز نییە تەنها بۆ نوێژی مردو نەبێت.

١٠. ژمارە (١٩) پیرۆزە لەلایان، بۆیە مانگەکانی ساڵ (١٩ مانگە) و ڕۆژەکانی مانگ (١٩ ڕۆژە).

١١. ئیکاری کۆتای هاتنی پێغەمبەر دەکەن! بڵکو دەڵێن هاتنی پێغەمبەران بەردەوامە.

١٢. جیهاد و هەڵگرتنی چەك حەرامە.

١٣. حەجکرد بۆ مککە باتڵە، بەڵکو دەبێت ڕوبکرێتە گۆڕی (بهاءالله) لە عکا لە فەرلەستین.

http://www.paldf.net/forum/showthread.php?t=٦٣٠٦٤

(بهاءالله) هاوڕا بوون، بۆئەوەی بە موسوڵمانان بڵێت"جیهاد مەكـەن، جیهـاد حەرامەو گوناهـە، جیهـاد ئـازارداني مەردومـەو، بـۆ ئازاریـان دەدەیـت لـە خەڵك؟ ئارامبە، خۆش ڕووبە، میهرەبانبە... ئـاخر چـۆن وا دەبێـت؟! كـابرا زوڵمم لێ بكات، كوڕم بكوژێت، بـرام بكوژێـت سـەرزەمینم داگـیر بكـات منیش بڵێم "بەقوربانت بم بێزەحمەت وا مەكە".

كورە ئەدەم لـە ورگی و هەڵی دەدەڕم، ئەوە ئینسان نییە ئەوە ڕێوییە، ئـەوە (مەیمونە). ئینسان دەبێت ئەگەر لـەبەرامبەری ئینـسانی مـەزڵوم و فـەقیرەوە لە(شیر) نەرمتر بێت، لـە بەرامبەری ئینسانی زاڵم و موتەفەلییەوە لـە (شـێر) دڕندەتر بێت، ئینسانی موسوڵمان ئەمە وەزیفەیەتی.

بەڵام (بەهاواللـە) لـە ئێران، (قادییانی) لـە هیندستان، خەریكن ئەم بەرنامە لـە موسوڵمانان بسێننەوە، كە جیهادەو جیهاد حەرام دەكەن.

**لـە داوی نەمانی جیهاد ئەمجار باسی حیجاب:**

یەكێكی تر لـە داواكارییەكانی ئەم دوو بە كرێگریراوە بریتی بوو لـەوەی كـە (حیجاب) لـە ناو ئافرەتانی موسوڵماندا نەمێنێت و هـەڵبگیرێت، ئەمـەش وەك پاڵپشتییەك بۆ بابەتی جیهاد و زەعیفكردنی ئەو بابەتـە، جـا (كـاك ئەحمـەدی موفتی زادە) لێرە بەدواوە هەوڵدەدات زۆر بەكورتی باسـی پەیوەنـدی نێـوان (جیهاد و حیجاب) بكات و كەشفی ئەو پیلانە بكات كە دوژمنانی ئـەم دینـە دایانڕشتووە و بەدرێژی مێژوو كاری لەسەر دەكان. ئەو بەم شێوەیە درێژە بە باسەكەی دەدات"دواتر پـشتەوانەیەك بـۆ جیهـاد دادەنێـت، ئـەویش نـەمانی (ناموس و حیجـاب) ئائەمـە داواكـاری ئـەم دوو لـەنـدەنی و حوقەبازانەیـە.

(قادیانی و بەهاوالله). لە دوای (جیهاد) (حیجاب) نەمێنێت، تا حەدێكی وا كە هیچ لەبەری ئافرەتدا نەمێنێت، بۆچی؟!

بەڵگەی دوورودرێژ ناهێنمەوە، بۆئەوەی سەرتان لێ نەشێوێت، هیچكامێكتان لە نەزەرتاندا عەجیب نەوێت و زوو حاڵی بن، لەناو هەموو جیلێكدا (دایك) بە رەحمترە لەگەڵ منداڵی خۆی، ئەگەر باش بیركەنەوە كاتێك شەهوەت دێتە پێشەوە دایك لەوانەیە وەڵامی نركە وناڵەی منداڵەكەی نەداتەوە! ئەگەر منداڵەكەی نەخۆش بێت هاوار بكات و داوای ئاو بكات لەوانەیە لەوەختی مەسەلەی شەهوەتدا وەڵامی منداڵەكەی نەداتەوەو ئاوی نەداتێ! دایك لەوانەیە لەكاتی ئاسایدا(جەرگی)خۆی دەربێنێت و بیبرژێنێتو بیخاتە دەمی منداڵەكەیەوە، ئەگەر بزانێت باشەو خۆش دەبێتەوە، بەلاَم كاتێك شەهوەت زۆری هێنا لەو كاتەدا وەڵامی منداڵەكەی ناداتەوە. كەلیمەیەكی پیس هەیە لەناو ئەدەبیاتی كوردیدا كە، ئاخ ئەو ئینسانە گۆرانی بێژانە بتگرتنایەو زمانت ببڕینایە وا ئەو جۆرە وشە پیسانە دەخەنە ناو ئەدەبیاتی میللەتێك!! دەڵێت"هەی رۆڵە سەردڵ خڕ بیت، باب مردو بیت شەو درەنگە بۆ جێژ وانێك" ئەمە دایكە بەمنداڵی خۆی وا دەڵێت!!

ئەمە شەهوەتە، لەگەڵ شەهواتییەت و جنس دەركەوت و مەسەلەی وا هاتە پێشەوە ئینسان پوچ دەبێتەوە، غیرەت و شەهامەت و رەحمییەت نامێنێت! تا حەدێك دایكێك كە ئامادەیە هەموو شتێك فیدای منداڵەكەی بكات، دەڕوا دۆعای شەڕ لە منداڵەكەی دەكات! ئا ئەوەیە مەسەلەی شەهوەت!!

لەندەن كاتێك(بەهاوالله و قادیانی)دەنێرێت و دەڵێت"با موسوڵمانان جیهاد نەكەن، جیهاد گوناهەو حەرامەو خەڵكی ئازار دانە". هەی هوا هێشتا




گاریگـەری نییـەو خـەڵکی بـاش لـەدین حـاڵی بـوون، هەرچـەند زۆریـش نەخوێنەواربێت، بەڵام ئەوە دەزانێت دەبێت بەغیرەت بێت. لەناموس و ماڵ و حەیـسییەتی خـۆی دیفـاع بکـات. موسـوڵمان لەمـە حـاڵی بـووە و زەحمەتە(بەهاوالله و قادیانی)ناتوانن ئەم کارە لەناو بەرن.

شتێك کە خەڵك نازانێ و خۆشـی لێیـەت و پێـی دەخەڵـەتێت ئەمـەیان بـۆ پیشنیار دەکەین، کاتێك ئەمە دامەزرا هەموو کارێـك حـەل دەبێـت، ئـەویش نـەمانی((حیجـاب)). بێـسەرو بـەری و ڕووتـی و بـەرەڵایی. ئائەمـە داوا کارییەکەیە کە ئۆتۆماتیکی دەبێتە زەعیف کردنی جیهاد. کێ جیهاد دەکات؟ جیهاد واتە بەماڵ و گیان فیداکاری بۆ دیفاع لە حەق، کێ جیهـاد دەکـات؟ پیاو جیهاد دەکات، خوێڕی جیهاد ناکات!(ڕێوی)جیهاد ناکات، ئینـسانی بـە شەهامەت و شوجاعەت و بە ئیمان دەبێت جیهاد بکات، بەڵام کاتێك باسـی شەهوەت هاتە بەرەوە، ئینسان وای لێدێت کە دایکت ڕەحمی نامێنێت و جنێو و دوعای شەڕ دەکات لە منداڵی خۆی.

لە(۱۲) جەلەسەدا کەمن لەگەڵ (بـەهائی) بـاس و قـسەکردنم هـەبوو، کـە چەند ڕێگای جیاوازیان هەیە بۆ قسە کردن، جگـە لـەوە پلـە پلـەیان هەیـە لەکاتی تەبلیغاتدا، تەبەقەی سێ و تەبەقەی دوو تەبەقەی یەك. من گەیـشتمە تەبەقاتی یەکیان لە تەبلیغات، واتە موبەلیغی پلە یەکیان. لە تەبەقاتی دوو دا بوو کۆمەڵێك کەس بەناوی (ڕەزاییەو موتەحیدە) و ئائەو موتەقەلیبـە حـەرام زادانە لە (تاران)دا سـەروەتی ئـەم وڵاتـە بـەتاڵان دەبـەن لـە بەهاییـەکان، مەجالیسی ئەوان مەجالیسی تەبەقەی دووەمی تەبلیغاتی بوو، شەوێك لەماڵی ئەو (ڕەزاییە) ئەو موبەلیغە دەرەجە دووەدا، ئێمە دانیـشتوین، سـەیر دەکـەم





ئەو شەوە جیاواز لە شەوەكانی تر، گۆشەیەك (دە، دوانزە) نەفەری، جوانترین ژنان و كچان ئەمانە دانرا بوون و باقی مەجلیسەكەو موبەلیغەكانیان و منیش بە تاك و تەنها.

خەیاڵم نییە حیكایەت بگێڕمەوە، چونكە (سێ سەعات) قسە كرا، دەستمانكرد بە قسە و باسكردن لە كۆتایدا وام ڕووبرد (ژن)ەكان، كونە مشكییان لێ بوویە عەمارە، نەیان دەزانی چۆن خۆیان بشارنەوە لەم حەقارەتی و پەستییە وا بەسەری خۆیاندا هێنا بوو، كە (بەهاواللە)ی موتەقەلیب بەسەریاندا هێناوییەتی. ژنەكان لەوێدا باش حاڵی بوون كەزوڵمیان لێكراوەو و باش خەڵەتێنراون و چییان بەسەردا هێنراوە.

نوكتە هەر ئەوەندە سادە دەكەمەوە!! كاتێك ناموس نەما كاتێك شەرەفییەتی خێزان و بنەماڵە نەما، كاتێك حەیسییەت نەما لەنێوان ژن و پیاوا، غیرەت نامێنێ، ئازایەتی نامێنێ، جیهاد بەتاڵ دەبێتەوە. لەبەر ئەو هۆیە بوو (بەهاواللە)و (جەنابی قادیانی)، دوای بەتاڵكردنەوەی جیهاد هێنایان حیجابی ئیسلامییان بەتاڵكردەوە، كەمەردم وای لێ بێت كە ئیتر بەشەقیش تێی هەڵبدەیت هەڵنەستێتەوەو نەتوانێت جیهاد بكات و نایشیكات. بڕواتان بێت ئەو مرۆڤەی وا كەوتە شوێن شەهوەت تێی هەڵدەو بەزۆر پێی بڵێ هەستە جیهاد بكە و لە حەق دیفاع بكە لە دین و ناموست دیفاع بكە (هایی هوو سەرەیی یەت) و ناتوانێت.

ئەمە فێڵی دووەمی (بەهاوالله)بوو، ئەو بەرنامە ئینقلابییە کە ئەم حەرام زادانە هێناویانە بۆ موسوڵمانان ئەوەیە کە دەڵێن کە (سەدەی بیستەمی زایینیی)*ە قەرنی حیجاب نییە. دیانەتێکی تر لازمە، دیانەتێکی تریشیان ئەوەیە کە بڵێن"جیهاد مەکەن" و لەوەو دوا بۆ ئەوەی جیهاد نەمێنێت بڵێت "حیجاب نەمێنێت، حیسیەت و ئەدەبی ژن و پیاو نەمێنێت". ئەمە تەواوی بەرنامە ئینقلابییەکانی(بەهاوالله)یە! (مەنصور) یان هەر ئینسانی موتەقەلیب ئاوا حەقیقەتت دەردەخەم کە(بەهاوالله)چی هێناوە بۆ بەشەر، جا فەرموو جگە لەم دووانە چی غەلەتێکی تری کردووە؟ لەندەن چی غەلەتێکی پێداوە تا ئەو بیگەیەنێ بە خەڵك؟ وەرە بەمن بڵێ حوقەبازی موتەقەلیب دەست لەسەر فەقیر هەڵگرە!!

میللەت! هەر کەسێك بەقەدەر زانینی خۆی تەکلیفی لەسەرە تەکلیفی من ئەوەیە، ئەگەر زمانیشم ببڕن ئەوە ووتم و دەیڵێم خوام بەسەو، ئەگەر عیدامیشم بکەن، لەوەو دوا بەسەر بەرزی دەگەڕێمەوە بۆلای خوا، زۆر لە ئەصحاب و خۆشەویستانی پێغەمبەر کوژران و عیدام کران، بەلاّم ئێستاش لە ئێمە سەر بەرز ترنو لە ئێمە زینو ترن و پیاو ترن، منیش ئەوەندەم زانی و ئەوەندەم دەرك پێ کرد ووتم و هەرچی بوو بوو، بەلاّم ئێوە ئەوەتان تەکلیف لەسەر نییە زۆر سادە.

ئەوەڵەن مەخەڵەتێن، دووەم بەماڵی خۆتان کۆمەك مەکەن بە دوژمنی خۆتان. ئەوە بزانن کە ئایەتی قورئان لە بارەی ئەم مورتەدە مەلعونانەوە، کە دوژمنی

---

*) دیارە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) ئەم باسەی لە (سەدەی بیست)دا کردووە، بۆیە ئاماژە بەو سەدەیە دەدات، ئەگەرنا هەمووان دەزانین ئێستا (سەدەی بیست و یەکە)....




دینن و هەڵگەڕاونەتەوە دژی دین، خیانەت بە دین و ئوممەتی -محمد- (ﷺ)دەکەن. ئەفەرموێت"ومن یتلهم منکم فهو منهم"، هەر کەسێك دۆستایەتیەك و ڕابیتەیەکی سادەی لەگەڵدا بگیرێت دروست وەکو ئەوی لێ دێت، ئەمەتان پێ بڵێم موسوڵمانەکان، بۆ موسوڵمان دروست نییە سەلامی بکات، بۆ موسوڵمان دروست نییە جوابی سەلامی بداتەوە، بۆ موسوڵمان دروست نییە ئەگەر لەبەر سەرئێشە خەریك بێت بمرێت و قەرارێك بدات حەبێکی لێ بکرێت، ئەمە شتێکە کە بەسەر خۆما هاتووە.

تەنها کوڕێکم هەیە زۆرم خۆشدەوێت (حمە ژیان)ئەوانە وا دۆست و ئاشنامن دەزانن چەنێك خۆشم دەوێت. وەڵاهی ئەوەندە نەخۆش بوو خەریك بوو دەمرد، جولەکەیەکی مەلعون لە سەعات (١١)ی شەودا، شتی بوو وتیان"تەنها ئەو ئەو دەرمانەی هەیە، تەواوی دەرمانخانەکان بەستراوە"، هاتمەوە ووتم"ئیمکانی نییە نایهێنم، بەئیزنی خوای گەورە سەعاتێکی بەسەردا تێ پەڕی و پاشان (حەمە ژیان) چاك بوویەوەو دەرمانیشم لەو نەکڕی".

خوا ئاگای لێیە چاوەڕێی ئەوەم دەکرد بمرێت، بەڵام ناچمە لای جولەکە، بەڵام هەڵە تێنەگەن، مەسیحی وا نییە، بت پەرست وا نییە، (جولەکە و بەهائی) تەنها دوژمنی موسوڵمانانن لە تەبلیغات و، لە (فەلەستین)دا خەریکن موسوڵمانان دەکوژن ئاگاتان لێبێت کەسێك دۆستیان بێت، کەسێك سەلام و خوا حافیزیان لێ بکات، کەسێك بڕواتە دوکانیان کەسێك پەیوەندییان لەگەڵدا بگرێت وەك ئەوان حساب دەکرێت، ئەمە هیچ مەجالێکی تێدا نییەو ئایەتی قورئانەو تەفسیری قورئانە. موسوڵمانی بەمە ناڵێن بڵێت"من موسوڵمانم و لەناو پێناسەکەمدا نوسراوە موسوڵمان بەوە ناڵێن

بێت لە مزگەوتا نوێژێك بكەیت یان لەماڵی خۆتدا نوێژێك بكەیت، یان بەیانی تا ئێوارە هیچ نەخۆیت. موسوڵمانی بەوە دەڵێن ئەركەكانی خۆت بەباشی بزانیت،هەموو وەزیفەكانت و لێیان لانەدەیت. ئەمە یەكێك لەوەزیفە گرنگەكانە كە ئینسان كۆمەكی دوژمنی نەكات.

بەهائی دوژمنە، جولەكە دوژمنە، تەنها باقی ئەهلی دینەكانی دیكە هیچی دوژمنی ئێمە نین، ئەم دووانە. هەر موسوڵمانێك پەیوەندی لەگەڵ ئەمانەدا هەبێت ئەوە دوژمنی ئیسلامە. جولەكە لەبەر ئەمە ئەهلی دیانەتە ئەگەر نا ئێستا وا لە (فەلەستین) خەریكن ماڵ و منداڵی ئێمە دەكوژن، ماڵ و منداڵی موسوڵمانانی ئەویّ ماڵ و منداڵی ئێمەن. فەرق ناكات .ئەو كەسە وا دەچێت بۆ دوكانی جولەكەكە، پارە دەدات حەبێك دەكڕێ یان دەرزییەك دەكڕێت گۆشەیەك لە گولەیەك یان ساچمەیەك زیاد دەكات تا بیدەن موسوڵمانێكی پێ بكوژن. دەی براكانم كێ ڕازییە بڕوات موسوڵمانانی (فەلەستین) بكوژێت؟ تۆ ئاگات لێی نییە پارەت دەچێتە گیرفانی موسایی و بەهائیی و بەو پارە دەڕۆن فەلەستینی دەكوژن!! دەی لەمەولا وریابن.

**قورئان وەك كۆتا بەرنامەی ئیلاهی:**

خوا كۆتا بەرنامەی نارد كە قورئانە، قورئان ئەو مەوادە كولییەیە كە تا قیامەت بەكەڵكی بەشەر دێت و لە هەر سەردەمێكدا بەشەر پێویستی بە چییە لە ئەو مەوادە كولییەیی قورئان دەریبهێنێت و ژیانی مەعنەوی خۆی پێ ئیدارە بكات. بەڵام كێ؟ مەگەر هەموو كەس ئەمەی پێ دەكرێت؟ نا....

خۆ هەموو كەس ناتوانێت دكتۆر، و ئاسنگەر بێت، هەموو كـەس ناتوانێـت دارتاش بێت، هەموو كەس ناتوانێـت كلاشـكەرو بـەرگ درو بێـت، هـەروا هەموو كەسێكیش ناتوانێت زانای دینی بێت. تاكە تاكەیەك ئینسان هـەن كـە دەتوانن ئەم بارە بگرنە سەرشان، و ئەم بارەش لەهـەموو گـەورەترە لـەباری دكتۆری و خەیاتی و دارتاشی، بەڵێ ئەوانیش گرنگن و خزمەت بـە خـەڵك دەكەن، بەلاَم خزمەتێك كە ئەوان دەیكەن بـە خـەڵك تـەنها تـەئمینی ژیانـە مادییەكە دەكات. مرۆڤی زانای دینی، ئەگەر بەڕاستی زانای دینی بێـت و بـە ئیمان بێ، عالم بێت، واتە بزانێت خوای گەورەو پێغەمبەر(ﷺ) چـیان وتـووە بە ئیمان بێت، واتە هەرگیز نەتوانێت لـەوە كـە خـوا پێـی خۆشـە لابـدات، ئەگەر ئاوا بێت ئەوە (نوورە)، ئەوە خێـرو بەرەكەتـە بـۆ بەشـەر، ئـاین ئـاوا بـەكاری خـەڵك دێـت، ئـەوە كـە خـوای گـەورە بەوەسـیلەی پێغەمبـەران ناردویەتی، خصوصەن ئەوە كە بە وەسـیلەی كۆتـا پێغەمبـەر كـە حـەزرەتی محمد(ﷺ) ناردویەتی، ئەوە ئەركی كۆمەڵێكە لـە مرۆڤەكان كـە پێیـان بلـێن زانای دینی و پێشڕەوی دینی و باشی لێ حاڵی بن و موخلیسانە بەیانی بكـەن بۆ خەڵك. بەلاَم زۆر بەد بەختییە كـە كـابرا بـەخۆی بلـێت پزیـشك و لـە پزیشكی نەزانێت، بەخۆی بلێت دارتاش و لـە دارتاشی نەزانێت، بەخۆی بلێ بەرگدرو لـە بەرگدروی نەزانێت یان ئەگـەر بەرگـدروی دەكـات جلەكـەی خراپ و لارو گێڕ دروست بكات، مەلای دینیش ڕەهبەری دینیش هەروایـە، پەنا بە خوا لـەوەی بەخۆی بلێت مەلای دینی و كەچی لـە دین بەڵەد(شارەزا) نییە. یـان ئەگـەر بەڵـەدە خـۆی دەدزێتـەوەو عەیبـداری دەكـات و خراپـی دەكات، كاتێك زانای دینی خۆشەویستی خوایـەو ڕەهبـەری ئوممەتـە خـەیرو




بەرەكەتە بۆ ئوممەت، كە ئەوە خوا پێی داوە ئەنجامی بدات. خوای گەورە قورئانی داوەتە عالمی دینی و ئومەتی -محمد(ﷺ)داوەتە عالمی دینی. ئەمانەتی ئاوا گەورە گەورە وا بەدەستیەوە خیانەتی لێ نەكات. ئومەت ئەمانەتە بەلای عالمی دینەوە قورئان ئەمانەتە بەلای عالمی دینەوە .

هەركاتێك ئومەتی محمد(ﷺ) توشی هەڵەیەك دەبێت و كێشەیەكی هەیە عالمی دینی موخلیصانە چارەی بكات. ئەگەر ئاوا بوو عالمی دینی چرایە، خۆرەتاوە و نوورە، ئەگەر وانەبوو پەنا بەخوا شەڕو تاریكیە. ئاغایانی عولەمای دینی من ئیمڕۆ میوانم و هاتومەتە خزمەتی ئێوە مووەفەق نەبووم زۆر لە خزمەتتاندا بمێنمەوەو زۆر یەكتری بناسین، من مسافر هاتم سەیرم كرد خەڵكی (مەریوان) نەخۆش و میكرۆبی (بەهائی) سەری تێكردووە ئەمە تێگەیشتم، ڕانەوەستام و تاقەتم نەگرت من بڕۆمەوەو ئەم میكرۆبە ببێت، وتم با ئەگەر سەعاتێكیش وام لە (مەریوان)دا چارەیەكی ئەم نەخۆشییانەی خەڵكی (مەریوان) بكەم، ئەوە من دەڕۆم بەلام خۆ دینی خوا نەڕۆییوە، خۆ قورئان نەڕۆییوە خۆ خوا ئاگادارە، تكاتان لێ دەكەم یەكە یەكەی زانای (مەریوان) نەك تەنهالە مەسەلەی (بەهائی)دا لە هەموو مەسەلەیەكدا ئائەو دەمودەزگایانەی وا بەناوی شێخێتی دروست بوون ئەو دەم و دەزگایانە وا بەناوی شێخییەتیو تەصەوف و دەروێشی و هەر جۆرە شتێك دروست بوون، بیر لە ڕەفتارو كرداریان بكەنەوە ئەگەر ماڵ و پارەی تێدایە درۆیە، ئەگەر نەخوێنەواری تێدایە، عالمی دینی یانی كەسێك كە قورئان و سونەت دەزانێت كەسێك كە قورئان و سونەت دەزانێت ئیتر چی كارێكی بەوەهەیە بڕوات لە شێخ سودوەرگرێتو پشتگیری بكات.......؟!

# باسی سێیەم:

## فەلسەفەی شیرك و تەوحید لای کاك ئەحمەدی موفتی زادە*

## "شیرك، وەك دایکەدەردانی کۆمەڵگە!"

هەمیشە لە کۆمەڵگەدا کە دەردەکان زۆر دەبن و کۆمەڵگە دەبێت بەیەك پارچە لە دەرد ئەو کاتە قورسترین کار ئەوەیە تۆ بێیت دەردێك دیاری بکەیت و قسەی لەسەر بکەیت، چونکە دەردی بەشەر جۆراوجۆرە بڕێك دەرد هەیە(دایکەدەردانە)، دەبێتە بناغە و ئەساسیات بۆ دەرد و نەخۆشی دیکە، بڕێك دەرد هەن بچکۆلە بچکۆلەن، لق و پۆلن، بەپشت بەستن بەم قاعیدەیە من لەبارەی دەردێکەوە قسەتان بۆ دەکەم کەوڵاتی ئێمە و زۆرێك لە وڵاتانی داگیر کردووە، کە دایکەدەردانە و بناغەیە بۆ هەموو نەخۆشییەکانی دیکە، ئەو دەردەش(شیرك)ە.

شیرك، واتە شەریك بۆ خودا دروست کردن، مەعنای سادەی وشەکە دەبێتە ئەوە، بەڵام ئەی مانا دەقیق و دوورودرێژەکەی چییە؟ ئێستا بە ڕواڵەت لەوانەیە هیچ کەس باوەڕ نەکات کە خۆی موشریکە، بەڵام ئەگەر بێین و بەو جۆرە لەمانای(شیرك)تێبگەین کە قورئان باسی کردووە بۆمان، بەڕاستی کەم ئینسان هەیە موشریك نەبێت! لە کاتێکەوە کە بەشەر موختەسەری خۆی

---

*) ئەم بابەتەی کاك ئەحمەد بریتییە لە وتارێکی کە لە کۆتاڕۆژی ساڵی (١٣٥٦) لە مزگەوتی گوندی (مەرخوز) لە (بۆکان) پێشکەشی کردووە و بەناونیشانی (شیرك و تەوحید)بە ناوبانگە....

ناسیوە و فێری ئەوە بوون كە دەستە جەمعی لەجێگەیەكدا كۆببنەوە و پێكەوە زیندەگی بكەن، لەوكاتەوە زوڵم و زۆرداری دەستی پێكردووە! ئەساسی زوڵم و زۆرداریش ئەوەیە یەكە یەكەیەكی ویستویانە زەحمەتی كەمتر بكێشن كەچی لەخەڵكی ئاسوودەتر زیندەگی بكەن! ئالەو كاتەوە كە یەكە یەكەیەك كەوتنە ئەو فكرە كە خەڵك زەحمەت بكێشن و كوێرەوەری قبوڵ بكەن، و تیكە نانێك بەدەستبهێنن ئەمانیش ئاسودە دابنیشن و بیخۆن، ئالەوكاتەوە جۆرەها بەدبەختی ڕووی كرد لەبەشەر، بەلاٚم هەموو ئەو بەدبەختیانە لقوپۆی ئەو نەخۆشییە ئەساسییە كە(شیرك)ە! چونكە بەشەر پێچەوانەی تەواوی گیاندارانە، ئەگەر هەروا بەرەلاٚی بكەیت بۆخۆی ناتوانیت دروست زیندەگی بكات، هەر جۆرە گیاندارێك سەیردەكەیت دەبینیست هەموویان وەكویەك زیندەگی دەكەن، سەیری سەد دانە(گورگ)بكە، دەبینیت یەكیان چۆنە هەموویان هەروا زیندەگی دەكەن جا هەر حەیوانێكی دیكە بگریت هەروایە، بەلاٚم ئینسان دەتوانێت بەهەزار جۆر زیندەگی بكات(چاك، خراپ)یان بەو جۆرەی وتم لەكاتێكەوە فێربوون پێكەوە زیندەگی بكەن، زوڵم و زۆرداری دروست بوو، لەبەرئەوە خودا ئینسانی وەك گیاندارانی دیكە بەرەلاٚ نەكردووە بەكەیفی خۆیان زیندەگی بكەن، چونكە دەتوانن زۆر فڕوفێڵ و زوڵم و زۆر بكەن لەخەڵك لەبەرئەمە خودا بەرنامەی بۆ ناردوون، جا ئەم بەرنامەیەی بۆ دوو شت ناردووە:ـ

یەكەم: بەشەر ئەو شتانەی وا ئەصڵ و پێویستن بیانزانن.

دووەم: ڕێگە و شوێنێكی چاك بزانن بۆ زیندەگی كردن.

خودا لەبەر ئەم دوو شتە هەمیشە بەرنامەی بۆ بەشەر ناردووە، پێغەمبەرانی ناردووە(درود و سەلامی خوایان لەسەربێت)كە لەلایەن خوداوە زانیارییەكیان هێناوە بۆ خەڵك كەدەركی ئەو شتانە بكەن وا پێویست و گرنگن، پاشان ڕێگە و شوێنی پێكەوە زیندەگی كردن و زوڵم و زۆر و ناعەدالەتی نەكردن فێربن. لەگەڵئەوەی ناوبەناو هەمیشە خودا پێغەمبەران(درود و سەلامی خوایان لەسەربێت) ناردووە ئەو ئینسانانە وا وتم كەئارەزویان ئەوە بووە كە خۆیان هیچ هەوڵنەدەن و خۆیان ماندوو نەكەن، بەڵكو خەڵكی زەحمەت بكێشێت و دەستی ڕەنجی زەحمەتیان بێت بۆ ئەوان و بیخۆن و پاشان ناز بفرۆشن بەسەر خەڵكیدا و خۆش و ماقوڵتر لەخەڵكی بژین، ئا ئەو كۆمەڵانە لەدوای هاتنی پێغەمبەرانیش هێشتا هەر دەستیان هەڵنەگرتووە، لەزەمانێكدا كە پێغەمبەرێك دەستیكردووە بە بانگەوازی بەرنامەی خۆی بۆ ئازادكردنی خەڵك و ڕزگاركردنی خەڵك لەدەستی شیرك و هیدایەت كردنیانی بۆ لای تەوحید لەوكاتەدا وردە وردە ئەوانەی وا زوڵم و زۆر و شیركیان دامەزراندووە لەناو خەڵكیدا شكستیان خواردووە و چوونەتە كەنارەوە، بەڵام پاشان لەهەر كاتێكدا كەمترین هەلیان دەست كەوتبێت(ئەو شەیتانانە)سەریانی هەڵداوەتەوە!! جا هەمیشەش بەیەك ڕەنگ نا، بەڵكو هەر جارەی بەجۆرێك، ڕێگایەك، هەر كەسێك بە فرۆفێڵێك دەستی كردووەتەوە بە شیرك بڵاوكردنەوە!

پێش لەزەمانی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)بەشەر بە گشتی ڕشد(گەشە) و شارەزایی و وریایی كەم بوو، لەبەرئەوە ئەو كۆمەڵە زاڵمانە وا هەمیشە هەوڵیانداوە خەڵكی لە تەوحید دوور بخەنەوە و بیهێننەوە بەرەو لای شیرك و




بت پەرستی بـە پێـی بـارودۆخی جیـاواز و بەرنامـەی جیـاواز و ئـارەزووی جۆراوجۆر كەهەمووی هـەر دەبێتـە ئـەوەی كەخـەڵك بەندایـەتییان بكـەن، هەركام بەڕێگایەك، بەجۆرێك لـەدوای پێغەمبەران هەوڵیانداوە ئەو دینە، ئـەو بەرنامەیە وا پێغەمبەران هێناویانە دەستكاری بكەن و پاشماوەكەی لـەناو ببـەن. زەمانی واهەبووەی ڕشدی خەڵكی یەكجار كەم بووە، ئەوانە بـەجارێك ئـەو دیانەت و بەرنامە و دەستورەی وا پێغەمبەرێك لـەلایەن خوداوە هێناویەتی ئیتر لـەناویان بردووە. ئێستا ناوی چەندین پێغەمبەر دەزانین، بەڵام كـەس نازانێـت كوا ئەو كتێب و بەرنامەیەی لـەلایەن خوداوە هێناویانە؟! چی لێهات؟ لـەهیچ لایەكەوە دیارنییە. پاشان وردە وردە تێگەیشتن و ئاگایی خەڵكی زیادی كـرد دوژمنانی خەڵكی نەیاندەتوانی ئەو كتێبانـەی وا لـەلایـەن خـوداوە دێـت بـۆ پێغەمبەران بەتەواوەتی لـەناوی بەرن ئەی چییان كرد؟ ئایا دانیشتن و تەواو؟! نەخێر.وردە وردە دەستیان كردە دەستەواژە گۆڕین و هەندێكیان لێ لادەبردو بڕێكیان بۆ زیـاد دەكـرد، چـونكە ئەگـەر بـەو جـۆرە بمایەتـەوە كـە خـودا ناردویەتی ئەو كاتە(شیرك)جێگەی نەدەگرت و هـەموو خـەڵكی لـەبەرامبـەر خوداوە یەك جۆر دەبوون، بۆیە پێویست بوو بۆئەوەی ئەوان بتوانن دووبـارە دیانەتی شیرك تازەبكەنەوە دەبێت دەستكاری ئەصڵی ئـەو كتێـب و بەرنامـە بكـەن كەلـەلایـەنی خـوداوە هـاتووە، تـاوەكو ئەگـەر ئینـسانێكی وریـا و خوێندەوار و دڵسۆزی خەڵكی ویستی دووبـارە خـەڵكی هیدایـەت بداتـەوە نەزانێت ڕێگەی خۆش بەختی وهیدایەت كامەیە، بەو دەلیلـە دیسان خـودا هەر پێغەمبەرانی دەنارد و دەنارد، تاوەكو گەیشتە زەمانێك كە ڕشدی بەشـەر وایلێهات كـە حـەزرەتی محمـد(ﷺ)رسـالـەت و مەئموریـەتی بـۆ هـات بـۆ

ڕزگاركردنی خەڵكی لە شیرك و هیدایەتی خەڵك بۆلای(تەوحید)لەو كاتەدا خودا قورئانی نارد بەئەو بەڵێنەوە كە ئیدی تازە ئەو قورئانە دەستكاری ناكرێت، زاڵم و زۆردار ناتوانن دەستی بۆ ببەن، ناتوانن بەمەیلی خۆیان بەو شێوەیە بیگۆڕن كە ببێتە هۆكاری ئەوەی كە دووبارە خەڵك لە تەوحید دور بخەنەوە و بیگەڕێننەوە بەرەو لای(شیرك)، ئا لەم زەمانەدا خوای گەورە قورئانی نارد. جا بەڕاستی ڕێگەی زۆرێك لە فێڵ و تەڵەكەی جەماعەلی زاڵمی بەرامبەر بە خەڵك بەست! بەو جۆرەی كە دەزانین لەدوای ئەوەی كە قورئان بە هۆی پێغەمبەر(ﷺ)نازڵ بوو ئەوانەی وا قورئانیان پیت بە پیت و وشە بە وشە لەبەردەكرد و بەو خوێندنەوە و لەهجە جیاوازانەی واپێغەمبەر(ﷺ)تێیگەیاندبوون، زۆرینەی هەژارترین چینی خەڵك بوون. هەتا (حەوت كەس) لە مامۆستا گەورەكانی مێژووی ئیسلامدا هەن لەوانە كە موسوڵمانیان فێری خوێندەواری قورئان كردووە ئەوانە لە زەعیفترین و مەزڵوم ترین چینی خەڵك بوون، واتە شەش كەسیان كۆیلە و كۆیلەزادە بوون و پێشتر لە ئەصڵی كۆیلە بوون كە بەبۆنەی ئیسلامەوە ئازادیان پەیداكردووە و دواجار بوونە ڕەهبەری خەڵكی، بوونە زامن و ئەمینی ماف و خۆشبەختی خەڵكی! پێش لەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لەكاتێكدا خودا دیانەتێكی دەنارد لەگەڵ پێغەمبەرەكە وەفاتی دەكرد و لەناو خەڵكیدا نەدەما سەیرت دەكرد یەكسەر كۆمەڵێكی فێڵبازی زاڵم دەهاتن كتێبە ئاسمانییەكەیان دەخستە ئیختیاری خۆیانەوە، یان هەروەك پێشتر وتم لەناویان دەبرد، یاخود وردە وردە دەستكاریان دەكرد، بەلاَم لەپاش رسالەتی حەزرەتی محمد(ﷺ)خودا كاتێك قورئانی دابەزاند خەڵكی بەشێوەیەك وریا بوونەوە

كەئەوانەی وا زەعیفترینن بوون بە(حافظ) و مامۆستای قورئان،كە ئیتر تازە زاڵم و زۆردار ڕووی ئەوەیان نامێنێت دەستكاری بكەن ئەوانەی وا زەعیفن بەیەقینی دەستكاری ناكەن، چونكە بەرنامە ئیلاهییەكە هەمیشە بۆ ڕزگاركردنی خەڵكی زەعیف هاتووە، ئیتر ئەو چۆن دەستكاری دەكات؟ لەوە چاكتر چی دەوێت واخودا ناردویەتی بۆ ڕزگاری بەشەرییەت؟! ئەوانەی وا دەستكاری كتێبە ئاسمانییەكانیان كردووە كەسانێك بوون ویستویانە تالآن و تەحقیری خەڵك بكەن و نیسبەت بە خەڵك ئیمتیاز پەیدابكەن، لەبەرئەوەش توانیویانە دەستكاری بكەن، چونكە خەڵكی نەیانتوانیووە ئاگاداری دین و كتێبە ئاسمانییەكانی خۆیان بن، بەلآم پاش ئەوەی كە قورئان نازڵ بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئەوە خەڵكە وا بەبۆنەی قورئان و جیهادی حەزرەتی محمد(ﷺ)ڕزگاریان بوو لە شیرك و هاتن بەرەو تەوحید هەر ئەوانە خۆیان بوونە حافظ و مامۆستای قورئان و خەریك بوون قورئان و ئایات و وشەكانی قورئانیان ژمارە دەكرد بۆیە ئیتر تازە ڕێگەی ئەوە نەماوە وەك سەردەمی پێشوتر زۆرداران و ستەمكاران و خەڵك خەڵەتێنەران و پارەداران دەستكاری ئەو بەرنامە ئیلاهییە بكەن لەبەرژەوەندی خۆیان. جاران یان لەناویان دەبرد یان دەستكارییان دەكرد، بەلآم ئێستا مەجالی هیچ كارێكیان بۆ نەماوەتەوە، چونكە هەر ئینسانێكی موسوڵمان لە هەزارترین چین وشە بە وشە و پیت بە پیتی قورئانی لەبەربووا جگە لەوەش زۆر كەس هەبوون بەشێكی زۆر یان بەشێكی كەمیان لە قورئان نوسیبویەوە كە ژمارەیان سەدەها هەزار ئینسان دەبوو بۆیە، ئیتر ئینسانێكی فێڵبازی زۆردار لە كوێ دەتوانێت دەستكاری ئەو قورئانو بەرنامەیە بكات كەبەشەر ئەوەندە دەرك و ئاگایی پەیداكردووە،

ئەوەندە وریا بۆتەوە وشە بە وشەی ئەو بەرنامەی واخـودا ناردویـەتی لـەبـەری کـردووە و ژماردوویـەتی؟! بۆیـە مـەجالی ئـەوە نـەما. ئـەی ئـەو بەدبەختـە مەزڵومانە(بەخەیاڵی خۆیان مەزلومن)چی بکەن؟ ئەوانەی وا فێربـوون هەمیـشە ڕەحەت و ئاسـودە دانیـشن هـیچ کارێـك نەکـەن و ئـەوەی خـەڵکی دەسـت ڕەنجییەتی و بەدەستی هێناوە بێتە بەردەستیان و زۆر خۆشتر لـە خەڵکی ڕابـوێرن لـەپاشانیشدا ناز و غروریش بفرۆشن بەسەر خەڵکیدا! ئـــائەمانە چـی بکـەن؟ خۆ قورئان مەجالی ئەوەی نە هێشتۆتەوە و بەرنامەی قورئانی زۆر زۆر ئاشـكرایە لـە حەقیقەتدا هەر ئـەو بەرنامەیەیـە کـە تـەواوی پێغەمبـەران(درود و سـەلامی خوایان لـەسەربێت) هێناویانە، بەڵام ئەم بۆ بەشەرێکی کاملتر و ڕوشدی زۆرتـر لـەبەرئەوە بەرنامەکەش کاملتر و ڕۆشنترە. بەرنامـە ئەساسـییەکەی هـەر ئـەوە بوو(خەڵك لـە شیرك ڕزگاریان ببێت و فێری تەوحید بن)، واتە لـە چەند خودا پەرستی ڕزگاریان ببێت و فێری ئەوە بن یەك خودا بپەرستن. ئەساسی بەرنامەی تەواوی پێغەمبەران ئەمەیە. بەو شێوەیەی قورئان دەفەرمێت کە دەستوری داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بانگەشەی خەڵکی دەکات بەتایبەت ئەوانـەی کـە دەڵـێن ئێمە ئەهلی دیانەتی زوترین ئەو دیانەتەی واخودا ناردویـەتی ئێمـە شـوێنی ئـەو کەوتووین دەفەرمێت پێیان بڵێ کە﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾*، محمد! بڵێ بە عالـەم، بڵێ ئەی کەسانێك خۆتان بەپەیڕەوی کتێبـە ئاسمانییـەکانی پێـشتر دەزانـن وەرن ئێـوە دەعـوەت دەکـەم بـەرەو لای

*) ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ (٦٤)ال عمران




**مەتڵەبێك(حەقیقەتێك)كەلەنێوان ئێمە و ئێوەدا مساوییە(یەكسان)ە، خودا بۆ تەواوی پێغەمبەران هەر ئەو مەتڵەبەی ناردووە، كە چییە؟**

**غەیری خودا بەندەگی كەس نەكەین. بەندەگی، واتە تەنها نوێژ و ڕۆژوو گرتن؟ نەخێر! بەندەگی بەرامبەر لەگەڵ وشەی(عیبادەت)* "ألا نعبد إلا اللهّ" عیبادەتی غەیری خوا نەكەیت، عیبادەت: واتە قبوڵ كردن و گوێڕایەڵی كردن بەگیان و بەدڵ بەبێ هیچ جۆرە تێبینی وقەید و بەربەستێك، عیبادەت**

---

*) مامۆستا ناصری سوبحانی لە تەفسیری سورەتی (یونس)دا كاتێك باسی چەمكی (فَاعبُدُوهُ) دەكات بەم شێوەیە شەرحی دەكات:

فَاعبُدُوهُ: لە كەلیمەی (عَبدَ)ەوەیە، كە لەئەصڵدا واتە (گەردنكەچی)، گوێڕایەڵە. ئەم مەعنای گەردنكەچییە دەبێتە چەند بەشێكەوە، خوارترین پلەی ئەمەیە كە كاتێك ئینسان عیبادەتی شتێك دەكات خۆی لەبەرامبەر ئەو شتەوە بە مەوجودێكە وەها بداتە قەڵەم كە مافی هیچ جۆری برشیاردانێكی نییە، بەجۆرێك تەسلیمی ئەو لایەنە بێت كە ئیجازە بەخۆی نەدات كەمترین بریار لەبارەی خۆیەوە بدات، كاتێك ئەم مافی بڕیاردانە لە خۆی دادەڕنێت مەعنای ئەوەیە لە جوڵە كەوتوە و ئیتر مافی نییە هەنگاوێك بنێت و یەك جوڵە بكات! خۆ جوڵە كردنیش بۆ هەموو مەوجودێك بەتایبەت ئینسان دەبێت بجوڵێت و بڕوات بەرەو لەو حاڵەی بۆی دیاریكراوە، دەی چۆن بجوڵێت لەكاتێكدا بڕیاریداوە خۆی هیچ جۆرە جوڵەیەكی نەبێت مادام لە بەرامبەر هێزێكی سەروتر لەخۆیەوە قەراری گرتووە؟!

چاوەڕێ دەكات هەرجۆرە بڕیارێك لەلایەن سەروترییەوە بێت و بەتەواوی وجودییەوە گوێڕایەڵی لێبكات، واتە بەفەرمانی ئەو دەكەوێتە جوڵە، خۆی هیچ تەصمیم گیری و بڕیارێكی نییە.... بەكورتی و تەرتیب مەعنای عیبادەت و عبودیە دەبێت بەسێ بەشەوە:

یەكەم: دارِنینی مافی بڕیاردان لە خود

دووەم: گوێڕایەڵی تەواو لەئەوە كە ئینسان لە بەرامبەرییەوە خۆی گەردن كەچ كردووە.

سێیەم: بۆ ئامادەكردنی پێویستییەكان و لابردنی ڕێگریەكان پەتای پێبباب و هاواری لێبكات و داوای سود پێگەیاندن و لابردنی زیانی لێبكات. بڕوانە: مامۆستا ناصری سوبحانی، تەفسیری سورەتی یونس،٢٠٠٩،لا ٦٨-٦٩.

تەنها نوێژ و ڕۆژوو ناڵێین، ئەگەر ئینسانێك لەسەر سفرەیەك دابنیشێت دەزانێت ئینسانانە نان بخوات بیری خەڵكی تری هەبێت كە نیانە بخۆن ئائەوە عیبادەتە! ئەگەر ئینسانێك جلەكانی دەباتە لای بەرگ دوورێك بۆی بدورێت لە فكری ئەوە دابێت كە فەخر نەفرۆشێت و ناز و ئەتوانر و دەعییە بەسەر خەڵكدا نەفرۆشێت و خەڵكی تەحقیر نەكات، ئا ئەو جلوبەرگ پۆشینە عیبادەتە هەروا لە تەواوی كارەكانی تریشدا لە هەستان و دانیشتن و خەوتندا.

عیبادەت، بریتییە لەوەی ئینسان تبقی بەرنامەی خودای خۆی ڕەفتار بكات. ئا ئەوە عیبادەتی صەحیصە لەوەش لایدا عیبادەتی غەیری خودایە. عیبادەت و بەندەگی، واتە گوێڕایەڵی كردن، ئەگەر هەر ئینسانێك بەرامبەر بە غەیری خودا حاڵەتی گوێڕایەڵی هەبوو، جگەلە خودا نەفسی خۆی بێ، زۆردارێك بێ، فێڵبازێكی زۆرزانی پارەدار بێ چی پێخۆش بێت ئینسان ئەو كارە بكات وا پێی خۆشە ئەوە دەبێتە عیبادەت. بۆ نمونە، خودا دەستوری داوە لە فلاَنە پێگەدا(مەوقیع)دا بەو شێوەیە ڕەفتار بكەیت، بەلاَم لەبەرئەوەی یەك كەسی ماقوڵی دونیای هەیە بەو جۆرە(وای خودا دەستوری داوە)ڕەفتار ناكەیت ئائەوە عیبادەتی غەیری خودا دەكەیت! عیبادەتی غەیری خودا، واتە لەو ڕێوشوێن و بەرنامە وا خودا دایناوە لابدەیت بۆ ڕێوشوێن و بەرنامەی غەیری خودا ئەوە پێی دەڵێن(عیبادەتی غەیری خودا). جا زۆرێك لە خەڵكی لە ئێستادا دەڵێن"وەڵا! ئەوە ناكرێت ئێستا ئەوە بۆتە قاعیدە و دەستور"، واتە تۆ دەڵێیت"خودا بەم شێوەیە دەستوری داوە و ئێوە وا بكەن"، ئەویش لەبەرامبەردا دەڵێت"ئاخر تازە ئەوە بۆ قاعیدە و بنەما بەئێمە تێك نادرێت". ئا ئەوە عیبادەتی غەیری خودایە. بەپێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمێت، بلێ بەوالەی

كە ئەهلی كتێبن(خۆیان وا بەخەڵكی دەناسێنن كە شوێنكەوتەی كتێبە پێشوەكانن). كە﴿تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾.

یەكەم: ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ﴾. یەكەم وشە كە تەعەهود(پەیمان) بدەین كەگوێڕایەڵی جگە لە خودا نەكەین، زۆردار و پارەدار و پێشەوا بڵێ...هەر ئینسانێك(عادەت و تەقالید و عورف) پێچەوانەی ڕێگەی خودامان پێ بڵێت ئێمە قبوڵی نەكەین و گوێڕایەڵی نەكەین.

دووەم: ﴿وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا﴾:

لەو صیفاتەدا كە تایبەت بە خودای گەورەیە هیچ شتێك نەكەیتە شەریكی ئەو. تەنها خودایە خاوەنی قودرەت لە هەستیدا تەنها خودایە ئاگا و شارەزا لە ئموری جیهان، تەنها خودایە خاوەنی ئەوەی بەرنامە بۆ بەشەر دابنێت، تەنها خودایە كە خۆشبەختی و بەدبەختی دونیا و ئاخیرەتی خەڵكی لە دەستیدایە. لەم بوارەدا جگەلە خودا هیچ كەس نەناسین و باوەڕ بە هیچ كەسێكی دیكە نەكەین.

سێهەم: ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ﴾:

فێری ئەوە بین و پەیمان(تەعەهود)ی ئەوە بدەین كە هەندێكمان هەندێكی دیكەمان نەكەینە (ئەرباب) ئەرباب جەمعی(رب)* واتاكەی بە كوردی خۆمان دەبێتە(خودا). هیچ كەسمان هیچ كەس نەكاتە خودا. مەگەر ئەهلی كیتاب و دینەكانی دیكە بە كەسێكیان وتووە ئائەوە خودایە؟!! نا...بەعەمەلەن نەیانووتووە(خودا)یە، واتە خاوەن و دروستكەری(هەستی)ە، هیچ موشریك و

*) بۆ زیاتر شارەزابوون لەبارەی چەمكی (رب) و ئەو مانانەی لە قورئاندا هاتووە و بەچەند مانا دێت بگەڕێرەوە بۆ كتێبی (تەفسیری سورەتی (یونس)ی مامۆستا ناصری سوبحانی.




بــت پەرسـتێك ئــەوەی نــەوتووە! لەکاتێکـدا قورئــان بــە ئێمــەی حــاڵی دەکات﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾*، ئـەوان پێـشەوا دینییەکانی خۆیان بە (ئەرباب) بە خودایانێك حساب دەکەن جیا لـە خـودای واقیعی ئەم جیهانە! ئەمەیان چۆن دەووت، ئایا دەیانووت ئەم پێشەوا دینیالەی ئێمە خودان؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر! بەڵکو دەچون لەسەر دەستی ئەوان(تەوبـە)یـان دەکـرد، دەچون ڕازونیـازی دڵـی خۆیـان بـەلای ئەوانـەوە دەووت، دەچـون وێنـە و پەیکەری ئـەوانیان دروسـت دەکـرد و بـۆ بەرەکـەت لـەماڵی خۆیانـدا لـە عیبادەتگاکاندا دایاندەنا! لەماڵی خۆیانـدا هاواریـان لـەو ڕەهبـەرە دینیالـەی خۆیان دەکرد! خوا ئائەو کارانە بە شیرك دادەنێت.

﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ﴾. مەبەستی ئەو کار و کردەوانەیە خـۆ ئەوان هەرگیز نەیانوتووە ئەو ڕەهبەرە دینییـەی ئێمـە خودایـە، بـەلاَم خـود ئائـەو جـۆرە کارانـە بـەمانایی شـیرك دادەنێـت، واتـە ئەوانـەی واهاواریـان لێدەکرێت و وێنە و پەیکەریان بـۆ بەرەکـەت دادەنرێـت و ڕێـز لـە وێنـە و پەیکەریان دەگیرێت ئەوانە واتە(خودا). ئاخر حەقیقـەت ئەوەیـە ئـەو کـابر هەرچەند گەورە بێت جسمی وەك جسمی باقی ئینسانەکان وایە. ئەو جـسما لە دونیادا بەو مادانە گەشە دەکات و پڕە لە جۆرەها نەجاسەت و پیسی جـ هەر ئینسانێك ببێت بۆ نمونە ئەگەر خوێنێك لەدەستی بـەر بێـت ئـەو خوێنـا پیسە، ئەو ئینسانە پاش ئەوەی دەمرێت لە گۆڕدا دەڕزێت ئیتر چ ئەرزشـێکو

---

*) اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَ إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٣١).

ەوەی هەیـە وێنـە و پەیكـەری دروسـت بكەیتـەوە و بـەرێزەوە لـەبەرامبەریـدا وەستی؟! چ ئەرزشێكی ئـەوەی هەیـە بەخـەیاڵی خـۆت بـۆ بەرەكـەت بهێنیـت ،ماڵی خۆتی ئاوێزان بكەیت؟!

ودا ئائەوانە بەشیرك دایاندەنێت، دەڵێن ئائەوانە لـەبیروبۆچـوونی ئێـوەدا خـودان استە تۆ ناڵێیت ئەو وێنـە یـان ئـەو پەیكـەرە كـە ئاوێزانـت كـردووە خودایـە و ،رێزەوە لـەبەرامبەری ڕادەوەستی، بەڵام واقیعیـەتی ئەوەیـە ئـەو كـارەی كـە تـۆ .ەیكەیت خودا ئەوەی ناوناوە شیرك و بە خودای حساب كردووە.

ٔیرك بەشێوەیەكی سادە دەبێتە ئەوە داستانێكی گەورە و گرنگی مێـژووی هەیـە، كە هەموو جیهان لـەو كاتەدا كە (پەیام) بۆ حەزرەتی محمد(ﷺ) لـەلایـەن خـوداوە مـات لـەجۆرەها شـیرك و بەدبەختیـدا نـوقم بـوو بـوو كـەوەك وتم(شـیرك دایكەدەردانە!)كاتێك خـەڵك دوچـاری شـیرك بـوون ئـەوە ئیـتر هـەموو دەرد و نەخۆشییەكانی تێدایە، جا كەم و زیادی هەیە و ڕەنگ دەگۆڕێت، ئەگەر نا هەموو نەخۆشییەك هەیە لـەناو خەڵكیـدا. عالـەم هـەمووی گرفتـاری ئـەوە بـوون(دینـی تەوحید و تەنها خودا پەرستی كردن) لـەسەرەتادا هات و لە(مەككە)دامەزرا چەند ساڵ (رسول اللـهّ ـ ﷺ)زەحمەتی كێشا كۆچیكرد و تەشریفی هێنایە(مەدینـە)چـەند ساڵیش لـە (مەدینە)كە ژیانی بەردەوام بوو هەوڵیدا و وردە وردە خەڵكی لـە شیرك و لـەپەرستی چەندین خودا و ئەرباب ڕزگاركرد و كەوتە سەر ڕێگایی(تەوحیـد) و پەرستشی تەنها خودای واقیعی عالـەم ئیترهەمووی بـەتاڵ بوونـەوە. پـاش ئـەوانیش ئینسانی گەورە گەورەی(مـوئمین)هـەبوون كەئـەو ڕێگـا و شـوێنەی وا حـەزرەتی محمد(ﷺ) دیاری كردبوو بەردەوامییان پێدا و هەر لـەسـەر ئـەو ڕێگـا و شـوێنەی ڕۆشتن و وردە وردە بۆ ئازادكردنی خـەڵكی دیكـە و مـەردمی مـەزڵوم و شـیرك زەدەی وڵاتی دیكە هەوڵیاندەدا!

(جا ئەگەر سەیرێكی ئەو نامانە بكەین وا حەزرەتی محمد(ﷺ) لەژیانی خۆیدا بۆ تەواوی زاڵم و زۆرداری دونیایی ناردبوو وەك ناردنی بۆ پادشای(ئێران و ڕۆم)لە زەمانی حەزرەتی(عومەر)دا مەئمورانی جیهانی ئیسلام و خەلافەتی ئیسلامی كەوتنە ڕێ بۆ ئەو وڵاتانە یەكێك لەو كەس و سەفیرانەی كەلەلایەن حەزرەتی (عومەر)ەوە دەنێردران(موغەیرە)بوون، كەیەكێك لە هاوەڵانی زانا و خوێندەواری پێغەمبەرە(ﷺ).

موغەیرە، هات بۆ ئێران كە تازە پاشایەكی گەنجی، جوانی، بێ ڕشدی، بێ سەلیقەی، هیچ نەفام لەسەر تەخت دانیشتبوو، سیستەم و حوكومەتەكە وابوو بە(ئیرث) بەوێ دەگەیشت و كردبوویانە پاشا، بەڵام لەحەقیقەتدا هەموو كار و خاوەن دەسەڵات كابرایەكی فێڵبازی زۆردار بوو بەناوی(ڕۆستەمی فەروخ زادە) لەبەرئەوەی(شا) خوێندەواری وعەقڵ و ئەزموون و شعور و ئەزموونی نەبوو لە ئێران بەرنامەیان وا ڕێكخست كە نوێنەری(حەزرەتی عومەر) بێت چاوی بە (ڕۆستەمی فەروخ زادە)بكەوێت، ڕۆستەمیش زۆر بەهێز بوو، چونكە هەر ئەو (شا)ی دیاری بوو لەبەرئەوە بە كردەوە هێزی لە(شا)ش زۆرتر بوو، بەڵام لەبەرئەوەی سیستەمی ئێران وابوو كە بنەماڵەی شاهی نەبوو نەیدەتوانی ببێتە پاشا، چونكە حوكمەت لەئێراندا لەسەردەمی جاهیلیدا بە(ویراثة)بوو، كەس بۆی نەبوو جگەلە بنەماڵەی شا و بەتایبەت ئەگەر كوڕێكی هەبێت ببێتە(شا) هەتا ئەگەر لەبنەماڵەش بێت، لەبەرئەوە ئەو كرابوویە(شاه)، بەڵام(ڕۆستەمی فەروخ زادە) هەمە كارە بوو. بەرنامەیان بۆ حەزرەتی(موغەیرە) دیاری كرد و هاتن چاویان كەوت پێی. سەیری كرد عەجەب جاهەو جەلالێكە زۆر سەیرە لەولاوە قودرەت و




عەزیمەتی(حەزرەتی عومەر)دەبینێت، كەچی لەناو خانویەكی بچوكدا زیندەگی دەكات، كەچی لێرە سەیردەكات ئەم خوێڕییانە ئەم پڕ فڕوفێڵ و بێ كارانە ئائەوە دام و دەزگاو جاهەوجەلالیانە! هەر ڕۆشت و سەرسەرایەكی بڕی و دانەیەكی دیكەهات، هەر ڕۆی...پڕ زەوق و بەرقۆ...تالەكۆتایدا گەیشتە سەرسەرایەك كەئیتر لەوێدا خودی(ڕۆستەم)ی لێبوو، لەسەر تەختەوە دانیشتبوو وتیان دەبێت سەردانەوێنیت و بە (ركوع)ەوە بچیتە ژورەوە.

وتی: بەڵێ!!

وتیان: ئەمە نیزامی ئێمەیە بەو شێوەیەیە.

وتی: بۆ من وابەستەم بە نیزامی ئێوەوە؟! من دەست پەروەردەی نیزامی ئیسلامم. سیستەمی(تەوحید)بە من دەڵێت لەبەرامبەری(ڕۆستەمی فەروخ زادە)وە سەردانەوێنە؟!

هەستا بگەڕێتەوە، بەڵام ئەوان ترس و لەرزیان هەیە و دەزانن هێزی ئیسلام و هێزی (عومەر) چی دەكات!

وتیان: قەیناكات مەگەڕێرەوە فەرموو.

ڕۆشتن وتیان بە (ڕۆستەم) ئەو كابرایە سەیرە و لەو ئاداب و ڕسومەی ئێمە نازانێت و نەفامە! بە خەیاڵی خۆیان بەوانە دەڵێن نەفامی و نابەڵەدی، ئینسانێك كەئازادە و دینی تەوحیدە ناسیوە ناتوانێت جگەلە (خودا)هیچ كەس بەگەورە بزانێت (هەر بەوجۆرەی من جارجار بە ئێوە دەڵێم كەبەو شێوەیە لەسەر چۆك دانیشتن و ئەو جۆرە ڕێزە تەنها لەبەرامبەری خوداوە دەبێت، كاتێك نوێژ دەكەیت لەبەرامبەری خوداوە وادانیشە و لەبەرامبەری خەڵكی دیكەوە وادامەنیشە!) موغەیرە! بەو شێوەیە فێربوو بوو.

بۆیە(ڕۆستەم)سەیری كرد چارە نییە بزانن و نەزانن ئـەمان ترسـیان لـەدڵدایـە پێیان خۆشە ئەو سەفیرە بێت و قسەی لـەگەڵ بكەن بۆیە وتی: قەیناكات بابێتە ژوورەوە، هـات و ڕاسـتەوخۆ ڕۆشـت لەسـەرەوە لـەلای(تـەخت)ەوە لای(ڕۆستەمی فەروخ زادە)دانیشت، جائەوە زۆر ئیهانەت بوو، بەڵام ترسیان لەدڵدابوو بێ چارە بوون دەبێت قبوڵی بكەن، خەڵێكی زۆریـش لـەئـەم لاوە كۆبونەوە لـە خە ڵكـی گـەورە گـەورە نـەك لـە خـەڵكی سـادە! لـەو بینـا گەورەیەدا كە ڕۆستەمی لێبوو. ڕۆستەم پرسیاری كرد لـە موغەیرە.

ڕۆستەم: ئێوە بۆ هاتوون بۆ ئێرە و كارتان بەسەر ئێمەوە چییە؟

موغەیرە دەستیكرد بەباسێكی دوورودرێژ جامن یەك ڕستەی دەگێڕمەوە.

وتی: ئێمە بۆ سێ شت هاتووین.

یەكەم: خەڵك لـەبەندەگی ئینسانەوە ڕزگاربكەین بۆ بەندەگی خودا، لـەوڵاتی ئێوە ئینـسان بەنـدەگی بـۆ ئینـسان دەكـات لـەكاتێكـدا هـەموو ئینـسانەكان لـەبەرامبەر خوداوە یەك دەرەجەیان هەیـە،وڵاتـی ئێـوە كەسـانێك بـوون بـە خوداو ئەوانی دیكە بەندەگیان دەكەن. بەرنامەی ئێمە ئەوەیە خـەڵك ئـازاد بكەین لـەو بەندەگییە، هاتووین میللـەتی ئێـران لـەبەنـدەگی ئینـسان وكەسـی فێڵباز و زاڵـم ڕزگاربكەین و بیان خەینە سەر ڕێگای بەندەگی خودا.

دووەم: هاتووین خەڵكی لـە سیستەمی هەواوهەوەس بگێڕینەوە بۆ سیـستەمی عەدالـەتی ئیلاهی. ئائەو سیستەم و یاسایانەی وادانراون بۆ خەڵكی هـەمووی لـەڕووی هەواوهەوەسەوە و لـەسەر بینایی ئارەزوو و ئـاواتی كەسـانی زۆردار دامەزراوە و هەمیشە بۆ زوڵـم لـە مەزڵوم ئـەو بەرنامانـە ڕێكـدەخرێت، ئێمـە هاتووین خەڵكی لـەدەستی ئەو بەرنامە زاڵـمانە ڕزگار بكەین. سێهەم: ئێمە بۆ





ئەوە هاتووین خەڵكی (ئێران) لەئەسارەتی سەرزەمینی نەخشەی جوگرافیایی ئێران ڕزگار بكەین و لەڕووی گورەی زەمیندا ئازادیان بكەین، چونكە دین وایە هەموو دینێك هەر وایە بەتایبەتی دینی ئیسلام كە ئیتر ڕوونە و قورئانمان لەبەردەستدایە، دین ئەو هێڵانە بەدەوری بەشەردا ناكێشێت كەبەشی بكات ئەو بەشە بۆ فلانە كەس و ئەو بەشەش بۆ فلان خۆ بەشەر مەڕ و ماڵات نییە(ئاوا هێڵی بۆ بكێشیت)!

كابرایەكی مەسیحی، مەسیحییەك كەبیریارێكی عەرەبە، بەلام وردە وردە لێكۆڵینەوە و خوێندنەوەی لەدینی ئیسلامدا كردووە، قەصیدەیەكی زۆر جوان و گەورەی لەم بوارەدا نوسیوە ،لە شوێنێكدا دەڵێت"ئەو سنورانەی وادروست دەكرێت، هیچ پەیوەندییەكی بە عورفی ئەو(محمد)ەوە(ﷺ)نییە، چونكە ئەو(محمد)ە خاوەنی مامۆستایی جیهانی ئینسانییە و لەهەر جێگەیەكدا ئینسان هەبێت ئەو مامۆستایەتی و دەستی دەگرێت پەروەردەی بكات و ڕزگاری بكات، دەی سنور و ڕێگر لەم كارانە!".

جا(حەزرەتی مەغەیرە)بەم جۆرەی كرد وتی:"ئێمە هاتوین ئەو میللەتانەی وا لەسنورێكی دیاری كراودا زیندانی كراون و شورایەكیان بەدەوردا كێشراوە لەو ئەسارەتە ئازادیان بكەین و بەكەیفی خۆیان لەسەر گورەی زەوی بگەڕێن و زیندەگی بكەن".

ئەوانەی بۆ دەخوێننەوە دەوانن بابەتێك هەیە كە بریتییە لە یاسایەك بەناوی(مافی مرۆڤ)كەلەلایەن(شورای ئەمنییەتی سازمانی ملەل)ەوە بەتەواوی جیهان ڕاگەیەنراوە هیچ وشەیەكی زیاتر نییە لەو وسەی كۆتاییەی وا(موغەیرە)وتی!كە (خەڵك ئازاد بن). تەواوی مافی مرۆڤ كورت دەبێتەوە




لەو ڕستەی (موغەیرە)دا کە خەڵکی ئازاد بن! بەم جۆرە لەلایەن موسوڵمانانەوە لە هەموو لایەکەوە هەوڵدرا کەبەو شێوەیەی خۆیان ڕزگاریان بووە لە دیانەتی شیرك باقی بەشەری سەر زەوی ڕزگاریان ببێت تاوەکو کاتێك ڕێگا و شوێنی ئیسلام بەو جۆرەی پێغەمبەر(ﷺ)ڕۆشنی کردۆتەوە بەردەوامی هەبوو ئەم هەوڵەش هەر بەردەوام بوو بۆیە هەر ڕۆژە وولاتێك ئازاد دەبوو.. تاوەکو کاتێك ڕێگە و شوێنی ئیسلام گۆڕا و هەوا و هەوەس و زوڵم و زۆر دەستی پێکردەوە ئەو کات ئەوانەی وائازاد بوون و لەسەر دیانەتی تەوحید قەراریان گرتبوو وردە وردە نەصڵی ئەوانە گەڕانەوە بەرەو دیانەتی شیرك.

جا مەتڵەبێکی ئەصڵ و گرنگ کەدەبێت باسی بکەم ئەوەیە کە بەو جۆرەی کە خودا مانایی شیرك بۆ ئێمە دیاری دەکات بەڕاستی ئێمە موەحید نین! هەموو موشریکین! پێش لەوەی باس لەم بابەتە بکەم، یەك شتە بچوك بگێڕمەوە لە(سنە)لەناو کۆمەڵێکدا باسیان لە کابرایەك کردبوو یەك نەفەر بەناوی ئەمەوە کە ڕەهبەری دینییە، مەلایەکی پەیوەست بە دەزگای پیسی شاهەوە وتبووی "لێگەڕێن باسی مەکەن ئەو کابرا موەحیدە!" زۆر سەیرە! کابرا ناوی ڕەهبەری دینە، عەمەلەن ڕەدی ئینسانێك دەکاتەوە بەتۆمەتی ئەوەی کەحەقیقەتی دین هەر ئەوەیە کە دین تەنها عیبارەتە لە(تەوحید)یەکتاپەرستی، ئەساسی دین هەر ئەوەیە و هەموو لق و پۆپی دین لەسەر ئەوە دادەمەزرێت، کابرا خۆی بە مەلا و ڕەهبەری دین دەزانێت دەڵێت، فلان کەس ئیعتیباری نییە، چونکە موەحیدە، زۆر سەیرە!!.

جانەمە ئەو بابەتەیە كەدەبێت باسی بكەم، لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی وا بە بۆنەی هاتنی ئیسلامەوە هەموو ئیمتیازاتێكیان لەدەستدابوو، هەموو دەسەلاّتێكی یان زیادەیان لێسەنرابویەوە و وەك خەڵكی دیكەیان لێهاتبوو، بەبێ سەر و خوار و دەوڵەمەند و هەژار، هەموویان وایان لێهاتبوو ماقوڵ و ناماقوڵیان تێدانەمابوو، ئا ئەمانە دڵ بریندار و نارەحەت بوون، نەسل(نەوەی)ئەوانەش هەر وابوون، دوای ئەوانیش هەروا بوون، بۆیە هەر ئینسانێك زۆر موئمین و موخلیص نەبێت بەیەكسانی نارەحەتی دەبێت و پێی خۆشە ئیمتیازاتێكی هەبێت، پێی خۆشە هیچ نەبێت قوربان قوربانێكی پێ بڵێن، چونكە ئەوە لەزەتێكی پێدەگەیەنێت، بەو جۆرەیە تا تەواوی ئیمتیازاتەكانی دیكە!

ئائەم جۆرە ئینسانانە كەوتنە هەوڵدان(جا زۆر بە كورتی بۆتان باس دەكەم) وردە وردە بەتەدریج هاتن دەستیان كرد بە قسەكردن و درۆ و دەلەسە دروست كردن بە زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ). شتیی وایان دروست كرد ڕیشەی تەوحید دەربهێنێت و تۆوی شیرك و بت پەرستی لەدڵی ئینسانەكاندا بچێنێت، بەم جۆرە وردە وردە ئەو درۆ و دەلەسەیان دروست كرد، بەلاّم سەیریان دەكرد واچەند قەرن دەگوزەرێت هەندێك لەخەڵكی بەحەدیسی درۆ دەخەڵەتێن و ماقوڵ و ناماقوڵ دەبنەیەك، كە ئەوە مەزهەری شیركە. دیانەتی شیرك بەروبومە دەرەكییەكەی كەبەچاو ببینیت ئەوەیە،كە كۆمەڵێك ماقوڵ بن و كۆمەڵێك ناماقوڵ ئائەمە ڕەمزی ضاهر(ڕوخسا)ی شیركە! وردە وردە خەڵكی فێری ئەوە دەبن، بەلاّم خۆ قورئانەكە هەر لەبەردەستیاندایە و لێی دەزانن، ئەگەر قورئان دەخوێننەوە سەیردەكەیت ئەو درۆ و دەلەسانە





لەبەرامبەریەوە هیچی پێناكرێت، دەی ئەگەر وابێت چی بكەین؟ بۆیە هەستان كەم كەم دەستیان كرد بەدروست كردنی درۆ و دەلەسە كردن بۆ قورئان، چونكە ئەوەیان دەزانی كەناتوانن دەستكاری بكەن و تەنانەت ناتوانن یەك وشەی سەروخوار پێ بكەن، بۆیە دەستیان كرد بەوەی بڵێن، قورئان ئاوایە و شتێكی گەورەیە و شتێكە زۆر بانترە لەعەقڵی بەشەری ئاسایی و ئینسانی ئاسایی ناتوانێت لێی حاڵی ببێت، ئەگەر هەزار زمانی عەرەبی بزانیت تاوەكو ئیلهامێكی خوایی و ئیمتیازێكت نەبێت ناتوانیت لەقورئان حاڵی ببیت ئابەم جۆرە لەم شێوە قسانەیان دروست كرد! ئەنجامەكەی گەشت بەوەی كەچەند قەرن گوزەراوە لە ئێستادا كۆمەڵێكی چەند صەد نەفەری كە لێرەدا دانیشتوون بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم لەم چەند صەد كەسە دوو كەسیان بە حسابی(باشی) قورئان نازانێت، پانزە كەسیان حسابی قورئان نازانن!! دەی جا خۆ هیچ ماڵێكیش نییە قورئانی تێدانەبێت، هەموو ماڵێكی موسوڵمان سەیردەكەیت قورئانێكی تێدایە دەی بۆچی باشە*؟ ئێوە بیر لەوە بكەنەوە ئەو

---

*) مامۆستا ناصری سوبحانی لە كتێبی (لادانەكانی بەشەریەت و ژیانی موئمینانە)دا، دەربارەی كتێبە ئاسمانییەكان بەگشتی و قورئان بەتایبەت، و ئەو ئەرك و كارانەی بەو كتێبانە سپێرراوە و لە پاشاندا چۆن مرۆڤ لیێ لاداون دەفەرموێت " لە بڕوا (ئیعتقاد) بەكتێبەكانی خوادا لادانو ئینحراف بەم شێوەیە بوو كە: ئەو كتێبانەی وا بەرنامەن بۆ هیدایەتدانی مرۆڤ لە ژیاندا، بوو بوون بە هۆكاری (تەبەڕوك - تەبەرك) و بەكارهێنانیان لە جێی ئەو هۆكارانەی وا دیاریكرابوون.

بۆنموونە: بۆ لابردنی نەخۆشی و ترس، بۆئەوەی باران ببارێت، بۆ دەستكەوتنی هەر نیعمەتێكی تر لە نیعمەتەكانی خوای گەورە! بە كورتی بۆ لابردنی ئەو شەڕانەی وا تەمەڵی یان جەهل (نەزانی) نەیدەهێشت كە هۆكارەكەیان بەكار بهێنرێت، هەروەها بۆ دەستخستنی ئەو (بەرژەوەندی) مەنفەعەتانەش كە هەر تا بەو شێوەیە بوون تێدا.



قورئانەمان بۆچییە؟! ئەوە دوعـای چـاوە زارە وا لـەماڵـەوە دامانـاوە، ئـەوە حەب و دەرمانە، ئەوە بەكاری چی دێت؟ قورئان خـۆی، خـۆی دەناسـێنێت كەبۆ ئەوە بەكاردێت كە خەڵك بیخوێننەوە و لێی ڕامێنن و لێی حـاڵی بـبن، تاوەكو لـە شیرك ڕزگاریـان ببێـت. شـیركێك كەهەمیـشە دوژمنـانی خـەڵك بەدرێژای مێژوو تەوجیهی دەكـەن و دەیـسەپێنن بەسـەر خەڵكیـدا، خـەڵك ئەگەر لـە قورئان حاڵی بن لـەدەست ئەو شیركە ڕزگاریان دەبێت.

**قورئان بەئێمەی حاڵی دەكات كە(ترس)بەهۆی سێ شتەوە دادەمەزرێت:**

١. زۆر: ئینسانی بێ ئیمانی فاسدی وا هەن كـە زۆر و دەسـەڵاتی سیاسـی و هێـز پەیدادەكـەن و خـەڵك ناچـاردەكەن بـەوەی ڕەمـزی تەوحیـد و یەكتاپەرستی بگۆڕن و وردە وردە عیبادەتی ئەوان بكەن و فێری ئەوە ببن گوێ بۆ ئەوان ڕابگرن، ئەوانی چییان پێ خۆشە ئەوە بڵێن.

---

ـە هەمان كاتدا كە ئیعتقاد بەوە هەبوو كە ئەمانە كتێبی خوان، بەڵام بەو شێوەیە مامەڵەیان لـەگەڵدا ـەكرد،كە كتێبی تەبەڕروكن و خوێندنەوەیان تەنها بۆ ئەوەی كە بەرەكەت ببارێت بەسەریاندا، نەك بۆ ـەوەی فەهمبكرێن و عەمەلْ بكرێن (لێیان تێبگەن و كاریان پێ بكرێت)! " بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هاتوو ـە خەڵكی حاڵیكر كە "وا مەزانە ئەو قورئانەی كە بۆ تۆ نێردراوە بۆ ئەوەیە كە بینێیت بە سەرچاوە و ـە(تەبەڕكی) بزانیت، یان وەختێك دەڕۆی بۆ سەفەر، سەر بكەیت بە ژێریدا و ڕەو بێت و بەس! بە هیچ ـێوەیەك وا مەزانە كە بۆ ئەوە هاتووە.

ـەوە بەرنامەی عەمەڵی (كردەیی) ژیانتە، ئەگەر یەك ملیۆن ساڵ بینێیت بە سەرتەوە و بیخەیتە سەر ـاوت، بەڵام یەكێك لـە حوكمەكانی قبوڵنەكەیت، ئەوە خوا لێتی قبوڵ ناكات، بەڵام ئەگەر ـحكامەكەی جێبەجێ بكەیت و گوێ بۆ فەرمانەكانی بگریت و ڕەچاوی بكەی، تەنها جارێكیش ـچت نەكردبێت، ئەوا خوا موحاكەمەت ناكات لـەسەری". بڕوانە: مامۆستا ناصری سوبحانی: ـدانەكانی بەشەرییەت و ژیانی موسڵمانانە، ئامادەكردنی (سەروەت عەبدوڵڵا)، چاپی یەكەم، چاپخانەی ـما، سلێمانی. ٢٠١١.

٢. **پارە:** بڕێك لە خەڵكی هەر لەڕێگەی فڕوفێڵەوە(پارە)لەلای خۆیان كۆدەكەنەوە و لەئەنجامی ئەو پارە زۆرییەوە خەڵك ناچار دەكەن، چونكە پێویستیان بەپارەكەی ئەوان هەیە فێربن ڕێزێكیان بۆ دەربڕن و لەبەرامبەریانەوە قوربان قوربانیان بۆ بكەن تاوەكو پارە و قەرز و هەر جۆرە كۆمەكێكیان بدەنێ، جا كۆمەكەكە دروست بێت یان نادروست لەلایەن ئەوانەوە بەخەڵك بدرێت.

٣. **بە قسەكردن:** دەستەیەكی ترهەن هەر بەقسە خەڵكی زەوج دەكەن!! وەك ئەوانەی ئەو هەموو حەدیسەیان بەدەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ)دروست كرد، قسەی پڕپێچ و قەمچ دروست دەكەن و حەقیقەتی ڕوون و ئاشكرای قورئان لەخەڵكی دەشارنەوە. كارێكی وادەكەن كەهەتا خەڵك قورئانی لەباوەشدا بێت و دژی قورئانیش قسەی بۆ بكەیت بە خۆی نەزانێت! هەر وەك ئەو پەندە كوردییە"ماڵم پڕە لە ڕازیانە بەدەست دڵ ئێشە دەمرم"! چونكە ڕازیانە بۆ دڵ ئێشە باشە، واتە ماڵم پڕە لە ڕازیانەو بەدەردی دڵ ئێشەوە دەمرم ئەمە زۆر سەیرە! كابرا ماڵی قورئانی تێدایە كەچی خەریكە بەدەردی شیرك و بتپەرستییەوە دەتلێتەوە!! ئەمەش هۆكارەكەی ئەوە بوو كەهاتن وتیان بەخەڵك"ئامان! ئێوە دەست لەقورئان مەدەن، ئێوە لێی حاڵی نابن، دەخیل كوفرە نەیخوێننەوە، دەخیل هەوڵنەدەن بۆ خوێندنەوەی قورئان!" ئەمەی ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە ماجەرایەكە لە زیندەگی خۆمدا دیوومە كەماوەیەك پێش ئێستا بووە ئینسان دەڕۆشت ئەو هەموو زانستەی دەخوێند بە خەیاڵی خۆی ببێتە ڕەهبەری دینی لەناو كتێبێك لەكتێبەكاندا، ئەگەر بگەشتنایەتە سەر




ئایەتێك لەئایەتەكانی قورئـان یەكـسەر مامۆسـتاكان دەیـانووت جالـەوە گەڕێن ئەوە(ئایەتی قورئانە)، زۆر سەیرە! ئەو كتێبـە گـەورە لەسـەرەتاوە تا كۆتایی وشە بە وشە بەوهەموو قەید و قوید و حاشییەوە بیخوێننـەوە و لێی حاڵی ببین یەك وشەی خودایی تێدایە ئێمـە لێـی گـەڕێین و كارمـان بەسەریەوە نەبێت!!

لەچەند قەرندا ئەو فڕوفێڵەیان كرد هەتا ئەوەی وا خۆی پـەروەردە دەكـات بۆئەوەی ببێتە ڕەهبەری دین و خەڵكی لـە قورئان حاڵی بكات ناوێرێـت یـەك ئایەتی قورئان حاڵی ببێت. ئاوایان كرد تا دووبـارە بتـوانن خـەڵكی لـەدینی تەوحیـدەوە بگێڕنـەوە بـۆلای دینـی شـیرك و بتپەرسـتی! دیـاربوو بـەجۆر و ڕێگاكانی دیكە پێیان نەدەكرا نەیاندەتوانی قورئـان بەتـەواوەتی لەناوبـەرن و حەرفەكانی بگۆڕن كەواتە دەبێـت ئـەم ڕێگایـە بگرنەبـەر كەباشـە باهـەموو ماڵێــك قورئــانی تێــدابێت، بــەلأم خــۆ قورئــان(بــەرگ و كاغــەز و ڕوخسارەكەی)بەرەكەتی نییە بۆ خەڵك، بـەڵكو ئـەوە مەعنایـەتی بەرەكـەتی هەیە بۆ خەڵك وریایان دەكاتەوە و زیندوویان دەكاتەوە! با قورئان لـەماڵانـدا هەبێت، بەلأم خەڵك لێی نەزانن و لێی حاڵی نەبن، (كەر)ێك بهێنـە پـەنجاہار قورئانی لێبنێ بزانـە هـیچ سـودێكی هەیـە بـۆ ئـەو كـەرە! هـاتن خـەڵكیان ئاوالێكرد هەروەك ئەو كەرە هەموو ماڵێك قورئانی تێدایە، بەلأم كـەس لێـی حاڵی نابێت!

(جا قورئان خـۆی ئـەم تەشـبیهە دەكـات كاتێـك باسـی(بـەنی ئیـسرائیل) و ڕەهبەرەكانیان دەكات بەتایبەتی ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا

يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾( ٥ سوراالجمعة)ئەوانە (تەوراتیان) بۆ نێردرا و خۆشیان واپیشاندا کەئێمە حافز و هەڵگری تـەوراتین، ئـەمینی خـەڵکین کەتـەوراتیان فێربکەین و تێیان بگەیەنین کەچی لـە حەقیقەتـدا بـەخیلافی ڕێگـەی تـەورات ڕەفتاریان دەکرد و خیانەتیان لەتـەورات دەکـرد دەفـەرمێت "حـاڵی ئەوانـە هەروەك ئەوە وایە کەرێك بهێنیت و باری گەورەی کتێبی لێبنێیت!" جا دەی ئەمە سودی چییە؟!! ئەوان هـاتن وایـانکرد لـەو خەڵکـە کەهـەر وەك ئـەو کەرەی لێبێت قورئانیان لەباوەشدا بێت، بەڵام هیچی لیٚ حاڵیٚ نەبێت لەسەر تاق دانرا بێت، بەڵام سودی لێوەنەگیرێت تەنانەت نەوێرێت سەیری بکات و وشە وشەیەکی لێبخوێنێتەوە بڕوات تەواوی زانـستە عەرەبییـەکان فێربێـت، بەڵام نەوێرێت لای مامۆستاکەی دابنیشێت و بڵێت ئـەریٚ مامۆسـتا پێمبڵـیٚ بزانم خودا چی یۆ ئێمـە نـاردووە؟! ئـاخری مەگـەر ئـەو قورئانـەی بـۆ کـیٚ ناردووە؟ بەکاری چی دێت؟!

جا سەیردەکەیت کاتێك کەنەیانتوانی لەناوی بەرن و دەستکاری بکەن، بەڵام توانیان ئەم فێڵە دروست بکەن کارێك بکەن خەڵکی قورئانی هەبێت، بـەڵام نەزانێت و لـێی بێگانە بێت.. ئابەو فڕوفێڵە کارێکی وایـان کـرد کەبەڕاسـتی نوێژ دەخوێنین و ڕۆژو دەگرین و خۆشمان بە موسوڵمان دەزانین، بەڵام ئەگەر موسوڵمانین ئائەوە واحـەزرەتی محمـد (ﷺ) زەحمـەتی بـۆ کێـشا و هێنـایی و بەخەڵکی حاڵیٚ کرد بەڕاستی ئیتر ئێمە موسـوڵمان نـین! ئەگـەر موسـوڵمان بەوە دەڵێن کەبەو جۆرەی قورئـان دەفـەرمێت بـە پێغەمبـەر(ﷺ) بەخـەڵکی ڕابگەیەنە، بەو جۆرەی کە (موغەیرە)بە (ڕۆستەمی)وت کـە"هـیچ ئینـسانێك بەندەگی غەیری خودا نـەکات، هـەموو کەسـێك بەنـدەی یـەك گـەورە بـن

كەئەوە خودایە". (وەڵا)ئێمە ئەو موسوڵمانەی نین سادە سادە تەماشایی ژیانی خۆتان بكەن (بەكورتی باسم كرد بەندەگی واتایی چییە؟)

وتم: كەبەندەگی بە نوێژ و ڕۆژوو ناڵێن، بەڵكو بەوە دەڵێن كە ئینسان لە جوزئییات و كولییاتدا وەك بیروبۆچوونی كەسێك ڕەفتار بكات، ئەگەر هەروەك ئەو بەرنامەیەیی وا خوا ڕایگەیاندووە ڕەفتاربكات ئەوە بەندەگی خوایكردووە و موحیدە، ئەگەر یەك تۆز لەو بەرنامەیە لایدا و پێی خۆش بوو بەرنامەیەكی دیكە لەجێگەی ئەو بەرنامەیەی خودا دابنێت ئەوە(موشریك)ە.

ئەگەر بەو حسابە بێت ئێمە هەموومان موشریكین! چونكە ئەگەر نوێژ و ڕۆژوو بۆ خوا دەكەین خۆ موشریكەكانی دیكەش، خۆ یەهود و نەصارا و باقی پەیڕەوانی دینەكانی دیكەش هەر بەو جۆرە عیبادەتیان بۆ خوا ئەنجام دەدا، ئەوانیش نوێژ و ڕۆژوویان هەبوو كەچی خوا پێیان دەڵێت(موشریك).

بەڵێ، ڕەهبەرە دینی و دونیاییەكانیان لەجیاتی خودا حسابیان دەكردن و شوێنی ئەوان دەكەوتن و دەستوریان لەوانەوە وەردەگرت و هاواریان لەوان دەكرد! خودا ئائەوانە بە موشریك دادەنێت...

جا بیری بكەنەوە و بزانن چەنێك ڕەنگی شیرك لەناوماندا هەیە! جا چونكە درۆی زۆر كراوە تاوەكو ئەو شیركانە تەحمیل كراوە بەسەرماندا زۆریش زەحمەتی دەوێت كە دووبارە لەڕێگەی شیرك و شەیتان لابدەینەوە بەرەو ڕێگەیەك كە پێغەمبەر(ﷺ)هێنایی زۆر زەحمەتی هەیە! ئەو زەحمەتەش زەحمەتی جەماعەتی مەلاكانە، بەڵام كامان نازانین ئەگەر مەلایەك قسەی خودا و پێغەمبەر(ﷺ)دەگێڕێتەوە بۆ خەڵك و ئەو حەقیقەتەی واخودا دەستوری داوە كە بەخەڵكی حاڵی بكرێت، ئەگەر ئەوە بەیان دەكات، مەلای (صەو)ی

دیکە دێن، ناو بەخەڵکی دەنێن و دەڵێن"ئەوە لامەزهەبییە و ئەوە وەهابییە و ئەوە چییە و ئەوە چییە..." لەو جۆرە توهمەتانە، بەڵام بەوجودی ئەو حەقیقەتە ڕەفعی مەسئولییەت لەسەرشانی مەلا موسوڵمانەکان لاناچێت حەزرەتی (رسول اللـهّ)(ﷺ )کاتێك هات دینی خودا و دینی تەوحید بەخەڵکی ڕابگەیەنێت هەروەك مەلایان و ڕەهبەرانی دینی ئێستا دەیانگووت ئەوە(کافرە) ئەوە هاتووە دینمان لێتێکبدات. قورئان دەیگێڕێتەوە لەهەر سەردەمێکدا هەر پێغەمبەرێك هاتبێت یەکسەر وتوویانە ئەوە هاتووە خەڵك لەڕێگەی دینی خۆیان لابدات! ئێمە ئەژداد وئابادی خۆمان دەناسین هەموو بەو ڕێگایەدا ڕۆشتوون و دینی هەموویان ئەوەبوو ئێستا تۆ دەتەوێت ئێمە لەڕێگەی دینی ئەژداد و ئابادمان دوور بخەیتەوە؟ دەتەوێت دینی ئێمە و ئەوان جیا بکەیتەوە؟

قورئان دەیگێڕێتەوە هەر پێغەمبەرێك هاتووە ویستویەتی دینی خودا بگەیەنێتە خەڵکی ئەو تۆمەتانەیان بۆ دروست کردووە ئاخر بتپەرستەکانیش(دینیان هەبووە)، بەڵام دینی دونیا، دینی زۆردار و پوڵدار و ڕەهبەرانی دینی بوو، نەك ئەو دینەی کەوا پێغەمبەران لەلایەن خوداوە هێناویانە. دینی پێغەمبەران هاتووە بۆئەوەی دینی ئەربابی دونیا لەناوبەرێت، ئەو دینەی ئەوان دینی شیرك بووە و دینێکیش کەلەلایەن خوداوە هاتووە بۆ لەناو بردنی دینی ئەوان، دینی تەوحید بووە،کەهەموو یەك پلە بن و هەموو لەیەك(مَبدَء) دەستور وەربگرن،گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بکەن و تەنها.ئەوبە خاوەنی هێز و دەسەڵات بزانن لە هەستیدا...

هەروەك باسم كرد لە ئێستادا (وایلێهاتووە باسەكان ئاوەژوو بونەتەوە)خۆم لە (سنە)بیستوومە لەمەجلیسێكدا باسی نەفەرێك كرابوو مەلایەك وتبووی"لێی گەڕێن ئەوە موەحیدە"بە مونتەهای بێحەیاییەوە هەندێك مەلای دونیا پەرستی، دین فرۆشی، خائین هەن كەخۆیان فرۆشتووە بە ئەربابی دونیا، بە فلأنە وەزیر و ڕەئیس و بەڕێوەبەر و فلأنە شێخ، گوێڕایەڵی هەریەك لەوانە دەكەن تەنها گوێڕایەڵی خودا ناكەن، دەزانن مەلای بەو شێوەیە زۆرن. بۆیە ئێوە ئەی كۆمەڵەی مەلاكان ئەگەر خەیاڵتان ببێت ئەو ڕێگەیەی وا پێغەمبەران پێیدا ڕۆشتن ئێوەش پێیدا برۆن و دووبارە دینی تەوحید زیندوو بكەنەوە، یەقینەن دەبێت چاوەڕێی ئەوە بكەن جنێوتان بدرێتێ! ئاخر مەگەر ئێوە لە پێغەمبەران(درود و سەلامی وایان لەسەربێت)ماقوڵترن؟ ماقوڵی كاتێكە كە لە ڕێگەی ئەوانەوە بچن، بۆیە هیچ ناز مەفرۆشن بەسەر خەڵكیدا، هیچ تەوەقوعێكتان لەخەڵكی نەبێت و بەو جۆرە كە پێغەمبەران ڕەفتاریان كردووە ڕەفتار بكەن و ئەو ڕێگە كەئەوان وتوویانە ڕۆشنی بكەنەوە بۆ خەڵك. هەروا كە پێغەمبەرانیش ئازاردران، زۆریش لە(ئەنبیاء)نەك (ڕەسول)، چونكە ڕەسول خودا وەعدی پاراستنی پێداون، زۆرێك لە(ئەنبیا)بەدەستی مەلایانی دینفرۆش كوژراون، چونكە مەلایان واتە ڕەهبەری دینی ئەوانیش ڕەهبەری دینییان هەبووە كەدەیانووت ئەمانەی كافرن و ئێمە كافر دەكەن بابێین بیانكوژین، لەگەڵ ئەربابی دونیا و زۆردارانـدا دەستیان تێكەڵاو دەكرد بۆ كوشتنی ئەنبیاكانی خودا.

زۆربەی زۆری ئەو مەلایانە لەهەر لایەكەوە سەیری دەكەیت نۆكەری پوڵدارو زۆردارن، بۆیە جنێوتان دەدەنێ، تەشیرتان دەكەن و ئازارتان دەدەن،





لەوانەش ئەگەر ئێوە زۆر ئینسانی چاك بن خەڵكیشتان لێهەڵئەنێن و لێشتان بدەن، جائەو جار ئیتر ئێوە دەبنە ئینسانی چاك، ئەوە نیشانەی چاكی نییە كابرا لەماڵی خۆی ڕەحەت و ئاسودە دابنیشێت و پلاو و گۆشت بخوات و جارجار بەئەدا و ئەتوارەوە دوو كەلیمە قسەبكات بۆ خەڵك! ئینسانی چاك ئەوەیە سەیردەكات خەڵكی بەدبەختە،گرفتارە، سەری لێشێواوە و دینی خودای لێسەنراوەتەوە و كەوتۆتە سەر دینی بتپەرستی، هەوڵدەدات ئەو خەڵكە مەزڵومە ڕزگار بكات. ئیتر ئەو كاتەیە ڕەمزی پێغەمبەران پەیدا دەكەیت و ڕووت هەیە بڵێیت(من وارسی پێغەمبەرانم)، چونكە پێغەمبەران بۆ ڕزگاركردنی خەڵكی زەجر و ستەمیان تەحەموول كردووە تۆ دەتەوێت هیچ نەكەیت و بڵێیت(من)وارسی(میراتگری) پێغەمبەرانم! ئاوا نابیتە میراتگر.

جەماعەتی مەلایان! ئومێدم هەیە لەم ساتەوە ڕێگەی قاتع و ڕۆشن بۆ خۆتان تەئمین بكەن، دەزانم شوكر بۆ خوا لەم وڵاتەدا ئێوە ڕۆشنایيەكتان خستۆتە ناو خەڵكەوە، ئێوە توانیوتانە كەمێك زیهنی خەڵكی ڕۆشن بكەنەوە، بەڵام ئەمە كەمە! ئەگەر كابرا نەخۆشییەكی ببێت دەرزییەكی لێدەدەن، بەڵام كاتێك كابرا خەریكە جەڵدە لێی دەدات، كابرا كۆڵەوارە و لەدەست و پێ كەوتووە، دەستوپێ(شعور و دەرك)ی كابرا لەم كاتەدا بەدەرزییەك ڕزگاری نابێت، بەڵكو دەبێت بەتەواوی وجودەوە هەوڵی بۆ بدەیت...

پزیشكێكی دڵسۆزی خەڵك شەونخونی دەكێشێت و خۆی زەحمەت دەدات كە ئینسانی گوند و وڵات و ناوچەكەی خۆی چاك بكاتەوە. ئێوە زۆر گەورەترن لەو پزیشكانەی وا جەستەی خەڵكی چاك دەكەنەوە! لێرە ڕۆحی خەڵك نەخۆشە، ئیمان و فكر و شعوری خەڵك نەخۆشە،

ئێوە(مەلاگەل)پزیشكی چارەسەركردنی ئەو نەخۆشیانەن بۆیە مەرد و مەردانە هیمەت بكەن﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾* موعامەلەیەكی بەو شێوەیە بكەن واز لە نەفسی خۆشتان بهێنن، دوور بكەونەوە لەماڵ و ئیحرام و جاهە و جەلال، هەوڵبدەن ئەو خەڵكە نەخۆشە وا بەهەزار دەرد موبتەلایە كە هەموو ئەو هەزار دەردە تەنها لەبەر ئەو ئەصڵەیە كەتووشی شیرك بوون و دینی خودا پەرستییان وێڵكردووە وكەوتوونەتە شوێن دونیا پەرستی. هەوڵبدەن چارەسەری ئەوانە بكەن ئەمەش شەونخونی و زەجر و مەشقەتی دەوێت! بەڵام خودا مامەڵەی بەو شێوەتان لەگەڵ دەكات لەوەش گەورەتر!(ورضوان من اللّهٔ أكبر)...

دەی دونیاش دەبینن چی تێدایە، نەخۆشی و زەجر و حەسرەت وئازار هەیە و لەدوای ئەمانیشەوە مردن، بەڵام ئەگەر ڕێگەی خودا بگریت هەرئەوكاتە یەكسەر بەرەو خۆشبەختی دەچیت، ئەمە لەلایەكەوە، لەلایەكی تریشەوە ئەوە واهەر ئەو هەیە لە دونیا و ئاخرەتدا جا لەپاشاندا وریا دەبیتەوە و سەیردەكەیت باقی تر هەمووی پیسە و هەرئەو قودرەتی هەیە كە خودایە ئەویش لێت ڕازی دەبێت. وەك خودای گەورە دەفەرمێت"بۆ ئینسانی عاقڵ و دانا لە بەهەشتیش گەورەتر ڕەزامەندی خودایە". ئەگەر خۆت یەكلای بكەیتەوە بۆ ڕزگاركردنی ئەو خەڵكە نەخۆش و هەژارە، كە پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون ئەوە تۆ هەم بەهەشتەكە وەردەگریت و هەم ڕەزامەندی خودا

---

*) إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١١١ سورة التوبة)

وەردەگریت، دەی ئیتر چیت دەوێت؟! تۆ ڕەزامەندی خـودا وەربگـرە! دەی ئیتر با شەیتان و وردە شەیتان نارازی بن. چاویان دەربێت!!

تکاتان لێدەکەم! تەکانێکی توند تر بدەن با یەکەمجار ئەو مەلایانەی واخائین و دینفرۆش و دونیا پەرستن زیاتر ڕسوا بن، چونکە لەگەرمەی جیهادی دینیدا ئینسانی خائین دەردەکەوێت! ئەگەر وردە وردە قسە بکەیت هەرگیز ئینسانی خائین دەرناکەوێت، زۆر توند حەقیقەت بڵێ بازۆر توند ئینسانە خائین و مەلا خائینەکان ڕسوا بن و خەجاڵەت ببنەوە، ئەگەر ئێوە بەو توندییە جیهاد بکەن هەم زۆر زووتر خەڵك وریا دەبێتەوە، هەم یەکەیەکیش لەناو ئەو مەلایانەدا ئاخری خەجاڵەت دەبنەوە و دێن بەرەو ڕێگای حەق.

جابە ئێوە ئەی خەڵکی ئاسایی(مەلانین). هـەزاران دەرد هەیـە بائـەوەتان پـێ بڵێم، جارێکیان کابرایـەکی گـەنج لەسـەر ڕێگـەدا دارێـك هەڵـدەگرێت و دەکێشێت بەسەر کابرایەکی تردا و خوێناوی دەکات خـەڵکی کۆدەبنـەوە و دەڵێن تەماشا ئەو گەنجە چەند بێ حەیا و بێ ئەدەبە، سەیر چـۆن لـەو پیـاوە ڕیش سپییە دەدات؟! بۆیە دەڕۆن دەستی دەگرن و ناهێڵن ئیـتر لێـی بـدات، لەپڕ هاواری لێبەرز دەبێتەوە و دەڵێت تۆ سەیر ئەم خەڵکـە نـاهێڵن بـاوکی خۆشت تەربییەت بکەیت!

جا خەڵکینە ڕەهبەری دینی دەبێت لـەباوك لەپێـشتر بێـت، دەبێـت لـەباوك شارەزاتر بێت، بۆیە ئێوە باوکی خۆتان تەربییەت بکـەن، مـەلاکان تەربییـەت بکەن! ئەوان تەربییەت بکەن و عەقڵی خۆتان بخەنەکار، کاتێـك قـسەیەکیان کرد خودا یاسایی داناوە کەخەڵکی(مەئمورانی)خودا لـە (مـەئمورانی)دونیـا جیابکەنەوە ڕەهبەرانی دینی (دونیاپەرست) لەیەك جیابکەنەوە. ئەوەی کاتێك

قسە دەكەن بۆ سوود و بەرژەوەندی خەڵكی قسەدەكەن و نەك بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئابەم پێوەرە سادە كە خودا دیاری كردووە دەتوانن جیایان بكەنەوە،كام لەمەلایان بۆ خودا قەسە دەكەن و ئازاریان دەدرێت و هیچ چاوەڕێییەكیان لەخەڵكی نییە، نە سەرووەت و سامان و پلە و پایە و ماقوڵی و جاه و جەلالیان دەوێت، ئەوانە لەگەڵ خەڵكی ڕاست دەكەن. بەلأم ئەوانی تر نەسیحەتی خەڵكی دەكەن بۆئەوەی هەدیيەیان بۆ بەرن لەسەرەوەی خەڵكەوە دادەنیشن، لەسەر سفرەی رەنگاو رەنگ دانیشن! ئائەوانە درۆ دەكەن...هەركاتێك دەبینین مەلایەك بەناوی دینەوە بۆ دونیا هەوڵدەدات نەفرینی بكەن و ڕسوای بكەن و، كۆمەكی ئەوەش بكەن بەرەو دینی تەوحیدی خودا بانگتان دەكات.



## باسی چوارەم:
## مانەوەی مادە و ووزە لە بووندا

سـەرەتا دەبێـت ئـەوە جیـا بكرێتـەوە مەسـەلـەی قـانون لـەگـەڵ مەسـەلـەی تیۆریا(نـضرية) دوو شـتی جیـاوازن لـەیـەكتری! تیۆریـا مەتڵەبێكـە بـەزیهنی ئینساندا دێت، ئیتر لـەڕووی بەڵگە هێنانەوە و بینینەوە یان لـەهـەر ڕوویـەكی تـرەوە پێـی ئێـژن تیۆریـا تـاوەكو كاتێـك بەتەجروبـە(ئـەزموون)ی زانـست دەسـەلمێنرێت. بۆیـە مەبەسـتی خـەلقی(مـادە و ئینـرژی)ئـصوڵـەن تەجروبـە پەزیرییەك نییە تاوەكو ببێتە قانون(یاسا)، نەك ئەوەی ئێستا قانون نییە، بـەڵكو بەگشتی ناتوانێت ببێتە قانون! چـونكە(دیقـەت لـەم نوكتەیـە بكـەن)كاتێـك تیۆرییەكی زانستی دەبێتە یاسا كە چەندین جار تەجروبەی بكـەیت و سـەیری بكەیت كەبەڵێ هەموو جارەكان هەریەك ئەنجام دەدات بەدەستەوە ئـەو كاتـە پێی ئێژن یاسا، بۆیە ئەگەر شتێك ئیمكانی نەبێت تەجروبە بكرێت نابێتە یاسا. دەی ئیمكانی نییە تیۆری(خلق لـە عەدەمـەوە)مەسـەلـەی(خـەلقی مـادە یـان ئینرژی)ببێتە قانون، چونكە ئیمكانی تەجروبە كردنی نییە، ئیمكانی نییە بەشەر بتوانێت لـە(نەبوون ـ عەدەم)ەوە جارێك، دووجار، سێ جار، خـەلقی بكـات تاوەكو تەجروبەی بكات بزانێت دەكرێت یان ناكرێت، دەبێـت یـان نابێـت، چونكە ئیمكانی نییە ئەوە تەجروبە بكات لـەبەرئەوە بەدرێژی تەمەنی ئیمكانی نییە ببێتە یاسا، تەنها تیۆرییە، جا تیۆرییەك كاتێك لـەلایەكەوە دەلیلی قەتعی و یـەقینی هەیـە بـەخلافی دیـارە كـە باتڵـە! لـەولاشـەوە ئـەوەش كـە پێـی




ئێژن(یاسا)هەر دووبارە لەڕووی زانستییەوە ئەگەر وشەی یاسا دەقیق مانا بکرێت ناتوانیت پێی بێژیت-یاسا-دەربڕینەکە دەربڕینێکی هەڵەیە، چونکە بەشەر توانای ئەوەی نییە(مادە) یان (ئینرژی) بەرەو(عەدەم)نەبوون بەرێتەوە پاشان چەند جار ئەم مەتڵەبە تەجروبە بکات تاوەکو ببینێت دەبێت یان نابێت، ئەو ئەوەندە بەفعلی لەواقیعیەتێکدایە کە(مادە و ئینرژی) لەناو ئەم واقیعیەتەدا جەرەیان پەیدا دەکات هەرچی پەیوەندی هەبێت بەم واقیعیەتەوە کەهەیەتی نەك بەڕابردووی واقیعیەتەکە کاتێك کەنەبووە نەك بەئایندەی ئەم واقیعیەتە فەرزەن کاتێك دەبێتەوە عەدەم، بەدەر لەم دووانە ئەوەی کەپەیوەندی هەیە بەم واقیعیەتەوە کە فیعلەن جەرەیانی هەیە، دەتوانێت تیۆری پێشکەش بکات و دواتر تیۆرییەکە بکاتە یاسا، ئەویش یان(ڕاست) یان(هەڵە)، چونکە هەر تیۆرییەك لەمەجالی(ئەزمون) کردندا(ڕاست) دەرناچێت کاتی واهەیە بەتاڵ دەبێتەوە، تیۆرییەکی زانستی پێشکەش دەکرێت کاتێك تەجروبە دەردەکەوێت کە دروستە کاتی واش هەیە کە دەردەکەوێت هەڵەیە.

ئەوەی وا داخلی مەحدودەی وجودی مادە و ئینرژی بێت نەك پەیوەست بە ئەم پەڕی، واتە کاتێك کە هێشتا مادە و ئینرژی نەبووە. ئەو پەڕی، واتە کاتێك(مادە و ئینرژی)لەناو دەچێت، ئا ئەوە لەمەحدودەی کاری ئێمە خاریجە. ئیمکانی ئەوەمان نییە دەست بکەین بەتەجروبە کردن لەبارەیەوە، بینا لەسەر ئەمەش ئەگەر مانای وشەی(یاسایی زانستی)-قانونی عیلمی-بزانین چییە ناکرێت بەسەرەتاکەی هیچ و بەئاخرەکەی کەئەو پەڕییەتی هەر بڵێیت(یاسا). وشەی یاسا بەکارناهێنرێت بۆ شتێك کە ئینسان تێیدا دەسەڵاتی ئەوەی نەبێت کەتەجروبەی بکات و بزانێت وایە یان وانییە. دەی خۆ ناتوانین




تەجروبەی بكەین بزانین ئەم تیۆرییـە كـە ئێـژێ"مـادە و ئینـرژی لـەناودەچـن تیۆرییەكی دروست یان هەڵەیە"، چونكە ناتوانین تەجروبەی بكەین بۆیە نابێتە یاسا ئەوەی پێی ئێژن یاسا ئەوە خۆهەڵخەڵەتاندنە! هەروا كـەبۆ ئـەو سـەری ناتوانین بۆ ئەم سەریشی(بۆ ڕابردووی)بەدڵنیاییەوە ناتوانین، لە توانایی دیـاری كـــراوی ئێمـــە خاریجـــە بۆیـــە بەشـــێوەیەكی گـــشتی بـــەكارهێنانی وشەی(یاسا)لـەڕووی زانستییەوە بۆ مەتڵەبی(وجود و عەدەم)لـەباری(مـادە و ئینرژی)یەوە بەكارهێنانی باتڵ و ڕەدكراوەیە.

هەوڵبدەن بە وشـە و چـەمك مەخەڵـەتێن، زۆر وشـە و چـەمك هەیـە لـەڕووی زاهیرییـەوە بـەهێز، هـەتا وا دەبینرێـت كـە دەلیلیـان هەیـە، زۆر شـت هەیـە لـەمەسـەلـەی(فەلـسەفی و كۆمەڵایـەتی و سیاسـی)ئیـستدلالی زۆر دەكرێـت و وا پیشان دەدات زۆر بەهێزە، بەڵام هەر شتێكی ڕواڵەتییە و واقیعەتێكی نییە و باتڵە. لـەمەتاڵی سیاسی و كۆمەڵایەتی كە پەیوەسـتن بەئینـسانەوە ئەمانـە دەیـانبینین كـورەی زەوی هەمیـــشە خەریكـــە مـــەتاڵیبێك بەناونیـــشانی حەقیقـــەت و موسەلـەمات دەداتە دەستی خەڵكی و هەمیشە باتڵـە، لـەڕووی زانستیـشەوە هەر بەو جۆرە، بۆیە بەوە مەخەڵـەتێن كە شتێك بڵێن یاسـا! دەبێـت حاڵێتـان بێت كەچ شـتێك دەبێتـە یاسـا ئـەوەی كـە شـەرتی تـەواوە و دروسـتە بـۆ بەكارهێنانی وشەی (یاسا) هەیە یان نییە؟ ئەگەر مەرجی دروست ئەنجام بـوو، واتە ئەو ئەنجامەی لـەدوای تەجروبە بەدەسـت هـاتووە موافیـق بـووە لـەگـەڵ تیۆرییەكەدا ئابەوە بێژن (یاسا)، بەڵام ئەگەر مەقدور نەبوو پێی مەڵێن قـانون، یان مەقدور بوو، بەڵام بالفعل ئەنجام نەدرا تاوەكو دەركەوێت وایە یان وانییـە ئەو كاتەش پێی مـەڵێن قـانون(یاسـا). بـەوەی كەسـێك ئێـژێ(یاسـا)یـە تـۆ

مەخەڵەتێ، وەكو هەندێك لەتیۆرییەكانی (داروین) لەو سەرەتاوە ئەو ئینسانە خەڵەتاوانە كەهەر قسەیەكی تازە دەكرێت شوێنی دەكەون، چونكە ئەمە شتێكە لەدەرونی ئینسانلدا هەیە(هەموو قسەیەكی تازە لەزەتێكی هەیە بۆ ئینسان) ئەوانە وا خەڵەتابوون هەندێك نوكتە كە(داروین)لەبارەی تەكامولەوە دەیانلێت بەناونیشانی بەدیهی ترین بەدیهییات دەیانووت! دەی هەر كەمێك دوای (داروین)تحقیقاتی علمی دەریخست بڕێك لەتیۆرییەكانی هەڵەیە تائێستاش هەر لێكۆڵینەوە دەكرێت دەردەكەوێت هەندێك موسەلەمەو باش تێگەیشتووەو كەشفی عیلمی گەورە گەورەی كردووە، بەڵام بڕێكیشی دەردەكەوێت كە هەڵەی كردووە. ئەوانەی والەسەرەتاوە بەوجۆرە بەرخورد دەبوونەوە لەگەڵ باسەكەدا بەرخوردێكی صەحیانەبوو بە ناونیشانی موسەلەماتی عیلمی باسیان دەكرد! ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی تازە بوو، جازیبییەتی هەبوو، بەڵام دواتر دەركەوت كەوانییە. ئێستاش ئەم وشەیە بەكاردەهێنرێت كەئەم یاسایەكی زانستییە(مادە و ئینرژی) لەنەبوونەوە نایەتە بوون، ئەمە یاسایەكی زانستییە كاتێك مادە و ئینرژی بوونیان هەبوو ئیتر بۆ نەبوون ناگەڕێتەوە ئابەمە مەخەڵەتێن بێژن یاسا و تیۆری زانستی مانای چییە؟ دەی كاتێك ئێوە توانیتان كاری تەجروبە كردن بهێنن بەسەر ئەم دوو مەتڵەبەدا:

یەكەم: بەوجود هاتن یان بەوجود نەهاتن مادە و ئینرژی لەنەبونەوە.

دووەم: چونەوە یان نەچونەوەی مادە و ئینرژی بەرەو عەدەم(نەبوون).

ئەگەر ئێوە توانیتان ئەو كارە كە پەیوەستە بە (قانونێكی عیلمی) لەم زەمینەیەدا ئەنجام بدەن، تاوەكو پێی بوترێت قانونێكی عیلمی، {ئەوە كارێكی




باشە و باوەڕی پێبکەن}، خۆ نەتانتوانیوە و هیچ کاتێکیش ناتوانن ئەوە ئەنجام بدەن دەی بۆیە هەرگیز نابێت بەمە بێژن یاسای زانستی(قانونی عیلمـی). جـا ئاگاتان لـەوە بێت لێرەدا هێشتا قسە لەوە نییە دروسـت یـان هەڵەیـە، واتـە نالێین(ئەم ڕاستە یان هەڵەیە)ئەمە تیۆرییەکە دەکرێت ڕاسـت بێـت دەکرێـت هەڵەش بێت، چاوپۆشی لـەواقیعییەتی مەتڵەب دەکەین و قـسە لەیـەك وشـە دەکەین ئەویش ئەوەیە بەم مەتڵەبە دەڵێین(یاسا)، ئـەوە هەڵەیـە پێـی بڵێیـت یاسا، چونکە(تیۆرییایە) و هیچ کات ناکرێـت بکرێتـە یاسـا، جـا ڕاسـتە یـان هەڵەیە ئەوە بەشوێنێکی تر و بەجێی خۆی.

زاتی بەکارهێنانی وشەی(یاسا)بـەو جـۆرە لـەجیاتی(تیۆریـا)هەڵەیـە، چـونکە قابیلی تەجروبە کردن نییە ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە یەقینیاتی تر لـەم لاوە هەیە کە مەبدەئی عالەم بەوجۆرە کە قورئان دەفەرمێت"دوکەڵ"ە و خوای گەورە دروستی کردووە، دروستکەری ئەم عالـەمە بەوجودی هێنـاوە ئـەویش لـە پلەی یەقیندایە، چونکە لـەهەموو لایەنێکەوە(یەقین)بۆ ئینسان کـە ئـەهلی تەحقیقە حاصڵ دەبێت بەوەی کەئەم قورئانـە لـە لایـەنی دروسـتکەری ئـەم ئینسانەوە هاتووە، کەزۆرێك لـەدەلیلـەکانی پەیوەستە بەو زنجیرە باسانەوەی تا ئێستا وتوومانە ئەو باسانەی تایبەت بوون بە(نوور و مردن و ئەشـیعە...).جـا ئەو باسانەی لـەم بارەیەوە لـە قورئاندا کراون دواتـر دەرکـەوتوون کـە بـەبێ کەم و زیاد ئەوەیە کە قورئان وتویەتی ئەم جۆرە باسانە ئاگادار کردنەوەیەکە بۆ حەقیانییەتی قورئان کە ناکرێت لـەلایەنی ئینـسانەوە نوسـرا بێـت، بـەڵکو لـەلایەنی ئەو دروست کراوەوە بوو کە شارەزایە لـەسەرەتای دروست بـوونی ئەم جیهانەدا! هەڵبەتە ئەمە مەسەلـەیەکی فەرعییـە و مەسـەلـەیەکی ئەساسـی

نییە لە قورئاندا ئەمەش لەبەر ئەو ڕازەی کە قورئان خۆی ئیشارەتی بۆ ئەکات کە﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾* بۆئەوەی لەئایاتدا ئەم نیشانانە دەرکەوێت ئەو ئینسانانەی وا گومانیان هەیە بە بۆنەی نوکتەی تازە تازەوە حەقانییەتی قورئانیان بۆ دەردەکەوێت، ئەگەرنا مەتڵەبی قورئان ئەوەیە ئینسان لە پووچی و خراپی بهێنێت بەرەو ئینسانی واقیعی و باش، ئینسان لەدەستی جاهیلییەت ڕزگار بکات و بیهێنێت بەرەو ئیسلام ئەساسیاتیشی لەم زەمینەشدا دیارە(١٤٠٠سالّ)کار کراوە لەمەودواش هەر کار بکرێت هەر ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر حەقانییەتی قورئان دەردەکەوێت! ئەم کۆمەڵە بەناوی(کۆمەڵەی قورئان) یەقینییە و مەتاڵیبی بەرجەستەیە و جێگەی شك و گومانی نییە! دەی ئێستا یەك شت وتراوە کە هیچ تیۆرییەك بۆ سەلماندنی یان نەفی کردنی نییە لەگەڵیدا، شتێکی تر وتراوە کە دەلیلی سەلماندنی لەگەڵدایە، ئەگەر وابێت ئەم باسەی یەکەم بێ ئیعتیبارە، ئەم باسەی دووەم کە دەلیلی لەگەڵدایە بە ئیعتیبارە، بۆ نمونە:دوو ئینسان لە (سەقز)ەوە هاتوون بۆ (تاران) کە لە (سەقز)دا مەتڵەبێك پێش هاتووە یەکێکیان بینیویەتی وەك فلانە ڕوداو تەقینەوە یان هەر شتێك ڕویداوە ئەم بینیویەتی ئەویتریان ئەمەی نەبینیوە و ئاگاداری نییە. ئەوەی کە هەواڵ و ئاگایی لێی نییە هیچ ئیعتیبارێکی نییە، بەلاّم ئەوەیان کە بینیویەتی و بۆتە یەقینی بۆی ئەوە مەبنایە و ئیعتیباری هەیە.

---

*) ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (٥٣) سورة فصلت




لەلایەكەوە عیلم دێت و باسی دروست بوونی یان دروست نەبوونی(مادە و ئینرژی) دەكات، باسی لەناو چوون یان لەناو نەچوونی(مادە و ئینرژی) دەكات، بەلاّم توانای ئەوەی نییە كە دەلیلێكی(موسەلەم – بەرجەستە)بهێنێتەوە تبقی قەواعیدی عیلمی دەری بخات كە وایە یان وانییە. وتیشمان هیچ كات ناتوانێت و توانایش نییە ئەوە بكات هەڵبەتە ئەوە لەبەرچاو بگرن مەسەلەی سەرەتای پەیدابوون و دروست بوون لەنەبوونەوە(عەدەمەوە) جیاوازە لەمەسەلەی بەرەو نەبوون(عەدەم) چونەوە! (دین)ئێژێ، بەرەو نەبوون ناچێتەوە، بەڵكو نەفی دەكات لە جاهیلییەتدا دەیان ووت بەرەو(نەبوون–عەدەم)دەچێت و نابورت دەبێت، بەلاّم قورئان مەسخەرەیان پێدەكات ئێژێ نابووت نابێت، بەڵكو موتەلاشی و شی دەبێتەوە ئەوە ئێوە وادەزانن نابووت دەبێت! بۆیە ئەم دووانە لەیەك جیاوازن ئەم یەكەیەكەیان بەو لایەنەدا هەماهەنگە لەگەڵ ئەو تیۆرییەدا كە (مادە و ئینرژی)نابوت نابێت لەدوای ئەوە كە دروست بووە، بەلاّم ئەویتریان كە دەربارەی سەرەتای دروستبوونییەتی جیاوازە لەگەڵ ئەم تیۆرییەدا ئێژێ بەوجود هاتووە! دەی شتێكی یەقینیمان هەیە مەتڵەبێكمان پێدەڵێت، شتێكی تریشمان هەیە كە ناتوانێت ئەصڵەن بگاتە ئەقین و مەتڵەبێكمان پێ بدات، ئەو كەناتوانێت بگاتە یەقین واتە ناتوانێت نەئەم لای نە ئەو لای سابت بكات ئەویتریان بەرجەستەیە و بەیەقینی دەڵێت ئەمیان ڕاستە.

جا نەتوانیت شتێك تەجروبە بكەیت و یەقینی پێ ببەخشیت بێ تەفاوتە، لێرەدا قسە لەسەر (زانا) نییە واتە فلاّنە زانا قسە دەكات و شتێك دەڵێت ئەمە غەیری عیلمە بۆ نمونە، (زانای دینی)شتێك دەڵێت ئائەمە غەیری

دینە(مەلا درۆی زۆر دەكات بەدەم دینەوە) جا مەلای بێ ئیمان نـەك مـەلای خوێندەواری بە ئیمان، ئەگەر خوێندەواریش نەبێت هەر بەئیمان بێـت باشـە. جا بۆیە قسەی زانا شتێكە و زانست شتێك، بیریارێـك دە بیریـان ئێـژن ئەمـە یاسایە، بەڵام عیلم ئێژێ ئەصڵەن ناكرێت ببێتە یاسا دەی جا شتێك ئەصڵەن ناكرێت نەئەم لای و نەئەو لای سابت بكرێت(باتـڵ)دەردەچێت. لـە ڕووی زانـستییەوە (مـساوی تَـرَفَینَ). زانـست ناتوانێـت ئەمـە ئـەزموون بكـات لەنەبوونەوە هاتووە یان نەخێر لەئەزەلـەوە هەبووە! بۆیە ناتوانێت ئـەوە دەرك بكات بۆیە ئیعتیباری نییە، بـەڵام ئـەمیان ئیعتیبـاری هەیـە و ئێـژێ لـەلایـەنی دروست كەرەوە دروست كراوە.

**مادە لـە نێوان وجود و توانایی حیات(ژیان) پەیداكردندا:**

{ئەوەی كەدەڵێن مادە وجود و خودی ژیانە وانییە، بەڵكو مادە شتێكە كەتوانایی پەیداكردنی ژیانی هەبە}،واتە توانایی ئەوەی هەیە نەك واتە وجودی هەیە، مادە حەیات نییە، بەڵام توانایی هەیە حەیات پەیدا بكات، ئەمە كە توانایی هەیە حەیات پەیدا بكات مانای ئەوە نییە واتە حەیاتی هەیە.
شەرائیتی موناسیبی بۆ پێش دێت ئیزافە دەبێت، بەڵام ئەمەش لـە بەدیهاتێكە (مادەی بە ئیزافە حەیات) شتێكی ترە غەیری (مادەی منها حەیات) ئەم شتە كە ئیزافە بوو خودی مادە نییە، چونكە مادەی (منها حەیات) واتە چی؟ واتە (مادە) مادەی بە ئیزافە حەیات، واتە غەیری مادە، بابەتی یەكەم تەنها مادەیە، بابەتی دووەم مادەی بە ئیزافە حەیاتە، بابەتی دووەم غەیری بابەتی یەكەمە.

ئەم بابەتی دووەمە، بریتییە لە بابەتی یەكەم بە ئیزافە شتێك، با بڵێین (مەوزوع) (بابەت) بە ئیستیلاحی فەلسەفی.

مەوزوعی یەكەم بە ئیزافەی شتێك، كە(حەیاتە)، بەڵێ مەوزوعی یەكەم توانای ئەوەی هەیە كەمەوزوعی دووەمی بێ‌ئیزافە ببێت، بەلاّم مەوزوعی دووەم خودی مەوزوعی یەكەم نییە، واتە (حەیات). حەیات خودی مادەكە نییە، مادە ئەهلییەت و توانای هەیە حەیاتی بێ‌ئیزافە ببێت، بەلاّم خۆ خودی حەیات نییە! بەڵكو حەیات شتێكە بە ئیزافەی مادە، لە مەوجودی زیندەیەكدا كە دوو دانە مەوزوع هەیە، هەم مادە هەیە، هەم حەیات هەیە. ئەمە كە دەبینیت مەوجودی زیندو هەیە، مەوجودی زیندوش واتە مادە بە ئیزافەی حەیات بۆ ئێمە دەردەخات كە خارج لە عالەمی مادە، ئیرادەیەك هەیە كە شتێك ئیزافە دەكات بە مادە، تا مادەی بێ‌حەیات دەبێتە مادەی بە حەیات! مادەی (منها حەیات) دەبێتە مادەی بە(ئیزافە حەیات)، و ئەوە كە ئیستیعدادی هەیە، مانای ئەوە نییە واتە خودی مادەكەیە، ئەو حەیاتەی وا ئیزافە دەبێت، واقیعییەت ئەمەیە كە بەو جۆرە تەوزیحمدا... شەیئێك، منها شەیئێكی تر (شتێك لەناو شتێكر تردا)، ئەگەر ملیارەها گۆڕان كاری بەسەردا بهێنیت تا ئەو شەیئەكەی تر لە خارجەوە ئیزافەی نەبێت، نابێتە ئەو شەیئە بە ئیزافە ئەو شەیئەكەی تر...

ئێمە بە مادە دەڵێین (أ)، ئەلف هەرچی ئینفیعال و گۆڕان كاری جۆراو جۆرە بەسەریدا بهێنە، تاوەكو لە خارجی (ئەلف)ەوە،(باء) ئیزافە نەبێت بۆی ناوێتە(ئەلف بەئیزافەی باء)، بەلاّم دەبێت (ئەلف) ئیستیعداد (ئامادەگی) وەرگرتنی (باء)ی ببێت. ئیزافە بوونی(باء) بە(ئەلف) یەك مەرحەلەیە خارجە

لەوەی كە(ئەلف) تەنها (ئەلف)ە كەیە، هەروەها ئەمە لە خاسییەتی خودی (ئەلف)دا نییە كە خۆی بكاتە (ئەلفا)بە (ئیزافە باء) نیرۆو قابلیەتی ئەمەی هەیە كە ببێتە (ئەلف بەئیزافە باء)، بەڵام خۆی نییە ببێتە (ئەلف بە ئیزافە باء) لە خۆیەوە نییە، خوێ نییە كە (ئەلف) دەكاتە (ئەلف)یش و (باء)یش، چونكە(ئەلف) بە هەزار و تەحەولات(وەرچەرخان) هەر(ئەلف)ە ئەوە كە ب(باء)ی بۆ ئیزافە دەبێت، وە بەڵێ لە پێشدا(ئەلف) ئیستیعدادی بیلقوەی هەیە بۆئەوەی(باء)ی بۆ ئیزافە ببێت، لەبەرئەوەیە كە ئیرادەیەك خارج لە (ئەلف) و (باء) هەیە كە (باء) ئیزافە دەكات بۆلای (ئەلف).

بۆ نمونە شەكر، با شتێكی بەرهەستی و زۆر سادەو بچكۆلە بلێین بۆ ڕۆشن بونەوەی قەزییەكە.

هەرچی تەحەولاتە بەسەر (شەكر)دا بهێنە، ئەگەر شتێكی دیكە خارج لە(شەكر) جا (هەوا بلێیت، یان گەرما بلێیت یان شتێك كە قابلی كۆنترۆڵ و تەشخیص بێت بۆ ئێمە یان قابلی نەبێت) تا شتێكی دیكە ئیزافە نەوێت بۆ (شەكر)، ناوێتە (شەكر) بە ئیزافەی شتێكی تر، مومكینە شەكرەكە كە شێوازی جیاواز پەیدا كات، بەڵام هەر ئەو ماهییەتەیە و نابێتە ماهییەتێكی تر بە ئیزافە شتێكی تر، مەگەر واقیعەن شتێكی تری بۆ ئیزافە ببێت،وەك (گەرما).

شەكر، بە ئیزافە (گەرما) دەبێتە شتێكی تر، یان ڕتوبەت(شێ)، (شەكر) بە ئیزافە (شێ) دەبێتە شتێكی تر. عەناصری جۆراو جۆرێك كە لەم هەستییەدا هەیە، چی ئێمە پێی بزانین چی ئێمە پێی نەزانین، شتێكی تر ئیزافە دەبێت بە شەكر، كە دەبێتە شتێك غەیری شەكر، ئەویە كە شەكر بە ئیزافەی شتێكی تر بێت. واقیعەت ئەوەیە كە شتێكی دیكە ئیزافە بووە پێی، بەڵێ شەكر

ئیستیعدادو توانای ئەوەی هەیە ببێتە ئەم شتەی ئەخیرە، كە شەكرەو ب
ئیزافەی شتێكی دیكە، بەڵام دەبێت ئەو شتەكەی دیكە ئیزافە ببێت تا ببێ
شەكرو بە ئیزافە فلأن .

مەجموعەی مادە موقایەسە بكە لەگەڵ ئەو نمونەی شەكرا، مەجموعە، وا
تەواوی مادده . مادە دەبینین (منها حیات)، مادە دەبینین (بە عەلاوە حەیات)
ئەم دوو جۆرە مادەیە دەبینین، وایە؟

لە ئەصڵیشا حەیات نەبووە لەم عالەمەدا، لە دەورانی (دوكەڵ) ئەوەی ك
لەئیستیلاحی عیلمی غیر عالمانە پێی دەڵێن (زەڕە)، وەلێ ئیستیلاحی قورئا
ئەوەسە كە پێی دەڵێن (دوكەڵ).

ئەو دوكەڵە ئەوەڵییە حەیاتی نییە، ئەم كورەی زەوییە لە سەرەتاوە دروس
بووە حەیاتی نەبووە، ئەم مادانەی كە دەیان بینیت لەم كورەی زەویەد
حەیاتیان نەبووە، لەو مەرحەلەی ئەوەڵەوە تا ئێستا مادەی بێحەیات دەبینی
بە مەنازری (شێوەی) جۆر جۆر، ئەم مادە لە كاتێكدا تەماشای دەكەی
حەیاتی بۆ ئیزافە دەبێت، ئەهلییەت و زەرفییەتی هەیە، {ئیستیعدادی} هە
(بل القوە) بۆئەوەی بێتە مادده بە ئیزاف حەیات، بەڵام واقیعییەت ئەوە
كاتێك دەبێت تەنها مادده نییە . ماددەیە بە ئیزافە حەیاتە، وە ئەم حەیا
خودی مادده نییە ئیتر، وە خودی مادده نییە بۆتە حەیات بەو قانونە سادە ك
دەڵێن (ئەلف) ناوێتە (ئەلف بە ئیزافە باء) تا واقعەن (باء)ی بۆ ئیزا
نەوێت، واقیعیەت ئەمەیە كە حەیات ئیزافە كراوە بۆ ماددەكەو ماددەك
دەبێتە (مادده بە ئیزافەی حەیات) بە ئیزافە بوونی حەیات مادەكە گۆڕاوە
مادەی بە عەلاوە حەیات، ئەمەش پیشان دەدات لە خارجی مادەدا ئیرادەیە

هەیە دێت ئەم شتە ئیزافە دەکات بۆ مادە، لەوەو دوا مەخلوقی زیندوی جۆر جۆر بە ئیزافەی حەیات بە ئیزافەی شعور بە ئیزافەی تەعەقول، بە ئیزافەی تەفەکور. بە ئیزافەی هەر شتێك کە لە ئینساندا دەبینیت. ئەمانە گشتی ئیزافە بووە خۆ خودی ماددە نییە بۆتە ئەمانە، چونکە ماددە ناوێتە ماددە بە ئیزافە شتی تر بەو جۆرە کە ڕوونمان کردەوە.

دەی ئەمە کە ئیزافەس لە ماددەو زەمینەی ماددە بووە چی پیشان دەدات بە ئێمە؟ پێمان دەڵێت کە ئیرادەیەك هەیە ئەم توانایيە لە مادەدا دەگۆڕێت بۆ فیعلییەت. ئێمە خۆ نازانین حەیات چییە، ئێمە تەنها ڕوواڵەتەکە دەبینین و قەزیە ڕۆشنە بۆمان، کە دەوینین دوو دانە کرم دانەیەکیان دروست دەکەین لە (مۆم) و دانەیەکیان کرمی ڕاستی، لە پاڵ یەکدا دایان دەنێین. یان دوو دانە نمونە بەرجەستە و دیار، کە(منها کە)زۆر گرنگترە لە (عەلاوەکە)، کۆمپیتەرو میکرۆبێك کۆمپیتەر زۆر دەزگایەکی موهیم و گرنگە بە زاهیر، میکرۆبەکەش شتێکی سادەیە، تەماشا دەکەین ئەم میکرۆبە ئەو شتەیە کە کۆمپیتەری لێ دروست بووە بە ئیزافە شتێکی تریش مادەیە بە ئیزافەی حەیات. ئێمە ئەوەندەی دیاری دەکەین، ئیتر حەیات چییە؟ خۆ عیلم ئەمە نازانێت. دەزانێت لە فلانە شەرائیتدا ئەم گۆڕانکارییانە بەسەر مادەدا دێت و ئەهلییەت و شایستەگی حەیات پەیدا دەکات، تەنها ئەمەنە دەزانێت. ئێمە تەنها ڕوواڵەتی دیاری دەکەین و ئەمەش شتێکی زۆر ئاسایی و ئاسانە، ئێمە دەبینین ئەو میکرۆبە شتێکە زیاتر لە ئەو کۆمپیوتەرە، واتە مادەی کۆمپیوتەری هەیە، کە خودی مادەیە، بەڵام بە ئیزافەی شتێکی تر ئەوەندە




مەحسوسە بۆ ئێمە (دەرکی پێ دەکەین)و کاریگەری و جێکەوتەی دیارە و ئاسایش دیارە.

بە هەر حاڵ مەتڵەبەکە بەدیهییە بۆ ئێمە هەرچەند توانای ناسینی دەقیقی پێ پەیدا نەکەین، مەتڵەبەکە چییە؟ حەیاتە، وجودی حەیاتە لە مەوجودێکی زیندودا ئەمە بەدیهیە بۆ ئێمە کە حەیاتی تێدایە، بەڵام ئیمکانی نییە ناسین و مەعریفەی دروست پەیدا بکەین بە حەیات و بزانین چییە!

تازە ئەگەر دەقیق تر بێژین ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ﴾* نەك حەیات، خودی مادە کە زەرفێکە حەیات قبوڵ دەکات ئیمکانی نییە بتوانین بە جۆرێکی نیهائی بیناسین!! (دەستدەکەیت بە گەڕان و ناسینی دەوروبەر) ورد وردە دەگەیتە مەلەکوتیەت، ورد بەرەوە دەگەیتە عونصورگەل و ورد بەرەوە بەرەوخوار دەبیتەوە دەگەیتە (ئەتۆم)و لەوەش وورد بەرەوە دەگەیتە (ئەلیکترۆن)و برۆ خوارەوە مەرحەلە لە دووای مەرحەلە. هەر وورد بەرەوە دەگەیتە جێگەیەك (نور)، هەر ئەوەندە دەیگەیتێ، بەڵام ئایا ئێمە دەتوانین بەجۆرێکی نیهائی خودی مادە بناسین؟ هیچ عونصورێك لە عەناصری مادە بەجۆرێکی نیهائی بناسین؟ بگەینە ئەو پەڕی مەعریفەت؟ ئیمکانی نییە و ئەم توانایيە بەبەشەر نەدریاوە. بەشەر توانای ئەوەی پێدراوە حەرەکەت بکات بەرەو بێنیهایەت. بەڵام نابێت بگەین، ئەگەر گەین بێنیهایەت ئیتر بێنیهایەت

---

*) اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ (٢٥٥) البقرة




نییە تازە!! (بێنیهایەت(بێكۆتایی) كاتێك بێنیهایەت، كە ئێمە پێی نەگەین، ئەگەر بگەینە بێنیهایەت واتە بێنیهایەت نییە!)

توانی حەرەكەتی ئینسان بە شێوەیەكی دیاری نەكراو دراوە، بەلاَم هیچ كاتێك گەشتن پێی نییە. مەبەست لە تەكامولْ (كاملْ بوون) پێگەیشتن نییە، ئەگەر پێیگەیشت ئیتر ئەوە موتەناهی بووە. هەر كاتێك تۆ گەشتیتە حەدێك ئەو حەدە ئیتر موتەناهییە لە كاتێكدا مەبەستەكە نا موتەناهییە، حەرەكەتە بەرەو نا موتەناهییە.

موتەناهی مەبەستەكەیەو ئینسان بەرەو لای دەڕوات، واتە بەشەر بەڕێگەوەیە بەرەو ناموتەنهایی دەڕوات، بەلاَم پێگەیشتنی نییە. جا مەبەستم ئەوەیە ئێمە ناتوانین تا ئەو پەڕ لە مەوردی هەر شتێك لە شتگەلی مادەو هەر عنصورێك لە عەناصری مادەدا بگەین. چ جای لە مەوردی حەیاتەوە!! ناتوانین بزانین حەیات چییە.

## لەبارەی ڕۆحەوە

ئەوەی لە حەیات گرنگترە (ڕوح)ە و ناشتوانین بزانین ڕۆح چییە! ئێمە تەنها دیاری دەكەین و دەڵێین ئەمە مادەیە زۆریش هەوڵ بدەین كۆمەڵێك شت لەبارەی مادەوە بزانین دیاری دەكەین لەم مادەدا(حەیات) چیە، بەپێی حەرەكەتەكەدا دیاری دەكەین لەم مەخلوقە زیندووەدا كە(مرۆڤە) مادەش هەیە، حەیاتیش هەیە، ڕۆحیش هەیە. ئەی ڕۆح چییە؟

ڕۆح: ئەو جیاوازی و ئیمتیازاتەیە كە مرۆڤ هەیەتی لەگەڵ باقی گیاندارگەلدا. سادە بیلێین بۆ ئێمە ناسینی حەیات ئاسان نییە، چ جای ناسینی (ڕۆح)!

لەسەرەتاوە باسمکرد، کە پێش لە حەیات ناسینی نیهائی مادەش مومکین نییە بۆ ئێمە. جا دیقەت بکەن ئێمە ڕۆح چۆن بناسین؟ ئایا تەعریفی بکەین، و تایبەتمەندی و موشەخەصاتی بڵێین؟ نا....تەنها دەتوانین کاریگەری دیاری بکەین، چۆن جیاوازی مەخلوقێکی زیندوو، لەگەڵ مەخلوقێکی بێحەیاتدا دیاری دەکەین ئەویش بە ڕواڵەت شتێکی عەینی و لەبەرچاوە بۆمانە، کە ئەم مەخلوقە حەیاتی هەیە بەم بەڵگانە، بەلاّم ئەو مەخلوقەکەی تر حەیاتی نییە، هەر بەو جۆریشە جیاوازی ئینسان لەگەڵ باقی گیاندارانی تردا دیاری دەکەین، دەبینین مرۆڤ کۆمەڵێك شتی دیکەی هەیە، ئەو ئامادەگیە عەجیبەی هەیەو لە باقی حەیواناتدا نییە، کە دەتوانرێت بە باری خاسیداو بە باری خراپی دا، بە سیفەتگەلی پۆزەتیڤ و بە سیفەتی نێگەتیڤ، کەم و زۆر بێ حساب{ئەنجامی بدات}و کاریگەری هەبێت. ئـــا ئەمە شتێکە کەئێمە لە مرۆڤدا دەیبینی و، کۆمەڵێکە کە مرۆڤ جیادەکاتەوە لە باقی گیاندارەکان. ئـــا ئەو مەجموعە، یان ئەو نیروە کە ئەم مەجوعە پەیوەستە پێیەوە پێی ئێژین (ڕۆح). ئەوە شتێکی زۆر بەدیهی کە ئینسان ڕۆحی هەیە، واتە ئینسان حەیوانە بە ئیزافەی شتێکی دیکە.

ئائێستا ئێمە مرۆڤ دەبینین جیاوازە لە گیاندارانی دیکە. ڕۆح چیە؟ ڕۆح: ئەو مەجموعەیەیە کە مرۆڤی جیاکردۆتەوە لە باقی حەیوانات. ئەساسەن لە تەعبیری قورئانیشدا لە زۆر شوێندا ئێمە دەیبینین . واتە (لوب) واتە (ئەرزشی ئەساسی). ڕۆحی ئینسان واتە ئەو شتە وا (ئەرزشی ئەساسی)هەیە بۆ ئینسان. لە فرە ئایاتی قورئاندا بە تەشریع و بە لوبی تەشریع دەفەرموێت (ڕۆح ). بە ئەرزشی گەورەی هەر شتێك مەسەلەن (گەرما) بۆ (ئاگر) ڕۆحە.





(روح فيها باذن ربهم من كل امر)ڕۆح لە هەرچی شتە. هەرچی شتە ڕۆحی هەیە. یان لوبی هەی. جا لوب و ڕۆح تەقریبەن وەك یەکن، واتە ئەوشتە وا ئەرزشی واقیعی ئەو شتەیە .

ئینسان ئەرزشە واقیعیەکەی وجودە مادیەکەی نییە، ئینسان ئەرزە واقیعیەکەی حەیاتەکە نییە شتێکی ترە لەسەرو ئەمانەوە، غەیری مادەکەو غەیری حەیاتەکە شتێکی تر هەیە، کە ئەوە ئەرزشی ئینسانە، ئەوە پێی دەڵێن (ڕۆح).

**دەربارەی مادە، مادە بە ئیزافەی حەیات، مادە بە ئیزافەی حەیات و رۆح:**

جا بابێینەوە سەر باسی سەرەتامان، ئێمە سێ جۆرە قەبیلەی گەورە دەبینین. دەستە بەندی بکەین:

قەبیلەیەك، کە هەر مادەیە بەبێ ئیزافەی هیچ شتێك .

قەبیلەیەك، کە هەر مادەیە بەە ئیزافەی شتێك، کە ئەو شتە پێیدەڵێین (حەیات) نازانین چیە، بەڵام کاریگەرییەکەی دەزانین.

قەبیلەیەك، مادەیە بە ئیزافەی ئەو شتەی وتمان پێی(حەیات) و نەمانزانی چیەو کاریگەرییەکەیمان بینی، بە ئیزافەی شتێکی تر کە(ڕۆح)ە، نازانین چیەو کاریگەری دەبینین. ئێمە ئەم سێ شێوەیە دەبینین .

ئەمانە (بالقوه) هەن، ئائەو (دوکەڵە) وا لە ئەوەڵەوە دروست بووە ئەو دوکەڵە توانای ئەوەی بووە، ئەو ئیستیعدادەی پێدراوە کە بۆ ڕۆژێك بگۆڕێت بۆ مادەی بە ئیزافە حەیات و بە ئیزافە ڕۆح ، بالفعلیش ئێمە ئەم سێ شێوەیە دەبینین.

بالقوە، واتە ئیستیعدادی بووە لێرەدا تەنها تەعبیرەكان دەگۆڕێن، ئەگینا بالقوە و ئیستیعداد یەكێكن. ئیستیعدادی بووە، واتە توانایی ئەمەی هەبووە، كە كاتێك كە شەرائیت جۆر بوو ئەم خەسڵەتییە پێ ئیزافە ببێت ئەم خصوصیەتەی پێ ئیزافە ببێت، بالقوەش لە ئیستلاحی (مەنتیقدا) هەر ئەم مانابیەی هەیە.

بۆیە لێرەدا دەگەینە ئەوەی هەر مەوجودێك شتێكە ئەو ئەرزشەی پێداوە و كردوویەتیە ئەو مەوجودە بە ئەرزشە ئا ئەوە (ڕۆح)ە. وەئیلا مەوجودەكە بە عینوانی مادە گشتی یەكێكن، فلآنە شت. نەوعی مادەیەو ئەو شتەكەی تر نەوعێكی مادەیەو ئەوی تر نەوعێكی تر، ئەمانە جیاوازن و بوونەتە چەند جۆرێك لەبەر خاتری كۆمەڵێك خەصڵەتە كە ئەمانەی جیاكردۆتەوە لە یەك ئەو كۆمەڵە خەصڵەتەی بۆتە مایەی ئەرزش دان بەم شتە ئەوە (ڕۆحی ئەم شتەیە).

ئەوەش لەسەرەتاوە لەكاتی دوكەڵەكەدا بوونی هەیە بە عینوانی ئیستیعداد (بالقوە) بوونی هەیە، نەك بە عینوانی (بالفعل)، واتە ئێمە (بالفعل) دەبینین ئەم شتە حەیاتی پەیدا كردووە وە دەشزانین كە ئەم شتە حەیاتی پەیدا كردووە، دووشت(مادە و حەیات)، ئەوەش دەشزانین (مادە)ی بێ حەیات، مادەی بە ئیزافە حەیات نییە-ئەمەش لە بەدیهییاتە — دەی ئێستا وەڵامی ئەم پرسیارە مادەی بێ حەیات چۆن دەبێتە مادەی بە ئیزافە حەیات؟

هەرچی لەناو مادەدا بگەڕێیت وەڵامی ئەمەت دەست ناكەوێت. وەڵامەكەش ئەمەیە: ئیرادەیەكی خارج لە مادە هەیە، كە هەروا مادەی خەلق كردووە، هەر بەو جۆرەش ئیستیعداد (بالقوە)ی ئەمەی پێداوە لە شەرائیتێكدا حەیاتی

پێ ئیزافە بکات، ئیستیعدادی پێداوە لە شەرائیتێکدا (بارودۆخێکدا) ئەوە وا پێی دەڵێین (ڕۆحی) ئینسانی بۆی ئیزافە بێت.

جا مەبەستم شتێکە ئێمە وشەی (ڕۆح) بۆ واتای(ئەخەفی) بەکاردەبەین بۆ ئەو شتە وا لەئینساندا هەیە و لە شتی دیکەدا نییە، ئەمە مانای (ئەخەفییە)، ئەوەش کە باسمکرد لەواتای گشتی ڕۆحدا باش تێبگەین، لەواتای گشتی ڕۆحدا بەو جۆرە وا لە قورئاندا باسیدەکات، واتە (لوبی)ئەرزشی ئەساسی هەر شتێك، بەڵام ئەم ڕۆحە تایبەتیەی کە لە ئینساندا هەیە جیاوازە لەو ڕۆحانەی کە دەڵێین ئەرزشی ئەساسی هەر شتێکە ئەوە تەنها لە لایەنی دەلالەت و مەفهومی لەفزەوەیە، ئەو تەعبیرە عامەی کە ووتم لەبەرئەوە بوو تێبگەین و زهنمان ڕۆشن بکاتەوە کە ئەمە وا لە ئینساندا هەیە بۆچی پێ وتراوە ڕۆح، چونکە ئەرزشی ئینسان ئا بەمەوەیە، بەڵام ئەمە کە ناوی نراوە ڕۆح مانایی ئەوە نییە واتە ئێمە توانای ئەمەمان هەیە بە بۆنەی ئەم ووشەیەوە، ئیتر مەعریفەت بە مەدلولەکەی پەیدا بکەین و بە تەواوەتی بیناسین، ...نا...زۆر وشەمان هەیە مەدلولی هەیە، مەدلولێك میقدارێك قابل دەرك بۆ ئێمە، بەڵام زۆرێکی غەیر قابلی دەرکە، مەدلولی عام و موشتەرەکی ڕۆح ئێمە دەزانین چیە، بەڵام مەدلولی خاسی ڕۆحی ئینسانی نازانین چیە، مەفهومە عام و هاوبەشەکەیە کە تەنها قابلی دەرکە بۆ ئێمە، ئەوەشە کە ڕوونمکردەوە هەر بۆ ئەمەبوو، بۆئەوە کە مەفهومی عامی ئەم وشەیە تێبگەن. بۆ دەرکی مەتڵەب بوو، کە ئەو تەعبیرە عامەی ڕۆحمان ووت، بۆئەوەی بزانن ئەمە لە عورفی دیندا چی مانایەکی هەیە. جا جۆری (ما صەدەقی) ووشەی ڕۆح لە ئینساندا لەگەڵ غیری ئینساندا ئاسمان تا زەوی بەینیان هەیە (جیاوازن لەیەك).

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش کە ئایا خودی ئیستیعدادات جۆرێك لە وجود(قوەتیان) هەیە، یان نا؟

وجود دوو مانایی هەیە، ئەگەر وجود بەمانای وجودی(بالفعل)بێت، کەچی زهنی بێت و چ خاریجی(واقیعی)، نەوەلاّ وجودی نییە و دیارنییە عەدەمە، خۆ ئەگەر بڵێین ئێمە هەر لە سەرەتاوە وجود تەنها بەمانای وجودی (بالفعل لێکبدەینەوە،کە دابەش دەبێت بۆ وجودی (زهنی) و وجودی خاریجی یان(واقیقی)، ئەوە هەر لەسەرەتاوە هەڵەمان کردووە! وجود ئاوادابەش مەکەن، ئەوە تەنها وجودی (بالفعل)ە قابیلییەتی دابەش بوونی هەیە بۆ ئەم دوو جۆرە وجودە(وجودی زهنی و وجودی واقیعی) لەسەرەتاوە وجود تەنها بەمانای (وجودی (بالفعل) مەگرن، بەڵکو گشتیتر(عامتر) بیگرن. ئێمە جۆرێکی دیکە وجودمان هەیە، ئەویش وجودی (بالقوە) ئەمەش لەبەرئەوەی (بالفعل)نییە ناتوانین موختەصاتی بڵێین، کاتێك شتێك فیعلییەتی پەیداکرد، چی زهنی و چی خاریجی (واقیعی) وجودێك ئابەو مانا خاصە دەتوانیت باسی موختەصاتی بکەین، بەلاّم کاتێك هێشتا پەیدای نەکردووە ناتوانیت موختەصاتی (عەدەم) بڵێین. بالفعل (عەدەمە) بە ئیعتباری بالفعل، بەلاّم بالقوە (وجودە)، واتە دەبێت لەسەرەتاوە ئەو دابەش کردنە مەنتیقیە لە زیهندا دەربکەیت کە دەڵێین"وجود، یان زهنییە یان خاریجیە (واقیعیە)"، خەریکن ئەم دوو جۆرە وجودە تەصەور دەکەیت، ئەمەش هەڵەیە .

لەسەرەتاوە بزانن (وجودی بالفعل) دەبێتە دوو بەشەوە:

١. وجودی زیهنی.

٢. وجودی خاریجی (واقیعی).

واتە، ئەمە وجودی بالفعلە دەبێتە ئەم دووانە، واتە ئەوە وا بە واقیعی هەبێت، چی لەزهنی ئێمەدا و چی لە خاریجی ئێمەدا(ئەمەش هەر جێگەی




قسه لەسەر كردنه)، چونكه وجودی زهنیش هەر وجودی خاریجیه هەر ڕیالیسته(واقیعیه)، چونكه لە كۆتایدا لەم عالەمەدا هەر هەیه، جا ئێستا درێژەی پێنادەم و دووری بخەمەوه.

ئایدیالیزمیش هەر ڕیالیزمه، جا لایەنی دیكه پەیدا دەكات، ئایدیالیزمیش دوو لایەن پەیدا دەكات :

**١. ئایدیالیزمی واقیع بینانه.**

**٢. ئایدیالیزمی غێر واقیع بینانەو (تەخەیولی).**

به هەر حاڵ با زۆر دوور نەكەومەوه ئەو باسه زۆر دوورو درێژوه .

قسه لەمەیه ئەوه وا لە مەنتیقدا تۆ دەیخوێنیت و دەیبینیت و (وجود) دابەش دەكەن بۆ دوو بوعود، یەكێك (زهنی) و یەكێك (خاریجی – واقیعی) ئەوه واتایەكی تایبەتی لە وجودی گرتۆتەوه كه وجودی(بالفعله)، لەسەرەتاوه لقێك لە وجود گرتووەو هاتووه دابەشی دەكات(تۆ بڕۆ پێش ئەم لقه، ئەگەر لەناو ئەم لقەدا كاربكەیت (ئیمكانی نییه (قوه) بدۆزیتەوه)، چونكه جۆری زهنی و خاریجی نییه، واته دەبێت بڕۆیته سەرەوەو ئەم لقه بەجێ بهێڵیت و بڕۆیته مانایی گشتی وجود.

جا لێره سەیر دەكەیت قابلی دابەش كردنه بۆ دوو لق:

١. لقی (وجودی بالقوه)، كه هەر یەكسانه به(عەدەم)، بەڵام نەك عەدەمێك لباسی(جل) وجود نەكاته بەر، عەدەمێك كه لیباسی وجود بكاته بەر.

٢. لقی (وجودی بالفعل)، جا وجودی بالفعل دەكرێته دوو بەشەوه:

أ- وجودی زهنی.

ب- وجودی خاریجی (واقیعی).





جا خاڵێك گرنگە هەیە نیسبەت بەم باسانەو گشت باسێکی دیکەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکەم، ئەویش ئەوەیە کە تەنها یەك وشە لەناو یەك ڕستەی دوورو درێژدا توانای ئەوەی هەیە سەر لەبەری مانای ئەو ڕستەیە بگۆڕێت بەجۆرێك کە ئەصڵەن بە تەواوەتی مانای یەکەمی ڕستە پێچەوانە بکاتەوە، لەباسێکی وەك باسی (وجود)دا، ئەگەر بوترێت"مادە زاتەن ئیستیعدادی هەیە بگۆڕدرێت بۆ شتێکی دیکە"، کاتێك دەڵێیت (زاتەن ئیستیعدادی ئەمەی هەیە) ئاگاداری وشەی (زاتەن) بە، ئەگەر بەو مانا بیڵێیت کە ئیرادەیەك خارج لە مادە بەشداری تێدا ناکات، واتە بە بێ ئیرادەیەکی خاریجی ئەم مادە توانای ئەوەی هەیە بگۆڕێت بۆ مادەیەك بەئیزافە شتێکی تر ئەمە غەڵەتە، زاتەن بەم مانایە غەڵەتە، ئەگەر (زاتەن) بەمانای ئەمەیە، واتە ئەم ئەهلییەتە(توانایە) دراوە بەم شتە، کە هەر کاتێك ئەم ئیرادە خاریجیە مەیلی بێت، مەسەلەن ئەو دارە سەوزە، دەڵێیت ئەم دارە (زاتەن) ئەهلیەتی هەس (توانای هەیە ببێتە پەنجەرە، لێرەدا مەبەستت چیە؟ ئەگەر زاتەن مەبەستت ئەوەیە بەبێ ئیرادەی خارجیەك ببێتە پەنجەرە قسەی غەڵەتتکرد، ئەگەر مەبەستت لەمەیە زاتەن ئیستیعدادی هەیە ببێتە پەنجەرە، ئەمە مانای ئەوەیە ئیرادەی خاریجیەك بەشداری تێدا بکات و بەشێوەی پەنجەرە دەریبهێنێت، بەڵێ ئەمە ڕاستە، ئەگەر ئابەو جۆرە ئیستیعدردگەل لە مەوجوداتی مادیدا، یان لەمادەی گشتیدا دەگریتە نەزەرو دەڵێیت (زاتەن) توانایان هەیە کە ببنە ئەم شتە جۆراو جۆرە بە ئیزافەی حەیات و هەر شتێك، و مەبەستیشت ئەوە نییە واتە خۆی بە تەنیا خۆی و بەبێ ئیرادەیەك خاریجی بتوانێت ببێتە ئەمانە، ئەمە قسەیەکی ڕاستەو بەو جۆرەیە، بەڵام ئەگەر مانای ئیستیعدادی (زاتی) لەم

مادەدا بۆ گۆڕانی بە شێوازی جۆر جۆر کە ئێستا هەن و بەوەی بزانین ئیرادەی خاریجی بەشداری تێدا نەکردووە ئەمە غەڵەتە، هەر وەك ئەو نموونەیەی کە ووتم، دارێك زاتەن ببێتە پەنجەرەیەك، ئەگەر بەم مانا بڵێیت ئیرادەی خاریجی بەژداری تێدا ناکات ....نا...!!

**جیاوازی نێوان ئیستعداد و مەصیرەکان لە نێوان ئینسان و شتەکانی دیکەدا:**

لێرەشدا پێویستە ئەوەش باس بکەم ئیستیعدادو مەسیرەکان لە نێوان ئینسان وشتەکانی دیکەدا جیاوازە، ئەگەر بێت و دەرك بەمە نەکرێت، ئەوە پرسیاری جۆر جۆر سەر هەڵدەدات، بەڵام گرنگە بزانین کە مەسەلە لە ئینساندا نوکتەیەکە، کە ئینسان جیادەکاتەوە لە (دروستکراوەکانی دیکە) لەو شتانەی غەیری ئینسانن، ئیستیعداد لە دروستکراوەکانی دیکەدا تەنها یەك مەسیری هەیە، بەڵام لە ئینساندا دوو مەسیر هەی﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾(٢)سورة الإنسان یان ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (٨) سورة الشمس. جیاوازی ئینسان لەگەڵ بارگەلی تردا ئەوەیە، کە مەوجودانی جیاواز سەیردەکەیت یەك مەسیری ئیستیعدادی هەیە، بۆیتە ئەو بارە... ئەو بارەکەی تری نییە، بەلام مرۆڤ وانییە کاتێك دەبێتە ئەم مەوجودە کە بریتیە لە مادەی بە ئیزافە حەیات و بە ئیزافە ڕۆح لە هەر بارێکدا تۆ بیلێیت دەتوانێت ئەم بارەکەی بێت یان ئەو بارەکەی بێت.

لە باری بەغی و بەخششدا، دەتوانێت ڕشد(گەشە) بێت، دەتوانێت سەخی بێت. لە باری تەعەلوقی زیهن بە واقیعییەتەوە، دەتوانێت نەزان بێت، دەتوانێت زانا بێت، لە باری پەزرشی واقیعیاتدا دەتوانێت(موئمین)بێت،

دەتوانێت (کافر)بێت، لە باری کاری جەستەییەوە، دەتوانێت دارتاش بێت، دەتوانێت دارتاش نەبێت، دەتوانێت وەستا بەنا بێت، دەتوانێت بەنا نەبێت، بە جیاوازی باقی مەوجودات کە ئیستیعدادیان یەك مەسیرییە، ئەوەڵەن ئەم چەند مەسیرییە، جگە لەم چەند مەسیرییەی، لێرەشدا(واتە لەم چەند مەسیریەشدا) دوو ڕێگەی هەیە، یان بەملا یان بەولا. ئەمە لە ئینساندا هەیەو دەبێت ئاگاداری بیت بە جیاواز لە هەموو مەوجوداتی دیکە.

## کات و شوێن لە دونیای (ڕۆح)دا:

لێرەدا دووبارە ئەوە ڕۆشنبکەمەوە لە بارەی (مادەو ڕۆحەوە) لەسەرەتاوە باسم کرد، کە شایەت هەندێك باس هەبێت لای خەڵکی ڕۆشن نەبێت و هەر ئەم ڕۆشن نەبوونەش بووبێتە مایەی کێشە بۆ دروستکردن و کۆمەڵێکی کەمیش لەناو کۆمەڵگەدا ئەمەیان کردبێتە سەرداو لە بەرامبەر موسوڵمانانەوە قسەی پێبکەن و کۆمەڵگەی پێ لابدەن، کە دەکرێت ئەو کەمینەیە بەتایبەت لەگەڵیان دابنیشرێت و قسەیان لەگەڵ بکرێت. دەربارەی زەمان و مەکان (کات و شوێن)لەلای مادەو ڕۆح جیاوازە، کاتێك (ڕۆح ئایدیالیزمی) بە تەنیایە زەمان و مەکانی بۆ نییە، بەڵام کاتێك بە تەنها نەبوو، لەگەڵ مادا بوو، کە ئائەمە –ئێمە بالفعل–هەین ئیتر بە بۆنەی ئەم تەرکیبەوە زەمان و مەکانمان بۆ هەیە، کاتێك ڕۆح لەناو ئەم جیسمە مادییەدا سنوری هەیە هیچ فەرقی نییە، هەر کاتێك ڕۆح لە جیسم چووە دەرەوە ئیتر شتێك بەناوی زەمان و مەکانەوە بوونی نامێنێت، زەمان و مەکان قەیدێکە حاکمە

بەسەر مادەدا، واتە مادەیەکە ناتوانێت بێزەمان و بێمەکان وجودی ببێت، بەڵام ماوەرای مادە ئەم قەیدەی نییە، ئەم نوکتەیە لە نەزەری خۆتاندا ڕۆشن بکەنەوە. ئێمە ناتوانین ڕۆح بەبێ پەیوەندی لەگەڵ ئەم جیسما تەصەور بکەین، چونکە نایناسین، هەروا کە حەیات بەبێ پەیوەندی لەگەڵ جیسما تەصەور بکەین چونکە نایناسین، هەروەها ئەوەی کە بتەوێ لێکۆڵینەوە لە ئەحواڵی ڕۆحت، جیا لە جیسم بکەیت، بەهیچ جۆرێك ناتوانیت، ئەمە ئەصلێکە ڕۆشن کە قەیدی زەمان بۆ مادە مەترەحە، ئەگەر شتێك غەیری مادە بوو ئیتر قەیدی زەمانی بۆ مەترەح نییە، ئەمەش ڕۆشنە، بەڵام ئەوەی چۆنە ڕۆح توانای ئەوەی هەیە لە قەیدی جیسم خاریج بوێت تا زەمانی گەرەك نەوێت؟ ئەمە قابیلی دەرك نییە بۆ ئێمە، دەرکێکی عیلمی، لێرەدا دەرکی فەلسەفیمان هەیە، هەروا کە مادە ناتوانین بە جۆرێکی زانستی بناسین، دەتوانین بە جۆری فەلسەفی بزانین مادە چییە، نەك بە جۆرێکی عیلمی، مەحاڵەو ناتوانین بە جۆرێکی عیلمی بگەینە ناسینی مەعریفەتی نیهائی نیسبەت بە مادە، بەڵام بە جۆری فەلسەفی دەزانین.

ئەم بابەتەو زۆرێك لە بابەتەکانی تر بە جۆری فەلسەفە قابلی دەرکن بۆ ئێمە، نەك بەشێوەی ئازمایشگا (تاقیگە)، چونکە ئەگەر دەرکی فەلسەفی لە ئینسان بسەنیتەوە دەبێت هەمیشە ئازمایشگا بە کۆڵییەوە بێت، بێتاقیگە دەبێت لە هیچ شتێك حاڵی نەبێت، لە کاتێکدا دەزانین بۆ کەم شتە ئێمە تاقیگەمان گەرەکە، بۆ هیچ شتێك پێویستمان بە تاقیگە نییە. تاقیگەکە زهنی خۆمانە، ئەوەیە پێی دەڵێین:(دەرکی فەلسەفی). لەوەودواش ئەصڵەن برۆ تاقیگەکەش برۆ مادی ترین تاقیگاش لەوێش دەرکێکی فەلسەفی نەکەوێتە

كار، دەركی عیلمی تەحەقوق پەیدا ناكات، چونكە حەیوان ببە تاقیگە بزانە شتێك حاڵی دەبێت، كە تۆ حاڵی دەبیت، نا.... بۆیە مەبەستم ئەوە بوو ئێمە بەشێوەی فەلسەفی دەتوانین ئەمە دەرك بكەین كە غەیری مادە پێویستی بە (كات)نییە، قەیدی (كات) حاكم نییە بەسەریدا، هەروا كە قەیدی مەكان(شوێن)یش حاكم نییە. بەكورتی لە ماوەرای، مادەدا شتێك بە ناوی (شوێن و كات) وجودی نییە، ئەوەش كە دەڵێین ئێمە ناتوانین ماوەرای مادە بناسینو توانای ناسینمان نییە،لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەوە بین، كە دەوترێت ڕۆح ناناسین لەبەر ئەوە نییە، كە ڕۆح ئەو خەصڵەتە غێر قابلی ناسینەی هەبێت، واتە ڕۆح خەصڵەتێكی هەیە ئێمە ناتوانین بیناسین، نا بەڵكو ئێمە مادەش ناناسین، حەیاتیش ناناسین، كاتێك تۆ مادەو حەیات نەناسیت دیارە كە ناتوانیت ڕۆحیش بناسیت. جا بۆیە ئەو تەصەوراتانەی ئێمە هەمانە لەبارەی ڕۆحەوە، هەرچییەك دێن بە زهنماندا لە كارو چالاكییەكان سەیر دەكەیت زەمانی لەگەڵدایە لەبەر ئەوەیە لەبارەی خودی (ڕۆح) بە تەنها نییە، بەڵكو جەستەش –مادە– شی لەگەڵدایە، بەڵام كاتێك ڕۆح تەنها كرایەوە كەوتە دەرەوەوی ئیرادەی خۆمان، جا لەوكاتەدا چونكە مادە نییە –كات– مانای نامێنێت، لە كاتێكدا چونكە زهنی ئێمە خۆی بریتیە لەمادەو ڕۆح و لەوان پێكهاتووە، دووبارە حاڵەتێكی زەمانی پەیدا دەكاتەوە. جا بۆیە ئائەم تەصەوراتە كە ئێمە هەمانە لەبارەی (ڕۆح)ەوەو هەرچییەك دێت بە زهنماندا لە كارو چالاكییەكانی سەیردەكەیت زەمانی لەگەڵدایە، لەبەرئەوەیە بەتەنها لە بارەی خودی(ڕۆح)ەوە نییە، لەبەرئەوەیە زهنمان لە جەستە(مادە) و ڕۆح پێكهاتووە و بۆمەجالی مادییەكەی زەمان مەترەحە، بەڵام دەكرییەت ئەو

**كاتەی (رۆح) لـە ئیرادەی خۆماندا نامێنێت و لـێمان وەردەگیرێتەوە شتی تر ڕوودەدات، چونكە كاتێك ئێمە (بیردەكەینەوە) ئەم بیركردنەوەیە بە ئیرادەی خۆمانە و رۆح و مادەش تێیدا بەشداری دەكەن، بۆیە لێرەدا بەم مایە رۆح لـە ئیرادەی خۆماندایە، بەڵام كاتێك لێمان وەردەگیرێتەوە و خارج لـە ئیرادەی خۆمان مومكینە (رۆح) تەنها بكرێتەوە و موجەرەد بكرێتەوە {لـەدەرەوەی مادە}، جا كاتێك وایلێكرا مادەم لـەدەرەوەی ئیرادەی خۆمانە ئیتر زەمان مانایی نامێنێت، بەڵام لـە كاتێكدا لـە ناوئێمە و زهنی ئێمەدایە دووبارە دێتەوە ژێرباری قەیدی زەمانەوە!**

# باسی پێنجەم:
# لە نێوان ئێرە و ئەوێدا

ناونیشانی ئەم باسە لە ڕاستیدا بریتییە لە (حور و غیلمان و ویلدان)، كە دەزانین سێ ناون لە قورئاندا هاتوون و بریتین لە جۆرێك لە دروستكراوی خوای گەورە لە بەهەشتدان و تایبەتن بە موسوڵمانان و وەك پاداشتێك بۆیان ئامادەكراوە لەپای ئەو كردەوە چاكانەی كە لە دونیادا ئەنجامیان داوە، بوڵام ئێمە لەئێرەدا ناونیشانەكەمان گۆڕی، چونكە بەڕاستی لەم باسەدا (كاك ئەحمەد) وردەكاری و سرنج و تێبینییەكی زۆر تایبەت دەربارەی جیاوازییەكانی ئەم ژیانی مادییەی كە ئێستا ئێمە تێیدا دەژین، لەگەڵ ژیانێكدا كە بە نیسبەت هەر تاكێكمانەوە بە بێئیختیاری خۆمان ڕووبەڕوو بۆی دەڕۆین و ڕۆژانە كەسەكانی دەوروبەرمان پێی دەگەن! هەربۆیە مەبەستمان لەو ناونیشانە (لە نێوان ئێرەو ئەوێدا) ئەم ژیانە و ژیانی بەرزەخ و قیامەت و بەهەشتە. دەتوانم ئەوە بڵێم هەركەسێك ئەم باسە و باسەكانی پێشتر كە دەربارەی مەسەلەی (مادە و ووزە)كراوە، بەوردی بیخوێنێتەوە بە كۆمەڵێك حەقیقەت و قەناعەت دەكات دواجار دەبێتە دەروازەیەك بۆی لە زۆر گومان و ناڕووی ڕزگاری دەكات! ئەوەی (موفتی زادە) لەم باسانەدا وروژادویەتی لەكۆی گشتیاندا بەرچاوڕوونیەكە دەربارەی ژیانێك كە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەكانیدا باسی كردووە، بەڵام بۆمان ڕوون نییە، پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین

فەرمودەدا دەربارەی قیامەت و ژیان لە بەهەشت قسەی كردووە و باسی حاڵی جەهەنمییەكانی كردووە، بەڵام زۆرێك لەو فەرموودانە ئەگەربێت و كەمێك لەسەری ڕابمێنین دوچاری سەرئێشەو تێنەگەیشتنێكی زۆرماندەكات! بە تایبەت ئەو فەرموودانەی باس لە شەوڕەوی(ئیسراو میعراج)دەكەن، لە شوێنیكدا دەفەرموویت بە (بیلالی حەبەشی) "گوێم لە تەقەی نەعلەكانی بیلال بوو لە بەهەشتدا". لە شوێنێكدا دەفەرموێت "جەهەنمیان پیشاندام"، یان ئەو فەرمودانەی باسی بەهەشتداكەن، بۆنمونە دەفەرموێت"لەبەهەشت جوتیارێك بەیانی گەنم دەچێنێت و ئێوارە دەیدورێتەوە"! چەندین فەرموودەمان هەیە كە باس لە گەورەترین گۆڕانكارییەكان دەكەن كە لەدوای مردن بەسەر مرۆڤدا ڕوودەدەن، و باس لە جیاوازی ئەم دوو ژیانەدەكەن. لە فەرمودەیەكدا هاتووە ئەستوری پێستی دۆزەخیەكان سێ ڕۆژ ڕێگایە! یان ناسكی ئافرەتانی بەهەشت، یان گەورەی فریشتەكان، یان جیاوازی ئاگری دونیا و ئاگری دۆزەخ، جیاوازییەكان زۆرن دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو فەرمودانەی دەربارەی بەهەشت و دۆزەخ و قیامەت و ئیسراو میعراج هاتوون. هەردوو ئیمام لە صەحیحەكەیاندا بە سەنەدی خۆیانەوە لە قەتادەوە، لە ئەنەسی كوری مالیكەوە، لە مالیكی كوری صەعصەعەوە لە فزەكەشی هی بوخارییە ڕیوایەتكراوە كە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەو شەوەی بۆ كردون كە شەوڕەوی پێكراوە، بۆنمونە دەفەرموێت "وڵاخێكی سپییم بۆ هێنرا كە لە ئێستر بچوكتر و لە گوێدرێژیش گەورەتر بوو، جاروود لێی پرسی (بوراقە ئەی ئەنەس؟)





ووتی بەڵێ، تاكوێ چاو بڕ بكات بە هەنگاوێك دەیگاتێ"[1]. ئالێرەدا دەتوانرێت ئەوەی لێ فەهمبكرێت كە تایبەتە بە مەسەلەی كات و جیاوازی كات لە نێوان ئەم دونیا و ئەو دونیادا! كە بەبڕوای ئێمە ئیمكانی نییە بتوانرێت تێگەیشتنی ورد و قوڵ لەبارەی جیاوازی نێوان ئێرەو ئەوێوە بزانررێت، ئەگەر بێت و دەربارەی كات و فەلسەفەی كات نەزانرێت. جەوهەری جیاوازی نێوان ئێرەو ئەوێ بریتییە لە (كات)، قورئان لە دوو جێگەدا باسی ئەو جیاوازییە دەكات، كە لەیەكیاندا دەفەرموێت (خمسين الف سنه) لەویتریاندا (الف سنه)، جا مامۆستا (ناصری سوبحانی) دەفەرموێت ئەو ژمارانە بۆ (تَكثير) نەك (تَحديد)[2]، واتە بۆ ئەوەیە پێمان بڵێت ڕۆژەكانی قیامەت جیاوازن لە ڕۆژی ئەم دونیایە و زۆر زۆرە نەك بە دیاریكراوی (پەنجا هەزار ساڵ)، ئەو دەفەرموێت ئەمە بەلاغیە و وەك ئەوە وایە بڵێیت "لەو شەقامەی ئەوبەرەوە (١٠٠٠) كەس وەستابوو"، خۆ تۆ نەچویت بیان ژمێریت و ڕێك هەزار كەسبێت، بەڵكو مەبەستت ئەوەیە قەرەباڵغییەكە زۆرە! یان لە فەرمودەیەكی صەحیحی موسلیمدا هاتووە، كە میقدادی كوڕی ئەسوەد بۆ سەلیمی كوڕی عامری گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی "لە ڕۆژی قیامەتدا خۆر لە خەڵكی نزیك دەبێتەوە تا بەندازەی میلێكی دەمێنێت بۆی"[3]، ئەوەی لێرەدا دەردەكەوێت ئەوەیە، سەرەتا ئەوە ئیمكانی نییە ئەم خۆرەی ئێستا بێت، چونكە (سوبحانی) وتەنی خوای گەورە لە

---

[1]) حەبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، ٢٠٠٧، چاپخانەی مەهارەت، تهران

[2]) مامۆستا ناصری سوبحانی: مونازەرەی عیلمی، سیدی تۆمار كراو.

[3])زكی الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي المنذري: پوختەری صەحیحی موسلیم: و.لیژنەیەك، بەرگی دووەم،٢٠٠٧.

قورئاندا دەفەرموێت ئەم خۆرە و زەوی و مانگیش دەدەین بەیەكدا! كەواتە خۆرێكی دیكەیە و مرۆڤەكان جۆرێكن كە بەرگەی ئەوە دەگرن خۆر تا ئەو ئەندازەیەش لێیان زیك بێتەوە و تەنها عارەق بكەن نەك بسوێن و نەمێنن! لە ڕاستیدا زۆرن ئەو بابەتانەی جیاوازییە وردەكانی ئێرە و ئەوێ پیشاندەدات، ئێمە لەم بابەتەدا دەروازەیەك دەخەینە ڕوو لەم ڕێگەیەوە دەكرێت مانایەكی قوڵ و فەلسەفی تر ببەخیشنەوە بە ئایەت و فەرمودەكان و ئەو نارونییەی دەربارەی ژیانی بەهەشتی و دۆزەخییەكان هەیە بۆ تێگەیشتنی ئاسانتر بكەین، چونكە لە مێژە خەڵك سەرقاڵی ئەوەیە، كە ئاخۆ چۆن بكرێت من بە هەمیشەی لە بەهەشتدابم لە ناو ناز و نیعمەت و خۆشی و بێتاقەتیش نەبم! دەبێت ئاگامان لەوەبێت قسە لەسەر ئەوەیە بۆ هەمیشەی، واتە ئەوسەری نییە و چاوەڕێی مردنیش ناكەیت!جا لەم بارەیەوە زۆر بیرو ڕا خراوەتە ڕوو، بەلام ئەوەندەی من پێی گەیشتبم تاوەكو ئێستا هیچ بیریارو فەیلەسوفێكم نەدیوە و نەم خوێندۆتەوە هێندەی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بتوانێت ژیرانە و لۆژیكیانەتر قسە بكات و لێكدانەوە بۆ ئایەت و فەرموودەكان بكات و باسەكان لە دونیایی عەقڵ نزیك بكاتەوە. ئەوە ئەوە فێرتدەكات لەسەر ڕوودا و بابەتەكان هەڵوێست بكەیت و ڕێگە نەدەیت شتەكان لەدەرەوەی تێگەیشتن بسەپێنرێن. ئێمە لێرە بەدواوە واز لە قسە كردن دەهێنین و گوێ بۆ (موفتی زادە) شلدەكەین، بزانین ئەو دەربارەی ئەم باسانە چی لە هەبگەیدا هەیە!

## جیاوازی ئەم دونیایە لەگەڵ ئەو دونیادا

بۆئەوەی حاڵیتان بوێت، مەعنای (حور و غیلمان) چییە؟ ئەساسەن خۆیان چین لەقیامەتدا؟ ئیحتیاج هەیە بەوەی، كە جیاوازی ئەم دەورانە لە حەیات، لەگەڵ ئەو دەورانەی دواتردا(بەرزەخ و قیامەت)میقدارێك بزانین. بەو جۆرە لە قورئاندا لەبارەی قیامەتەوە حاڵیمان دەبێت، قیامەت هەروەك پەیدا بوونی ئەوەڵی ئەم هەستییە(ئەم جیهانی بینراوە) دەورانی جیاوازی هەیە. یەك دەورە نییە، بەڵكو دەورەگەلی جیاوازی هەیە.

ئەوەڵین دەورە لە قیامەت ئەمەیە، هیچ هێزێك(نیرو)ی لە ئەم جیهانی (مادە)دا نامێنێت، غەیری یەك هێز(نیرو) نەبێت، كە عیبارەتە لە نیروی(حەرارەت) هێزی گەرمی. لەئەوەڵەوە قورئان دەفەرمێت"كە هەستی بەشێوەی (دوكەڵێك) بەوجود هاتووە، واتە مادەیەك ڕەقیق و لەتیف و پەراگەندە بە یەك دانە نیرووەوە كە عیبارەتە لە نیروی حەرارەتی، لەوەودوا ئەم هەستییە بە نیزامێك كەخوای گەورە دایناوە بۆی، گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە كە ئەوەتا بیریاران هەندێكی لەم بارەیەوە كەچۆن حەرەكەت پەیدا بووە لە هەستیدا و گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە و شتی جۆرا و جۆر دروست بووە نەزەرییەگەلێكیان داناوە، جا ئیتر پێویستمان بەوە نییە بێژین ئەو نەزەرییاتانە چین و چی ڕاستە و چی ناڕاستە، بەشێوەیەكی گشتی لەسەرەتاوە بەشێوەی ئەم دوكەڵە دروست بووە، لەوەودوا هاتووە تا ئەم قۆناغەو لەئاخرەوە﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ﴾* ئەوەڵی ئافەرینیش، دەفەرمێت، چۆن

---

*) {يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاء كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ } الأنبياء١٠٤

بووە چۆن بە وجودمان هێناوە دووبارە دەیبەینەوە سەر ئەو حاڵەتە،بەم کەیفییەتەیە کە هەرچی نیرووە لەناو دەچێت، بینا لەسەر ئەمە بەشانێك کە لێستا بە شێوەگەلێکەوە وجودیان هەیە هیچیان بەم شێوەیە بوونیان نامێنێت، نەك بێژین تەنها(مەنضومە) هەسارە گەورەکان لەناو دەچن، نەك بێژیت تەنها کورەگەل و ئەستێرەگەل لە مەداری (خولگەی) خۆیان لادەدەن ولەناو دەچن، لەوانیشە فرە بچوکتر. هەتا (ئەتۆمەکان)یش لەناو دەچێت! ئەتۆمەکانیش لەسەر ئەو شکلّ و خصوصیاتانەی کە هەیانەنامێنن. ئەلکترۆنگەل لە خولگەی خۆیان دوور دەکەونەوە، چونکە نیروی فرە فرە گەورە هەیە کە ئەتۆمێك چاودێری دەکات، ئەلکترۆنگەل دانە و دووان و سیان هەرچەنێك بێت ئەوەتا بەدەوری ئەو هەستییەی خۆیەوە و لەمەداری خۆیدا دەگەڕێت، لەئەو مەرحەلەی ئەوەڵەوەی (قیامەت)دا هیچ نیرویەك نامێنێت، جگە لەنیروی حەرارەت، ئەگەر وابێت هەتا دانەیەك ئەلکترۆن ناتوانێت لە خولگەی هەستی خۆی بمێنێت،گشتی لەناو دەچێت، جا لێرەدا ئیشارەت بکەم بە نوکتەیەك، لەچەند ئایەتێك لە قورئاندا لەبارەی (دەریاکانەوە) کەدەفەرمێت﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ (٦ سورة التكوير) ئەوە مەرحەلەی ئەوەڵی قیامەتە، کە دەریاکان دەبنە بڵێسەی ئاگر، مەبەست ئەوە نییە واتە گەرم دەبێت و ئاو داخ دەبێت، نا... ئەصڵەن (ئاو) دەبێتە شتێکی تر، دەریا ئیتر ئاو نییە، بڵێسەی ئاگرە، ئەمە مەسەلەیەکە زۆر تازە ماناکەی زانراوە، چەند ساڵ لەمەوبەر هیچێکمان نەدەزانی، ئەمە یانی چی! بەڵام لەوەودوا لەمەتاڵەعاتی عیلمیدا سەرنجی ئەمەماندا کە بۆمبێکی(هایدۆجینی)

کاتێکە دەتەقێتەوە، چی فعل و ئینفعالاتێك دروست دەكـات! ئـەو قودرەتـە گەورە ئاگرینە لـەچی دروست دەبێت؟ بەشێوەیەکی سادە بێژین ئەلکترۆنگەل لـەدەوری هەستەکانیان(خولـگە)دوور دەکەونەوە، ئەم جیابوونەوەیە لـەدەوری هەستیدا بەئەندازەیەك نیرۆ وجـودی بـووە وردەوردە گـشتی دەکاتـە نـیرۆی حەرارەت، ئەگەر وا بێت (ئاو)داخ نابێت ئاو دەبێتە ئـاگر، دەبێتـە بلێـسەی ئاگر ئێستە ئەمە مەعلومە.

هەربەو جۆرە باقی ئەتۆمگەلی زەڕاتی هەستی تەواوی زەڕاتـی عالـەمی مـادە، گشتی بەوجۆرە تێکدەچێت و تەنها ماددەکە دەمێنێتەوە بەشێوەی دوکـەڵێك لـەگەڵ ئەو ئینرژییە حەرارەتییە. جالێرەدا ڕوونکردنەوەیەك بـدەم ،کـە عـیلم ئێژێت (گاز) ئەوە دەورانی ئەوەڵی دروست بورنـە لـەگاز ناودەبـەن، بـەڵام قورئان دەفەرمێت، (دوکەڵ) ئەم دووانە کامیـان زانـستی تـرە؟ کـەمێك ورد بنەوە لـەمەوپێش وتمان مادە دەمێنێتەوە تەنها بەیەك ئینێرژییەوە ئەویش ئینێرژی حەرارەتی. جا (گاز) مانای حـەرارەتی لـەگەڵدانییـە، بـەڵکو دوکـەڵ مانـای حەرارەتی لـەگەڵ دایە بۆیە دەبینیت تەعبیری قورئان عیلمیە و ڕاستە!!

مەرحەلـەی ئەوەڵی قیامەت ئەمەیـە. (ئەڵبەتـە ئـەویش دەورانـی موختـەلیفی هەیە). لـەتەقینەوەی سەرەتاوە تادەگاتە ئـەو قۆناغـەی کـە دەبێتـە (دوکـەڵ) دەورانی فرە تولانی دەبڕێت، گـۆڕانی جۆراوجۆری بەسـەردا دێـت، بـەڵام بەشێوەیەکی گشتی تەماشای بکەین ئەم کۆمەڵە تا کاتێك دەبێتـە(گـاز) پێـی ئێژن دەورانـی ئـەوەڵ و مـاددە بەتـەواوەتی لەبەین چـووە، بـەڵام بەگـشتی هەستییەك کە دووبارە دروست دەبێتەوە یـەك دانـە ئـەتۆم ئالـەم ئەتۆمانـەی کەبەشدارن لـە دروست کردنی ئەم عالـەمی ئێستامان وجودی نییە! کەبێـژین

ەوە دەبێتە بنەما بۆدروست بوونی زەڕاتی جیهانی مادده لە ئەتۆمیش
چوکترە، وەختێك بەوجود دێتەوە، چۆن بەوجود دێتەوە؟ بەتەشکیلێکی
ەوە، چونکە ئەگەر ئەتۆمەکان بمانایە بەساقی، ئیحتمالی هەبوو تەصەور
کەین دووبارە عالەمی مادده تازەبوونەوەیەك پەیدا بکاتەوە بەمیقدارێك
یبەتمەندی ئەم دەورانەوە کەئێستا هەیەتی، ئەڵبەتە نەك سەد دەر سەد،
ونکە تەرتیبی ئەتۆمەکان دەزانین، کەئەم گشتە شتە گەورەیە لێی دروست
ەبێت، بەلاَم ئەگەر بەهەرحاڵ ئەتۆمەکان ساق بمانایە، مومکین بوو ئێمە
ەصەور بکەین هەستی دوای ئەوەی تێکدەچێت و دووبارە دروست دەبێتەوە
بقدارێك لەیەك چوونی هەیە بە هەستی ئەم دەورانە، بەلاَم ڕاستییەکەی
ەوەیە کە هەتا یەك دانەش ئەتۆم نامێنێت!

یە لە بیناوە تەرکیبی مادە فەرق دەکات. فەرق و جیاوازییەك کەلە تەرتیبی
ەورانی دووەمی هەستیدا هەیە نسبەت بەئەم دەورانە ئەوەڵەی ئێستای
یهان، لە قورئان و سوننەتدا ئێمە حاڵیمان دەبێت، ئەمەیە کە تەرتیبی فعلی
الەمی مادە تەرتیبێکی هەیە، بە دەربرینە فەلسەفییەکەی تەرتیبی(کەون و
ساد) یان (بەوجود هێنان و لەناوچوون) ئەمە تایبەتمەندی فعلی عالەمی
ادەیە، دوای ئەوە ئاوا لە ناوچوو بویە دوکەڵ ئیرادەی خوای گەورە کاتێك
روستی دەکاتەوە بەجۆرێك دروستی دەکاتەوە ئەم خاسییەتەی نییە. واتە
اسییەتی (کەون و فەساد) یان (بەوجود هێنان و لەناوچوون) نییە،
اسییەتی تەرکیبی مادیی لەدەورانی دواتردا خاسییەتی (بەقا)یە، ماندوەیە.
م خاسییەتی تەغیر و تەحەولاتە مەعلولی تەرکیبی فعلی ماددەیە. مادده وا

دروست بووە هەر لەسەرەتاوە(لە ئەتۆمەكان)ەوە كە ئەم دەبێت ئەم تایبەتمەندییەی هەبێت،كە تەغیر بكات و دروست بێت و لەناو بچێت، بەلاّم ئەمجارە بەجۆرێك دروست دەكرێتەوە كەئیتر خەصڵەتی لەناو چوونی نییە!

ئەمە یەك جیاوازی كوللی لەئەو مەرحەلە لەپەیدا بوون، لەگەڵ ئەم مەرحەلەدا، كە لەدەورانی دوكەڵەوە ئەم مەرحەلە دروست بووە بەم خصوصییەتی تەغیرەوە، بەلاّم لە دەورانی دوكەڵی بەعدییەوە{واتە لە قیامەتدا} هەستی بەوجود دێتەوە بەم خصوصییەتەوە كە تەغیری نییە. جا دوای ئەوە ئەم نوكتەیەمان زانی تەفاوتی حەیاتی ئینسان، لەدەورانی دواتر لەگەڵ ئەم دەورانەدا دەرك دەكەین و حاڵیمان دەبێت...

## جیاوزای ژیانی ئینسان لە هەردوو دونیادا:

خەصڵەتێك لەژیانی ئینساندا لەم دونیا هەیە، بەتەناسوبی ئەصڵی (تخزیب) عیبارەتە لەوەی هەرلەبەرەوە چینێك موتەوەلید دەبێت و گەورە دەبێت و دەڕوات و چینێكی دیكە دێت، بەقایی جۆر لەهەستیدا بەم كەیفییەتەیە، جۆرەكانی گیاندارگەل بەم جۆرە بەقایان هەیە، كەئەمەیش بەبۆنەی یەك خەصڵەتەوە تەعین بووە كە خوای گەورە داینــاوە لەناو گیاندارگەلدا كەئەویش خەصڵەتی (غەریزەی جنسییە)، بەبۆنەی غەریزەی جنسییەوە نائاگاهانە بێئیرادە و ئیختیاری گیاندارگەل لە وجودی گیاندارگەلدا هەیە، هەرلەبەرەوە وەچەی تازە موتەوەلید دەبن. كاتێك وەچەیەك لەناو دەچێت ئەم وەچە تازەیە دێتە مەیدان ئیتر تەماشا دەكەیت جۆرەكانی گیانداران بەردەوامی هەیە و دەمێنێتەوە لە هەستیدا بەم بۆنەیەوە، بەم كەیفییەتە بەقای

گیاندارگەل و لەناویشیاندا بەقای ئینسان تەعین دەبێت، چونكە ئەم دونیا
ونیای تەغیرە یەكێك لەشێوەكانی(تەغیر) لەزیندەگی ئینساندا ئەمەیە كە
ەمرێت، ئەگەر غەریزە نەبوایە جۆری ئینسان دەیتوانی بمێنێتەوە؟ نە، كاتێك
ئەصڵ لەم هەستییەدا لەم عالەمی مادییەدا عیبارەتە لە تەغیر و ئینسانیش
ە حوكمی ئەصڵی تەغیر دەمرێت، ئەگەر غەریزە نەبووایە چۆن ئیمكانی
ەبوو كەكاتێك ئینسانگەلێك موتەوەلید بوون (لەسەرەتاوە بەوجود هاتن)،
ەمانە لەناو بچنوون، جێنشینیان ببێت؟ لەچی ڕێگەیەكی دیكەوە؟! بەچی
ەركیبێكەوە؟ ئیمكانی نەبوو. ڕێگەی ئەمە تبقی (تەغیر) كە ئەصڵی ئینسان
ەناو دەچێت و چەندین جۆری دەمێنێتەوە ئەمەیە كە غەریزەی جنسی دراوە
، ئینسان دەبێتە مەوجودێك دروست كەری(نەسل و وەچە) لەڕێگەی وەچە
ستنەوە ئەم جۆرە بەردەوامی پەیدا دەكات.

ەی خۆوتمان لە ئاخیرەتدا تەركیبی مادە جۆرێكە كە ئەصڵی تەغیر مەترەح
یە بۆی! بەم شێوەیەی كەئێستا مادده هەیە بە وجود نایەتەوە لەبەرئەوە ئەم
صوصییەتەشی نییە كە خصوصییەتی (تەغیرە). مەگەر ئیرادەی خوای گەورە
تێك لەناو ببات، ئەگینا لەناو چوونی نییە خەصڵەتی لەناو چوون نییە...

## ەریزەی جنسی مرۆڤ لەنێوان دونیا و قیامەتدا

اتێك ئەمە دەزانین (كە غەریزەی جنسی بۆ مانەوەی ئەصلی بەشەرە و ئەم
ەوەش لە ئەنجامی گۆڕانی بەردوام دروست دەبێت) لەوە تێدەگەین كە
سەلەی جۆری ئینسان لە قیامەتدا لەگەڵ جۆری ئینسان لەم دونیادا
مەدا جیاوازی هەیە، كەلێرەدا مەسەلەی غەریزەی جنسی بوونی هەیە!

بۆچی؟ چونكە غەریزەی جنسی لەبەر یەك مەسئولییەتە كە شكڵ و خصوصییەتی (هەستی) و مادی ئێستا داوای دەكات. غەریزەی جنسی بۆ ئەوەیە كە(هەستی)ئێستا بەسروشتی خصوصییەتی تەغیرەوە بەوجود هاتووە، ئینسانیش تبقی ئەم سروشت و خصوصییەتە كە (هەستی) هەیەتی هەر لەبەرەوە دەبێت لەناو بچێت و غەریزەی جنسی ئەركی بەردەوامییەتی وەچە خستنەوە جێبەجێ دەكات. دەی كاتێك تەغیر نییە لەناوباسدا و (وەچە)ی ئینسان لەناو ناچێت ئیتر غەریزە چ كارەیەكی هەیە لە قیامەتدا؟ هیچ! ئەم باسە لەوێ مەترەح نییە، موتڵەقەن مەفهومێك بۆ غەریزەی جنسی لەئەو دەورانی پەیدابونەوەیەدا نامێنێتەوە، مەفهومێك بۆ منداڵ بوونی مەردمیش نامێنێتەوە! چونكە غەریزەی جنسی نێوەندێكە لەنێوان وەچەی یەكەمدا بۆ وەچەی دووەم، نەسلی ئەوەڵ (وەچەی یەكەم) بەبۆنەی غەریزەی جنسییەوە ئیمكانی بەوجود هاتنی نەسلی دووەم فەراهەم دەكەن، كە نەسلی ئەوەڵ لەبەین دەچێت، نەسلی دووەم دێتە جێگەی.

لەقیامەتدا ئەصڵەكە كە(تەغیرە) وجودی نییە، ئەگەر وا بێت وەچە خستنەوەش نییە، و غەریزەیەكیش كەواصتەیە لەنێوان نەسلێكدا بۆ نەسلی دوای خۆی ئەویش وجودی نییە، بۆیە دەزانن لەبەرامبەر پیاوەوە (ژن) لەم دونیای موتەغەیرەدا كەتەصەوری دەكەیت وجودی نییە، لەبەرامبەر (ژن)ەوە لەقیامەتدا پیاوێك بەم مەئمورییەت و خصوصییەتەوە لە دونیایی ئەمڕۆدا هەیە وجودی نییە.

مەفهومی (ژن و پیاو) لەئاخیرەتدا جۆرێكی ترە بەتەناسوبی حاصڵ نەبوونی خصوصییەتی تەغیر، چونكە خصوصییەتی تەغیر وجودی نییە و حاصڵ نییە

لەبەرئەوە مەفهومی ژن نیسبەت بە پیاو ئەمە نییە كە ئێستا هەیە، هەروەها مەفهومی پیاو نیسبەت بەژن ئەوە نییە كە ئێمە تەصەوری دەكەین.

دەی باشە ئەی چی دەمێنێتەوە لەمەسائیلی بەینی (ژن و پیاو) كە پیاو حەز دەكات بە ژن و ژنیش حەز دەكات بەپیاو لە قیامەتدا؟ خۆ غەریزەی جنسی نییە ئەوە چ خصوصییەتێكی ترە بوونی هەیە، ئەگەر غەریزەی جنسی نەبێت، هێشتا ئەو سۆز و موحیبەتە هەر دەمێنێت؟ جا ئێستا شتێك دەقیقتر تەماشای مەعنای (زیندەگی) بكەین، تەماشای مانای خانەوادە بكەین، تەماشای مانای پەیوەندی نێوان (ژن و پیاو) بكەین.

ئێستا هەروا ئیشارەتێكی كورت و مەختەصەر بكەم، بەم باسە.

لە جیهانی ئاژەڵەكاندا دوو جۆرە حاڵەتی جنسی دەبینین، مەسەلەن حاڵەتێكی جنسی دەبینین كەلەناو حەشەراتدا یان لەناو حەیواناتێكدا هەیە،كە فەقەد لەلەحزەی نیازی جنسیدا دوو جنسی جیاواز لەیەك(جنسی موخالیف) دەگەن بەیەكتری، بەر لەوە بێگانەن بەیەكتری و هیچ كارێكیان بەیەك نییە، لەو كاتەدا دەگەن بەیەك و دوای ئەوە بێگانە دەبنەوە بەیەك و پەیوەنییەكیان بەیەكەوە نامێنێت، ئەمەجۆرێك لە پەیوەندی جنسی لە جیهانی گیاندارانـدا. جۆرێكی تریش دەبینین لەناو شارگەلدا و لەناو فرەیەك لە دێهاتگەلیشدا گشتمان(كۆتر)مان دیووە. (كۆتری زەوجی) بەجیاوازی لەو جۆرە لەمەودجوداتەكان كەوتمان پەیوەندی جنسییان تایبەتمەندی دیكەی لەگەڵدایە، وەك جۆری یەكەم نین، كەتەنها لەساتەكانی نیازی جنسیدا لەیەك نزیك ببنەوە لەمەودوا بێگانە بن بەیەكتری... نەء...




واقیعەن لایەنی فرە فرە زەریف لەپەیوەندی نێوان دوو (کۆتر)دا هەیە، هەر بەشێوەی خانەوادە ئەمانە دەکەونە یەك و زیندەگی دەکەن، تا کۆتای چ لە ساتانێکدا کەنیازی جنسی پێیەتی چ لە غەیری ئەو ساتانەدا، گشتمان ئەمەمان بینیوەو قەزییەیەکە ڕۆشنە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە، کە چەنێك پەیوەندی هەیە لەنێوانیاندا، لەجیهانی ئاژەڵاندا و ئێمە ئەم دوو جۆرە پەیوەندییە جنسییە دەبینین .

**ئەصڵی پەیوەندی جنسی لە نێوان مرۆڤدا:**

پەیوەندی جنسی ئینسان چۆنە؟ ئایا تەصەور دەکرێت بشوبهێنرێت بەو پەیوەندییە جنسییە لەناو ئاژەڵی بەرەڵاگەلدا هەیە، کە دور لە زەوق و کۆمەڵایەتی و مەدەنییەتە، یان دەبێت بشوبهێنرێت بە پەیوەندییەکی جنسی کە لەناو باڵندەگەلی وەك (کۆتردا هەیە)؟ بێ هیچێك و بینا لەسەر ئەوەی دەیزانین کۆتر چەنێك نیسبەت بە ئاژەڵگەل لەتیف ترو عالی ترە لەو ساتەی پەیوەندی کردن و خانەوەدە دروست کردندا، ئینسان چەنێك کامڵترە لە (کۆتر) بەو ئەندازەش دەبێت پەیوەندی جنسی لەنێوان ئینسانگەلدا لە نێوان ژن و پیاودا لە مەعنەوییەت و جەفا و صەمیمەت و موحیبەت زیاتر سوود وەرگرێت، ئەگەر بەو جۆرە نەبێت پەیوەندی جنسی لە نێوان ئینسانگەلدا وەك ئەم هەرزەییە و فەحشا بێت کەلە دونیا هەیە، بەڕاستی خیلافی ئینسانییەتە! دەبینین کە ئاژەڵانێك بە شێوەیەکی غەریزی و بەبێ فەهم خەصڵەتی خانەوادەیان پێدراوە لەتەرەف خواوە فەحشا و بەرەڵایی و بەدجنسی نییە لەناویاندا، کۆترگەل بەرەڵایی جنسی نییە لەناویاندا، چونکە

بەشێوەیەكی غەریزی خوای گەورە وا دروستی كردوون كەبە خانەوادەگی زیندەگی بكەن. دەی ئایا ئینسان موتەمەدین(شارستانی) ترە چاكترە بەشێوەی گروپ و خانەوادەگی زیندەگی بكات، یان (كۆتر)؟! ئاساییە كە دەبێت ئینسان سەدەها بەرامبەر لەم خەصڵەتەدا قەوی تر بێت لە(كۆتر). دەی چەنێك نەنگییە بۆ ئینسان كە ئەو خەصڵەتە والە كۆتردا هەیە لەمدا نەبێت، ئەو خەصڵەتە موسبەتە. چاو لەحەیوان و دوور لە زەوق و خصوصییەتە مەدەنییەكان بكات، تووشی بێ بەند و باری و بەرەڵایی جنسی ببێت! واتە لە ساتەكانی پێداویستی جنسیدا ببنە ئاشنایی یەك و بەرلەوە بێگانە بن لەیەك دوای تەواوبوونی نیازەكەش بێگانە بنەوە بەیەك! بەڕاستی دوورە لە ئەرزش و شەخسییەتی ئینسانەوە، سەرفی نەزەر لەوەی كەچی زوڵمێكە لەژن دەكرێت، زاتەن بۆ ئەرزشی ئینسانی عەجیب ناسازگارو ناجۆرە كارێك بەم جۆرە! جا لەم عالەمی هەستییەدا ئەگەر ئینسان مونحەریف نەبێت بەخصوصییەتێك كە هەیەتی كە فرەتر مەدەنی ترو شارستانی تر و خانەوادەگی ترە لە(كۆتر)، (بێ گومان دەبێت لەپەیوەندی نێوان ژن و پیاودا زیاد لەمەسائیلی جنسی ئەو لایەنە مەعنەویەتگەلە زۆر زۆر كاملتر بێت، بگاتە ئەو ئاستە كە قورئان ئیزدواجی ئینساگەلی موسوڵمان بەو خەصڵەتگەلەوە ڕون دەكاتەوە لە نێوانیادا(مەوەدەت) و (ڕەحمەت) بێت، واتە خۆشەویستی و دڵسۆزی، (مەوەدەت): واتە خۆشەویستی. (ڕەحمەت):واتە دڵسۆزی.

یەكتریان خۆشگەرەك بێت و دڵیان بسوتێت بۆیەكتری... جیاوازییەكی فرە هەیە لەنێوان خۆشەویستی و دڵسۆزیدا، دەبێت بە ئەندازەیەك ئەمانە نزیك

بن لـەیەك و بێگانەگییان نەبێت نیسبەت بەیەك، بگاتە ئەو ئاستەی ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾*. تائەو ئاستە هاوبەستەگی لـەنێوان ژن و پیاودا كامـڵ بێت ئینجا پەیوەندی نێوان ئەم (دوو جنسە موخالیفـە) ئەرزشـی ئـەوە پەیـدا دەكات پێی بێژن پەیوەندی ئینسانی، ئەگەرنا واقیعەن ئینسانی نییە نەگەشتبێتە ئەو ئاستە كە مەوەدەت و ڕەحمەت لـەنێوانیاندا ببێت. پیاو (لبـاس) بێـت بـۆ ژن، ژنیش (لباس) بێت بۆ پیاو، ئەگەر لـەو ئاسـتەدا نـەبوو هـیچ ئەرزشـێكی نییە. بەشێوەیەكی زۆر كورت ئەو ئەنجامگیرییەی ئێمە لـەم نوكتـە دەیگـرین ئەمەیە كەزیاد لـەغـەرائیزی جنـسی نوكتەگـەلی عـاتفی فەوقـەلعادە زەریـف لـەنێوان ژن و پیاودا وجودی هەیە كەدەبێت زۆر زۆر زەریـف تـر بێـت لـەو پەیوەندی عاتفییـەی لــەنێوان دوو دانـە كـۆتردا وجـودی هەیـە. لـەڕاسـتیدا نمونەگەلی تریشمان بینیوە ژن و پیاوگەلێك كـە ئەصـڵەن مەسـائیلی جنـسی لـەنێوانیادا نامێنێت. بەلام لـەفرەیەك لـەژن و پیاوگـەلی جـوان، صـەمیمیەت و موحیبەتیان نیسبەت بەیەكتریان زۆرترە، ڕەوابتی ئەو ژن و پیاوە پەیوەنییـەكی سالم و ئیسلامییە، نەك پەیوەندی ژن و پیاوێـك، كـەوەك ئـەو حەیوانانـە كـە تەنها لـەساتەكانی پێداویستی جنسیدا كاریان هەیە بەیـەكتر و ئـیتر لــەوەودوا بێگانەن بەیـەكتر كـە داخەكـەم زۆرینـەی خێزانـەكانی ئێمـە بـەو جۆرەیـە، بەڕاسـتی پەیوەنـدی ژن و پیاوگـەل پەیوەندییـەكی حـەیوانی پەسـتە، نـەك

---

*) أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (١٨٧ سورة البقرة)

حەیوانێكی ئاسایی هاوشێوەی جیهانی(كۆتر). لەكەمترینیدا ئەگەر لە ئاستی كۆتردا بووایە شتێك بوو پەسەند، لەكاتێكدا پەیوەندی كۆتر نیسبەت بە ئینسان هەر ئاژەڵییە دەبێت پەیوەندی جنسی نێوان ژن و پیاو لەعالەمی ئینسانیدا فرەفرە كاملتر بێت بەوەی وا لەناو ئاژەڵاندا بەشێوەیەكی خانەوادەگی زیندەگی دەكەن و وجودی هەیە،بەڵام ڕاستییەكەی ئەوە لەبەر دووریان لەپەروەردەی ئیسلام و دەرك و شعووری ئیسلامی دەبینیت چەنێك پەیوەندی لە نێوان خانەوادەگەلدا پەست و خراپە،ئەو لایەنە عالییە ئەرزشدارە وجودی نییە! بەڵام بەپێی ئەو نمونەگەلەدا كە دەیبینین ئێمە ئەم نوكتە دەرك دەكەین،كە شێرازەی پەیوەندی نێوان ژن و پیاوێك كاتێك پەیوەندییەكە پەیوەندییەكی فرە عالی بوو لە سنووری ئەرزشی ئینساندا دوو شتە:

**یەكەم: ئەركی مانەوەی جۆر(وەزیفەی بەقای نەوع).**

**دووەم: ئەو عەواتیفە زەریفەی كەئەوەتا لەنێوانیاندا.**

ئەم دوو شتە هەیە، كە ئەگەر یەكێكیان نەما نەخۆشی پیری و حادیسەگەلی جۆراوجۆر بەشێوەیەكی كاتی یان بۆ هەمیشە غەریزەی جنسی لەناو دەبات، ڕوویداوە چەندین جار ژن و پیاوێك ئەوەندە ئەو لایەنە مەعنەوییەیان بەهێز بووە كە لەگەڵئەوەی ئەو لایەنە ماددیەیان لەناو چووە و لایەنی (ئەركی مانەوەی جۆر)یان نەماوە، ئەو موحیبەت و عاتیفەیان هەروەك ئەوەڵ ماوە و كەمی نەكردوە! نمونەی وامان زۆرە، بەحاڵ مەردم سەرنجیان داوە،كەحادیسەیەك ڕویداوە كە مەسەلەی جنسی لە نێوان ئەم ژن و شووەدا

نەماوە، بەلاَم ئەو عەواتف و موحیبەتە هەر ماوە لە غەیری پەیوەندی جنسیدا نمونەی عەواتف و موحیبەت زۆر دەبینین بەدەر لەوەی كەفكری پەستی مادیەت و( دەروونناسی فرۆیدیی) كەتەصەور دەكات موحیبەتی دایكیش نیسبەت بە كورەكەی هەر لەسەرچاوەی غەریزەوە سەرچاوە دەگرێت، كەئیتر چەنێك پەستەو فكری مادی ئینسان پەست دەكات،كە دیمان هەتا لەناو(كۆتر)دا ئەرزشگەلی بالاتر لە غەریزەی جنسی وجودی هەیە، چجای لەناو ئینساندا! ئەو هەتا وا تەصەور دەكات، كەپەیوەندی دایك و كورِ پەیوەنییەكی جنسییە،كە بەشێوەیەكی نائاگایانە، بەهەرحاڵ ئەی پەیوەندی دایك و كچ چییە، براو برا چییە ،خوشك و خوشك چییە، هاورِێ و هاورِێ چییە؟

جا خولاَسە دەركی مادی ئابەو جۆرە دوورە لە واقیعیەت و ئینسان دەخاتە ناو خەیالاَتەوە، جا چ خەیالاَتێك؟! نەك خەیالاَتێكی(عیرفانی) كە ئەویش هەر دوورە لە واقیعەوە و خلافی واقیعە! بەلاَم بەهەرحاڵ ئینسان بەرەو ئەرزشە عالییەكان رِێنمونی دەكات، ئەم دەیخاتە ناو خەیالاَتێكی دوور لە واقیع، بەلاَم بەرەو پەستترین دەرەجات و لە خوار پەسترین حەیواناتەوە، دەركی مادی ئەوەندە دەیبات بەرەو خوار.

جائەوەی كە ئێمە لەم باسەدا نەتیجەگیری دەكەین، ئەمە كە لەنێوان ژن و پیاوداغەیری غەریزەی جنسی كەوەزیفەیەكە بۆ بەقای نەسل بۆ ئەم دونیا بەكاردێت پەیوەندییەگەلێكی تریش وجودی هەیە كەئەو پەیوەندییە عاتفییە عالییە لەقیامەتدا ئەوەی وا سازگارە لەگەڵ دونیای موتەغەیری ئەمرِۆدا ئەوە ئیتر نامێنێت، بەو جۆرە كە وتمان، ئەی چی دەمێنێت؟ ئەو پەیوەندییە عاتفییە





سۆزدارییە دەمێنێتەوە، چۆن لە هاورێیەك لەزەت دەبات لە هاورێیەتی هاورێیەكی، لە شۆخی هاورێیەكی، هاورێی صەمیمی، دوو برای صەمیمی، لەزەت دەبەن لە چاو كەوتنیان بەیەكتری بەهەمان شێوە لە قیامەتدا ئەو لایەنە سۆزداریگەلە لەناو ژن و پیاودا دەمێنێت نەك لایەنی جنسی .

لەلایەكی تریشەوە حاڵەتگەلی عاتفی بەتەناسوب شەرائیتی جۆرجۆر شكۆفە دەكات و لەزەتی پێدەگات، ئەم شەرائیتە یەك جۆر نییە بۆ نمونە تۆ لە جۆرێك شۆخی لەزەتێكت پێدەگات لە جۆرێكی تر شۆخی لەزەتێكی ترت پێدەگات، شۆخییەكانیش یەك جۆر نین جیاوازن لە حاڵەتێك لە قیافەیەك لەزەت دەبەیت و خۆشت دێت خوێن شیرینە لەبەرچاوت لە قیافەیەكی تریش خۆشت دێت و خوێن شیرینە لەبەرچاوت كەچی تەماشا دەكەیت ئەم دوو قیافەیە لە یەكتری ناكەن و فەرقیان هەیە، لەتەماشاكردنی(دڵێك) لەزەت دەبەیت و لەتەماشاكردنی دڵێكی تریش لەزەت دەبەیت كەماشا دەكەیت ئەم دوو دڵە لەیەكتری ناكەن،بۆنێكی عەتر كەیف خۆشت دەكات و بۆنێكی تریش كەیف خۆشت دەكات كەچی ل ەكیش ناچن و فەرقیان هەیە بەشێوەیەكی گشتی ئەو شتگەلە واعەواتفی ئینسان دەگەشێنێتەوە كەیف خۆشی دەكات یەك جۆر نین مەسەلەن باسی قیافەت كردن، چەندەها جۆر قیافەت هەیە كە مومكینە تۆ لەزەت بەریت لەتەماشاكردنی هیچكامیشیان لەیەكتری ناچن، جا دەیەها جۆر حاڵەت مومكینە هەبێت، تۆ لەو حاڵەتگەلە كە وەختێك دەبینیت لە قیافەتی ئینسانگەلدا لەزەت دەبەیت، حاڵەتی خەندە كردنی فلانە كەسێك

فەوقەلعادە مەتلووبە بۆت، حاڵەتی ناوچاو تاڵکردن لە منداڵێکی شیرە خۆرە، سەیر دەکەیت لەزەتی هەیە بۆت، حاڵەتی تورەیی هەندێك ئینسان سەیر دەکەیت لەزەتی هەیە بۆت، گشتی ئەمان جیاوازن، بەلاّم لەئەصڵی لەزەت گەیاندن بە تۆدا وەك یەك نین و هەرکام بەجۆرێك لەزەت دەگەیەنن بە تۆ.

ئەو لایەنەعالییە لە پەیوەندی ژن و پیاودا دەمێنێت کە ئەو پەیوەندییە عاتفییە بەشێوەی جیاواز جیاواز دەشکۆفێتەوە و لەزەتی لێدەبەیت، بەجۆرەها شێوە مەسەلەن ئەگەر پیاوێك(وتمان لە قیامەتدا نیازی جنسی بوونی نییە لە نێوان ژن و پیاو دا) لە حاڵەتێك لە(ژن) جۆرێك لەزەتی پێدەگات، لە حاڵەتێکی تر لە(ژن) لەزەتێکی تری پێدەگات، بە جۆرێك قیافەی ژنانە جۆرێك لەزەتی پێدەگات و بەجۆرێکی تر،و جۆرێکی تر. یان ژنگەل بە قیافەیەك لە پیاو جۆرێك لەزەتی پێدەگات. بەقیافەیەکی تر جۆرێکی تر کە هیچ مەسەلەی غەریزەکە نییە لەناودا، هەر ئەو لایەنە سۆزدارییە عالییەیە،کەکاتێك لایەنی عاتفییەکە ئیتر فەرق ناکات، ئەو لەزەتە کە پیاوێك لەسەیر کردن و پێکەنینی ژنێك دەیبات، هیچ فەرقی نییە لەلەحەزاتی ئەصڵی عاتفەکەوە کەوەختێك غەریزە نەبێت لە نێوانیاندا. دایکێك لەپێکەنینی منداڵە شیرەخۆرەکەی کە تازە فێری پێکەنین دەبێت لەزەت دەبات هیچ فەرق ناکات، چونکە هەر لایەنە عاطفییەکەیە ،کەیفییەتەکەیان دەگۆڕێت لەئەصڵی لەزەتە عاتفییەکەدا جیاوازییان نییە، هەروا کەوتمان (تۆ) لەزەتی عاتفیت پێدەگات لەچەند جۆر حاڵەتدا، لەئەصڵی لەزەتدا گشتی یەکێکە، بەلاّم لە زاهیرەکە و وەسیلەی لەزەتگەیاندنەکەدا فەرقی کردووە، ئەو لەزەتەی وا بەعاتفەی ئینسان دەگات

دووبارە لە ئەصڵی لەزەت پێگەیاندا فەرق ناکات لە تەماشا کردنی منداڵی خۆیدا ئینسان، کاتێك خەریکە گروگاڵ دەکات دەمی دێت بەیەکدا و گەرەکییە بەشکووم حەرفێك بێژێت و ناتوانێت، یان کاتێك تازە خەریکە فێری پێکەنین دەبێت و دەست دەکات بە پێکەنین، چ لەزەتێکی پێدەگات؟ ئەوەش کەلە تەماشا کردنی ژنێك کە جەنبەی غەریزەکە لەناودا نەبێت هەر پێیدەگات هەروەك ئەوە وایە لەڕوخسار و وەسیلە فەرق دەکات ئەگەرنا ئەصڵی لەزەت بردنەکە وەك یەکە. وەك ئەو نمونانەی هێنامانەوە.

لەقیامەتدا ئەوەی وا جەنبەی غەریزە بوو وتمان نامێنێت، ئەوەی دەمێنێتەوە لایەنی پەیوەندییە سۆزدارییەکەیە، لایەنی سۆزداریش بەم نمونانەوە کە وتمان بە حاڵەتگەل و قیافەتگەلی جۆراوجۆر دەشکۆفێتەوە، بەو بۆنەیەوە بۆ هەر پیاوێك هەر ئەندازەیەك تەصەور بکات، هەر ئەندازەیەك قیافەت و حاڵەتگەلی جۆرجۆری (ژنانە) لەزەت بە عاتیفەی(سۆزداری) دەگەیەنێت، چونکە غەریزە نییە، بەوئەندازەیە دەتوانێت ژن لە ئیختیاریدا بێت، هەر ژنێك چەنێك حاڵەتی جۆرجۆری (پیاوانە) عەواتفی بشکۆفێنێتەوە دەتوانێت ئەوەندە پیاو لە ئیختیاریدا بێت. بەڵام نەك ژن و پیاوێك لە جۆری ئینسان! نا... لە مەوجودێك کە خوای گەورە بە وجودی تێرێت و خەلقی دەکات لە شێوەی ئینساندا، چونکە (حور)ئینسان نین(غیلمان) ئینسان نین، قیافەیان هاوشێوەیە بە قیافەی ئینسان. ژنێك دەتوانێت سەدهەزار ئارەزوو بکات بەتەناسوبی حالآتی موختەلیف، لە ئیختیاریدایە کەئەو حاڵەتە(عەواتفی) دەشکۆفێنێتەوە لەکاتێکدا خۆ مەسەلەی جنسییەکە نییە.

باوێك دەتوانێت ئارەزووی سەدهەزار (حور) بكات، غەیری (حور و غیلمان) شتگەلی تریش، چ ژن و چ پیاو لەزەت دەبەن لە مندالْ دەزانن چەنێك ژن و پیاوگەل ئارەزوویانە مندالْیان ببێت، بەتایبەت ئەوانەی وا دەورانێك دەگوزەرێت و مندالْیان نابێت، یەكێك لە شتگەل كە لەزەت دەگەیەنێتە باوك یان دایك، واتە ژن و پیاو، بەو جۆرە كەوتمان ئائەو حالْەتەیە كەلەو مندالْەدا دەیبینێت، زەردەخەنەیەكی مندالْەكەی، هەتا حالْەتی ناوچاوتالْكردن و قیژە قیژ لە كاتی برسێتیدا، ناوچاو تۆراندنی لە كاتی خەودا، پێكەنین و گروگالْی ئەمانە گشتی لەزەت دەگەیەنن بە عەواتیفی ئینسان، ئەمانە خۆ دیارن موتلْەقەن غەریزەی جنسیان تێدا نییە.

باوكێك لەزەت دەبات و عەواتفی دەشكۆفێتەوە لەم حالْەتانەی مندالْ یان دایكێك، ئەوە تەنها لایەنە عالییەكەی و لایەنە عاتفییەكەی تێدایەو لایەنی غەریزی تێدا نییە، بەتەناسوب ئەم جۆرە نیازە لە ئینساندا هەیە لایەنە موتەعالییەكەی دەمێنێتەوە، دووبارە جۆرێكی تر مەوجودات بەناوی(ویلدان): واتە(مندالْگەل)، چونكە ئەمەش هەیە لەئینساندا وەلێ ئەمە ئیتر ئەو ئەركە كاتییەی كە سازگارە لەگەلْ دونیای ئەمڕۆدا لەگەلْیدا نییە، كە غەریزەی جنسی بێت، تەنها لایەنی عاتفییە. هەر ئەندازەیەك پیاو یان ژن ئارەزوو بكات مندالْ لە ئیختیاریدایە، وەك مندالْی خۆی كە لەزەت ببات لەمە كەئەمە مندالْییەتی.

بەشێوەیەكی گشتی لە مەوجوداتێك نەك وەك ئینسان شەبیه بە ئینسان، (سێ) جۆرە مەوجود خەلق دەكرێت، لەقیامەتدا بۆ ئینسانگەلێك كە ئەهلی سەعادەتن، جۆرێكیان (حور)ە، جۆرێكی (غیلمان)ە، جۆرێكی (ویلدان)ە.

(حور)، واتە شەبیهی ژن،لە(ژن) دەچن. كە مەسائیلی جنسیان تێدانییە!

(غیلمان)، واتە لە پیاو دەچن، كەئەوانیش مەسائیلی جنسییان تێدانییە.

(ویلدان)، واتە لە منداڵ دەچن.

جا بەئەم كەمە ڕوون كردنەوەیە، ئێمە ئەوەمان حاڵی دەبێت. كەئەگەر پیاوێك لە قیامەتدا سەدهەزار و هەرچەنێك تەصەور بكرییەت (حور) لە ئیختیاریدا بێت. یان ژنێك هەر چەند (غیلمان) لە ئیختیاریدا بێت، یان ژن و پیاوێك هەر ئەندازەیەك (ویلدان) لە ئیختیاریاندا بێت و بدرێت پێیان، ئەوە وا تەصەوری دەكەین بۆ دونیایی ئەمڕۆ و سازگار لەگەڵ ژیان لەم دەورانەدا ئەصڵەن لە قیامەتدا مەترەح نییە، كە مەسائیلی جنسییە، ئەو لایەنە عالییەیە، وەك پیاوگەلێك كە ڕەفیقانە و دڵسۆزانە دادەنیشن پێكەوە و لەزەت دەبەن لەو ڕەفاقەت و قسە كردن و شۆخی كردنە پێكەوە، وەك ژنگەلێك كەدادەنیشن، وەك ئەو لەزەتە كە ژن و پیاو دەیبەن لە(ویلدان) لە منداڵگەل، عەینەنە (حور و غیلمان) هیچ فەرق ناكات، هیچ مەسائیلی جنسییان تێدا نییە، ئیتر ئەو تەصەورە كە وادەزانرێت ئەمەدەورانی شەهوەت بازی و غەرائیزی جنسییە، لەسەر ئەساسی ناشارەزایی و ناحاڵی بوون لەو دەورانە دروست بووە.

## ڕشد(گەشەکردن) و گەورەبوون لە قیامەتدا:

جــا لێــرەدا زۆر بــەکورتی قــسەیەکیش بکــەم لەســەرئەوەی کەمەسەلەی(ڕشدکردن) گەورە بوون و گەشە کردن، لەقیامەتداکەئایا لەوێ شتێك هەیە، بەناوی (ڕوشدکردن) یاخود نا؟

نا...نییە! بۆچی؟

چونکە ڕشدکردن مەسەلەیەکە(بابەتێکە) تابعی بابەتی(زات وەلەد). تابعی ئەصڵی تەغیرە. لەو دەورانە لە حەیاتدا بەو جۆرە کە ڕوونکردەوە، کولەن لەهەستیدا ئەصڵی تەغیر حاصڵ نییە تاوەکو لەعالەمی ئینساندا تەغیرێك کە بەم کەیفییەتە لە دونیایی ئێمەدا بوونی هەیە حاکم بێت، کەلەسەرەتاوە کەسێك منداڵ بێت و لەوەودوا وردەوردە گەورە دەبێت، ئەوە کاتێك مەترەحە کە غەرائیز وجودی ببێت، لە دایك بوون و نەوە دروست کردن بوونی هەبێت، لەکاتێکدا ئەصڵەن لەدایك بوون و نەوە دروست کردن بوونی نییە. بۆیە بابەتی ڕشد کەتابیعێکە بۆ بابەتی گۆڕان(تەغیر) بەمەسائیلێکەوە کەئەوەتا لەباری عالەمی ئینسانیدا ناتوانێت لەو دەورانەدا بوونی هەبێت.

ئەوەش بڵێم، خالێکی دیکەی جیاوازی لەنێوان (ئێرە و ئەوێدا) مەسەلەی جەبر و ئیختیارە، کە ناکرێت من لەم باسەدا، بێم قسە لەبارەی جەبرو و ئیختییارەوە بکەم، چونکە باسێکە قسەی زۆر هەڵدەگرێت و قسەی زۆریشی لەبارەوە کراوە، بەڵام مەسەلەی بوونی (جەبر) لەقیامەتدا کە ئایا (جەبر) هەیە یان نییە؟

نەخێر. جەبر ئەصلّەن لەو كاتەدا، بەم مەفهومەش كەمیقداریك لە دونیایی ئەمڕۆدا هەیە لەویٚ ئەصلّەن نامێنێت، نیسبەت بە ئینسانگەلێك كە ئەهلی سەعادەتن، ئەمە بە مانای ئەوە نایەت هیچ شتێكی جەبری وجودی نابێت، ناء...

لە دونیایی ئەمڕۆدا(جەبر) زۆرترە بۆ ئینسان، زیاد لە نیزامی سروشت، پەیوەندی ئینسان لەگەڵ سروشتدا و ئەوزاع و فعل و ئینفعالاتێك كە لەوجودی خودی ئینسانداا هەیە، میقدارێك زۆر جەبری بۆ ئینسان دروست كردووە، لەوكاتەدا زۆرێك لەم جەبرانە لەناو دەچن، حاڵەتی ئیختیاری دروست دەبێت، مەسەلەن، حاڵەتێك لەجەبر لە دونیایی ئێمەدا چییە؟

ئەمەیە ئینسانێك(خەوی یەت)، ئەم (خەوە) بەشێوەیەكی جەبری لەزۆرێك لەلەزەتگەل دایدەبڕێت دەبێتە هۆكاری ئەوە كەلەو كاتەدا زۆرشتی لەزەت داری بۆ پێشیەت و ئەم لەلەزەتەكەی سوود وەرناگرێت، بۆ نمونە، لەحاڵەتێكدا لەناو مەجلیسێكدا دانیشتووە خەوی دێت فلأن قسەی خۆشی گویٚ لێدەبێت زۆر لەزەت دەبات، بەلاٚم لە حاڵەتێكی تردا، (خەو) زۆری بۆ هێناوە ئەو قسە خۆشە دەبیستێت تەماشا دەكەیت هیچ سوودێكی لێنابات، ئەمە حاڵەتێكە جەبری كە خەو دەیسەپێنێت بەسەریدا. نەخۆشی و زۆر شتی تر، ئەمانە جەبرییەكی هەیە لە بوونی ئینساندا، لەهەمانكاتدا سازگار لەگەڵ سروشتی ژیاندا. ئائەم جۆرە جەبرانە كەلە دونیایی موتەغەیری ئێستا هەیە و دەبێتە هۆكاری ئەوەی مەفهومی و مانای لەزەت سنوردار بكات ئەو جۆرە جەبرگەلە نامێنێت. ئەگەرنا جەبری كوللی نیزامی هەستی بەوجۆرە كەئەو دروستی دەكات و ئێمە نازانین چۆنە، بەلاٚم ئەوەندە دەشزانین جیاوازی هەیە




لەگەڵ نیزامی ئێستادا، كە دیارە ئەوە حاكمە، ئەگەر ئەو جەبرە وجودی نەبێت ئەصڵەن حەیاتیش وجودی نابێت، چونكە زاتی حەیات مەعلولی یەك ڕشتە قەوانینی جەبرییەكە ئینسان ناتوانێت دەخاڵەتی تێدا بكات،و وجودی مەوجودێكی زیندو مەعلولی ملیۆنەها قانوونی جەبرییە، بەو ملیۆنەها قانونی جەبرییە ئەم مەوجودە زیندووە ئەمە خانانە كەوتونەتە یەك و هاوكاری بەیەكەوە دەكەن تا مەوجودێكی زیندووە، ئەگەر ئەو ملیۆنەها قانونی جەبرییە نەبێت، ناكریەت ئەمانە بەیەكەوە هەماهەنگ بن و ئیدامە بدەن بە وجودی ئەم مەوجودە زیەندووە.

لەقیامەتدا كاتێك دەزانین ئینسان وجودی هەیە، بەڵام بە خەصڵەتێكی ترەوە، عالەمی مادە وجودی هەیە، بەڵام بەخەصڵەتێكی ترەوە، كە تەغیری تێدا نییە، دەی دەردەكەوێت بوونی ئەمانە نیشانەی یەك دونیا جەبرە! ملیۆنەها قانوونی جەبرە، بەڵام ئائەم جەبرە كە ئیختیار دیاری دەكات، ئەم جۆرە كەسەروكاری هەیە لەگەڵ مەسەلەی ئیختیاردا، ئەو جۆرە جەبرە نییە و نامێنێت.

## باسی شەشەم:
## لەبارەی "ماتریالیزمی فكری و ئەخلاقی"

ماتریالیزم، تەعبیرێکە لەڕیشەی (ماتر)یەوە وەرگیراوە، (ماتر)یش، واتە (مادە)، ماتریالْ لەزمانی خۆشماندا واتە (مادی)، کاتێکیش دەبێتە(ماتریالیزم)و وەردەگێڕڕێت بۆ زمانی کوردی دەبێتە(مادیگەری).

ئەم تەعبیرە لە فەلسەفەدا هەیە و کاتێکیش بەکاردەهێنرێت بەمانایی جۆرێك لەجیهانبینی و تەرزی تەفەکور بەکاردەبرێت، بەمانایی ئەوەی کەئینسان فکری مادی بێت و وا تەصەور بکات کەهەر جیهانی مادی هەیە و غەیری جیهانی مادە شتێکی تر نییە. جا لەدەبڕینی ئەمڕۆدا ماتریالیزم تەنها بەمانایی(مادیگەری فکری)بەکاردەهێنرێت، بەلاّم ئەمەش لەبەرئەوەی دیقەتنەکراوە! مانایی دەقیقی ئەم وشەیە لەمێژووی زیندەگی ئینساندا دەورانێکی زۆر دوورودرێژ ئامادەیی هەبووە بەبێئەوەی بەشێوەی جیهانبینی فیکرێك دەربکەوێت، بەلْکو لەدەورانێکی زۆر دوورودرێژدا تەنها خەصلْەتێك بووە لەئینساندا، (من)ئەم تەعبیرەم بەکارهێنا،کەماتریالیزم دوو شێوەی هەیە:

یەکەم: ئەخلاقی

دووەم: فکری




بۆ ڕونكردنەوەی مەبەست ئیشارەتێك بە مـەجموعی دەرونـی ئینـسان دەكـەم كەدوای ناسینی دەرون ئەم دوو جۆرە خەصڵەتە یـان فیكـرە قـابیلی ئەوەیـە دەرك بكرێن، ئینسانگەل بەئیعتیباری بونیادی دەرونی دووجۆرن:

جۆری یە كەم: جۆرێك لـەئینسانگەل یەك شەخصییەتین، ئینـسانگەلێكن كـە دژایەتی و ئیزدواجییەت لـەشەخصییەتییاندا نییە.

جـۆری دووەم: جـۆرێكی تـر لـەئینـسانگەل دوو شەخـصییەتین، دژایـەتی و ئیزدواجییەت لـەشەخصییەتییاندا بوونی هەیە.

مەبنای ئەم ئیمتیازە كەئینـسان دەكاتـە دوو دەسـتەوە، بریتییـە لـەدوو بـەش لـەدەرونی ئینساندا:

بەشی یەكەم: عیبارەتە لـەتەرزی تەفەكور و زانیاری و ناسـین و ئاگاهیگـەلی، واتە ئـەوەی كەپەیوەنـدی بەبەشـی (ئاگـاهی) ئینـسانەوە هەیـە، سـەمەرە و بەدەست هاتووەكانی(دەرونی ئاگاهی)ئینسان.

بەشی دووەم: عیبارەتە لـەسیفەت و ئەخلاق و تایبەتمەنـدی و خەصـڵەتگەلی، كـە ئـەم پەیوەسـتە بـەدەرونی نائاگـاهی ئینـسان، حاڵـەتگەلێكـە كەئینـسان بەموقتەزای دەرونی نائاگاهی پەیدای دەكات.

كاتێك تەناسوب لـەنێوان موقتەزای دەرونی ئاگا و خـصوصیات و فیـصاڵێك لـەدەرونی نائاگادا وجودی هەبێت لـەوكاتـەدا ئینـسان دەبێتـە ئینـسانی یـەك شەخصییەتی و بێ دژایەتی و ئیزدواجیی، واتـە ئـەوەی كەچـی دەزانێـت. چ تەرزی تەفەكورێكی هەیە، لـە صیفات و خصوصیاتیشیاندا هەر ئەوە ببینیـت، خیصاڵی مەزهەرێك بێت، تەجەلییـەك بێـت بۆئـەو شـتە كـەوا دەیزانێـت و ئێژێتی، بەڵام هەنـدێك كـەس خـصوصیاتێكیان هەیـە جیـاوازە لـەگەڵئـەوەدا




كەدەیزانن و تەعبیری لێدەكەن، جیاوازە لەگەڵ تەرزی تەفەكوریاندا بۆ نمونە تەرزی تەفەكوری ئەوەیە، كە(ئازایەتی باشە) كەچی لەمەیدانی عەمەلدا موتەوەجیهـ دەبێت لەڕووی خەصڵەتگەلی ئەخلاقییەوە ئەو ئینسانە كەسێكی ترسنۆكە، ئەمە وەك نمونە دەیڵێم و شتێكی زۆر بچوكە نامەوێت لەئەصڵی باسەكە لایدەم و نمونە بهێنمەوە، ئەگەرنا ئەم بابەتە بچوكە بەنیسبەتی بابەتی باسەكەمەوە قابیلی ئەوەی نییە وەك نمونە بیهێنمەوە، بەڵام تەنها وەك نمونەیەك دەیڵێم و تێدەپەڕم. ئەوەش بڵێم مەبەستم لەم (ئیزدواجی شەخصییەت)ە ئەو جۆرە ئیزدواجییە نییە لەكەسێكی مونافیقدا دەیبینیت! واتە ئینسانگەلێك كەشتانێك ئێژن، بەلام لەپاشاندا پێچەوانەی ئەوەی كە دەیڵێن عەمەل دەكەن، لەبارودۆخێكدا جۆرێك خۆیان دەردەخەن و لەبارودۆخێكی تردا جۆرێكی تر! نا...ئابەوە ناڵێین (ئیزدواجییەت لەشەخصییەتدا). ئیزدواجییەت ئەوەیە، كە صەمیمانە و بەبێ مەبەستی فێڵ كردن و تەزویركردن كاربكات، تەرزی تەفەكورێكی هەیە، بەڵام لەتەجەلی حالأت و خیصاڵ و خصوصیاتیدا موتەوەجیهـ دەبین كە پێچەوانەی ئەوەیە و بەو جۆرە نییە كەخۆی ئێژێتی! ئا ئەمە نیشانەی نائاگاهییە و دژایەتییەكە لەنێوان خیصاڵی (نائاگایی) لەگەڵ (ئاگایی و معلوماتی)دا.

جا دوای ئەم پێشەكییە كورتە بگەڕێینەوە بەرەو دوو شێوەكەی(ماتریالیست) كەیەكیان ئەوەیە(ئەخلاقی)بێت و ئەویتریان(فكری)بێت.

لەلێكۆڵینەوەی فەلسەفیدا ئێمە موتەوەجیهی ئەوە دەبین كە(ماتریالیستی فكری)، واتە ئەوەی كەلە فەلسەفەدا مەترەحە و پێشینەیەكی دوورودرێژی نییە، ئەگەر ئینسالگەلێكیش هەبوون فكری مادییان هەبووبێت

وەك(دەهریگەل و تەبیعی مەزهەبگەل) پێشینەیەكی دوورودرێژیان لەمێژووی فەلسەفەدا نییە و ئەو تەرزی تەفەكورە مادییەش كەهەیانبووە زۆر پوخت و ڕۆشن و بەهێز و قاتع نەبووە، ئائەم جۆرە فكرە بەشێوەی یەك مەكتەبی دروست بوو و پەرداخت كەتەعبیراتی عمومی و كوللی هەبێت لەبارەی هەستی و ڕوودا و فعل و ئینفعالاتەوە لەجیهانی ئینسانی و غەیرە ئینسانیدا، هەروەها بەیەك بوعدی،كە بوعدی تەنها مادی بێت هەرچی مەسائیلە تەجزییەو تەحلیل بكرێت، ئەمە شتێكە تازەیە و تەقریبەن(قەرنێك دوو قەرن) بەسەر دەركەوتنیدا تێدەپەڕێت بەڵام خەصڵەتی تەنها تەوەجوە بەمادەكردن و ماوەرای مادە لەبەرچاوگرتن ئەمە زۆر زۆر قەدیمییە، مێژوو ناتوانێت پیشانی بدات ئەم خەصڵەتەی ئینسان لەچ زەمانێكەوە وجودی هەبووە. ئەگەر كەمێك ڕوونتر بڵێم ئینسان لەگەڵ حەیواندا لەیەك خەصڵەتدا وەك یەك وان، كەئەویش بریتییە لەمەسائیلی(جسم)*.

---

*) دەربارەی جیاوازی نێوان حەیوان و ئینسان یەكێكە لەو باسانەی زۆر گرنگی پێدەدرێت و بەبەردەوامی جێگەی تێڕامانی مرۆڤەكان بووە. ئێمە لێرەدا دەمانەوێت بە پشت بەستن بە ڕونكردنەوەیەكی زانای كورد (مامۆستا ناصری سوبحانی) لەسەر ئەم باسە هەڵوێستەیەك بكەین و بە وردەكارییەوە ئەو لێكچوون و جیاوازییە (كاك ئەحمەد) ئاماژەی بۆكرد ڕوونی بكەینەوە.
مامۆستا ناصر، دەربارەی جیاوازییەكانی (ئینسان نیسبەت بە گیاندارانی دەوروبەری لەم جیهانەدا) دێت جیهانی مادی و بینراو بەگشتی بۆ(سێ جیهان) دابەشدەكات {ئەوەش بڵێم ئەم باسەی سوبحانی یەكێكە لەوباسانەی لە ناودونیایی فكری ئیسلامیدا جێگەو پێگەیەكی مێژووی هەیە و زانای بەناوبانگ (ابن مسكەوەیهی) وەك(سوبحانی و موفتی زادە)ش ئاماژەی بۆدەكەن زۆر وردو جوان ئەمەی باسكردووە، تەنانەت دەگەنە ئەوەی كە دەڵێن، ئەوەوی (داروین) ووتی هەر قسەكانی (ابن مسكەوەیهی) ە، بەڵام داروین بەهەڵە لێی حاڵی بووبوو، جیهانەكانی تێكەڵ كردبوو!! ئەگەر بتوانین بڵێین، زانای ئیسلامی (ابن مسكەوەیهی) وتوویەتی تاڵە موویەك جیهانی حەیوان و ئینسان لەیەك جیادەكاتەوە، (داروین) هات

**جسمی ئینسان پێداویستی گەلێکی هەیە کە جسمی حەیوانیش هەیەتی، هەرچەندە جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەم پێداویستیانەدا، بەلاّم ئەو جیاوازییە جیاییەك ئەساسی لەنێوان پێداویستی جسمی ئینسان و حەیواندا دروست**

---

لەو تالّە مووە تێنەگەشت و جیهانەکانی تێکەڵکرد و دواتر وتی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا ئینسان و حەیوان لەیەك جیابوونەوە!}.

مامۆستا ناصر، دەڵێت ئەم جیهانی هەستییە لە سێ بەش، یان سێ‌جیهان پێکدێت، کە هەریەکەیان خاوەنی تایبەتمەندی خۆیانن، ئەوانیش (جیهانی گیایی، جیهانی ئاژەڵ، جیهانی مرۆڤ – مرۆڤ –).

تایبەتمەندییەکانی جیهانی گیایی بریتییە لە:

١. گەشەکردن (گەرەبوون)
٢. زۆربوون (لەصل خستنەوە)

تایبەتمەندی و جیاکاریەکانی جیهانی ئاژەڵ لە جیهانی گیایی بریتیەلە:

١. گەشەکردن.
٢. زۆربوون
٣. جوڵ
٤. هەستکردن (جا ئەم هەستە وەك هەستەکانی ئینسانیش پێشکەوتوو نیە!!)

تایبەتمەندی و جیاکاری جیهانی ئینسان(مرۆڤ) لە حەیوان(ئاژەڵ) بریتییەلە:

١. گەشەکردن
٢. زۆربوون
٣. جوڵە
٤. هەستەکان
٥. عیلم (زانست)
٦. ئیرادە (ویست)

جا ئەم تایبەتمەندییەی کۆتایی (مامۆستا ناصر) دەڵێت دوای ئیزافەکردنی رۆح بۆ جەستە لە مرۆڤدا زیاد دەبێت، واتە خەصلەتێکن تایبەتن بە بەشی مەعنەوی و رۆحی مرۆڤەوە نەك بەشە مادییەکەی، بۆیە لێرەدا دەگەینەوە بە قسەکەی کاك ئەحمەد، کە دەفەرموێت"ئینسان و حەیوان لە بەشی مادی(جەستە)دا وەك یەکن".

ناکات، چونکە دەبینین حەیوانگەلیش ڕوخساریان جۆراوجۆرە، جۆرێك حەیوان جۆرە ڕوخسار و پێداویستی هەیە و حەیوانێکی تر جۆرێکی تر، بەڵام ئەمانە گشتی پێداویستی جسمن گشتی هەر پێداویستی مادییە،بە موقتەزای غەریزە دەرکی دەکات و هەوڵی بۆ دەدات. ئینسانیش هەرچەند پێداویستی جسمانی و خواستە غەریزییەکانی جیاوازی هەبێت لەگەڵ خواستی غەریزی هەندێك لەحەیواندا، (کە نیسبەت بەهەندێك حەیوان خواستی غەریزی ئینسان زۆر جیاوازی هەیە و نیسبەت بەهەندێکی کەم)، بەڵام بەگشتی ئەوەی واپەیوەستە بەجسمەوە نیازگەلی جسم دابین دەکات لەگەڵ باقی حەیواناتدا هاوبەشە! هەر عیبارەتە لەخواستی غەریزی هەر عیبارەتە لەدابین کردنی پێداویستی لایەنی مادی جسم.

بەلام لایەنێك کەلە ئینساندا مەترەحە و لەحەیواناتدا مەترەح نییە، لایەنی(مەعنەوی) و خواستی دەرونی ئینسانە. ئالێرەدایە کە دووبوعدی و ئیزدواجییەتی وجودی ئینسان (نەك شەخصییەتی) دەردەکەوێت. هەروەها ئیمتیازی ئینسان نیسبەت بەحەیوان لەم دوو بوعدەدایە، چونکە جۆری ئینسان بەتەدریج بەرەو کەماڵ هاتووە، هەرواکە یەك کەس لەئینسان بەتەدریج لە(نەقص)ەوە بەرەو کەماڵ دەچێت، نەقصیش عیبارەتە لە مەرحەلەیەکی حەیوانییەت کەواتە سەرەتایی لەحاڵەتێکی حەیوانی و لەزیندەگییەك حەوانییەوە دەستی پێکردووە! واتە لەزیندەگییەکەوە کەتەنها سەروکاری لەگەڵ مادە و مەسائیلی مادییەك کە دابین کەری پێداویستییە جسمانییەکانی بووە هەبووە، لەوەزیاتر مەسائیلێکی بۆمەترەح نەبووە. هەروەك منداڵێك، کە لەسەرەتایی لەدایکبوونیدا جگەلە دابینکردنی

پێداویستییەكانی(جسم)ی هیچی تری بۆ مەترەح نییە، وردە وردە كامڵ دەبێت، ئەوكاتە (مەحسوسات) و مادە كەم كەم لای دەبات و تەوەجوه دەكات(مەعقولات)، مەعقولاتێك لەشێوەی مادەدا بێت یان دوورتر بێت لەمادە هەرچی كاملتر دەبێت بەو شێوەیە لەمادە دوور دەكەوێتەوە، ئینسانیش تەكامولی هەروەك ئەوەیە لەسەرەتاوە هەروەك ئەو منداڵە لەسنوری مادیاتدا زیندەگی كردووە و تەوەجوهی تەنها بەمادییەت بووە، بەڵام وردە وردە هەر لەسەرەتاوە كەماڵی پەیدا كردووە لەسەتح و سنوری مادیات دوور كەوتوەتەوە. جا خەصڵەتی تەكامولی ئینسان ئەمەیە كە لە(مەحسوسات و مادییات)دوردەكەوێتەوە، نمونەیەكی سادە دەهێنمەوە(هەرچەندپەیوەندی بەباسەكەوەنییە). منداڵ كەلەسەرەتاوە ڕوشتی پەیدا دەبێت هەرلەشتگەلی مادی پەیوەست بەخودی ئینساندا ئەوەی وازۆر سادە و مەحسوس دەرك دەكات، مەسەلەن دەڕوانێت بۆ چاو خودی دەزگاو شكڵی چاو دەبینێت، بەڵام(بەصیرەت)نابینێت. واتە (بینایی)نابینێت، دەرك ناكات كەبۆ(چاو)هێزی (بینایی) مەترەحە، كاتێك سەیری (گوێچكە)دەكات تەنها ئەم شكڵە دەرەكییەی (گوێچكە)دەبینێت، ئەوخەصڵەت وحاڵەتی گوێچكە هەیەتی و عیبارەتە لە (سمع) ـ بیستن ـ دەرك ناكات، لەپاشاندا وردە وردە گەورە دەبێت موتەوەجیه دەبێت،كە (چاو) گرنگییەكەی ئەم بەشە بینراوەنییە،(گوێچكە) گرنگییەكەی ئەم بەشە بینراوەی نییە یان مەسەلەن (سەر) بەشێكی گرنگی ئەمەنییە كەدەبینرێت، بەڵكو ئەو هێندەی واهەیەتی گرنگترە، بەوشێوەیە تەكامولی نینسان دەبێتە ئەوەی وا وردە لە صەنحی مادە و مەحسوسات دوردەكەوێتەوە و دەركی قوڵتردەبێتەوە و




بانتر دەبێت لە صەحی مادە و مەحسوسات کاتێك مەسیری تەکامولی ئینسان ئەمەیە ئەوکاتە موتەوەجیه دەبین کەئینسان لەسەرەتاوە هەروەکو حەیوانات بووە، تەنها بەشی مادیاتی بۆ مەترەح بووە لایەنی دەرك و فیکر و دەرونی ئاگایی ئەوەندە شکۆفەی نەبووە و گەورە نەبووە، ئەگەروابێت ئالەم تەعبیرەی کە ئێژین (ماتریالیست)، واتە (مادیگەری)لەسەرەتاوە خەصڵەتێکی دەرونی بووە بۆ ئینسان، مادیگەری حاڵەتێکی سروشتی بووە کە ئینسانگەل هەیان بووە، واتە بەشێوەیەکی ئاسایی تەوەجوهیان تەنها بەمادی و مادییات بووە، پاشان وردە وردە هاتون بەرەو کەماڵ و مەسائیلی لە مادە بەولاوەیان بۆ مەترەح بووە.

جاهەروەك وتم، مێژووی تەکامولی ئینسان وەك تەکامولی منداڵێکە، منداڵیش (ڕۆحی)هەیە، بەلاَم سەیر دەکەیت لەسەرەتادا جگە لە مادییات هیچێکی تری بۆ مەترەح نییە، مەجموعەی ئینسانیش هەروایە لەسەرەتادا هەر مادیاتی بۆ مەترەح بووە وەك حەیوانێك لەپاشاندا وردە وردە بەرەو کەماڵ هاتووە و ماوەرای مادە (میتافیزیك)و مەسائیلی گەورە گەورەی بۆ زیاد بووە، هەتا هەر لەخودی عالەمی مادیشدا ئەوەی وا گرنگترە لە نەزەریدا عیبارەتە لە شتگەلێك کە مەحسوس نییە و قابیلی دەرك نییە لەعالەمی مادەدا ئائەوانەی بۆ مەترەح دەبێت، چونکە واقیعی مێژووی زیندەگی ئینسان بەم جۆرەیە ئەگەر وابێت کاتێك بمانەوێت تەحلیلێك دروست لەبارەی دروست بوونی ماتریالیستەوە بکەین تەنها لەلایەنی فیکرییەکەوە باسناکرێت، بەناونیشانی بابەتێکی مەوردی تەوەجوه بۆ ئینسان و مەترەح لە زیندەگی ئینساندا بیری لێدەکەینەوە، هەرچەند تەعبیرەکە لەناو خەڵکدا بلاَو نییە،

بەلاَم بەموقەزای ئەم ڕابردووە مێژووییە لەزیندەگی ئینساندا ئێمە دەتوانین بێژین ماتریالیست دوو قۆناغە، قۆناغی ماتریالیستی ئەخلاقی، قۆناغێکی ماتریالیستی فکرییە. ئەمە نەوتراوە بەلاَم واقیعییەتێکە لەمێژووی زیندەگی ئینساندا.

لەپاشاندا ئینسانگەڵ کە وردە وردە هاتوون بەرەو کەماڵ و دەرکیان گەورە کردووە و لەسنوری مەحسوسات لایانداوە. (هەڵبەتە ئەوەش بەجێگەی خۆی ئینسان هەر لەسەرەتاوە دینی بۆ هاتووە و ئاشناکراوە نیسبەت بە ماوەرای(پشتی) مادە، بەلاَم ئێمە ئەو دەرکە سروشتی و تەدریجییەکە ئێژین کە خودی ئینسان پەیدای کردووە، ئەمە بەدەر لەوەی لەلایەن خواوە حەقائیقی پێ‌حاڵی کراوە و شتگەلێك کەزۆر زووتر گەیاندویەتییە کەماڵ بۆی هاتووە، ئەوە هیچ، ئەوەی کەلەڕووی سروشتییەوە وەریگرتووە. چونکە(ڕوشدی پەروەردەی شتێکە و ڕوشدی سروشتی)شتێکی ترە. ئەوەی من لێرەدا باسی دەکەم، بریتییە لە(ڕوشدی سروشتی)ئینسان کە ئەو ڕوشتە سروشتییە بەوجۆرە بە تەدریجی لەبەرامبەر حەیوانەوە هاتووە تا گەشتۆتە ئێرە، کاتێك ئینسان ئەم قۆناغەی بڕیووە گەیشتۆتە ئێرە، ئەوەندەی کەلەبارەی زیندەگی ئینسانەوە بەڵگە و شایەتمان لەبەردەستدایە دەبینین ئینسانگەلێك لە جەرەیانگەلی جۆراوجۆری کۆمەڵگەکاندا دەکەونە بەرچاو، کەئەمانە نمونە سمبولی زوڵم و ستەمگەری و خیانەت و بێ شەرەفی بوون بەرامبەر بە ئینسان، ئەمەش لەسەرەتایی مێژووی ڕۆشنەوە دەبینین کە ئینسانگەل غەیری جیهانی مادە شتی تریشیان بۆ مەترەح بووە، مەعنەویاتیش مەترەح بووە بۆیان، ئەرزشگەلی مەعنەوی هەر مەترەح بووە بۆیان، هێشتا یەکە یەکەیەك ئینسانگەلی بەو جۆرەیان تێدا بووە کەعەمەلەن سەیردەکەیت کەتەنها مادیات




مەترەح بووە بۆیان و جگە لەوە هیچی تر مەترەح نییە بۆیان، ئێستاش ئەوە هەر دەبینین و لەو ئینسانگەلە هەر بوونیان هەیە! ئینساگەلێك كەهەرچی ئەرزشگەلی مەعنەوییە دەیخەنە ژێر پێیانەوە. هەرچی زوڵم و ستەمی تاكەكەسییە بەرامبەربەشەریەتی دەكەن، لەبەرخاتری دابین كردنی ئارەزووەكانی خۆیان، خواستە غەریزەییەكانی خۆیان(هەڵبەتە بە جیاوازییەك كە ئینسان لەگەڵ حەیواندا هەیەتی)سەیر دەكەیت حەیوان چەنێك زوو خواستی غەریزەیی كامڵ دەبێت و ڕازی دەبێت، بەڵام ئینسان خواستی غەریزەیی تەواو نابێت(ملیۆنها و ملیارەها هەموو زەوی بخوات هەر تەواو نابێت چاوەڕێ دەكات جێگەی تریش بخوات!) ئا ئەمە پەیوەستە بە ناموتەناهی ـ ناكۆتای ـ ئینسان بەشێوەیەكی ئاسایی لەڕووی پێكهاتەی دوو لایەنی مادە و ماوەرای مادە، واتە(جسم و ڕۆح) بۆچی ئینسان بەوجۆرە ئارەزووەكانی ناكۆتاییە؟ئەمە باسێكی سەربەخۆیە ئەگەر گەرەكم بێت بێژمی كەمێك دوورمان دەخاتەوە لەمەتڵەب!.

ئاماژەیەكی كورت بەوە بكەم تاكەمێك ڕوون بێتەوە، سەیری مێژووی ئیسلام بكەن دیانەت هاتووە و ئینسانگەل وریا بونەتەوە و حەقیقەتی هەستییان دەرك كردووە، دوو لایەنە بوونی هەستییان دەرك كردووە،كە(مادی و ماوەرای مادەیە)، بەڵام لەپاش ئەوە لەجەرەیانی زیندەگی خۆیاندا سەیر دەكەیت وردە وردە بەرە و مادییان دەگەڕێنێتەوە(جا هەڵبەتە ئەمەش باسێكی ترە ئەگەر باسی بكەم زۆر درێژە دەكێشێت!) بەپێچەوانەی تیۆرییەك كە ماتریالیستەكان لەبارەی دین و مێژووی دینەوە ئێژنی، كەئێژن لەسەرەتادا لەنەقسەوە دەستی پێ كردووە و هاتووە بەرەو كەماڵ، واقیعی مێژووی زیندوی تازەی ئیسلام و

لەوەولاش باقی دیانەتەكانی تریش ئەوە دەردەخات بۆمان كەلەسەرەتاوە دیانەت لەلایەن خواوە بەمونتەهای ڕوونییەوە هاتووە لەپاشاندا زەمان دەگوزەرێت و خورافیاتی تێكەڵ دەبێت و ئەم ڕەنگە ترسهاوەر و خەیاڵاوی و ئاواتییە كەقورئان ئاماژەی بۆ دەكات پەیدادەبێت، هەروەها بەوەشدا دەزانین كەهەر لەسەرەتاوە دین بەشێوەیەكی ڕوون و كامڵ هاتووە بۆ بەشەر لەكاتێكدا ئینسان بۆتە ئینسانێكی عاقڵ و ڕەشید، وە ئەوەندەی كەموتەناسیب بێت لەگەڵ دەركی زەمان و بارودۆخی خۆیدا پێی حاڵی كراوە، بەلاّم تبقی ئا ئەم موشاهەداتە (كەئێمە هەمانە كە سەیرێكی مەعكوسی هەیە لە رشدی پەروەرشیدا بەپێچەوانەی ڕشدی سروشتی)، ئەگەر جارجارێك دووبارە تەكانێكی پێنادەیت خەریكە بەرەو حەیوانی دەچێتەوە موتەوەجیهی ئەوە دەبین كە لەڕابردوویشدا دوای ئەوەی دیانەتگەلێك هاتوون هەمدیسان ئینسانگەل هاتوونەتەوە بەرەو دووری لەدین، بەرەو خەصڵەتگەلی حەیوانی، هەڵبەتە خۆ بەتەواوی نابێتەوە بەحەیوان، چونكە دوو بوعدییە، بەلاّم لەمەسیری زیندەگیدا تەماشای دەكەیت حالاّتێكی شێوە حەیوانی دووبارە پەیدادەكاتەوە. لەپاشانیشدا ئەگەر لەكۆمەڵگەدا دینیش ئامادەیی هەیە دەبینیت دەگۆڕێت بۆ شتگەلێكی خورافی و ئاوات و خەیاڵ پلاّوی!

جا دوورنەكەومەوە، ماتریالیستی فكری شتێكی عام و شاملە و شێوەگەلی جیاوازی هەیە، بریتییە لەوەی ئینسان لەتەرزی تەفەكوری فەلسەفەی خۆیدا، لەجیهانبینیدا خۆیدا لەگەڵ مادەدا موافیق بێت و ماوەرای مادە(میتافیزیك) نەفی بكات، جائام(ماتریالیزمە)عامە لق و پۆپ گەلێكی لێدەبێتەوە یەكێك لەلقەكانی لەدونیای ئەمڕۆدا مەشهورە بە(ماركسیست) یان (ماتریالیستی

یـالیٚکتی)، ئەمـە لقێکـە لـە(ماتریـالیزم) جـــا هـەروەك وتم لـەڕابردوودا
اتریالیزم لـەشێوەی یەك مەکتەبی فکـری و یـەك باسـی فەلـسەفی وجـودی
ەبووە، ئەگەر فکرێکی ئاسایی ئەمە بەشێوەی ئۆرگـانیزە و تـەرتیب نـەبووە،
ەمەی ئێستا لـەم فۆڕمەدا تەقریبەن تازەیە لـەدەوروبەری سەدە و نیوێك، دوو
سەدەیە بەشێوەی یەك جیهـانبینی ئیـستدلالی و ئـستنتاجی دەرکـەوتووە. جـا
ـەبەرئـەوەی بەدرێـژای مێـژووی ئینـسان(مادیگـەری) بەناونیـشانی یـەك
خەصڵەت و یەك ئەخلاق زۆر وجودی هەبووە کـۆنتر و ڕیـشە داکـوتراوە،
ئەگەر وابێت و بمانەوێت ئـەم تـەعبیرە دەقیـق و دروسـت لـەگـەڵ زینـدەگی
ئینساندا بەررەسی (بکۆڵینەو) دەبێت موتەوەجیهی ئەوە ببین کە (ماتریالیستی
ئـەخلاقی) لـەپێـشترە نیـسبەت بـە(ماتریـالیزمی فکـری) بـەدەربڕینێکی تـر
ئینسانگەلی تاوانبار و زالم و خائینگەل تەرزی تەفەکوریان ڕۆشن نەبۆتـەوە و
نەیانتوانی تەفسیر و ڕوونکردنەوەیـەکی کـاملی بـۆ بـدەن، تـەنها لـەڕووی
خەصڵەت و ئەخلاقەوە بەو شێوەیە بوون کـە تـەنها مادیـات مـەترەح بـووە
بۆیان و غەیری مادیات مەترەح نەبووە بۆیان و تەوەجوهیان بەغەیری مادیات
نــەداوە، هــەرگیز نــەیانتوانیووە نەلــەڕابردودا و نەلــە ئێـستاشدا ئەوانـەی
واحالەتی مادیگەری ئـەخلاقییان هەیـە، زالـم و تاوانبـار و دیـن فرۆشـان و
شەرف فرۆشگەل! هەموو ئەمانە حالەتێکی ئەخلاقی مادیگەرییان هەیە،کاتێك
سـەیری ڕەفتـار و کرداریـان دەکـەیت سـەیردەکەیت لایـەنی مەعنـەوی
لەبەرچاویان پووچە وگرنگی پێنادەن، تـەنها گرنگـی و تـەوەجوهـ بـەمادیات
دەدەن، بۆ نمونە، پلـە و پایە و پارە و ماڵ و توانـایی و هەرچـییەك هەیـە هـەر
لایـەنی مـادی گرنگـە و غـەیری مادییـان بـەلاوە پووچـە، جـا لەوانەیـە

بەشێوەیەكی سەریح ئەم حاڵەتە ئەخلاقییە لەناویاندا نەیەتە عیبارەت، یان ئەوەندە نائاگاین لەو خەصڵەتە لەناویاندایە ئەصڵەن هەندێكیان نەتوانن تەعبیری لێ بكەن، بەڵام هەندێكجار سەیر دەكەیت یەكەیەكەیەك لەو زاڵمگەلە لەیەك بارودۆخی ئیستسنائیدا قەرار دەگرن و ئیحساس دەكەن جەو و فەزایەك لەصەمیمییەت مەترەحە،كەحاڵەتی خۆیان بخەنە ڕوو ئەو صیفات و خەصڵەتە واهەیانە بیخەنە ناو عیبارەت، واتە لە(نائاهییەوە)بێتە دەرەوە و ڕەنگێكی (ئاگاهی) پەیدا بكات، سەیردەكەیت ئێژێت"ئەی باوا! كێ لەقیامەت هاتۆتەوە؟!"ئەی باوا! تەمەنت چورا ڕۆژە خۆشی بگوزەرێنە!".

كاتێك پێی ئێژی"ئاخر، شەرافەت و شەخصییەت و ئینسانییەت، ئەخلاق دەخەیتە ژێر پێتەوە بۆ ماڵی دونیا و پارە و پوڵ و پلە و پایە؟".

لەبارودۆخێكی ئاسایدا بەشێوەیەكی ئاسایی ئینكاری لێدەكات، بەڵام لەو بارودۆخە ئیستسنائییەدا سەیردەكەیت بەبێ پەردە خەصڵەتەكەی دەخاتە ناو عیبارەتەوە و تەعبیری لێدەكات. لێرەدا موتەوەجهی ئەوە دەبیت كەدەتوانێت خۆیشی تەعبیرێك بهێنێتەوە دەربارەی ئەو خەصڵەت و ئەخلاقەی واهەیەتی.كەیەكسان دەبێت بەماتریالیزمی فكری،كەواتە لەوە دڵنیا دەبیت ئەم ئینسانە لەقوڵای دەرونی نائاگاهیدا ئەم خەصڵەتە نفوزییەی پەیداكردووە كەتەنها گرنگی بەمادیات دەدات و شتگەلێكی غەیری مادی وەك صەداقەت، شەرافەت، شەخصییات، ئەصالەت و ئینسانییەت، ئەمانە بەلایەوە پووچە و گرنگییان نییە.

ئەم ئینسانە وائەم خەصڵەتە ئەخلاقییەی هەیە،كەتەنها مادییات مەترەحە بۆی‌و غەیری مادیات هیچ نییە وگشتی دەكاتە قوربانی مادیات، كاتی واهەیە

سەیردەكەیت(عەقیدەیەكی)هەیە بەپێچەوانەی ئەوەشەوە جا قسە لە(نیفاق)ناكەم...تا قسە لەسەر (ئیزدواجییەتی شەخصییەتە). سەیردەكەیت ئینسانێكی موئمین بە(میتافیزیك)، موئمین بەمەی كەئەم جیهانی هەستییە بە سوتفە و لەخۆیەوە دروست نەبووە، بەڵكو ئیرادەی ئاگا و بەهێز و موقتەدیر دروستی كردووە و دەیگەڕێنێت. موئمینە بەوەی كە زیندەگی ئینسان و پوروچ و عەبەسی نییە، باشی و خراپی وەكو یەك نین، جیاوازی هەیە لەنێوان ڕەفتاری باش و ڕەفتاری خراپدا.موئمینە بەوەی كەكاتێك ئینسان دەمرێت جەزای باشی و خراپییەكانی لەدونیادا نەبینیووە هەروا تەواو نابێت، بەڵكو لەكۆتایدا دەیبینێتەوە. بەهەموو ئەمانە ئیمانی هەیە، بەلاّم لەخصوصیاتی ئەخلاقییەكەیدا نیشانەیەكی ئەمەی كەئەم خەصڵەتە نفوزی كردبێت بۆ دەرونی ئاگاهی هیچ نابینیت!

عەقیدەی هەیە بە(بەرپرسیارێتی) و ئەنجامی بەرپرسیارێتی.كە بریتییە لەوەرگرتنی پاداشتی چاكە و خراپە لەكۆتایدا، بەلاّم دەبینیت لەئەخلاقیدا تەنها مادیات مەترەحە، موتەناسیبی ئەوەی كەدەزانێت سبەی باس و خواسی لەگەڵدا دەكرێت دەربارەی ڕەفتار و كرداری كەچی ئەخلاقی خەصڵەتێكی بەو جۆرەی نییە لەخەصڵەتیدا مادیات، بەلاّم لەفكریدا مادە و ماوەرای مادە مەترەحە! ئا ئەمە نیشانەیەكە لە ئیزدواجییەتی شەخصییەتی ئینساندا، نمونەی ئەمەش بەدرێژای مێژوو زۆر بووە. جگە لەو ئینسانگەلە زاڵم و تاوانبار و ستەمكارانە یان ئەو ئینساگەلە بێشەرەفە كەئیتر غەرق بوون لە(مادیگەری ئەخلاقیدا)، كاتێك لەبارودۆخێكدا زۆریان بۆدەهێمیت دەبینیت بەمونتەهای سەراحەت ئەوە ڕادەگەیەنن كەهەرچی شتە پووچە و هەر خۆشبگوزەرێنە.

هەر ئەم چوار ڕۆژەی تەمەن حسابە و لەدوای ئەوە هیچ شتێك حساب نییە، جگەلەوانە زۆرێكی تریش لەئینسانگەل هەن كەلەڕووی ئەخلاقییەوە مادین و هەر مادییاتیان بۆ مەترەحە، كەچی سەیردەكەیت لەڕووی فكرییەوە(موتەدەینن)، واتە ماوەرای مادە(میتافیزیك)یش مەترەحە بۆیان. ئا ئەم حاڵەتە زۆر زۆر كۆنترە نیسبەت بەم مەفهومە كە ئیمڕۆ (ماتریالیزم) پەیدای كردووە، كەماتریالیزم عیبارەتە لەبەحسێك تەوجیهی ئیستدلالی بۆ دەكات و فەلسەفە باسی بۆ دەكات، ئەمەش لەبەرئەوە سابتی بكات كە دونیا هەر مادەیە(فیزیك)ە و ماوەرای مادە(میتافیزیك) بوونی نییە، ئەگەر وابێت ئەم(ماتریالیستە) فەلسەفییەی كەئێستا وجودی هەیە عیبارەتە لەتەكامولی ئەو(ماتریالیزمە ئەخلاقی)ەی بەدرێژای مێژوو بوونی هەبووە! ئەو ماتریالیستە ئەخلاقییەی لەئینسانگەلی هیچ و پووچدا بوونی هەبووە، چ ئەوەی دووچاری ئیزدواجییەتی شەخصییەت بێت و چ تەنها یەك لایەنە و لەحاڵەتی دەرونی ئاگاهیشیاندا هەر تەوەجوهیان بەمادیات بێت و غەیری ئەوە گرنگ نەبووبێت ماتریالیستی فەلسەفی و فكری ئەمڕۆ هەوڵدەدات ئائەوە بەناونیشانی یەك حەقیقەتی موسەلەم و ڕۆشن ڕوونبكاتەوە و بەدونیایی حاڵی بكات. ئەگەر وابێت(ماتریالیزمی فكری و فەلسەفی) تەكامولی (ماتریالیزمی ئەخلاقییە)، چونكە بەشەر لەسەرەتادا هەستی بەزۆر شت كردووە لەدەرونی خۆیدا، لەپاشاندا تەعبیری دەكات و تەوجیهی دەكات. حاڵەتی مادیگەریش لەسەرەتادا لەئەخلاق و خیصاڵ و خصوصیاتی ئینسانگەلدا وجودی هەبووە و ئێستاش هەر وجودی هەیە، چ ئەو ئینسانگەلەی دوو شەخصییەتین،چ ئەو ئینسانگەلی یەك شەخصییەتین. بەڵام

ئائەو تەوجیهە فەلسەفییەی دونیای ئەمڕۆ لەبارەی یەك ڕەهەند بوونی هەستییەوە(مادی بوونی هەستییەوە) هەوڵدانێکە بۆئەوەی بێت ئائەو خەصڵەتە وا بەدرێژای مێژوو لەگەڵ ئینسانگەلدا بووە و ئینسانگەلی پەست و بێ شەرەف لەم سەردەمەشدا هەر ئەو خەصڵەتەیان هەیە کەتەنها (ماتریاڵ) مەترەحە بۆیان و غەیری مادیات هیچی تر مەترەح نییە بۆیان بیکاتە یەك ئەصڵی عیلمی و موسەلەم و بیداتە دەستی بەشەرییەت، واتە(ماتریالیزمی فەلسەفی و فکری)یا ئاگاهانە یا نائاگاهانە هەوڵدەدات کەشێوەی مەنفی بوونەوە و پووچ بوونەوەی ئینسانییەت بکاتە سمبول و نمونە بۆ ئینسانییەت و بە ناونیشانی یەك ئەصڵی عیلمی و موسەلەمە بیداتە بەشەرییەت و بێژێت"بەشەرییەت تەنها مادەیان بۆ مەترەحە وهیچی تر". ئەگەر صەمیمانەش ئێژێ دەی خۆ فلاّنە ستەمگەر و فیرعەونەکانیش لەمەی ئێوە ئێژنی زیاتریان نەوتووە! لەوانەیە(ئەمانەی ئێستا) هونەرێکی کردبێت، هونەرەکەشی تەنها ئەوەیە هێناوییەتی ئەو شتەی وا لە زیندەگی ئینساندا و بەدرێژای مێژوو ئامادەی هەبووە و نەیانتوانیووە زۆر ڕوونیبکەنەوە و ئیستدلالی بۆ بکەن، ئەم ڕوونی دەکاتەوە و تەفسیری بۆ دەکات بەشێوەی یەك ئەصڵی موسەلەم دەیداتە ئینسان. هەروەك ئەوەی دەربارەی(فرۆید)باسکردووە.کە ئینسانگەلی ساقت و پووچ و تواوە لەناو غەریزەدا هەندێکیان تەنها غەریزەی جنسی و هەندێکی بۆیان تەنها غەریزەی خواردن و شتێکی تریان نەبێت! (فرۆید)دێت ئەو ئینسانەی وا پووچە و تەنها غەریزەی جنسی هەیە و هیچی تری بۆ مەترەحە نییە دەیکاتە سمبول و نمونە و دەیداتە تەحویلی ئینسانییەت، ئێژێ"ئینسانییەت ئەمەیە و دەبێت ئەمەش بێت".





(ماركسیزم)یش كە عیبارەتـە لـەمەكتـەبێكی فكـری ماتریالیـستی، جیهـانبینی ماتریالیـستی لـەیەك جیهەتەوە و ئینسانی(مەسـخ)بـووە دێنێـت و بەناونیـشانی ئەصـڵ و بەناونیـشانی ئینـسانی ئەصـیل دەناسـێنێت و دەیداتـە تـەحویلی بەشەرییەت كە ئێژێت"بەشەرییەت هەر ئەمە بێـت و غـەیری ئەمـە نـەبێت". (مەسخ)بـووە لــە نـەزەرەی ئـەم لۆجیكـە سـادەیەوە، چـونكە خـۆ ئـەویش دەزانێت(زاڵـم و ستەمگەل) هەرچـی كەسـە و مەسـائیلە دەكەنـە قوربـانی مادیات و ئیستسمارگەر، ئـەویش پێیـان ئێـژێ خـراپ و مەسـخ بـووە وەن! واقیعییەتی ئەمەیە كەلەهەندێك لەدەربڕینەكاندا ئەو لـەگـەڵ ئێمـە تـەوافوقی هەیە، بەڵام ئێمە دێین ماهییەتی مەتڵەب دەخەینـە ڕوو. ئـەو ئینـسانە(مەسـخ بووەوانە چین؟). ئەو ئینسانانەن كەبەلایـەنی كەمـەوە لـەڕووی ئەخلاقییـەوە جگە لـە مادیات هیچی تر مەترەح نییە بۆیـان، زاڵـم و ستەمگەرێك كەئـەو نەفرینیان دەكات و دەیانكوتێت منـیش هـەر نـەفرینیان دەكـەم و دەیـانكوتم ئینسانگەلێكن لـەڕووی ئەخلاقییـەوە تـەنها تـەوەجوه بـەمادییات دەكـەن و ماوەرای مادە ئەرزشی نییە بۆیان. جا چ ئەمـە لـەڕووی فكرییـەوە ئەرزشـی هەبێت بۆیان، بـەڵام لـەشەخـصییەتیاندا ئیزدواجییـەت بـوونی هـەبێت، واتـە لەڕووی فكرییەوە موتەعەقیدن، بەڵام لـە ئەخلاقیانـدا ئـەم فكرەیـان نفـوزی نەكردبێت.چ ئەوەی هەر یەك لایەن بن و لـەڕووی فكریشەوە تـەنها مادیـات مەترەح بێت و غەیری ئەوە مەترەح نەبێت، بەڵام توانـایی ڕوون كردنـەوە و تەفسیری ئەو ڕۆحییەت و خصوصیاتە واخۆیان هەیانە بیان بێت. لـە پاشـاندا ئاگاداری ئەوە بن جگەلـەوەی بەرنامەیـەك لـەگـەڵ فەلـسەفە و جیهانبینیـدا جیاوازییان هەیە. لـەلایەكی تریشەوە ئەم باسەی مـن دەیكـەم دوو مەتڵەبـە،

ماتریالیستی فكری و فەلسەفی)وەك وتم بریتییە لەجۆرێك جیهانبینی و
بەصەوری خەڵك دەربارەی هەستی، كەهەستی چییە؟ بەڵام ئەوەی كەدێت و
بەرنامەیەك ڕێكدەخات كە(ئابووری)تەركیب و ڕێكبخات ئەمە هیچ
پەیوەندییەكی بەژێر بینای فكرییەوە نییە، واتە ئینسانێك لەڕووی فكرییەوە
ماتریالیستیش بێت دەتوانێت ئەم بەرنامەیە جێبەجێ بكات، ئینسانێكی غەیرە
ماتریالیستیش بێت لەڕووی فكرییەوە هەر دەتوانێت جێ بەجێ بكات.
غەیری ماتریالیست واتە(موتەدەین) چونكە دەربڕینێكی ڕاست و دروست
لەبەرامبەر(ماتریالیزمەوە) بریتییە لە(موتەدەین)، ئەمەش لەبەرئەوە
دەیڵێم،چونكە لەم سەردەمەدا فرۆفێڵێك لەدەربڕیندا بەكاردەهێنن
كەلەبەرامبەر(ماتریالیستەوە)،(ئایدیالیست - ئایدیالیزم) بەكاردهێنن و
مەبەستیان لە(ئایدیالیزم) جۆرێك جیهانبینی دینییە. ئەمەش باسێكە لە ڕووی
عیلمییەوە زۆر هەڵەیە!! (ئایدیالیزم)دەربڕینێكە لەبەرامبەر (ڕیالیزمەوە)
بەكاردەهێنرێت، واتە ئەمەی كەئینسان تەوەجوە بەئەصاڵەتی(زیهن) بكات،
یان تەوەجوە بە ئەصاڵەتی(واقیع ودەرەوە) بكات. ئەم دووانە دەكرێت
لەبەرامبەری یەكەوە بەكاربهێنرێت، بەڵام(ماتریالیزم - ماتریالیست)نە
لەبەرامبەری(ئایدیالیزم) و نە لەبەرامبەری(ڕیالیزمەوە)بەكارناهێنرێت و باس و
لایەنێكی ترە.

ماتریالیزم، بریتییە لەوەی موتەعەقید(باوەڕت) وابێت كەتەنها جیهانی مادە
هەیە بۆیە بەرامبەرەكەی دەبێتە (دین)، كەباوەڕی وایە جیهان لەمادە (فیزیك)
و ماوەرای مادە(میتافیزیك) دروست بووە. جا لەكۆتایدا ئەمە دەمێنێتەوە، كە
ئایا دین ئایدیالیزمە،یان ماتریالیزم؟ ئەگەر دروست باس بكرێت موتەوەجیهی

ئەوە دەبیت کە دین نە تەنها سەرنج لەلایەنی(واقیع، دەرەوە) دەدات، نە تەنهاش سەرنج لەلایەنی(زیهن) دەدات، دین دوو جەمسەری(لایەن) سەیری وجود دەکات، ئێژێ جەمسەرێکی لایەنی(زیهنی)ئینسانە و لایەنێکی تری (جیهانی دەرەوەیە)، نە جیهانی دەرەوە بەتەنها ئەرزشی هەیە بەنیسبەتی ئینسانەوە ئەگەر ئینسان زیهنی توانایی نەبێت بۆنمونە وەك(شێتێك)، نە زیهنی ئینسان بەتەنها ئەرزش(بایەخ)ی هەیە ئەگەر جیهانی دەرەوە لە ئیختیاریدا نەبێت بۆنمونە وەك ئەمەی ئینسانێك بێنیت لەسەرەتایی تەمەنییەوە تاکۆتایی تەمەنی بیخەیتە زیندانەوە. ئا ئەمە تەرزی تەفەکوری دینییە،کە نە(ئایدیالیزمە) کە تەنها باوەڕی بە(زیهن) هەبێت، نە (ڕیالیزمە) کە تەنها باوەڕی بە(دەرەوە ـ واقیع) هەبیت و نەفی زیهن بکات، بەڵکو سەرنج لەهەردوو لایەنەکە دەدات. جا ئەمە کەڵەکێکە(فێڵێکە) دەیکەن کە دێن بۆئەوەی ماتریالیست محترم و بەناوبانگ بکەن لەجێگەی(ڕیالیزم) بەکاری دەهێنن،لەبەرامبەرەوە دین بە ڕیالیزم ناودەبەن و دایدەنێن، ئێژن(ماتریالیزم)و (ئایدیالیزم)کەلە ئەساسدا دەربڕینێکە هەڵەیە،لەپاشانیشدالە(ما صەدەقیشدا) دووبارە هەڵەیە، بۆئەمەش دەبێت باسێکی ورد بکەم،لەکۆتایدا دەردەکەوێت،کە دید و جیهانبینی دینی واقیع بینانەتر و دروستترە، تاوەکو جیهانبینی مارتیالیستی، جیهانبینی مارتیالیستی لە لۆجیکی ئینسانیدا عەجیب دژە لەگەڵ ئەساسی سروشتی فکر و زانستی بەشەریدا! (ڕیالیزمیش) بەتەنها و بەو مانایەی کەنەفی ئەصاڵەتی(زیهن) بکات و باوەڕی تەنها بە ئەصاڵەتی(دەرەکی)هەبێت، دین ئەمەش قبوڵ ناکات. دین هەم دەرەوە و هەم زیهن قبوڵ دەکات. جا دوای ئەمەش عەمەڵ سەرهەڵدەدات، کە مەعلولی

پەیوەندی نێوان(زیهن) و (دەرەوە)یە، واتە کاتێك ئەم دوو جەمسەرە دەچنە پاڵ یەك(زیهن) و (دەرەوە) یان (دەرەوە و زیهن) ئەوکاتە(عەمەڵ ـ کردار)ی ئینسانی دروست دەبێت، کە ئەم جەرەیانی مێژووە مەعلولی ئەوەیە.
جا بۆیە ئەوەی کە(ماتریالیستگەلی دیالێکتی) واتە(مارکسییەکان) بە تەوەجوهـ بەوەی کەباوەڕیان بە ئەصاڵەتی مادە هەیە، هەوڵدەدەن مادە بەدروستی دابەش بکەن ئەم دوو مەتڵەبە جیان لەیەك، ئەمەی کەبەرنامەیەك ڕێکدەخرێت جیایە لە جیهانبینی. جا بەو جۆرەی لەدین شارەزاین، ئەوە دینە بەئایەتەکانی قورئاندا دەفەرموێت﴿خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا﴾"البقرة"، ﴿وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ﴾" ١٠الرحمن". ئەوە ئیسلامە کەئێژێ ئەوەی وا لەکورەی زەویدا هەیە بەشێوەی یەکسان لەنێوان ئینسانگەلدا دابەش بکرێت، بۆیە ئصولی و لۆجیکی بیربکەینەوە بەرنامەی دروست ڕێکخستنی(ئابوری) لەناو کۆمەڵگەدا پەیوەندی نییە لەگەڵ ئەمەدا، کەئەو بەرنامەیە(ژێر بیناکەی) بریتی بێت لە تێڕوانینی(دین)ی یان تێڕوانینی(مادی)، کەواتە دەکرێت ئینسانێك دیدی مادی بێت و عەلاقەمەند بێت بەوەوە لەڕووی ئابورییەوە بەرنامەیەکی یەکسان دابنرێت، هەروەها دەکرێت ئینسانێك دیدی دینی بێت و عەلاقەمەند بێت بەبەرنامەیەکی یەکسانەوە و دەشکرێت بەپێچەوانەوە. بۆیە لەکۆتایدا لەسەر ئەوە دەمێنێتەوە کەبەباشی لێکۆڵیتەوە و شیکردنەوە بکەیت و بزانین کام لەم دوو تەرزی تەفەکورە سازگارترن، ئایا تەرزی تەفەکور(جیهانبینی) سازگارترە لەگەڵ ئەمەدا کەبێژین(ئابوری) بەشێوەیەکی یەکسان و تەرتیب لەنێوان خەڵکدا دابەش بکرێت یان تەرزی تەفەکوری مادی؟ ئەگەر پەیوەندی(ژێرخان و سەرخان)

كە (ژێربینا)بریتییە لەبەشی دەرونی ئینسان و (سەرخان) بریتییە لەمەسائیلی ئینسان بەگشتی. ئەگەر بەم ئەصلە تەوەجوهـ بكەین موتەوەجیهی ئەوە دەبین كەتەرزی تەفەكوری دینی سازگارترە بۆئەوەی كەبەرنامەیەكی(ئابوری)سالم و یەكسان جێ بەجێ بكات، تاوەكو تەرزی تەفەكوری مادی، چونكە(ماتریالیزم) هیچ ئەرزشێك جگە لەمادە مەترەح نییە بۆی، هەر تاكێك شوێنكەوتەی ئەو قوتابخانەیە بێت بێت تەواوی ئەرزشگەلی لەبیروبۆچوونیدا كورت دەبێتەوە لە مادەدا، چونكە هەرچی شت هەیە بە ئیعتیباری مادییات ئەرزشی هەیە و هەر مادە حسابە، بەلأم(دین) مادە بەئەرزشی دووەم دادەنرێت بۆ ئینسان،ئێژێت هەردووكی مەترەحە بۆ ئینسان. واتە ئینسان هەم مادە و هەم ماوەرای مادەیە، لەبەرئەوە هەم مادییات مەترەحە بۆی، هەم مەعنەوییات، بەلأم لەپێوانەكردن لەنێوان مادە و مەعنەویدا لەگەڵئەوەی هەردووكی گرنگ و پێویستە بۆ ئینسان. بەشی گرنگتر لەشەخصییەتی ئینساندا كەلە حەیوان جیای دەكاتەوە بریتییە لە(ماوەرای مادە) واتە(ڕۆح)ی لەبەرئەوەش (مەعنەوییات)سازگارە لەگەڵ ڕۆحدا بۆیە ئەو گرنگترە. بەشی بێبایەخیش بریتییە لە(جسم)ی ئەو شتەش كەپەیوەندی بەجسمەوە هەیە بریتییە لە(مادییات) و ئەو بێئەهمییەترە. ئێژێ، ئەگەر ئینسانێك تەنها لەڕووی جسم و مادییەوە پەروەردەی بكەیت دەبێتە(پاڵەوانێكی كەر و بێ شعور)، بەلأم لەڕووی ڕۆحییەوە پەروەردەی بكەیت دەبێتە یەك ئینسانی نمونەو گەورە، هەرچەند لەڕووی جسمیشەوە(لاواز)بێت هەڵبەتە ئەوە بەمانایی ئەوە نایەت ئەو لایەنی ڕۆحی بۆ مەترەح نەبێت و ئەمیش لایەنی مادی بۆ مەترەح نەبێت.نا...لایەنی ڕۆحی لەویشدا هەیە و لایەنی مادی




لەمدا هەیە، بەلاّم زیاتر سەرنج دان بەلایەنی مادی ئەمە دەستکەوتەکەیەتی و زیاتر سەرنج دان بەلایەنی مادی ئەمە دەستکەوتەکەیەتی، بۆیە دین ئێژێت دەبێت هەردووکی هەبێت، دەبێت نە مەعنەوییات ببێتە(تاغوت)وەك کار و کرداری(راهیبگەل) و نە مادییات ببێتە(تاغوت)وەك کار و کرداری تاوانبار و بێشەرەف و خۆفرۆشگەل، دەبێت هەر کامییان بەئەندازەیەك کەپێویستی ئینسانییەتە سەرنجی بدرێت، بەلاّم ئابەو جۆرە تێڕوانییە کەهەیەتی، کەلە دژایەتی نێوان مادییات و مەعنەوییاتدا ئەرزشی گەورە بۆ مەعنەوییاتە، ئەگەر وابێت مادییات فیدای مەعنەوییات دەکرێت، دەی کاتێك تەرزی تەفەکورێك بەمجۆرە بێت زۆر ئاسانە کۆمەڵگەیەك مەسەلەن(١٠٠)نەفەری تێدایە یەك نەفەریان ناتوانایە و کارناکات بێژنە ئەوانی تر "دەبێت دەستکەوتی کاری ئێوە ئەم یەکە نەفەرە ناتوانایە زیندەگییەکی خۆشی بۆ دابین بکرێت و بەڕێوە ببرێت"، بەلاّم کاتێك ئەم(١٠٠)نەفەرە تەنها ئەرزش لەبیروبۆچونیاندا بریتییە لەمادییات بە چ دید و ئەرزشێکی بانتر لەمادییات تاکەکان ڕازی بکەین، کە بێژین ئەم یەك نەفەرە ناتوانا و ناساڵە ئێوە کاربکەن و ئەو لەزەت لەو کارە ببات{واتە، ئێوە کار بکەن و ئەمی پێ بژی}.

بەرنامەی (ئابوری دین)* ئەمەیە، کەهەرچی کەسە بەئەندازەی ئامادەگی و توانای کار بکات، بەلاّم هەرچی کەسە بەئەندازەی پێویستی خۆی پێی

---

*) لێرەدا بە پێویستی دەزانین، کە بابەتکی تایبەتی کاك ئەحمەد هەیە دەربارەی ئابوری ئیسلام قسەی کردووە بلاّوی بکەینەوە، چونکە بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆکارێکی زۆر بەهێز بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونیمان دەربارەی (ئابووری لە ئیسلامدا).

بدرێت[*]، بەڵام لە(ماركسیست)دا ئەمە قۆناغی كۆتای كاری ئابوورییە(كە هەرچی كەسە بەئەندازەی پێویستی خۆی پێی بدرێت) لە قۆناغی یەكەمدا ئێژێت"هەرچی كەسە بەئەندازەی توانایی خۆی كار بكات، بەڵام هەرچی كەسە بەئەندازەی كاری پێی بدرێت". جا با بزانین ئەم بەرنامەیە هەر لەسەرەتاوە چەنێك نارەوا و نادروستە، و لەكۆتایشدا ئایا بەشێوەی ئاسایی دەگات بەوەی كە(هەر كەس بەئەندازەی پێویستی خۆی پێی بدرێت؟)

لەسەرەتادا ئێژێت"هەرچی كەسە بەئەندازەی كاری". دەی سەیربكەن كاتێك كۆمەڵگەیەك بەم جۆرە لەسەرەتاوە بەرنامەی تێدا جێبەجێ بكرێت كەهەر كەس بەئەندازەی كاری شتی پێ بدرێت. ئیمتیازی مادی پێ بدرێت. ئەمە دەزانین بەشێوەیەكی سروشتی لەكۆمەڵگەدا هەندێك لەئینسانەكان توانای كاری كەمترە و هەندێكی زۆرترە، هەندێكی بەو دیدە مارتیالیستەوە ئەرزشی كاریان بانترە و هەندێكی ئەرزشی كاریان خوارترە! ئێستاش لەئەرزشی كار بگوزەرێین هەتا حەجم و میقداری كار بێژێن، ئەگەر زووتر ماتریالیست ئینكاری ئەم جیاوازییەی ئینسانی دەكرد كەلەڕووی ئامادەگی و تواناییەوە مەترەحە، لەبەر خاتری ئەمە ئینسانی بەیەك شێوەی سروشتی تەصەور دەكرد. خۆ مەسەلەن لەكۆمەڵگەیەكدا كەیەك نەسڵی كاملی گوزەراندووە،

---

[*]) هەركەس بەئەندازەی پێویستی خۆی، واتە لەم كۆمەڵگەیە چی لێدایە بەشێوەیەكی یەكسان لەنێوان ئینسانگەلدا دابەش بكرێت، ئەمەش وەك ئەو بەرنامە ئابوورییە كەئیسلام ڕێكیخست و حەزرەتی(عومەری كوڕی خەتاب) (ﷺ)، (دیوان)ی دروست كرد و لەكۆتایی تەمەنیدا وتی "ئەگەر بمێنم بۆ ساڵێكی تر(دیوان) بەشێوەیەك مورەتەب و ڕێكخراوە، كەلە ساڵێكدا هیچ ئینسانێك(درهەم)ێكی لەئینسانێكی تر زیاتر نەبێت"، هەركەس بەئەندازەی نیازی، واتە ئەمە نەك ئەوەی بێژی دەباشە كابرای كارگەل دەوا و دەرمان و نان و مەسكەنێكی هەیە بەسیەتی و نیتر چی دەوێت؟ بەڵام لەوێ لەناز و نیعمەتدا و لەناو لۆفیسی تایبەتدا بەتەواوی ڕەفا و خۆشییەوە زیندەگی بكات!

لەدیدی مەكتەبەكەی خۆیەوە. ئەگەر وەرچەرخانێك وجودی هەبێت، ئەگەر تەفاوتێك لەزیندەگی ئینساندا وجودی هەبێت، هەرچییەك هەبێت هەر (مەعللولی) مەكتەبەكەی خۆیەتی، بۆ نمونە ئێستا كۆمەڵگەی (ڕوسیا)، ئینسانگەلێكی تێدایە توانایی كاریان زۆرە و ئینسانگەلێكیش تواناییان كەمە، ئینسانگەلێكی تێدایە كەكرێكارێكی سادەن و دەچن لەناو ئەو مەعدەنگەل وخاك و خاشاك و پرگاز و پیسەدا لەبارودۆخێكی ترسناكدا چەند ساڵێك زیندەگی دەكەن و لەپاشاندا تواناییان لەدەست دەدەن، لەولاشەوە ئینسانگەلێكیش لەناو ئۆفیس و سەنتەری لێكۆڵینەوەدا لەهەوا و بارودۆخی خۆشدا دادەنیشن و زیندەگی دەكەن. خۆ عەمەلەن خۆی ئەم جیلەی پەروەردە كردووە و تبقی ئایدۆلۆژیا و بەرنامەی مەكتەبی خۆی پەروەردەی كردوون كەچی سەیردەكەین ئەم جیاوازییە لەنێوان ئینسانگەلدا هەیە!

دەی كاتێك ئەو دێت و هەر كەس بەئەندازی كاری پاداشتی پێ دەدات ئینسانێك كەتوانای كاری كەمە دیارە دەرامەتی كەمە و بەپێچەوانەشەوە، لەئەنجامدا خود بە خود ئەم بەرنامەی سەرەتایە تەبەقات و چینایەتی پێ دروست بووە، جا شكی تەبەقات بەو جۆرە نا كەلە دونیای سەرمایەداریدا مەترەحە. بەڵكو بەماناو مەفهومە ئەصڵییەكەی خۆی، واتە هەندێكی كەمی هەبێت و هەندێكی زۆر، مانا گرنگەكە نەك چەمك و تەعبیر! مانایی چینایەتی ئەمەیە كەهەندێك زۆری هەبێت و هەندێكی كەمی هەبێت، ئەو بەرنامەیە كەئەو ئیجرای دەكات مونتەهی دەبێتە ئەوەی ئەوانەی واتوانایی كاریان زۆترە و (٦٠ــــ٧٠)ساڵ كار دەكەن لەبارودۆخێكی سالمدا و ئەم(٦٠ـ٧٠)ساڵە ڕۆژی(١٢ـ١٥)سەعات كاردەكەن دەرامەتێكی زۆرتریان




دەبێت، بەلاَم ئەوانەی وا(٢٠-٣٠)ساڵ دەتوانن كار بكەن و بارودۆخی كارەكەشیان خراپە و بەجۆرێكە كە ڕۆژانە تەنها دەتوانن(٦-٧)سەعات كاربكەن دەرامەتیان كەمتر دەبێت! هەر ئەم جیاوازی دەرامەتە بەهۆی ئەم بەرنامەوە كەئەو پێشكەشی دەكات دەبێتە هۆی دروست بوونی ئەم جیاوازییە چینایەتییە واقیعییە بە مەفهومەكەی خۆی نەك بەو چەمكەی بلاّوە! كاتێك ئینسانگەل بەم كەیفییەتە پەروەردەكران و ڕۆحییەتێكی ئاوایان پێدرا و لەسەرەتاشەوە پێیان وترا تەنها مادییات گرنگە و (ماوەرای مادە) هیچ گرنگ نییە ئەو كاتە مادییات دەبێتە(بت) و دەبێتە گشت شتێك و لەپاشانیشدا ئەم بەرنامەیەی بۆ ئیجرا دەكرێت! بۆیە خود بە خود دەبێتە مایەی دروست بوونی چینایەتی لە ڕووی سەروەت و سامانەوە! دەی ئیتر چۆن دەكرێت ئێمە ئەم ئینسانگەلە بێنینە حاڵەتێكەوە كە پێیان بێژین"ئیتر تۆ زەحمەتی زۆر بكێشە، بەلاّم ئیمتیازی مادی كەمت دەست دەكەوێت و حقوقی كەمترت پێبدرێت، بائەو زیادە زەحمەتەی كێشاوتە بدرێت بەو كەسەی تر".

لەڕووی زانستییەوە ئەوە دەزانین، كە ئەو جۆرە(ژێرخانە) واتە ئەوەی كەئینسان وا تەصەور بكات تەنها مادییات هەیە و غەیری ئەوە نییە، لەپاشانیشدا ئەو جۆرە بەرنامە ئیجرا بكرێت كەهەر كەسێك بەئەندازەی كاری پێبدرێت كە عەمەلەن جیاوازی چینایەتی دروست دەكات ناتوانێت مونتەهی ببێتە ئەم بەرنامەیە كەئینسانگەل وازبهێنن لەئەندازەی كاریان و بەئەندازەی پێویستییان پێیان بدرێت، بەشێوەیەكی ئاسایی پەیوەندی لۆجیكی لە نێوان ئەم دوو قۆناغە و ئەو ژێرخان و تەرزی تەفەكورەدا وجودی نییە، بەلاّم لە تەرزی تەفەكوری دینیدا چۆنە؟

كاتێـك لەتـەرزی تەفـەكوری دینیـدا مادییـات پێویـستە بـۆ ئینـسان، بـەڵام بەناونیشانی(بایەخی دووەم) و بەو ناونیشانە كەهەتا ئینسان تەواوی مادییـاتی بكاتە قوربانی بۆ بایەخی مەعنەوی ئەمە هـیچ، تەنانـەت (جـسم)ی خۆیـشی بكاتە قوربانی بـۆ بایـەخی مەعنـەوی دەبێـت، كاتێـك بـەم فكـرەوە ئینـسان پەروەردە بكەیت، ئامادە بێت تەواوی مادییات و جسم و گیانیشی فیدا بكات بۆ بایەخگەلی مەعنەوی چەنێك سادە دەبێـت، ئەگـەر پێـی بێـژی"تـۆ لـەبـەر بایەخگەلی مەعنەوی كار بكە، بەڵام كەسێكی تر بیخوات". چەنێك پەیوەندی هەیە لـەنێوان ئـەم(ژێرخـانی فكـری)ە لـەگـەڵ ئـەم(سـەرخان)و بەرنامەیـەدا پەیوەندییەكی(سروشتی و زانستی)یە...

پاشـان واقیعـی مێـژووش پیـشانیدا، كەلـە ئێـستا یـەك نـەوەی تـەواو لـە ئینقلابی(كۆمۆنیستی) لـە(ڕووسیا) دەگوزێت، لـەجیاتی ئـەوەی لـەو قۆنـاغی یەكەمەی (سۆسیالیزم)ەوەبڕوات بەرەو قۆناغی كامڵی(كۆمـۆنیزم) كەبریتییـە لـەوەی (هەركەس بەئەندازەی كاری خـۆی پـیێ بـدرێت) دروسـت خەریكـە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، بەپێچەوانەی ئەو تیۆرییەش كەوا تەصەور دەكـات بەشێوەیەكی سروشتی بەرەو دواوە گەڕانەوە وجودی نییە!

جا بۆیە ئێستا دەركەوت:

یەكەم: لـە ڕووی عیلـمییەوە ئەو تەرزی تەفەكور و ئەو قوناغی یەكەمەی كار مونتـەهی نابێتـە قۆنـاغی دووەم {واتـە، لـە سۆسـیالزمەوە نـاڕوات بـەرەو كۆمۆنیزم}.




دووەم: لـە ڕووی عـەینی و واقیعیـشەوە بـەوجۆرەی لـە مێـژوودا بینیمـان لەگەڵئەوەی بەرەو ئەوە نەچوو كە بڕیابوو بڕوات وا خەریكە دووبارە بەرەو سەرمایەداری دەڕواتەوە!

# باسی حەوتەم:
# قوتابخانەكەی (موفتی زادە) لە نێوان لیبڕالیست و حزبی (جمهوری و بەنی صەدر)دا

لەبارەی گرنگی (لیبڕالیز)* و ئەندازەی سودوەرگرتن لەم چەمكە لەئێستای ئێرانداو پێشبینی ئێمە لەبەرامبەرئەم بابەتەوە،هەروەها لەبەرامبەر كەسانێكەوە كەئەم خەصڵەتگەلە لە بارەیانەوە بەكاردەبرییەت بەكورتی باسێكی بكەم.

---

*) لیبرالیزم: بریتییە لە ڕەوتێكی هزری و فەلسەفی و سیاسی زۆر بڵاو و بەرفراوان كە گەلێك بیرمەند و تیۆرداڕێژو قوتابخانە بەناوەكەیەوە گرێدراون. لیبرالیزم نزیكەی چوار سەدە وەرچەرخانی لە هزری ڕۆژئاوادا تێپەڕاندووە و گۆڕاوە بۆ نەریتێكی هزی گەورە كە تەوژمێكی بەربڵاو لە تیۆری و بۆچونە سیاسییەكانی لە خۆیدا پەروەردە كردووە. لەماوەی ئەو چوار سەدەیەی كەبەسەر سەرهەڵدانی لیبرالیزمدا تێدەپەڕێت چەندین بیرمەندی گەورە پەیدابوون كە بەردەوام ئەم ڕەوتە هزر و سیاسەتەیان بەرەو بوارگەلێكی نوێ ئاڕاستەكردووە و ڕوانگەگەلێكی نوێیان بۆ كردۆتەوە. گەلێك تیۆری بە تەوژمی میانڕەوی ڕادیكاڵی لەگەڵ بنەما فەلسەفییەكانی لیبرالیزمدا گرێدراون بەجۆرێك لیبرالیزم لەڕووی ئاڕاستەگیرییە سیاسییەكان لەلایەكەوە تا میانڕەوی و لەلایەكی ترەوەو تا سرسیالیزم هەنگاوی ناوە. بەرنامەگەلێكی سیاسی جۆراوجۆر هەر لە بازاڕی ئازادە و دەوڵەتی لایكەم و دەستێوەردانی دەوڵەتەوە تا ڕێكخستن خوازی ئابووری و دەوڵەتی خۆشگوزەران لە چوارچێوەی بۆچوونە لیبڕاڵەكاندا جێیان بۆتەوە. هەروەها دیارترین و بەرجەستەترین بەها و ئامانجی لیبرالیزم بریتییە لە (ئازادی)، لەڕاستیدا تەواوی بەهاكانی تر وەكو ئاسانكاری و سنوری تایبەتی و مافی گەڕان بەدوای خۆشبەختی تاكەكەسی و ...هتد) لە ئازادییەوە وەرگیراون. ئزادی بۆ لیبڕاڵەكان هێندە گرنگە كە هەندێك كات لیبڕاڵەكان قوتابخانەكەیان لەڕێگەی وشەی ئازادییەوە پێناسەدەكەن....





لەڕووی مێژوویەوە لیبرالیزم وەکو قوتابخانەیەکی هزری و ئایدۆلۆژیایەك دروستکەری هەلومەرجێکی مێژوویە کە پەیوەستە بە لەناوچوونی پەیوەندییە فیوداڵییەکان و سەرهەڵدانی پەیوەندییە بۆرژوازییەکان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی سەرمایەداری. هەموو ئامانج و بەها سەرەکییە لیبرالییەکان وەکو ئازادی و یەکسانی و سەربەخۆیی تاکە کەسی هەر هەمووی لەسەربنەمای ئاراستەگیری دژ بە پەیوەندییە فیوداڵییەکانن بووە وەك ئیمتیازاتی ئاریستۆکراتی، ڕیزبەندی پلەو پایەکان و دابەشبوونی کۆمەڵگە بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی. بۆیە زۆرێك لە توێژەران پێیانوایە کە لیبرالیزم تەنها وەکو قاڵبی ئایدیۆلۆژی بۆرژوازی دەناسرێت.لەکاتێکدا لایەنگرانی لیبرالیزم دەیالەوێت بەرزتر لە ئامرازی ئایدیۆلۆژیای چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەت نیشانی بدەن و بەشێکی پەیوەست بە بنەما گشتییە مرۆییەکان ڕاییگەیەنن. هەروەها لیبرالیزم چیرۆکی بەگژداچوونی پاشایەتییە ڕەهاکانی ئەوروپا بووە بۆ گەیشتن بە حوکمی سنوردار و بەگژداچوونی کڵێسا بۆ گونجانی ئاینی و جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت. لیبرالیزم: کاریگەرە بە مرۆڤگەرایی ڕێنیسانس. تاکگەرایی وەکو بەشێکی جەوهەری لیبرالیزم لە تێڕوانینی نوێی مرۆڤی سەردەمی ڕێنسانسەوە وەرگیراوە. بڕوانە: د.کەمال بۆلادی، مێژووی هزری سیاسی لە ڕۆژئاوا سەدەی بیستەم، و. ئازاد وەلەد بەگی و سیروان زەندی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، هەولێر.

دەزانین کە (ڕێنیسانس)* بەناونیشانی یەك قۆناغی مێژووی گرنگ دەناسرێت کە(سەدەی ناوەڕاست)ی لە(سەدەی تازە) جیاکردەوە، سەرچاوەی ئەم گۆڕانکارییەش ئەوروپا بوو. بۆیە دەبینین لەشوێنەکانی تر بەشێوەی یەك بابەتی دیاریکراو (سەربەخۆ) ئەم گۆڕانکارییە مەترەح نییە. ئەوروپا بوو کەپێش لەم حەرەکەتە پێش لەفەراهەم بوونی زەمینەی ئەم حەرەکەتە لەشەرائیتی تەئریخی سەدەی ناوەڕاستدا بوو، هەروەها پاش پەیدابوونی حەرەکەتی (ڕێنیسانس) گۆڕانکارییەك لەگۆشەی جیاواز جیاوازەوە پەیدابوو لەلایەنی فکرییەوە، هونەرییەوە، سیاسییەوە. ئەم گۆڕانکارییە لەبابەتی جۆراوجۆری کۆمەڵگەدا ئەنجامی جۆرجۆری لێکەوتەوە هەندێکجار موثبت و

---

*) مەبەستمان لە ڕێنیسانس ئەو گۆڕنە رامیار، کۆمەلأیەتی، ئابووری و هزرییەیە، کە لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوروپایی گرتەوە{سەدەی یانزە تا سەدەی شانزە}. بزوتنەوەی زیندوکردنەوە و ژیاندنەوەی شارستانیەتی کلاسیکی یۆنان و ڕۆما کە (RENAISSANCE)ی پێدەوترا لە ئیتاڵیاوە دەستی پێکرد و زیاتر هونەر و مرۆڤبینی و ئەو گۆڕانکاریانەی گرتەوە کە لەسەدەکانی (١٤، ١٥، ١٦)دا بەسەر ئەوروپادا هات. لەم سەدالە بە سەردەمی گواستنەوە دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ سەردەمی نوێ. ئەوەی بەرچاودەکەوێت لە سەردەمی نوێ زیاتر خۆی لە برژاندنەوەی ئابووری و سیاسیدا دەبینێتەوە کە ولأتانی خۆرئاوای لەوروپاو شاخەکانی(لەڵپ) پێشەوایەتیان دەکرد، بەڵام بزوتنەوە هزری و هونەری و وێژەی ئیتاڵیا ڕابەرایەتی دەکرد.

دیارترین دیاردەکانی ڕێنیسانسی ئەوروپیش بریتی بوو لەك

١. دۆزینەوەی چاپ و بلأوبونەوەی زانیاری.

٢. ژیانەوەی شارستانی کلاسیکی کۆن و بلأوبوونەوەی کلاسیك و هیومانیستی(مرۆگەری).

٣. گەشانەوەی وێژەی نیشتمانی و نەتەوەیی.

٤. پێشکەوتنی زانستە سروشتییەکان و ڕەخنەی مێژوویی.

بڕوانە: د.محەمەد محەمەد صالح: مێژووی ئەوروپا لە سەردەمی ڕینیسانس تاوەکو شۆڕشی فەرەنسی، و.ئارام محەمەد، ٢٠١١.٧٣٦.٩.




هەندێكجار مەنفی. لەناوئەوانەشدا لەبابەتی (سیاسی)دا لەبەرامبەر فشارێك كە(كلیسا و دەرباریەكان)ی سەردەمی سەدەی ناوەڕاستەوە دروستی كرد حاڵەتی (ئازادی ویستی) سەری هەڵدا، چەمكی(لیبرالیست) لەسەرەتاوە كە لەئەوروپا سەریهەڵدا لەم دەورانە تازەیەدا بۆئەم بوعدە سیاسییە بوو، بۆ ئازادی وەرگرتنێك كەبەشێكی تایبەتە لە بنەماكانی دروستكردنی سەردەمی تازە لە گۆڕانكارییەكانی ئەوروپادا. ئەم ڕوداوە سیاسیانە لەدەورانی تازە و، هەروەها لەدەورەگەلی ڕابردوودا لەڕووی محتەوای كارەوە، كار دابەش بوو بۆ دوو دەستە:

**یەكەم:** هەندێك تەنها بەشێوەی شیعار كاریان دەكرد، یان ئەگەر زۆر گەورەش بن محتەوایەكی دیاریكراو لە زەمینەیەكی تایبەتدا پەیدا دەكەن. لەو زەمینە تایبەتە لایدا وەك تەواوی بابەتە ئینسانییەكانی دیكە پەیامێك، تیۆرییایەك، بەرنامەیەكیان نییە!!

**دووەم:** هەندێكی تریان حاڵەتێكی مەكتەبی(قوتابخانە)یی پەیدادەكەن، كەهەندێك لەبابەتە ئینسانییەكان دەگرنە خۆیانو پەیامو بەرنامەیەكیان هەیە بۆیان. جا چ بەبانگەشە بێت كەخاوەنانی ئەو تیۆریانە بەجۆرێك بانگەشە دەكەن كە ڕێگە و چارەسەری لەگەڵ دادەنێن بۆ مەسائیلی جۆرجۆری ئینسانی، یان نەخێر حەقیقەتەن لە زۆرێك لەمەسائیلی ئینسانی بكۆڵنەوە و چارەسەرێكی بۆ بدۆزنەوە و پێشنیاری بكەن، چ زەعیف، چ قەوی، چ ڕاست، چ هەڵە.

هەرواكە لەمەسائیلی سیاسی تایبەتدا ناونیشانگەلێك مەترەح دەبێت و دەبێتە ئەم دوو شێوەیە، شێوەیەك سادە یان بێ محتەوا و كەم محتەوا، شیعاراتی، لەگەڵ شێوەیەكی پڕ محتەواو بەرنامەدار،خاوەن تیۆری بۆ بابەتە ئینسانییەكان،




چ زەعیف، چ قەوی، چ باش، چ خراپ. لەباقی مەسائیلی ئینسانیدا دووبارە ناونیشانێك بەوجۆرە بەدرێژایی مێژوو هەمیشە بونیان هەبووە، بۆنمونە لەبارەی(ئابووریی)ەوە دەزانین چەندین سەدەی دوورودرێژ پێش لە(ماركسیست)، (سۆسیالیست) مەترەح بووە. هەتا پێش لەزەمینەی پەیدابوونی(ماركسیست)كە ئەو خەصڵەتە عیلمانییەتە بوو كەلەسەردەمی ڕێنسانسەوە دەركەوت و بیری مادییەت زیندوو بوویەوەو وردەوردە فەلسەفەی ڕابردوی بەحاڵەتێك زەعیفی كردەبەر و هاتە مەیدان. هەتا پێش لەسەدەی ناوەڕاستیش(سۆسیالیست) مەترەح بووە تەنها بەشێوەی شیعارات(لەزۆربەی كاتەكاندا)لە پاشانیشدا بەشێوەی تیۆرییەك و هەندێك بەرنامەدار تا وردەوردە هاتۆتە پێشەوە و لەو سەردەمەدا وا(كارل ماركس) دەستی كرد بەچالاكی كە(ئەم مەتڵەبەی وائێستا بەناوی(ماركسیزم) دەناسرێت پەیدابوو كەحاڵەتێكی لەشێوەی قوتابخانەدا پەیداكردووە، باقی بابەتەكانی تریش جگەلە(ئابوری)، وەك بابەتی حوكمەت و بابەتی فكری و تەوجیهاتی جۆرجۆری ئینسان دەربارەی ژیان و مێژوو، هەتا دەربارەی بونیادیترین بابەت كەئیتر ئەوە تیۆری ئینسان كاریگەری لەسەر نابێت وەك(ناسینی هەستی)! ناسینی هەستی واتە: بارگوكردنی یەك واقیعییەت، واقیعەت هەیە (من چۆنی بناسم) ئالەمەشدا سەیردەكەیت هەندێكجار ناونیشانگەلێك باسكراوە لەحاڵەتی شیعاری تێنەپەڕیوون! نەیانتوانیوە تیۆرییەك لەبواری(هەستی ناسی)ەوە (جیهانبینییەوە) مەترەح بكەن هاتوون شیعارێكیان وتووە، هەندێكجار تیۆریگەلێك پەیدابووە، هەندێك جاریش پەرەیسەندووە تا سنوری دروست بوونی قوتابخانەیەك.

ئازادی ویستییەك كەلەئەوروپا مەترەح بوو كەسەرچاوەی پەیدابوونی چەمكی (لیبرالیزم)بوو زیاتر لەشێوەی شیعارێكدا بوو تاوەكو لەشێوەی یەك بەرنامەی قوتابخانەی سیاسیدا، هەروەها لەزۆرترین حاڵدا ئەمە بوو كاتێك كەلەشیعار لایدا، یان لە هەندێك بابەتی سیاسی تیۆرییەكی پێشنیار دەكرد، بەڵام بۆ شێوازی بابەتی جۆراوجۆر كەبۆ بەشەرییەت مەترەحە و ئیحتیاجی بەدۆزینەوەی چارەسەر هەیە تیۆرییەكیان بۆی نەبوو. بۆنمونە لەم سەردەمە تازەدا بابەتی(ناسیۆنالیست) مەترەح بووە. یەكێك لە ناحەقییەكان كەبەدرێژایی مێژوو لەلایەن زۆرێك لەمیللەتگەلی (زۆرین)ەوە بەرامبەر میللەتگەلی (كەمینە) ڕوویداوە دژە كردەوە لەبەرامبەرییەوە پیشاندراوە بەتەرحی ناونیشانێكەوە وەك(ناسیۆنالیست). هەڵبەتە كاتێك كەدەڵێین لەم سەردەمە تازەدا مەبەستمان ئەوەیە بەم كەیفییەتەوە كە ئێستا هەیەتی، ئەگەرنا دەزانن لە قورئان و سونتەدا دەربارەی (نەتەوە) و جیاوازی لەنێوان نەتەوەكاندا چەنێك باسكراوە و چەنێك تەئسیس كراوە؟ هەروەها ئیسلامیش لەو حوكمەتە مەركەزییەی كە دروستی كرد شیرینترین نمونەی بۆ بەشەرییەت دروستكرد كەئینسانگەلی ئەوەڵی و پێشڕەوگەل و دەستەی ئەصڵی حەرەكەت لەكۆمەڵێك تەشكیل دەبێت، هەرواكە(علی) تێدایە كەعەرەبی خاڵصی (قوڕەیشییە)، (بیلالی)یشی تێدایە(حەبەشییە)، كەمەسەلە تەنها نەتەوە نییە هەتا قسەلەبارەی (نەژاد)ەوەیە، نەژادی عەرەب(سپی) پێستی تێدایە، (بیلالی حەبەشی) ڕەش پێستیشی تێدیە، سەیردەكەیت(سوهەیبی ڕۆمی) تێدایە، (سەلمانی فارسی) تێدایە، كەئەمانە ئەوەڵین قافڵەن دەموچاوی ئاوا دەبینیت! واقیعەن لوتكەی حەرەكەتی ئیسلامی بوو، كاكڵەی حەرەكەتی ئیسلامی بوو،

ەمانەش خاوەنی ئاوا ئەرزشێکن هەروەك ئەوەی چۆن(مێشك) کۆنتڕۆڵی جەستە دەکات یان(کاکڵە) ئەرزشی (گوێزە) ئەمانەش وادەکەونە یەك ئاوا ئەرزشن بۆ حەرەکەتەکە و بەوجۆرە جیهەتی پێدەدەن. ئەوانە واقیعەن کاکڵەی حەرەکەت بوون{مەبەست ئەو حەرەکەتەیە کە پێغەمبەر(ﷺ)سەرکردایەتی دەکات و صەحابەکان پشتیوانی}، لوبی حەرەکەت بوون کە تەشکیل بووبوون لە میللەتگەل و نەژادگەلی جیاواز. جا مەبەستم ئەوەیە وانەزانن(ناسیۆنالیستی) بەناونیشانی ئەمە کەدەبێت کێشەی نەتەوایەتی لەناوبچێت لەسەدەی تازەدا مەترەح بووە، نەخێر...لەئیسلامدا بۆلەناوبردنی(فاصیلەی نەتەوایەتی) هەم دەستوری زۆر گرنگ دراوە لە(ئایات و حەدیس)دا، هەم لەکردەوەشدا نمونەی بەرچاو هەیە لەیەکەمین هەنگاوەکاندا کە نراوە بۆ تەشکیلکردنی کاکڵەی کۆمەڵگەی ئایندەی ئیسلامی بەم جۆرە هەنگاونراوە، کە هیچ فاصیلەیەك لە نێوان میللەت و نەژادگەلدا نەمێنێت، بەڵام ئەم جۆرە دەرکەوتنی بابەتەکە(ناسیۆنالیستی)ناوە: کەنەتەوەگەل لەبەرامبەری یەکەوە دەست بکەن بەجەبهەگیری بەئەم شێوەی ئاشوفتەو ئالودەبووەیەوە پەدیدەی ئەم سەدەی کۆتایەیە.

## ناسیۆنالیزم:

جا سەیرێکی ناسیۆنالیست بکەین‌و بزانین(ناسیۆنالیست)چ جۆرە ناونیشانێکە لەبابەتی ئینساندا؟ ئایا قوتابخانەیەکە؟دیارە نەخێر!!! سەیردەکەیت تاماوەیەك (هەتا ئێستاش هەر شێوەی شیعاری هەیە) و محتەواو و پەیامێکی نییە

بۆ ئینسانییەت! لەزەمانێكدا لە هەندێك شوێندا جار جار پەیام و محتەوایەكی هەیە، بەڵام هەرلەو سنورە تایبەتەدا!
بۆنمونە ناسیۆنالیست هاتۆتە ناو(نەتەوەی ئیسلامی)ئەگەر بەم عینوانە نەڵێین، واتە ستەمگەلی میللی دەركەوتووە لەسەردەمی (ئومەوی)ەوە سەیردەكەیت میللەتگەلی ئیسلامی هەستاون بەپشت بەستن بە(كیتاب و سوننەت) ئیعترازیان گرتووە، یەكێك لەوانە مەسەلەن(میللەتی ئێران)ە، كەئەم فەرق و جیاوازییە نابێت لەنێوان میللەتگەلدا نابێت هەبێت، ئەمە كە(ئومەوی) خەریكن (نەژادی عەرەب) وەك نەژادێكی لە پێشتر بسەپێنن بەسەر نەژادەكانی تردا وەك بەسەر(عەجەم)دا، ئەمە نابێت هەبێت. بەپێی یاسا و پێوەری ئیسلامی دەبێت یەكسان بن، كەهەر ئەو زوڵمگەلی ئەوانەبوو بوویە سەرەتایی سەرهەڵدانی ئەو حەرەكەتە ئیرتجاعییە، كە شاهنشاهی هاتوو سودی وەرگرت لە ئیحساساتی میللی خەڵكی ئێران و ئەو كارگەلەی كرد كەئێستاش ئاساری دیارە و هەمووكەس دەزانێت هەندێك شت هەیە، كە ئێستا ناوێری بێژیتی، چونكە وەك ئەوە وایە كەسێك نەخۆشییەكی ترسناكی هەبێتو بڕۆیت پێیبڵێت تۆ ئەو نەخۆشییە ترسناكەت هەیە! كۆمەڵگەكە گرفتاری ئەو نەخۆشییەیە، ئەگەر بێژیتی حەقیقەتەن لەجیاتی ئەوەی سودی هەبێت بۆی زەرەری هەیە. (شاهنشاهی) ئێران سودێكی زۆری بینی لەو ستەمگەلە وا(ئومەوی) دەیانكردا كەدەهاتن نەژادی عەرەبیان بەناونیشانی یەك نەژادی لەپێشتر دەسەپاند بەسەر (عەجەم)دا بەسەر غەیری عەرەبدا، بەڕاستیش ئیسلامیان ئالودە كرد. جەبهەگیرییان والێكرد و شتگەلی وایان

هێنا (مەزهەب)* و لق و پەلی وادروست بوو كەزۆر زۆر لەتە بوو بۆ

---

*) وەك لەم نووسینەدا دەردەكەوێت و لە (كتێبی یەكەمیش)دا وتوومانە، دیدو بۆچوونی (كاك ئەحمەد) بەتەواوەتی چۆتە دەرەوەی حیزب و گرزپ و رێكخراو مەزهەبێكی دیاریكراوەوە، بەڵكو وەك خۆی دەڵێت"ئیسلام درەختێكە"، لەو وەك لە وتە و نووسینەكانیدا دەردەكەوێت بە تەواوی مانەوە بۆ ئەو درەختەكاری كردووە و هەرگیز ئامادە نەبووە تەرجیحی لقەكانی بدات بەسەر ئەوصڵی درەختەكەدا، ئەوەی لەم پەراوێزەدا دەیخوێنینەوە تەنها كورتە و پوختەیەكە لە دیدی كاك ئەحمەد بۆ مەسەلەی (ئەسەنون و تەشەیوع)، كە بەداخەوە هەرلەدێك دڵسۆز لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە قوڵ لەو زانایە بخوێننەوە زۆرجار وابیردەكەنەوە كە (كاك ئەحمەد) نەیوانیوە (سوننان)ە بیربكاتەوە و كاری بۆ سوننە نەكردە، كە بەداخەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانیشەوە تۆمەتی سوننەگەرایان بۆ دروستدەكرد و بە بەكرێگیراوی لەقەڵەم دەدەن!! بۆیە لەو دەڵێت:

دەربارەی ئەوەی كە(ئیسلام، شیعە یان سوننی؟) بەشێوازێكی سادە پێتان دەڵێم:

ئیسلام: واتە قەدی درەختێكە و سوننی و شیعەش لقەكانی ئەم تاكە درەختەن. و هەمدیسان ئاماژەم كرد كەلە ئێوچوونی شورا بووە هۆی لێكترازان و تەفرەقە و ئایینزاكان دروست بوون، بۆیە بە هاتنەكایەی دووبارەی شورا دەتوانین لە لێكترازانەوە بەرەو یەكرێزی و یەكبوون بگەڕێینەوە.

پرسیار: ئایا (ئایینزای سوننی) بە بوونی ئەو گوزارشتەی كەلە بارەی ئایەتی:﴿أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾* هەیەتی دەتوانێت شۆڕشگێڕ بێت؟

وەڵام: بەباسكردنێكی كورت پێتان ڕادەگەیەنم، لە ڕاستیدا (ئایینزای سوننی)، مەزهەبێكە كە لە بنەڕەتدا شۆڕشێكە لە دژی حكومەتی سەڵتەنەتی. (تسنن)لە ڕەگی(سنت)ەوە وەرگیراوە(سنت)یش دوو واتای هەیە:

١. واتە سوننەتی ئیلاهی و فەرموودە و كتێبی خودا.

٢. واتای دەسەڵات و شێوازی بەڕێوەبردنی وڵاتە.

ڕاپەڕین و بزوتنەوەی(تسنن)خوازیاری نوێبوونەوەی سیستەمی كۆمەڵگە بوو لەسەر بنەماكانی دەسەڵاتداری لەسەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەكانی ڕاشیدین و لەڕاستیدا ڕاپەڕینێك بوو لە دژی سەڵتەنەت.

(تسنن)دەڵێت"ئەوەی هەقە، بەسەر فەرمانڕەوایی بكات، شورایە نەك تاكەكەسی"-پێشتر ئاماژەم پێدا-"اولی الامر منكم"لە تەعبیر وگوزارشتی ئێمەدا، واتە شورا نەك تاكەكەسی. ئاماژەم كرد بە ئایەتێكی تر لە قورئاندا كە وشەی"اولی"كۆیە و هەرگیز ناتوانێت واتایی تاكی بەسەردا بسەپێنرێت. و هەمدیسان ئاماژەم بەو حكومە﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾كرد و لە ئاماژەیەكی تر بۆ ئەو كەسانەی كە تاڕادەیەك ئاگادارن ئەمە دەڵێم كە سێ بنەڕەتمان هەن بۆ شوێنكەوتن:

یەكەم: كتێب، كە قورئانە

دووەم: سوننەت، سوننەت، واتە فەرموودەكانی پێغەمبەری ئیسلام.

سێیەم: ئیجماع(كۆدەنگی)، واتە ڕای پەسەندكراوی هەمووان یان ئەندامانی شورا.

چەمكی(اولی الامر) لە مێشكی هەندێكدایە بەهۆی لێكدانەوەی چەند بەكرێگیراوێكی ئایین فرۆشەوە بە واتای دەسەڵاتداران لێكیان داوەتەوە، بۆتە هۆی هاتنە ئارای پرسیارێكی لەم چەشنە كە (تسنن)چۆن دەتوانێت شۆڕشگێڕ بێت؟

نا ئازیزانم، (اولی الامر)بەواتایی فەرمانڕەوایان نیە، بەهەمان شێوە كە ئاماژەمان پێدا(اولی الامر)واتە شورا، ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ و لەهەركات و لەهەر كۆمەڵگەیەكدا شورا دەتوانێت هێمای جان و جوڵانی كۆمەڵگە بێت، واتە گۆڕینەوەی

**ئیسلام، جا تاوانباری ئەم ڕوداوانە لەسەرەتاوە(ئومەوین)لەوەودوا جیابوونەوەی ئێران و تازە بوونەوەی شاهنشاهی ئێران! ئەمانە بوو دەستیان دایەدەستی یەکەوە و ئەم گشتە ئیختلافە مەزهەبییەیان دروست ئەم مەسائیلە عەجیبو غەریبانەیان هێنا!!ئەمە جۆرێك ڕوبەڕوبونەوە بوو لەبەرامبەر (ستەمگەلی میللییەوە) نەك بەعینوانی(ناسیۆنالیزم). هەتا لە(شانامەی فیردەوسی)دا بەڕوونی لەمسی بابەتەکە دەکەیت کەچی کراوە و دژە کردەوە چی بووە.**

---

ڕای خاوەن ڕایان و زانایان. و ئەگەر(اولی الامر) بەواتای تاك وەربگرین چ لە سنوری دەسەلاّتدا و چ لەئاستی سەرکردایەتی، یان هەر ئاستێکی تردا، بەڵێ لەو سنورەدا جانی شۆڕشگێڕانەمان لێدەسەنێتەوە. بەلاّم ڕاستییەکەی ئەوەیە کە(اولی الامر)جگە لە واتای شورا لەنێو سونني مەزهەبەکاندا هیچ واتایەکی دیکەی نیە. بەهەمان شێوە کەلە کۆڕەکەمدا ئاماژەم پێدا ئەوەی بەڕای سونني شۆڕشگێڕەوە–سونني نەبەوی نە سونني ئومەوی–ئرخ و بەهای هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و دەتوانێت کە کۆمەڵگە بە ڕێوەبیات بریتییە لە هەمان شورا کە قورئان فەرمانی پێدەکات﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾وە ئەندامانی شوران–(اولی الامر)–. (اولی الامر)، واتە کەسانێك زانیاری و ئاگاداریيان بۆ کێشە و بابەتەکانی کۆمەڵگە بەڕادەیەکە کە بتوانن ڕێگایەك بۆ کامڵ بوونی کۆمەڵگە بکەنەوە. تاکاتی بەدەسەلاّت گەیشتنی موعاویە، دەسەلاّت و کێشە و بابەتەکانی تری کۆمەڵگە بەهۆی ئەم شورایەوە چارەسەردەکران. و(تسنن)ڕاپەڕینێکە لەڕاستیدا بۆ نوێبوونەوەی سیستەمی دەسەلاّت لەسەر بنەڕەتی شورا و ڕاپەڕینەوە لە دژی سەڵتەنەت، چونکە تسنن(هەرووەك چۆن وتمان لە ڕەگی(سنت)ەوەیە بەواتای سیستەم و شێواز و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەیە. (تسنن) خوازیاری ئەوە بوو کە حکومەتی سەڵتەنەتی و تاکەکەسی لابرێت و حکومەتی شورا دووبارە بگەڕێتەوە، تا سەردەمی موعاویە هەمیشە و هەردەم بە شورا هەموو بابەتەکان–وەك دیاری کردنی سەرۆکی دەسەلاّتی ڕاپەڕاندن و بابەتەکانی تر چارەسەر دەکرێن.

ئەوەش بڵێم، هەندێك دەپرسن(ئایا کاتێك دەڵێین خەلیفە راشدینەکان، خەلیفە ئومەوی و عەباسیەکان دەگرێتەوە؟)

نەخێر! کاتێك دەڵێین خەلیفەکانی ڕاشیدین مەبەستمان کەسانێکە کە بەشورا بەهۆی هەڵبژاردنەوە دەگەشتنە دەسەلاّتی ڕاپەڕاندن، کەواتە تا سەردەمی حەزرەتی ئیمام(حەسەن)وشەی خەلیفە دروستە، لەدوای حەزرەتی(حەسەن)بەدواوە–لەسەردەمی موعاویە–ئیر وشەی خەلافەت بۆ دەسەلاّتداران دروست نیە. و هەمدیسان ئاماژەیەکی ڕوونم کرد: وتم لە خیانەتی مێژونوسانە کە دەڵێن"خەلیفەکانی ئومەوی و عەباسی". لەکاتێکدا ئەمانە خەلیفە نەبوون، بەڵکو سوڵتان و شاهەنشاه بوون.



لەم سەدەی كۆتاییەدا دووبارە ناسیۆنالیست بەشێوەیەكی ڕوونتر مەترەح دەبێت سەیردەكەیت بەڕاستی حەدی ئەكسەر كەلەشیعار لادەدات كەمێك ئەوەی وا زۆر ڕۆشنە و پەیامدارە سودوەردەگرێت لەو یاسا و پێوەرانەی وا ئیسلام هەیە لەبابەتی جیاوازی نێوان میللەتگەلدا كە دەبێت نەبێت، بەڵام ناكەوێتە كار بۆئەوەی لەباقی بابەتگەلی ئینسانی بكۆڵێتەوە! دیارە خۆ ناشتوانێت، چونكە (میللییەت) یەك جۆر بابەتی ئینسانە، بۆیە ئەگەر زۆر زۆر پڕ محتەواو پەیامیش بێت دەتوانێت هەر لێكۆڵینەوە لەسەر ئەو یەك جۆر بابەتە بكات و تەنها دەرمان بۆ ئەو یەك جۆرە دەردە بدۆزێتەوە{كە مەسەلەی نەتەوەیە}! بۆباقی بابەتەكانی ئینسان ناتوانێت كارێك بكات، چونكە پەیوەندی بەمیللییەتەوە نییە. بۆنمونە ئەگەر ئێستا ئەم حوكمەتەی ئێرانە واقیعەن بتوانێت ببێتە حوكمەتێكی ئیسلامی و ستەمگەلی میللی لەناوبەرێت، ئایا مەسەلەی میللەتی كوردی مەحروم و بەدبەخت تەواو دەبێت؟ هەرئەوەنەی لەڕووی میللییەوە ستەم نەماوە بەمیللەتی كورد وترا"زمانتان، فەرهەنگتان، مەوجودییەتتان، هەڵبژاردنی ئیدارەی ئمورتان" بسپێریتە یەك (شورای)واقیعەن ئیسلامی، بە ئیختیاراتێكی كاملەوە كەئیسلام دەیداتە شوراگەل. ناوچەی كوردستان شورایەكی هەبێت خۆی ئیدارەی بكات ئەمە بەمانایی ئەوەیەت ئیتر كێشە نەما و تەواو؟! هەتا (كوردستان) تەواو سەربەخۆ بێت كێشەی تەواو دەبێت؟ ئەوە (میللەتی عەرەب) چەندین وڵاتە سەربەخۆیان هەیە، ئەوە میللەتی سەربەخۆی دونیا كە وڵاتگەلی سەربەخۆیان هەیە و ستەمی میللی مەترەح نییە بۆیان، ئایا كێشەیان نەماوە؟ ئایا نامێنێت؟!!!





نەخێر...ئەوكاتە كێشەكان باشتر دەكەونە دەرەوە و سەربەرز دەكاتەوە دەی ئایا(ناسیۆنالیست) چارەسەرێكی هەیە بۆئاوا كێشەگەلێك؟ ئەمیش نەخێر، خودی ناسیۆنالیست زۆریش پڕ محتەوا و پەیام بێت، ئەوەیە كە بەم شێوەیەی لەلای خۆمان دەیبینن سود وەردەگرن لەڕێنمایی و یاسا و مەوازینی ئیسلامی بۆئەمە كە نابێت لەنێوان میللەتگەلدا جیاوازی هەبێت، جا تەرحەكەشیان ئیجرایەكەشی هەرئەو سیستەمەی سیاسی و ئیدارییە كە ئیسلام هەیەتی، كە هەرناوچەیەك خاوەنی تایبەتمەندییەكە شورای خۆی هەبێت، چونكە ڕاجع بەشوراگەل بە تەناسوبی (مەوازینی شەرائیتی زەمان) كاردەكرییەت، لەیەك زەماندا دەكرێت یەك شار شورایەكی كامڵی ناوچەی خۆی هەبێت بەتەواوی ئیختیاراتی پێویستی خۆیەوە، چونكە ئەهلی ئەو شارە خاوەنی تەواوی ئیمتیازات و تایبەتمەندییەكن كەجیایان دەكاتەوە لەشار و دەوروبەرەكەی، لەشوێن و كاتێكی تردا دەكرێت بۆشارێك دروست نەبێت شورایەكی بەوجۆرە هەبێت، چونكە ئەو شارە لەگەڵ چەند شار و دێیەكی دەوروبەریدا بابەتەكانیان هاوبەشن بۆیە شورایەك كەشورای ناوچەیی بێت بەو ئیختیاراتەوە كە شورایەك هەیەتی بۆ گشتیان دادەمەزرێت، وەك نمونەیەك دەیڵێم بەشێوەیەكی گشتی لەهەلومەرجی زەمانی ئێمەدا ئەوەی وا پێی ئێژن (كوردەواری) نەك (ئوستانی كوردستان) كە (ئوستانی كوردستان) دەبێتە بەشێك لە (ئوستانی كرماشان)، كەهەڵبەتە لەحەقیقەتدا زۆر فراوانترە (كرماشان، ئازربایجان، گەیلان..)، بەڵام خۆ مەسائیلێك بەوجۆرە تەحمیلی

نییە بەوجۆرەی لە(کۆنفرانسی خودموختاری)*دا قەتع نامەیەکمان هەبوو ئیشارەتمان پێ کردووە ئەمە تەحەمیل ناکرێت، بەڵکو بەئارەزووی خەڵکی خۆیانە لێرەشدا دووبارە نابێت دیکتاتۆری بەکاربهێنین لەتەحەمیلی ناسیۆنالیستدا، کە تۆ کوردیت و دەبێت لەگەڵ کورددا بێت بەئارەزووی خۆی. بەگشتی دەبێتە (ئوستانی کوردستان و بەشێك لە ئوستانی کرماشان و بەشێك لە ئوستانی ئازربایجانی غەربی...) سەیردەکەیت ئەمانە مەسائیلیان یەکێکە تەقریبەن دەبێتە یەك، بینا لەسەر ئەمە ئەو ڕەفعی ستەمی میللییە نیسبەت بەمانە دەبێت وابێت کە(شورای خودموختاری) شورای ناوچەی بەوجۆرە بێت کەگشتی ئەمانە بگرێتەوە، لەجێگەیەکی تردا وەك(تورك..)سەیردەکەیت سنورێك بچوکترە، لە جێگەیەکی تردا مومکینە بچوکتر... ئەوە ئیسلامە لێرەدا محتەوای داوەتە ناسیۆنالیست کە ئێژێ "ڕێگە چارەسەری سیاسی و ئیدارییەك بۆئەوەی ستەمی میللی نەمێنێت (شوراگەلی ئیسلامییە) بەم تایبەتمەندییەوە"، ئەمە ئەو سەریەتی، ئایا زاتی ناسیۆنالیست دەتوانێت کارێك لەمە زیاتر بکات؟ و کێشەی بەشەری حەلبکات؟ نەخێر... بۆیە دەبێت ناسیۆنالیست یەك مەسەلە بێت لە(مەکتەبێك جامع) کە لە تەواوی مەسائیلی ئینسانی دەکۆڵێتەوە و بۆهەر کارێکی پێوەری هەیە و چارەی هەیە. بۆنمونە ئیسلام بۆ(میللییەت) مەوازینی هەیە و چارەسەری دەکات، بۆبابەتی (مەزهەبی)ڕێنمایی هەیە و چارەی دەکات، کە لەنێوان پەیڕەوانی مەزهەبدا قسە و باس دەربارەی باشتر لەیەکتری نەبێت، بۆ مەسائیلی

---

*) بۆ زیاتر خوێندنەوە دەربارەی (کۆنفرانسی خودموختاری) بگەڕێرەوە بۆ کتێبی یەکەم(کاك ئەحمەدی موفتی زادەو دەروازەیەك بۆ خەباتێکی نەناسێنراو، سەرووەت عەبدولاّ).

عامی ئینسانی ڕێگە چارەی هەیە کەئیمتیازاتی مادی و مەعنەوی نەبێت، چینایەتی بوونی نەبێت، تەواوی مەسائیلیش هەربەوجۆرە، بەڵام تەنها ئەم سیانە(میللی، مەزهەب، چینایەتی) ئصوڵێن لەمەسائیلی ئینسانگەل لەئێراندا.

لیبرالیستیش هەروەك(ناسیۆنالیست) لەمەدا قوتابخانەیەکی فرەلایەنە نییە، قوتابخانەیەك نییە کەتەواوی مەسائیلەکانی ئینسان لەخۆی بگرێت و ڕێگەچارەی بۆ بدۆزێتەوە، بەزۆری لەزۆربەی کات و شوێنەکاندا تەنها شیعارە ئەویش شیعاری(ئازادی ویستن) هەتا پەیامی بۆئازادی ویستی و بەرقەرارکردنی ئازادی دەکاتە یەکێك، هەروەك شیعار! حەدی ئەکسەر کاتێك دەبێتە خاوەنی پەیام لە ڕەهەندی سیاسیی (پەیوەندی نێوان حوکمەت و خەڵك)دا، -ئەویش هەتا نەك تەواوی خەڵکی، بەڵکو خەڵکییەك کەلەگروپە سیاسییەکاندا بوونیان هەیە- بۆ ئەمانە ڕێنمایی و ڕێگەچارەیەکی هەیە، کە ئازادن، چالاکییەکانیان وابێت و وابێ! ئەی بۆ باقی مەسائیل چی؟ ئائەم واقیعیەتەیە(لیبرالیست) کە یەکێکە لەبەرهەمەکانی(ڕێنسانس)ە. هەروەها خودی فکرەکە فکرەیەکی پۆزەتیڤ(موثبت)ە و دژی داگیرکاری، دژی کلیسا و زۆردارگەل، بەڵام زەمان دەگوزەرییەت، حیزب دروست دەبێت، تەشکیلات و چالاکی دروست دەبێت لەژێر ناونیشانی (لیبرالیست)دا، و لەپاشاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ بابەتی جیاوازی بەشەرییەتدا، چ ڕێگەچارەیەکیان نییە! لەوکاتەدا دەبینیت (لیبرالیست) قیافەیەکی تر پەیدادەکات! کەئەمە بۆهەر جۆرە ناونیشانێك لەناونیشانگەلی جیاواز کەخەریکن لێکۆڵینەوە لە مەسائیلی بەشەری دەکەن هەر دروست دەبێت! بۆنمونە(ناسیۆنالیست) ئەگەر لە وڵاتێکدا مەترەح ببێت و محتەوا پەیدانەکات

و هەروەك شیعارێك بێت، یان گریمان محتەوا پەیدابكات و فرە عالی وەك ئەم محتەوا ئیسلامییە كە ئێمە داومانەتە ناسیۆنالیستێك كەئێستا لە ئێراندا مەترەحە و ئیمكانی هەیە لەكەمترین حاڵدا زاتی ناسیۆنالیست بەو محتەوا ئیسلامییەوە ڕەنگ و محتەوایەك پۆزەتیڤ(موثبت) پەیدا بكات و گشت كەس بەوجۆرە ناسیۆنالیست مەترەح بكەن، كەئیسلام ئێژێتی و ئێمەش ڕێگەمان پیشانداوە. (باشە ئەی بۆ مەسائیلی ئابوری و كۆمەڵایەتی جۆراوجۆر و خانەوادە و پەروەردە و فێركردن چی دەكەیت؟!!! هەزاران مەسئەلەی تر دەمێنێتەوە كە ئیتر ناسیۆنالیست ناتوانێت چارەسەری بكات). ئێستا ئەگەر ئایندەی ناسیۆنالیست بگرینە بەرچاو لە هەرێم و وڵاتگەلێكدا دەزانین عەینەن سەرگوزشتەی لیبرالیستی بەسەردا دێت كە لە زۆر شوێندا بەسەریشیدا هاتووە! دەگاتە جێگەیەك دەی باشە بۆباقی مەسائیل چیت هەیە؟ هیچی نییە! یەك مەحدودەی خاص لەمەسائیلی ئینسانی دەگرێتە نەزەر بۆباقی تر ئەصڵەن ناتوانێت باسی لەبارەوە بكات. دەی باشە كاتێك نییەتی و توانایی نییە ئەی ڕوداوگەلێك لە كۆمەڵگەدا دروست دەبێت وەك(ئابوری، كۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، خانەوادەگی) لەبەرامبەر ئەمانەوە چی دەكەیت؟! نازانێت دەبێت چی بكات جائەو كاتە خۆی دەدات بەدار و بەردا، بەملاوبەولادا دەڕۆن و ڕێگەی جیاوازی پەیدادەكەن!!

لیبرالیست، دوای ئەوەی دەورانێك لەعومری گوزەریا و حیزبگەل و چالاكی تەشكیلاتی گرنگ لەئەورپا دروست بوو گەشتە ئەوەی هێزیان پەیداكرد تابتوانێت كۆمەڵگە بەڕێوەبەرن، ئەمەش سەرەتای بەدبەختی و ڕسوایی و بەدناویان بوو دەی فەرموو چیت هەیە بۆ كۆمەڵگە؟ چۆن كۆمەڵگە بەڕێوەدەبەیت؟ هیچی نییە!



ئەی چی دەکات؟ کاتێك سەیردەکات بۆمەسائیلی جۆراوجۆر و خۆشیگەلی جۆرجۆری کۆمەڵگە خودی(ئازادی ویستی) کافی نییە، ئازادی ویستی یەك مەسەلەیە هەروەك(نەتەوەیی)یەك مەسەلەیە، ئەم یەك مەسەلە صەلاحییەتی نییە هەیە بۆ باقی مەسەلەی ئینسان چارە بدۆزێتەوە، بۆیە کاتێك ڕووبەڕوو بوویەوە لەگەڵ کێشەگەلی دەست و پێگیری کۆمەڵگەی ئەورووپی کەبەرەو گۆڕانکاری جۆراوجۆر دەچوو لەڕوی ئابورییەوە سەرگەردان بوو نەیزانی چی بکات! لێرەدا بەزۆری کاتێك حەرەکەتێك دروست بووە و خەریکە کاردەکات و دەیەوێت کۆمەڵگە بگرێت بەدەستەوە و نیزام و بەرنامەیەکی نییە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کۆمەڵگەیە مومکینە دوچاری جۆرەها لەڕێگەلادان ببێتەوە و یەکێك لەو ئینحرافات(لەڕێگەلادانانەش) بریتییەلە (سازشکاری)، چونکە بەرنامەی نییە کێشەکان حەل بکات هەرحاڵەتێك لە کۆمەڵگەدا سەرهەڵبدات باشە،{سازشدەکات و قسەیەکی نییە بیکات}، ئەگەر لەکۆمەڵگەدا خوێن مژی و خراپترین جۆری فیوداڵی سەرهەڵبدات باشە، چونکە بەرنامەیەکی نییە بۆی لەگەڵیدا ڕێکدەکەوێت. ئەگەر لە کۆمەڵگەدا خراپترین جۆری سەرمایەداری ئیستسمار لە چینی خوارەوە تا چینی سەرەوە سەرهەڵبدات لەبەرئەوەی چارە و بەرنامەیەکی نییە بۆی شتێکی باشە و دەسازیەت لەگەڵیدا! ئەو تەنها مەسەلەکەی خۆی مەترحە بۆی ئەویش(ئازادی)یە، لەڕووی سیاسییەوە ئازادی ئیتر لەوە بترازێت هیچ ناتوانێت و نازانێت و بەرنامەی نییە،ئەگەر لیبرالیست لەشیعارێك بەدەرنەبوایە خۆشبەختی بوو بۆ لیبرالیست و بەدناو و ڕسوا نەدەبوو، حەقیقەتەن(ئازادی ویستی) ئەگەر تەنها بیگریتە نەزەر هیچ وەخت خۆی ڕسوا نابێت شتێکی

بێگومانە كەلە فەهمی ئینساندا هەرچەند قوتابخانەیەكی وەك(ماركسیست) فرە تەكییە بكات لەسەر دیكتاتۆری، ئەگەر تەنها شیعار بوایە هیچ وەخت ڕسوانەدەبوو، هەروەك ئێستا سەیردەكەیت مەفهومی خودی ئازادی ویستی هەرگیز ڕسوا نابێت، بەڵام كاتێك لەسنوری شیعارێك دێتە دەرەوە و حیزبگەلێك بە(ئازادی ویستی) خۆیان دروست دەكەن و دەیانەوێت كۆمەڵگە بەڕێوەبەرن ئەوە سەرەتایی بەدبەختییانە، سەرەتایی بەدبەختی ئەوان و ڕسوابوونی عەمەلی لیبرالیزم، نەك مەفهومی ئازادی ویستی! ئەمە بەعینوانی یەك تەرحە خەریكە ڕسوادەبێت، لەبەرئەوەی كاتێك گروپ و حیزبگەلێك دروست دەبێت و دەسەڵات پەیدادەكات و خەریكە كۆمەڵگە بەڕێوە دەبات ئیتر جا بەدوو كەلیمە و چوار دانە كار و پێنج دانە كار داواكارییەكانی خەڵكی تەئمین نابێت و خەڵكی لێیان ڕازی نابن، بەڵكو دەبێت بەتەواوی ئەو مەسائیلانەی لەكۆمەڵگەدا مەترەح دەبن بۆ گشتی ڕێگە چارەی هەبێت، دەبێت كێشەكانی كۆمەڵگە دەرمان بكات، باشە دەی خۆئەم دەرمانانەی نییە هەرگ(قوڕ)ی كوێ بكات بەسەریا؟! جائەمەش وەك دادگا بەئیصتلاح ئینقلابییەكانی ئێستای ئێرانی لێدێت، جۆرەها شێوە حوكم دەردەكەن! لەوكاتەدا كابرا مەحكوم دەكات بەئیعدام كەچی بەوەسیلەیەك و واستەیەك بەبێ دواكەوتن ئازادی دەكات! دەی ئەمە چ حوكمەتێكە بەوەسیلەی واستەیەكەوە لە ئیعدامەوە گۆڕا بۆ ئازادی!! لەم بارەیەوە نمونەی زۆرمان هەیە. لیبرالیست، وەك ئەمانەی لێهات لەبەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی كێشەكانی كۆمەڵگەدا، خەڵكی كێشەی هەیە و نارەحەتە كەچی ئاغای لیبرالیست بەقوربان جلوبەرگ و قژی عەتر لێدراوت بم!! ئەم گشتە خەریكی هاوار و

داد دەکەیت بۆ ڕزگارکردنی ئێمە لەدەست بەدبەختیگەل، کورە خۆ خاوەن سامان و فیودالّەکان ڕیشەیان دەرهێناین، کورە خۆ بۆرجوازییەکان، خاوەنکارگەکان خواردمانیان و خەریکن بەجۆرەها ڕێگە بەدبەختمان دەکەن، سەرمایەدار و خاوەن موڵکەکان ڕیشەیان دەرهێناین، کورە خۆ بۆرجوازییەتگەل خواردینیان! دەی فەرموو دەرمانی دەردێك بدۆزەرەوە بۆمان، {لیبرالیست کە گوێ لەم داواکارییانە بوو دەیگووت} "وەڵا براکان ڕاست دەکەن ئەمانە هەرگیز نابڕێنەوە"، لەولاشەوە کە (خاوەن کارگە) دەهات دادەنیشت و دەکەوتە قسە لەگەڵ لیبرالیستەکان و بەکۆمەڵێك وشە و ڕستەوە کە نزیکترە لە زەوقی لیبرالیستییەکانەوە(ئەوان ئەو جۆرە قسانەیان پێخۆشترە) دەستی دەکرد بەقسەکردن لەگەڵیدا لەبەرامبەردا لیبرالیستییەکان لێیان دەبویە شتێکی زۆر گرنگ و لەکۆتایدا دەیانوت "وەڵا برا تۆ ڕاست دەکەیت". لەولاوە بەکابرای هەژار و ئاساییان دەوت "تۆ ڕاست دەکەیت"، لەم لاشەوە بەکابرای خاوەن کارگەیان دەوت "تۆ ڕاست ئەکەیت"! جا ئەمە وەك نمونەی داداگییەکەی (مەلا نەصرەدین) وایە، دەگێڕنەوە (ڕۆژێکیان دوو پیاو دەچنە لای مەلا نەصرەدین بۆئەوەی چارە سەری کێشیەکیان بۆ بکات، کابرای یەکەمیان دەکەوێتە قسە و دەردەدڵی خۆی دەکات کە چەنێك ناحەقیان بەرامبەر کردووە و زوڵمیان لێکردووە، مەلاش دەڵێت"ئای ئەم خەڵکە چەنێك ناحەقی دەکەن و بێویژدانن"، دوای ئەوە پیاوی دووەم دەستدەکاتە ڕەخنەو کە "مەلا نەصرەدین خۆتۆ ڕێگەت نەدا من قسە بکەم و ئەمە نابێت...." مەلاش دەڵێت "دەی فەرموو تۆش قسە بکە"، کە پیاوی دووەمیش دەکەوێتە قسە و باسی ئەو ناحەقی و زووڵمە

دەکات لێیانکردووە، مەلا بۆئەمیش دەستدەکات بە ئەسەف دەربڕین کە ڕاستدەکات و ناحەقی بەرامبەر کراوە! هەردوو پیاوەکە سەریان سوڕدەمێنێت کە مەلا نەصرەدین بە قسەکانی هەردووکیانی وت ڕاستدەکەن، کەسێك لەناو مەجلیسەکەدایە دەستدەکات بەقسە کردن کە "مەلا ئەمە چی قەزاوەتێکە و تۆ بە قسەی هەردووکیان هەر دەڵێت ڕاستە و ئەسەف دەردەبڕیت و وا نابێت"، مەلا نەصرەدین لە وەڵامی ئەمیشا دەڵێت "وەڵا تۆش ڕاست دەکەیت"!)... سەیر ئەم بەدبەختییە! بە هەردوو لایەنی دەعواکە دەڵێت تۆ ڕاست دەکەیت! بە کەسی سێیەمیش کە ڕوخنەی لە قەزاوەتەکەگرت ووتی تۆش ڕاستدەکەیت. {جا لیبرالیستیش هەمان مامەڵە دەکات، بە ڕەخنە و داواکارییەکانی خەڵکی دەڵێت ڕاستەکەن و حەقی خۆتانە و خیانەتان لێدەکەن، لەولاشەوە بە خاوەن کارگە و فیوداڵەکانیش دەڵێت ئێوە ڕاستدەکەن و دەبێت وابکرێت و وانەکرێت!!}

بۆیە (لیبراليست)ئەگەر لەوە نەترسیت کەلەدوایدا مەسائیلی جۆرجۆری کۆمەڵگە سەرهەڵدەدان و دروست دەبن، حەدی ئەکسەر لەشێوەی شیعارێکیشدا بوایە بە هەندێك محتەواوە لە ڕووی ئازادی سیاسییەوە باشبوو تووشی کێشەیەك نەدەبوو، بەڵام کەوتە ئەو ئەوزاع و ئەحواڵەوە ئیتر ڕسوایی دەستی پێکرد، جا(ناسیۆنالیزم)یش هەمان سەرگوزشتەی هەیە یەك حیزب یان گروپ کەشیعاری ناسیۆنالیزمە و کار بۆ ڕەفعی ستەمی نەتەوەی دەکات، ئەگەر بەرنامەیەکی هەمەلایەنەی نەبێت کە گەرەکی بێت پێشکەشی بکات بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە سبەی چی ڕوودەدات؟ ئەوە ڕەفعی ستەم کرا بەمحتەوایەکی زۆر زۆر بەرزەوە ئەم ستەمە ڕەفع دەکەیت، تۆ شورای

ناوچەی خۆت دامەزرێنە و كۆمەڵگە بەڕێوەبەرە ئەمە ئەوەڵی بەدبەختی و ڕسوای و بەدناوییە. باشە واستەمی نەتەوەی نەما و نەتەوەی كورد وەك یەك كۆمەڵگەی ئیسلامی مافی پێدراوە لەڕووی(سیاسی، كۆمەلأیەتی، سەربازیی، دادگایی، فكری و مەزهەبی) و هەرچی شتە گرینانەی ئەوە بكەین كۆمەڵگە تەواو ئیسلامییە، فلأنە كۆمەڵ و گروپ كەتۆ پێشڕەوی ئەم داواكارییە بویت، ئایا بەرنامەت هەیە بۆ مەسائیلەكانی تری كۆمەڵگە؟ ئەگەر بەرنامەی(مەكتەبی) هەیەو ئامادەگی پەیداكردووە زۆر باشە، بۆیە (ناسیۆنالیست)مەسەلەیەك بوو حەل بوو تەواو بوو ئەصڵەن باسیشی نەما، چونكە كاتێك ستەمی نەتەوایەتی نەما ئیتر ئیحساساتی نەتەوایەتیش نامێنێت. ئەم (ناسیۆنالیستە) ڕەدفعلێكە لەبەرامبەر زوڵمەوە كاتێك كە زوڵم نەما ئیتر تۆ خەریكی كاری فەرهەنگی و سیاسی و قەزائی خۆتی و جۆرەها كار ئەنجام دەدەیت تەواو دەبێت، بەلأم (مەكتەب) بەرنامەی هەیە بۆباقی كێشەكان و چارەی دەكات. بەلأم ئەی ئەگەر نەبێت چی؟ ئەوەی واپێشڕەوی ناسیۆنالیستە و بەرنامەی نییە بۆ چارەسەركردنی كێشەكان سبەی جۆرەها كێشە وەك(ئەژدیها)دەم دەكاتەوە بۆیە سەیردەكەیت پێشڕەوانی ناسیۆنالیست، چونكە بەرنامەیان نییە پەكیان دەكەوێت و ڕسوا دەبن، تەماشا دەكەیت ئێستا خراپترن لەجاران! جاران بەهەرحاڵ بە ئیستبداد و بە هەر جۆرێك بوو بەرنامەیەكیان هەبوو بۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵگە، بەلأم ئێستاكە ئەمان بەرنامەیان نییە كێشە و شپرزەیی زۆرتر دەبێت، ئەو كاتە خەڵكی نارازی دەبن خەڵكی دەڵێن ئەوە ئێوە چیتان كرد؟ دەردی ئێمەتان دەرمان كرد؟





نا...دەردمان زیاد کردن، نمونەی فراوانیش وەك ئەم ئینقلابەی ئێران. ئەم ئینقلابە بەم گشتە عەزەمەت و ئارایشت و عەدەمی وابەستەگییەوە کەوتە دەست ئەم جەماعەتەوە کەئەم حوکمەتە ئەوەتا بەدەستیانەوە بەم هەموو کێشە جیاوازانەوە کەهەیانە! ناوی ئینقلابی ئیسلامی بوو چاوەڕێی ئەم میللەتە ئەوەیەکە تبقی ڕێکخستنی فراوان و گرنگ و دەقیقی مەکتەبی ئیسلامی کۆمەڵگە بەڕێوەبەرێت، ئیسلام بۆ تەواوی کێشەی بەشەری بەرنامەی هەیە هەروا بۆ بابەتە نەتەوەییەکان هەیەتی بۆ تەواوی بابەتەکانی تریش هەیەتی، هەروا بۆ ئازادی ویستی و مەزهەب هەیەتی بۆ تەواوی بابەتەکانی تر هەیەتی، هیچ مەسەلەیەك لەمەسائیلی ئینسانی نییە کە بەرنامەی نەبێت بۆی وەکو هیچ مەکتەبێکی تر نییە! هیچ مەکتەبێکمان نییە کەبۆ تەواوی بابەتە ئینسانییەکان بەرنامەی هەبێت، بەڵام ئەوە تەنها ئیسلامە بۆ تەواوی مەسائیلی ئینسانی بەرنامەی هەیە، دەی فەرموو ئاغاگەلی تازە بەدەوران گەیشتوو! ئاغاگەلی حوکمەتی (فیوداڵ) چی بەرنامەیەکتان هەیە بۆ بەڕێوە بردنی کۆمەڵگە؟ بۆ نمونە ئەمە یەکێکە لەرەخنەکان، چونکە ڕەخنەیان فرەیە. ئەوەندە شارەزانین لە ئیسلام کەڕاستەوخۆ بڵێین ئەو کێشە ئاوا چارە دەبێت و ئاوای چارە بێت، ئەوانەش واشتێك دەزانن ئەم لەشتێك شارەزایە و ئەو لەشتێك و ئەو لەشتێك، تەنانەت زانیاریشیان لەسەرچاوەی جیاوازی زانیارییەوە هەیە، بۆ نمونە ئەگەر لە ئێراندا(دە کەسمان) هەبێت لە (ئابوری ئیسلامیدا)شارەزا دەبینیت لەسەرچاوەی جیاوازەوەیە و لەژێرکاریگەری موتاڵەعە کردنی جۆراوجۆرەوە (ئابوری ئیسلامیان) تەفسیر کردووە هەرکەسە و بەجۆرێك تەفسیری دەکات، جا زیاد لەوەش (مەلاگەل) ئیجازە




بەخوێندەواران نادەن كەئەوانیش بێنە مەیدان و بیروڕای خۆیان بڵێن ئەمەش دەردی لەسەر دەردان! بەگشتی ئێستا ئەمانەش(ئەوانەی حوكمی ئێران دەكەن) ڕێك حاڵەتی لیبرالیستی ئەوروپایان پەیداكردووە! ئەمانە وا لایەنگری لیبرالیست دەكەن وەك مەلاكان و مەرجەعە تەقلیدییەكان (كەمەبەست گروپێكی یەكگرتووی تەشكیلكراوی خاوەن هێزی هێز پەرست كەبونەتە بەلاّ و ئافات بۆئەم ئینقیلابە).

ئەمانە كەبوونەتە دەرد بۆئەم ئینقیلابە حەقیقەتەن خۆیان لیبرالیستن. ئەمەش بەمانا نێگەتیڤەكەی نەك بەمانا پۆزەتیڤەكەی لایەنە پۆزەتیڤەكەی كە(ئازادی ویستی)یە بەموتڵەقی ڕەنگێكی لەمانەدا نییە، بەلاّم مانا نێگەتیڤەكەی كەئەو ڕوداوە مێژووییە بوو دوای بەقودرەت گەیشتنی حیزب و گروپگەلێكی لیبرالیست لەئەوروپا دوچاری بوو هەروەك ئەوە بۆ ئەمانەی ئێرەش دروست بوو، چۆن ئەوان سەیریان كرد ڕووبەڕووی كێشە دەبنەوە و ڕێگە چارەیان نییەبۆی ئەمانیش هەم لەبەر نەخوێندەواری (ئاخر بەوجۆرەی باسمكردووە لەشوێنی دیكەدا هەندێك مەلا هەیە كە فەقیرانە تەنها شتێك كەلێی شارەزا نەبن"دینە"مومكینە لەهەموو شتێكدا شارەزا بن، بەلاّم لەدین شارەزا نین!) كورە خۆ مەلاكانی تریش هەروان، بەحەقیقەت مومكینە یەكە یەكەیەكیان تێدابێت و لەهەندێك لەمەسائیلە ئیسلامییەكان زۆر شارەزا بن، بەلاّم ئەگەر دین بەناونیشانی یەك مەكتەبی جامعە شوناسی كەلە تەواوی بابەتەكانی ئینسان دەكۆڵێتەوە مەترەح بێت ژمارەیەكی ئێجگار كەم لەناو مەلاگەلدا شتی واهەیە كەمەبەست مەلاگەلی لەسەرانسەری ئێراندا، لەناو(شیعەشدا) واقیعەن زۆر كەمە، ئەگەر شارەزاشبن تەنها بەدەمییە و ڕەوشتی كردارییان

نییە، بەرنامەیەكیان نییە بۆئەوەی وادەیزانن پیادەی بكەن. ئەگەر وابێت بەخەصلەتی حاڵەت تەواو لیبرالیستن! زۆر سەرم سورِ دەمێنێت كە بەرامبەرەكانیان چەنێك گەوجن نایكەن بە(پاصات)ی (یاری دووگۆڵی) كەئەمان ئەم (تۆپ)ە فرێ دەدەن بۆیان و پێیان ئێژن(لیبرالیست)، بڵێن كورە (لیبراڵ) خۆتانن!! ئێوەن كە قودرەتی حوكمەتتان بەدەستەوەیە و كێشەكانی كۆمەڵگە رِووی تێكردن و دێن(فیوداڵ) چەكدار دەكەن، دێن (باج) دەگرن لەخوێن مژترین سەرمایەدارگەل كەهۆكاری ئەم گشتە گرانی و بەدبەختییەن بۆ خەڵكی و مەیدانیان بۆ بازدەكەن، دێن فاسدترین كەس كە قاچاخچییان تێكەڵ دەكەن لەگەڵ ئینقلابی ترین ئۆرگاندا كەبریتییە لە(سوپای پاسداران)! دێن ئاشناترین رِوخساری دژی ئیسلامی وەك (تودەی و ماركسی گەلی رِووسی و چینی و ئەمەریكی و ساواكی)! ئاخر دەزانن گشت جۆرێكمان هەیە! ئەمانە دەخەنە ناو حیزبەكەی خۆتانەوە! دەی وتمان لیبرالیست بە ئیعتباری لایەنە پۆزەتیڤەكەی كە مەبدەئی حەركەتە عیبارەتە لە(ئازادی ویستی) دەی ئەمان حەتا ئەمەشیان نییە! رِەنگی ئازادی ویستییەكەی ناشرین ترین ئیستبدادە.

لایەنی نێگەتیڤی لیبرالیزمیش ئەوەیە، كاتێك هێز كەوتە دەستیان رِێگە چارەیان نەبوو بۆ كێشەكانی كۆمەڵگە هەروا یان بەئارەزووی خۆیان شتگەلێكیان دەوت یان بەویان دەگوت"بەڵێ تۆ رِاست دەكەیت"، بەویتریشیان دەوت"بەڵێ تۆ رِاست دەكەیت". بۆیە كێشەكانی كۆمەڵگە بەهەر جۆرێك برِۆشتایەتە پێشەوە ئەمان لەبەرامبەرییەوە تەسلیم دەبوون، ئێستا ئەو قودرەتە گەورە لەناو هەیئەتی حاكمدا كە (ئیئتلافی حیزبی

جهوری) و هەندێك لە(مەرجەعە تەقلیدییەكان)ە ڕەنگە نێگەتیڤەكەی لیبرالیستیان (سەد دەرسەد) تێدایە، نازانم ئەم تەرەفە فەقیر حاڵانە بۆ نازانن ئەمە بێژن "ئاخر لیبرالیزم دوو باری هەیە تۆ مەبەستت كامیانە؟"مەبەستت بارە سیاسییەكەیە كە(ئازادی ویستییە)لەبەرئەوە تانەوتەشەرمان لێدەدەن؟ دەی ئەم ڕسواییە بۆ خۆت، چونكە دیارە دەتەوێت حوكمەتی(ئیستبدادی) دابەزرێنیت، یان مەبەست لایەنی نێگەتیڤی لیبرالیستییە كەهەر جۆرە ڕوداو و خاوەن هێز و زوڵم و فەسادێك هەیە لەبەرامبەرییەوە سازش بكات و بەرنامەیەكی نەبێت بۆ چارەسەری دەی ئەمە خۆتانن، چونكە حوكمەت و هێز بەدەستی خۆتانەوەیە. ئێوە هەروەك ئەم لیبرالیستەن، چونكە هیچ چارەسەرێكتان نییە بۆ كۆمەڵگە.

جادوای ئەم تەحلیلە كورتە دەربارەی پێشینەی لیبرالیست و حاڵەتی مەنفی و خوێ نتاڵی سازشكارانەیەك كەلیبرالیست لەسەردەمانێكدا وا لایەنگرانی دەگەنە دەسەلاَت دووچاری دەبن، دێمەوە سەر ئێران تا بزانین لیبرالیست بەچ مانایەك مەترەحە؟ كێن ئەوانەی مەزهەری ئەم فكرەن، دەزانن لەناو ئەم حوكمەتەدا كەسی زۆر هەیە لەڕووی فكرییەوە(بەشێوەی مونفەرد)–تاكگەر–. مونفەرید(تاكگەر) مەبەستم لەڕووی سیاسییەوە نییە، چەمكی(تاكگەر) بەكاردەهێنرێت بۆ هەندێك ڕووداوگەلی كۆمەلایەتی، وەك ئەوەی هەڵبژاردنێك دەكرییەت و ژمارەیەك كەس بەبێ وابەستەگییان بەحیزب و گروپێكەوە خۆیان كاندید دەكەن، نا...لەمانایەكی فراوانتردا كەسانی زۆر هەن كەتابعی ئەم گروپە یان ئەو چالاكییە نین و لەهەمان كاتدا دەربارەی بابەتە ئیسلامییەكان بیر و

بۆچونێکیان هەیە دەتوانین بەمانەش بڵێین(شەخصییەتگەلی مونفەرید) کەسی وا زۆرە چ لەناو حوکمەتدا چ لەدەرەوەی حوکمەت.

لەپاشانیشدا لەناو حوکمەتدا جیالەوەی نمونەگەلێك لەم (ئەشخاصی مونفەرید)ە هەن و لەگەڵ جەرەیانێکدان یان پەیوەندییان بەگروپێکەوە هەیە زۆرن، جەنگی تەنازوعی قودرەت ئەوەتا لەنێوان دوو دەستەدا، یەکێکیان(حیزبی جمهوری) بەهاوپەیمانەکانییەوە کە زۆرێکن لە(مەرجەعە تەقلیدییەکان) ئەوی تریان(بەنی صەدر) و هاومەسیرگەلییەوە، لەئێستادا ئەمانە دیارترین و ڕونترین قیافەن لە عەناصری تەشکیلگەرانی حوکمەتی ئێراندا، جەماعەت و حیزب و دەستەگەلیان بەو جەماعەتی موخالیفانە کەئازدییەکی تێدا دیاری نەکراوە کارێکی دیاری کراوی هەبێت و بزانرێت(لیبراڵییەکان)کێن، بەڵام دیارە کامانەن(بەنی صەدری) تێدایە، زۆرێك لە تاکگەرەکان و لەغەیری تاکگەرەکان، هەموو ئەمانە دەگرێتەوە).

بەگشتی دەزانین لەگەڵ ئەوەی کادیرێکیان دیاری نەکردووە بە کێ ئێژن لیبرالیست، چونکە ئاخر خۆ حیزبێك یان گروپێك نییە خۆی ناونابێت بەم ناونیشانەوە، ئەمە ناونیشانێکە ئەمان دەیدەن بە وانە ئەگەر گروپێك بوایە و ناوی لەخۆی بنایە و شیعاری بەرز کردایەتەوە و ئەوە شتێکی باش بوو قەزییەکە ڕۆشن بوو، بەڵام ئەوە ئەمانن پێیان دەڵێن(لیبرالیست) موتەوەجهی ئەوەین کە(بەنی صەدر و داروەدستەکەی و زۆر لە تاکگەراکان و سیاسیگەلی ناو جەبهەی میللی) ئەمانەن لەبەرامبەر حیزبی جمهورییەوە کە خاوەنی هێزی حاکمە. بەگشتی بەو کۆمەڵە ئێژن لیبرالیست، بەنەخشە و کاری ئەوان ئێژن لیبرالیست، ئەوانیش بە شیعارگەلی جیاواز هەوڵدەدەن





ئەمان موشەخەص بكەن و قیافەیان پیشانی خەڵكی بدە، جا ئەم جەبهەگیرییە لەبەرامبەرییەكەوە كەسێك كەمێك شارەزا بێت لە ئیسلام دەزانێت هەردووكیان چەنێك خەتاكارن، چەنێك بێگانەن لە سیاسەتی ئیسلام كە خەریكن كار دەكەن وجەبهەگیری دەكەن، حەقیقەتەن هەندێك لەگروپە ئیسلامییەكان لەڕووی چالاكییەوە عەجیب غەیرە ئیسلامییە حەتا لەهەندێك شتدا تەواو دژی ئیسلامە! هەندێكیشیان خەتایان نییە، كە ئێستا كاتی ڕوونكردنەوەمان نییە...لەبەرئەو ڕووداوانەی لە مێژوودا ڕوویانداوە لە (١٣)سەدەی لەمەوبەردا لەسەردەمی حوكمەتی (مەعاوییەوە) عەمەلەن بوعدەی سیاسی ئیسلام نەماوە (باقی بوعدەكانی تری هەر ماوە)، بەڵام بوعدی سیاسی نەماوە و سیاسەتی ئیسلامی بەشێوەی عیلمی كاری پێنەكراوە، لەئێستادا هەزاران و دەیەها هەزار كتێبمان دەربارەی بابەتی جیاوازی ئیسلامی هەیە كە بەزمانی عەرەبی حساب ناكرێت! بەفارسیش زۆرمان هەیە، بەڵام سەیربكەن لەهیچ زمانێكدا دەربارەی عیلمی سیاسەتی ئیسلامی واتە(تیۆری سیاسی ئیسلامی) یەكدانە كتێبی بچكۆلەمان نییە! چونكە كاتێك عەمەلەن ئەم بوعدە لە كۆمەڵگەدا نەما ئیتر كارێك نەكرا بۆی بۆیە دەبێت ئێستا كار بكرێت، هەر گروپێك خۆی بەئیسلامی دەزانێت و چالاكی سیاسی دەكات دەبێت خۆی لەوبوارەدا كار بكات دووبارە ئەمەش كارێكی كێشەدارە و ئاسان نییە هەوڵ و زەحمەتی زۆری دەوێت لەبەرئەم دەلیلە زۆرینەی گروپ و حیزبەكان شارەزا نین لە سیاسەتی ئیسلام، بەڵكو لەژێر كاریگەری گروپێكدان كە سەیتەرەی سیاسەتیان كردووە(دیارە ئیسلامی نین) بەو بەرداشتگەلەوە لەئەو ئاگاهییە سیاسییەی

کەهەیانە ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە بۆیە دەبینیت ڕووبەڕووبونەوەکەیان لەبەرامبەری یەکتریەوە بەوشێوەیە نازەریف و خوێن تاڵە!

ئەم گروپە (لەبەنی صەدر و ئەشخاصێك کە زۆر یان کەم بەیەکەوەن) موتەهەم دەکریەت بە(لیبرالیست) ئەمەش دوو باری هەیە هەروا کە ڕوونم کردەوە کە لیبرالیست دوو حاڵەتی هەیەە حاڵەتە مثبت(پۆزەتیڤەکەی) لەسەرەتاوە بوو، حاڵەتە مەنفی(نێگەتیڤەکەی) لەپاشاندا دروست بووە، بۆیە سودوەرگرتن لەم شیعاریشە دژی ئەم جەماعەتە بەتەرکیز کردن لەوەی مەفهومی(لیبرالیزم) ئەو دوو بوعدە و ئەو دوو خەصڵەتە پەیدادەکات یەقینەن هەردوو بارەکەی تێدایە، واتە ژمارەیەکیان هەن بارووخساری خۆشیان پیشان نەدەن کە(حەربەی لیبرالیزمی) بەکاردەهێنن دژی ئەم گروپە تبقی دیدگایی خۆیان لەبەر(تەنەفوریان) لە(ئازادی ویستی) وەك حیزبی(تودە). حیزبی تودە حەزدەکات خۆی ئازاد بێت، بەڵام قینیەتی لە ئازادییەك لەئێستا لە کۆمەڵگەی ئێراندا بەرقەرار بێت لەڕووی سیاسیەوە، چونکە ئەزموونی تاڵی ئەورووپای ڕۆژئاوا و وڵاتانی سەرمایەدار دەریخست کە ئازادی سیاسی دەبێتە هۆکاری محفبوونەوە(پوکانەوە)ی (مارکسییەت)، مارکسییەت تبقی ئەو مەزهەبەی کەهەیەتی دەبێت لە وڵاتگەلی سەرمایەداریدا ئینقیلاب ببێت دەی یەك دانە ئینقلاب لەوڵاتگەلی سەرمایەداری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا نەکریا!! بەڵکو لەسادەترین و مەحروم ترین وڵاتگەلدا ئینقلابی مارکسی کرا کەلەڕووی فەرهەنگی و ئاگاهییەوە مەحرومن ئەی ئەمە لەبەرچی، دەلیلی چی بوو؟ دەلیلی ئەوەیە کە بەڕاستی زیاتر لەوەی کە محتەوای مارکسی خەڵکی ڕابکێشێت، شەخصیەتی بازیگری و شیعارگەلی خەڵکی ڕادەکێشێت

و جەلبیان دەكات، ئەم شەخصییەتی بازیگری و شیعارگەرییەش لەو شوێنانەدا كار دەكات كەئاگاهی خەڵكی لەخوارەوە بێت(واتە خەڵك زۆر ڕۆشنبیر نەبن).. لەشوێنێكدا ئازادی سیاسی زۆر بێت ئاگاهی خەڵكی سەردەكەوێت، بەپێچەوانەشەوە لەشوێنێكدا ئازادی سیاسی كەم بێت ئاگاهی خەڵكی دێتە خوارەوە، بینا لەسەر ئەمە حیزبە ماركسییەكان بەسودوەرگرتن لەئەزموونی تاڵی ولاّتگەلێك لەڕووی سیاسییەوە دیموكراتیك (كە مەفهومی دیموكراتی لە ڕووی سیاسییەوە لەناویاندایە)، كەبیری ئازادی دەركی خەڵكی پێشدەخات ڕۆژ بەڕۆژ ئەحزاب و لایەنگرالی ماركسییەت بەرەو كەم بوونەوە دەڕوات و حیزبە ماركسییەكان وردە وردە شكست دەخۆن و دێنە دواوە، ئەم دەرئەنجامە دەگرن كەلە كۆمەڵگەیەدا خەفەكردن بوونی هەبێت، فشاری هەبێت ماركسیست گەشەدەكات! حەقیقەتەنیش ئەمە ئەنجامگیرییەكی دروستە دەستیان كەوتووە. بینا لەسەر ئەمانە حیزبی تودەش لەدانیشتنی دۆستانەیان لەگەڵ كەسایەتییەكاندا ئەمە ئێژن(هەڵبەتە لەڕووی مەكتەبیشەوە ڕایدەگەیەنن، لەڕووی مەكتەبییەوە ئەمە دەڵێن "دەبێت خۆپیشاندان هەبێت و زۆرتر هەبێت، یەكێك لە خۆپیشاندانەكانیش خۆپیشاندانی نێوان(حاكم و خەڵكە) لەڕووی فشاری سیاسییەوە ئەمە یەكێكە لەو خۆپیشاندانانەی دەتوانن سودی لێوەربگرن) هەرچەند لە چوارچێوەی حەرەكەتی ماركسیدا نییە، چونكە ئەوان تەنها قسە لەسەر ئابووری دەكەن، بەلاّم بەهەرحاڵ لەئەزمونیاندا سەیریان كردووە كەنەخێر ئابوری خۆی هەموو شتێك نییە، بەڵكو شتی تریش هەیە بینا لەسەر ئەمە مەسائیلی سیاسی لەنەزەریاندا گرنگە و حەزدەكەن فشار هەبێت و خۆپیشاندان هەبێت، لەدانیشتنە تایبەتییەكاندا

واقیعیەتەکانی بیری خۆیان ئێژن. ئێژن"ئەمە بە سودی خۆمانەن بۆیە لایەنگری مەلا بکەن". ئاخر نا کەسگەلینە، ئێوە بۆچی لایەنگری مەلا دەکەن؟ ئێوە دژی دینن و مەلاش لەڕوخساردا واتە ڕەهبەری دین ئێوە لە کویێ و حوکمەتێك و حیزبێکی غەیر مارکسی لەکویێ؟ چۆن لایەنگریان دەکەن؟! ئەمە واقیعەتی نییەتەکەی خۆیانە هەموو ئەمانە خۆپیشاندان(دژایەتی) پێدەگەیەنێت ئەمانە ناتوانن کۆمەڵگە بەڕێوەبەرن لە کۆتایدا نارەزایی دروست دەبێت و لە زەمینەی نارەزایشدا ئێمە سودوەردەگرین و سبەی حوکمەت دەگاتە دەستی خۆمان.

بینا لەسەر ئەمە تبقی ئەو تەوجیهە مەکتەبییە کە دروست کردنی دژایەتییە، چ تبقی ئائەم تەوجیهە سیاسییە حەساسە وردە کەهەیانە لەبارەی ئەمەوە کە حیزبی جمهوری و مەلاگەل حوکمەت بکەن شتێکی باشە بۆئەوەی مەردم نارازی بێت. مەترەح بوونی ئازادی لەئێراندا مەرگە بۆ ئەوان!! ئەگەر ئازادی هەبێت کە خەڵکی فەرموون مەسائیلی خۆتان ئاشکرا بڵێن کەدەزانن پێش ئینقلاب و دوای ئینقلاب چەنێك دەعوەتی گروپگەلی مارکسیمان دەکرد کە وەرن قسە و باس بکەین بەیەکەوە زۆر بەئاشکرا لە مزگەوت و مەکتەبەکاندا وەرن یەکلایەنە قسەمەکەن، نە ئێمە یەکلایەنە قسە دەکەین و نە ئێوەش بیکەن، وەرن بادانیشین لە شوێنێکدا کە خەڵکی ئامادەبن موسوڵمانێکی شارەزا و مارکسییەکی شارەزا دابنیشن و مەکتەبەکانی خۆیان پێشکەشی خەڵکی بکەن با خەڵکی حاڵی ببێت، دەزانن چەنێك لەزیان لێدەدا و فیراریان دەکرد، چونکە دەزانن ئەوە ئیتر سەرەتای مەرگیانە و هەموو شت دەردەکەوێت بۆ خەڵکی و خەڵکی ئیتر ئەوانی ناوێت. لەئێستادا ئەمان بەبێ ئەندازەی لەئازادی دەترسن! جا بۆیە(حیزبی تودە و لاینگرانی)




بۆچونیان وایە کەبەبێ لایەنگری لەشەڕ ناتوانن ئەم حوکمەتە بخەن و جێگەی بگرنەوە بەبارێکی تر دێن(سازشکاری دەکەن) لەلایەکەوە بەبۆنەی نائاگاهی و نەزانینی ئەمانەوە(مەبەست حوکمەت) دژایەتی سەرهەڵدەدات و وردە وردە خەڵکی هەست دەکەن و نارەزایی سەرهەڵدەدات، لەلایەکی ترەوە خۆشیان (دزەیانکردووە) چونەتە ناو حوکمەت و بەمەیلی خۆیان کاردەکەن و پەیام ئاراستە دەکەن! لەولاشەوە دووبارە خۆشیان نارەزایی دەردەبڕن (تەنانەت هەیانە لەناو سوپای پازداراندا زوڵم و ستەم و تاوان و کاری خراپ دەکەن بۆئەوەی ئەو دژایەتییە دروست بکەن). بۆیە بوعدێك لە موخالەفەت لەگەڵ لیبرالیزمدا کە دەگەڕێتەوە بۆسەر حیزبی (تودە) و هاومەسیرگەلی، مارکسیستگەلێك کەلەرێگەی سازشکارییەوە لەگەڵ هەیئەی حاکمدا و سودوەرگرتن لە دژایەتی نانەوە وادەزانن دەگەنە هێز، ئەم بوعدە مەنفییەیە کە موخالفن لەگەڵ ئازادی و وجودی ئازادیدا! هەرچەندە بەشێوەیەکی ئاسایی حەزبکەن ئازادی هەبێت بۆئەوەی خۆیان ئازادانە چالاکییەکانیان بکەن، بەڵام پێویستیان بەوەنییە و رێگەی خۆیانیان کردۆتەوە بە پشتبەستن بەوەی کە وتمان وادەزانن لەو بارەوە باشتر دەگەنە نەتیجە و لەوبارەکەی ترەوە هیچیان پێناکرێت، واتە ئەوەی لەبەرامبەر حوکمەتەوە بوەستن و موخالەفەی حوکمەت بکەن بەم رێگەیە هیچیان پێناکرێت، چونکە ئەزمونیان کردووە و شەڕیان کردووە دواتر شکستیان خوارد چ حیزبی(تودە) ، چ (چریکەی فیدایی)، چ ئەوانەی وابیردەکەنەوە زانیویانە کە بەو جۆرە ناکرییەت، ئەگەروابێت دەبێت لەم رێگەوە بکرێت کە دژایەتی و نارەزای نانەوە و خۆپیشانداندن درەستکردن و فیتنە هەڵگرساندنە!

جا بۆئەوەی زەمینەی گەشەی مارکسییەت فەراهەم بێت دەبێت(خەفەقان و دەمکوتکردن) وجودی هەبێت! خەڵکی نارازی بن لەم حوکمەتە و ئەم حوکمەتە بڕوخێت و ئەوان هێز بگرنە دەست، ئەمە فەوقەلعادە بارێکی مەنفی و دژی بەشەرییە و موخالەفەتە لەگەڵ لیبرالیستدا، ئەمە لەلایەکەوە.
بەڕاستی ئەگەر سەرکردەکان حیزبی (جمهوری) لەبەرچاو بگریت و لێیان بپرسیت کە "دەلیلتان چییە موخالەفەت دەکەن لەگەڵ لیبرالیستدا؟ لەگەڵ ئەفرادێکدا کە پێیان دەڵێن لیبرالیست؟" سەیردەکەیت هەر ئالەم فکرەوە کە (حیزبی تودە) ئیلقای کردووە و ئەوانیش مەزهەری ئەو مەتڵەبەی تودەن، واتە موخالەفەتەکەیان لەمەوەیە کەئەوان حەزدەکەن لە(ئازادی ویستی) ئێژن بافشار نەبێت با دمکوتکردن نەبێت با ئازادی هەبێت و خەڵکی قسەی خۆیان بکەن، هەرکەس دەیەوێت بیروبۆچوون و بەرنامەی خۆی بڵێت، (حیزبی جمهوری و هاوپەیمانگەلی)، چونکە ئیسلامییانە بیر ناکەنەوە و کار ناکەن خەڵکی ڕەخنەیانلێدەگرن، هەروەك بەوجۆرەی لای خۆمان لەسەرەتای ئینقلابدا کەئیشارەتمان کرد بەکێشەکانی ئینقلاب کە (ئیستبداد) چۆن دروست دەبێت، لێرەوە دروست دەبێت، ئەو کەسەی حوکمەتی بەدەستەوەیە خرابی دەکات و بەدروستی ڕووبەڕووی ئەو ئیعتزازالەش نابێتەوە کە خەڵکی بەهۆی خراپییەکانیەوە دەری دەبڕن حەز دەکات دەکات سنووردار بکرێت و بێ دەنگ بکرێت، دەی وردە وردە ئەم کارانە دەکات تادەبێتە خراپترین حوکمەتی دیکتاتۆر، ئەساسی دیکتاتۆری لێرەوە پەیدا دەبێت، ئەمانە چونکە نە ئارەزوو و ئاواتیان ئیسلامییە و نە بەرنامەیان، خەڵکی نارازین و ئێژن کوا ئەمە بوو؟ ئەمە بوو ئینقلابی ئیسلامی؟! حەز

دەكەن خەفەقانیان بكەن و كوتەككاریيان بكەن تاوەكو خەڵكی نەتوانن دەم بكەنەوە! بۆیە ئەگەر تەواوی ئەو موخالەفەتە لەگەڵ لیبرالیستدا بگریتە بەرچاو (شایەد ئەگەر بێژین هەمووی نا) ئەوا لە(سەدا نەوەد)ی هەر لەبەر خاتری موخالەفەتە لەگەڵ ئازادیدا ئالەم بوعدە نازەریفەوە، مەگەر (لەسەدا دە) هەبێت خەصڵەتگەلی مەنفی لیبرالیست ببینێت كە(سازشكارییە) لەبەر نەبوونی بەرنامەیان...

چی كاتێك موخالەفەت لەگەڵ لیبرالیزمدا دروستە؟

واقیعیەت ئەوەیە هەروا خاوەن هێزانی حوكمەت (حیزبی جمهوری هاوپەیمانی) بەرنامەیەكی بەهێزیان نییە كە كۆمەڵگە بەڕێوەبەرن، موخالەفەتكارەكانیشیان كە (بەنی صەدر و لایەنگرانی نەهجی ئازادی و جەماعەتیش) ئەوانیش نییانە! ئەوانیش ئەگەر بەیانی پێیان بڵێیت فەرموو كۆمەڵگە بەشێوەی ئیسلامی بەڕێوەبەرن، بەرنامەیان نییە و نازانن و ناشتوانن. موسوڵمانگەلێك هەن لەجەماعەتی(بەنی صەدر)و تەرەفدارگەلی، كەئەمە دەرك دەكەن كەئەمانە لەگەڵ سەرمایەدارگەلدا سازشدەكەن هەرواكە (حیزبی جمهوری) دەیكەن، لەگەڵ(فیودالەكاندا) سازشدەكەن، لەگەڵ جۆرەها و تاوانبار و زاڵماندا سازش دەكەن لەبەربێ بەرنامەیی، ئەوە دەبینن و لیبرالیست دەكوتن، ئەوانەش واقیعەن ژمارەیەكی كەمن، بەلاّم ئەگەر موخالەفەت لەگەڵ لیبرالیستدا ئالەبەر ئەم لایەن و خەصڵەتە مەنفییە لیبڕالیستییە بێت، موخالەفەتێكە فەوقەلعادە ئیسلامی و موثبت(پۆزەتیڤ)ە. بەلاّم ئایا هەیئەتی خاوەن هێز لە حوكمدا لەبەرئەوەیە موخالەفەت دەكەن؟ ئێژن ئەوان ئینقلاب لەخەتی خۆی لادەدەن؟

چونكە بەرنامەی ئیسلامییان نییە بۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵگە؟ دەی ئەزانین نەخێر... لەبەرئەوە نییە، چونكە خۆشیان نیانە! چونكە عەمەلەن خۆیانن ئینقلابیان لەخەتی خۆی لاداوە! ئایا حیزبی (تودە) لەبەرئەوە موخالەفەت دەكات، چونكە ناتوانن ئیسلامیانە كۆمەڵگە بەڕێوەبەرن؟ نەخێر! ئەگەر بێتوو كۆمەڵگە ئیسلامیانە بەڕێوەببرێت ئیتر تەواو حیزبی تودە و هەرچی حیزبی ماركسییە دەمرێت و نامێنێت، بۆیە لەبەرئەوە نییە موخالەفەتی حیزبی(تودە) و هاومەسیرگەلی و موخالەفەتی حیزبی (جمهوری) و هاومەسیرگەلی لەگەڵ لیبرالیستدا لەبەر لایەنی پۆزەتیڤی لیبرالیستە، بەڵام یەكەیەكەیەك ئیمكانی هەیە هەبن كەئەو لایەنە نێگەتیڤەی (لیبرالیست) ببینین و لەبەر ئەو لایەنانە موخالەفەت بكەن لەگەڵیاندا، ئەوانە ئەگەر موخالەفەتەكەیان ئاگاهانەبێت لەگەڵ خەصڵەتی نێگەتیڤ و سازشكارانەی لیبرالیستدا دەی دەبێت هەروا لەگەڵ لیبرالیستدا موخالەفەت دەكەن، لەگەڵ حیزبی جمهوری و باقی خاوەن هێزاندا موخالەفەت بكەن! هەتا شەدیدترا چونكە خەتەر و زیانی ئەمانە لەدیدگای مەكتەبییەوە بۆ ئیسلام زۆر زۆرترە لە(لیبرالیستگەل)، چونكە لەكەمترین كاتدا كەم بوونی زەرەری لیبرالیست لەمەداكە بەرنامەیەكی ئیسلامییان نییە كۆمەڵگەی پێ بەڕێوەبەرن ئەمەیەكە (عەبا و مێزەرەیەكیان نییە)، بەڵام خاوەن هێزان كەسیفترین خەصڵەتی لیبرالیستی كە بریتییە لە(سازش لەگەڵ هەرچی لایەندایە لەبەر نەبوونی بەرنامە) لەناویاندایە. واتە (حیزبی جمهوری و هاوپەیمانی)ئەسازن لەگەڵ هەرچی فەساد و خیانەتو زوڵمو ستەمدا كە(بەفعلی نمونەی دەبینین)، هەروەها ئەوەی كە ئەوان بەرنامەیان نییە بۆ ئیسلامیانە بەڕێوەبردنی كۆمەڵگە،واقیعەن ئەمانیش(حیزبی جمهوری)

بەرنامەیان نییە، ئیزافە لەهەموو ئەمانەش ئەمان بە سمبولی ئیسلام خۆیان داوەتە قەڵەم، چونكە واراگەیەنراوە كەرۆحانییەتو عەبا و مێزەرە سمبولی ڕەهبەرییە لە ئیسلامدا! خەڵك وا حاڵی بووە لەكاتێكدا لە ئیسلامدا ئەم شتانەمان نییە! قشلۆ جلی تایبەت و ئەم شتانە لە خودی خۆیدا دژی ئیسلامە. جا ئەم شتە دژی ئیسلامییە هێنراوەتە كۆمەڵگە تا خەڵكی وابزانن ئەمانە سمبولی مەزهەری ئیسلامن بۆیە ئەم شەڕیشە لەئەم هێزە حاكمەدا وجودی هەیە بەئیزافە لەسەر ئەو دوو شەڕەی لەپێشەوە باسمانكرد و لە جەماعەتەكەی ترهەیە. دوو جەناح لەبەرامبەری یەكەوە، جەناحێكیان بەرنامەی نییە و شازش دەكات لەگەڵ هەموو شتێكدا، ئەم جەناحەكەش بەرنامەی نییە و سازش دەكات لەگەڵ گشت شتێكدا، ئەمانن كە فیودالەكانیان لە ئەنواع ناوچەدا چەكدار كردووە، ئەمانن كە(باج)دەسێنن لە خوێن مژترین سەرمایەدار كەڕۆژ بەڕۆژ نرخ دەبەنە سەرەوە ئەم گشتە فشارە دروست دەكەن بۆ خەڵكی، ئائەمانەن دەبێت دادگایی ئینقلابی بكرێن، بەلاَم چونكە لەلایەكەوە ئەلقە لەگوێی دەزگای مەرجەعییەتی تەقلیدن و دەزگای مەرجەعییەتی تەقلید بەوانە هەڵدەسوڕێت بەو سەرمایەدارە خوێنمژانە، لەلایەكی تریشەوە گەورەترین(باج) دەدەن بە(حیزبی جمهوری). دەی ئەمە كارەكانی حیزبی جمهورییە! دەی خۆ ئەو جەناحەكەی تر ئەوەندە سازشكار نین و ئەوەندە خیانەت ناكەن! ئەو خەصڵەتە نێگەتیڤەی ئەوەڵ لەواندا هەیە و لەمانیشدا هەیە، خەصڵەتی سازشكاری لەواندا هەیە و لەماندا فرە شەدیدتر هەیە، شەڕێك لەماندا هەیە كەخۆیان لە سمبولی ئیسلامیدا خۆیان دەردەخەن و ناونیشانی ڕۆحانییەت و ئایەتولاَ و حوجەتول ئیسلامیان هەیە، عەباو مێزەرە و چی و چییان هەیە، كەئەوانی تر(تودە و ماركسییەكان) ئەمەیان





نییە، ئەگەر مەخالەفەت لەگەڵ لیبرالیستدا موخالەفەتێکی مەکتەبی ئیسلامی بێت دەبێت هەر لەژێر ئەم ناونیشانەدا (حیزبی جمهوری و مەرجاعی هاوپەیمان لەگەڵیدا) بوکترێن بەناونیشانی لیبرالیست! هەر ئەوانەی والەتەرەف ئەو جەناحەکەی ترەوە پێیان دەوترێت(مورتەجیع) هەرئەوانیشە بەناوی لیبرالیست بکوترێن و حەملەیان بکرێتە سەریان، چونکە حەقیقەتەن خەصلەتی نێگەتیڤی لیبرالیست لەوانیشدایە.

## پەیوەندی (کاك ئەحمەد) لەبەرامبەر ئەم دووا هێزەوە:

جا ئێستا بابەتی ئێمە لەبەرامبەر ئەم دوو جەماعەتەوە؟ واقیعەت ئەمەیە ناتوانین هیچ کامیان بەناونیشانی هێزێك بناسین کە توانای عیلمی و ئەخلاقی و پیادەکردنی ئیسلامیان هەبێت، نە (حیزبی جمهوری و لایەنگرانی)، نە(بەنی صەدر) و هاودارو دەستەی، ئەمەش مانای ئەوە نییەکە بلێین موسوڵمانیان تێدانییە. چەندین جار وتوومە کە دەکرێت لە (حیزبی جمهوری)دا زۆرینەی موسوڵمانی قاتعی بن، بەلأم موسوڵمانی ئیحساساتین نەك موسوڵمانی مەکتەبی، کە ڕوونکردۆتەوە چەمکی مەکتەبی کەلە دونیای ئەمڕۆدا هەیە بەنیسبەت موسوڵمانەوە واتە(شاهید)، واتە(شەهید)، موسوڵمانی مەکتەبی واتە(موسوڵمانی شەهید)، واتە هەم شارەزا بێت، هەم موتەعەهید بێت. لەڕووی ئاگاهی و لەڕووی کردار و جێبەجێ کردنەوە نمونەی مەکتەب بێت. بەڕاستی ئیتمیئنانمان هەیە نە تاقمی ئەملا دەتوانن ئاگاهی و تەعەهودیان لەبارەی ئیسلامەوە لەو سنورەدا بێت کە ئینقلاب بخەنەسەر مەسیری ئیسلامی و سیستەمی ئیسلامی پیادە بکەن نە تاقمەکەی ئەولا!! ئاخر دیارە

خۆ كۆمەڵێك موسوڵمانین گروهپەرستی و حیزب پەرستی مەترەح نییە، ئەگەر ئێمە یەكێك لەم دووانە ئەوەندە بەمەكتەبیان بزانین كە دڵنیا بین ئاگاهییان لە ئیسلام و تەعەهودیان نیسبەت بە ئیسلام كافییە ئیتر بۆچی بەناونیشانی حەرەكەتێكی جیاو واحیدە(سەربەخۆ)و جودمان دەبێت؟ ئەصڵەن ئەوكاتە وجودمان نابێت جا بەو نیسبەتە بەئەوان. چەندین جار باسمكردووە(تەفەرەق) چەنێك خراپ و پەستە، چەنێك خەصڵەتێكی دژە ئیسلامییە، ئەی هۆكار چییە ئێمە بەناونیشانی بزوتنەوەیەكی سەربەخۆ بوونمان هەیە و لەگەڵ هیچكام لەم حەرەكەتگەلە ئیسلامییە لەگەڵ ئەم گروهگەلەدا نین؟ ناتوانین ببینە یەك وەحدەتی كامڵی ئیسلامی؟

هۆكارەكەی ئەوەیە هیچ كامیان بە ئیسلامی تەواوەتی نازانین. لایەنی نێگەتیف و دژە ئیسلامی و نەقسگەل لەگشتیاندا وجودی هەیە. لەناو ئەم دوو تاقمەشدا، واتە لەناو سیستەمی حوكمەتدا ئەم دوو تاقمە بوونی هەیە، ئەگەر یەكێك لەم دووانەمان بەخاوەن توانا بزانیایە بۆ پیادەكردنی ئیسلام فەوقەلعادە(نادروست بوو ئێستا بەناونیشانی بزوتنەوە و گروپێك بوونمان هەبوایە). ئێمە ئیسلاممان گەرەكە ئەگەر بزانین جەماعەتی(بەنی صەدر) و هاومەسیرگەلی شارەزان و موتەعەهیدن بۆ ئیجرای دەكەن دەچوین هاوكاریمان دەكرد لەگەڵیان و حەرەكەتی ئیسلامی كوردستانمان وەك گروپێكی جیا و سەربەخۆ نەدەهێشت!! ئەگەر بزانین (حیزبی جمهوری و هاودارودەستەی) ئەم كارە دەكەن، هەم شارەزان و هەم موتەعەهیدن بە ئیسلام دەچوین لەگەڵ ئەواندا هاوكاریمان دەكرد، هەرئەوەی كە دەزانرێت بەبەردەوامیو لەلایەن هەردوو تاقمەكەوە داوا(لەمنداڵی موسوڵمانان)

دەكریەت و بەڵێنیان پێدەدەن و دەعوەتیان دەكەن لە تاران لە كوردستان)دا، "كە ئەگەر ئیسلامتان گەرەكە فەرموون ئێمەش ئیسلاممان گەرەكە و وەرن هاوكاری بكەن لەگەڵمان"، دەی بۆ ئەمە قبوڵی ناكەین؟ چونكە دەزانین:

یەكەم: ئەم قسەیەیان زۆر ڕاست نییە كە دەڵێن"ئیسلاممان گەرەكە".

دووەم: ئەگەر گەرەكیشیان بێت و موخلێصیش بن(كە زۆر ئەفرادیان تێدایە موخلێصە)ئەو ئیسلامەی كەئەوان ئێژنی غەیری ئەو ئیسلامەیە كەئێمە ئێژینی. ئەمەش لەچەندین لایەنەوە جیاوازیمان هەیە، لەبەرئەوەیە ئێمە حازرنین بڕۆینە ناو یەكێك لەم دوو تاقمەوە، و دەمانەوێت هەر بەشێوەی یەك حەرەكەتی ئیسلامی بوونمان هەبێت، ئەگەر ئەم دووانە یەكێكیان بیتوانیایە سمبول‌و نمونەی ئیسلام بوایە مانەوەی ئێمە بەشێوەی یەك گروهو یەك بزوتنەوە فەوقەلعادە ناپێویست‌و مەنفی(نێگەتیڤ) بووا ئەوە خودپەرستی‌و گروهپەرستییە!

بۆیە ئێمە مەجموعەن لەقۆناغی سەرەتادا هیچ كامیان بەتەواوی بە ئیسلامی نازانین، ئەگەر بەئیسلامیان بزانین شوێنیان دەكەوین و تەواوی هێزمان دەخەینەكار بۆئەوەی ئەو بەرنامە ئیسلامییەی كەهەیانە پیادەی بكەن، بەڵام دەزانین وانییە، بۆیە خۆمان ناخەینە پاڵیان. ئێستاش واخەریكین خۆمان ئیسلام بەو شێوەیەی وادەیناسین، هەم لێی شارەزا بین، هەم بەیانی بكەین و ڕوونی بكەینەوە بۆ كۆمەڵگە. ئەمە یەك مەوزوعگیری كوللی لەبەرامبەر هەردوو سیستەمەكەوە، كە كوللەن هیچكامیان لەڕووی ئاگاهی و لەڕووی كرداری و تەعەهودەوە بەئیسلام نازانن، كە مەوجودییەتی خۆمان نەفی بكەین و دەستبكەینە هاوكاری لەگەڵیاندا!

## كاك ئەحمەد كوێی حوكمەتی ئیسلامی قبوڵبوو؟

جالەمەودوا قسە دێتە سەر مەوزوعگیری لەبارەی بابەتی وردەوە لەناو ئەم دووتاقمەدا، ئەم دەستە ناونیشانگەلێك و بەرنامەگەل و كارگەلێكی هەیە، ئەو دەستەش هەروا. ئاخر كەسێك كە مەوزوعگیری ئیسلامی بێت، ئەگەر بەوجۆرە لەلایەنی كوللییەوە دەتوانێت یەك مەجموعە، یەك بزوتنەوە و گروپ (سەددەرسەد) بەئیسلامی نەناسێت ئەمە نابێتە هۆكاری ئەوەی كە بێژێ ئیتر هەرچی شتیەتی نائیسلامییە. ئەمە گوناهە، ئەگەر یەك مەسئەلەشی ئیسلامی بێت و بەیانی بكات ئەشێ بێژی بەڵێ ئەمە ئیسلامییە، (تەركیز لەم نوكتەیە بدەن) ئێمە هیچكامێكمان (سەد دەر سەد) بەناونیشانی ئیسلامی ناناسین كەهێزی خۆمان بخەینەكار بۆ پیادەكردنی بەرنامە و بیروبۆچونەكانیان، ئەمە ئەصلێك. بەڵام ئایا (سەد دەر سەد) گشتیان بەدژە ئیسلامی دەناسین؟ ئەمەش نەخێر. دەكرێت لەناو بەرنامەگەلێكدا كەهەیانە، یان بەرنامە نەڵێین، چونكە داخەكەم واقیعەن گشتیان بێ بەرنامەن! بلێین لەناو شیعارگەلێكدا كەهەیانە، یان شیعارگەلێك كە محتەوایەكیان پێدابێت دەكرێت شتگەلێكی ئیسلامی هەبێت دەبێت ئێمە نیسبەت بەو شتگەلە(ئەگەر مەترەح بوو، ئەگەر مەترەح نەبوو ئەوە هیچ)، كەمەترەحە بووە مەوزوعی تەرەفداری پەیدابكەین، بێژین "بەڵێ ئەمەی ڕاستە و ئەوەی نادروستە". جا ئیتر ئەمە مامەڵەی (ئیمانە) بگەڕێین جوزئیاتی مەسائیلی ئەم دەستەیە و ئەو دەستەیە بدۆزینەوە و بێژین ئەمە ئیسلامییە و ئەوە ئیسلامی نییە، ئەمە كارێكی قورس و كێشەدارە، بۆ نمونە لەڕووی (حیزبی جمهوری)ەوە بگەڕێم و قسەیەك بهێنم



بەشكوم شتێك ئیسلامییان تێدا بدۆزمەوە، بە ئیمانم ئەم دۆزیوەتەوە! جادەكرێت ئێوە ئەگەر دەدۆزنەوە مەردو مەردانە بێژن، چونكە وەزیفەمانە موسوڵمانانە لەگەڵ هەركەسێك ئیسلامییە ڕووبەڕوو ببینەوە. چی بكەم زانیاری من كەمە، نارۆمە دەرەوە و سنووردارم، هەرچییەك هەیە بۆتە هۆكاری ئەوەی زانیاریم لەبارەی (حیزبی جمهوری و هاوپەیمانگەلییەوە) ئەمەیە كە هیچ شتێكی ئیسلامی تێدانابینم. جاوەك وتم تەعەهودی ئینسانی موسوڵمان ئەوەیە ئەگەر ببینم دەبێت بیڵێم.

ئەوەی بەتەمەنە دەزانێت كاتێك ناونیشانی(ئینقلابی سپی)یان مەترەح كرد لەساڵی(١٣٤٢)دا، باسێك دەكرا دەربارەی ئەوەی ئەریَ ئەمە زوڵم نییە خەریكن موڵك لەدەستی مالیك دەردەهێنن و بەبیَ موعامەلەی شەرعی بەش بەشی دەكەن لە ناو خەڵكیدا؟ جا ڕونمدەكردەوە، كورە! ئەمە كەمترین مافێكە لەمافی ئەم خەڵكە كە ئەم دوابڕاوانە دەیدەن، بەڵام مافی جوتیاران زۆر زۆر لەمە زیاترە كە نایدەن كەمێك دەدەن و زۆرەكە وازلێدێنن، گەرەكم بوو خەڵكی ئاگادار بكەمەوە كەئەمە خزمەت نییە خیانەتە، هەروەها ئاگادار ببنەوە خودی ئەم مەتڵەبە كە موڵكگەل دەدەنە دەست جوتیاران كارێكی ئیسلامییە، مەجبور بووم كە هەتا سیستەمی شاهنشاهییەك كە هەرچی بیەوێت دەیكات لەبەرامبەر خیانەتەوە ئەگەر كارەكەی موسبەت بوو نەك بێژم ئەو كارە موسبەتەی كردووە.نا...نیشانی بدەم كە ئەم كارە ئیسلامییە، بەڵام جوزئێكە لەتەواوی مەجموعەكەیەوە كە دەبێت بیكات، بەڵام لەبەر خیانەت گشتی ناكات هەندێكی دەكات من(١٠٠تمەنم) لەلایەتی دەمخەڵەتێنی و (٥٠تمەنم) پێدەدات! لەفەزای تاریكدا چرا دەكوژێنێتەوە و

۱۰دانە) (ئەسكەناس) دەژمێرێت و ئێژێ ئەمە(۱۰دانە) (۱۰تمەنییە) و بێتە(۱۰۰ تمەن)، لەكۆتایدا كاتێك ورد سەیری دەكەم و دونیا ڕۆشن بێتەوە تەماشا دەكەم، ئێی خۆ هەمووی دەكاتە(۵۰تمەن)، نەك(۱۰۰تمەن) لاوی خستۆتە سەرم! بۆیە ئەمەی كە (۵۰تمەنم) پێدەداتەوە كارێكی وسبەتە و نابێت بێژم ئەمە موسبەتە، دەبێت بێژم كورە ئەم مەلعونە ەجیاتی(۱۰۰تمەن)(۵۰تمەنی) پێداوم، چونكە ئەساسی خیانەتە. ئابەم شێوەیە ۆ خەڵكمان ڕووندەكردەوە لەكاتی خۆی. ئێستاش بائەم خاوەن هێزانە، ئەم دەستانە خەریكن وەك حوكمەتی شاهنشاهییان لێبێت هەڵبەتە بەتەواوەتی وایان لێنەهاتووە، بەلاٌم خەریكە وایان لێدێت و ئەگەر لەسەر ئەمەش بەردەوام بێت وای لێدێت ئەگەر كاری باشەش بكات دەبێت بێژی "ڕووی ڕەش بێت ئەم كارە باشە جوزئێكە لەبابەتێك كەدەبوایە بیكردایە لەیكردووە!" داخەكەم هەتا كارێكی باش كە شاهنشاهی دەیكرد تائێستا لەمدا نەمبینیوە، كەبێژم ڕووی ڕەش بێت ئەم كارەی شتێكی باشە، بەڕاستی نەمبینیووە! ئا ئەوەیە بەدبەختی! ئەوەیە مەحرومییە لەم بێ زانیارییەی كەمن هەمە تائێستا نەم بینیووە كارێكی باش بكەن، بەلاٌم ئێوە ئەركتانە ئەگەر ئێوە دەبینن ئەم دەستە خاوەن هێزە كارێكی باشی ئیسلامی كردووە، یان شیعارێكی باشی ئیسلامییان هەیە و عەمەلیشی لەگەڵدایە، (چونكە شیعاری بێ عەمەلی زۆریان هەیە، بە شیعار ماشەلاٌ نمونەن!) شیعارێك كە كەمێك عەمەلی لەپاڵدا بێت و بێن و بەمن بێژن، چونكە ئەركی ئینسانی موسوڵمانە كە لەگەڵ بابەتەكاندا صادقانە ڕوبەڕوو بێتەوە، چی ئیسلامی و چی غەیر ئیسلامی هەمووی بێژێتی. تائێستا زانیاریم گەشتۆتە ئەوەی لەم دەستەیە(حیزبی جمهوری) كارێكی ئیسلامیم نەدیووە!

## موفتی زادە و حیزبی بەنی صەدر:

دەڕۆینە سەر ئەو دەستەکەی تر و موقایەسەیەکیان بکەین بەیەکەوە. بەڵێ، بە شیعار هەردوولا بێ عەیب! هەراو بەزمە و تەپوتۆز دەکەن! بەڵام لەبارەی عەمەلەوە، بەینی و بەینەلا لەمانیشدا عەمەلی ئیسلامی بەجۆرێك نابینم! یەك(ڕوانگە) لەواندا دیارە جا ئایا لەبەرئەوەیە کە لەئێستادا لایەنی زەعیفترن(لەڕووی هێزەوە)؟ ئەو لایەنە باشەیەشیان لەمەسەلەی بەکارنەهێنانی (ئیستبداد)ە. لە کردەوەشدا ئیستبداد بەکارناهێنن. ئەمە بۆنی ئیسلامی لێدێت، چونکە ئیسلام لەگەڵ خەفەقان و ئیستبداددا موخالیفە.

لەبوعدی سیاسیدا دەستەی زەعیف لە حوکمەت کە(بەنی صەدر)و دارودەستەکەیەتی بینیومانە ئەو شیعارە(ئازادی ویستییە)ی کەهەیانە و داوای(ئیستقراری ئازادی جمهوری ئیسلامی)، کەیەکیان بریتییە لە ئازادییەکە مقدارێك لەڕووی کردەوەوە هەماهەنگن لەگەڵیدا، واتە هەم لە شیعاردا هەیانە و هەم مقدارێك لەکردەوەشدا کاری پێدەکەن، وەك ئەوەیە صادقن، هەڵبەتە نابێت بێژی لە ئایندەشدا هەروا دەبن! مومکینە ئەگەر هێز کەوتە دەستیان ئالەبەرئەوەی باسمکرد کە بەرنامەیان نییە. هەرکە ئیعترازگەل دەمیان کردەوە و داوای ڕێگە چارەیەك بکەن و ئەمانیش(بەنی صەد) نییانە و ئەکسەر ئەمانیش دەست بکەن بەزۆرکردن، بۆیە ئایندەیان ئاشکرا نییە. واقیعەن نەبوونی بەرنامەش ئەگەر ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ ئینسانگەلی بێئینصافدا لە کۆتایدا دەبێتە ئیستبداد، مەگەر ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ ئینصافداو کابرا بێژێ بەرنامەم نییەو خواحافیز کەسێکی تر بێتو ئیدارە

توانایم نییە بەڕێوەی بەرم، ئەگەر بەرنامەشم هەیە، بەلاّم ئەوەندە
ڕ نییەجێبەجێی بکەن بۆیە جێبەجێ ناكرێ، ئەگەر ئەوەندە ئیمان هەبێت
ەفمەندانە ئاوا بێژێ زۆر خاسە، بەلاّم ئایا ئەگەر ئەم گروهە ئەگەر
ە هێز پەیدا بکەن ئەوەندە ئیمانیان هەیەكە ئیسلامیان لەخۆیان خۆشتر
و ئیسلام بەدناو نەكەن، ڕێك بێژنە خەڵكی "خەڵكینە! یان نازانین
م چۆن جێبەجێ دەكرێ، یان دەزانین، بەلاّم كەسمان بەپێی پێویست
بۆیە ناتوانین جێبەجێی بكەین". جا ئاشكرا نییە ئەوەندە تەعەهودی
میان هەبێت و دڵسۆزی ئیسلام بن، واتە شەخصییەتی خۆیان نەخەنە
ئیسلامەوە، بەڵكو ئیسلام بخەنە پێش شەخصییەتی خۆیانەوە، ڕاست
ە خەڵكی و خۆیان فیدا بکەن، بەلاّم ئیسلام بەدناو نەكەن. بیلفیعل، تەنها
ندە دەبینین كەلە شیعاری لایەنگری لە(ئازادی)دا ئەمان صادقتر دیارن،
انیش(حیزبی جمهوری) ئێژن(ئیستقلال، ئازادی، جمهوری ئیسلامی)، بەلاّم
ەمەلی دەبینین درۆدەكەن. ئەمە نوكتەیەكی ئیمتیازە كە ئەم دەستە (كەم
ە) لەدەستەی (خاوەن هێز) جیادەكاتەوە.

ختی خۆی باسمكردووە لەڕووی سیاسییەوە، ئەگەر تەرەفداری لەئازادی لەناو
اندا دەبینین لەڕووی ئابورییە بۆ نمونە (بەنی صەدر) مەسەلەی(ئیقتصادی
وحیدی) مەترەح كردووە، هەڵبەتە فیعلەن هێشتا بەو شێوەیەی كەكۆمەڵگە
ەیە ئەم تەرحە قابیلی جێبەجێ كردن نییە{واتە بارودۆخی كۆمەڵگە سازگارنییە
چێبەجێكرنی ئیقتصادەی تەوحیدی}، بەلاّم خودی مەترەح كردنی وشەكە بۆ
ئێران) كە ئینقلابی كردووە و هیچ بەرنامەیەكی نییە بۆ جێبەجێ كردن ئەم تەرحە

كارێكی باشە، هەروەك ئەو تەرحەی لەلایەنی مەرحوم (د.علی شریعەتی)*ەوە (خوای گەورە لێی ڕازی بێت)كردی تەرحی (تەشەیوعی عەلەوی و صەفەوی)ە كە فەوقەلعادە كارێكی گەورەیكرد كە ئەم شیعارەی خستە سەرزاری خەڵكییەوە!! (٤٠٠ساڵ)لە خیانەتگەلێك كەلەئێراندا(صەوفییەت) تا ئێستا كردویانە و غەنیمە بووە(بەتەشەیوع) شكڵی غەیر ئیسلامی داوە بە(تەشەیوع) ئەمەیە ڕسواكردن! تەنها بەمەترەح كردنی ئەم وشەیە. مەردمی بەدرۆ خستەوە كە(تەشەیوع) دوو ڕەنگی هەیە، ڕەنگێكی دەورانی(صەوی)، ڕەنگێكی دەورانی (صەوی) بەرەو ئەملاوە. ئەوەی وا لەدەورانی صەفەوییەوە بەرەو ئەملاوەیە زیاد كراوە هەڵەیە و مەنفییە، ئەمە عیبادەتێكی زۆر زۆر گەورە بوو. واقیعەن عیبادەت بوو، هەڵبەتە ئەوە نییە ڕەسا (هەراش)بێت، ڕەسا نییە، چونكە بەر لە صەویش هەر خیانەت كراوە، هەم لە تەشەیوعدا هەم لە تەسەنوندا، ڕەنگی زۆر ئالودە لەلایەن حوكمەتگەلەوە تەحیلڵ كراوە بە مەزهەبگەل بەلاّم بەگشتی كارێكی گەورەیە. مەترەح كردنی ناونیشانی(ئیقتصادی تەوحیدی)بۆئەم كۆمەڵگە كەم ئیسلامییە كارێكی گەورە بوو.

---

*) د.علی محەمەد تقی شەریعەتی: لەساڵی ١٣١٢ لە بنەماڵەیەكی ئایینی لە (روستای كهل)لە ئێران لە دایكبووە،دووای ئەوەی دەبێتە مامۆستا لە (مەشهد)،دەگەڕێتەوە زانكۆ و لەساڵی(١٣٣١)دا زانكۆی (فردەوسی)تەواو دەكات،لە ساڵی(١٣٣٥)دا (ئەنجومەنی ئەدەبی)لە ئێران دادەمەزرێنێت، دووای ئەوەی لەلایەن ڕژێمی شاوە زیندانی دەكرێت بۆ (٨)مانگ دووای ئازادبوونی دەڕوات بۆ فەرەنسا.پاش ئاشنابوونی بە زۆرێك لە كەسایەتییە بیرمەندەكانی ئەوكاتەی لەوروپا لەساڵی(١٣٤٣) لەدەرەوە (بەرەی میللی ئێرانی)دادەمەزرێنێت،شەریعەتی خاوەنی كەسایتییەكی دیارە لە دەرەوە و ناوخۆی ئێراندا،دوو بڕوانامەی دكتۆرای هەیە لەبواری(مێژوو وكۆمەڵناسی)دا،خاوەنی سەدان كتێبی بلاّوكراوەیە،كە بۆچەندین زمانی جیاجیا وەرگێڕاوە، شەریعەتی دووایی دەچێت بۆ بەریتانیا لەساڵی(١٣٥٦)لەوێ تیرۆر دەكرێت. جعفر سعید :شخصی و اندیشە دكتر علی شریعتی، چاپی دوەم چاپخانە(اران چاپ)، ایران،١٣٦٩ لا٢٥٦-٢٦٠).

تەرحكردنی ئەم عیبارەتە بۆ ئێستای ئێران كە ئینقلابی كردووە، (كە بەلایەنی كەمەوە ئارەزووی صادقانەی میللەت ئەمەیە، كە ئینقلابەكە ببێتە ئیسلامی و كۆمەڵگە بەسیستەمی ئیسلامی بەڕێوە ببرێت، جگە لەمەش لە هیچ بارێكەوە حوكمەت هیچ بەرنامەیەكی نییە بۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵگە) تەرحكردنی ئەم فیكرە خۆی بۆ خۆی خزمەتێكە كە ئیسلام لەسەر(تەوحیدەوە) بینا دەنرێت و ئەوەڵین مەسەلەی ئیسلام كە(عەقائیدە) دەبێت(تەوحیدی) بێت لەوەودوا هەر لەبەرەوە دەبێت باقی شئونی كۆمەڵگە دەبێت تەوحیدی بێت، لەم ناوەندەشدا دەبێت(ئیقتصادیشی تەوحیدی)بێت، نابێت(ئیقتصادی سۆشیالیستی)بێت و ڕەنگەلی بان و خواری تێدابێت، بۆیە خودی مەترەح كردنی ئەم باسە كارێكی باشە، بەشەرتێك شتێك تەشریعی بێت بەرنامەی بێت، ئەمانە دەتوانن ببن بەمەنشەئی خزمەتێكی فرەگەورە، بەلاّم فیعلەن وانییە! بەكردەوە بەرنامەی ورد بۆ كاركردن بەم ناونیشانە تا ئێستا لەلایەنی(بەنی صەدر) و هاوپەیمانەكانییەوە پێشكەش نەكراوە، بەلاّم خودی مەترەح بوونی ئەم ناونیشانە دەتوانێت ببێتە خزمەتێكی باش، بینا لەسەر ئەمە ئێمە هەرچەند (جەماعەتی بەنی صەدر و هاوپەیمانین) ـ تاچەند دەرەجە هامڕا ـ ئەمانە بەرنامەیەكیان نییە كۆمەڵگەی پێبەڕێوەبەرن بۆیە ئەمانیش هەر مەجبور دەبن وەك ئەم (لیبرالیستە) خاوەن هێزە كە حەقیقەتەن ئەمانە ئێستا نمونە و سمبولی مانای نێگەتیڤی(مەنفی) لیبرالیستن، سازش بكەن هەرچەند ئەمە لەڕوخساردا ڕۆشنە ئەگەر سبەی ئەوانیش بگەنە هێز لەبەر بێ بەرنامەیی لەگەڵ (فیودال)ەكاندا لەگەڵ سەرمایەدار و بازرگانەكاندا، لەگەڵ ئەنواعی زاڵمگەلدا سازشكاری دەكەن، بەلاّم خودی ئەم تەرحەیان





هەرچەند بەشێوەی شیعاریش بێت کارێکی موثبت (پۆزەتیڤە). ئێمە مەوزوعگیریمان لەبەرامبەریانەوە بەناونیشانی یەك (کۆمەڵەی ئیسلامی) نایانناسین کە بێژین سەد لە سەد ئیسلامین، بەڵام لەبەرئەو ئەرکەی کە پێشتر باسمکردە دەبێت جوزئیترین مەتڵەبیان ئیسلامی بێت بێژین(ئەمە ئیسلامییە).

یەکێکی تر لە بابەتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە بابەتەکانی(بەنی صەدر) کە ئەویش ئیسلامییە کەئەویش تەقریبەن هەر لە سنوری شیعاردایە و بۆ جێبەجێ کردنی کارێك نەکراوە، هەڵبەتە لەم کۆتاییانەوە کارگەلێك کراوە، بەڵام فرە ڕۆشن نەکراوە. ئەویش بابەتی(تەعمیمی ئیمامەتە)، ئەمە پەیوەندی بە(حوکمەتی ئیسلامی)یەوە هەیە، لە کتێبی (حوکمەتی ئیسلامی)*دا باسمکردووە. لەسێ دەورەی ئەصڵی و گەورەی حەرەکەتی ئینقلابی ئیسلامی، کەلەدەورەی یەکەمدا: (ئیمامەت فەردییە) تەصمیمگیر هەمەلایەنەش هەر فەردییە. لەدەورەی دووەمدا: فەردییە: بەڵام بەموراجەعە بە(بیر و بۆچونی جەمع)، واتە (موشاوەرە کردن). لەدەورەی سێیەمدا: ئیتر جەمعییە، شورایە.

ئەم بابەتی(تەعمیمی ئیمامەتە) فرە ڕۆشن تۆمار نەکراوە بەو شێوەیەی کەلەحوکمەتی ئیسلامیدا باسمکردووە کە پێویستی یەك حەرەکەتی ئیسلامییە، بەڵام بۆنی ئەوەی لێدێت! ئیمامەت، تایبەت نەبێت بە کەسێك یان چەند

---

*) کتێبی (حوکمەتی ئیسلامی) یەکێکە لەبەرهەمە چاپکراوەکانی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بە زمانی فارسی، بەڵام لە ئێستادا خۆشبەختانە لە لایەن بەڕێز (سەرخێل فەتاح نادر) لەژێر ناونیشانی (کورتە باسێك دەربارەی حکومەتی ئیسلامی) وەرگێڕراوەتە سەرزمانی کوردی. خوێنەر دەتوانێت بۆ زیاتر شارەزابوون سەردانی ئەو کتێبە بکات.




كەسێكەوە، بەڵكو ئیمامەتی تەواوی میللەت بێت بەوەسیلەی نوێنەرانی شوراوە، شوراگەل كۆمەڵگە بەرن بەڕێوە. ڕەهبەری لە قۆناغی كۆتایی تەشكیلاتدا كەلەوكاتەدا ئیتر فەردی ڕەهبەر نامێنێت یان ئەگەر كۆمەڵێك كەس بەیەكەوە كۆبنەوەو حەرەكەتێكی ڕەهبەرییان بەرێ خستبێت تابگاتە مەنزڵ نامێنن، ئیتر لەكۆتایدا تەواوی ئومەت دەبێت كۆمەڵگە بگرێتە ئەستۆ ئەویش لەڕێگەی نوێنەرەكانییەوە بەو شێوەیەی لە شورای ئیسلامیدا دەكرێت.

ئەم بابەتی(تەعمیمی ئیمامەتە) لەگەڵ سیاسەتی كۆمەلایەتی ئیسلامدا، یان سیستەمی كۆمەلایەتی و سیاسی ئیسلامدا، هەروەها لەگەڵ شێوازی ئیدارەی كۆمەلایەتی ئیسلامدا یەكدەگرێتەوە، بەلام ئەوەشمان لەبیربێت، وەك وتم هێشتا حیسابی تۆمار نەكراوە كەبزانین ئایا دوای ئەوەی تەدوین كرا و لەدواتردا تەرحی عەمەلی بۆ ئیرائە كرا لەگەڵ ئیسلامدا یەكانگیر دەبن یان نا؟ فیعلەن كەلەشێوەی شیعارێكدا سەیری دەكەیت بە مقدارێك كەم محتەواوە لەگەڵ ئیسلامدا موتەبیقە. هەروا(ئیقتصادە تەوحیدی)ەكەش ئەگەر كاتی جێبەجێ كردنی هات لەبەرئەوەی بەرنامەیەكیان نییە بۆی! مەعلوم نییە ڕەنگی تەواوی ئیسلامی پەیدابكات! ئەمیش هەر بەو جۆرەیە.

جا شیعارگەلی تر بێتەعەهود و بێمحتەوا و بێ ئەرزش بەشێوەیەكی موشتەرەك گشتیان ئێژنی كەكارمان بەوانەوە نییە. ئەگەر لەناو ئەم لایەنەدا یان ئەو لایەنی حوكمەتدا شتگەلێكی تر دەزانن ئەوە بێژنی، چونكە واقیعەن زانیاری پۆزەتیڤم دەربارەی (تایبەتمەندی)ئەم دوو لایەنە تەواو بوو.

جا وەلامی ئەوەش بدەمەوە كەئێمە كەوتوینەتە بەر توهمەت لێدان پێمان دەڵێن(كە لەگەڵ لیبرالیستەكانداین)،وتم ئەگەر واقعی بلێن (جمهورییەكان)ن،

كە خاوەنی هێزن لەوانن لیبرالیست، بەلاَم ئێستا (جمهوریيەكان) بەوانەی موخالیفی حوكمەتن ئێژن لیبرالیست، واتە لایەنی هێز كەجمهوریيەكانن بەئێمە ئێژن لیبرالیستین، ئەمەش مانایی ئەوەیە ئێمە لەگەلْ جەماعەتی (بەنی صەدر)داین. لێرەدا پرسیارەكە ئەوەیە لەڕاستیدا كاتێك كە ئیمان نەبێت تۆمەتدانە پالْ كەسێك هیچی تێناچێت! شتێكە فەوقەلعادە ئاسان، براكانم پێمان نائێژن لایەنگرانی ڕژێمی(پەهلەوی)ن؟ پێمان نائێژن بەكرێگیراوانی (ئەمەریكا و ڕوس و بەعس)ن؟ پێمان نائێژن(مونافیق)ن؟ هەر حیزبی جمهوری تەواوی ئەمانەیان پێنەوتوین؟ هەتا پێمان نائێژن(حاكمی شەڕەكان). خۆم گوێم لێبووە لەڕادیۆ و لە تەلەفزیۆندا وتویانە كە ئێمە ئەوەتاین لەگەلْ گروپەكانی (دژی ئیسلامی)دا! ئەوەتاین لەگەلْ(كۆمەلْ و فیدائی و...). بۆیە تۆمەتدان لە خەلْكی یەك زەڕە زەحمەتی دەوێت، ئەویش نەبوونی ئیمان! لەسەردەمی شاهنشاهیدا هەزار تۆمەتمان بۆ دروست كرا، یان ئەو كاتەی گروپە(دژە ئیسلامییەكان) كەلە كوردستان حاكم بوون و پێش ئەوە و دوای ئەوەش جۆرەها تۆمەتگەلمان لێدەدەن... حیزبی جمهوریش جۆرەها تۆمەتمان بۆدروست دەكات. ئەگەر وابێت ئێمە هەر بەدناوین و لەهیچ سەردەمێكدا نەگۆڕاوین، لە سەردەمی (شاهنشاهی)دا هەر بەد ناوبووین، لە سەردەمی (حوكمی گروپەكان)یشدا هەر بەدناوین، ئێستاش لەسەردەمی حوكمی(جمهوری)شدا هەر بەد ناوین، بەلاَم كام بەد ناوییە؟!! وەك حیكایەتەكەی(مەلا نەسرەدین)، مەلا نەسرەدین (٧٠-٨٠ساڵ) تەمەنی هەبوو پشتی كۆم بوبویەوە، ڕیشی هاتبوو درێژ، ڕۆژێك لە ناو كۆمەلْێكدا باسی هێزو توانا دەكرا ئەویش وتی"من تەجروبەمكردووە هێزی ئێستام لەگەلْ سەردەمی گەنجیمدا هیچ

فەرقی نەكردووە لەتەمەنی (٢٥ساڵیدا)چۆن هێزێكم هەیە ئێستاش هەروام".
خەڵكی سەریان سوڕما چۆن هێزی ئێستای بەم پیرییە هیچ فەرقی نییە لەگەڵ تەمەنی (٢٥)ساڵیدا؟ وتیان مەلا گیان چۆن؟
وتی:"لەگۆشەی حەوشەكەماندا (كوچكێك)هەیە لەتەمەنی(٢٥)ساڵیمدا دەڕۆشتم بەرزی بكەمەوە نەمدەتوانی ئێستاش هەر ناتوانم". براگیان شەنصی ئێمە بەوجۆرەیە، ناومان، حەیسییەتمان، واقیعیەتی سیاسیمان، جۆرەها مەسەلەكە پەیوەندی بەئێمەوەیە هەیە لەگەڵ سەردەمی(شاهنشاهی) هیچ فەرقی نەكردووە! جا هۆكاری ئەمە چییە؟ ئێمە نەیەین بەرخوردی ئیحساساتی بكەین ئەوە وا تۆمەتمان لێدەدەن و جنێودەدەن گشتی وەك ئەو كەف و كوڵە وایە كە قورئان دەفەرمێت ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ﴾*. ئێمە بەڕاستی هەتا دەتوانین بكۆشین باش لەئیسلام شارەزا بین، بەئەخلاق، بەتەقوا...بەهەرچی جۆرە خاس ئیسلام ببەین بەرێوە ئەمە باشترین ڕێگەیە! ڕێگەیەكی موتمەئین و محكەم و بێ هەڵە. جائەمە خۆ یەكەمجارمان نییە تۆمەتمان لێبدرێت،كە بترسین و داچڵەكین، هەر لەزووەوە ئەمە وایە لەوكاتەوە پێمان خستۆتە كاری سیاسییەوە تا ئێستا جنێومان پێ دەدرێت و نەفرینمان لێدەكرێت... بەلام خۆ بەگشتی ئەوەندەمان بیستووە كەدەبێت ئیتر دڵمان زۆر ناسك نەبێت...واگرنگە وەك

*) {أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَّابِياً وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ } الرعد١٧

قورئان دەفەرمێت﴿لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾*، ئەگەر ئێمە دروست ڕێگەبگرین کار و بەرنامەی گومڕاگەل هیچ زەرەرێکی نییە بۆمان.﴿لم یضرکم الا أذا﴾ ئەزیەت و ئازارمان بۆ دروست دەکەن بەڵام باتڵ ناتوانێ سەر بگرێ! ئەگەر قوردەتیش پەیدابکات﴿الْبَاطِلُ زَهُولا﴾.تا قودرەتەکەی هەیە دەتوانێت خۆی بسەپێنێت بەسەر خەڵکیدا ئەم قودرەتەش بۆ هەمیشە نامێنێتەوە لەگەڵیدا ئەوە بوو دیمان!

بەڕاستی سیستەمی (شاهنشاهی) پێش لەوەش بکەوێت ڕۆژ بە ڕۆژ قودرەتمان دەگرت، ئەو گروپە هاتن و شەڕ و زۆریان کرد بەڵام نەمان، ئەم حوکمەتەش هەروا دەبێت گریمان ئیستقراریەتیش وەربگرێت و خوانەکا (١٥٠٠ ساڵ)یش ئیستبداد بسەپێنێت بەسەر میللەتدا (هەڵبەتە بە لایەنە خائینەکەی دەڵێم خوانەکات، ئەگەرنا یاخوا ئینسانگەلی بە ئیمانە کەیەکە یەکەیەك هەن لەناو حوکمەتدا ئەمان زاڵ بن بەسەریاندا و ئەوان لەناوبەرن، هەرچەند بەرنامەیان نەبێت، بەڵام ئەگەر(ئیمان و ئەخلاق)یان هەبێت لەکۆتایدا دەتوانن داوالەخەڵکی بکەن و خەڵکیش بەرنامەیان پێبدەن، خوابکات ئینقلابەکە مەحفوز بێت و لەشەڕ و ئاژاوەی خودی ئەم تاقمە قودرەت پەرستە پێش لەهەموو شتێك مەحفوز بێت، جالەوەودوا دوژمنگەلی داخلی و خارجی، ترسناکترین ئینقلابی خودی حوکمەتەکەیە، خوا سەرەتا لەشەڕی ئەمانە بیپارێزێت جا لەوەودوا لەشەڕی ئەوانەی کەبەئاشکرا لەبەرامبەریەوە وەستاون). حەقیقەت ئەوەیە کە مونتەهای عەزییەت و ئازاری ئەمانە بۆ ئێمە

---

*) {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ }المائدة١٠٥

ئەو نارەحەتیانەیە کەدروستی دەکەن بۆمان و فشارێکی ڕۆحی دەخەنەسەرمان و ڕێگرییەك کەدروستی دەکەن بۆمان نایەڵن حەرەکەتمان بچێتە پێشەوە تاوەکو خەڵکی باش خاڵی ببێت، دەڕۆن سەر دەشێوێنن لەخەڵکی و گەردەلوول دروست دەکەن بۆ خەڵکی تا دەرك نەکەن و حەق و باتڵ لەیەك جیانەکەنەوە، بەڵام ئێمە بە ئیستقامەت ڕێگەی هیدایەت کە خوای گەورە دەفەرموێت بیبڕن، چونکە دینی ئیلاهی لەگەڵ سروشتی بەشەردا سازگارە وردە وردە تەواوی ئەم تاقیکردنەوانە لەناودەچن، ئەمە ڕێگەی ئەصڵی و موتمەئین. بەڵام ڕێگەیەکی تریش ڕێگەی (تەبلیغاتی). ئەمەش زۆر ئاشکرایە، کەبراکان! خۆ قودرەت پەرستی و گروپگەرای و حیزبداری لە ئیسلامدا نییە، ئەمە کە ئێمە لە ئێستادا بەناونیشانی (حەرەکەتێك هەین) لەبەرئەوەیە کە هیچێکی تر لەئێراندا بەو جۆرە نییە کەئێمە لەگەڵیاندا بین، ئەگەر قەرار بێت بکەوینە شوێن هەر حەرەکەتێك ئەوە ئیسلاممان فەوتاندووە!! ئەمە کەئێمە بەجیا خەریکین کاردەکەین کار دەکەین و لەگەڵ هیچکام لەمانەدا نین نیشانەی ئەوەیە کە هیچکامێکیان بەتەواو ئیسلامی نازانین ئەمەش زۆر بەسادەیی و عادی.

## دەربارەی ئیمپریالیزم

هەروەها نوکتەیەکیش بێژم لەبارەی ناحاڵی بوونی ئەم گروهگەلانەوە دەربارەی هەندێ چەمك کەبۆتە بنێشتە خۆشەی بن دانیان،بۆ نمونە چەمکی(ئیمپریالیست) شتێکە کەبۆتە جاجك(بنێشت)ە خۆشەی دەمی هەرچی کەسە زۆربەیان ماناشی نازانن! واقیعەن (ئیمپریالیزم)لەناو گیرفانیاندایە کەچی خەریکن جنێو دەدەن

بە(ئیمپریالیزم)! خەریكن خزمەت دەكەن بە(ئیمپریالیزم)و گەشەی پێدەدەن، ئاوی دەدەن و لق و پۆپە زیادەكانی دەبڕن و نەش و نمای پێدەدەن، كەچی هەر نەفرینی دەكەن، ئەمەش لەبەرئەوەی دروست و قوڵ و مەكتەبی بەرخورد ناكەن لەگەڵ(ئیمپریالیزم)دا! ئەگەر واقیعەت بێژیٚ لەقورئاندا بەحسێك هەیە كە ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَىَ شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ﴾*. حەملەی موتەقابیلن نیسبەت بەیەك، یەهود دەڵێت"نەصرانییەت" ڕێگەی حەقیان وێڵكردووە، (نەصرانییەت) ئێژن(یەهود) "ڕێگەی حەقیان وێڵكردووە"، جا هەردوولا هەر ڕاستدەكەن، بەخوا سازشكاری ببێت، ئیرتجاع بێت، هەرجۆرێك بێت هەر خزمەتە بە (ئیمپریالیست)! هەر جۆرە مەوزوع گیرییەك غەیر ئیسلامی هەر ترسناكە و هۆكاری دروست كردنی پایگا و نفوز و قودرەتگەلی (جیهانخارە). جا من ئیمپریالیست بەمانا فراوانەكەی ئێژم، چ ئەوەی بەفعلی و وجودی هەیە، چ ئەوەی كە نەبێت مەفهومەكەی مەترەحە بۆم، نەك كادری جوگرافیایی، یان كادری سیاسی موشەخەص،هەموو لایەنەی خەصڵەتی ئیمپریالیست دەگرمە نەزەر(داگیركردن و تالآنكردنی ولآتان) ئێستا (ئیمپریالیسگەلی)ئەمەریكا و ئەوروپا و شۆرەوی و هاومەسیرگەلی(هەندیٚ لە چین و ژاپۆن) هەر وردە وردە ئیمپریالیست خەریكە دروست دەبێت، ئەگەر ئینسان ئیسلامی و دروست سەیری مەفهومی ئیمپریالیست بكات كە بریتییە لە هەندێك هێزی داخلی و خارجی، كەبە خاریجییەكەی دەوترێت ئیمپریالیست! سەیردەكەیت تەنها (ئەمەریكا) نییە! زۆرن و گشتیان فاكتەرن بۆ دروست

---

*) {وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَىَ شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ الْكِتَابَ كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَاللّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ }البقرة١١٣

بوونی كۆنترۆڵی خارجی لەسەر ئێران. بەڕاستی باقی گروپەكان هەروان لەبەرئەوەی غەیرە ئیسلامی كاردەكەن و مەورززعگیری و بەرخوردیان لەبەرامبەر یەكەوە غەیرە ئیسلامییە هەر وردە وردە ئینقلاب زەعیف دەبێت! هەرچی ئینقلاب زەعیف ببێت قودرەتی ئیدارەی ئیسلامی داخلی لەناودەچێت، ئەمەش وردە وردە مەیدان دەكاتەوە بۆئەوەی قودرەتگەلی خارجی بێنە ناوەوە، چونكە كاتێك قودرەتێكی نیرۆمەندی داخلی نەبێت بتوانێت كۆمەڵگە بەڕێوەبەرێت و تەعەهودی كارگەلی بكات ئیتر لەدەرەوە دەیكەن.

بەگشتی ئەم توهمەتگەلە كە(سازمانی موجاهدین، جەمبشی موسوڵمانان،..) ئەم دەستەگەلە دەیدەن موتەئەسیفانە زۆر محتەوای قوڵی مەتڵەبیان ڕۆشن نییە، ڕواڵەتی دیارە. هۆكاری ئەمەش ئەوەیە خۆشیان زۆر ڕۆشن ئیسلام پێشكەش ناكەن، بەڕاستی ئەگەر لایەنێكیشیان زۆر زۆر شارەزا بێت تەنها لە سنوری(مەزهەبی جەعفەری)ەیەوە ئەوەش زۆر كەمە(هەڵبەتە وتومانە ئێمە جیدالی مەزهەبی)ناكەین، (مەزهەبی شافیعیش) هەروایە. هەتا مەجموعەی بەناو (تەسەنون)یش هەروا كافی نییە تۆ گەرەكت بێت لە دیدگای تەسەنونەوە ئیسلام بناسین، دەی لە دیدگای(تەشەیوعەوە) بەتەریقەی ئەولا كافی نییە!! جگەلەوەی مەزاهیب چەنێك ئینحرافاتی هەیە لە ئەصڵی دین، جا ئینحرافات لەهەردوولا هەیە بەتایبەت لە(تەشەیوع)دا.جگە لە ئینحرافاتەكان خۆ نارەساییەكە بێ گومانە، مەزهەب ڕەسا نییە! مەزهەب بەرداشتگەلی ژمارەیەك لەئینسانگەلە لە شەرائیتی زەمانێكی تایبەتدا ئەمە ڕەسا نییە بۆ هەرچی زەمانە كەكاری كۆمەڵگە بەڕێوەبەرێت. دەبێت بگەڕێیتەوە سەر دین وبەئیجتهادی تازە و سودوەرگرتن لە دین كۆمەڵگە بەڕێوەبەرێت. بەگشتی

هەموو گروپ و دەستەکان لەمانە وا لەبەرامبەری یەکەوە وەستاون گشتیان ئەوەڵێن ڕەخنە لێیان ئەمەیە کە مەزهەبین! ئەویش شاخەی مەزهەبی (جەعفەری) کە بەڕاستی ئەگەر لایەنی پۆزەتیڤیشی هەبێت نیسبەت بەباقی مەزهەبەکانی تر یاخود فراوانتر بێژین(تەشەیوع) با لایەنە فکرییەکەشی بگرێتەوە. پەیڕەوی تەشەیوع، ئەگەر تەشەیوع لایەنی پۆزەتیڤیشی هەبێت لەهەندێك حاڵدا نیسبەت بە (تەسەنون) کەدەبێت هەردوو لاوابن، دەبێت بە ئینصافەوە بیڵێیت و جەنگی نەکات بێژیٚ هەر من حەقم و هەرچی شتم هەیە حەقە و ئەو تەرەفەکە ناحەقە، هەرچی لەودا حەقە بێژێتی و لەوەی خۆیدا ناحەقە بێژێتی.{هەروەك ئەوەی مامۆستا ناصری سوبحانی دەفەرموێت"کاتێك ئێمە بەڵگە لە جولەکەیەك وەرناگرین لەبەرئەوە نییە کە جولەکەیە بۆیە وەری ناگرین، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە حەقی پێنییە بۆیە وەریناگرین، ئەگەرنا حەقیش بە جولەکەیەکیش بێت دەبێت وەریبگریت}.

بەڵیٚ( تەشەیوع)لایەنگەلی پۆزەتیڤی هەیە نیسبەت بەتەسەنون، بەلاٚم ئەگەر ورد و فراوان تەماشا بکەیت (تەشەیوع) یەکجار دورترە لە ئیسلام تاوەکو(تەسەنون) هەردووکیان دورن لە ئیسلام هیچکامیان ئیسلام نین نە تەسەنون نە تەشەیوع، بەلاٚم تەسەنون فرەتر نزیکە لە ئیسلام. هەرچەند شتگەلی هەڵەی تێدایە کەلە تەشەیوعدا نییە، هەرچەند لە تەشەیوعدا شتگەلی پۆزەتیڤ هەیە نزیکتر لە ئیسلام و ئیسلامی تر کەلەتەسەنوندا نییە، بەلاٚم مەجموعەن لەبەرچاو بگریت تەسەننون زۆر زۆر بەهێزترە لەبارەی ئیسلامی بونەوە زۆر زۆر لە پێشترە فرە کەم خەتەر ترە بۆ ئیسلام. تەشەیوع یەکجار کەمتر ئیسلامییە! مەجموعی ئەم گروهگەلە چالاکەوانانە لە ئێراندا، ئەمانە




وادیارن گشتی بەڕاستی مەزهەبین‌و فەوقەلعادە بچوك‌و كەم‌و سنوردار، گشتی لە دیدگای تەشەیوعەوە تەماشای ئیسلام دەكات كە:

یەكەم: مەزهەب بە موتڵەقی بەكارناخوات، ئەگەر ئینسان دیدی سنوردار بێت هەتا تەسەنونیش.

دووەم: ئەگەر قەرار بێت لەدیدگای مەزهەبەوە تەماشا بكەیت، بەلایەنی كەمەوە لە دیدگای تەسەنونەوە تەماشای بكە كە زۆر لە تەشەیوع ئیسلامی ترە. دەیڵێمەوە ئەمە نەبێتە مەبنای جەنگی مەزهەبی! چونكە (دەمارگیری مەزهەبی) ئەوەیە كە بێژی هەرچی شتی من هەیە حەقە و هەرچی شتی ئەوە باتڵە، چونكە من سوننیم بۆیە سوننی حەقە، ئەو شیعەیە بۆیە شیعە باتڵە، لەبەرئەوە نەبێتە ئەو جەنگە مەزهەبییە بۆیە ئاماژەی پێدەكەمەوە زۆر شت هەیە لە تەشەیوعدا ڕاستە و هینی ئێمە هەڵەیە. دەبێت ئینسان حەق بێژێت، بەڵام دەبێت ئەم واقیعیەتە لەبیر نەبەینەوە، هەروەها نابێت بیكەینە مایەی جەنگ و جیدالیش كە دەبێت تەنها بیزانین (تەسەنون) فرە فرە نزیكترە لە ئیسلام، تاوەكو تەشەیوع. ئەگەر قەرار بێت ئینسان دیدگای مەزهەبی بێت ئەقەلەن لە تەسەنونەوە تەماشای ئیسلام بكات، كەزۆر ئیسلامی ترە. لادانی یەكجار كەمترە لەئیسلام نەك لەدیدگای تەشەیوعەوە كەیەكجار كەم ئیسلامییە و لادانی لەئیسلام زۆرترە.

تەواوی ئەم گروهگەلە هەر لە(جەمبشی موسوڵمانانی..سازمانی موجاهیدین.) ئەم گروپ و ئەو گروپی حوكمەت ڕاستییەكەی ئەوەیە گشتی شیعەیە، ئیسلام لەدیدگای تایبەتی مەزهەبییەوە دەبینن، جائەم جۆرە بیركردنەوەیە لەگەڵ بیركردنەوەیەك ئازاد و ئیسلامیدا كە سنوردار نەبێت لەچوارچێوەی مەزهەبدا زۆرترە، چەندین جار وتومانە كەناتوانین ئێستا نەفی (مەزهەب) بكەین كاتێك شورای عالەمی ئیسلامی هەبێت ئەوە حەقی هەیە نەفی مەزهەبی بكات.




# (١)

## بارەی ئەصلی ئافرەتەوە

ەدا دەمانەوێت ئەوە بۆ خوێنەری ڕون بكەینەوە، كە لە ڕێگەی ئەم باسەی
اك ئەحمەد)ەوە وەڵامی ئەو هەموو گومان و ناڕونیانە بدەینەوە كە
ربارەی هەندێك ئایەتی قورئان هەیە، بەتایبەت ئەوانەی لە بارەی (ژن)و
كهاتەی (ژن)ەوە قسە دەكەن، كە بەداخەوە زۆرێك لە مەلاگەلی خۆشمان
حاڵیانە وەك (كاك ئەحمەد) باسی دەكات هەمان ئەو قسانە دەجوونەوە كە
شارەزایانی دین بە ناوی دینەوە جویوویانە! جا بۆئەوەی ئەوە چارە بكەین
ەوڵدەدەین بەم پەراوێزە ئەو گومانانە چارەبكەین، ئەمە جگە لەوەی
وێنەران دەعوەت دەكەین بۆ زیاتر شارەزابوون لەم باسەدا سەردانی
بدتەكانی (مامۆستا ناصری سوبحانی) بكەن، بەتایبەت ئەو وانانەی بە ناوی
خلق أدم)ەوە بلاّو بوونەتەوە. (موفتی زادە) بەم جۆرە وڵامی ئەو گوماناه
ەداتەوە"یەكێك لە هاوڕێیان لەم مەجلیسەدا پرسیارێكی مەترەح كردووە،
رسیارێكی زانستی و گرنگە ڕاجع بەتەكامول ئەویش ئەمەیە كەلەبارەی ئەم
ایەتەوە پرسیویەتی﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ
وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء﴾، چونكە ترجمەی ئەم
كەلیمە " وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا " بەخراپ دەرك كراوە.

ئەم هەڵەیە پێش هاتووە كەئەم ئایەتە موخالیفە لەگەڵ تەكامولدا." مِنْهَا "
ئەو(ها)یە دەگەڕێتەوە بۆ (نفس) سەرنجی ئەم نوكتەیە بدەن ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ

وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ ئەو (ها) هەر بۆ خودی(نفس)ەكە دەگەڕێتەوە، ئەوە هیچ كە هەندێك لە بانگخوازی ڕۆشنبیر چەنێك بەخراپی سودیان وەرگرتووە لەكتێبگەلێك كە علیه ئیسلام بەناو تكامول كە هاوردویەتی تبقی تەفسیری تبری ئەوەی وا (مەسیحیگەل و یەهودیگەل) ووتویانە تەفسیری تبری بە زاراوەی (ئیسرائیلییات) پێی ئێژن (دین)، پێی ئێژن (ئیسرائیلییات) هێناویەتی ئەوەیان گواستوەتەوە، كە(ژن)لەپەراسوی چەپی (ئادەم)ەوە دروست بووە، ئەوە هیچ ئەو گاڵتەجاڕییە كە كابرا خۆی بەڕۆشنبیر دەزانێت خیانەتی وا دەكات بەناوی قورئانەوە! قورئان ئاوا بەهەڵە تەفسیر دەكات. ئەمە بەجێی خۆی، بەڵام ئەمەش خیانەت نییە غەفڵەتێكی سادەیە!

﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾:

نفس، واتە ئەو ماهییەتە كوللییە كەهەر مەوجودێك هەیەتی. واتە(ژن و پیاو) لەئەم جۆرەدا لەیەك ماهییەتی كوللی دروست بوون، هەروەك(ژن و پیاو) لەهەر جۆرێ گیانداردا هەر جۆرێ لەگیاندارگەل(مۆكر و مێنی) ماهییەتە ئەم ئایەتەش دەڵێت، كەئێوەمان لەیەك ماهییەت دروست كردووە چ پیاوەكە، چ ژنەكە،"خَلَقَ مِنْهَا" ئەو (ها) دەگەڕێتەوە بۆ (نفس)، واتە ڕێك لەو (نفس واحدە) لەو ماهییەتە جفت دروست بووە، نەك ئەوەی پیاو لەماهییەتێك و ژن لەماهییەتێك پێك دێت، ماهییەتی ئەم دووانە هەر یەكێكە.

ئەمە ئەمەیان. لەوەودوا لەوانەیە لەڕووی ئەمەوە دووچاری هەڵە بوبێت، كە عیلم مەسەلەن دەركی ئەمە نەكات دوو ئینسان بەناوی (ئادەم و حەوا) لەیەك ساتدا بەدیهاتبێتن‌و ئەو گشتە بەشەرە لەوان كەوتبێتەوە، بەڵام ئەمە چارەسەرەكەی

زۆر زۆر سادەیە و زۆر زوو بۆ ئینسان ڕۆشن دەبێتەوە كەیەك هەڵەی لاوازە وا تصور دەكەن لەنێوانی ئەم مەتڵەبەدا و تحقیقاتی تكامڵدا ئیختلاف ببێت؟

لەتەكامولڵدا منتهی بوونەتە ئەوەی كەیەك ئەڵقەی ونبوو(مفقود) هەیە كەپەیوەندی نێوانی ئینسان و ئاژەڵێك شەبیە بە زاراوەی (مەیمونێك) ئیمڕۆژە، ئەمەش دەزانن لەزەمانێكدا كەئیتر نازانین ئەم زەمانە (هەزار ساڵ یان پێنج سەد هەزار ساڵ یان پێنج ملیۆن ساڵ) لەمەوبەر بووبێت، هەر چییەك بێت.

چونكە تكامولڵگەل بیروبۆچوونی جیاوازیان هەیە، كە ئینسان لەدایك بووە لەو ئاژەڵە كامڵە كە ونبووە و نەماوە لەڕووی كورەی زەویدا نەسڵی لەناو چووە، قورئانیش هەربەوجۆرە دەفەرمێت:"ئینسان بووە بە جێنشین" كەزۆرێك لە موفەسیرینی ئیسلامی بەپێی باقی ئایەت و قورئان دەڵێن وجودێ زۆر بەڕێز و بەهێز نیسبەت بە ئاژەلانی تر وجودی بووە پێش لە ئینسان كە دەفەرمێت"یفسد فیهاویسفك الدماء" هەم بەروبوم و گژوگیا دەخوات و لە نێوانی ئەمەدا هەم خوێن ڕژە، یانی هەم گیاخۆر وهەم گۆشتخۆر لە مەوجودێك كە وجودی بووە و لەناوچووە ئینسان لەنسڵی ئەو كەوتۆتەوە.

جائەمە عیلم بەوردی ناتوانێ دیاری بكات چ زەمانێكە. ئەصولەن لە نەزەری عیلمدا هەرگیز ناتوانێ ڕۆشنی بكاتەوە كەلە فلانە زەماندا چەند دانە ئینسان لەنەسڵی ئەو گیاندارگەلە كەوتونەتەوە، تەنها ئەوەندە لەنێوانی تكامڵگەلدا مەترەحە كە دوو بیروبۆچوون وجودی هەیە:

بیروبۆچوونی یەكەم/ تەواوی ئینسان بەیەك نەسلْ دەزانن.

بیروبۆچوونی دووەم/ سپی پێستگەل بەنەسڵێك دەزانێت، ڕەش پێستگەل بەنەسڵێك دەزانێت، سور پێستگەل و زەرد پێستگەل بەنەسڵێك دەزانن.




ئەم دوو جۆرە بیربۆچوونە وجودی هەیە، بزانین چ فیكرێكی فەلسەفییە كەئەم دووانە جیادەكاتەوە لەیەك، كاتێ تەرزی تەفەكوری فەلسەفی ئەم دوو جۆرە بیروبۆچوونە بەرڕەسی دەكەین سەیردەكەین ئەوانە وا دەڵێن ئەصڵ و ڕەگەزی(سپی پێست و ڕەش پێست) جیان لەیەك فاشیستگەلێكن، (كەتەرەفداری بەرتەرێی نەژادین) تەنها تەرەفدارەگەل (برترێی نەژادی)ئێژن جنسی(سپی پێست) لەیەك جۆر مەیمونە، جنسی(ڕەش پێست) لەیەك جۆر مەیمونە، جنسی(سور پێست) لەیەك جۆرە و جنسی(زەرد پێست) لەیەك جۆرە. دانشمەندگەلێك كە تەرەفداری بەرتەرێی نەژادی نین ئەوان گشتیان ئێژن لەیەك جۆرە، دەی كاتێ لەیەك جۆرە، ئەمە سادەترین چارەسەرە كەئەم گشتە نەسڵە هەر لەیەك (دایك و باوك) بوو بێت، كە (ئادەم و حەوا) ناو ڕەمزی ئەم دوودانە ئینسانە ئەوەڵەن. جا ئەمە چ كێشە و ناسازگارییەكی هەیە لەگەڵ عیلمدا؟!.

لەوەودوا مەتڵەبێكی تر بێژم ئەگەر سەیری مێژووی ڕابردووی ژیانی بەشەری بكەین بەسەیركردنێكی سادە بۆمان دەردەكەوێت مەنتیقی بۆ ئینسان ئەوەیە كەبزانێت لەكاتێكدا مەتڵەبێك لەڕێی زانین و هەوڵدانی بەشەرییەوە ئەوەندە ڕۆشن نەبوبێتەوە كەتەناسوبی ببێت لەگەڵ قورئاندا ئەوە نیشانەی ئەوەیە كە هێشتا مەتڵەبەكە تەواو ڕۆشن نەبۆتەوە بۆ خەڵك، بەشەر تەواو حاڵی نەبووە، چۆن؟ مەسەلەن خوای گەورە لە قورئاندا چەندین جار ئەمەی فەرمووە، كە حەوت تەبەقە ئاسمان هەیە بەدەوری كورەی زەویدا، لەدەیەها ساڵ لەمەوپێش تەنها (سێ) تەبەقە بەدەوری زەویدا تەصەوریان دەكرد، ئەوانە وا تەصەوریان دەكرد تەنها سێ تەبەقە بەدەوری زەویدا وجودی هەیە، ئەوانیش(هەواو ئاگرو خەلەء) بەخەیاڵی خۆیان وایان دەوت،




دەیانوت ئەوەی قورئان وتوویەتی(حەوت) تەبەقە هەڵەی کردووە، بەڵام بەتێپەڕبوونی زەمان زانییان کە چوار تەبەقە هەیە، پاشان زانییان پێنج تەبەقە هەیە، ساڵانێك بە پێنج تەبەقەیان دەزانیو دەیانووت قورئان هەڵەی کردووە وتوویەتی حەوت. دەی دەی... تاگەیشتە ساڵی(٤٣)کە ئیسپۆتنیگەلی ئەمەریکای شوێنێکیان بەدوو پۆستەی(داخلی و خارجی)یەوە دۆزییەوە بەناوی مەنتیقەی(تشعشوع وان عالم) کەلێرەدا دەرکەوت بەڵێ حەوت ئاسمان بەدەوری زەویدا هەیە!.

ئەو کاتەی کە قورئان دەیفەرموو حەوتە، مەنتیقی ئەوە بوو بێژین باشە قورئان هەڵەی کردووە؟! نەخێر..بەشەر هەڵەی کردووە! قورئان لەتەرەف بەدیهێنانی زەوی و هەستییەوە هاتووە و پێویستی نەبوو ئەقمار دەستکرد دروست بکات و بڕوات تەبەقات ئازمایشت بکات تابزانێت دەگەیتە خەلەء جەمعەن دەبێتە چەند تەبەقە. خۆی دەیزانی چۆنی خەلق کردووە. ئەوکاتە ئێمە وامان دەزانی سێ تەبەقەیە ئێمە هەڵەمان دەکرد، ئەوکاتە وتمان چوار تەبەقەیە ئێمە هەڵەمان کرد، وتمان پێنج تەبەقەیە ئێمە هەڵەمان کرد، تاوەکو بۆمان دەرکەوت حەوت تەبەقەیە جائەو کاتە عیلمی ئێمە لەگەڵ قورئاندا موتابیق بوو، لەحەقیقەتدا عیلمی ئێمە بوو گەیشتە ئەوەی وا قورئان فەرموویەتی، نوکتەیەك کەپەیوەندی هەیە بە ئاخرین قۆناغی دۆزینەوەی بەشەری ئاسمانی(فچاو)، لە سورەی(الرحمان)دا باس لەسەفەری ئاسمانی بەشەر دەکات ڕوودەکاتە بەشەر کەئەگەر توانایتان هەیە لە ڕوبەری(قوترگەلی) هەم کورەی زەوی و هەم کورەی ئاسمانییەوە بڕۆنە دەرەوە، و لەوەودوا لەوە گرنگتر بۆ ئێمە ئەوەیە کەیەکەمجار لە ڕووبەری کورەی زەوی(لەئیختیاری

کورەی زەوی)بڕۆینە دەرەوە! باس لەڕێگرێك دەکات کەلەڕێماندا هەیە کەئەگەر وەسیلەیەکمان نەبێت ناتوانین لەو ڕێگرە تێپەڕین کەدەفەرمێت﴿یرسل علیکما شواظٌ من النار و نحاسٌ فلا تنتصران﴾ هەڵبەتە، ﴿یا معشر الجن والإنس ان ستطعتم ان تنفذوا من اقطار السموات و الارض فأنفذوا لا تنفذون الا بسلطان﴾. هەر لەسەرەتاوە ئەگەر وەسیلەیەکتان نەبێت ناتوانن لە (اقگار) کورەی زەوییەوە بڕۆنە دەرەوە، بۆچی؟ یەك خەتەر بەیان دەکات، خەتەرەکە نییە لەناو کورەی زەویدا لە جێگەیەکدایە دەبێت بەشەر زۆر بڕوات بەرەو ژوور تادەرکی بکات! زۆر لەزەوی دەربچێت تائەو خەتەرەی بۆ ڕۆشن ببێتەوە!. باش لەم نوکتەیە ورد ببنەوە"یرسل علیکما شواظٌ من النار و نحاسٌ فلا تنتصران".بلێسەگەلێك لەجۆری ئاگر(النار) ،(نحاسٌ) جۆری مسی تواوە یان دوکەڵ دەربڕینێکە کەهەم مانای مس دەگەیەنێت و هەم مانای دوکەڵ دەگەیەنێت. بلێسەیەك لەمس یان دوکەڵ بەجۆرێك لە ئاگر دەبێتە ڕێگر لەوەی کە ئێوە لەم سەفەرەدا بتوانن سەرکەوتوو بن و لە(اقطار السماوات ولارض) بڕۆنە دەرەوە. یانی چی؟ مەسەلە چییە؟ تاساڵی(٤٣) ئەم نوکتەیە نەدۆزرایەوە. لەساڵی(٤٣)دا بوو(ئیسپۆتنیگەلی شەشەمی ئەمەریکایی) بوو.توانی بگاتە ئەو مەنتیقە تشعشوعییە،(مەنتیقەی تشعشوعی وان عالم) کە پێشتر باسمان کرد. لێرەدا تێگەیشت کەئەم قۆناغگەلە کەلەکورەی زەوی دوور کەوتۆتەوە گشتی ئاسان بووە، بەڵام خەتەر لێرەدا ئەمەیە، ڕێك ئەو کەسایەتییە وا(سەرۆکی کۆمیتەی میللی زانستی ئەمەریکایی)بوو بەناوی(وان عالم) کەئیتر لەکورەی زەویدا ئەو مەنتیقە بەناوی ئەوەوە ناوبانگی دەرکردووە، مەملەکەتگەلی





ش هەر پێی دەڵێن(مەنتیقەی تشعشوعی وان عالم).بابەتێكی نوسیووە، كاتێ
سان تەنها سەیری مانا بكات نەك وشەیەكی (عەرەبی) یان
ەیەكی(ئینگلیزی)،مانای مەتڵەب سەیربكات بۆی دەردەكەوێت (د. وان
م) ڕێك تەفسیری ئەو ئایەتە قورئانییەی نوسیووە﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن
وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾الرحمن٣٥. عەجیبە"الا بسلطان" عەینەن وشەكە
ێت "ئێمە لەسەفەرگەلی ئاسمانیماندا كێشەیەكمان بووە گشتیمان خستۆتە
ست سەر، چونكە تائەو كاتە نەیانتوانی بوو ئیتر بەتەواوی لەئاسمان و زەوی
هەموو لایەكەوە بەتەواوی بڕۆنە دەرەوە، بەڵام تازە تێگەیشتین لەو
ەتەرەی واعیبارەتە لەم (مەنتیقە تشعشوعییە) كەقورسە بۆ ئەهلی
ۆمەڵەكە ئەگەر بەدرێژی باسی بكەم، ئەم مەنتیقە تشعشوعییە
ارای(حەوت سەد ملۆن ۆڵت شارسودەی ئیلیكتریسیتی)یە، كەئەگەر
بوو(سین كێشی)یەكی بۆ بكرێت لەڕووی ڕەوشی زانستییەوە(برق) چەند
ەرامبەر كورەی زەوی تەئمین دەكات، بەهەرحاڵ بەڵكو لەئایندەدا بەشەر
توانێ بەهرەبەرداری سەیر و گەورە بكات، لەو مەنتیقەی كەمەربەندییە،
ەر مەوجودێك بیەوێت لەم مەنتیقەوە تێپەڕ بێت بەبۆنەی تینی خۆرەوە،
شیعەی خۆرەوە، ڕێك وەك (گوللە) لەئەلكترۆن و پرۆتۆن شتگەلێك
گوللەمانان دێت بەرەو لای ئەوشتەوە یەكسەر ئەیسرێتەوە، نەك ئەوەی
كەبیسوتێنێت یەكسەر ئەیسرێتەوە. لەگەڵ ئەو گوللە دایدەنێت، كەواتە
ئێمە جۆرێك وەسیلەمان ئەوێت "بسلطان" كە لەبەرامبەر خەتەری ئەو
گوللەوە بمانپارێزێت بتوانێت لەو ناوچەوە تێپەڕ بێت.

ئەو كاتەی كەلە(قزلّ قلعا){ یەكێكە لەو زیندانییانەی لە ئێراندا هەی و كاك ئەحمەد تێدا زیندانی كراوە، بۆ زیاتر خوێندنەوە سەردانی كتبی یەكەم بكە(كاك ئەحمەدی موفتیزادە و دەروازەیەك بۆ خەاتێكی نەناسێنراو)...}
بووم ژمارەیەك ڕۆژنامە هاتە دەستمان سەیرم كرد تائەو مەتڵەبە واساڵەهای تێپەڕی و بەشەر هەر گڕوگاڵێكی كردووە لەبارەیەوە و هیچی لیّ تێنەگەیشتووە خەیاڵ بازی كردووە، ڕێك وەك ئەوەی (د. وان عالم) تەفسیری كردووە، ئەوكاتە من ئیتر تێگەیشتم لەمانای ئەم ئایەتی قورئانە. جا مەتڵەبی زۆر هەیە لەقورئاندا بەشێوەیەكی دیاریكراو دانە و دوان و سیان نییە! یان لە ئەحادیسی پێغەمبەردا(ﷺ) كە ئاماژە دەكات......

(٢)

## پێنج بابەتەکەی کۆتای سورەتی (لوقمان):

{ئێمە دەزانین لەکۆتایی (سورەی لوقمان)*دا پێنج بابەتی ئەساسی و گرنگ باسکراون لە لەژیانی ڕۆژانەی هەر تاکێکدا گرنگی و جێکەوتەی خۆیان هەیە، دەبینین هەر لەبەر ئەم گرنگییەتی بۆتە جێگەی مشتومڕێکی زۆری زانایان و تەفسیری جۆراوجۆری بۆکراوەو لەلایەن بیریارانەوە ڕوونکردنەوەی زۆر دراوە! بە تایبەت ئەوەی پەیوەند بە مەسەلەی (باران بارین)ەوە هەیە، کە تائێستاش زۆرێك لە موسڵمانان والێی تێگەیشتون کەسەر بە بابەتی غەیبیاتەو ناکرێت مرۆڤ لە بارەی کات و ساتی باران بارینەوە هیچ بزانێت! بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە بیریاری کورد (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) هاتووە جیاواز لەهەموو ئەو قسە و باسانەی تائێستا دەربارەی ئەم پێنج ئایەتە بیستوومانە قسەی دیکەی هەیە بۆ ووتن و تەفسیر و ڕوونکردنەوەی جیاواز دەدات لەوبارەیە، هەر لەبەر ئەم گرنگییەیەتی ئێمەش لێرەدا دامانا}...

دیارە ئەوەی لەم ئایەتانەدا هەیە و ناونراوە بە (پێنج غەیبیاتەکە) هەڵە کراوە، لێرەدا بە موتڵەقی باس لە(غەیبیات) نییە! بەحسی لە پێنج مەسەلە کراوە کە یەکێکیان ئەساسەن مەسەلەی (عیلم) نییە، بەڵکو مەسەلەی قودرەت و کارکردنە، چواریان مەسەلەی (عیلمە)، دووانیان باسی ئەمەیە کە بەشەر ئیمکانی نییە بیزانێت، ئەو دووانەکەی تریان باسی ئەمە نییە کە

---

* ) إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (٣٤) سورة لقمان

بەشەر بیزانێت یان نەیزانێت. جا پێنج قەزییەكە چییە، كە ئەصڵەن پەیوەندی نییە بە (عیلمەوە)؟

مەسەلەی﴿وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ﴾خوای گەورەیە ئەم قانون و نیزامەی دامەزراندووە كە ئەم بوخارە(هەڵمە) لە فلانە هەلومەرجدا ئەو حاڵەتە پەیدا دەكات، كە بارانی لێ بێتە خوارەوە، یەكیان باسی ئەمەیە، كە ئەمە باس لە زانین نییە، نەزانینی خواو نەزانینی بەشەر، مەسەلەی باران بارین و تەواوی ئەو كارو كار دانەوانەی لەم جیهانەدا هەیە بە قودرەتی خوای گەورەیەو خوای گەورە نەزم و قانونی ئاوای دامەزراندووە كە لە فلانە قۆناغدا باران دەبارێت، بۆنمونە یەكدانە قاپی فلزی لەژوورێكدا دابنێ لەو ژوورەدا ئاگر بكەرەوەو ئاو بخە سەری،دەبینیت هەڵم دەكاتو دەیدات لەو قاپە فلزییەو قاپە فلزیەكە پشتی ساردۆ بێت دەبینیت ووردە ووردە دەگۆڕێت و ئاو دێتە خوارەوە، دەی ئەمانە هەمووی قانونی خوایە، ئائەمەو هەرچیتر بەمجۆرە هەیە لە جیهانی هەستیدا هەمووی كارو بەرنامەی خوای گەورەیە، قانونێكەو ئەو دایناوە، ئەمەش باس لە غەیبیات نییە، باس لە زانین و نەزانین نییە، باس لە كارە﴿وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ﴾ باران دەنێرێت، لێرەدا لەناو وشەكەدا مانایەكی كۆمەكی و فریاد ڕەسییەكی تێدایە، ئەو مادەیە بۆ مەوجوداتی زیندوو خوا دەینێرێت و بەرنامە بەۆنامەی ئەوە.

چواری دەمێنێتەوە، دوانی باسە لە زانینی خوا، كە ئیتر ئەساسەن (لە بنەڕەتدا) بەشەر بیزانێت یان نەیزانێت نییە لە توانایدا، دەفەرموێت ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾. ﴿ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾، واتە لەحزەی تەواو بوونی تەمەنی ئەم هەستییە، و پاشان دووبارە شروعبوونەوەی تەمەن هەستی! ئەمە بەلای




خواوەیە خوا ئەم عیلمەی هەیە، باسی ئەمە نییە واتە(مەغیباتێك) ببێت لەم ئایەتەداو خەڵك نەیزانێت، ئەصڵەن بەحسی وای تیا نییە، بەڵێ دەزانێت خەڵك نایزانێت، بەڵام سیاقی بەحسەكە ئەوە نییە و باسە دەربارەی عیلمی خوا. ئەویتریشیان ئەوەیە ﴿يَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ﴾، خوا دەزانێت چی لە ڕەحمدا هەیە، لەو ئایەتەی سورەی( النجم)دا باسی دەكات، كە لەسەرەتایەوە تا سرەوتنی لە ڕەحمدا. ﴿.... هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ ...﴾* ئالەو قۆناغانەی سەرەتاوە، واتە خوا زاناس بە ئێوەو باشتر دەزانێت بە وەزعی ئێوەو ئەو گۆڕان كاریانەی بەسەرتاندا دێت، لەو قۆناغەوە كە لە زەویدا بە شێوەی گیاو مادەی جۆراوجۆر كە لەزەویدایە و قابیلییەتی هەیە بگۆڕێت بۆ گیا و حەیوانات و لەپاشاندا وورده وورده دەبێتە وجودی ئینسانگەل و تەبدیل دەبێتە نوتفە(تنكۆ ئاو) و لە ڕەحمدا سرەوت دەگرێت تا دەبێتە (كرۆمۆسۆم لە رەحمدا) و دەڕواتە ئەو زەمینەی ئامادەی لە دایك بوون دەبێت بۆ ئەم دونیایەو لە ڕەحمدا بێتە دەرەوە ، چی بەسەردا دێت خوا دەیزانێت، لێرەشدا دووبارە باسی ئەوە نییە كە خەڵك نایزانێت، دەكرێت فلانە نوكتەی بۆ دەركەوێت و فلانە نوكتەی بزانێت، نەفی زانین لە بەشەر نەكراوە، بەڵكو ئەوە بۆ ئێمە وتراوە و حاڵیكراوین كە خوا ئاگای هەیە لە قۆناغە جیا جیاكانی حیاتی ئێوە، كە قۆناغێكی كاتێكە كە لە ڕەحمدا قەرار دەگرن.

---

*) ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾(٣٢) سورة النجم

لێرەدا ئەساسەن باسی نەفی كردنی عیلم لە ئینسان نییە. ئەو دووانەكەی تریان نەفی زانینی بەشەرە، تەنها ئەم دووانەیە نەفی زانینی بەشەری لێكراوەو بەشەر نایزانێت، ئەویش ئەوەیە، مرۆڤ نازانێت بەیانی چی دەكات، چونكە ڕاستە بەرنامە دادەنێت، بەلاَم لەوانەشە تا بەیانی بمرێت! جاری وا هەیە بەرنامە دادەنێت تا ساڵێك تا دەساڵ كە چی بكات، بەلاَم لەوانەیە یەك لەحزە لەدوای ئەوە ئەو فیكری كردۆتەوە شتێك ڕوویدات هیچكام لەوانە نەبینێت، مەرگ و ژیان و گۆڕانی جۆر جۆر، عیلم بەمانای ئا ئەو جۆرە زانینە، كە تەحەولی نەبێت و حەتمی بێت كەس نازانێت! چونكە نازانێت كەی مەرگ دێتە پێشەوە، لێرەدا زانین نییە.

لەوانەیە لێرەدا هەندێ شت لەلای موسوڵمانان دروست ببێت كە پێویستە كەمێك ڕوونی بكەمەوە، لەوانەیە بەهۆكاری (وەحی)، حەقائیقێك بوترێت بەپێغەمبەران، مومكینە بە وەسیلەی(خەو) ئینسان شتگەلێكی پێ بوترێت، مومكینە بە (ئیلهام) شتگەلێكی پێبوترێت، فلاَنە حاڵەت كۆمەڵێك شتی پێ بوترێت، بەلاَم ئەمە پێی ناڵێن (عیلم غیب). بەشەر (عیلم غیب) پەیدا ناكات.

## عیلمی غیب چیە؟

ئصولەن عیلمی بەشەری بەوەدەڵێن، كە تبقی ئەوشتەی وا لەناو بەشەردا ناسراوە. زانینی بۆ بەشەر مەقدوربێت و ڕێگەی دەرك و زانینی لە ئیختیاری بەشەردا بێت. مەسەلەن عیلم بەشەری بەوە دەڵێن كەشتێك وا ڕێگەی لەبەردەم بەشەردا هەیە و دەتوانێت لەورێگانەوە دەستی پێیان بگات، بۆ نمونە لەبابەتی فیزیا یان كیما یان ئەدەبیات یان كۆمەلاَیەتی یان مێژوودا ڕێگەی

زانینی فلآنە مەتڵەبت هەیە. چونكە دەڕۆیت كتێبەكان دەهێنیت و دەیان خوێنینتەوەو حالیٚ دەبیت. بەلاٚم غەیبیات ئاوا نییە. ڕێگەی موتەعارفی نییە بۆ ئینسان كە بیان زانێت، بینا لەسەر ئەمە ئەگەر چی پێغەمبەران بە وەسیلەی (وەحی) زۆر شتیان پیٚ بوترێت، بەلاٚم هیچكات عیلمی غەیب پەیدا ناكەن، چونكە پێیان وترا دەیزانن و پیان نەوترا ئیمكانی نییە بیزانن! ئەگەر هەرچی كتێبی دونیا هەیە بیخوێننەوە! جا ئەمە كە دەڵێین كەس نازانێت سبەینیٚ چی دەكات و كەس نازانێت لە چی گۆشەیەكی زەویدا دەمرێت، مانای ئەوە نییە واتە مومكین نییە شتێك بەو جۆرە بوترێت بە زەمیری ئینسان، بەڵیٚ مومكینە بە جۆرێكی یەقینی لەلایەن خوای گەورە بوترێت بە پێغەمبەرێك،"كە تۆ بەیانی ئەو كارە دەكەیت". حەتا (وەحی) بێت بۆی، كەلە (ئیلهام) بانتر‌ە، چونكە تەواو ئاگاهانەو ڕۆشنە، كە دەربڕین و ووشەكانی هەموو شتێكی ڕۆشنە، لەكاتێكدا ئەوەش بزانین ئیلهامی پێغەمبەران جیاوازی هەیە لەگەڵ ئیلهامی ئێمەدا، ئەویش هەر ڕۆشنەو ئاگاهانەیە، دەرك دەكەن دەزانن ئەمە تەخەیولاتی خۆیان نییەو لەلایەن خواوە نێرراوە، بەلاٚم جیاوازی هەیە لەگەڵ (وەحی)داو لەناو عیبارات و ئەلفازیدا ڕۆشنی نییە، تەنها مەفهومێكە.

جا ئیلهم بێت یان بانتر لە ئیلهام و وەحی بێت، كە بەیانی فلآنە كار دەكەم یان لە فلآنە گۆشەی زەویدا دەمرم، بەمە ناوترێت (عیلم)، چونكە ئەمە خۆی ڕێگەیەكی نییە بۆ زانینی، و بە ڕێگە موتەعارفەكە نەیزانیوە! ئەمە پێی دەڵێین (ئیلقای ئیلاهی).

عیلمی بەشەری بەوە دەڵێین، كە ڕێكخستنی لە توانای بەشەردا هەبێت و هەركات ویستی بتوانێت بیزانێت، ئێستا من زمانی (ئیسپانی)نازانم، بەلاٚم

ئەگەر لە ڕێگەی موتەعارفەوە مەیلمبێت و هەڵی بۆ بدەم دەتوانم فێری ببم و بیزانم. بەلاَم (غەیبیات) وا نییەو ڕێگەیەك موتەعارف نییە بۆ زانینیان. لە پێغەمبەرانیش خوارتر لەوانە ئیلهامێك فرە فرە ڕۆشن بوترێت بە مرۆڤێك لە مەجالی كارێكدا كە بەیانی دەیكات، لە مەجالی ڕووداوێكدا كە بەیانی ڕوودەدات، یەقینی قەتعی ببێت، واتە ئەوەندە ڕۆشن بێت لەلای كە ڕوودەدات یان بە خەو شتێك ببینێت ئەوەندە ڕۆشن بێت لە فلاَنە جێگەدا دەمرێت، بەمانە ناوترێت (عیلمی بەشەری)، چونكە ڕێگەی زانینەكەی نییە بۆ خەڵك و هەركات بیانەوێت پێی ناگەن .

جا لێرەدا ئەم دووانە نەفیكراوە، كە كەسێك نازانێت سبەینێ چی دەكات، یان كەسێك نازانێت لە كام گۆشەی زەویدا دەمرێت مەبەستی ئەو زانینە عادییەیە كە ڕێگای زانینەكەی لە توانای بەشەردا بێت، هەروا چۆن بۆ عیلمێك ڕێگە هەیە فێری بیت بۆ ئەمیش ڕێگەیەك هەیە فێری ببیت، بتوانیت فێری ئەمە ببیت یەقین پەیدا بكەیت كە سبەینێ چی كارێك دەكەیت، بتوانیت فێری ئەمە ببیت یەقین پەیدا بكەیت لەكوێدا دەمریت! دەی ئەمە قەت ناتوانیت، بەلاَم ئەمە بە مانای ئەوە نییە واتە هیچ وەختێك شتێكی وامان بۆ دەرناكەوێت و بۆمان باس ناكرێت، نا ... مومكینە بوێت. بۆیە لەناو ئەو پێنج شتەی پێی دەڵێن(پێنج غەیبی)ەكە تەنها ئەم دووانەیەتی كە نەفی زانینی لەبەشەر كراوە، ئەو سیانەكەشیان یەكیان باسی زانین نییە و دووانیشیان باسی زانینی خوای گەورەیە، نەك نەفی لە زانینی بەشەر.

لێرەدا پێویستە بەسەر ئەوەشدا تێنەپەڕم و ڕوونی بكەمەوە لەبارەی ئەو شتانەی پێی دەوترێت هیپنۆتیزم (خەواندنی موگناتیزی)و ئەستێرە ناسی و شتی




وا كە لەو رێگانەوە مرۆڤ ئاگادار دەكەنەوەلە رووداوەكان، جا ئەم باسانە دوو لایەنیان هەیە:
قسە لەسەر ئەوەبێت كە رێگەیەك هەبێت بۆ زانینی ئەم شتانە، ئەگەر وابێت ئەوە وا رێگەی بۆ پەیدا بووە ناچێتە خانەی غەیبیاتەوە{بۆنمونە (خەواندنەكەی) ئەنجام داوە، ئیتر باس لە غەیبیات نییە}. بەلاَم واقیعییەت شتێكی ترە، بۆ ئەم جۆرە باسانە رێگەیەكی عیلمی بوونی نییە، واتە ئەو رێگەیە كە دەزانیت تبقی فلاَنە قەواعید لە فلاَنە عیلم، یان فلاَنە موشاهەدات لە فلاَنە مەسەلەی تەجروبیدا نەتیجەیەك بەوجۆرە دەستبكەوێتەوە، ئابەوجۆرە رێگەیەك نییە بۆ ئەم بابەتانە. ئەگەر فەرزی وابوو ووتمان ئیتر لە بابەتی غەیبیات چۆتە دەرەوە، ئیتر ئاسانە بۆتە مەسەلەیەكی عیلمی، بەلاَم ئەم فەرزە(گریمانە) خۆی باتلە، ئەوە كە لە رابردوودا لەرێگەی ئەستێرەوە هاتوون حسابی وایان كردووەو ئێستاش لە رێگەی هیپنۆتیزم و ئەنواع كاری رۆحی، بابەتێك دەرك دەكەن تەنها تەڵخی و لێڵی و سێبەرێك دەداتە ئینسان و عیلم نادات. هەموو ئەمانە یەقینی نین، لەبەرئەوەی یەقینیش نییە ناكرێت ببێتە بنەما بۆ حوكم دان، ناكرێت یەقین لەسەر بنەمای ئەمانە دابنرێت، بەلێ خۆم دەزانم كۆمەڵێك كار هەیە لەرێگەی ئەستێرەوە دەكرێت، وەك مەسەلەی مردنی (عومەری خەیامی نەیشابوری)یان كۆمەڵێك شتی دیكە كە لەكتێبەكاندا دیومە، یان لە دونیای ئەمرۆدا كە كۆمەڵێك شتم لە مەسەلەی (خەواندنی موگناتیسیم) بیستووەو باوەڕ دەكەم دەزانم راستەو درۆ ناكەن، بەلاَم گرنگ جیاوازی ئائەم رێگەیەیە، لەگەڵ ئەو رێگە موتەعاریفا كە پێی دەڵێین (عیلم). رێگەی موتەعارف یەقین دەبەخشێت، بەلاَم ئەمانە یەقین نابەخشن، تەنها لێڵییەك

دەدات بە مرۆڤ كە ئیحتیمالی هەیە واش نەبێت. ئا ئەمەیە جیاوازییەكە لەكاتێكدا ئەوە وا ئێژین مەقدور نییە (عیلمە)، واتە ئەو جۆرە دەركە یەقینییە وا لە ڕووی موقەدیماتی یەقینییەوە تبقی ئەو ڕێگە موتەعارفە بۆ ئینسان حاصڵ دەبێت لەم مەسائیلانەدا ئەو جۆرە عیلمە حاصڵ نابێت وەك باقی علومەكانی دیكە نییە. واتە وەك بابەتێكی وەك بیركاری نییە كە یەقینت پێبخشن!

# ئەو سەرچاوانەی سودیان لێوەرگیراوە:


. حەبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، چاپخانەی مەهاران، تهران،٢٠٠٧.دووەم،٢٠٠٧.

١. زكی الدین عبدالعچیم بن: صوختەی صەحیحی موسلیم، و.لیژنەیەك، بەرگی

٣. سەروەت عبدالله: كاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەروازەیەك بۆ خەباتێكی نەناسێنراو، بەرگە یەكەم، چاپی یەكەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی،٢٠١٠.

٤. عەلی عیزەت بیگۆڤیچ: ئیسلام لە نێوان ڕۆژهەلاّت و رۆژئاوادا، چاپی چوارەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٥. كاك ئەحمەدی موفتی زادە: یەكبوونی ئیسلامی، و.یاسین حمەسەعید، گۆڤاری هەژان، ژ.١٧و١٨، ٢٠٠٥.

٦. مامۆستا ناصری سوبحانی: اثبات وجود، كاسێتی تۆماركراو.

٧. مامۆستا ناصری سوبحانی: تەفسیری سورەتی یونس، ٢٠٠٩.

٨. مامۆستا ناصری سوبحانی: خلق ادم، كاسێتی تۆماركراو.

٩. مامۆستا ناصری سوبحانی: خودا ناسی، كاسێتی تۆماركراو.




١٠. مامۆستا ناصری سوبحانی: لادانەکانی بەشەرییەت و ژیانێکی مونمینانە، ئامادەکردنی، سەروەت عەبدولاَ، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١١.

١١. مامۆستا ناصری سوبحانی: مەسەلەکانی ئافرەت، ئامادەکردنی سالم بێستانی، چاپی یەکەم،

١٢. مامۆستا ناصری سوبحانی: مونازەرەی عیلمی: کاسێتی تۆمارکراو.

## کاسێتەکانی کاك ئەحمەدی موفتی زادە:

١. کاسێتی ژمارە(٤٥)، سخنرانی بۆکان،B-A.

٢. کاسێتی ژمارە(٦٧) (تصفیه انقلاب فرهنگی)،B-A.

٣. کاسێتی ژمارە(٢٤) (پرورش و اموزش)، B-A.

٤. کاسێتی ژمارە(١٩٦) (راطبه و مراحل ماده و حیات روح و میزان اگاهی انسان نسبت به ذات خلق)B١-A١. B٢-A٢

٥. کاسێتی ژمارە(٣)(بحثی درباره بهائیان در مریوان)B-A.

٦. کاسێتی ژمارە(٣٣) ()B-A.

٧. کاسێتی ژمارە(٢٤٦) (توصیه به خانوادە (١ و٢ )B١-A١. B٢-A٢ (٢٤٦)

٨. کاسێتی ژمارە(١٨٥) (١.بقای ماده و انرژی ٢. جاریيه)B-A.

٩. کاسێتی ژمارە(١٧٤) (حور، غلمان، ولدان )B-A.

١٠.کاسێتی ژمارە(٣١) (شرك و تەوحید در مسجد روستای مرخوز-بوکان)B-A.

١١. کاسێتی ژمارە(١٧٠) (لیبرالیسم)B١-A١. B٢-A٢

١٢. كاسێتی ژمارە(٣٥) (ماتریالیسم فكری و اخلاقی)B-A.

١٣. كاسێتی ژمارە(٢٠٤) (هدف از خلقت هستی و انسان، علت تزلزل فكر و روان و راه چارە)B-A.

١٤. كاسێتی ژمارە(٢٣٤) (وظیفە انسان موسلمان نسبت بە خود و اطرایان)B-A.

١٥. كاسێتی ژمارە(٧٢) (وظیفە انسان در مسیر تاریخ)B-A.

١٦. كاسێتی ژمارە(١٥٧) (تفاوت ایمان و اسلام و ایمان و كفر و نفاق)B-A.



لەڕاستیدا (تەسخیر) کردن و کۆنترۆڵ کردنی جسم لەچاو تەسخیرکردن‌و کۆنترۆڵکردنی فکردا شتێکی بچوکە، ئینسانێک ببەیت و زیندانی بکەیت زۆر کەم زەرەرترە، تاوەکو ئەوەی بێیت فکری بگۆڕیت و دیلی بکەیت. لە جاهیلییەتی دونیایی ئەم ڕۆژەدا وەک جاهیلییەتی درێژایی مێژوو تەسخیری فکر دەکەن، کەئەوە بەدبەختییە، ئەو قوتابخانە بەشەری و یاسا و سیستەمە بەشەریانە زۆر زاڵمانەتر کاردەکەن لەو ئەشکەنجانەی لە زیندانەکاندا دەدرێن! چونکە (جسمی تسخیر) ناکەن (دەرونی تسخیر) دەکەن، جا دەرون گرنگترە تا جسم، هەرکە دەرون تسخیر کرا تازە ئیتر ئینسان نییە!

لە وتەکانی کاک ئەحمەد







چاپخانەی سیما - سلێمانی